# ڕۆشنبیری نوێ

ژماره (106) سالی 1985






دووازده سوارەی مەریوان

ئەم ژمارەیە
تۆماری تایبەتی تێدایە بەبۆنەی
تێپەڕبوونی (200) ساڵ بەسەر
دامەزراندنی شاری سلێمانی‌دا

# رۆشنبیری نوێ

سالی 1985 ژمارە (106)

رۆشنبیری نوێ

گۆڤارێکی وەرزیە بۆ لێکۆڵینەوە

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

دەری دەکات

سەرنووسەر و سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێر : مصلح جەلالی




لەم ژمارەیەدا




نەخشەکێشان و دەرهێنانی هونەری نەسرین خضر

هونەرمەند محمد عارف

وێنەی بەرگی دەرەوەی کێشاوە

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الکردیة

ساحة الخلانی بغداد تەلەفون 8875795 پێنج خەتە

# له یادی

# له دایك بوونی سه‌رکرده دا

جلال حسن خوّشناو





ئەگەر بمانەوی لە کەسایەتی سەرۆکی فەرماندەو پێشەوای سەرکەوتن صدام حسین بدوێن و لە گشت لایەنەکانی وەکو فەرماندەیەکی مێژوویی دەگمەن فەرماندەیەك کە لەناو میللەتەوە پێ گەیشتووە وەهەروەها لەناو جەرگەی شۆڕشەوە وەکو کانی یە ئاوێك دەربووە.

سەرۆك تەنیا سەرکردەی ئەم گۆڕانە لەسەر کۆمەڵ و مرۆڤی عیراقی و پەیوەندیەکانی پشکنێنەری سەرەکی لە شوێنی میری یەوە نی یە، بەڵکو فەرماندەیەکە سەرۆکایەتی ئەم گۆڕانە دەکات و ئەم شۆڕشە لەهەموو لایەنێکیەوە بەشێوەیەکی سەرکردایەتی دیاری کراو بەڕێوە دەبات تاکو سەرکردایەتی یکی نموونەیی و دیاری کراو بێ و، پێشڕەوبێت بەهەموو پێوەرەکانی مرۆڤایەتی و پەروەردەیی و تێکوشان ـ [illegible] هەتاکو سەرکردایەتی صدام حسین ببێتە پەروەردەیەکی رامیاری، بەراستی ئەمەیە سەرکردایەتی، چونکە هەموو هاو وولاتێك دەتوانێت خۆی تیایدا ببینی، چونکە سەرۆك خۆی لەناو هەر هاو وولاتییێك دەدۆزێتەوە.

لەدایك بوونی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین:

لێکۆڵینەوەو لێدوان لەهاتنی سەرۆکی مەزن صدام حسین کردەوەیەکی ئاسان نی یە نەك لەبەر گرێدارو گرانی باسەکە بەڵکو لەبەر زۆری کەلێن و قوژبن و تێکەڵاو بوونی ئەم هەموانە لەبارەی لایەنەکانی خێزانی یەتی و تێکوشان و لایەنە کۆمەلایەتی و مرۆڤایەتی یەوە کە هاتنی سەرۆکی فەرماندەی بەدەرخستووەو ئەم ئازارو ئەشکەنجەی، کە لە منالی و هەرزەکاری و لاوێتی دا چێژی کردووەو هەستی بەئازاری رۆڵەکانی گەلەکەی کردووەو ئامانجەکانی تێ گەیشتووە.



**لەدایك بوونی: -**

لەم ڕۆژەدا واتـا لە 28ی نیسـانی 1937دا وپێش 48 ساڵ سەرۆکی فەرماندە لەدایك بوو. لەو ڕۆژە ڕەشانەی، کە میللەتـەکـەمـان لە تاریکیو ئازارو ئەشکـەنجەدا بوو لە هەمـان ساڵ سەرکـردەی دامـەزرێنـەر (میشێـل عەفلەق) ویستی بیـری جوولانەوەی بەعسی عەرەبی بکـاتـە پارتێـك (حزب). ئەمە نیشانەیەکی قووڵە نەك تەنیا ڕێکەوتێکی بەر بەیـار بێ. کە شانـۆ ئامـادەکـرا لە پاڵـەوانێـك گەڕان تاکـو وەڵامی بانگی مێژوو، بانگی گەل، بانگی نیشتمان بداتەوە.

لەدایـك بوونـەکـەی بەخـۆشی نـەبوو، گوڵ و ڕوحانیش لەنێو لانکەکەی دانەندرابوو لەدایکیش نەبوو تاکو لە دەمیدا کەوچکی زێڕ ببینی.

بەڵـێ بەهێتیمی لەدایـك بوو، پاش ئەوەی، کە باوکی مردبوو وەپێش ئەوەی، کە چاوەکانی لەرووناکیدا بکرێتەوە.

لەنـاو جەرگـەی خێـزانێکی جووتیـار ئاسـا بەهـەژاری لەدایـك بوو، هەر وەك زۆر لەپـاڵـەوانـەکـانی مێـژوو، کە بەرەنگاری ڕۆژگار ببوون.

هاتنـە سەرەتـایی یـەکـەی لەخـانـوویەکی قوڕ لە گوندی (العـوجـە)، کە سەر بەشـاری (تکـریت)ە، لە پارێـزگـەی صلاح الـدیـن. پاش لەدایـك بوونـی لە ماڵی خاڵـۆی (حـاجی خەیـرواللە تولفـاح)، مامـەکـەی (حسن المجید) ناوی نا (صدام).

تەمـەنـی بووە هەشـت ساڵان و هێـشتـا نەچـوو بووە قوتـابخـانـە، چونکـە خێـزانەکەی ویستیان ببێ بەجووتیار، هەروەکـو هەمـوو کشتیـارەکـانی گونـدەکـەی، بەڵام کوڕە خاڵـەکـەی (عـدنان خەیرواللە وەزیری بەرگری ئێستا)، کە ئەوسـا لە تکـریت دەژیـا بەبن گوێیدا چرپـانـدو باسی قوتابخانەو خوێندن و نووسین و نیگاری بۆکرد.

قسـەکـانی کوڕی خاڵی زۆر کاری تێکـرد لەبـەر ئەوە

شەوێك بەدزی‌یەوە کە خێزانەکەی نووستبون لەناو تاریکیدا بۆی دەرچــوو پاش دوو سەعــات ڕۆیشــتــن بە پێ خۆی گەیاندە لای خزمەکانی لەشاری تکریت و تێ‌ی گەیاندن، کە دەبێ بەخێزانەکەی بسەلمێنن، تاکو بچێتە قوتابخانە.

ئەمجــا چووە قوتــابخــانــە تا پۆلی یەکـەمی ناوەنـدی تەواوکـرد، لەگـەڵ ماڵی خاڵی چوە بەغـدا، لەمـاڵی خاڵی ژیــا. ئەبـێ ئەوەش بزانـیـن، کە خاڵـی لەمـنــاڵی‌یــەوە سەرپەرشتی کردووەو قوتابخانەی ناوەندی تەواوکرد.

لە کۆتــای ساڵی (1957) کە تەمــەنی سەرۆك صدام حسين گەيشتـە بيست ساڵ چووە ریـزەکانی پارتی بەعـسی عەرەبی سۆشیــالیست ، کەبیــرو باوەڕو نیشتمـان پەروەری خۆی تیا. دۆزی‌یەوە. ئەم بیرو باوەڕە بەگورەی، کە دایکی لە دڵی چەسپاندبو ئەویش بەباس کردنی خالە ئەفسەرەکەی (خەيرواللە تلفاح) کە چۆن بەشداری کردبو لەبەر هەڵستی ئینگلیزەکان لەکاتی شۆڕش (ڕەشید عالی گەیلانی) ساڵی 1941.

ئەم ڕووداوانەی، کە پاشماوەی ئیمپریالیزمی بریتانی بە جێ‌ی هێشتبــون و فەرمــانــڕەوایی عیــراق بە بێگـانــەوەو گیـروگـرفتـەکـانی نیشتمـانی وای لەسـەرۆك صدام حسين کردکـەکـار کردنی ڕامیـاری بکـاتـە پیشەی‌و بەتایبەتی، کە سەرۆك صدام حسين بەندکرا لەسەر ئەوەی گۆیا پیاوێکی میری لە ساڵی 1958 لە تکریت کوشتووە.

دادگــەی (مــەهـداوی) جۆش درابـوو دژی دژەکـانی فەرمانرەوای عبدالکريم قاسمی دکتاتۆر.

سەرۆك صدام حسين سەرکـەوتـوانـە پەیـوەنـدی لەگەڵ هەڤاڵەکانی پتەو کرد لەناو بەندیخانەدا.

پاش دەرچـونی لەبـەندیخانە، لەپارتەوە ڕاگەیێنرا، کەلە بەغـدا پێـویستیـان پێی هەیـە، پاش ئەوەی جووڵانەوەکەی لەسەرۆکایەتی پارت دا دەنگی دایەوە.

کە گەیـشـتــە بەغــدا بەهــەمــوو دڵـی‌یــەوە ویـستی عەبــدول کەریـم قاسم لابــەرێت، مەشقێکی زۆری کرد لەســەر بەکـار هێنـانی چەك و زۆر چاك لێ‌ی شارەزابــوو، توانـای ئەوەی هەبـوو، کە ئەم کارە نیشتمـانی‌یە جێ‌بەجێ بکـات، لەبـەر ئەوە هەمـوو شەقامەکانی بەغدا شارەزابوو، هەتاکو بتوانێ ئەم کارە گرنگە بەجێ بهێنێت.

هەر لەبەر ئەوەش سەرۆك صدام حسين یەکێك بوو لەو پێنج تێکۆشەرانەی، کەراسپێردران لە 17ی تشرینی یەکەم ساڵی 1959 کە عەبدول کەریم قاسم لەناوببەن.

بەڵام ئەو پێنـج تێکـۆشـەرانـە بەختیـان نەبوو لەکوشتنی عەبــدول کەریم قاسم پاش ئەوەی، کە دەست ڕێــژ یـان لێ‌کرد لەشەقامی ڕەشید لە بەغدا، وەسەرۆك صدام حسين نەکشـاوە تاکـو کشـانـەوەی چوار هاوڕی‌یـەکەی دابێن کردو بریـنـدارکـرا لەلایـەن یاسـاوڵـەکان و هەر بەخۆی گوللەکەی لەپێ‌ی خۆی دەرهێنا هەتا فرمانەکەی ئاشکرا نەبێت ئەگەر هات و چووە نەخۆشخانە.

پاش ئەوەی هەرچــوار هاوڕی‌یـەکـانی گیـران گەڕایـەوە تکریت وەلە (عوجە)وە گەیشتە سوریا پاش ماندووبونێکی زۆر لەسەر فەرمانی پارت.

لە ڕۆژی 21ی شوبــاتی ساڵی 1960 لە دیمـەشقـەوە چووە قاهیــرە، کە ئەوســاکـە قاهیـرە ئارامگـەی نیشتمـان پەروەرانی گشت عەرەبەکان بوو.

سێ ســاڵ و چەنــد مانگێـك تیـادا ماوەو، جم وجـۆڵی قاهیـرەو گێـژاوەکـانی، صدام حسين لە ڕێگـەی نیشتمانی لانەدا بەڵکو قوتابخانەی ئامادەیی (قصر النيل)ی تەواوکردو خۆی ئامادەکردو ڕاهێنا کە بچێتە کولیەی حقوق لە زانکۆی قاهیرە.

لەم ماوەیەدا سەرۆك صدام حسين هەڵبژێرا بە ئەندام لەسەرکردایەتی تیپ ودوایی ئەندام لە سەرکردایەتی هۆبەو دوایی ئەندام لەسەر کردایەتی پارت لقی‌میسر.

پاش ئەوەی، کەزانــی ڕژێــمــی قاســم لەنــاو چووەو

شۆڕشی 8ی شوباتی 1963 بەرپا بوو، یەکسەر گەڕایەوە بەغدا، تاکو بەردەوام بێ لە تێکۆشانی پارتەوە. لەو کاتەی، کە پارت تووشی دووبەرەکی و ناکۆکی ببوو، پێویستی بەسەرکردەیەکی بەتوانا و بەهێز بوو، کرابە ئەندامی سەرکردایەتی نووسینگەی جووتیاران.

پاش گەڕانەوەی سەرۆك صدام حسین لە قاهیرە بەرەنگاری ناکۆکیەکانی ناو پارت بوو. سەربازەکانی عەبدول سلام عارف بەعسی یەکانیان پەرێشان کردن و پێش هەموویان سەرۆك صدام حسین بوو کە بەشێکی گەورەی لەو ئازارە بەرکەوت..

پاش گەڕانەوەی بۆ بەغدا رێکخراوی سەربازی پارتی گرتە ئەستۆی خۆی، سەرباری نووسینگەی جووتیاران.

هەوڵی خۆ ئامادە کردنی دا تا فرمانڕەوایی وەربگرێ.

دەستی کرد بەکڕینی چەك و دروست کردنی نارنجۆك لە پێناوی هەڵمەت بردن بۆسەر رژێمی بۆگەن.

جاری یەکەم فرمانی پارتی خستە پاش گوێ، کەرازی نەبوو بچێتە (دیمەشق) بۆیەگیرا، چونکە لە بەغدا مایەوە. گەلێك رۆژی تاریکی لە بەندیخانە بەسەر برد، بەڵام هیچ کۆڵی نەدا لەرێگەی تێکۆشان و پەیوەندی کردن بەهاوڕێ یەکانی لەدەرەوەی بەندیخانەوە پلانێکی دانا، کە لەبەندیخانە رابکاو یاساوڵەکانی دەستەمۆ کردن وتوانی کورە گەورەکەی (عُدەی) ببینێ کە ئەوساکە شەش ساڵی بوو. وەکو رەکەی نامەی لەباوکیەوە بۆ هاوڕێ یەکانی دەرەوەی بەندیخانە دەبرد، هەتا سەرۆك صدام حسین توانی لەچێشتخانەکانی شەقامی سەعدون رابکا لەکاتی گەڕانەوەی لەدادگا لەگەڵ یاساوڵەکانی، وەلە دەرگایەکی پشتەوەی چێشتخانەکە دەرچوو کە ئوتومبێلێك چاوەڕوانی دەکرد.

راکردنی لەبەندیخانە زۆر گرنگ بوو چونکە پاش راکردنی تەنگ و چەڵەمەی دوو بەرەکی ناوپارتی جێ‌بەجێ کردو گیرو گرفتی (ئەفسەر رژێمی) جی‌بەجێ‌کردو دەستی کرد بە دانانی پلانی شۆڕش.

لەکات ژمێری سێ‌ی شەوی حەڤدەی تەمووزی ساڵی 1968 سەرۆك صدام حسین بەجلی سەربازی‌یەوە سواری تانکێك ببوو بەناو کۆشکی کۆماری‌یەوە کەوت، بۆ روخاندنی رژێمی کۆنە پەرست عەبدول رەحمان عارف.

سەرۆك صدام حسین پارتی ئاگادارکرد بۆ لابردنی عبدالرزاق نایف وابراهیم الداود تاکو هەموو پارت سەرکردایەتی بگرێتە ئەستۆی خۆی.

زۆر دلێرانەو ئازایانەو پیتۆڵانە نایفی لە هێزەکەی دابڕی‌و راپێچی کردە دەرەوەی کۆشکی کۆماری‌و بۆ فڕۆکەخانەو لەوێوەش بۆ مەغریب کە لەسەر داوای خۆی‌بوو.

وەسەرۆك صدام حسین رێگای توخمە سەربازی‌یەکانی گرت، کە بۆ دواخستنی پارت و شورش دەجوولانەوە. وەپاش دەرکردنی بەیانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کە احمد حسن البکر بێتە باوەڕپێکراوی نهێنی سەرکردایەتی قوتری پارت و سەرۆك کۆمار.

سەرۆك صدام حسین جێ نشینی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی بۆ خۆی هەڵبژارد بەبێ ئەوەی بڵاوبکرێتەوە. چونکە سەرۆك صدام حسین پیاوی دووەم بوو لە پلەی حیزبایەتی‌دا (تسلسل الحزبي).

لەیەکەم ووتار کەسەرۆك صدام حسین سەرۆکایەتی کۆماری وەرگرت لە 17ی تەموزی ساڵی 1979 گوتی:

«لەهیچ مێژووی کۆنداولە مێژووی گەلەکەماندا و لە مێژووی هاوچەرخ دا رووی نەداوە کە دوو فەرمانڕەوا بۆ ماوەی یانزە ساڵ لەسەر کردایەتی یەك بەسیفەتە زانراوەکانی تەگەرە بخاتە پێش کاروانی شۆڕش و پەیوەندیان لە نێواندا بپچڕێ‌و بۆ ئەوەی یەکێکیان لەناو بچی‌و ئەوتریان بمێنێ».

ئێمە هەموومان دەزانین، کە سەرۆك احمد حسن البکر لەدوا رۆژەکانی سەرۆکایەتی نەخۆش بوو وەنەی دەتوانی ئەم ئەرکەگرانانە بەڕیوە بەری هەر لە بەر ئەمە سەرۆك

صدام حسین هەر لە شەفەق تاکو نیوەشەو لەکاری شۆرشگێرانە دابوو.

لە ئەنجاما لە ئێوارەی 16ی تەمووزی 1979 هەردوو سەرکردایەتی نەتەوەیی و قوتری کۆ بوونەوە بریاریان دا، کە صدام حسین سەرۆك ببێت بەسەرکۆمارو شوێنی یەکەم لەپارتەوە بگرێتە ئەستۆی خۆی.

ئەوەبوو هەموو جەماوەری عیراق رایان لەم بریارە مێژوویی یە بوو، وەبەتەواوی راو خۆشەویستی خۆیان بۆ ئەو بریارە مەزنە دەربری.

سەرۆك صدام، شوێنی یەکەمی لەدەولەت و پارت گرت و ئەمجا رو بەرووی پیلانەکان بووەوە.

نابێ ئەوەش فەرامۆش بکرێ کە: گۆنگرەی سەرۆکەکانی عەرەب لەبەغدا پارسەنگیکی گەورەی عەرەب بوو بۆ سەرۆك صدام حسین، کە گیروگرفتەکانی گەلی گرتبووە ئەستۆ لە پێش هەموویان گیروگرفتی فەلەستین وە هەروەها دژی رێرەوی سادات وەستا. هەروا لایەنگیری بزوتنەوە نیشتمانیەکان بوو لە جیهانی سێیەم لەبارەی ئابووری و رامیاریەوە. پشتگیریانبوو.

هەروەها دەبینین، کە سەرۆك صدام بۆتە نیشانەی یەکێتی نیشتمانی گشت عیراقی یەکان.

گیروگرفتی کوردی بە شێوەیەکی دیموکراتی پەراندەوە کە لەهەستی مرۆڤێکی رەسەن و پیتولی پارتەکەی و روانگە تایبەتی یەکەی بۆ نەتەوەی کورد لەژێر رەشماڵە گەورەکەی عیراق.

رامیاری سەرۆك زۆر ئاشکرایە لەبارەی پەیوەندی عیراق لەگەڵ وولاتە سوشیالیستەکان و ئەوریپەکان کە بگونجێ لەگەڵ بارو دۆخمان و بێ ئەوەی کار بکاتە سەر سەربەستی عیراق.

هەروا دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە عیراق چۆن لەشەری تشرینی 1973 بەسەر کردایەتی سەروك صدام راوەستا. هەروا چۆن کیشەو گیروگرفتی کوردستانی بەشێوەیەکی مرۆڤایەتی جێبەجێ کرد.

خۆماڵی کردنی نەوتیش لە 1ی حزیرانی 1972 دەورێکی باڵای هەبوو کەمافی عیراقی لە کۆمپانیە بێگانەکان سەندەوە.

لایەنە گرنگەکانی سەرۆك صدام ئەوەیە کە ریبازی دیموقراتی کردوە بەپیشە لەوساتەوە کە شوێنی یەکەمی لەپارت و دەولەت وەرگرتووە، وەهەمیشە خۆی بەسوارچاکی سواران ناساندووە، وتێکۆشەرە لەناو تێکوشەران و شمشێرە لەناو شمشێران نەك تەنیا شمشێرێك بێت، وەلە هەموو رۆژێ و لە هەموو ساتێ کاروانە سەرکەوتووەکەی بە بیرو پەروەردی خۆی ئاوداوە.

وەهەمیشە لەگەڵ ووردترین کاری پارت و میری ژیاوە، ئەویش بەسەردانەکانی بۆ ماڵەکان و نەخۆشخانەکان و قوتابخانەکان و کارگەکان و سەربازگاکان هەموو شوێنەکانی نیشتمان بە گوندو شارەوە.

سەرۆك صدام حسین لەیەکێ لەوەڵامەکانی بۆ. رۆژنامەگەرێکی عەرەبی، کە لێی پرسی بوو (کێ سەر کۆمارە؟) ئەویش فەرمووی:

«ئەوکەسەیە، فرمانی پێ راسپێردراوە تاخزمەتی گەلەکەی بکات».

## کێشەی کورد:

پێداچوونەوەیەکی خێرای مێژووی مەسەلەی کوردو ئەو ئاڵۆزیانەی، کە لە گەڵیدا هاتوون، ئەوەمان بۆ دووپات دەکاتەوە، کە ئەم کێشەیە لەسەر دەمە سیاسی یە جۆراو جۆرەکاندا کە بەسەر وولاتدا تێپەریوە شێوەیەکی تایبەتی هەبووە، هەرچەندە رژێمە یەك لەدوای یەکەکان هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەولەتی عیراقەوە، هەوڵی ئەوەیان داوە چارەسەری کاتی و رێکەوتن نامەی ئاشتی مۆربکەن،

بەلام هەر هەمــوویــان چارەسـەرێکی تەواوی مەسـەلـەی کوردیان نەکردووە تەنها ئەوە نەبێ دانیان بە هەندێ مافی کارگێــڕێتیو ڕۆشنبیــریـەتی ڕۆلـەکـانی گەلی کورد دانــاوە، کە ئەوانـیش بە شێــوەیــەکـی ڕاسـت و دروست جێبــەجێ نەکــران، لەبــەر ئەمــە کێشــەی کورد بەبێ چارەســەرکــردن مایــەوەو درێــژەی کێشــاو بوو بە هوی وێـران کردن و کوشتن وبـرینی خەڵکی کوردستان هەروەها تێـك دانی پەیــوەنــدی نێــوان ڕۆلـەکـانی عیـراق وهێـزە نیشتمانیەکانی ئەو گەلەقارەمانە.

کە شۆڕشــی 30/17ی تەمــووزی ســاڵــی 1968ی پێشکەوتنخواز بەرپا بوو کەوتنە گۆڕینی ئەم بارودۆخە.

سەرکردایەتی سیاسیو سەرۆکی فەرماندە صدام حسین هەر لەڕۆژی یەکــەمیــەوە هەستی کرد کە کێشـەی یەکێتی نیشتمـانی یەکێکـە لەکێشـە هەرە گرنگـەکانی، کە پێویستە چارە سەری تەواوی بۆ بکرێت.

بۆیــە بە یاننــامــەی یانــزەی ئازار هاتـەدی، کە مافی نەتەوایەتی ڕەوای گەلی کوردی چەسپاند بەو پێیەی، کە یەکێکـە لەدوو نەتـەوە سەرەکیـەکـانی عیراق ئەم بەیاننامەیە بنــاغـەی یەکێتی نیشتمـانیو برایـەتی نەتـەوایـەتی لەسـەر بناغەی چارە نووسی هاوبەش لەیەك نیشتماندا چەسپاند.

هەروەهـا دەرچـونی یاسای ئۆتونۆمێ ناوچەی کوردستان ژمــارە [33]ی ساڵی 1974و دامـەزرانـدنی ئەنجـومـەنی یاسادانان و ڕاپەڕاندن لە ناوچەی کوردستان و دامە زراندنی دەزگـاکـانی ئوتـونـۆمیو دەست کردنیـان بەهـەڵسـوراندنی ئیشوکاری ناوچەی کوردستان.

بەکـورتی، دەسکـەوتەکانی شۆڕش لەوکاتەی کەسەرۆك صدام ئالای ئەو شۆڕشـەی هەڵگـرتـوە بەم جۆرە ئەتـوانرێ سەیری بکرێ:

1 ـ سەربەخۆیی سیاسی.
2 ـ خۆماڵێ کردنی نەوت.
3 ـ جێبەجێ کردنی کێشەی کورد.
4 ـ بەرەی پێشکەوتنخواز.
5 ـ چارە سەرکردنی کشتوکاڵ.
6 ـ پێش خستنی پیشەسازی.
7 ـ خوێندنی تەوزیمیو قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری.
8 ـ پتەوکردنی شۆڕشی فەلەستین لەهەموو لایەنێکەوە.
9 ـ بەهێز کردنی سوپا بەبا شترین چەکی تازەو مەشقی نوێ.
10 ـ بوژانەوەی بازرگانی.
11 ـ دان بەمافی ئافرەتان.
12 ـ دانانی ئەنجومەنی نیشتمانی.
13 ـ پالپشتی هەمـوو بزوتنـەوەیـەکی پێشکـەوتـوو خواز لە جیهانی سێهەمەوە.

## جەنگی قادسیەی صدام:

جەنگی ئێمــە لەدژی ڕژێمی ئیـرانی ڕەگـەزپـەرست و بەکـرێ گیـراو لەسـەرەتـاو تا ئەمـڕۆ بەر پەرچدانەوەیەکی بە جەرگــانــەی شۆڕشــەکــەمـان بووە، لەسـەر ئەو زنجیـرە ترسنــاکـەی، کە لە نێـو نەخشـەو پلان و کاری ئۆردوگـای دوژمنانی شۆڕش هاتووەو هەوڵی دوژمنکارانەیان بووە، بۆ هەلکــوتــانــە سەر شۆڕش، دوای ئەوەی گشت جۆرە هۆو پلانێکیان خستەکار تاپیلانی بەسەرا بگێڕن، کە لە ئەنجاما گشتی نووچیداو بۆری خوارد، ئەوە بوو هێرشی دڕندانەی تاقمی خومەینی لە 1980/9/4 بەدەسدرێژیەکەی لەسەر وولاتــەکــەمـان، هەولێکی نائومێـدانـە بوو، بۆ ڕاگـرتنی جوولانــەوەی ڕاپـەڕینی مێـژوویی نەتـەوەییو پێشکـەوتنی شارستـانیو مرۆڤـانـەی کە شۆڕشی عیراق، بەسەرۆکایەتی هەڤاڵ صدام شۆرە سوار، جێبەجێی کردبوو.

کە عیــراقییـەکـانیش چوونـە نێـو جەنگی سەر بەرزیو

شەرەفمەندی‌و کەرامەتو پاراستنی دەسەڵاتی خۆی، رەنگدانەوەیەکی راستەوراست بوو، لەتێگەیشتنی قووڵی، مەبەستی هێرشی خومەمینیەتی فارسی‌و لایەنە مێژوویی‌و پاشە رۆژانەکەی‌و هەروا هۆو مەبەستەکانی.

ئەوە بوو رۆڵەکانی سوپای دلێرمان لەگەڵ سوپای میللی، گەلێ قارەمانێتی بەرزو قوربانی‌ی لەخۆ بوردوانەی بەدرێژایی رۆژگاری ئەو جەنگە پێشکەش کرد، ئەو جەنگەی کە هێزە شەڕ خوازەکانی ویستیان درێژە بکێشێ، تامەبەستە بە دخوازەکانیان جێ‌بەجێ بکەن.

لەپێناوی لاوازو شەکەت کردنی عیراقی نوێ‌و داگیرکردنی بەڵام هێزەکانی ئێران نەیان توانی‌و ناش توانن سنوورمان بشکێنن، چونکە لە عیراقدا میللەتیك هەیە، کە درووست بوی شۆرشی 17 ـ 30ی تەموزەو رۆژ بەرۆژ زیاتر پێش دەکەوێ هێزو یەکیتی زیاتر پتەوتر دەبێ لە عیراقی صدام حسین.

ئەم جەنگەش گەلێ بەخششی بەپیتی هێناو گەلێ دەرس و عیبرەتی بە برشتی‌وای دەردا، کە کۆنە جەنگەکان بەخۆیان نەدیوەو تا زانستی عەسکەریش، بەر لەم جەنگەمان دا هاوتای نەزانیوە.

ئەو بەخشش و پەندانەش بوو بەمایەی بایەخدانێکی زۆر سەر پەرو دیاری لای سەرەك صدام، لەپەنای سەرکردایەتی کردنی رەوت وکاروانی مێژوویانەی شۆرشەکەمان و لەئەنجامی هەلسوراندنی کاروباری جەنگی رەوامان لەدژی دەستدرێژی عەجەم و ژیانی راستەوخۆیشی لەنێو رووداوو هەنگاوەکانی جەنگ و دەسگرتنی راستەو راست و رۆژانەی بەسەر راستیەکانی ئەو جەنگە..

لەپەنای بیری رووناك وزرنگانەو ئەقلی کامل و ستراتیژی‌و تێکەلبوونی گیانی بەگیانیانەی صدام حسینی شۆرەسوار، لەگەڵ ژان و هەژانی سەربازەد لێرەکانی خۆی لە کۆرەکانی جەنگا، بوو بەمایەی ئەوەی بەلێکدانەوەی وردی‌خۆی، روداوەکانی جەنگ شیتەڵ بکات و بە شێوەیەکی داهێنەرانەش پەندە بە پیتەکانی هەلبهێنجێ‌و لەپێناوی رەوتی ئەو جەنگە بەردەوامەوە لەدژی دەسدرێژی‌ی رژێمی ئیرانی بیخاتە کارو لەپالێشیا ئەو زانستیانەی بەگشت سەرکردەو فەرماندەکانی سوپای راگەیاند، کە ئەبێ لەکاتی جەنگا سوودی لێ وەربگرن و بۆ دوای برانی ئەو جەنگەی نەهێڵنەوە.

ئەم هەموو بەشداری‌یە مەزنانەی سەرەك صدام لە فیکری عەسکەری‌و لەکاری هونەرەکانی جەنگ دا پرشنگدارە لەیەشداری کردنە مەزنەکانی تری بۆ بنج داکوتانی بنەماکانی تیۆری کاری بەعسیانەو پەرەپێدانی داهێنەرانەیە بۆ فیکری حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی لەپاڵ سەرکردایەتی کردنی، بۆ کاری ئاوێتە بوونی بەردەوامی نێوان تیووری‌و پراکتیك، ئەم بەشداری کردنەش بایەخە سەرپەرو کاریگەرەکەی لەپاڵ خاسیەتەکانی خۆی‌دا هەڵئەخات،

وەك لەچەندین چارەسەری فیکری وعەمەلی‌دا کە لە نێو جەرگەی جەنگ و لەپاڵ سەرکردایەتی صدام حسینی شۆرە سوارەوە هاتوتە کایەوەو بۆتە نموونەی نویشکێکی فیکری (رادە بەرز) بۆ گشت لایەنە عەمەلی‌یەکانی، کە ئەبێتە مایەی رۆشن کردنی راستەرێگەی بەردەم سوپای دلێروگشت گەلەکەمان و لەهەمان کاتیشا دەست نیشانی گشت شێوازو هۆیە نوێ‌و باس نەکراوەکان ئەکات، بۆ روبەروو بوونی **هەموو**

ئیحتمالاتیك کەلاپەرەکانی لەمەو لای جەنگ ئەگرێتەوە، بەجۆرێ کە ئەبێتە مایەی دەسگیرکردنی بەرزترین ئەنجامێك لە کۆری جەنگ و سەرکەوتنی هەمیشەیی بەسەر فارسی دوژمن دا.

بۆیە رۆژ دوای رۆژ هەفتە دوای هەفتە مانگ دوای مانگ چوار ساڵەی جەنگی رزگاریمان تەواو کردو پێنجەمین ساڵەی جەنگیش واتەوا ودەبێت کەچی نەدەنگی تۆپ ونەگرمەی فرۆکەو نە ناڵەی گوللە، نەیتوانی تۆزقالێ لەتواناو لێهاتوویو بەرگە گرتنی ئادەمزادی عیراقی سەردەمە نوێ یەداکەم بکاتەوە.

نا بەڵکو زیاتر بەرەو ژیان پاڵی پێوە ناو هاتە مەیدانی خەبات (بەدەستێك تفەنگ و سەرکەوتنی پاراستووەو بە دەستەکەی تریشی بنیادی ژیان و پاشە رۆژدا ئەنێت لەژێر فەرماندەی سەرکردەی بلیمەت و بەتوانا تێکۆشەر صدام حسین.. دوا شەری حەوێزەش چاکترین نموونەیەکی باس لێکراومانە کە چۆن بەو پەری لەخۆ بردنەوە، مرۆڤی نوێی عیراقی روو بە رووی هێرشە نارەواکەی رژێمی گەندەڵی قوم و تاران بووەوە.

سلاوله رۆژی لەدایك بوونی سەرۆکی فەرماندە صدام حسینی قارەمان.

المصادر:

1 ـ الحكم الذاتي العدد، 2، 1984.
2 ـ (صدام حسين) هكذا نقاتل الفرس.
3 ـ التقرير السياسي للمؤتمر القطري الثامن لحزب البعث العربي الأشتراكي.

لە سایەی شۆرشی ١٧ - ٣٠ تەموزی پیرۆزدا ناوچەی کوردستان و دەزگاکانی شۆرشی ئەگەشێتەوەو بەرەو پێشەوە ئەروا



# جەژنەکانی تەمووز

- مولود سورچي -

پێشەکی :-

حەڤدە ساڵ لەمەو بەر، پاش سەدان ساڵی ئێش و ئازارو نەهامەتیو ژێر دەستی شاڵاوی بێگانە... دوای سەدان ساڵی هەڵمژینی تاڵاوی تاریکیو دواکەوتن و ئەشکەنجەو بێ هیوایی گەلی مەزنی عیراق، شۆڕشی (17 - 30)ی تەمووزی 1968، کە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست سەرکردایەتی کردو رایپەڕاندو ئازایانەو سەرکەوتوانە تەقییەوە، هاتە مەیدان و نیشانەیەکی دیاری لە مێژووی گەل و وڵات و نەتەوەی عەرەبدا دروست کرد.

شۆڕشی تەمووز، لە بارو دۆخێکی ناو خۆییو هەندەرانی سەخت و دژواردا لە دایك بوو.، دەم کوتێکی کاریگەرو رەفز کردنێکی بەهێز بوو، بۆ بارودۆخی وێران و حوکمی دیکتاتۆریو لەرێ لادان ،بۆ رزگار کردنی وڵات... بۆ یەك بوون و سەر بەستیو سۆشیالیستی.

شۆڕشی تەمووز، رێگایەکی فراوانی لە بەردەم بینای شۆڕشگێرانەی یەکێتی خوازی بەهێزی عیراقدا تەخت کرد، بۆ ئەوەی بێ بە بازوویەکی ئاسنینی زەبروەشێن و لێهاتووی هەڵگرتنی لێپرسینەوەیەکی مێژوویی ئەوتۆ بتوانێ زەمینەیەکی وا بۆ گەل بسازێنێ، خواستە سروشتیو رەواکانی خۆی بەدی بهێنێت و پێ بنێتە قۆناخی نوێی گەشاندنەوەی بوارەکانی ژیان و ژین و ئازادیو سەربەستیو سەر بەخۆی.

شۆڕشی تەمووز، باشترین بەڵگەی تێکۆشان و قوربانیدان و ئازایەتي شۆڕشگێران پیشان دەدات... ئەوە بەرچاو دەخات کەوا تێکۆشەرانی ئەم خاکە، بە هەر بارو دۆخێکی ناسك و نالەباردا تێپەڕیون، بەپێی بۆلووان و پێکران و توانای لە رادەبەدەر، سەر شۆڕیو مل کەچییان قبوڵ نەکردووەو...

هەرگیز درێغیان بە خوێنی گەش و پاکی خۆیان لە کاروانی دوورو درێژی خەبات و تێکۆشان، نەداوە...

## چاو پێخشاندنێكی مێژوویی:

بۆ ئەوەی بابەتانە سرووشت و قەوارەی بزووتنەوە سیاسییەكەی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست هەڵسەنگێنین، ئەبێ ئاورێك لە بارودۆخەكانی حزب لە عیراق و نیشتمانی عەرەبی لە ماوەی نێوان (18)ی تشرینی دووەمی (1963)و (17)ی تەمووزی (1968)دا بدەینەوە.

لە (18)ی تشرینی دووەمی (1963)دا، تاقیكردنەوەی حزب لە عیراقدا، كە جێی خواست و ئاواتەكانی حزب و جەماوەر بوو، سەری نەگرت، ئەم سەر نەگرتنەشی، سەرەڕای زیان و لە دەست چوونی ژمارەیێكی زۆری تێكۆشەرانی حزب، حزب و جەماوەرەكەی تووشی گرفتێكی دەروونیی ترسناك كرد.

هەروەها لە (23)ی شوباتی (1966)دا، كاتێ دەستەی شوباتییەكان لە سوریادا، بە كودەتایەكی عەسكەریی دژی دەسەڵاتی حزب هەڵسان، دووبارە حزب تووشی گرفتێكی ترسناكترز بوو و بۆ یەكەم جار بارێكی نالەباری تایبەتی پڕ مەترسی و گیر هاتە كایەوە، بەتایبەتی لە رووی سەپاندنی دەسەڵاتی زۆردارانە بەسەر حزب.

دوا بە دوای ئەم دوو نەهامەتیە، دوو بەرەكێیكی ترسناك، تێكرا حزبی گرتەوەو، كێشەی رێكخستنییانەو بیری توندو تیژ لە نێوان ریزەكانیدا سەری هەڵدا.

· ئەمەش گرانایێكی تایبەتی پڕ مەترسی هەبوو لەسەر لقی حزب لە عیراقدا.

بەڵام حزب لە عیراقدا، دوای حەوتەمین كۆنگرەی نەتەوەیی، كە لە شوباتی (1964)دا كە لە دیمەشق گیراو كێشەی دوو بەرەكییەكەی، لە رووی شەرعییەتی حزبیەوە، بە لایەكا خست، بەرە بەرە رووی كردە یەكبوون و یەكگرتن و . . . تێكۆشەرانی حزبیش بە توانایێكی بەرزترو بڕوایێكی قووڵترەوە، دەستیان بە هەنگاونان بەرەو پاشەڕۆژ كردەوە.

هەر چەند حزب و جەماوەرە تێكۆشەرەكەی، پاش



رووداوەکـانی (5)ی ئەیلولی (1964)، زەبـرو زەنگیـان بە دەست دەسەڵاتی (عارفی)یەوە چەشت و لە ئەنجامیدا، زیانی ڕێکخراویی و باری ماددیی و دەروونیی ناخۆش و پڕ لە دوودڵییەوە هاتـەکـایـەوە، حزب خۆی لە گەرمـەی ڕووداوەکـانـدا، بە یەکگرتنێکی زیاتر لە جارانەوە بینییەوە.

پێش ئەوەی برینـەکـانی حزب و جەمـاوەرانی شۆڕشگێـر بەتـەواوی لە کارتێکـردنی دوو بەرەکییـەکـەی یەکـەم جارو جێبـەنجـەی لێـدانـەکـەی دەسەڵاتی عارفی لە (5)ی ئەیلولدا سارێژ بێتەوە، پاشگەز بونە وەکەی (23)ی شوبات ڕوویدا کە تیـایـدا هەرچی دەسکـەوتـە ئیجابیەکانی قۆناخی پێشوو هەیە، هەمووی شێواندو، ناچار، حزب سەر لەنوێ خۆی خستەوە ناو خۆ خەریـك کردن بە کێشـەکـانی زۆرانبـازی ڕێکخـراویی و ئایدیۆلۆجیی و، ناو کۆڕی دوودڵی دەروونییەوە.

تا بەستنی کۆنگرەی بەروەخت کە لە ئەیلولی (1966)دا گیراو تیایدا سەر کردایەتییەکی نوێی قوتری هەڵبژێردرا، لەم دۆخەدا مایەوە.

بەڵام دیسـان، لە ئەنجـامی دامـەزراندنی پەیوەندی چاك لە نێوان شوباتییەکان و دەسەڵاتی عارفیی و، زیاتر هاندانی ڕژێمی عارفی بۆ دەست وەشـانـدن بەزەبـرتـر لە تێکـۆشـەرانی حزب و بەردەوام بە ئاگـاخـسـتـنـەوەی ڕژێـم، بە نیـازو چالاکـی و مەبەستەکانی حزب لەلایەن سەرکردەکانی شوباتییەکانەوە، حزب خۆی لە بارێکی گران و ئاڵۆزترەوە بینیەوە.

حزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیـالیست، لەم قۆنـاغـەدا، ڕوو بەرووی گەورەتـرین دەستـدرێـژ ی بووەوە کە لە مێژ ووی دوورو درێــژ ی پڕ لە ئەرکی گران و ترسنـاك و باری سەخت و ئاڵـۆزیـا ڕوویدابێت ئەمجارەیان پەیوەندی بە بوونی حزب و پاشەڕۆژ ی و پەیـوەنـدی بە جەمـاوەرو سەرکـردایـەتـی کردنی بزووتنـەوە شۆڕشگێرییەکەیدا، هەبوو.

پاشگەز بوونەوەی (شوباتی)، ناوی حزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیـالیسـتی لەخـۆ ناو دەستی بەسـەر حوکمـداگرت لە سوریاو چەنـد پەیمـانێکی هاوکـارانـەیی عەرەبیی و جیهـانی گرنگی بەسـت و، بەمـەش کارێکی وایکـرد، حزبی خستـە بەردەم مەسەلەی «مانەوەو بەردەوام بوون».

لە چوارچێـوەی ئەو بارانـەی باسکـران و بارودۆخی بزووتنـەوەی شۆڕشگێـریی ناو وولات و نیشتمـانی عەرەبیـدا، دوو ڕێگـا لەبەردەم حزبدا هەبوون:-

**ڕێگـای یەکـەم**: یان وازهێنـان لە بیـروبـاوەڕی دەسەڵات گرتنە دەست لەهەر هەرێمێك لەو قوناغەداو، دەستدانە بەرنامەیەك بۆ خەباتی (سلبی)یانە بۆ قۆناغێکی مێژ وویی دوورو درێژ و وادانان کە حزب و بزووتنەوەی شۆڕشی عەرەب، لە هەموو لایەنێکەوە، بە قۆناغێکی دامەزراندنی نوێدا ئەڕۆن.

**ڕێگـای دووەم**: یا خود گەڕان بەدوای شێـوازێـکی نوێـدا بۆ گۆڕینێکی شۆڕشگێڕانەو دەسەڵات- گرتنە دەسـت، لە هەر هەرێمێك بێت، مەرجەکانی باری مەوزووعیی و پێداویستییەکانی قۆنـاغی نوێ ڕەچـاو بکـات و بەهـۆی شوێنی نوێیـەوە، هەوڵی سەرکـردایـەتی کردنی بزووتنـەوەی جەماوەر بدات بەرەو ئامانجە نەتـەوەیی و کۆمـەڵایـەتییـەکـان و ، بـۆ دوویـات کردنەوەی ڕووی ڕاستی حزب و بیـروبـاوەڕو ئامـانجـەکـانی و، سەلماندنی دەورە پێشرەواکەی لە بزووتنەوەی شۆڕشی عەرەبدا.

ڕێکخراوی حزبیش لە عیراقدا، ئاشکراو بێ پێچ و پەنا ڕێگای دووەمی هەڵبژارد.

ئەم ویـست و ئیرادەیەش هەروا بەتوانا، بە درێژایی ساڵانی نێـوان (18)ی تشـرینی دووەمی (1963)و (17)ی تەمـووزی (1968) مایەوە.

تەنیا پشتبەستن بە تواناکانی حزب و بزووتنەوەی جەماوەر بۆ ڕووخـانـدنی حوکمی پاشگـەزبـووەکـەی تشـرین، - بێگومان - دواخستنی ئەرکـە سەرەکییـەکـانی شۆڕشی بۆ ماوەیـەکی دوورو درێژ، دەگەیاند . . . سەرەڕای ئەوەی دۆخی عیراق لەوەدا نەما بوو، بووەسـتـێ و چاوەڕوان بکـات. ئەمـە بێـجگـە لەوەی بزووتنـەوەی شۆڕشی عەرەبی کەوتبـووە ژێـر بارێکی گران و

ترسناکترو هەرەشەلێکراو.

لە کاتێکـدا حزب کە هەوڵی ئەوەی ئەدا پێـویستییـەکانی ڕاپەڕین و ڕووخـانـدنی دەسـەڵاتی عارفی باوو مسـوگەر بکات ،ئەبوایە ئەم لایەنانەی خوارە وەشی ساغ بکردایەوە:

(1) ـ بایـەخـدان بە هاو پەیمـانێتی تایبـەتی، بە گوێـرەی پێـویستیـە واقیعی و تەکنیکییـەکـان کە تایبـەتین بە ڕاپـەڕین و دەسەڵان گرتنەدەست

(2) ـ کۆششی دڵسۆزانەو کارکردنی بەردەوام لە چوارچێوەی بەرەیـەکـدا تا ئەتـوانـرێ هێـزی نیشتمـانی و نەتـەوەییـە پێشکەوتخوازەکان بگرێتەوە.

(3) ـ تا ئەتـوانـێ هەوڵی ئەوە بدات ،نێـوەنـد سیـاسی و عەسکـەرییـەکـان لە زۆرانبـازی نێوانی و دەسەڵاتی عارفی ،بێ لایەن بکات.

سەرکـردایـەتی قوتـری، وە بەگـوێرەی نەخشەیەکی زانستی و تەکنیکییـەوە، توانی ئەو لایـەنـانـەی سەرەوە بهێنێتـە دی و لە بەرەبـەیـانـی ڕۆژی (16)ی تەمـووزی (1968)دا لە ماڵـی ئەمیـنداری نهێنی سەرکـردایـەتیی قوتـری کۆبێتەوەو چاو بە دوا شێـوەی نەخشـەی ڕاپـەڕینـە چەکدارانەکە بخشێنێتەوەو سەعات سێـی بەرەبـەیـانـی (17)ی تەمـووزی (1968)، بە کاتـی ڕاپەڕاندنی شۆڕش دابنێ.

بەم جۆرە ،تێکۆشەرانی حزب، ئازاو دلێرانەو بە ئیرادەیێکی پۆ لایین و چاونـە ترسـەوە، میللەتی عیـراقیـان لە زەبـروزەنگی دەسەڵاتی عارفی ڕزگار کردو، لە نێوان سەعات سێ بەرەبەیانی ڕۆژی (17)و سەعـات سێـی پاش نیـوەڕۆی ڕۆژی (30)ی تەمـووزەوە ،کـۆتـایی بە هەمـوو شتێکـەوە هات و دەسـەڵاتی میللەت کەوتە دەست میللەتەوە[1].

## چارە سەرکردنی بارو دۆخ: . . .

شۆڕشی تەمووز، هەر لە ڕۆژانی یەکەمی سەرکەوتنەکەیدا، وە بەگـوێـرەی تیـۆرییـە زانستی و شۆڕشگێڕییەکەیەوە، ووردو چاونە ترسـانـە، دەسـتی بە چارە سەرکـردنی بارو دۆخی سیـاسی و ئابـووری و کۆمـەڵایـەتی و ڕۆشنبیـرییـەوە کرد، بۆ ئەوەی ئیتـر دەرفـەت و بواری ئیمپـریـالی و کۆنـە پەرست و پیـلانگێـران باو نەبێت، جارێکی تر یاری بە وولات و میللەت و سامانی گەل بکەنەوە.

لە ڕووی سەر بەخۆیی سیاسییەوە، شۆڕشی (17 ـ 30)ی تەمـووز، دەستی دایـە پاککـردنـەوەی بنەڕەتی تۆڕە سیخوڕیی و بەکـرێگیـراوەکـان و ڕزگـار کردنی ئیـرادەی نیشتمـانی لە هەموو کۆتێك، ئینجا «بنیاتنانی دەسەڵاتدارییەکی ناوەندیی نیشتمانی بەهێز».

لایـەنی بیـری و ڕۆشنبیرییش، بایەخێکی بنچینەیی هەبوو لە پتـەوکـردنی سەر بەخـۆی سیاسیدا، چونکی گەر میللەت ڕزگار نەبێ لە زەبری کار تێکردنی فیکری و ڕۆشنبیریی بێگانە، لە پاشە ڕۆژدا، بەشێکیان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆوە هەر لە ژێـر ئەم کارتێکـردنـانـە ئەمێننـەوەو ئەمـەش بارێکی گران و ژەهرێکی مێشك خۆرە.

لەبـەر ئەمـە، شۆڕش زوو داوای ڕۆشنبیـرکردنی تێکرا گەل و ،لاوان بەتایبەتی ،کرد، ڕۆشنبیرێکی نەتەوەیی و سۆشیالیستی و دیموکراتیانە، بۆ ئەوەی ببێتە قەڵایەکی سەخت دژی ئەو تێزرو تەوژمە فیکری و ڕۆشنبیرییە بێگانانەی ،لەگەڵ ئامانجە نەتەوەیی و مرۆڤایەتییەکانماندا ناگونجێن.

بەم جۆرەبـە پتـەوکـردنـی دەسـەڵاتـداریـتـی شۆڕش و سەرکـردایـەتی کـردنی لە لایـەن حزبـەوە ، سەرکـردایـەتییێکی نیشتمـانیـانـەی توونـدو تۆڵ، ناوەرۆکێکی ڕاستـەقینـەی بە سەر بەخـۆی سیـاسی بەخشی و، بەسـەر دەزگاکانی دەوڵەت و دەستە جۆر بەجۆرەکانیدا سەپاند، کە لە هەڵوێستی خواستی نیشتمانی سەر بەستانەوە ،بەرژەوەندییە نیشتمانی و نەتەوەییەکانەوە، ڕەفتار بکەن.[2]

لە ڕووی سەر بەخۆیی ئابووریشەوە، شۆڕش ڕوو بەڕووی

ئەركی دوو شەڕ بووەوە ،كە شەڕی بەرهەم هێنانی نیشتمانیانەی نەوت و شەڕی بەرهەم هێنانی نیشتمانیانەی گۆگرد بوو، سەرەنجام، توانی خەونی گەلی عیراق و هەموو پێشکەوتووخوازانی جیهانی وەدی بهێنێ لەو کاتەی کە زەبری کاریگەری لە کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکانی نەوتی ئیمپریالی وەشاند، کە یارییان بە سامانەکانی گەلی عیراق دەکرد بەدرێژایی دەیان ساڵ.

شۆڕش یاسای ژمارە (80)ی ساڵی (1961)ی هێشتەوەو لە تەمووزی ساڵی (1969)دا نەوت بەشێوەیەکی نیشتمانی بەرهەم هێنزاو لە (1973/10/21)و (1973/12/20)، بەشی هۆڵەندەو پورتەغال، یەك لە دوای یەك خۆماڵی کرا پاشان بەشی بەریتانیاو فەرەنسا لە کۆمپانیای نەوتی بەسرادا لە 1975/12/8 خۆماڵی کرا... وە لە یەکی مانگی حوزەیرانی (1977) کۆمپانیای نەوتی عیراق خۆماڵی کرا.

بە گەڕانەوەی ئەم سامانە مەزن و سەرەکییە، شۆڕش نەخشەی گەشەی تەقینەری کێشاو دەستی دایە پیشە سازی کردنی وڵات و کردنی عیراق بە دەوڵەتێکی پێشکەوتوو لە پیشە سازییدا. (3)

نەخشەکێشان و ... پەرەپێدانی نەتەوەیی:

شۆڕشی 17 ـ 30ی تەمووز، هەر لە ڕۆژانی یەکەمی سەرکەوتنیدا، بایەخێکی تایبەتی و راستەوخۆی دا بە نەخشەکێشان و بەرنامەکانی پەرەپێدان، بە رادەیەك توانیان، پاش ماوەیەکی کەم، دەوری مەزنی خۆیان لە گەشەپێدان و ڕێگای گۆڕانکاری سۆشیالیستیانەدا ببینن.

شۆڕش لە رەگ ڕشتنی ستراتیجی گەشەپێداندا، پشتی بەسێ لای سەرەکی بەستبوو:

یەکەمیان: لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و مەوزووعییانەی بارودۆخی سیاسەتی ئابووریی سەردەمە گۆڕکراوەکانی پێشوو دۆزینەوەی کەلەبەرو کۆسپەکانی بەردەم گەشەپێدان و دەستنیشانکردنی داهاتی ئابووری، لە وڵاتدا.

دووەمیشیان بنیاتنانی ئابوورییەکی پەرەسەندووی پتەو، ئامانجی حزب و گەل بهێنێتەدی.

سێیەم: رزگار کردنی ئابووری و داهاتی عیراق بە تەواوی، لە هەموو شێوەکانی پاشکۆیەتی بێگانە.

بەم تێروانینە زانستییانە، وە لە ئەنجامی کۆششکردن بۆ پەرەپێدانی توانای بەرهەم هێنان و پێشخستنی بەرهەمکاری ئیشکردن و وەگەڕخستنی هەموو تواناو تەکنیکییە نوێکان بۆ بنیاتنانی ئابووری نیشتمانی و پەرەسەندنی خێراو هاوسەنگ بۆ مسۆگەر کردنی کۆڵەکەی گەشە کردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی میللەت... سەرەرای پێکەوە بەستنەوەی سیاسەتی بەرهەم هێنان و پاشەکەوت کردن و سیاسەتی بەکاربردن و پێداویستییەکانی گەشە کردن، حزب توانی شۆڕشێکی تەقینەرانەی پەرەپێدان و راپەڕینی و وڵات بەرەو «عیراقی نوێ»بەرێت.

## تایبەتییەتی شۆڕش و نیشانە دیارییەکان:

گومان لەوەدانییە، کە شۆڕشی (17 ـ 30)ی تەمووز، سەبارەت بە نیشانە بنەرەتییەکانی و راستییە دیارییەکانی، وەك تاقیکردنەوەیەکی شۆڕشگێرانەی رێبەر لە نیشتمانی عەرەبی و لە جیهانی سێیەمدا، لە مەسەلە ناوەندییە گرنگەکانی لە رێرەوی درێژ و دژواریداو لە خەباتیدا دژی دیاردەکانی دواکەوتن و لە پێناوی هێنانەدی پێویستییەکانی گۆڕانکارییە نیشتمانی و دیموکراتییەکانی، بەرەو گەیشتن بە دامەزرانی سۆشیالستی، تایبەتیەتێکی دیاری وەرگرتووە.

گرنگترین تایبەتیەتێکی بنەرەتی، کە شۆڕشی وڵاتەکەمانی لە تاقیکردنەوە نیشتمانییەکانی نیشتمانی عەرەبی و جیهانی سێیەم پێ جوێ دەبێتەوە، ئەوەیە کە بەردەوامەو لە سنووری جێبەجێکردنی چەند بەرنامەیەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی قۆناغیدا ناگیرسێتەوە، بەڵکو توانایەکی فراوانی هەیە بۆ تازە

کردنەوە بەرنامەکان و بەردەوام بوونیان بە جۆرێك لەگەڵ ئامانجە ستراتیجیەکانی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی رابەری شۆرشدا، بگونجێت بەڵێ هەندێ جار دەبینین شۆرشەکەمان لە هێنانەدی ئامانجەکانیدا، لە قۆناغێکی تایبەتیدا، لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی خەڵکی تردا لەیەك دەچن، بەڵام ئەوەندەی پێ ناچێت، کە ئەو تاقیکردنەوانە لە سنوورێکی تایبەتیدا رادەوەستن و لەکار دەکەون کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو تاقیکردنەوانە رێبازی شۆرشگێریو بەردەوامی نەمێنێو بەرەودوا پاشگەز بێتەوە، ئامانجەکانی نەهێنێتەدیو لە رێگای شۆرشگێری لادات و ببێتە هۆی چەو سانەوەو سەر کوتانەوەی جەماوەری گەل و هێزە شۆرشگێرەکانی.

واتە: ئەو تاقیکردنەوە نیشتمانی یانە نەیانتوانی لە سەر رێبازی خۆیان بەردەوام بن، چونکە لەسەر بیروایەکی رامیاریی کەم و کورتی ئاسۆتەسك دا لە سنوورێکی تایبەتیدا رادەوەستن و، ئاسۆی ستراتیجی پان و بەرینیان نیە.

بەڵام شۆرشی تەمووز لە سنوورێکی تایبەتیدا رانەوەستاو بەردەوامەو هەموو رۆژێ لە تازەبوونەوە دایەو، رێگەی خۆی گرتووەتە بەرو بەگەرمیو بێ کۆڵنەدان لەلایەکەوە خەریکی جێبەجێکردن و هێنانەدیی بەرنامە سیاسیو ئابووریو کۆمەلایەتیو رۆشنبیرییەکانیەتیو، لە لایەکی ترەوە، ئەم جێبەجێکردنە بە چۆنیەتی پاشە رۆژی گۆرانکاریی شۆرشەوە دەبەستێتەوە.

شتێکی بەڵگە نەویستە کە شۆرشی 17 ـ 30ی تەمووز بە قۆناغێکی کاریگەردا، تێدەپەرێ، ئەویش قۆناغی ئازادی دیموکراتی شۆرشگێریی و دامەزرانی سەرەتای گۆرانی سۆشیالستییە، لەبەر ئەمە دەبینین شۆرش بە رێگایەکی گران و سەخت دا دەروات و چەند راستییەکی تازەی لە نێو ولاتدا لەسەر خاکی واقیعی گۆراو دروست کردو، لەهەمان کاتدا هەوڵیدا کات کورت بکاتەوەو، بناغەی پاشە رۆژی گەشەدارتر دارێژێت، کە ئەمەش رێگای بۆ خۆش دەکات بگاتە قافڵەی گۆرانکاریی تازەی ئادەمیزادو دروستکردنی رۆژگارێکی تازەی گۆراو.

هەروەها، لەگەڵ بوونی دیاردەکانی پاشگەز بوونەوەو خۆ بە دەستە وەدانیش لە ناوچەی عەرەبیدا، شۆرش خۆی لە ریزی پێشەوەی بەرگریو بەگژداچووندا دانا دژی دوژمنە مێژووییەکانمان لە ئیستعمارو زایۆنیزم و کۆنە پەرستییە. ١

حیساب و لێکدانەوەکانی شۆرش و دەستنیشان کردنە تەواوەکانی لەبەر رووناکی بیروباوەری داهێنەردا دەرۆن و رێبازی شۆرشگێریان گرتوەتە بەر هەر لەبەر ئەمە بوو لەماوەی ساڵانی رێرەوە سەرکەو تووەکەیدا لە سنووری شۆرشەکانی تر تێپەرێو دەرکەت کە شۆرشێکی تازەو تازە کەرەوەیەو هەموو رۆژێ بە بیرو بەکردەوە وڵامی گەلێك پرسیاری گەورەو گیرو گرفتی بنەرەتی دەداتەوە. . . لەگەڵ ئەوەشدا کە رۆژانە روو بەرووی نەخۆشییەکان و پاشماوە جۆر بەجۆرەکانی کۆمەڵەکەمان دەوەستێ لە هەموو مەیدانێکدا چ سیاسیو ئابووریو کۆمەلایەتی یا رۆشنبیریو کارگێری.

شۆرشی تەمووز، لە رێرەوی تایبەتیی خۆیدا. خۆی لە رێگەی وەڵامدانەوەی ئامادەو تەقلیدی لاداو، رێگایەکی تازەی دروستکەرو داهێنەری گرتە بەر کە بناغەکەی زانست و رەنگ رێژانەو، کێشانەو تەرازووی لێهاتن و دەست پێشخەریو دڵسۆزی یەو ئەوەی ئەیبەخشێ تاقیکردنەوەیە، نەك بەشێوەی هەڵەو راست، بەڵکو لەسەر بناغەی تێگەیشتنێکی تەواو کە تاقیکردنە وەکە دەوڵەمەندو خەست و قوولتر بکات و نەکەوێتە هەڵەوەو بە هەموو جۆرێك و لەهەموو لاو پایەیەکدا پێشکەوتن بهێنێتە دی.

شۆرشی 17ی تەمووز، لە بارو دۆخێکی ناوخۆیو زۆرگران و دژ وارداو، لە دۆخێکی تایبەتیی نەتەوەییو هەندەرانی لەدایك بوو 1000 بارو دۆخی پاش شکستیەکەی حوزەیران و تونـدبوونی هێرشی ئیستعماریو ئیمپریالیزمی لەسەر جیهانی سێیەم و بەتین بوونی هێرشی زایۆنیزم لەسەر هەموو نیشتمانی

عەرەب . . .

ئا لەم بارو دۆخە تایبەتییەدا ، لەسەر شۆڕشی تەمووز بوو کە زۆر بە دامەزراوی‌و باوەڕ بەخۆییەوە، ڕێڕەوی شۆڕشی پێشکەو تنخوازی سۆشیالیستی‌و دیموکراتی‌و سەر بەخۆیی سیاسی بە مانای شۆڕشگێڕیی تازە جێبەجێ بکات و، سەبارەت بە مەیدانی نەتەوەییش لە پێش هەموو پێویستیەکان سەرشانی شۆڕش پێویست ئەوە بوو کە هێزەکانی عەرەب بۆ بەرەنگاریی سوێنخواریی ئیستعمارو زایۆنیزم و کۆنەپەرستی، کۆ و ئامادە بکات.

بێگومان ئەمەی ووتمان ، کە بارودۆخی لە دایك بوونی شۆڕش بێت و . . . ئەوەش پێویستەکانی سەرشانی بێت ، مەترسی‌یە چاوەڕوان کراوەکان گەورەو گیروگرفتەکانی بەیەکاچوو دەبن و، کە پێویستیەکانی گرنگ و بارودۆخی دژوار بێت، ئەوەی کارە نیشتمانی‌یە نەتەوەکان جێبەجێ دەکات دەبێ چاوەڕوانی (رد فعل) بێت لە هێزەکان و کۆمپانیا دوژمنەکان کە تەماعیان کردۆتە سامانی وڵات و چاویان تێ‌بڕیوە.

[جێ‌بەجێ کراوەکانی] بەم جۆرە، روون دەبێتەوە، کە تابلۆی هەنگاوو کارە شۆڕشگێڕی‌یەکان لەماوەی ڕێڕەوی ساڵانی شۆڕشدا توانایەکی باڵای دەرخست لە گواستنەوەی بیرو باوەڕ بۆ مەیدانی کردەوە لە چوارچێوەی گونجایشی نێوان بیرو باوەڕو پێویستیەکان بەکار چوارچێوەی گونجایشی نێوان بیرو باوەڕو پێویستیەکانی بەکار هێنانی‌و مەرجەکانی قوناغ و نیشانەکانی تێگرای بارودۆخ.

کەواتە، ڕێگای شۆڕش مەبدەئەو واقیع، زانیاری‌یەو شۆڕشگێڕی . . . ڕێگای قۆناغە دروست کەرە بەرەو پێش چووەکانەو، هەموو چوارچێوەو شێوەیەکی خۆ بەدەستەوەدان دەداتە دواوە کە لەگەڵ لێکۆڵینەوەو تایبەتیەکانی واقیع و بزوتنەوەی کۆمەڵ و مێژووماندا نەگونجێت . . . ئامانجی ئەوەیە واقیعی دواکەوتوو تەواو بروخێ‌و نەمێنێ‌و پایەکانی کۆمەڵگای تازەو پێشکەوتووی ئەمڕۆ بابەت لەسەر بناغەیەکی بیری ساغ و سەلیمی وەها دامەزرێنێ کە بتوانێ لە بزوتنەوەی کۆمەڵ بگات و، لە ڕێڕەوێکی دیارکراوی کاریگەری تایبەتیدا، کارە گرنگەکانی ئێستەو لەمەو پاش جێبەجێ بکات و گۆڕانکاریە سۆشیالیستیەکان بهێنێتە دی، وەك تاقیکردنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی رابەر لە نیشتمانی عەرەب و جیهانی سێ‌یەمدا[4] .

## ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەی کوردستان :

هەر لە سەرە تاوە شۆڕشی (17 ـ 30)ی تەمووز ، بە خەباتی بێوچانی ڕۆژانەی‌و لەبە ڕۆشناریی نەخشەیەکی وردو زانستانەدا، رووی کردە ئالۆزترین مەسەلەیەکی هەڵایساوی نێو عیراق ـ مەسەلەی کورد ـ.

دەربارەی مەسەلەی کوردو روانینی حزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیالست و هەوڵدانی بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە، چارە سەرکردنێکی ئاشتی‌و دیموکراتیانە، ئەبێ سەرەنجی ئەم سێ خاڵانەی خوارەوە بدەین کە لە راپۆرتی سیاسی سەر بەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی حزب دا دیاری کراوان ئەمانەن:

یەکەم : بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، سەرەڕای هەندێ نارێکی مێژوویی کە تووشی بووەو هەندێ ئیتیجاهاتی دوورە پەرێزی‌و کۆنە پەرستانە کە هەندێکیان پەیوەندی ئاشکرایان لەگەڵ دەزگاکانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستاندا بەستبوو، سەرەڕای ئەمانە هەمووی، هێشتا بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عیراقدا لە ناوەڕۆك و بنەڕەتداو لە چوارچێوەی داواکردنی مافە رەواکانی گەلی کورددا و لە چوارچێوەی کۆماری عیراقداو، کە ئۆتۆنۆمی لە سەرووی هەموو یانەوەیە، بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی مەبدەئی‌و واقیعی‌یەو، لەم سنوورەدا بە بەشێکی بنەڕەتی بزووتنەوەی نیشتمانی عیراق دەژمێردرێ.

دووەم : حزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیست، حزبێکی نەتەوەیی‌و ئینسانی‌و سۆشیالیستی‌و خاوەن بیروڕایەکی

ديموكراتيانەيە، بۆيە شتێكى ئاساييە كە لە ناوەرۆكى مافى رەواى جەماوەرى كورد بگات و خەبات لە پێناوى جێبەجێكردنى و مسۆگەركردنى بكات و، لەبەر ئەوەى لە (17 ـ 30)ى تەمووزى ساڵى (1968)ەوە حزب فەرمانرەوايى و دەسەڵاتدارێتى شۆرشگێرى لە وڵاتدا دەكات، بۆيە لێپرسينەوەى سەرەكى مسۆگەركردنى مافەرەواكانى گەلى كوردى كەوتۆتە سەرشان ،بەپێى رێو شوێنى دەستوورى و ياسايى و جێبە جێكردن.

سێيەم: ئەو پرۆگرامە چەسپاو سەرەكييەى حزبى بەعسى عەرەبيى سۆشياليست رەچاوى دەكا بۆ جێبە جێكردنى ئەو مافانەو مسۆگەر كردنيان، بەرنامەيەكى ئاشتيخوازانەو ديموكراتيانەيە بەهاوكارى دڵسۆزانەو ئيجابيانە لەگەڵ هێزە خێرخوازو نيشتمان پەروەرو پێشكەو تنخوازەكانى نێوان كۆمەڵانى گەلى كوردو لە چوارچێوەى كارى نيشتمانى هاوبەش كە لەبەرەى نيشتمانى و نەتەوەيى پێشكەو تنخوازدا خۆى دەنوێنێ.»[5]

لەبەر ئەم بايەخ و گرنگە پێدانە ،حزبى بەعسى ،زوو ويستى ئەم مەسەلەيە چارەسەر بكات و چوارچێوەو دارشتنێكى تيۆرى و پراكتيكى واى بۆ گەڵاڵە بكات لەگەڵ ئاواتە نەتەوايەتييەكانى كوردو يەكگرتوويى وڵات و يەكگرتوويى بزووتنەوەى نيشتمانى و پێشكەو تنخوازيدا بگونجێ.

بەمجۆرە، بەياننامەى (11)ى ئادارى ساڵى (1970)ى مێژوويى، وەك چوارچێوەيەكى راست و دروستى چارە سەركردنى ئاشتى و ديموكراتيانەى مەسەلەى كورد، بانگى بۆ راهێلرا.. بەمەيش: پەيوەندى برايانەى هەردوو گەلى كوردو عەرەب، خرايە مەودايەكى باشترو خەباتى هاوكۆيان رەگاژۆتر كراو گەلى قارەمانى كورديش، لە دەرەتانى مێژووى هاوچەرخى خۆيدا، هەنگاوێكى گەورەى بەرەو پێشەوە هەڵێناو، جۆرەها هيواو ئامانج و دووربينى و، چەشنە خەباتێكى تر هاتە كۆرى سياسەتى سەرجە ئەم گەلەوە، بەتايبەتى دواى جاردانى ياساى ئۆتۆنۆمى كوردستان و دامەزراندنى هەردوو ئەنجومەنى ياسادانان و راپەراندن و..

دەيان دەسكەوتى ترى مەزن كە ئەم ناوچەيە بەخۆيەوە بينى[6]

دوژمنان، هەميشە هەوڵيان داوەو دەدەن، كە رەنجە دڵسۆزەكانى شۆرش لەم ناوچەيەدا پەك بخەن و كۆسپ بێننە رێگەى و، هەوڵ دەدەن ئەم ناوچەيە بگەرێننەوە بارودۆخى جارانى بەڵام ئەم جۆرە بيروباوەرە، ئەمرۆ لەهيچ سووچێكى ناوچەكەدا جێى نابێتەوەو، ئەو رەنجە دڵسۆزەى حزب و شۆرش دايان ،سەوز بووو هاتە بەرو، بيروباوەرى رەسەن لە قووڵايى گەلدا بنجى داخت و ريشەى داكوتاوەو، لە سەركردايەتيە مێژووييەكەى دوور ناكەوێتەوەو، بەرەى نيشتمانى و نەتەوەييە پێشكەوتنخوازەكەى دەپارێزێو ،ئامادەيە پارێزگاريى لەو مافانە بكات كە دەستى كەوتووە، دەسكەوتە نيشتمانييەكانى تر لەگەڵ جەماوەرى گەلدا بپارێزێ.[7]

## يەكيەتى نيشتمانى و... مەبەست:

مێژوو واى ويست كە لە سەر خاكى ئەم عيراقەدا، عەرەب و كوردو توركمان و خەڵكى تر پێكەوە بژين و بە هەموويانەوە گەلێكى يەكگرتوو پێك بهێنن كە گەلى عيراقە.

ئەم خواستەى مێژوو، دەربرينێكە لە گيانى مرۆڤايەتى و پێكەوەژيانى برايانەى هاوبەش. ئەم جۆرە پێكەوە ژيانە تايبەتيە، شتێك نيە تەنها لە عيراقى ئێمەدا هەبێت، بەڵكو زۆربەى وڵاتانى جيهان، لەم جۆرە ژيانەدا هاوبەشن و، بە دەگمەن هەيە، نيشتمانێك هەبێ تەنها نەتەوەيەكى تێدابژيت، يان تەنها ئايينێكى تێدا باو بێت.

بە پێى پێويستى ئەم ژيانە نەتەوەيى و ئايينييەو لە پێناوى پێكەوەژيانى مرۆڤايەتى و پاراستنى بەرژەوەندو ئامانجى هاوبەش ،رۆڵەكانى گەلى عيراق هەميشە هەوڵيان داوەو دەدەن كە پارێزگارى نيشتمانەكەيان بكەن و هەردەم ئامادەن بۆ بەرزكردنەوەى



لە سایەی شۆڕشی ١٧ - ٣٠ تەمووزی پیرۆزدا
دەستکەوتەکانی گەلی کورد جێگیرتروو ..
زۆرتر ئەبێ

ڕێزو شوێن و پایەو ناوی ئەم وڵاتە.

ڕادەی سەرکەوتنیش لە پێکەوە ژیانی برایانەو پاراستنی خواست و ئامانج و ویستی هاوبەش، بەندە بە ڕادەی یەکبوون و یەکگرتن و یەکیەتیی نیشتمانی جا ئەرکی پێکهێنانی بەرەی پێشکەوتنخواز، لە گرنگترین و بایەخدارترین ئەرکەکان بوو کە حزبی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیست، لە یەکەمین ڕۆژانی شۆڕشەوە، بیری لێ کردەوەو بە پێی تیوورە شۆڕشگێرییەکەی، پێکهێنانی ئەم بەرەیەی بە پێویست زانیو، بۆ یەکبوون و یەکگرتنی ڕۆڵەکانی وڵات و لێپرسینەوەو خواست و ئامانج و ئەرکی هاوبەش، هەر ئەبێ ئەم بەرەیە پێك بهێنرێو یەکیەتی نیشتمانی بهێنرێتە دی.[8]

شۆڕش ئەوەی زانی کە دارشتنی بینای یەکیەتی نیشتمانی، لە سەر بناغەی جێبەجێکردنی سەربەخۆیی ئابووریو سیاسیو ڕزگاربوونی کۆمەڵایەتیو، فراوان کردنی سنووری سەربەستیو دیموکراتیو دانی مافی نەتەوەییو ڕۆشنبیرییو مافە ڕەواکانی تری گەلی ء کوردو برا کەمایەتیەکان، دادەمەزرێت.

ئەوەبوو، شۆڕش دەستی کرد بە بیناکردنی یەکیەتی نیشتمانی گەل و، دەستی دایە کۆمەڵێك بریارو کاری شۆڕشگێرانە بە نیازی پتەوکردن و زیندە ڕەگ داکوتاندنی ئەم کارە شۆڕشگێرییە، پاش ئەوەی کە پایەو بنەرەتەکانی سەربەخۆییو سەربەستیی نیشتمانی دارشت و سامانی سروشتی وڵاتی بۆ گەل گەراندەوەو، بەرەی نیشتمانیو نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی بەرپاکردو، ئۆتۆنۆمی بە گەلی کورداو بناغەی دیموکراتیەتی دانا، توانی بەم جۆرە یەکیەتیی نیشتمانیمان بکاتە قەڵایەکی بەرزو، گشت هاوڵاتییەکی دڵسۆزیش هەست بە سەربەرزیی وڵات و نیشتمان بکات و پێکەوە دەست لە ناو دەست یەك دڵ و دەروون و یەك بیروباوەر، گشت توانای بخاتە کار بۆ پتەوکردنی یەکیەتیی نیشتمانی.. بۆ سەربەستیو سەربەخۆیو سەربەرزیی وڵات.. بۆ پاراستنی وڵات و پەرەپێدان و پەرەسەندنی عیراق و، زیاتر پێشخستنی عیراقی نوێو هاوڵاتی نوێ.[9]

## سەرەنجێکی دەسکەوتەکان و... بینای عیراقی نوێ..

شۆڕشی تەمووز، هەر لە سەرتاوە، خۆی بە چوارچێوەیەکی تەسك و ووشك نەبەستەوە، بە شێوازی دوور لە قەناعەت و ڕەزامەندی گەل، سەودای لەگەڵ ژیان و گیروگرفتە زۆرەکان نەکرد بەڵکو بە گوێرەی ئەو نەخشەو بەرنامەیە زیندووو شۆڕشگێرییەی هەڵی بژارد، ویستی لە مەیدانی دارشتنی فیکریو تیوری ساغ و واقیعیو هەست پێکراو، ئینجا تەتبیقێکی هاوسەنگ و بەهرەدارانتە، شۆڕشی ڕاستەقینەی پێشکەوتن و گەشەسەندنی بەدی بهێنێت.

ئەرکی بەدیهێنانی چارەسەرکردنێکی بنەڕەتیو ڕیشەی کشتوکاڵ لە لادێکانی عیراقدا، لە ئەرکە هەرە گەورەکان بوو شۆڕش ڕووی تێکردو، زۆر بە پێویستی زانی یاسا کۆنەکانی چارەسەرکردنی کشتوکاڵ، کە لە ساڵی (1958)دا دەرچودبوون، ڕاست بکرێنەوە.

ئەم ڕاستکردنەوانەش، لە ئاياری (1969)دا دەرچوون و، بژاردنەوەی دەرەبەگاکان و ئەوەی لە یاسا کۆنەکەدا بە (مان)ی دەرەبەگ لە هەڵبژاردنی زەویدا ناو ئەبرا هەڵوەشایەوەو زەویو زار بە خۆڕایی بە سەر جوتیارە ڕەش و ڕووتەکان دابەشکرا.

ئەنجا شۆڕش یاسای نوێی چارەسەرکردنی کشتوکالیی ژمارە (117)ی ساڵی (1970)و، لە پاشان یاسای ژمارە (90)ی تایبەت بە سنووردانی موڵکیەتی کشتوکاڵی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی، دەرکردن، کە ڕادەی بەرزی موڵکایەتی هاتە خوارەوەو ڕێبازی نوێی تیدا دانا بۆ دابەشکردنی زەوی کە زیاتر لەگەڵ بەرهەم هێنانی کشتوکاڵ و پێداویستیەکانیدا بگونجێو، زیاتریش مافی جوتیارە ڕەنجدەرەکان زامن بکات شۆڕش بایەخێکی زۆر

گرنگی بە لادێکانی وڵات داوە...
بە تایبەتی لە بواری کەمکردنەوەی جیاوازی نێوان شارو دێهات

بێگومان ئەمەش لە ڕێگای پێشکەشکردنی چەشنەها خزمەتگوزاریەوە وەك کردنەوەی ڕێگاو بان و گەیاندنی ئاوی پاکی خواردنەوەو کارەباو کردنەوەی نەخۆشخانەو قوتابخانە... سەرەڕای راپەڕاندنی سەدان پرۆژەی کشتوکاڵی وەك: پرۆژەکانی ئاودان و بەراوکردن و پردو بەستەڵەك و...

کردنەوەی کارگەی کشتوکاڵی و پرۆژەی بەرهەم هێنانی ئاژەڵی و کشتوکاڵی و دابەشکردنی ئامێرو ماشین و پەینی کیمیایی و جۆرەها خزمەتگوازی تر.

بێگومان ئەم بەخشندەو کردەوە چاکانەی شۆڕش، بۆ دابینکردنی دوو ئامانجی سەرەکی بوو:

یەکەمیان: زاڵبوون بە سەر دیاردەو شێوەکانی چەوساندنەوە، بەرا دەیەك لە سەردەمی شۆڕشی (17 - 30)ی تەمووزەوە جووتیارمان بۆ یەکەم جار بوو بە گەورەی خۆی و خاوەن موڵك و لە لایەن دەوڵەتەوە، راستەو خۆ چاودێری لێکرا.

دووەمیشیان:

بۆ پەرەسەندن و پێشخستنی دێهات و بەرزبوونەوەی پلەی ژیارو ژیان و گوزەرانی خێزانی لادێ و نەهێشتنی بێکاری و بڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری لە نێوان ریزەکاندا.

لە پێناوی دروستکردنی شۆڕشی پێشکەوتنخوازی سۆشیالیستیدا، شۆڕش زۆر بە توندی و هێزەوە بەرپەرچی هەموو ئەو شێوە کۆنانەی دایەوە کە وڵات بۆ دواوە دەبەن... لە نۆکەرانی داو، دژی پیلانی کۆمپانیا بێگانەکان وەستاو بریاری خۆماڵی کردنی نەوتی دەکردو گۆگردی هێنایە بەرهەم و، پەیوەندی نوێی لە نێوان هێزە نیشتمانی و نەتەوایەتی یەکانی عیراقدا دروست کردو، بەم جۆرە بەرەی نیشتمانی هێنایە کایەوەو، مەسەلەی کوردمانی چارەسەرکردو حوکمی زاتی بۆ ناوچەی کوردستان هاتەدی...

هەموو ئەو دەسکەوتە مەزنانە، ڕێگایان بۆ ئەوە خۆش کرد کە بیروباوەڕی دیموکراتییانەی جەماوەری لە چوارچێوەی واقیعدا جێبەجێ بکرێ.

ئەمەش قۆناغێکی تازەی پێشکەوتووی ژیانە لە وڵاتەکەماندا، لە سایەی تایبەتی ڕێبازو ڕێرەوو ئامانجەکانی شۆڕشی 17ی تەمووزدا هاتۆتە دی کە لە سەر بیروباوەڕو مەبدەئە ئایدیۆلۆجیەکانی حزبی سەرکردە - حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و پاڵەوانی رابەرو لێهاتوو، سەرەك صدام حسین، دەڕوات.[15]

چاوپێخشاندنێکی مەوزووعیانە لە ماوەی ساڵانی تەمەنی شۆڕش، ئەوەمان بۆ دەردەخات و دەسەلمێنێ کەوا شۆڕش، نەك هەر لە قەبارەدا پێشکەوتووەو پێگەیوە، بەڵکو لە چەشن و ناوەڕۆکیشدا، لە سەر پێشکەوتن و پەرەپێدان بەردەوامە وەك شۆڕشێکیش لە ئەنجامدانی بەرنامە شۆڕشگێرییەکەیدا هەر بەردەوامە بۆ بنیاتنانی تاقیکردنەوەیەکی نموونەیی لە ڕێرەوی چوارچێوەی چەسپاندنی ئاسوودەری یەکگرتنی تەواو لە نێوان بیروباوەڕو پێویستیەکان و جێبەجێکردنی هەلەو مەرجی قۆناغ و بارو دۆخی خودی و مەوزووعیەوە. شۆڕش، لە ماوەی ساڵانی رابردوویدا سەدان هەنگاوی مەزن و گورجی لە ڕێگای بنیاتنانی کۆمەڵی نوێدا ناوە.

دامەزراندنی سەدان پرۆژەی کشتوکاڵی و کردنیان بە بنکەیەکی پتەو بۆ پەرەپێدانی پیشەسازی وڵات و، تێکرا بۆ گەشەسەندنی بەرنامەکانی پەرەپێدان و کردنەوەی ئاسۆگەی فراوان لە بەردەم پێگەیشتن و کامڵ بوونی ئابووری وڵات...

ئینجا پرۆژەکانی تری رۆشنبیری‌و خوێندنی بە خۆرایی‌و قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری‌و خوێندنی ئیلزامی‌و فراوان کردن و کردنەوەی دەزگاو کۆمەڵە رۆشنبیری‌و هونەرییەکان و دەرکردنی دەیان یاسای تری رۆشنبیری ئەوتۆ کە دەوری مەزن دەگێرن لە چەسپاندنی بیری راستەقینەی شۆرش و ئامادکردنی مرۆڤی نوێ...

دەیان پرۆژەو بریارو یاسای کۆمەڵایەتی بۆ خزمەتی میللەتی عیراق و خۆشگوزەرانی خەڵك و ژیارو ژیانی شادی‌و بەختەوەری گەل.

ئەمەو، سەرەرای سەدان دەسکەوتی تری مەزن مەزن لە بوارەکانی تەندروستی‌و لەش ساغی‌و چارەکردن و ئامۆژگاری تەندروستی‌و، دەیان بریارو دەسکەوتی تر کە بەندن بە ئافرەت و قوتابی‌و لاوان و پێشرەوان... سەرەرای جۆرەها دەسکەوتی تری گەورەی خزمەتگوزارییە کشتییەکان.[11]

## عیراقی نوێ‌و ... پیلانەکان:

ئا بەم جۆرەی باسمان کرد، شۆرشی (17 - 30)ی تەمووزی پیرۆزو سەرکردایەتیە مێژوویە هەڵکەوتووەکەی، سەلماندی‌و ئیسپاتی کرد کەوا توانایەکی تەواوی هەیە بۆ فەرماندەیی گۆرانکارە گەورەکان و هێنانەدی ئاسوودەیی ژین و سەربەرزی‌و سەربەستی‌و پێویستیەکان بەهێزبوونی گەل، بە بێ ئەوەی هیچ هێزێکی خەشیم، با زۆر بە تواناو زەبردەستیش بێ، بتوانێ بەرەنگاری رەوتی شۆرش بێت و یان لەم لاو لەو لا گێرەشێوێنی بکات و کار لە کاروانی بەردەوامی بینای گشتی بکات کە ئەمرۆ بووەتە رەمزێکی گەورەی سەربەرزی عیراق رێگەی پەرەسەندنی هێزی عیراق و بە توانابوونی.

لە ئەنجامی دەسکەوت و رەوتی دیاری شۆرشی تەمووز، لە سالانی تەمەنیدا ئیمپریالیزم و زایۆنی‌و دوژمنانی شۆرش ،بۆ ئەوەی رێ لە رێبازی پەرەپێدان و عیراقی نوێ بگرن و جوولانەوەی شۆرش لە سنوورێکی دیاریکراودا بوەستێنن و نەتوانێت کاروانی ئامانجە پیرۆزەکانی بەرێتە سەر، دەیان پیلانیان داناو هەوڵی راپەراندنیان دا.

دوای ئەوەی ئیمپریالیزم و زایۆنی، هەموو هەوڵ و توانای خۆیان تاقی‌کردەوەو بۆیان سەڵما کە راستەوخۆ خۆیان ناتوانن زەفەر بە عیراق ببەن و دەستی لێ‌بوەشێنن، هەڵسان مێزەر بە سەرێکی جادووگەری گێل و نەفام و زەلیلیان لە ئێرانا لە سەر تەختی حوکم داناو، راپەراندنی پیلانەکەیان پێ‌سپارد.

سەرەنجام، بۆ بە جێگەیاندنی ئەم خواستە بوگەنەی هێزەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم، رژێمی کۆنەپەرستی دواکەوتوو لە قوم و تاران ،لە چواری ئەیلولی سالی (1980)دا، دەست درێژییان کردە سەر خاك و ئاوو گەلی عیراق و... شارو دێهاتی ولاتیان دایە بەر ئاگری تۆپەوە..
شەریان بە سەر گەلی عیراق و شۆرشی گەشاوەی عیراق سەپاند.

ئێستاکەش، ئەم شەرە سەپێنراوە کە لەپێنج ساڵ وا نزیك دەبێتەوەو بەردەوامیش تاقمی تەماعکارو چاوچنۆك، شکاون و بەزیوون و، لە هەر هێرشێکیاندا گۆرستانێکی نوێیان بۆ هەڵکەندراوەو هەڵدەکەنرێ ،پاڵەوانانی عیراق، لە پشت سەرکردەی خۆیان سەرەکی تێکۆشەر صدام حسین دا، شیری هەفانەتیان تیژترو قایمترەو هەمیشە ئیرادەیان سەر لە نوێ دەبێتەوەو لە بن نایەت.

ئەوە بوو، شۆرش زەبرێکی بە ژانی سرەواندە دوژمنان و ئەوانەی داویان بۆ عیراق ئەنایەوەو پشتی ئاواتی پەل هاویشتن و پیلانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و فارسی شکاند... لەشکری

قادسیەی نوێ بە سەرکردایەتیی سەر لەشکری بە تەجرەبەو بێ نمونەی سەرەك صدام حسین ، سەری نیشتمان و نەتەوەی بەرزکردەوە.

نەك هەر لە مەیـدانی جەنگـدا، بەڵکـو لە مەیـدان و بواری پەرەپێـدان و پێشکـەوتنیشـدا کە هەوڵی وەستـاندنی رێرەوەکەیان ئەدا، لەو مەیـدانـەشـدا عیـراق توانی بەردەوام هەنگـاوی بەرەو پێشتر هەڵێنێو. . . رۆڵەکانی عیراق بەرپرسیاریی خۆیان ئەزانن زیـاتـر رەنـج ئەدەن لە بنیـاتنـانی پرۆژەو بەگـەڕخستنی مەکینەی ئابـووریو بەردەوامی ژیـانی رۆژانـەی سرووشتی، لە هەمـوو شوێنەکاندا. . بێ ماندوویوون کاردەکەن.

شەرفرۆشیو دوژمنایەتی ستەمکارانەی فارسی رەگەزپەرست، هەرچـەنـدە درێـژە بکێشێت ئەبێتە مایەی تێکشکاندنی مەکینەی دەستـدرێـژیو دوژمنـایـەتی فارسی لە لایـەکەوەو پەرەسەندنی هێزی سوپایو ئابووریو سیاسیو کۆمەڵایەتیو مەعنەویی عیراق لە لایەکی ترەوە.

بەم جۆرە، شۆرشی سەرەك صدام حسین، ساغی کردەوە، کە لە هەمـوو دوژمنـان و، لە هەمـوو نەهـامـەتیو تەنگـانەیەکدا بەهێـزتـرە. .شـۆرشێکـە لە تەرزدانـوێیـە، بـۆ کامەرانیی مرۆڤ و پێشکەوتنی مرۆڤ کاردەکات.[12]


سەرچاوەکان

1 ـ راپۆرتی سیاسی سەر بە هەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی. کانـوونی دووەمی 1974، ل 21 ـ 46 «بـڵاوکـراوەکـانی: دەزگـای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی».

2 ـ هەمان سـەرچاوەی پێشوو ل 71 ـ 76.

3 ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل 84 ـ 92.

4 ـ پاشکۆی عیراق ژمارە (37)ی حوزەیران و تەمووزی 1980 «ژمارەیەکی تایبەتی‌یە بە بۆنەی جەژنەکانی تەمووزەوە».

5 ـ راپـۆرتی سیـاسی سەربـە هە شتـەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی کانوونی دووەمی 1974، ل 98 ـ 99.

6 ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە (97)ی ئایارو حوزەیرانی 1981.

7 ـ پاشکۆی عیراق ژمارە (46)ی نیسانی 1982.

8 ـ راپۆرتی سیـاسی سەر بە هەشتـەمین کۆنگرەی هەرێمـایەتی کانوونی دووەمی 1974، ل 106.

9 ـ پاشکۆی عیراق ژمارە (37)ی حوزەیران و تەمووزی (1980).

10 ـ گۆڤـاری «صـوت الفـلاح». هەردوو ژمـارەی (654)و (642)، لە (1984)و (1983)دا.

11 ـ گۆڤـاری رۆشـنبـیـری نوێ ژمـارە (87)ی تەمـووزی (1981). و، ژمارە (98)ی تەمووزی (1982)

12 ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە (97)ی ئایارو حوزەیرانی (1981).

# لوڕو بەختیاریەکان

٧

مسعود عزالدین سالەیی

## جوگرافیای لوڕستان

سنوور: کرماشان لە ژووروەو لە ڕوژهەلاتەوە، ئەهواز تا هەرێمەکانی (بندردیلم)و (حصار) ئەگرێتەوە. وئەمەش ناوچەی لوڕستان و ناوچەی لەکستان و بەختیاریەکان ئەگرێتەوە.

وە ئیستەش دابەش کراوە بەسەر شارەکانی کرماشان وە هەمەدان و ئەصفەهان وە شیرازوە. هەرێمی جوگرافیای لوڕستان درێژ ئەبێتەوە تا نەهاوەند لە باکوورەوە، بەلام لە باکووری خوڕهەلاتەوە تا رووباری (سزار)و (ئاب دوو رود) وە (مخمل کوە). هەروەها لە باشووری خوڕهەلاتەوە تا (سەیمەرەو کبیر کوە) درێژ ئەبێتەوە.

شوێنی لوڕستانیەکان شاخاویە ئەمەش بوتە هوی ئەوەی فێری ژیانێکی.. سەخت بین وە بە ئازادی بژین و ئیستاکەش هەندێکیان هەر بە کوچەری ئەژین.

وئەو هەرێمە (هەرێمی لوڕستان( پڕە لە کانیاو و لە زستاندا بارانێکی زوری لێ ئەبارێت وە دارو دارستان وە باغ و باغاتێکی زور دەولەمەندی هەیە، وهەروەها کانیشی لێ هەیە وەکو نەوت.

## مێژووی لوڕستان:

نەژادی لوڕ ئەگەرێتەوە سەر ئاریەکان کە لە شاخەکانی قەفقاسەوە کوچیان کردووەو لە کوندا ناسرا بوون بە کاسیێن وە لە نیشتمانی خویان کوچیان کردبو بو خوارووی خوڕهەلاتی ئیران لە پێش میدیەکان.

فارسە رەگەزپەرستەکان دەسەلاتی خویان سەپاندوە بەسەر لوڕستاندا پێش چوار هەزار ساڵ، واتە هەزار ساڵ پێش ئەخمینیەکان، وە فارسە ئەخمینیەکان دەسەلاتدارێتی سیاسی لوڕستانیان خستە ژێر ئیمپراتوریەتیەکەیان وە لوڕەکان دەسەلاتدارێتی سیاسی خویان هەبوە لە دواقوناغی سەردەمی عەباسێکان وەکو حوکمەتی لوڕی گەورە (550 ـ 872ك)و میرنشینی لوڕی بچوك (570 ـ 1250ك)وە لوڕەکان یارمەتی عەرەبەکانیان داوە دژی لێشاوی مەغول و تەتەر، وە لوڕەکان چەند جارێك شورشیان دژی سەفەویەکان بەرپاکردووە هەروەها دژی نادرشاهیش، بەلام نادرشارە توانی بەسەریان دا زاڵ بێت هەندێك لە خێلەکانی لوڕی دەربەدەربکات و دوای کوشتنی نادرشاه لوڕەکان (بەختیاریەکان) توانیان فەرمان ڕەوایەتی ئەسفەهان و دەوروبەری بکەن بە سەروکایەتی عەلی مەردان خانی بەختیاریوە دوای عەلی مەردان خان بنەماڵەی زەندیە لوڕەکان توانیان فەرمان ڕەوایەتی ئیران بگرنە دەست لە ساڵانی (1749 ـ 1795ز) بەسەروکایەتی کەریم خانی زەند. بنەماڵەی زەندیکان توشی لێشاوی قاجاریەکان و فارسە رەگەز پەرستەکان بوون بەسەروکایەتی محەمەد خان

وە هەروەها لورە ڕەسەنەکان خۆیان بە کورد دائەنێین وە ئەمەش هیچ شکی تیانی‌یە کە ئەمانە کوردن وە کوخێڵی لەك خێڵی زەندوە هەندێ بەشیش لەم خێڵانە ئیستە لە عێراقدا ئەژێن لور دابەش ئەبێت بە چوار خێڵی سەرەکێوە.

1 ـ مامەسینی ئەمیش بریتیە لە ـ بەهمی ـ بەهرهەمدی تیبی ـ بویر.

2 ـ کوهگیلویە ئەمیش بریتیە لە (توی ـ گورەم ـ باوی شیرعلی ـ یوسفی ـ شاروی ـ ئەحمەدی ـ تیلکوی ئەوشار).

3 ـ بەختیاری‌وە ئەمانەش ئەبنە دوو بەشی سەرەکێوە ـ (چوار لنگ ـ حەوت لنگ) کە بڵاوبونەتەوە لە شارەکانی ئەسفەهان ـ شەهرکورد ـ خۆراسان وە بروجرد)وە ژمارەی ئەم خێڵانەش نزیکەی نیو ملیون ئەبێ‌وە شای گۆر بەگۆڕیش کچێکی لێیان خواست بۆ ئەوەی بیان کاتە لایەنگیری خۆی.

4 ـ لوری ڕەسەن: کە بە لوری بچوك ناسراون ئەویش بریتیە لەم خێڵانە أ ـ دلفان: ـ کۆشکی ـ زیودار ـ قاتراچی ئاومورایی ـ میر أخول).

ب ـ سیلسیە (حەسناوەند ـ قۆلی‌وەند ـ یوسفەوەند.

جـ ـ باڵاگرێوە (پایی ـ ساکی ـ دیرکۆند ـ ڕشتۆ)وە هەندێ خێڵی لەکی لوریش هەن لەوانە (مافی ـ تەرخان ـ باجەلان ـ دەلوەند ـ زندەگێدل) بەڵام ئەو خێڵانەی کەئێستا لە هەرێمی لورستانن (بیرانوەند لە ڕۆژهەڵاتی خورم ئابادەوە ئەژێن وە ئەمانەش ئەبنە دوو بەشەوە) ڕەحیم خانی لەناوچەی دێزەفول وە عەلی‌خانی لە ناوچەی بروجردو خورەم ئاباد.

سگوەند ئەمانیش لە ناوچەی ئەلستان ئەژێن وە هەروەها (چکنی ـ جۆدەگی ـ دیرەکەوەند لە ناوچەی سەمەرەو پول کەشکان نیشتەجێ بونە لوری ڕەسەن ـ ئەمانە لەو ناوچەیە ئەژین کە کەوتوتە نیوان شاخی چل نابالغاو دولی گاماسپ وە دۆڵی حەسمەرەو ئۆدیس وە لەوانەش کاکەوەند ـ کورد دەشت خاوە ـ حەسناوەند ـ ئەلوەند ـ کۆلیوەند) لە دەشتی ئەلشت بەڵام دانیشتوانی پشتکوە تێکەڵاون لە (فەیلی‌و کورد لەکی‌و کورد لە باکورەوە لە سەروی پشتکۆو باشورەوە خێڵەکانی مەلك شاهی‌و یوسفەوەندو گراوەند)ەوەن وە کوردەکانی دیناروەندوە غیایوەند (شوەند) لەو شاخانەی ئەڕوانێتە سەر هەرێمی ئەهواز.

دانیشتوانی ئەم هەرێمە نزیکەی 688,139 کەسن بەگوێرەی ئەو سەرژمێریەی کرا لە ساڵی 1966 بەڵام ئێستا ژمارەیان لە ملیۆنێك زیاترە.

زمان و ڕۆشنبیری:

زمانی لور لە فارسی نوێ کۆنترەو ووشەی بیانی زۆر کەمی تیایەوە لوری زۆر نزیکە لە دیالیکتی گۆران وە زۆر لە ڕۆژهەڵات ناسەکان و کورد ناسەکان زمانی لور دائەنەن بە بەشێك لە زمانی کوردی‌وە ئەو جیاوازی‌یەی هەیە لە نێوان شێوەی لوری کوردی‌و لەهجەیەکی تری کوردی ئەویش وەکو لەهجەکانی زمانی عەرەبی‌و یاخود زمانی یۆنانی کە لەهجەکانیان جیاوازەوە فەرهەنگێکیش هەیە بەناوی (لوری ـ فارسی) کە حەمید ئیزد پەنا دایناوە کە ئەمیش نیشانەی ئەوەیە کە لوری بەشێکە لە زمانی کوردی.

شارستانی لورەکان زۆر کۆنترە لە شارستانی فارسە (ڕەگەزپەرستە)کان ئەو پاشماوەیەی کە لێیان بەجێ ماوە بریتیە لە (برۆنزیەکانی لور) کە لە نێو زاناکانی پاشماوەکان وە مۆزەخانەکان وە هونەرمەندەکان زۆر بەناوبانگەوە ئەم پاشماوە بەنرخ و نایابە لەلایەن حکومەتی فارسە خوێن مژەکان هیچ بایەخێکی پێ نەدراوە لەبەر ئەوە هەندێکی لەناوچوووە هەندێکی لە بازاری ڕەشدا فرۆشراوەو هەندێکیشی دزراوە لە نێو لوردا زۆر شاعیر هەڵکەوتووە وەکو بابەتاهیری عوریان ی هەمەدانی‌وە مەلاپەرێشان وە حوسێن قوکی خان وە نەجمە مامەحسین وە

قاجار وه خەڵکێکی زۆریان کوشت لە زەندێکان وە تەنها لە شاری کرمـان (20) هەزار جوتـە چاوی زەنـدیـەکـانیـان دەرهێنـاوە لە کەلـەسەری خەڵکی ئەهرامیان دروست ئەکرد لەبەر ئەوە هەندێکیان پەنایان هێنایە بەر عێراقەوە.

لورەکـان رۆڵێکی گرنگیسـان هەبـوو لە مەشـروتیـەتی پێـشـکـەوتـوخـواز (لـە سالـی 1906 ـ 1911)وە جەنگـاوەرەکـانیـان توانیـان شاری تەهـران ئازادبکـەن وە محەمەد عەلی میرزای شای قاجار رای‌کردو پەنای بردە بەر باڵیوزخانەی روسیا.

پەیـوەنـدیـەکی بەتێن هەبـوو لەنێـوان لورەکـان و شێـخ خەزعەلی فەرمان رەوای ئەهواز وە رەزا شای گۆربەگۆر زۆر دڵ تەنـگ بوو بەو پەیـوەنـدیـە لەبـەر ئەوە ئەیـووت فەرمان رەواکانی باشور بەکرێ گیراوی خەزعەلن.

کاتێ کە رەزا شاە هێرشی بردە سەر شێخ خەزعەل لە ئەهـواز لە پێشـەوە هێـرشی بردە لسـەر لورەکـان وە پاش کوشـتـارێـکی زۆر توانی زاڵ بێت بەسـەر هەردوولاداو لە هەمان کاتدا لورو عەرەبی پێکەوە دەچەوساندەوە.

زۆر جار لورەکـان توش دەس درێژی‌و زوڵـم لێکردن بونە لەلایەن سوپای فارسە رەگەز پەرستەکانەوە لە سالـی (1936ز) حکـومـەتـی رەزا شاە بریـاری‌دا کە رێگەیەکی هێڵی ئاسنینی سوپایی بکاتەوە بەناو لورستاندا بۆ ئەوەی دەسـەلاتی رامیـاری لورەکـان بکوژێنێتەوە، بەلام لورەکـان بەرەنگـاریـان کرد، ئەوەبـوو چەنـد بزووتنـەوەیەك پەیـدا بوو لەوکـاتـەداوە چەنـد جارێـك هێـرشیان بردە سەر سوپـای فارسـە رەگـەزپەرستەکان وە لورەکان توانیان شاری خورم ئاباد بگرن بەلام فارسە رەگەرپەرستەکان پاش ئەوەی یەك مانگ ئابلۆقەی شارەکەیان دا توانیان شـارەکە لەدەست لورەکان وەرگرنەوەوە (80)کەس لەسەرداره لورەکانیان لە سێ دارەدا.

وە فەرمـانـدەی فارسـە رەگـەز پەرستـەکـان کە ئەمیـر ئەحمەدی بوو کە دوای بوو بە وەزیری بەرگری خەڵکێکی زۆری بێ تـاوانی کوشت لە پیـرو منـاڵ و ئافـرەت کە لە رەشماڵدا ئەژیان لە خورم ئاباد.

وە دوای ئەوە سوپـا نامـەردەکـەی دەسـتیـان کرد بە تالان کردنی مەرومـالاتیـان وە هەرچێکیـان هەبـوو ئەمیر ئەحمەد بردی بۆ خۆی وە هەرچێکیان هەبوو ئەمیر ئەحمەد بردی بۆ خۆی‌وە لەتەهران بەو پارەیە باشترین خانووی کری.

وە رۆژێکی ئەمیـر ئەحمـەد ئەم کردەوە نامـەردانـەیـەی خۆی بۆ نوسـەرێکی ئەوروپی ئەگێـرێتـەوە ئەڵێت ئیستەش لەناو لورستان دا هەر باس باس کردەوەی منە وە ئەگەر بێتو منـاڵێـك زۆر بگـرێ پێ‌ی ئەڵێن ئەمیـر ئەحمەد دێت ئینجا مناڵەکە زوو لە ترسا بێ‌دەنگ ئەبێت.

ئەم هەمـوو زوڵم و زۆرداریـەی فارسە رەگەز پەرستەکان کارێکی زۆری کردە سەر ژیـانی لورەکـان وای لێـان کرد بەکۆیلەتی بژین وە لە ژیانێکی زۆر سادەو دواکەوتودابن.

★ ★ ★

لور لە نەوەی کاسیتن ئەژمێـردرێت وە لەگـەڵ میـدێکان تێکـەلاوی یەکتـر بونـەوە زۆر کەس لە مێـژ وونـوسـان و جوگـرافیـاناسانی عەرەب و موسڵمانانی پێشوو وەکو (یاقوتی حەمـەوی)وە زۆر کەس لە رۆژهـەلات ناسـانی جیهـانی ئەڵێن کە لور بەشێکن لە کورد وە لورستـانیش نیشتیمـانی لورەوە ووشەی لور بەکوردی ماناکەی بدیتی‌یە (لە شاخێکی زۆر چڕ لە دارستان)وە لورەکان خۆیان ئەڵێن ئێمە لە نەوەی ئەو پیاوەین ئەژدهاکی کوشت یانی لە نەوەی کاوەی ئاسنگەرن.

وە لە سالی (1106ز) 400 خێزانی کورد لە باکوری شامەوە هاتونە بۆ لورستان چونکە لەگەڵ سەرۆکەکەیان بۆتە شەریان.

دەفتەری وە فەیزیەوە ئیزدیەوە عەلی ئەسغەری نەهاوەند وە غولام رەزاو وە میرنە وزوەو خان مەنسوروە مەلا نوشادوە ئەنوەرزەندوە لوتف عەلی‌خانی زەند.

بابەتاهیر شیعرەکانی بەلوری نووسیوەوە چوارینەکانی زۆر بەناوبانگەوە بۆ گەلێك زمان وەرگێراوەو فەلسەفەی بابەتاهیر لە سەر ژیان و روحە پێچەوانەی فەلسەفەی خەیامەوە شیعری سۆفی‌گەری روناك کردووەوە شیعرەکانی بابەتاهیر پرە لەهەست و سۆزو جۆش وە هەست دەربرینە بەرانبەر ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجانەوە دژی زوڵم و زۆرداری‌و چەوساندنەوە بەڵام گەورەترین خراپ کاری ئەوەیە کە هەندێ لە نوسەرانی فارسەرەگەز پەرستەکان هەندێ ووشە یا شێوەی شیعرەکانی بابەتاهیریان گۆریوەتە سەر زمانی فارسی بۆ ئەوەی بڵێن بابە تاهیر فارسە.

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو گۆران و گۆران کاریە میللەتی کورد بابە تاهیر بە یەکەم شاعیری خۆی دەژمێرێ لە مێژ وودا.

**ئەنوەر زەند:** ناوی ئیبراهیم خانی کوری کەریم خانی زەندە کاتێك کە قاچارە فارسە رەگەز پەرستەکان سەرکەوتن بە سەر زەندێکان هەردوو چاوی ئەم شاعیرەیان دەرهێنا.

**لوتف عەلی خانی زەند:** شاعیرو پاڵەوان و سوارچاك و خۆش نوس بووە ئەمیش بەدەست فارسە رەگەز پەرستەکانەوە کوژ را.

وە لورەکان پاش ماوەیەکی میللی‌و دەوڵەمەندیان هەیە لە گۆرانی‌و فولکلۆری‌وە دیارەی ئەڤین و داستان و حیکایەتو پەندو مۆسیقاو هەڵپەرکێوە زۆر پارێزگاری ئەکەن.

ئەمرۆیش رژێمی خومەینی رەگەز پەرست و کۆنەپەرست، هیچ بایەخێکی نەداوەتە لورەکان لەبوارەکانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌یەوە، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەوەوە هەر بەردەوامە لە چەوساندنەوەی لورەکان و بەسیجکردنیان وەکو سوتەمەنی یەك بۆ جەنگی دوشمن کاریان دژی عیراقی شۆرشگێرو موسڵمان.

**سەرچاوەکان: -**


1 - إيران نو ل پی ساتن ترجمة عبدالعظيم صبوری تهران 1342 شمسی.

2 - جنايات دو هزارو پانصد ساله شاهان ايران بغداد 1350 شمسی.

3 - نگاهی بەزندگی وآداب و سنن در ايلات هفت لنگ وچهار لنگ.

4 - خلاصة تاريخ الكرد و كردستان من أقدم العصور حتى الآن. محمد امين زكی ترجمة، محمد علی عونی القاهرة 1939م.

5 - اللرو لرستان علی سيدو الگورانی.
مجلة (المجمع العلمی الكردی) المجلد الثانی. بغداد.

6 - أمير أحمدی جزار لرستان ترجمة: فؤاد حمه خورشيد جريدة العراق 1980/12/16.

7 - نحو قراءة جريدة في تاريخ ايران (لمحات من جرائم شاهات ايران) جلال ورده - مجلة (آفاق عربية) العدد 8 نيسان 1982م.

8 - فەرهەنگی لەك و لور - دانان و کۆکردنەوەی: حەمیدی ئیزەد پەناه لێدوان و بەراوردکردنی مەحموود زامدار بەغدا 1978م.

# جیۆپۆلیتیکس و دەوڵەت و
# سیاسەتی دەرەوەو چارەنووسی جیهان

حیلمی عەلی شەریف

## جیۆپۆلیتکیس و خەڵك ودەوڵەت

**جیۆپۆلیتکیس بەم ناوەی ئیستایەوە باس و لێکۆڵینەوەیەکی تازەیە، زاناو پسپۆرە جوگرافیاناسەکانی دەوڵەتە سەرمایەدارو ئیمپریالی‌یە گەورەکانی جیهان هانیویانەتە کۆری زانستی، نادەمیزانەوە.**

**پەیوەندی‌یەکی توندو تۆڵی هەیە بە چارەنووسي گەل و ولاتە پچووك و مام ناوەندی‌یەکانی جیهانەوە، ولە گۆرەپانی ولاتە گەورە چاوبرسی‌یە چەوسێنەرەکانەوە هەڵئەقوڵیت و هی خۆیانەو لەوانەوە بلاوبۆتەوە ،وەپیش ئەمانیش هەر لە دەوڵەتە هاوشانە کۆنەکانی جیهانیانەوە بە شێوەیەکی تر هاتۆتە کایەوە.**

**بەم ناونیشانەی سەرەوە بەشي یەکەمی ئەم باسەمان لە ژمارە 103 و 104 وەبەشي دووەم لە ژمارە 105ی سالی 1985دا بەناونیشانی «بەسەر سنووری ولاتاندا کشان و بایەخدارترین دەرفەت» بلاوکردەوە. وا لەم ژمارەیەدا بەناونیشانی «جیۆپۆلیتیکس و خەڵك و دەوڵەت» بلاوئەکەینەوە.**

زانایانی جیوپولیتیکس زۆر بەتەنگەوەن هیزو توانای پایەداری دەوڵەتان تێبگەن ،بەتایبەتی هی ئەو دەوڵەتانەی دوژمن و ناحەزی دەوڵەتانی خۆیانن یان حەز بە دۆستایەتی و هاوکاری کردنیان ئەکەن واتا بەرەیەکیان لەگەڵدا پێك بهینن یان چاویان تێبریون بیان خەنە ژیر دەسەلاتی دەوڵەتەکانی خۆیانەوە یان هەر راستەو راست بەشێك یان هەموو خاکەکانیان داگیربکەن و دەوڵەتەکانی خۆیانیان پێ گەورە بکەن.

تا لەم باسە باشتر تێبگەین پێویستە لە رووی فەلسەفی و یاسا (قانون)وە خوێنەر سەرەتایەك لە دەوڵەت و دروست بوونی و فرمانەکانی تێبگات.

وشەی دەوڵەت خۆی لە خۆیدا واتایەکي تیۆری هەیە، کە دەزگایەکە هێزی ناوچەکەی خۆی گرتۆتە دەست و ئەم هێزەش بەسەر هەموو شتێك و دەسەلاتێکی تردا فەرمانرەوایەو خۆی لەهەموو لایەك بە خاوەن دەسەلات و خاوەن. هەق تر ئەزانێت

،كه نابێت كەس و هیچ هێزو توانایەكی تر لە ئاستیا سەركێشی وملی پێچی بكات.

دیارە ئەم دەسەڵاتە بێ ئامانەش كە مافی گرتن و كوشتن و ئازاردان و خەڵات كردنی هەیە ،خۆی لە خۆیەوە بو خەڵكی قوت نابێتەوە، بەڵكو پشت ئەبەستێت بە ئایدیولوجیو بناغەی ماددی تایبەتی یەوە، و لەهەموو كات و جێگایەكدا شان ئەداتە سەر دوو هێزی كاریگەر لەناو كومەڵدا؛

**یەكەم هێزی عەسكەری و دووەم: هێزی ئابووری.**

هارۆڵدلاسكی بەووردی دەوڵەت لە حكومەت جیا ئەكاتەوە كە ئەڵێت «دەوڵەت دەزگایەو حكومەت كەسانێكن ،كە بەناوی دەوڵەتەوە فەرمانرەوایەتی ئەكەن». -

ئەوی راست بێت دەوڵەت و حكومەت لە سێیەری هەموو رژ یمێكی ناسراوی ئەم سەرزەمینەدا ئەم جیاوازی یەیان لە نێواندا هەیە جگە لە كومەڵگا هەرە سەرەتاییەكانی ئادەمیزاد، كە بە كۆمەڵگای كومونیستی سەرەتایی ناوبانگی بلاوبۆتەوە، لەگەڵ رژێمە زۆر دیكتاتوری‌یەكان ،كە دەوڵەت و فەرمانرەوا لەیەكتری جیا ناكرێنەوە وەكو لویسی چواردەهەمی فەرەنسا ئەیوت: «من دەوڵەتم و دەولەتیش منە».

جا ناكریت ئەم فەرمانرەوایانە بەناوی دەوڵەتەوە ئەم هەموو دەسەڵاتەیان بێ‌پشتوپەناو بناغەیەكی ئایدیولوجی بەدەستەوە بێت. بویە زانایانی یاساو كومەڵایەتی‌و فەیلەسوفە خاوەن تیوری‌یە جۆراو جۆرەكان كەوتنە لێكولینەوەو لێكدانەوەو باسكردن و پاكانەكردن، بەڵام بەگشتی بوون بە دوو بەشەوە بەشی ئایدیالیستی (میثالی)و بەشی ماتریالیستی (مادی) یان سۆشیالیستی عیلمی.

هەر زوو ئەرەستووی گریكی وتوویەتی «دەوڵەت بۆ ئەوەیە ژ یانێكی خۆش بۆ هاوولاتیان جێبەجێ بكات».

هۆبز - یش ئەڵێت «شارستانێتی نایەتە دی ئەگەر ئەم شارستانێتی‌یە دەسەلاتی ژ یان و مردنی بەدەستەوە نەبێت».

• جۆن لوك - یش ئەڵێت «ئەبێ دەزگایەكی گشتی فەرمانرەوا هەبێت مافی ژیان و سەربەستی‌و مردنی بەدەستەوە بێت».

دوكتور منذر شاوی‌یش ئەڵێت «دەوڵەت برێتی‌یە لە جیاوازی‌كردن لە نێوان فەرمانرەواو فەرمان بە سەرداكرودا».

ئەوی راست بێت ئایدیالیستەكان جارێك بۆ پاكانەكردن و شی كردنەوەی ئەم باسە پەنا ئەبەنە بەر تیۆری باوكایەتی، كە دەوڵەت ئەچێتە قەوارەی باوكەوەو خەڵكیش ئەچێتە قەوارەی مناڵی ئەو باوكەوە واتا چۆن باوك مناڵی خۆی دێنێتە دیناوەو پەروەردەی ئەكات و پێی ئەگەیەنێت ومافی تەمێ كردن و سزادانی ئەو مناڵە شی هەیە، هەروەها دەوڵەتیش وایەو خاوەنی هەمان دەسەلاتە واتا دەوڵەت هەر خێزانە بەلام لە قەوارەیەكی گەورە تردا.

هی‌تریش هەن ئەبیەستن بە میللەتەوە واتا میللەت بەپێی پەیمانێكی مۆركراویان بروا پێكراو راستەو خۆ یان ناراستەو خۆیان نیوە راستەو خۆ بە ئارەزووی خۆی سەبارەت بەوەی ئەم فرمانە واتا فرمانی دەسەلاتداریتی لەهەموو جیگەو كاتێكدا بەهەموو ئەندامەكانی ناكرێت، داویتی‌یە دەست كۆمەڵێكی لێ‌هاتوو، كە بۆ ماوەیەك و بەپێی دەستوورو یاسایەكی دیاری‌و نیشانە كراو بەكاری فەرمانرەوایی‌و دەسەلاتداریتی بەپێی قازانجی گشتی هەڵسێت ،كە هەموو ئایدیولوجیستە دیموكراتی خوازەكان لەم بەرەیەدا كۆ ئەبنەوە.

لە سەدەكانی ناوەراست و پێش ناوەراستیشدا گەلێ ئایدیولوجیستی سەر بە فەرمانرەواكانی ئەوسا فەرمانرەوایی دەسەڵاتدارەكان و دەوڵەتیان خستۆتە پاڵ هێزێ ئاسمان كە گوایە ئەم دەسەڵاتدارانە لە جیاتی هێزیكی ئاسمانی یان چەند هێزیكی پیرۆزی ئاسمانی نادیار لە پێناوی خیرو خۆشی خەلكی‌و راگرتنی لەنگەری دادپەروەری ئەم ئەركەیان گرتۆتە ئەستۆ.

ئەوەی كە خاوەن تیوری‌یە ئایدیالی‌یەكان لە هی تر جیائەكاتەوە ئەوەیە، كە هەمیشە سوور بوون لەسەر ئەوەی كە فەرمانرەواو دەوڵەت دادپەروەرو بێ‌لایەنن. جیاوازی لە نێوان

خەلکی‌دا ناکەن ،هەژارو دەوڵەمەند لای ئەوان یەکسانن. تەنیا دادپەروەری، کە لە یاساکانیاندا رەنگ ئەداتەوە فەرمانرەوایەو بەس!! لەگەل ئەمەشدا لەسێبەری رژیمی کویلەییدا خاوەن کۆیلە مافی ئازاردان و ماندوکردن و گەلی جار کوشتنی کۆیلەی هەبوە ،هەروەکو لەسێبەری رژیمی دەرەبەگایەتی‌دا دەرەبەگ بەپێی یاسای دەوڵەتەکەی خۆی مافی سوخرەگەری هەبووەو جوتیار ئەبو بێ‌دەنگ و سەنگ بەلای کەمەوە چەند رۆژیك لەهەفتەیەکدا سوخرە بو دەرەبەگ بکات. هەروەکو لە سێبەری رژیمی سەرمایەداری‌دا سەرمایەدار لە سنورێکی نیوە ئازاد دا بەهێزی کرێکاری دەوڵەتەکەی خۆی سەرمایەی نوی کۆئەکاتەوە.

بۆیە ئایدیولوجیستە مەتریالی‌یەکان و سۆشیالیستە عیلمی یەکان کەوتنە خەباتێکی توندو تیژ لە پێناوی روون کردنەوەی سەرەتاکانی دامەزراندنی دەوڵەت و ئامانجی دروست بوونیان دا.

ئەمانە ئەڵێن هەر دوای کومەڵگەی کۆمونیستی سەرەتایی وپەیدابوونی دوو چین، چینی چەوسێنەرو چینی چەوساوە ئیتر دەوڵەت بەشێوەی سەرەتایی پایە نزم دروست بووەو بەرە بەرە بەدەم پێشکەوتنی ئادەمیزادو شارستانیتی‌و پێشکەوتنی تەکنو لوجیاو کشت و کاڵ و پیشەسازی‌یەوە، دەوڵەتیش وەکو سەرخانی ئەم ژێرخانانە رووله پیش کەوتن بووە، بەڵام هەمیشە نوێنەری چینی خاوەن دەسەڵات بووە، چینی خاوەن دەسەڵاتیش ئەو چینەبووە، کەئامرازی بەرهەم هێنانی بەدەستەوە بووە، یان راست ترخاوەنی ئامرازی بەرهەم هێنان بووە، وەئەم خاوەنیتی یە کردوویەتی بە خاوەنی دەوڵەت و ئەمجابە خاوەنی دەسەڵاتی ماددی وعەسکەری‌و ئابوری وەبەپێی ئەم بۆچوون و شی کردنەوەو لێکدانەوەیە فەرمانرەوایەتی کردووەو دەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێکدا گرتووەو بەپێی قازانجی خۆی بردوونی بەرێوە.

ئیتر بەپێی بۆ چوونی ئەوان دادپەروەری‌و یاسا پەرستی‌و خەلکی چوون یەك سەیرکردن، هەمووییان چاوبەست و فروفێڵن و قازانجەکانی ئەم چینە خاوەن دەسەڵاتانەی لە پەنادا ئەشاررینەوە. هەروەها ئەو راستی‌یەش ناپێچنەوە، کە ئەڵێن دەوڵەتانی سۆشیالیستی عیلمی ـ ش هەر بەپێی ئەم ئایدیولوجی‌یەتە فەرمانرەوایی ئەکەن و ئەرۆن بەرێوە، واتا دەسەلاتی چینی خاوەن ئامرازی بەرهەم هینان کە پرولیتاریایە فەرمانرەوایە بەسەر چین و توێژاڵەکانی تردا‌و دەوڵەتی سۆشیالیستی بەپێی قازانجی گشتی ئەم چینە چینی پرولیتاریاو هاوکارەکانی فەرمانرەوایی ئەکات و هەموو دەزگا ماددی‌و ئایدیولوجی‌یەکانی ئەم دەوڵەتە پێش هەموو شتێك قازانجی ئەمانی خستۆتە پێشەوەو بەرە بەرە چین و توێژاڵەکان تر، کە لەوەپیش دوژمن و خاوەن دەسەڵات بوون لەناو ئەبات.

هەروەکو دەوڵەتەکانی پێشوش لە پێناوی قازانجی چینە خاوەن دەسەلاتە چەوسێنەرەکان هەروایان کردووە.

ئەمجا بۆ لێ تێگەیشتن لە دەوڵەت پێویستمان بەم سەرەتایەی پێشوو هەبوو لەگەل ئەوەشدا جیۆپۆلیتیکس لە کلاورۆژنەیەکی ترەوە سەیری دەوڵەت ئەکات.

دکتور محمد ریاض ئەڵێت «جیۆپۆلیتکس ئەو فرمانەی گرتۆتە ئەستۆ کە لە دەوڵەت وەك بووەیەکی عضوی بکۆڵێتەوە کە لە ئەنجامی یەکگرتنێکی دیاری‌کراوی خەلکی دامەزرابێت لەسەر بەشێك لەم سەرزەمینە کە بۆی هەبێت لە چوارچێوەیەکی سیاسی دیاری‌کراودا پەرەبسێنێت و بکشێت یان پوچەل ببێتەوەو لە ناوبچێت».

وە دوکتور علی المیاح ـ یش مەرجە سروشتی‌یە پێویستەکان (العوامل الطبیعیە)وە ئەو مەرجانەی پەیوەندی‌یان بەخەڵکەوە هەیە (العوامل البشریە) بە مەرجی بنچینەیی ئەزانێت بۆ ئەوانەی ئەیانەوێت لە جیۆپۆلیتیکس باش تێ‌بگەن.

### (ئادەمیزاد یان خەلك یان گەل یان نەتەوە)

بەڵام لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسی بەشی دووەمیان ئەکەین واتە ئەو مەرجانەی پەیوەندی‌یان بەخەڵکەوە هەیە یاپێ‌یان بڵێین

ئادەمیزاد یان خەلك یان گەل یان نەتەوە.

یەکێــك لە مەرجـە بنـاخـەییـەکـانی دەوڵـەت دروست بوون ئەوەیە، کە لە قەوارەی ئەو دەوڵەتەدا کۆمەڵە خەڵکێکی دامەزراو لەسەرزەوییەکی دیارو نیشانە کراوو سنوور کێشراو هەبێت کە ئەو خەڵکـە قازانـج و سوودیـان لەو دامـەزرانـدن و پێکەوە ژیانە دەسـت کەویـت. زۆر کۆمــەڵانی تلای خەڵــك هەن پێکــەوە ئەژین و ئەگەرین بەڵام لەبەر ئەوەی بەزەوییەکی سنوور دیارو کێشراوەوە نەبەستراو نەتەوە پێیان ناوترێت بەشێکی دەوڵەت یان دەوڵـەتیـان لێ دروست نابێت وەکـو قەرەج (غجـر)کـە هەمیشـە گەڕۆك و کۆچەرن.

ئەم خەلکـــەش لە چوارچێـوەی دەوڵـەتێکی ناسـراودا ئەژین هەمـــوویـان لە رووی نەتـەوایـەتیو رەگـەزوو هاوو خوینییـەوە یەکســان نین، بەڵکـو لەهـەر دەوڵـەت ویـان چەنـد دەوڵـەتێکدا رەنگە و روویەکی تایبەتییان بەخۆیانەوە گرتووە.

لەهـەنـدێ دەوڵـەتـدا لە چەنـد ولاتێکەوە خەڵکی کۆچیان بۆ کردووەو تیـا کۆبـوونـەتـەوەو بەهـەموویان لەگەڵ هەندی خەڵکی کۆنی ولاتی ئەو دەوڵـەتـەدا گەلێکی تازەیـان پێـك هانیـوەو ،یان زمانێك بووە بە زمانی یەکگرتووی ئەو گەلە، یان زمانی بەشی زۆری خەڵکە کوچ کردووەکە خۆی سەپاندووە بەسەر زمانەکانی ترداو بووە بە زمــانی یەکگــرتــووی ئەو دەوڵــەتــە وەکـو ولاتـە یەکگـرتـووەکـانی ئەمـەریکـاو ئوستـرالیا کە لە هەر دوولا زمانی ئینگلیزی بووە بە زمانی یەکگرتوو سەرەکی ئەم دوو ولاتە.

بەڵام لەهـەنـدێ دەوڵـەتی ترا خەلکـەکـەی هەر لەسەرەتاوە هەموویان یەك نەتەوەو یەك رەگەزو یەك سەرچاوەی رەگەزایەتی یان هەیـــە، یان چەنـــد سەرچـــاوەیـــەکـــی پچـــوکـی لاواز لە سەرچـــاوەیـەکی گەورەو بەهیـزو خاوەن خاسییـەت و سروشتی خاوەن توانـادا تواونـەتـەوەو ئامێتـەی یەکتری بوون و بەیەك زمان قسـە ئەکـەن و نەتـەوەیـەکی تایبـەتی دیارو جیاواز، لەهی تریان پیاك هانیوە، کە بەم جورە یان ئەلین نەتەوە (الامە).

لەهەندێ دەوڵەتی تریشدا چەند نەتەوەو رەگەزێك لەبەر گەلێ هۆی جۆراوجـۆر وبـەزۆرو بەخـوایشت لە قەوارەی دەوڵـەتێکـدا کۆبـوونـەتـەوە وئەچنەوە سەر چەند تیرەو رەگەزو نەتەوەیەك بەڵام بەهەموویان گەلێکی یەکگرتوو، یان چەند گەلێکی یەکگرتوویان پێـك هانیـوە. کە زانـایـانی جیۆپۆلیتیکس و زانستی کۆمەڵایەتی زۆر خۆیـان بەم جۆرە دەوڵـەتـانـەوە خەریـك کردووەو لەوانی تر زیاتر بەلێکولینەوەو شی کردنەوەی پتەوی‌و لاوازیو کیشەو بەرەی نێوانی گەلانی ئەم دەوڵەتانەوە ماندوو بوون.

ئەوی راست بێت وەکـو نەتـەوە ورەگـەزو تیـرەو زمـان بابەتی سەرەتـایی ئەم باسـەن هەروەهـا ئاین و بروای ئاسمـانی نادیارو خواپەرستی - ش بابەتی تری ئەم باسەن هەرچەندە لە کێش و پێوانەی ئەوانی پێشوودا نین چونکە تا ئیستا بەروونیو ئاشکرایی دوو دەوڵەتی جیهان لەسەر بناخەی ئاین دامەزراون، کە قەوارەی زایونیستی و پاکستانن.

زایـونیستـەکـان ئاین و نەتـەوەیان تیکەڵ کردووەو بەناوی هەر دووکیـانـەوە کەهـەر بەیەکیان ئەزانن، یان ئەیانەویت وای بخەنە پێش چاو، دەوڵــەتــی (ئیـــســـرائیــل) یان بە یارمـــەتی ولاتـــە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو رۆژئاوا دروست کرد.

موسـولمانانی موسولمانانی دەوڵەتی پاکستانی ئیستا، کە نزیکەی پینـج یەکی دانیشتـوانی ئەوسـای هـنـدستـان ئەبوون دەوڵەتێکی ئیســلامییـــان لەســـەر خاکی ئیستـــای پاکستـان بەنگـلادیش دامەزراند ئیتر لەم دوو نمونەیە بەو لاوە نمونەی ئاوا روون و دیار نییـە هەرچـەنـدە ئەنـدەنـوسیـاش دوای دامـەزرانـدنی نازناوی ئیـسلامی بەبـەری دەوڵـەتـەکـەیـدا هەلکیشـا. وەدەوڵەتوکە زور پچکــولــەکــەی فاتیکــانیـش بو خزمـەتگـوازی ئاینی مەسیحی کاثولیکی باوەرگە (مذهب) دامەزراوە.

سەبـارەت بەوەی پسپـورو زانـایـانی زانستی جیـۆپۆلیتیکس و جوگـرافیـای سیـاسی بایـەخێکی زۆریان داوە بەم باسە چونکە، راستـــەوخـۆ پـەیـوەنـدی بـە توانـاو لاوازیو پتـەویو پـوچـەلی دەوڵـەتـەوە هـەیـەو ئـەبـێـتـە هـۆی گەشەکردن و پەرەسەندنی دەوڵەت، یان لاوازیو پوچەڵ بوونەوەو

لەناوچوونی .

بۆیە پێویستە لەم باسەشدا هەمان بایەخ و نرخی هەبێت و بۆ خوێنەران روون بکرێتەوە.

ئەگەر پێش ئەوەی باسی هەر دەوڵەتێك ،یەك یەك، بکەین، سەرنجێك بدەینە هەموو سەرزەمین ئەروانین کە ئیستا 4/5 ملیار خەلك لەهەموو رەگەزوو نەتەوەو تیرەو ئاینێك ئەژین ،کە بەسەدان زمانی جۆاروجۆر ئەدوێن و بەوشکایی ئەم سەرزەمینەدا بلاوبوونەتەوە وئەم ژمارەیە لە ساڵی 2000ی زایینیدا چاوەروان ئەکرێت بگاتە 6ملیار کەس بەلام وەنەبێت ئەم بلاوبوونەوەیە یەك کێش و تەرازووی هەبێت، بەلکو لەناوچەیەکدا چرو لە ناوچەیەکی تردا نیوە چرو لە جیگا یەکی ترا شاش بەش بووە.

بەپێی سەرژمێری بلاوکراوە ،نزیکەی 60٪ ی لەسی 3 ناوچە دا بلاوبونەتەوە، ناوچەی چین و ژاپون وەناوچەی هندو پاکستان و بەنگلادیش و ناوچەی ئەوروپا.

وەلەسەر ژمیرێکی تردا دوکتور ریاض محمد ئەلیت «55٪ ی دانیشتوانی سەرزەمین کەوتونەتە ئاسیای روژهەلات و خواروو وە 25٪ ی کەوتونەتە ئەوروپاو یەکێتی سوڤییەتەوە وئەوانی تر بەسەر بەشە و شکاییەکەی تری سەرزەمیندا بلاوبونەتەوە وەلەم جێگایانەشدا وەنەبێت چری و شاشی بلاوبونەوەیان چۆن یەك بێت ئەمانەش شوێنی زۆر چرو نیوە چریان تێدا هەلکەوتووە.

ئەمجا لێرەدا کێشەیەکی تر دێتە پێشەوەو کە ئایا ئەم خەلکەی لە ولاتێکدا بەچری ئەژین، خاکی ولاتەکەیان، ژیان و گوزەرانیان مسوگەر ئەکات؟ چری و شاشی دانیشتوانی دەولەتێك بۆیان ئەبێت بەخیر، یان بەکوێرەوەری؟

وەکاربەدەستانی ئەم دەولەتانە بەچ شێوەیەك چارەسەری کیشەی ژیان و گوزەرانی خەلکی دەولەتەکەیان ئەکەن؟

ئەگەر چاوێك بەمێژووی کۆنی ئادەمزاددا بگێرین گەلیك نمونەی جۆراو جۆرمان دێتە پێش چاو کە ئەبنە وەلامی ئەم پرسیارانە.

هەندێك دەولەت هەولیان داوە بکشێن بەسەر خاکی دراوسێکانیانداو بەم رێبازە چارەسەری کەم دەرامەتی خۆیان بکەن یان هەر خۆیانی پێ فرە سامان بکەن، وەکو ئیمپراتورییەتەکانی رۆمانی و فارسی و مەغۆل...

وەهەندیکی تریان لە دەریاکان پەریونەتەوەو خاکی گەلانی تریان داگیر کردووە، وەکو ئەثینایییەکان و پورتوغال و ئیسپانییەکان و ئینگلیزو فەرەنسایییەکان...

ئەگەر نەخشەی ئیمپراتۆرییەتی ئاشۆری بهینینەوە بەرچاو ئەروانین کە کەوتۆتە نیوان رووباری فورات و شاخی زاگروسەوەوە هی بابل هەر لە شاری بابل دا بووەو رۆمانییەکان لە هەرێمی لاتیوم وەچینییەکان لە میرگی خۆتان لەسەر روبارێك لە تورکستانی روژهەلاتدا بوون.

بەلام ئەمانە بەم بەشە خاکانەی خۆیان دانەمرکاون و بەرە بەرە خۆیان بە خاکی گەلانی ترئاوسانەدووە، تاکو لە پەلوپۆ کەوتوون و ئەوسا سەرەو ژیر هاتونەتە خوارەوە.

دەولەتی رۆمانی لە تافی لاوێتیدا ساڵی دووی پیش زایینی داشیاو دەورو بەری سوریاو هەندیك بەشی ولاتی عەرەب و ئەرمەنستانی خستە سەر خاکی خۆی تا نزیکەی دووسەد ساڵێك دوای ئەوە هەرەسی هانی.

وئیمپراتۆرییەتی عەرەبی وەکو دوکتور ریاض محمد ئەلێت «لە ساڵی 755ی زایینی دا ئەندەلوسی لە دەست چوو وە لە ساڵی 790 ز ـ دا مەراکیش و لە 891 دا میسر و بەرقەو لە ساڵی 934ی ز ـ دا کوردستان و ولاتی فارس....».

بۆیە جیوپۆلیتیکسیەکان ناتوانن ئەم لایەنەی ژیانی مروڤایەتی فەرامۆش بکەن هەروەها وەکو پەیوەندییەکی تونددوتۆلی بەکارو فرمانی ئەوانەوە هەیە هەروەها هەموو فەیلەسوف و پسپورو زایانانی بەشەکانی تری زانستی هەمە جۆرەی ئادەمزادی بەخۆیەوە خەریك کردووە.

زاناو پسپورانی ئابوری لەم بارەیەوە ئەلێن ئاستی دەرامەتی

تاکە کەسێك (الدخل الفردي) سەنگ و پێوانەی پێشکەوتن و دواکەوتنی هەر دەوڵەتیکە وئەم سەنگ و پێوانەیەش لە ئەنجاما دەستێکی گەورەی لە نەخشە کیشانی سیاسەتی دەرەوەی ولاتدا ئەبێت.

بەم پێشەکی‌یە کورتە دیینەوە سەر باسی خەلك و دەوڵەت وئەو مەرجانەی خەلکی دەوڵەتێك خاوەن هێزو سامان و دەسەلات، یان دەوڵەتەکەی پێ گەورەو ناودارو دەسەلاتدار ئەبێت، وەدەولەتێکی تری پێ بێ هیزو لاوازو پەککەوتە ئەبێت و دووچاری ررمان و لەناوچوون ئەبێت.

بۆ شي کردنەوەو ئاسان کردنی ئەم بابەتە پیویستە هەر دوو لقەکەی جیا جیا باس بکرێت کە بریتین لە:

## یەکەم - ئەنثروپولۆجي -

AnThRopoLogy علم الانسان - یان وەکو پێی ئەوترێت شارستانیتی کە بەپێی فەرهەنگی (المورد) «زانستێکە لە پەیدابوون و سەرچاوەی ئادەمزاد ئەدوێت و بەدوای پێشکەوتن و رەگەزو خوورەوشت و نەتەوەو ئلیینی ئادەمیزادا ئەگەریت و خەریك ئەبێت».

بەلای زانایانی جیۆپولیتیکس و سیاسە تمەداران و زانستي کومەلایەتی‌یەوە هەر لقیك لە لقەکانی زانستي ئادەمیزاد (ئەنثروپولوجی) نرخ و بایەخێکی گەورەی دەربارەی هیزو توانای دەوڵەت هەیە چ لە کاتی ئاشتي، یان لە کاتی شەر دا. وەئەو دەوڵەتانەی ئەم لقانەیان بەریکوپێکی تیا گونجاون روو لە پەرەسەندن و گەشەکردنن و بەپیچەوانەی ئەمەشەوە ئەوانی تر هەمیشە خەریکی سازکردنی کیشەو تەنگوچە لەمەو گیروگرفتن.

هەروەها هەر دەولەتە بەپێی مەرج و دەرفەتي تایبەتي خۆیو هەلکەوتی مەرجەکانی تری وەکو جێگەو شوێن ورووبارو دەریاو سنوورو دراوسێو پیتو بەرەکەی‌تی خاکەکەیەوە دەربارەی خالەکانی ئەنثرپولوجی یەك یەك جولاوەتەوە. لە هەندی ولاتدا وەکو ولاتە یەکگرتووە کانی ئەمەریکا سیاسەتی چاوپۆشي و نەرمی بەکار دەهیزیت و لەهەندی ولاتی تریشدا ئەو پەری توندو تیژی فەرمانرەوا ئەبیت جا سەربارەت بەوەی کە بابەتی باسەکەمان پەیوەندی بە چەند خالێکەوە هەیە وا لە خوارەوە باسي هەرە گرنگەکانی ئەکەین:

**1 - رەگەز (السلالە)**: زانایانی کۆن بەپێی رەنگی پیست و مووی سەرو شیوەی لەش و سەرو دیمەنی دەرەوەیان ئادەمیزادی‌یان کردووە بەسێ بەشەوە:

آ - رەگەزی سپی قەوقازي
ب - رەگەزی زەردی مەغۆلی
ح - رەگەزی رەشی زنجی (قولەرەش)

وەهەندی زانایان هەر رەگەزێکیشیان کردووە بە چەند بەشێکەوە وەکو رەگەزی سپی‌قەوقازي کە ئەلێن بەشی نۆردي و ئەلپي و دەریای سپی ناوەراستن.

ئەوی راست بێت ئەم رەگەزانە هەر لە شێوەی پێست و مووی سەرو هەندی دیمەنی دەرەوەی لەشي مرۆڤدا جیاوازی‌یان هەیە، دەنا لە زیرەکیو توناو کارو فرمانی هەموو بەشەکانی ئەندامی لەشي مرۆڤدا تێگرا وەکو یەکن. لەلایەکي تریشەوە سەدان ساڵە ئەم رەگەزانە تێکەلی یەکتری ئەبن و ژن و ژن خوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە، کە هیچ رەگەزیك نەماوە بەخاوینی مابێتەوەو لەگەڵ رەگەزی تردا تێکەڵ نەبووبێت.

بەلام دەوڵەتە گەورەکان چ بەرامبەر گەلانی ترو چ لەناو خۆیاندا لە سێبەری رژێمی چینایەتی چەوسێنەردا ئەم بابەتەیان بەشێوەیەکی تاڵ و ناخۆش بەکار هیناوەو ئیستاش لە پاش ئەوەی مرۆڤایەتی هەنگاوی گەورەی لە کۆری شارستانیتی دا بەرەوپێش هەڵهێناوە هەر رەگەز پەرستی لە زۆر ولاتي جیهاندا کەمو زۆر جێ پێی بەجێ ماوە وبەشێکی زۆری مرۆڤ هەندی جار لە ژیر پەردەی جیاوازی رەگەزو هەندی‌جار لەژیر پەردەی جیاوازی

نەتەوەدا ئەچەوسێنەوە.

ئەوەی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە خۆیان بە پاریـــزەری دنیـــای ئازاد ئەزانن! ئاگـابي رەگـەزنـاسي (شهـادة الجنسیـە) بەپێی خۆبـەستنـەوە بە خاکی ئەمـەریکاوە ئەدەن بە هاونیشتمـــانـەکـەیـان کەچی تا ئیستـا لە چەنـد پاریـزگـەیـەکی خوارووی ئەم ولاتـەدا بە ئاشکـراو بەپێی یاسـای تایبـەتی ئەو پاریـزگـایـانـە رەگـەزپـەرستي ئەکەن و رەش پیست و بۆر پیست لەگەل سپی پێستدا لەکارو فرمان و قازانج و خێرو خۆشي ولاتە ـ کەیان جیاوازی‌یان لەگەلدا ئەکریت.

هەروەهـا لە خوارووی ئەفـەریقـادا سپی پێستـانی ئەورویـا بەزۆرە ملێ خاکی ئەفەریقاییەکانی ئەو ولاتەیان داگیر کردووەو بەپێی رەفتارێکی نامروڤانەش ، کە بەپێی دەستوو رو یاسایەکی بۆ دانـــراو ئەجـــولینـــەوە، ئازاری ئەفـــەریقـــاییـــەکـــان ئەدەن و ئەیانچەوسێننەوەو دەرگەی زندان و کوشتن و برین و توقاندنیان لێ خستونەتە سەر پشت.

هەروەهـــا لە زۆر ولاتـی تر کە بەپێی ئەم دابـــەش کردنـــە لەهەمان رەگەزیشن لە ژێر پەردەی جیاوازی نەتەوایەتی دا بەشە دەســـەلاتـدارەکـەی نەتـەوەیـەك، یان گەلێکی گەورە، نەتـەوەو گەلێکی پچووك ئەچەوسێنیتەوە.

کە ئەم سیـاســەتـە بەلای زانـایـانەوە باری دەولەت لاسەنگ ئەکات و هێزو توانای بەرەو خوار ئەبات و لە کاتی شەردا هەلی زیرین ئەداتە دەست دوژمنەکانیان، جگە لەوەی کە رۆلەی ئەم گەل و نەتەوە زۆرلێکراوانە بە دل پاریزگاری ئەو ولاتانە ناکەن و بە ئارەزوو لە ریزی لەشکری ئەم ولاتانە دا ناجەنگێن.

ئەمـە جگـە لەوەی کە ناوەرۆکی نامـروڤـانـەی ئەم سیـاسـەتە راستەو خۆ جیگا پەنجەی لە قەوارەی ئەو دەولەتانە دا دیارە، لە پێوەندی یە دەولەتی‌یەکانی ئەم دەولەتە رەگەز پەرستانەو دەولەتانی جیهانیشدا رەنگی داوەتەوە. وەکو چۆن هەموو دەولەتانی جیهان جگـە لەو ولاتـە یەکگـرتووەکانی ئەمەریکاو (ئیسرائیل)و هەندی دەولـەتی رۆژئـاوایی بەدزی کومـەلگـەی دەولـەتـانـەوە دەولـەتی ئەفـەریقـای خوارووی رەگـەز پەرستیـان ئافـەروز کردووە وەلـە ریکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی جیهانیشدا نەفرەتی لێ کراوە.

ئەگنیـا ئەگـەر رەگـەز پەرستی سەرچـاوەیەکی زانستي هەبوایە بوچی رەش پێستـــان لە هەمـــوو بەشـــەکـانی زانستي و فرمـانی مرۆڤایەتي دا لەم ولاتانە دا کەلکیان لێ وەر ئەگیریت و بۆچی لە ریزی هێزە چەکدارەکانی خۆیاندا کاریان پێ ئەگەن؟! بوچێ قەوارەی زایـونیستی‌یـە کان بەیـارمـەتی ئەمـەریکا زنجي یەکانی حەبەشە (فلاشا) یان لە سودانەوە گواستەوە بو فەلەستینی داگیرکراو؟!

بوچێ کاربـەدەستـانی ئەمـەریکـاو ئیـسرائیل دژ بەسامیتی‌یان کردووە بە خوێنی سیاوەش و وازی لێ‌ناهینن؟

بێ‌گـــومـان هەر وەکـو هیتلەرو نازێکـان **لە ژێـر پەردەی ئەم ئایدیولوجی‌یەتەدا** رێبازی **داگیرکەری‌و ئاوسان و دەولەتی ئەلمانیا** گەورەکـــردنـیـــان گرتبـــووە بەر، ئیستـــاش **هەمـــوو دەولـــەتـــە** رەگەزپەرستەکانی جیهان و جیاوازی کارە خوازەکان **هەر هەمان** رێبـازو نیـازیـان هەیـەو بۆ هەمـان مەبەست دەست لە جیاوازی خوازی هەلنـاگـرن تا خۆیـان و دەولـەتـەکـەیان بەناخي زەمیندا ئەبەنە خوارەوە!

2 **زمان**: ئاشکرایە کە زمان دیاردەیەکی گرنگ و پێویستی شارستـــانیتی‌و پایـەیـەکی هەرە گەورەی پەیـدابـوونی نەتـەوەیـە تەنـانـەت هەنـدی رابەرانی نەتەوە پەروەر پێش مەرجەکانی تری پەیـدابـوونی نەتـەوەی ئەخـەن. لەم بارەیـەوە **ساطع الحصری** نەتـــەوە پەروەری **گەورەی عەرەب** دەربـــارەی **نەتـەوەی عەرەب** ئەلێت «**مـەرجـە بنچینـەییـە دروست کە رەکـانی نەتـەوە زمـان و میژوویەکی یەکگرتووە کەلە ئەنجامی ئەمەشەوە هەست وئاوات و ئازاری ناومویی لێ‌ئەوەشێتەوە**». واتا بایەخێکی ئەوتۆی نەداوە بە خوێن، یان رەگەز ، کە گەلێك دەولەتی عەرەب خوێنێان کردووە بەســەرچـاوە بو پێ ناسینی هاولاتێکی عەرەبی لە ولاتـەکـانیاندا وەبەهوێ خوێن و رەگەزەوە ئاگایی رەگەزناسی (الجنسیە) بەهاو

ولاتیانی خۆیان ئەدەن. وەبنچینەی بروا کەشي لەبەرئەوە یەکە ئەلێت «بەشی زۆری عیراق و شام، وەهەموو بەشەکانی باکوری ئەفەریفا ـ هەرلەمیسرو سودانەوە تا ئەوپەری مەغریب عەرەب نەبوون وەنەکراون بەعەرەب تادوای ئیسلام».

هەروەها رابەرانی ئایدیولوجی‌یەتی سوشیالیستی عیلمي ـ ش هەر زمانیان بە مەرجێکی بنچینەیي زانیوە کە دەربارەی پەیدابوونی نەتەوەو مەرجە سەرەکی‌یەکانی دوواون.

دکتور محمد ریاض ئەلێت «زمان شیرازەیەکی گرنگە گەلانی عەرەبی لە ئوقیانوسەوە تا کەنداووی عەرەب کردووە بەیەك نەتەوە». چونکە یەکێتی زمان پایەیەکی گەورەیە لەدامەزراندنی یەکێتی بیروباوەرو یەکیتی رۆشنبیری هەموو نەتەوەیەکدا.

هەروەها دوکتور علی المیاح ـ یش ئەلێت «زمان چاکترین و کاریگەرترین هۆیە، لە کۆری جیاکردنەوەی گەلێك لە گەلێکی تر، وە ئەبێتە پایەیەکی گرنگ بو یەکگرتنی کۆمەلان، وەپیچەوانەکەشي جیابوونەوە دینێتە کایەوە».

وەکو خۆشمان سەرنج ئەدەین، نەتەوەی کورد پاراستنی زمانی خۆی بەمەرجی سەرەکی بایەخداری مانی خۆی داناوە، بۆیە والە هەموو نەتەوەکانی دراوسێی پتر دەستی بە زمانی خۆیەوە گرتووەو ئەیپارێزێت و گەشەی پێ ئەکات و لەفەوتان و لاواز بوون دووری ئەخاتەوەو لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە کوری پەرەپێدان و پێشکەوتن دا هەنگاوی گەورە گەورەی پێ هەلهێناوە. هەروەها پێشخستن و خاوێن کردنەوەی زمانی کوردی کردووە بە نیشانەی پێشکەوتنی نەتەوەی کورد بە تێگرایی.

لەبەر ئەوە ئەو دەوڵەتانەی ، کە بەیەك زمان قسە ئەکەن لای جیوپولیتیکي یەکان پایەیەکی بەهێزیان بو خۆیان دەستە بەر کردووە بەپێچەوانەی ئەمەوە فرەزمانی لەولاتێکدا لایان ئەبێتە هۆی گۆبەندنانەوە ئەوی راست بێت هەندی جار زمان کراوە . بەبەلگەو بیانووی بەسەر ولاتاندا کشان (التوسع) وەکو هیتلەر کاتی خۆی بەبیانووی زمانی ئەلەمانی یەوە هەندێ ولات و ناوچەی خستە سەر خاکی ئەلەمانیا وا دەولەتە ئەوروپاییە رۆژئاواییەکان لە ترسي هێزە چەکدارە بەسامەکەی ئەلەمانیا دانیاو نا بەوەی ئەلمانیا بەئاشتی نەمسا و سوێت و هەندی ناوچەی تر تێکەڵی خاکی ئەلەمانیا بکات.

بێ گومان لە ولاتێکدا گەلێك بەچەند زمانێ قسە بکات وسێبەری رەگەز پەرستی و کۆنەپەرستی و جیاوزی خوازی بالی بەسەر ئەو ولاتەدا کێشابێت ئەوا ئەم فرە زمانی یە ئەبێتە مایەی شەرو ئاژاوەو گیروگرفت . بەلام ئەگەر یەکسانی و مروڤ خوازی و دیموکراتی یەت فەرمانرەوا بێت ئەوا فرە زمانی گەلي و لاتێك ئەبێتە هۆی ئالوگۆری شارستانی یەت و زانست و رۆشنبیریتی لە نێوان گەلانی یەکگرتووی ئەو ولاتانەدا وەکو لە سویسرە بە چوار زمان قسە ئەکەن و هەر چوار زمانەکەش لە ئاستی دەستوورو یاسای دەولەتی سویسرەدا هاوتاو هاو سەنگن کە ئەمانەن ،زمانی فەرەنسایي و ئیتالی و ئەلەمانی و رۆمانی کۆن.

هەروەها لە هندستان سەرەرای ئەوەی 42 ./.ی خەلکی هندستان بە زمانی هندی ئەدوین، لەگەل ئەمەشدا دەستووری هندستان دانی بە (15) زمانی سەرەکی و 720 دیالێکت و 42 زمانی پچووك و 23 زمانی عەشیرەتی دا ناوە.

وە لە بەلجیکا دوو زمانی هاوتا بەپێی دەستووری بەلجیکا هەیە زمانی فلمنك لە باکووری ولات کە ئەچێتەوە سەر زمانی ئەلەمانی وزمانی والون لە باشووری ولات کە ئەچێتەوە سەر زمانی لاتینی.

بۆیە پێویستە، کە سیاسەتی دەرەوەی هەر ولاتێك و هێزی دەولەت و چۆنێتی خەلکەکەی هەلئەسەنگێندرێت سەرنج بدرێتە زمانی خەلکەکەی و بزانرێت ئەچێتەوە سەر زمانی چ گەلیکی ترو لەو دەولەتەدا چەند زمان هەیەو هەر زمانەش پەیوەندی بە زمانی چ نەتەوەیەکی ترەوە هەیە.

## 3 ـ نەتەوەو نەتەوەی جۆی جۆیو کەمایەتی نەتەوایەتی :

هەروەکو زانایانی زانستي سیاسي و کومەلایەتی خۆیان خەریك کردووە بە بەبابەت و لیکولینەوەی نەتەوەو پەیدابوونی و گەشەکردنی و کیشەو گیروگرفتەکانی یەوە ، هەروەها زانایانی زانستي جیۆپۆلیتیکس ـ یش لەهەمان ئاست و ئەندازەدا وەبگرە هەندی جار زیاتر یش شارەزابوونی ئەم بابەتە زانستی یەیان لاگرنگ و بایەخدارە.

میژووی شەری جیهاني دووەم ئەم نرخ و بایەخە بە باشی رۆشن ئەکاتەوە کە نازییەکانی ئەلمانی رەگەزی ئاریو نەتەوایەتی جەرمانییان کرد بە بەردی بناغەی پروپاگەندەو ئایدیولوجییەتی بزوتنەوەکەیان لە دەزگا جور بەجورەکانی راگەیاندنی دەولەتی ئەلەمانی دا.

لەلایەکەوە پروپاگەندەیان بۆ پایە بەرزی رەگەزی ئاری ئەکرد لە نێو رەگەزەکانی ترداو لەهەمان کاتدا داوای یەکێتیو سەرکردایەتی نەتەوەی ئەلمانییان لە دنیادا ئەکرد. وهەر بەبیانووی جێبەجێ کردنی ئەم نیازەوە شەرری دووەمی جیهانییان هەلگیرساند.

ئەوی راست بێت وەکو سەرمایەدارە ئیمپریالی ومونوپولییەکان رەگەزایەتیو نەتەوایەتییان بو داگیرکەریو چەوسانەوەی گەلانی تر بەکار هیناوە ،گەلێ نەتەوەی تر، کە خۆشي ئەبێ وابیت، نەتەوایەتیان، یان راست تر، بیروباوەری نەتەوە پەرەوەرییان کردووە بە ئالای پیروزی پێش لەشکری خەبات و تێکوشان، لە پێناوی رزگاریو سەربەستیو کامەرانیداو کردویانە بە چەکێکی کاریگەری دەم ئەلماس لە گورەپانی بەربەرەکانی ئیمپریالیزم و داگیرکردنداو لەپێناوی یەکێتیو بەختیاری سەرجەمي نەتەوەکە دا.

ئەوەتا بزوتنەوەی ئازادی خوازانەی عەرەب ،یەکێتی نەتەوایەتی کردووە بە چەکی خەبات دژی ئیمپریالیزم و داگیرکردن و بەش بەش کردنی خاکی عەرەب هەروەها گەلی فەلەستین ،هەموو گەلانی عەرەبی کردووە بە دوژمنی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاو داگیرکەرە زایونیستییەکان.

هەروەها نەتەوەی کوردیش ریگای بزوتنەوەیەکی ئازادی خوازانەی پێش کەوتن خوازی لەپێناوی رزگارییو مافی نەتەوایەتی رەواو بەختیاری دا گرتوتە بەر و بزوتنەوەکەی خستوتە ئاستی بزوتنەوە پیش کەوتن خوازییە مروڤ پەروورییەکانی جیهانەوە.

بیگومان بزوتنەوەی نەتەوایەتی دوو دەمی تیژ ی هەیە، لە رێبازی ئازادیو بەختیارییو مرۆڤ پەروەریدا لە نیو گەلانی ژ یر دەستەو نیوە ژ یردەستەو تازە رزگار بوودا ئەبێت بە بزوتنەوەیەکی پیروزی مرۆڤ دۆستانەو دژ بە ئیمپریالیزم، ولە سێبەری رژێمیکی سەرمایەداری گەورە، یان بەهۆی ئایدیۆلۆجییەتیکی رەگەزپەرستانەی کۆنەپەرستانە، ئەچێتە ئاستي بزوتنەوەیەکی دوژمن بەخێرو خۆشي و کامەرانی ئادەمزادەوە.

بێگومان نەتەوە ،یان خەلك، یان گەلان مەرجي بنەرەتی پەیدابوونی دەولەتن وەبەبێ ئەمانە دەولەت دروست نابێت ،بۆیە ئەبێ لەواتاکانی تێ بگەین و هەندی نمونەیان لەسەر بهێنینەوە.

زانایانی سیاسیو کومەلایەتی هەریەکە بە جۆریك باسي نەتەوە ئەکەن هەرچەندە مەرجە بنچینەییەکانی هەموویان لەچەند خالێکی ناو کویي دا خۆیان ئەگرنەوە.

نەتەوە پەرەوەری بەناوبانگی عەرەب ساطع الحصری دوو مەرجي سەرەتایی بو نەتەوە ناسین داناوە، زمانی یەکگرتوو میژوویەکی ناوکویی، وە ئەلێت کە ئەم دوو مەرجە هاتە کایەوە هەستێکی نەتەوایەتیو رۆشنبیری یەکگرتووش دێتە نیو کۆمەلانی خەلکی نەتەوەکەوە .بەلام ستالین کە باسي نەتەوە ئەکات زەوییەکی دیاریکراو .بەلام ستالین کە باسي نەتەوە ئەکات ئەلیت «کومەلە خەلکێکی دامەزراووی نا کوچەرن زمانێکی یەکگرتوو خاکێکی دیاریکراوو ئابووریيەکی ناو کویي ومیژوویەکی ناوکویي یان هەیە وژیانێکی رۆشنبیری ناوکۆیي کە

بە هەستی ناو کۆیی دەری ئەبرن».

بەلاٌم دوکتور صلاح الدين علي الشامي ئەلْێت «نەتەوایەتی کە بلاوبوتەوەو بووە بە پایەکی سەرەتایی قەوارەی سیاسي بێ دائەمەزریت بریتی یە لە زمانێك ومێژوویەك و میراتێکی ناوکویی، کومەل خەلکێکی پێ بەیەکەوە ئەبەستێت».

ئەوی راست بێت گەلێك لەزانایان کە خۆیان بەخەلك و گەل و نەتەوەو دەولەتەوە ماندوو کردووە گەلێ جار ئەمانەیان، یان واتاکانیان لێ تێکەلاٌو ئەبێت، نەتەوە ئەکەن بەگەل و گەلان ئەکەن بەنەتەوەو نەتەوەی پچوك ئەکەن بەکەمایەتی نەتەوایەتی، یان هەر بەکیش و پێوانەیەکی تر واتای نەتەوە لیك ئەدەنەوە بۆ نمونە ئەوانەی بە ئایدیولوجی یەتی ئایینی ئیسلامی یەوە بەندن هەموو موسولمانانی جیهان بەیەك نەتەوە ئەزانن وەهەندیك لە هەر ولاتێك دا هەر نەتەوەیەك لە چ ئاستێکدا لە نەتەوەیەکی تر پچوك تر بوو پێ ئەلین کەمایەتی نەتەوایەتی (الأقليه ألقوميه). بویە پێویستە واتای ئەم وشانە بەراستی بەکار بهێنریت چونکە راستەو خۆ واتای وشەکان پەیوەندی هەیە بە مافی ئەو، گەل و نەتەوەو نەتەوەی پچوك و کەمایەتی نەتەوەوە کە ئەمیش لە شي کردنەوەو باس کردنی دەولەت و سیاسەتی دەرەوەو چارەنوسي گەلاندا رەنگ ئەداتەوە، کە ناوەرۆکی بابەتی باسي زانستي جیۆپولیتیکسە.

وەکو لە پێشەوە باسکراوە نەتەوە ئەو کومەلە خەلکەیە، کە زمان و هەست و شارستانێتی و خاك و مێژوو ئابوری یەکی ناوکۆیی و یەکگرتوویان هەبێت وئەم واتاو راستی یە هیچ پەیوەندی یەکی نی یە بە زۆری و کەمي ژمارەی خەلکەکەیەوە واریك ئەکەویت نەتەوەیەك ژمارەی ملیۆنێك کەس بیت و نەتەوەیەکی تر دە ملیون یان سەد ملیون یان زیاتر.

هەروەها رێك ئەکەویت نەتەوەیەك بە تەنیا لەسەر خاکیك وە لەچوارچێوەی یەك دەولەتدا بژی و ریکیش ئەکەویت دوو نەتەوە وزیاتر خاکەکانیان دابێتە دەم یەك و هەموویان لە چوارچێوەی یەك دەولەتی یەکگرتوو، یان فیدرالّي یان کونفدرالي دا بژین بێگومان کە دوو نەتەوە یان زیاتر لە قەوارەیەکی وادا پێکەوە ژیان هەر یەکێکیان بە ژمارە لەوی تریان زیاتر ئەبێت، بەمە نەتەوە کەم ژمارەکە نابێت بە کەمایەتی نەتەوایەتی، وەکو زۆر جار زانایانی بێگانە لە باسي نەتەوەی کوردا پێی ئەلێن کەمایەتی نەتەوایەتی کورد بەلکو بەم جۆرە نەتەوانە کەهەموو خاسي یەتی نەتوایەتی یان لە خۆیانا کۆ کردۆتەو هو لە چواچیوەی دەولەتیکدا لەگەل نەتەوەی تر دا ئەژین پێیان ئەوترێت نەتەوەی پچووك یان دووەم و سێیەم نەتەوە لەچاو نەتەوە هاو بەشەکانی تریانا بەلاٌم کەمایەتی نەتەوایەتی بەوانە ئەوتریت کە لە خاکیکی ترەوە هاتبێتنە ولاتێکی ترو لەسەر خاکی نەتەوەیەکی تر بە کومەل یان پچر پچر لەم لاو ئەو لای ئەو ولاتە دا بژین وەکو ئەرمەنی لە لوبنانداو تورك لە بولگاریاو جەزایری لە فەرەنسا. وەنەتەوەی پچوك شەریکە خاك و شەریکە بەشي تەواوی هەموو مافە نەتەوایەتی و مروڤایەتی و نیشتمانی یە لەگەل ئەو نەتەوە گەورەیەی لەگەلیا ئەژین و هەرجیاوازی کردنێك لەم شەریکایەتی یە دا ئەبێتە هوی پەیدابوونی کیشەی نەتەوایەتی و گیروگرفت پەیدابون و ئارەزووی جیابوونەوە خوازی لە نێو نەتەوە پچوکەکە دا کە ئەمەش قەوارەی دەولەتە یەکگرتووەکەی پێ هەلئەوەشێنەوەو دوژمنانی ئەو دەولەتەی پێ خوش ئەکات. هەر لەبەر ئەمەشە دەولەتە سوشیالیستی یە علمي یەکان و دیموکراتی خوازەکان لە سەرتاوە بایەخێکی گەورەیان بەم دیاردەیە داوەو دەولەتانی تریش چاویان لێ کردوون و گەلێکیان چارەسەریان کردووەو هەندێکی تریان لە ئاست و پلەی جۆراو جۆردا رێگاو نەخشەی سازکردنیان بۆکێشاوە هەندێك بە دامەزراندنی ئەتونومي (الحکم الذاتی)و هەندیکی تربە یەکیتی فیدرالّی و هەندیکی زۆرکەمیش بە کۆنفدرالّی کە راستی یەکەی ئەمەی دواییان زۆر کەم خۆی لە مەیدانی ماندا راگرتووە.

دوکتور صلاح الدين الشامي، فەرەنسایەکانی کەنەدا ئەکات بەنمونەو ئەلێت ئەبوایە ئەم کەمایەتی یە نەتەوایەتی یە هەستێکي یەکگرتووانەی لەگەل بەشە زۆرەکەی ئینگلیزی کەنەدا هەبوایە

دباری‌کراو نابێت به دەوڵەت و چۆنێتی ژیانی خەلکەکەو کەمو زوری‌و پێشکەوتن ژمارەو تەندروستی‌و ئاستی گوزەرانیان و . . . هي هەر دەوەلەتێك بێ هیز یان به هیز ئەکات وەپەیوەندی راستەو خۆیان هەیە به ئاستی دەرامەت و ئابوری‌و هیزی عەسکەری‌یەوە. ئەمەش بەشێکە لەو زانستی‌یەی جیوپولیتیکس لی‌ی ئەکولێتەوە.

لیرەدا زۆری‌و کەمی خەلکی دەولەتێك وچالاکی ئەو خەلکەو دابەش بوونیان بەسەر شارو لادی داو قەوارەی چینی کریکارو ئاستی بەرهەم هینانی ئەم چینەو قەوارەی لاوان به گشتي لەچاو قەوارەی منال و خەلکەکەدا لای زانایانی جیوپولیتیکس و جوگرافیای سیاسي بوون بەکەرەسەی گرنگی لیك دانەوەی هیزو لاوازی هەر دەولەتیك، له ئاستی ئابوری‌و عەسکەری‌و کومەلایەتیدا. که ئەم زانستی یه پارسەنگی هەر دەولەتیك له نێو دەولەتانی تری جیهاندا قورس و سوك ئەکات وەبەم پێ‌یە دەولەتانی تر پێوەندی سیاسی‌و ئابوری‌و عەسکەری خویانیانی لەگەلدا ریك ئەخەن.

وه لەنێو ئەم خالانەی پێشووی ئەم باسە دا ئاستی هاتنە جیهانی منالانی خەلکەکەو پلەی تەمەن بایەخێکی زۆری پێ دراوه ،چونکه ئەو دەولەتانەی منالی تیا زۆر له دایك ئەبێت و کەمتر لی‌ی ئەمریت، هیزێکی زۆری لاوانیان دیته بەر دەست که کەلکیان لێ وەرئەگرن له جەنگ و له ئاشتی دا، وەئەم لاوانه له ریزی بەرهەم هینان و ریزەکانی سوپا دا کار ئەکەن.

دکتور علی المیاح بەراوردێك له نێوان روسیاو یەکێتی سوڤییەتی ئیستا لەگەل روژئاوا دا ئەکات وئەلێت چونکه خەلکی ئەم ولاتەی یەکەم بەشێکی زۆریان بەکشتوکالەوه خەریك بوون و خەریکن حەزیان له منال زۆری کردووه، به پیچەوانەی گەلانی ئەوروپای روژئاواوه که منال زۆریان پێ‌خۆش نی‌یه، روسیاو یەکیتی سوڤییەتی ئیستا توانیان بەسەر ناپلیون و هیتلەر واتا فەرەنساو ئەلەمانیا دا له جەنگدا سەرکەون. هەروەها چین دژی پەلاماری ژاپون خۆی رابگریت.

چونکه هیزیکی گەورەی لاوانیان بەدەستەوەیه که سەرچاوەیەکی پر سامانن له کۆری بەرهەم هینان و خزمەتگوزاری سوپاییدا.

ئیڤالدبرانس ( EWALd BRanse ) پروفیسور وئەندامی کومەلەی زانستي و سیاسەتی عەسکەری ئەلەمانی له کتیبی «خەلك و هەریم له جەنگیکی جیهانی‌دا space and peopLein The « woRLd waR دا ئەلیت «ئەگەر سەرنج بدەینه جوگرافیای جەنگ راستەو خۆو بەرروونی بۆمان دەرئەکەویت که رووداوەکان و ئەنجامي هەموو جەنگێك پەیوەندی‌یەکی توندیان به هەریم و خەلکەوه هەیه». هەروەها (تریسچك) یەکی له هەلگراني مەشخەلي هیتلەر ئەلیت «. . . ناحەزانی سیاسەتی ئیمه ناتوانن لەو راستی‌یه بگەن که قەوارەی ئەلەمانیا بەنده به ملیونان خەلکەوه که له دووا روژدا به ئەلەمانی ئەدوێن».

وتەی ئەم دووانه راستەو راست لەگەل ئایدیولوجی‌یەتی جەنەرال هوسهوفەری ئەلەمانی دا جووت ئەبن که بەپی‌ی ژمارەی خەلکی، ئەلەمانیا بەدوای «دەرفەتی بایەخدار ـ المجال الحیوی»ی پێویست دا ئەگەرا کەبوو بەهۆی هەلگیرساندنی جەنگی دووەمي جیهان و لەژمارەی پیشوودا به دوورو دریژی باسکراوه.

هەروەها بەپی‌ی هەمان بۆچوونی جیۆپۆلیتیکسي، موسولینی له سالی 1927 وتاریکی له پەرلەمانی ئیتالیادا خوێندەوه ووتی «. . . هیزی سیاسي و ئنجاهیزی ئابوری‌و ورەی خەلکي به زۆربوونی ژمارەی خەلکەوه بەندن. ئەگەر ژمارەمان کەم بو وەوه ئەوا ئیمپراتوری‌یەتمان بێ دانامەزرێت بەلکو ئەبین به ژیر دەسته».

بێ‌گومان لەبەر روشنایی لیکدانەوەیەکی جیۆپۆلیتیکسانه دا زۆر بوونێ خەلکی دەولەتێك ئەم دوو دیاردەیەی لێ ئەوەشێتەوە:

1 ـ سەبارەت بەوەی زۆربوونی خەلکی دەولەتان چوون یەك نی‌یه، بەپی‌ی کەموو زۆری، ئەم خەلکه هێزی سیاسي دەولەتانیش زیادو کەم ئەکەن.

2 ـ زۆر بوونی خەلکی ئەبێته هۆی گەران به دوای سەچاوەی سامانی نوێی سەرزەمین.

بۆیه هەندی زانا، زۆر بوونی خەلکی به خیروبەرەکەت و

سەرچاوەی هێزو بەرهەم هێنان ئەزانن، وە هەندێکی تریان لایان ئەبێت بە گیروگرفت چونکە ئەبێ خواردەمەنییان بۆ مسوگەر بکرێت.

دەربـــارەی زۆر بوونی لەخەلکی مالثــوس ئابــوری زانی ئینگلیزی زۆر بەد بینانە سەیری ئەم دیاردەیەی ئەکردو ئەیوت:

«خەلکی بەپێی متەوالیەی هەندەسی زیاد ئەکەن بەلام بەرهەمی خواردەمەنی بەپێی متوالیەی عەدەدی لەبەر ئەوە بۆشاییەکی گەورە لەپاش چەند سالێکی کەم ئەکەوێتە نێوان خەلـکی و خواردەمـــەنییـــەوە کە ئەنجـــامێکی زۆر رەش و تارێکی ئەبێت، بۆیە ئەبێ جەنگ و نەخۆشی فرە کوژ وەکو تاعون ورشانەوەمان پێ خۆش بێت تاکو پارسەنگی خەلك و خواردن بگـەرێتـەوە دۆخی ئاسـایی خۆی.» بەلام گەنیـە ئابـــوری ناسـی دوای جەنگی یەکـــەمی جیهـــانی تـ... بینییـەیــان بە هیــچ ئەزانیو ئەیـانوت زانست و تەکنولوجیا هەمیشەبەرەو پێش چوو نایەڵن ئەو جیاوازییە پەیدا ببێت.

راستـــە دەیـــان سەدان سالّ لەمـەو پێش، کە زانست و تەکنـــولـــوجیـــا ئاست و پایـــەیـەکی ئەوتـۆیـان نەبـووە، تا چارەســەری گیروگرفتەکانی ئادەمزاد بکەن و فەرمانرەواکانی دەولـەتـانی ئەو کاتـەش دواکـەوتـوو کۆنەپەرست و زۆردارو خوێنــرێــژ بـوون داگیـرکـردن و کوچ کردنی بەکـۆمـەڵ لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێك ولەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تریان لە جێگـایـەکی ئاوەدانـەوە بۆ ناوچـەیـەکی چۆڵەوانی کردبووبە رێـبازی چارەســەرکردنی کەم دەرامەتیو برسێتیو قاتوقریو بێبـــەرهـــەمیو فرەبـــوونی خەلکی ولاتێـك، یان ناوچـەو هەریم و جێگـایـەك. بەلام ئیستـاو لە سێبەری شارستانێتی پیشکەوتوو زانست و تەکنولوجیای ئادەمیزادی ئەم سەدە یەدا ولـەژێـر سیبـەری پێوەندییە مرۆڤایەتی وسیاسییەکانی نێو دەولـەتـانی دنیـاو بوونی رێکخـراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی دنیـــا و بەهێـزبـوونی بزوتنـەوەی ئازادی خوازانـەی گەلانی جیهـانی سێیـەم و بەرەی دەولـەتـانی سوشیـالیستیو بەهێـز بوونی بزوتنـەوەی کریکـارانیو لاتـانی سەرمادارو سەرجەم بەهێز بوونی بزوتنەوەی ئاشتی خوازانەی جیهان، پێویستە کێش و پێـــوانـــەیـــەکـــی تر جیـــگـــای خۆی لە کۆری چارەســەرکـردنی گیـروگـرفتـەکـانی ئادەمیزادا بکاتەوەو بێتە مەیدانی کارو فرمانەوە.

لەگەڵ ئەم راستییەی سەرەوشدا هیشتا پەیوەندییەکانی سیـــاسیو ئابوریو عەسکـەری نیـو دەولـەتـان لەهـەمـوو شوێنێکیـدا وەلـەگـەل هەموو دەولەتێکی ئەم جیهانەدا لەسەر پێی خۆی زانـــەوەستـــاوە بۆیـە زانـایـانی زانستی جۆر بە جۆری مرۆڤـایـەتی بە دوو لایـەنی ئەم بابـەتـەوە خەریکن یەکەمیان سازکردنی گیروگرفتەکانی دیموگرافیا لە ناو خۆدا واتـە هەر دەولـەتـە لە چوارچێـوەی سنووری خۆیداو دووەم پێـوەنـدی ئەم بابــەتـــە بە دەولـەتـانی ددراوسێو دوورو نزیکـەوە. وەبـەگشتی دەربـارەی دیمـوگرافیای خەلکی هەر دەولەتیك سێ خالی سەرەکییان خستۆتە بەر چاو کە ئەمانەن:

1 - ژمارەی خەلك.

2 - چرری (الکثافة) دانیشتوان.

3 - جێگا گۆرکیی دانیشتوان وەئەم جێگا گۆرکێیە باری ئابۆریو عەسکەری وبنیات نان چۆن ئەگۆریت وەرەوندیو کوچ کردن لە ناوخـــۆو بۆ دەرەوەو لەدەرەوە هاتـن چێیـــان بەسەر ئەهێنێت.

پێش ئەوەی هەنـدێـك لەم باسـە بدوێین پیـویستـە ئەوە روون بکەینەوە، کە هیچ باس و بابەتێك نییە لە جیهاندا خۆی بە تاقی تەنیاو سەربەخۆ هەلسوریت، بەلکو هەموو وەلـەگـەل هەمـوو بابەتەکانی تری ئەم جیهانەدا کەموو زۆر بەیەکەوە بەستراون و یەکتری پێش ودوا ئەخەن و بەم لاو بەو لادا هەلئـەسـورین، بۆیـە پێـویستـە خوینەر سەرنجی ئەم لایەنەی باسەکە بدات لەبەر ئەوە ژمارە زۆری خەلکی وەك لەپیشـەوە باسکـراوە لە چەنـد روویـەکـەوە هێـزو توانایە بۆ بەرهـەم هێنـان و سوپـا، لەلایـەکی ترەوە بەتـایبـەتی لە نێو دەولـــەتـانی کەم سامـان و کەم پێشکـەوتـوو ئەبێت بەبـارو ئەرکێکی گەورە ومـایـەی تەنگـوچـەلەمەو نائارامی سیاسیو ئابوریو پەیدابوونی یاخی بوونی عەسکەریو شەروو هەللا

کەچي راستی‌یەکەی هەر هەستی کەمایەتی‌و یەکنەگرتنیان هەیە.

وەئـەم هەستی ئامێتـە نەبـوون و تێکەڵ نەبوونە پەیکەر وقەوارەی خەلکی کەنەدەی لاواز کردووەو ئارەزووی جیاوازی خوازی تیا جولاّنوزەتەوە.

هەروەهـا دوکتـور صلاح الـدین بەکـاڵ و کرچیش باسي کوردی عیراقی کردووە. بۆیە باسەکەیم نەهانیوەتە کایەوە.

ئاشکرایە بەپیّ‌ی دەنگوباسی دەزگاکانی راگەیاندنی دەوڵەتان چۆنێتی ژیانی فەرەنسـاییەکانی کەنەدا نەك هەر یەکیتی ژیان و گوزەرانی سەرجـەم خەلکی کەنـەدەی بە ئینگلیـزو فەرەنسـاییەوە شێواندووە بەلکو پێوەندی سیاسي و پێوەندی نێو دەوڵەتی دەوڵەتی کەنەدەو فەرەنساشي گرژ و ناخۆش کردووە.

هەروەها دوکتور صلاح الدین سیاسەتی خۆ بەگەورە زانین و بەچـاوی سوك سەیـری نەتـەوەی پچـوك کردن و کەمـایـەتی نەتـەوایـەتی‌و چەوسـانەوەی نەتەوایەتی تاوانبار ئەکات و ئەیکاتە هۆی بنـەرەتي پەیـدابـوونی کێشـەی نەتـەوایـەتی‌و ئارەزووی جیـابـونـەوە خوازی لە چوارچێـوەی دەولـەتێکی فرە نەتەوە دا. وەهـەر بەپیّ‌ی ئەم بۆچـوونە کە بەپیّ‌ی جوگـرافیـای سیـاسي قەوارەی دەولـەتـان شي ئەکـاتـەوە ئەلێت قەوارەی دەولـەتان بەم جۆرەی خوارەوەن:

أ ـ قەوارەی بەیەکەوە بەستراوی ئاسایي:

لە ئەنجـامی هەنـدی مەرج و دەرفـەتی تایبـەتی کۆمـەڵـە خەلکیکی چوون یەك و یەکگـرتـوو قەوارەیـەکی بەیـەکـەوە بەستـراوی ئاسـاییـان پێـك هانیـوەورەنگـە مەرجي سروشت کار (الطبیعی)یش دەستی لەم قەوارەیەدا هەبێت. هەروەها قەوارەی وا ئەتوانێت بێگانەو خەلکی رەوەکیش لە خۆیا بتوێنێتەوە.

هەروەهـا لەسـەر باسـەکـەی ئەروات و ئەلێت قەوارەی وا ئەتوانێت ببێت بە یەکێتی‌یەکی سیاسي ئەو تۆ، کە خەلکەکەی بیّ گیرو گرفت لیّ‌ی کۆ ببنەوە، وەخۆیان لەناکۆکی‌و دوو بەرەکی دوور بخەنەوە وببن بە دامەزراوێکی کۆمەڵە ئادەمزادێك بەردی بناغەی چووون یەك بێت و قیافەتی قایم و بەکگرتوو. وە گەلي میسری کردووە بە نمونەی ئەم جورە خەلك و پەیکەرە.

ب ـ قەوارەی یەکگرتووی تیروپر (المتکامل):

ئەم جۆرە بریتی‌یە لە چەند قەوارەیەك کە قازانجی ناوکویي و پێویستی لە چوارچێوەی یەکێتی‌یەکی سیاسی دا کۆ کردوونەتەوە. وەهـەر قەوارەیـەك خاسی‌یـەتی تایبـەتی‌و زمان و رەنگە کەلەپورو میراتی تایبەتی خۆی هەبێت.

وەهـەمـوویـان جگـە لە پەیـوەستی تایبەتی خۆیان، بەزەوی‌و هەموو هۆیەکانی تری بەیەکەوە ژیانەوە پەیوەستن هەروەها ئەلێت سەیـر نی‌یـە ئادەمیـزاد بەچـەنـد شتێکـەوە پەیـوەست بێت بەو مەرجەی قەوارە یەکگرتووەکە، وە بیروباوەری ناو کویي تیرو پر بخـاتـە ژوور ئەوانی ترەوە وەهـەر کەمتـەرخی‌یـەك دەربارەی ئەم لایەنە یەکێتی سیاسي دووچاری ناکوکی‌و دووبەرەکی ئەکات و هەرەشەی پچڕ بوونی لیّ ئەکات بەریتانیا وەکو نمونەی ئەم جورە قەوارەیـە ئەخـاتـە پیش چاو کە لە چوار قەوارە پێـك هاتـووە، قەوارەی ئینـگلیـز لەئینگلتـەررا وقـەوارەی سکـۆتلەنـدی لە سکۆتلەنداو وقەوارەی ویلزی لە ویلزو قەووارەی ئیرلەندی لە ئیرلەندا.

ج ـ قەوارەی پێکەوە لکاوی ریکوپێك (الکیان الملتئم المتلائم):

ئەمـەش جۆرە پێکـەوە بوونێکی ترە کە دەرفـەت و زروف و مەرجی تایبـەتی هانیـویتی‌یە کۆری ژیـانـەوەو چەنـد کومـەڵـە خەلـکێکی لە قەوارەی جیـاجیـاو خاوەن هەست و پەیـوەستی تایبـەتی فرانـدووەو لە خۆی کۆکـردۆتـەوە و لە کۆرێکی نویّ‌دا جۆشي داون و لەبۆتەیەکی نویّ دا هەمووی توانونەتەوەو رەگ و ریشە کۆنەکەی لە بنەرەتا هەلکەندوون.

نیـازی لەم قەوارەیـەش ولاتـە یەکگـرتـووەکـانی ئەمـەریکـاو ئوستـرالیـایـە کە لە هەمـوو کوچـەو ولاتێکـەوە کۆچیـان بۆکردووە وقازانجی ناوکویی بەیەکێوە لکاندوونی.

لەگـەل ئەوەشـدا ئەلێت هەنـدی کەمـایـەتی جیـاواز وەکـو هینـدی‌یـە سوورەکـان و قولـەرەش و ئوستـرالیـاییـە رەسـەنـەکان

بەتەواوەتی ئامیتەی کومەلە خەلکە سێی پێستەکە نەبوون و جیاوازییان لەگەل ئەکریت و دوو چاری چەوساندنەوە بوون.

4 ـ ئاین (الدین):

زانایانی ئەم باسە لەو بروایەدان کە ئاین دیاردەیەکی گرنگە بەشێکی زۆری کومەلانی خەلکی دنیای پێوە بەستراوەو جێ پەنجەی ئەم پێوەبەستنەش لە نەخشەی سیاسی ئەم جیهانەدا دیارە ئەوی راست بێت ئەم بایەخە لە سەدەکانی پێشوی مێژووی ئادەمیزادا بەشێوەیەکی ئاشکراو روون تر ئەهاتە بەر چاو بەلام لەگەلێ ئەوەشدا تا ئیستا ئاین رێبازیکی گرنگ و بایەخێکی گەورەی لە دنیادا هەیە. لەلایەکەوە وەکو رێرەوێکی ئایدیۆلوجی کە رابەری چاکەو خراپەو رەوشتی رۆژانەی بەشێکی هەرە زۆری ئادەمیزاد ئەکات و لەلایەکی تریشەوە تا ئیستا کەم و زۆر لەم کەرت و لەو کەرتی ئەم سەرزەمینەدا رەوشتی دەولەتان و پێوەندییە سیاسییەکانی نێو دەولەتانی بەخۆیەوە خەریك کردووە.

و لەزۆر جیگەی ئەم جیهانە دا ئاین خوازەکانی جیهان ریگای ئاشتي خوازیو دادپەروەرییان گرتۆتە بەر.

بۆ نمونە دەولەتە عەرەبیو ئیسلامییەکان خۆیان لە کۆنگرەیەکی ئیسلامي دا کۆکردۆتەوەو بە رنامەی هاوکاری نێو گەلانی ئیسلام و ئاشتی خوازی وپشتگیری بزوتنەوەی ئازادی خوازی گەلە ئیسلامییەکانیان کردووە بەسەر مەشقی خۆیان. وەتا دێت ئایینی ئیسلامی تۆزی لاوەکی کۆن لە خۆی ئەتەکێنیو ئەبێتە بزوتنەوەیەکی هاوشان و هاوکاری هەموو بزوتنە دادپەروەرو رزگاری خوازەکانی تری جیهان.

وەئەم لایەنەی کە ئیمپریالیست و کونەپەرستان بە زۆر ئەیانەویست بەسەر ئاینیا بسەپێنن و بەناوی ئاینەوە خاوەن ئاینە چۆر بەجۆرەکان لە پێناوی قازانجی نارەوای خۆیاندا بکەن بەگژ یەکا خێرا لە ئەنجامي کردەوە ناراستەکانی خۆیاندا پوچەل ئەبووەوە. بۆ نمونە لە دوو جەنگی گەورەی جیهانی دا دەولەتانی خاوەن گەلانی مەسیحی ئاین چوون بەگژ یەکتریداو ولاتانی یەکترییان ویران کردوو ملیونان خەلکی بی‌تاوانی یەکترییان بە ناهەق کوشت.

راستە لە دنیادا دوو دەولەت و فاتیکان لەسەر بناخەی ئایینی ئیسلامي و موسایي و مەسیحی دامەزراون بەلام هەریەکەیان کومەلە زروفو مەرج و دەرفەتی تایبەتی بەو شێوەیە قەوارەی بۆ کێشاون.

ئەم سێ قەوارەیەش دووانیان قەوارەی پاکستان و زایونیستییەکانە کە هەردووکیان لە سالی 1947 دا دامەزراون بەپێی دوو جۆر مەرج و زروفي جیاواز، هاتونەتە ریزی دەولەتانەوە.

لە زۆربەی زۆری ولاتانی دنیادا جیاوازی ئاین نەبوەوە بەمایەی کێشەو بەرە هەرچەندە تائیستا لە هەندی دەولەتی دنیادا سیاسەتی جیاوازی کاری ئایینی، دەولە تە جیاواز کارەکانیانی بەم کێشەیەوە ماندوو کردووە وەکو لوبنان و فلیپین و ئیرلەندەی ژوورو. کەئەمەش بەلای زانایانی جیوپولیتیکەوە بوتە مایەی گرژیو شلەقاندنی ریزی خەلکی ئەو ولاتانەو دوژمنانیان لێ هان ئەدات کەبە ئاسانی زەفەر بە یەکیتي ریزەکانی خەلکی ئەو ولاتانە بەرن.

بۆیە سیاسەتی دلّ فراواني و لێبوردن و ریزگرتنی هەموو ئاینێك یەکیتی دەولەت ئەپاریزیت و پێچەوانەکەشي زیانی پێ ئەگەیە نیت.

## دووەم : دیموگرافی - DemogRaphy -

لە فەرهەنگی (المورد) دا ئەلێت «دیموگرافیا لێکولینەوەی سەر ژمیری خەلکە دەربارەی هاتنە دنیاو مردن و تەندروستیو ژن هێنان و ....».

وەکو لەپێشەوە باسکراوە دەولەت بەبی کومەلە خەلکێکی

له نێـو دەوڵـەتـانـدا هەروەك هەنـدێ جاریش ئەبێتە مایەی تێکـەڵ بوونی شارستـانێتی پیشکـەوتـوو وەبـەرزبـوونـەوەی ئاستی شارستانیی یەت لە هەندێ ناوچەی تازەپیشکەوتوو، یان هەر دواکەوتوودا.

لەگـەڵ ئەمـانـەی سەرەوشـدا ژمـارەیـەکی ریکـوپێکی دامـەزراو لە قەوارەیـەکـی گونجـاوو پڕ پیتـو بەرەکت و چڕیەکی ئاسایی و جێگا نەگۆرکێی بێ سەرو شوین چ دەربارەی زۆر بوونی دانیشتوان وچ کوچ کردن لە ولاتێکەوە یان کوچ بۆ ولاتێك کردن لە دەرەوە ئەبنە هۆی هیزو توانای دەوڵـەتـانی خاوەن ئەم مەرج و دەرفـەتـانـەو دەوڵـەتـانی چاوبرسیش زۆرو زیاتر، پێش هیرش بردنە سەریان و تەماع تێکردنیان، بیر لە کردەوەکانیان ئەکەنەوە.

لەبـەراورد کردنیکـدا دوکتـور صلاح الـدین الشـامی دەربارەی چڕی خەڵکی میسر ئەڵێت میسر، کە نزیکەی 38 ملیـون کەسـە چڕی دانیشتـوانی بە شێـوەیـەکـە، قورسـاییـەکی زۆری خستـۆتـە سەر داهـاتی ولات. وئـەم قورسـاییـە بەهـۆی زیـادبوونی خەڵکی یەوە، ساڵ لە دوای ساڵ ئەرکی ئابووری ولات قورس تر ئەکات، کە ئەمەش ئاستی ژیانی خەڵکی بەرەو خوارەوە خلۆر ئەکاتەوەو بەشی تاکـەکـەسێـك لە سەرجـەمی داهـاتیْ نەتـەوایەتی (الدخل القومی) بەرەو کەمی ئەبات.

هەروەهـا لەبـەراوردکـردنێکی گوران و جێگـا گۆر کێ‌ی دانیشتـوانـدا (التغیر السکـانی) دوکتـور محمـد ریـاض دەربـارەی بەریتـانیـاو ولاتـە یەکگـرتـووەکـانی ئەمـەریکـا لەلایەك و بەرازیل و هندستان لەلایەکی ترەوە ئەڵێت «دوو دەوڵـەتی یەکـەمیـان لەچـاو جیهاندا پلەی گورران تیایانا لە مام ناوەندی کەمترە، کەچی هی دوومیان بەپێچەوانەی ئەم دوو ولاتەن.

وئەڵێت ئەم جێگا گۆرکێیە تەرازووی وزەی خەڵکی ئەو دەوڵـەتـانـە ئەشێـوینێت کە لەم کۆرەدا دەوڵـەتـانی تازە پێشکـەوتـوو (النـامی) بەشـە زۆرەکـەیان بەرکەوتووە کەبۆتە هۆی پەیدابوونی جیاوازیەکی دیارو فراوان لە نێوان ئەم دەوڵـەتـانـەو دەوڵـەتـە پێش کەوتـووە خاوەن زانست و تەکنـولـوجیـاکـان دا کە ئێستـا بۆ چارە کردنی دیٔـەو بەرەو گیروگرفتی ئابوری نێو دەوڵەتان ئەم دوو بەرە دەوڵەتە بەناوی دەوڵەتانی باکوورو باشوورەوە وتو وێژ ئەکەن.

ئیتر بەم بەراورکردنەی دوکتور صلاح الدین الشامی ئەم باسـە تەواو ئەکـەین کە دەربـارەی پێـوەنـدی نێـوان ژمارەی خەڵك و قەوارەی بەرهەم هێنانی گشتی و نرخی راستەقینەی کەلـك وەرگـرتنی ئابـوری ئەڵێت ئیتـالیـا پانـایی ولاتەکەی 170 هەزار میـل چوار گۆشـەیـەو پۆڵـەندە 121 هەزار میل چوار گوشـەو عیـراق 117 هەزار میـل چوار گوشـە بەڵام دانیشتـوانی ئیتـالیـا 50 ملیـون کەس وهی پۆڵـەندە (25) ملیـون کەس و هی عیـراق (6) ملیـون کەس ئەبـێـت «لـەسـەرسـەر ژمیری سالی 1957 ئەم ژمـارانەی داناوە» کەچی جیـاوازیـەکی گەورە لە نێـوان بەرهـەمی ئەم سێ دەوڵەتە لە قەوارەو چۆنیتی داهەیە. وەئەنجامەکەی بەوە تەواو ئەکـات، کە دابـەش کردنـی خەڵـکی لە زەویـەکـدا بگـونجێت لەگـەڵ داهـاتی سروشتی خاکـەکـەی و توانـای سازکرن و بەرهەم هێنانی ئابوری یانەی رێك و پێك جا ئەم دابـەشکـردنـەش لەرووی ستـراتیجی وئـامانجی پاراستنی قەوارەی یەکـێـتـی سیـاسـی دەوڵـەتـەکـەوە ئاسـایـی و بایەخدار بێت ئەوا هەلێکی باش بۆ ئەو دەوڵەتە ئەرەخسێت، کە شوێن و ناوێکی دیارو ئارام و بە کەلکی هەبێت بو کاروو باری ناو خۆی و نێو دەوڵەتانی جیهانەوە.

ئیتر هیواردارم لەژمارەی داهاتوودا بە شتێکی تری لێ بلاوبکریتەوە.

**لەم سەرچـاوانـەی خوارەوەو لە چەند سەرچاوەیەکی تر کەلك وەرگیراوە**


1 - جیوبولیتیکس - الدکتور علی محمد المیاح
2 - الاصـول العـامة فی الجغـرافیـا السیاسیه والجیوبولیتیکا مع دراسـة تطبیقیـه علی الشـرق الاوسـط - الدکتور محمد ریاض استاذ الجغرافیا بجامعه عین الشمس.
3 - دراسات من الجغرافیا السیاسیه - الدکتور صلاح الدین علی الشامی استاذ الجغرافیا بکلیه الاداب جامعه القاهرة بالخرطوم.
4 - القانون الدستوری - نظریه الدوله - الدکتور منذر الشاوی
5 - القـانـون الـدولی الخـاص وفق القانونین العراقی والمقارن - الدکتور ممدوح عبدالکریم حافظ.
6 - الخلیج العربی دراسة الجغرافیا السیاسیه - الدکتور صبری فارس الهیتی
7 - السر المعروف مبدأ نکسن وکیسنجر فی آسیا.
8 - توینبی منهج التأریخ وفلسفه التأریخ
9 - الأمیر
10 - اراء وأحادیث فی اللغة والأدب - ساطع الحصری

# رۆشنبیریی کوردی لە نێوان تایبەتیی نەتەوایەتی و هەنگاو هەڵێنان بەرەو ئاسۆی رۆشنبیریی جیهانی دا

ئیسماعیل رەسوول



رۆشنبیریی کوردی، هەروەك گشت رۆشنبیری‌یەکانی سەر ئەم زەمینە، لە کەلەپووری میللەتەکەی خۆی هەڵقوڵیوە. نەش و نمای کردووەو گەیشتۆتە ئەو رادیەی کەئێستا تێیدا دەیبینین. ئەوەش سەرەنجامی بەرەو پێشچوونی ئەم میللەتەیە کە بەدرێژایی مێژووەکەی پێیدا رۆیشتووەو لە قووڵایی خاکە بە پیت و فەرەکەی رەگی داکوتاوەو لە سەری پەیدا بووەو بەرەو پێشەوەش رۆیشتووە.

هەر وەکو هەموو شتێ لەسەرەتاوە دەست پێدەکا، رۆشنبیریی کوردیش سەرەتای تایبەتی هەبووە، بنچینەو رەچەلەکی لەم کەلەپوورە بەفەرە وەرگرتووە، کە لە واقیعی بەرەو پێشچوونی شارستانیەتی نەتەوەی کورد هەڵقوڵیوە.

گومان لەوەدا نییە کە واتای ووشەی رۆشنبیری ـ کەلچەر ـ تەنیا ئەدەب ناگرێتەوە، بەلکو بریتیە لە کۆمەڵێك لەو زانیاریانەی کە ئەدەب بەشێکیەتی، ئەویش لەپەندو قسەی نەستەق و ئەفسانەو چیرۆك و حیکایەتی میللی‌و ،خوو رەوشت و خولیای میللەت وگەلێ شتی‌تر کەبە فۆلکلور ناو ئەبرێ، دەست پێ‌دەکا، کە بەگشتی کەرەستەی سەرەتاو سەرەکی بووە، بۆ درووست بوونی رۆشنبیری، ئەوەی بەهۆی بەرەو پێشچوونی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌یەوە

نەش و نەمــای کردووەو بەدریـژایی قۆنـاغـەکـانی مێـژ ووی رابـوردو بەرەو پێـــشـــەوە چووەو گەلـێ لقــو پۆپــی لێ بڵاوبـــووەتـــەوە. ئەدەبیش لەم بەرەو پێشچـــوونـە بەشێکی گرنگی خۆی هەبووە.

هەر کەســـەدەی نۆزدەهـــەم دەستی پێکـــرد، ئەدەب و رۆشنبیری کوردی، چاویان لەبەرەو پێشچوونێکی ئاشکراو روون هەڵدەهێنا.

هەڵگـــری مەشخـــەڵی ئەم بەرەو پێشچـــوونـەش کەڵـە شاعـیـــرانـی کلاسـی بوون، وەك نالـی‌و کوردی‌و سالـم و حاج قادری کۆیی‌و دەیانی‌تری وەك ئەوان.

مزگـەو ت و تەکیـەکـان مەڵبـەندی سەرەتای رۆشنبیری‌و ئەدەب بوون کە پیاوە ئاینیەکان بەردەوام بوون لەکۆشش و هەولدان بۆ دەرس گوتنەوەو فێرکردنی قوتابیان کە لە هەمو سوچێکی کۆمـــەڵگـــای کوردەواری‌دا روویـــان تێـدەکـردن. بۆخوێندنی شەریعەتی ئیسلامی‌و فێربوونی زمانی عەرەبی ،کـەزمـانی قورئـانی پیـرۆزە لەگەل هێندێ زانیاری گشتی دیکە، لەم مەلبەندانەدا رابەرانی پێشووی شاعیرانی کورد وەدەرکـــەوتن. لەمـەی پیشـوودا گوتمـان، وادیـاری دەخـا کەرۆشنبیــــری لەکـانگـای کومـەڵگـا چەکـەرە دەکـاو بەرەو پێشکـــەوتن دەروا، لەگـەل خوێـدا هەمـو رەوشت و دیـاردە تایبـەتیـەکـانی ئەم کۆمـەڵگایە هەڵدەگرێ وەك ئەو مرۆڤەی دەبێتـە میـراتگـری هەمـوو ئەو سیفـاتـانـەی نەوەکانی پێش خۆی‌و هەمو کەسانی خێزان و بنەماڵەکەی لێ‌ی هاتوونەتە خوارێ. بەڵام لەرێبازی گەشەکردنیدا هەموو بارودۆخی - دەوروبـەرەکانی‌و هۆیەکانی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و سیاسی کاری تێ‌دەکـا، لە چوارچـێـوەی بەرەوپـێـشـچـوونـی شارستـانیـەتی‌و لە هەر قۆنـاغێکی مێـژ ویی دیـاری کراودا لێـرەوە تایبــەتیـەتی نەتـەوایـەتی - الخصـوصیـة - دەبێتـە شەقـلـێـکی ئاســایی ،مـۆرکی خۆی بە رۆشنبیــری هەر میللەتیکەوە دەنێ، کە خاوەنی بوونێکی مێژوویی تایبەتی بێ.

رۆشـنـبـیـــریش - لەفـولـکلۆرەوە تائـەدەب و هونـــەرە جوانەکان و کۆمەڵە زانیاریەکانی تر - پەیوەندیەکی توندو تۆل بەرادەی هوشیـاری‌و پلەی بەرەو پیشچـوونی شارستـانیەتەوە دەبەستێ. ئەم دیاردە تایبەتی‌یەوا نەبێ بەس لە رۆشنبیری کوردی‌دا هەبێ، بەلکو رواڵەتێکە هەموو رۆشنبیری‌یەکانی دیکـەش لەیـەك جیـاواز دەکـاتەوە. بۆ نموونە، رۆشنبیری میللەتی عەرەب و هەمـــوو ئەدەب و هونـەرەکـــانی، بیـرو ئاييني، خوو رەوشتـەکـانی ،کـەپێش ئیسـلام باو بوون، و پاش بڵاو بوونـــەوەی ئیســـلام، بەتـــایبـــەتی پاش چەنـــد سەدەیەك وەك خۆی نەماوە. گەشەسەندنی شارستانیەتی، کارێـکـی گرنـگی کردە سەر نەش و نمـــاو گەشـــەکـــردنی رۆشنبیری‌و ئەدەب، تاگەیشتە ئەو پەری بەرزی لەسەدەی چوارەمی کۆچی‌دا، بەتـــایبـــەتی لەو کاتـــەی جوولانـەوەی وەرگێـران و سوود وەرگـرتن لەزانیـاری‌و رۆشنبیـری‌یـەکـانی میللەتەکانی دیکەی ئەو سەردەمە دەستی‌پێکرد.

رۆشنبیــــری میللەتی عەرەب لەم سەردەمـــەدا گەیشتـە پایـــەیێکی بەرزی پێشکـەوتن، کە ئەمـەش سەرئـەنجـامی پێشکـــەوتن و بەرەو پێشـەوە چوونی میـــژ وویـە ورەنـگ دانـەوەی پیشکـەوتنی رۆشنبیـری‌و شارستـانیـەتی گێتی‌یـەو کارتێکراوی تێکرای ئەم دوو لایەنانەیە.

بەلام سەرەرای ئەمـــەش بەردەوام مایـەوە لەهـەلگـرتنی روالـەت و شێـوەتـایبـەتیـەکانی ئەم میللەتەبەگشتی، وشێوە تایبـەتیـەکـانی ئەو ولاتانەی تێیدا نیشتەجێ بووە. هەروەها رۆشنبیـــری گشت گەلانی سەر ئەم زەمینـە بەم جۆرەیـە، رەنـگ دانـەوەی کۆمـەلگـاکـانی خۆیـەتی، کە رۆشنبیری میللەتە پیشکەوتووەکاتی ئەوروپاش لەم دیاردەیە جیاواز ناکریتەوە.

رۆشنبیریی میللەتی کوردیش هەمان رۆشنبیری نەمایەوە کە لەپێشوودا باو بوو، لەقاوغی فۆلکلۆرو خوورەشتی خۆی هنیبایەدەر، تەکیەو مزگەوتەکان وەك جاران تەنها مەلبەندی رۆشنبیری نەمانەوە کە میللەت، رۆشنبیری و زانیاری لێ هەڵێنجێ هەروەها ئەدەبیش وەك جاران کزو لاواز نەمایەوە، رادەی هونــەریو ناوەرۆکــی ئەو ئەدەبــە نەمــایــەوە کە لەسەردەمی نالیو حاجی قادری کۆییو ئەحمەدی خانیدا باو بوو، چونکــە ئەو پێشکــەوتنــەو بەرەو پێشچــوونــەی کوردستــانی عیــراقی گرتــە بەر هەر لە کۆتــایی جەنگی یەکەمی گێتییەوە تا دامەزراندنی دەولەتی عێراق، تا ئەم بەســەرهــاتــوو رووداوە مێــژ وویــەکــان، کە لە ئەنجــامی تێکــوشــان و خەبــاتی گەلی عیــراق لە پێنــاوی ئازادیو سەربــەخۆیو پێشکـەوتنی کۆمـەلایـەتیدا، پەیـدا بـوو، مۆرکی کاریگـەرو ئاشکـرای خۆی خستـە سەر رۆشنبیریی میللەتـی کوردو سەر ئەدەب و هونــەریشــی لە قەپێلکــە تەسکەکەیو لەچوار چیوەی شێوەی خۆمالی هینایە دەرەوە.

کاتێ کە بمــانــەوێ باسی بارو دۆخ و ئەو کارتێکـردنــە بکەین کە بوونەتە هۆی ئەم گورانکارییە، هۆی ئابووریو گۆرانی پەیــوەنــدییــە بەرهــەم هێنــانــەکــانی کۆمــەلایــەتی لەکــۆمــەلگــای عیــراقی بەگشتیو کومــەلگــای کوردەواری بەتــایبــەتیو بەدرێــژایی سەدەی ئێستــامان دا ،لە سەرەوەی هەمــوو ئەو هۆیــانــەی ترخــۆی قیت دەکــاتــەوە. چونکــە لەسـایـەی ئابـوورییـەکی کشتـوکـالی دواکەوتوودا کەپشت بەگـاسن و ئاژەل و جوتیـارێکی نەخـوێنـدەوارو دواکـەوتـوو دەبـەستێ ،تـەو جوتیـارەی کە خاوەنیو وشیـاریو زانینێکی کزو لاواز بووە، مل کەچــی سەخــت تریــن شێــوەی چەوســانــەوەی دەرەبــەگــایــەتی بووە، جا ئەگـەر هاتـو ئەو راستییــەمــان خستــە بەرچــاو کەجــوتیاران یاخود دانیشتوانی لادێ تابــەر شورشــی گەلاویــژی سالی 1958 زۆر بەی زۆری دانیشتـوانی کومـەلگـای کوردەواری بوون، لەمەش ئەم کارەساتە مەزنەمان دێتە بەر چاو کە میللەتەکەمان تێیدا ئەژیـاو بەهیـچ جۆرێ نەدەلـوا کۆمەلگایەك باری ئابووریو کۆمــەلایــەتــی بەم جۆرەبێ، ئەدەب و رۆشنبیــرییــەکی پیشکــەو تووبهێنێتــەدی، بەتــایبــەتی ئەگــەر هاتــو ئەو راستییــەمــان هێنــایــە بەرچــاو کە نیسبــەتی نەخوێندەواری گەیشتبــووە 90/. قوتـابخـانــەو دەزگـاکـانی فێـرکردن زۆر بەسستیدا دەمەزران کە بریتی بوون لەچەند قوتابخانەیەك ،لـە مەلبــەنـدی شارەکـانـدا بلاو ببوونەوە. هەر لەبەر ئەمە بابەتەکانی رۆشنبیری لەجغزەکانی سەرەتاییو دوا کەوتوودا مانــەوە بەدەگمــەن نەبێ هێنـدێ لەنـووسەرانی هەلکەوتوو، توانیان بەهرە بنوێنن.

لە سەرەتاداو پاش قۆناغی فولکلۆری ئەدەبی کوردی تا ماوەیــەکی زۆر هەر لە جغــزی شیعــر دەخــولایــەوە، بابەتی شیعــرەکــانیش زۆربــەیــان غەزەل و تەسووف و پیاهەلدان و سەرزەنشتیو ئامۆژگارییو شتیوابوون، هێندیکیشیان خۆی لەبـابـەتی نەتـەوایـەتیو کۆمـەلایـەتی دەدا، داوای ئازادیو پێشکـەوتنی کۆمـەلایـەتیـان دەکـرد، خەلکیان بۆ فێربوونی زانستیو زانیاری هان دەدا، داوایان لێدەکردن واز لەقسەی پرو پووچ و خورافــات بێنــن کە شێــخ و مەلاو دەرویشی تەکیەکانی ئەو سەردەمە بەناوی ئایینەوە بلاویان دەکردەوە، وەك ئاشکـرایـە شۆرە سواری ئەم گورەپـانـە حاجی قادری کۆیی بوو.

بەلام ئەو گورانکــاریــانــەی کەپــاش جەنگی یەکـەم روویداو، رووداوە مەزنـەکـانی شۆرشی بیستی نیشتمانیو ئەو راپـەرینـە نەتەوایەتیەی شۆرشی شیخ مەحمودی حەفید لە سالانی 1919 ـ 1922 بەر پای کرد، پاش ئەوانەش دامەزراندنی دەولەتی عیراقیو بەر پابوونی ئەو خەباتە بێ وچـانـەی گەلی عیـراق دژی دەسـەلاتی بێگانە کەبە چەند رەنــگ و شێـوەخـوێ نوانـد، کۆ بوونـەوەی گەل لە چەنـد پارت و کۆمەلەو ریکخراوێکی شورشگیریدا.. پاشان ئەو راپەرینە مەزنانەی کە سەرەنجامی خەباتە سەختەکەی گەل

بوو پاش جەنگی دووەمی گیتی ووشیاری سیاسی لەناو جەماوەردا قوول کردو رۆشنبیرەکانیش وەك پێشەرەوێکی شورشگێرو هۆشمەند کەوتنە پێشەوەی [illegible] سیاسیەکان بەدرێژایی قۆناغی رابوردوو کە ئەم قۆناغەش بەسەر کەوتنی شۆرشی چواردەی گەلاویژی مەزن کوتایی هات.

وەئەگەر بێتولەروخساری ئەدەب و رۆشنبیریی ئەو قۆناغانەی رابوردوو بکۆڵینەوە دەبینین چۆن بەریبازێکی تایبەتی جیاوازو دیارکراودا تێپەر بووە، وەك ئاوێنە هەموو رووداوە مێژوویەکان و ئەو گۆرانکاریانەی لەگشت لاو گۆرەپاندا بەرپا بوبوو تێیدا رەنگی دایەوەو وەك هێڵێکی دیاریکراو بەرەو پیشەوە چوو کە لە ئەنجامدا توانی سنووری خۆمالیەتی و نەتەوایەتی ببری و تێکەڵی رۆشنبیرییەکانی دیکەی جیهانی ببی و سوودی لێوەربگری.

ئاشکرایە رۆشنبیریی عەرەبی و ئەدەبەکەی چاوگیکی سەرەکی بوو، بۆ رۆشنبیریی کوردی، روبارێکی بەتەوژم بوو بۆ ئاودانی کێڵگەکەی کەرەستەی راپەرین و پێشکەوتنی نایە دەستییەوە، چونکە پیشکەو توترو قوول و فرەوان ترو دەولەمەندتر بوو، وەش نەبێ ئەم کارتێکردنە بگەریتەوە سەرئەو قۆناغە نزیکەی باسم کرد، بەلکو مێژووەکەی ئەگەرێتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کورد هاتە سەر ئایینی ئیسلام، کە شەریعەت و زمانی عەرەبی و هێندی زانیاری تریش لەمزگەوت و مەلبەندە ئایینیەکانی دەخوێندران. بەلام ئەو قۆنـ ـانەی دوایی گرنگیەکی تایبەتی خۆیان هەبوو، چونکە روشنبیریی عەرەبی خۆی، کارتێکراو وسوود وەرگری ئەدەب و رۆشنبیریی جیهانی بوو، زمانی عەرەبیش بۆئێمە پـەنجەرەیەکی کراوە بوو، رۆشنبیرو نووسەرانمان، لێیەوە دەیان روانییە رۆشنبیریی ئەو سەردەمەمان بەرێگای ئەو زمانەوە شارەزای ئەدەب و زانیاریی میللەتانی دیکەی جیهان دەبوون.

یەکیەتی سیاسی گەلی عیراق لە چوارچیوەی یەك دەولەتدا سەرەرای پەیوەندییەکانی مێژوویی لەنیوان کوردو عەرەب دا، کەرەسەی پەیوەندیەکەی تری هێنایەکایەوە کەخەباتی هەر دوو لابەیەکەوە ببەستێ لەپێناوی بەرهەلست کردنی دوژمنان و روو بەروو بوون ی گشت مەترسی و کارەساتێ بێتە بەردەمیان . . بۆ چارەسەر کردنی گشت کێشەو گیروگرفتی ئابووری و کۆمەلایەتی و رامیاری، کە پەیوەندی بەژیانی هەر هاوولاتێکی عیراقی یەوە هەبێ، بێ ئەوەی دەست لەروالەتە تایبەتیەکانی نەتەوایەتی هەر دوولایان بدرێ. ئەمە بووە هۆی درووست بوون و گەشە کردنی ئەدەب و رۆشنبیرییەکی نوێ ،کە هەلگری ئێش و ژان و خەفەتیان و دلخۆشی سەر کەوتنەکانیان بێ لە گۆرەپانەکانی خەبات و زۆرانبازیدا، دژی دوژمنان، وگورەپانەکاتی بنیات نانی کۆشك و تەلاری بەرزی دوارۆژێکی پرشنگدار.

ئەم ئەدەب و رۆشنبیرییە، بەئەدەب و رۆشنبیریی عیراقی ناو ئەبردرێ . ناشمەوێ کەس وای لێکبداتەوە، کەمن دەمەوێ ئەم زاراوەیە بکەمە جێگری زاراوەی رۆشنبیریی نەتەوایەتی - الثقافه القومیه - ،جاچ رۆشنبیری کوردی بێ یاعەرەبی. بەواتایەکی تر هەردوو ئەم رۆشنبیرییە، هەر چەندە نەتەوەو زمان لەیەکیان جیاواز دەکاتەوە بەلام وەك جمك پێکەوە رێگایەکی سەخت و دژوار دەبرن بەرەو یەك ئامانج دەرۆن .لە شۆرشی بیست و لەتێکوشان و خەباتەکانی پاش ئەوە کە گەلی عیراق لەدژی دەسەلاتی ئیمپریالی بەرپای دەکرد، شاعیرانی کورد گۆرانییان بۆئازادی هەلدەبەست و داوای سەربەخۆی و رزگاری نیشتمانیان دەکرد، نووسەران و رۆشنبیران وەکو برا عەرەبەکانیان لە رۆژنامەو گوڤارەکاندا دەیاننوسی و لە گورەپانەکانی خەباتدا دەیان هەلبەست و شیعریان بۆ جەماوەر دەخوێندەوە.

ئەوەی بگــەرێتــەوە سەر شیعــرەکـانی فایق بێکـەس و گوران و دلــدارو کامــران موکــری‌و دەیــانی دیکـەی هاو چەرخیـان، وەیـا ئەوانـەی پاش ئەوان، بەروونی بۆی دیـار دەکەوێ کەچۆن شیعری کوردی هەنگاوی گەورەو فرەوانی بۆ پێشــەوە هاویـشتــووە، نەك بەس لەلایــەنی دارشتنی هونەریانەو نوێ خوازی روالەت و شێوەیەوە بەلکو لەلایەنی دەولـەمـەنـدکـردنی بابـەتـەکـانی کۆمـەلایـەتی‌و رامیـاری‌و مرۆڤایەتی، کەناوە رۆکیان بوون.

..پێکـەوە لکـانێکی مەوزوعیـانـەی خەفـەت و ژان و هەست و نەستی تاقـەکـەسی کورد بەکێشـە سەرەکیـەکـانی گەلی عیـراقـەوە.. هەر لە زولم و زۆرداری دەرەبـەگـایەتی ،چـەوسـانــەوەو کوێــرەوەری فەلاح و رەنــجــدەران و دواکـەوتنیـان.. کێشـەکـانی ئیمپـریـالیـزم و چەوسـانەوەی سیاسی و دواکەوتنە هەمە جۆرەکەی کۆمەلایەتی‌و تادەگاتە خەبـات کردن بۆ دوا رۆژ یـکـی چێـتـرو پرشنگـداری پر لەپیت و بەرەکـەت.. ئا ئەوانـە بوون بابـەتـەکـانی ئەدەبی کوردی، لە هەمـان کاتیشـدا ناوەرۆك و بایـەتەکانی ئەدەبی عەربیش بوون لە عیراقدا.

• کە واتە، والە تەکانی دەرپەرینی رۆشنبیری کوردی بەرەو ئاسۆ رۆشنبیری‌یەکانی جیهانی چییە؟ ..کەی‌و چۆن ئەم دەرپەرینە ـ الأنطلاق ـ رووی‌داو لەبەرچی؟

ئەگەر بێتو چاوێك بە ناوەرۆکی ئەو کتێبانەدا بخشێنین کە لەم دەساڵە ی دواییدا دەرچوون، هەر لەسەرەتاوە رادەی ئەو بەرەو پێشچوونەی رۆشنبیری کوردی فرەوانەمان دێتە بەرچاو.

هەنــدیـك کەس وا تێـدەگـەن، کەرۆشنبیـریی کوردی ،بـایـەخ بەس بەکێشـەو گرفتـەکـاتی ئەدەب و رۆشنبیـریی کوردی دەدات، هەشــە مەزەنــدەیـان وایـە کەتـائێستـا لە قەپێلکـە تەسکـەکـەی نەتـەوایـەتی دەرنـەچووە، بەلام ئەم مەزەنـدەیـە لەجێگـای خۆی نییـە، چونکی رۆشنبیری هەر وەکـو ئاشکـرایـە بەس ئەدەب و هونـەرو کەلـەپوورو مێژ وو ناگرێتەوە، بەلکو کۆمەلە زانیاری‌یەکی جۆراو جۆرە، بەندە بەژیـانی کۆمـەلایـەتی مرۆڤـەوە، دیسـانیش رەنگـدانەوەی ووشیـاری‌و زانینی کۆمـەلایـەتی‌و سیـاسی‌یـە لە قۆنـاغیکی دیـاری کراوی میـژ وویی یەوە.. رەنگدانەوەی جموجۆل و [illegible] رۆشنبیـران و ئەدیب و نووسـەرو هونەرمەندان و گشت دام و دەزگاکانی رۆشنبیری‌و زانیاری‌و پەروەردەو فیرکردنە.

ئەو بەرەو پێشچـوونـەی کە بەدرێـژایی چارەگـە سەدەی ئێیستــاکــە بەســەر رۆشنبیـریدا داهـاتـوە، شتێکـە نابێ بەچاوێکی کەم سەیری‌بکەین، چونکە ئەم پێشکەوتنە هەمو لایـەنـەکـای ژیـانی کۆمـەلایـەتی گرتـۆتـەوە ،بەتایبەتی لە مەیــدانــی پەروە ردەو فێــرکــردن و نزم بوونــەوەی رادەی نەخوێندەواری تارادەیەکی زۆر لەنێو گەلدا بەتایبەتی پاش جێ‌بـەجێ کردنی یاسـای قەلاچـۆکـردنی نەخـوێندەواری‌و یاسـای بەزۆرییێ خوێنـدنی سەرەتـایی‌و خویندن بەخۆرایی لەگـشـت پلەکـانـی فێــربــوونــدا، ..ئــەوە بووە هۆی بلاوبــوونــەوەو بەرفـرەوانی رۆشنبیـری و زانیـاری لەگشت سووچیکی ولاتەکەماندا، لەهەمان کاتیشدا دام ودەزگاکانی خویندنی بالا بەگشتی بەرەو پێشەوە چوو ژمارەیەکی زۆری زانکـۆو پەیمـانگـاکـان لە سەرانسەری عیراق دامەزرێندراو بەهــەزاران قوتــابیــانی دەرچـوانـد کەهـەنـدیکیـان بوون بەپسپـۆری بەتـوانـا. دەرگای ئەم هەمو زانکۆو پەیمانگایانە والاکــرا بوقــوتــابیــانــی کورد، سەرەرای ئەوەش سەدان قوتــابیــان و خوێنـدکـارانی کورد روویـان لە زانکـۆکـانی ئەوروپـاو ولاتـانی دیکـەی جیهان کرد، بەسەدانیش هەموو سالێك دەگەرێنەوەو لەگەل خۆیاندا سەرەنجمی خوێندن و فێـربـوونی سالانیـان دێنن و دەبنـەپسپۆرو مەمۆستا لەفێرگەو دام و دەزگاکانی‌میری.

راستــە بەشـێـکی زۆری خوینـدکــارن و هەلگــری باوەرنــامــەی دوکتـورا بایـەخیـان بەئـەدەب و رۆشنبیـریی

کوردیداوە بەلاّم نامەو باسەکانیان بوون بەسەر چاوەیەکی بەنرخ نەك بۆ قوتابیان بەتەنیا بەلکو بۆگشت رۆشنبیرو نووسەرو ئەدیب و پسپۆرانی کوردو بناغەیەکی زانستیانە بۆچارەسەر کردنی کێشەکانی ئەدەب و رۆشنبیری دادەنێ، ریگا بۆگشت تۆژەریك خۆش دەکاو کەرەستەیەکی بە فەریان دەخاتە بەردەم، تائەوانیش بەشداری بکەن لەم بەرەو پێشچوونە، بۆیێ ئەم بایەخدانە پێویستێکی مێژوویی بوو هەر پێویستیش دەمێنێتەوە. بەلاّم لەتەك وانەوەش، سەدان خوێندکارانی دی گەرانەوەو هەلگری باوەرنامەی زانکۆیی و دوکتورا بوون لەلقەکانی دیکەی زانیاری وەك پزیشکی و ئەندازیاری و ئابووری و فیزیاو کیمیاو دەیان لقی‌تر. ئەم رووداوە نوێیە، بووبەبەردی بناغەی، پەیدا بوون و گەشەکردنی رۆشنبیرییەکی نوێ، کەلەقاوغە کۆنەکەی خۆی هێنایە دەرو بەرگێکی زانستیانەی کردەبەر نەخشەی تۆژینەوەی زانستیانەی کێشا کەسەر لەنوێ نووسەرو توێژەرەکان بگەرێنەوە سەر رۆشنبیرییە کۆنەکان و بابەتەکانی بەروانینێکی زانستیانە بکەوتە لێکولینەوەی کە لەپوورو مێژوو کێشەکانی ئەدەب و رۆشنبیری بەگشتی. ئەو گۆرانکارییەو بەرەو پێشچوونەی لە بارودۆخی ئابووری کومەلگا، بە درێژایی قۆناغەکانی رابوردوو بەرپا بوو، بەکار هێنانی مەکینە لەکشتوکالّ داو دامەزراندنی کارگە هەمە جۆرەکانی پیشەسازی، پێویستی بەپسپۆرانی هەمە جۆر پەیداکرد. هەروەها گەشە کردن و فرەوان بوونی فێرکردنی بالاّو پسپۆری، بووە هۆی دەرچوونی کادیرێکی زۆرو بەردەوام بۆ بەرێوەبردنی ئەم کارگانە. جگەلەوەش ئەو راپەرینەی کەلەپێناوی بەخۆرایی خوێندن و فرەوان کردنی وەرگرتنی قوتابیان لەزانکۆکان بەر پابوو بووە هۆی بەرز بوونەوەی رادەی رۆشنبیریی میللەت بەگشتی، بایەخ دانی خەلکەکەش بەخوێندنەوە وکتێب کرین زیاتر بوو، هەر ئەمەش بووە هۆی گەشەکردنی بازاری کتێب.

گەر سەرنجێکی سەرپێیی بدەینە پێرستی ئەوکتێبانەی بۆ فرۆشتن داندراون، فرەوانی بابەتەکانی- لە زانست و زانیاری، بەسانایی بۆمان دەردەکەوێ، کە چۆن بووەتە سەرچاوەیەکی بەنرخ و خراوەتە بەردەست رۆشنبیرو خوێنەران بەگشتی بۆ فرەوان کردن و زێدە کردنی جوغزی زانینیان.

. . بۆ ئەوەی نووسەرو توێژەران هەر لەسەر ئەدەب و فۆلکلۆر نەنووسن، بەلکو بایەخ بەهەموو بابەتیکی زانیاری بدەن.

هەروەها دام و دەزگاکانی پەروەردەو فێرکردن گەلێ کتێبی زانیاریان گۆرییە سەرزمانی کوردیو ختوویانە بەردەست قوتابیانی کورد تا لە فێرگەکان بیانخوێنن. جگە لەوەش ئێستاکە زۆر بەئاسانی دەتوانین لەسەر لاپەرەی گۆڤارەکانی کوردی لەتەك بابەتەکانی ئەدەب، وەبەپێنووسی نووسەرو پسپۆرانی کورد خۆیان، بابەتی هەمە جۆری زانیاری بخوێنینەوە. بایەخ دانی رۆشنبیرەکان هەر بە بابەتەکانی خۆمالّییەوە نەوەستاوە، بەلکو لەمەیدانی ئەدەبیشدا بایەخێکی زۆر بەئەدەبی عەرەبی و جیهانی دەدەن و بەدەیان کتێب و باس وەردەگێرنە سەرزمانی کوردی، هەر لە چیرۆك و شانۆگەری و رۆمان و شیعرەوەتابابەتی دیکە، ئەم بەرهەمانەش بەگشتی کاری کردە سەر رێبازی ئەدەب و رۆشنبیریی کوردی، قوولّ ترو فرەوان ترو دەولەمەندتری کردووە بەشداری کردووە لەچەسپاندنی کۆلّەگەی ئەو راپەرینە بەر فرەوانەی کە ئەمرۆ دەیبینین.

# نیشانەکانی ڕێژەی فرمان

● نوری علی امین ●

نیشانەکانی ڕێژەی فرمان ـ سادە بێت، یان ناسادە لە زمانی کوردیدا ئەمانەن:

1 ـ نیشانەی (دە)

2 ـ نیشانەی (ب)

(ب.. ایە)

(ایە)[1]

ئەم نیشانانە، کە دەخرێنە بەرایی قەدی فرمان، یان ڕەگی فرمان، ڕێژەیێکی تایبەتی سازدەدەن و دەتوانرێت بەبۆنەی ئەم نیشانانەوە دەمەکانی فرمان لێك جوێ بکرێتەوە.

وام بە باش زانی بەرلەوەی باسی ئەم نیشانانە بکەم، هەندێ لە چۆنێتی پێك هاتنی (قەدی فرمان)و (ڕەگی فرمان) بدوێم و جیاوازی نێوانیان بخەمە بەرچاو چونکە پەیوەندی بە باسەکەوە هەیە، وێنە بۆ چاووگی سادە.[2]

1 ـ چاووگی سادە تێپەڕ بێت، یان تێنەپەڕ، ئەگەر نوونی چاوگیەکەی لێ‌فڕێدرا، ئەوەی دەمێنێتەوە (قەدی فرمان)ە، وەك:

| چاووگی سادە | قەدی فرمان |
|---|---|
| خەوتن | خەوت |
| وەرین | وەری |
| خواردن | خوارد |
| گەستن | گەست |

2 ـ چاووگی سادە تێپەڕ بێت، یان تێنەپەڕ، ئەگەر نوونی چاوگیەکەو پیتەکەی پێش نوونەکەی لێ‌فڕێدرا، ئەوەی دەمێنێتەوە (ڕەگی فرمان)ە، وەك:

| چاووگی سادە | ڕەگی فرمان |
|---|---|
| کەوتن | کەوت |
| وەرین | وەر |
| تاشین | تاش |
| نووسین | نووس |

لە دوای ئەم ڕوون کردنەوەیە دەگەڕێینەوە سەر باسی نیشانەکانی ڕێژەی (دە) و (ب) لە زمانی کوردیدا.

### نیشانەی(دە)

نیشانەی ڕێژەی (دە) لە دوو مەڵبەندا دەردەکەوێ:

1 ـ لە بەرایی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕو تێنەپەڕی

ئیستیمراری‌دا.

2 ـ لە بەرایی فرمانی رانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕی ئیخباری‌دا.

**یەکەم ـ فرمانی رابوردووی ئیستیمراری:**

نیشانەی (دە) ئەگەر خرایە بەرایی قەدی فرمانەوە، قەدەکە دەکات بە فرمانی رابوردووی ئیستیمراری تێپەڕ، یان تێنەپەڕ.

**أ ـ وێنە بۆ تێپەڕ:**

**نیشانە ⟵ قەدی فرمان**

**دە + چاند ← دەچاند**

**دە + گەست ← دەگەست**

**دە + دروو ← دەدروو**

**ب ـ وێنە بۆ تێنەپەڕ:**

**نیشانە ⟵ قەدی فرمان**

**دە + وەری ← دەوەری**

**دە + بوو ← دەبوو**

**دە + پیشا ← دەپیشا**

نیشانەی (دە) لە فرمانی رابوردووی ئیستیمراری‌دا، ئەمانەی بەدواوادا دێت:

**1 ـ راناوی لکاوی ك A :**

ئەم ڕاناوە لە فرمانی ڕابوردووی ئیستیمراری تێپەڕی سادەدا، یەکسەر بەدوای نیشانەی ڕێژەی (دە)دا دێت و لەتەك پەرتەکانی‌تری[1] فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

**ـ نیشانەی ڕێژە (دە)**

**ـ راناوی لکاوی ك A [2]**

**ـ قەدی فرمان، وەك:**

**دە + م + خواست ← دەم خواست**

**دە + مان + فراند ← دەمان فراند**

**دە + ت + کری ← دەت کری**

**دە + تان + خوارد ← دەتان خوارد**

**دە + ی + گرت ← دەی‌گرت**

**دە + یان + جنی ← دەیان جنی**

(1) پەرتەکان، واتە اجزاء

2 ـ راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی زمانی کوردی دوو جۆر، یان دوو کۆمەڵەن:

1 ـ کۆمەڵەی A (ك A :

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | مان |
| دووەم | ت | تان |
| سێیەم | ی | یان |

**2 ـ کۆمەڵەی B (ك B ):**

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | ین |
| دووەم | یت (ی) ـ ە | ن |
| سێیەم | ێت (ێ) ـ ت | ن |
| | ات (1) | |

**2 ـ ئامرازی (ش)ی عەتف:**[3]

ئەم ئامرازە لە فرمانی رابوردووی تێپەڕو، تێنەپەڕی سادەی ئیستیمراری‌دا یەکسەر بە دوای نیشانەی ڕێژەی (دە)دا دێت و لەتەك پەرتەکانی‌تری فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

**ـ نیشانەی ڕێژە (دە)**

ـ ئامرازی (ش)ی عەتف
ـ قەدی فرمان، وەك:
أ ـ وێنە بۆ تێپەڕ:
دە + ش + کێڵا ← دەش کێڵا
دە + ش + گروو ← دەش گروو
دە + ش + بوارد ← دەش بوارد

ب ـ وێنە بۆ تێنەپەڕ:
دە + ش + پیشا ← دەش پیشا
دە + ش + گریا ← دەش گریا
دە + ش + کۆکی ← دەش کۆکی

3 ـ راناوی لکاوی (ك A)و ئامرازی (ش) پێکەوە:
لە فرمانی رابوردووی تێپەڕی سادەی ئیستیمراریدا، راناوی لکاوی ك A و ئامرازی (ش) دەتوانن هەردووکیان یەك لە دوای یەك پێکەوە بەدوای نیشانەی رێژەی (دە) بێن، بەڵام لە هاتنەکەیاندا پاش و پێش دەکەوون:
1 ـ ئەگەر ئامرازی (ش) پێش کەوت، راناوی لکاوی ك A بەدوادا دێت و وەها لەتەك پەرتەکانی‌تری فرمانەکەدا دەگونجێن:

ـ نیشانەی رێژە (دە)
ـ ئامرازی (ش)
ـ راناوی لکاوی ك A
ـ قەدی فرمان، وەك:

دە + ش + م + پچراند ← دەشم پچراند
دە + ش + مان + هێنا ← دەشمان هێنا
دە + ش + ت + دۆشی ← دەشت دۆشی
دە + ش + تان + دروو ← دەشتان دروو
دە + ش + ی + سەلماند ← دەشی سەلماند
دە + ش + یان + قیراند ← دەشیان قیراند

ب ـ ئەگەر راناوی لکاوی ك A پێش کەوت، ئامرازی (ش) عەتف بەدوایدا دێت و وەها لەتەك پەرتەکانی‌تری فرمانەکەدا دەگونجێن:
ـ نیشانەی رێژە (دە)
ـ راناوی لکاوی ك A
ـ ئامرازی (ش)
ـ قەدی فرمان، وەك:

دە + م + یش + بیست ← دەمیش بیست
دە + مان + یش + خست ← دەمانیش خست
دە + ت + یش + ڕواند ← دەتیش ڕواند
دە + تان + یش + ژمارد ← دەتانیش ژمارد
دە + ش[4] + ی + خوارد ← دەشی خوارد
دە + یان + یش + هاورد ← دەیانیش هاورد

دووەم ـ فرمانی ڕانەبوردووی ئیخباری:
نیشانەی رێژەی (دە)[5] ئەگەر خرایە بەرایی ڕەگی فرمانەوە، ڕەگەکە لەگەڵ ڕاناوی لکاوی ك B دەکات بە فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕی ئیخباری وەك:

أ ـ وێنە بۆ تێپەڕ:
دە + چێن + م ← دەچێنم
دە + ماڵ + ین ← دەماڵین
دە + پاڵێو + یت ← دەپاڵێویت
دە + کێش + ن ← دەکێشن
دە + جن + ێت ← دەجنێت
دە + سڕ + ن ← دەسڕن

ب ـ وێنه بۆ تێنەپەڕ:

دە + چ + م ← دەچم

دە + ڕۆ + ین ← دەڕۆین

دە + تەز + یت ← دەتەزیت

دە + فڕ + ن ← دەفڕن

دە + خەو + ێت ← دەخەوێت

دە + کەو + ن ← دەکەون

نیشـانـەی ڕێـژەی (دە) لە فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕی سادەی ئیخباری‌دا، ئەمانەی بەدوادا دێت:

1 ـ ڕاناوی لکاوی ك A

ئەم ڕاناوە لکاوە لە فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی سادەی ئیخباری‌دا، یەکسەر بەدوای نیشانەی ڕێژەی (دە)دا دێت، وەك:

دە + م + گروو + یت ← دەم گروویت

دە + ت + کێش + ێت ← دەت کێشێت

دە + تان + نووس + ن ← دەتان نووسن

دە + ی + هێن + م ← دەی هێنم

دە + یان + نێژ + ین ← دەیان نێژین

2 ـ ئامرازی (ش)ی عەتف:

ئەم ئامـرازەش لە فرمـانی ڕانـەبوردووی سادەی تێپەڕو تێنەپەڕی ئیخباری‌دا بەدوای نیشانەی ڕێژەی (دە)دا دێت: .

أ ـ وێنە بۆ تێپەڕ:

دە + ش + بیس + م ← دەش بیسم

دە + ش + نێر + ین ← دەش نێرین

دە + ش خواز + یت ← دەش خوازیت

دە + ش + هاوێژ + ن ← دەش هاوێژن

دە + ش + هاڕ + ێت ← دەش هاڕێت

دە + ش + گەز + ن ← دەش گەزن

ب ـ وێنه بۆ تێنەپەڕ:

دە + ش + فڕ + م ← دەش فڕم

دە + ش + مر + ین ← دەش مرین

دە + ش + خەو + یت ← دەش خەویت

دە + ش + وەر + ن ← دەش وەرن

دە + ش + وێر + ێت ← دەش وێرێت

دە + ش + کەو + ن ← دەش کەون

3 ـ ئامرازی (ش)ی عەتف و ڕاناوی لکاوی ك A پێکەوە:

لە فرمـانی ڕانـەبـوردووی تێپەڕی سادەی ئیخباری‌دا، ئامرازی (ش)و ڕاناوی لکاوی ك A دەشێت پێکەوە بەدوای نیشانەی ڕێژەی (دە)دا بێن، وە لە هاتنەکەیاندا دەگونجێت:

أ ـ ئامرازی (ش) پێش ڕاناوی لکاوی كA بکەوێت ئەنجا هەردووکیان پێکەوە بەدوای نیشانەی ڕێژەکەدا بێن و لەتەك پەرتەکانی‌تری فرمانەکەدا وەهابگونجێن:

- نیشانەی ڕێژە (دە)
- ڕاناوی لکاوی ك A
- ئامرازی (ش)ی عەتف
- ڕەگی فرمان
- ڕاناوی لکاوی ك B وەك:

دە + ش+ئا+خوێن + م ← دەشی خوێنم

دە + ش + یان + گر + ین ← دەشیان گرین

ده + ش + ت + هار + ێت ← دەشت هارێت
ده + ش + تان + گوش + ن ← دەشتان گوشن
ده + ش + م - نووس + یت ← دەشم نووسیت
ده + ش + مان - ناس + ن ← دەشمان ناسن

ب ـ راناوی لکاوی ك A پێش ئامرازی (ش) بکەوێت، ئەنجا هەردووکیان پێکەوە بەدوای نیشانەی ڕێژەکەدا بێن و لەتەك پەرتەکانی تری فرمانەکەدا وەها بگونجێن:

- نیشانەی ڕێژەی (ده)
- راناوی لکاوی ك A
- ئامرازی (ش)ی عەتف
- ڕەگی فرمان
- راناوی لکاوی ك B وەك:

ده + م + یش + هار + یت ← دەمیش هاریت
ده + مان + یش + خۆ + ن ← دەمانیش خۆن
ده + ت + یش + دوێن + م ← دەتیش دوێنم
ده + تان + یش + پارێز + ین ← دەتانیش پارێزین
ده + ش + ی + فرۆش + ێت ← دەشیفرۆشێت
ده + یان + یش + نێر + ن ← دەیانیش نێرن[6]

2 ـ نیشانەی (ب) و (ب.. ایه)

نیشانەی ڕێژەی (ب)و (ب.. ایە) لە چوار مەڵبەندا دەردەکەوێ:
1 ـ لە بەرایی فرمانی رابوردووی تێپەڕو تێنەپەڕی ئینشائیدا.
2 ـ لە بەرایی فرمانی رانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕی ئینشائیدا
3 ـ لە بەرایی فرمانی داخوازیدا.
4 ـ لە بەرایی ئاوەڵناوی بکەردا.

یەکەم ـ فرمانی رابوردووی ئینشائی:

قەدی فرمان ئەگەر خرایە نێوان ڕێژەی (ب.. ایە)وە، قەدەکە دەکات بە فرمانی رابوردووی ئینشائی .تێپەڕو تێنەپەڕ.

1 ـ وێنە بۆ تێپەڕ:
بـ + گرت + ایه ← بگرتایه
بـ + نارد + ایه ← بناردایه
بـ + خوارد + ایه ← بخواردایه

ب ـ وێنەبۆ تێنەپەڕ:
بـ + هات + ایه ← بهاتایه
بـ + گەیشت + ایه ← بگەیشتایه
بـ + ما + یه[7] ← بمایه

نیشانەی (ب) لە فرمانی ڕابوردووی ئینشائیدا ئەمانەی بەدوادا دێن:

1 ـ راناوی لکاوی ك A :

ڕاناوی لکاوی ك A لە فرمانی رابوردووی تێپەڕی ئینشائیدا بەدوای نیشانەی (ب)دا دێت و لەتەك پەرتەکانی تری فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

- نیشانەی ڕێژە (ب)
- راناوی لکاوی ك A
- قەدی فرمان
- پاشکوی (ایه)، وەك:

بـ + م + خوارد + ایه ← بم خواردایه
بـ + مان + شوشت + ایه ← بمان شوشتایه
بـ + ت + رشت + ایه ← بت ڕشتایه

بـ + تان + فرۆشت + ایه ← بتان فرۆشتایه

بـ + ی + برد + ایه ← بیبردایه

بـ + یان + نووسی + یایه[8] ← بیان نووسییایه

2 ـ ئامرازی (ش) عەتف:

ئامرازی (ش)ی عەتف لە فرمانی رابوردووی تێپەڕو تێنەپەڕی ئینشائیدا بەدوای نیشانەی رێژەی (ب)دا دێت و لەتەك پەرتەكانی تری فرمانەكەدا وەها دەگونجێت:

- نیشانەی رێژە (ب)
- ئامرازی (ش)ی عەتف
- قەدی فرمان
- پاشكۆی (ایە)، وەك:

بـ + ش + برد + ایه ← بش بردایه

بـ + ش + كێلا + ایه ← بش كێلایه

بـ + ش + شوشت + ایه ← بش شوشتایه

ب ـ وێنە بۆ تێنەپەڕ:

بـ + ش + گەییشت + ایه ← بش گەییشتایه

بـ + ش + كەوت + ایه ← بش كەوتایه

بـ + ش + چوو + ایه ← بش چووایه

3 ـ راناوی لكاوی ك A و (ش)ی عەتف پێكەوە:

راناوی ك A و ئامرازی (ش)ی عەتف دەتوانن هەردووكیان پێكەوە یەك لەدوایەك لە فرمانی رابوردووی تێپەڕی سادەی ئینشائیدا بەدوای رێژەی (ب)دا بێن، بەڵام لە هاتنەكەدا دەشێت.

أ ـ ئامرازی (ش) پێش راناوی لكاوی ك A بكەوێت ئەنجا هەردووكیان یەك لە دوای یەك بەدوای نیشانەی (ب)دا بێن و لەتەك پەرتەكانی تری فرمانەكەدا وەها بگونجێن:

- نیشانەی رێژەی (ب)
- راناوی لكاوی ك A
- قەدی فرمان
- پاشكۆی (ایە)، وەك:

بـ + ش + م + بوارد + ایه ← بشم بواردایه

بـ + ش + مان + چاند + ایه ← بشمان چاندایه

بـ + ش + ت + تۆقاند + ایه ← بشتان تۆقاندایه

بـ + ش + تان + ئەنگاوت + ایه ← بشتان ئەنگاوتایه

بـ + ش + ی + برد + ایه ← بشیبردایه

بـ + ش + یان + پساند + ایه ← بشیان پساندایه

ب ـ راناوی لكاوی ك A پێش ئامرازی (ش)ی عەتف بكەوێت و هەردووكیان پێكەوەو یەك لەدوای یەك بەدوای نیشانەی رێژەی (ب)دا بێن و لەتەك پەرتەكانی تری فرمانەكەدا وەها بگونجێن:

- نیشانەی رێژەی (ب)
- راناوی لكاوی ك A
- ئامرازی (ش) عەتف
- پاشكۆی (ایە)، وەك:

بـ + م + یش + هاورد + ایه ← بمیش هاوردایه

بـ + مان + یش + رست + ایه ← بمانیش رستایه

بـ + ت + یش + رشت + ایه ← بتیش رشتایه

بـ + تان + یش + ژنەفت + ایه ← بتانیش ژنەفتایه

بـ + ش + ی + گلاند + ایه ← بشیگلاندایه

بـ + یان + یش + پساندا + ایه ← بیانیش پساندایه

دووەم ـ فرمانی رانەبوردووی ئینشائی:

ئەگەر نیشانەی رێژەی (ب) خرایە بەرایی (رەگی فرمان)، رەگەكە دەكات بە فرمانی رانەبوردووی تێپەڕو

تێنەپەڕی ئینشائی، وەك:

أ ـ وێنە بۆ تێپەڕ:

بـ + نووس + م ← بنووسم

بـ + نێر + ین ← بنێرین

بـ + کێش + ێت ← بکێشێت

ب ـ وێنە بۆ تێنەپەڕ:

بـ + خەو + م ← بخەوم

بـ + گە + ین ← بگەین

بـ + کەو + ێت ← بکەوێت

ئەم نیشانەیە (ب) لە فرمانی رانەبوردووی سادەی ئینشائی‌دا، ئەمانەی بەدوادا دێت.

أ ـ راناو ی لکاوی ك A

راناوی لکاوی‌ك A بە تەنیا بە دوای نیشانەی ڕێژەی (ب)دا دێت، لە فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی سادەی ئینشائی‌دا، وە لەتەك پەرتەکانی‌تری فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

ـ نیشانەی ڕێژەی (ب)

ـ راناوی لکاوی ك A

ـ ڕەگی فرمان

ـ راناوی لکاوی ك B ، وەك:

بـ + م + نووس + یت ← بم نووسیت

بـ + مان + بەخش + ن ← بمان بەخشن

بـ + ت + کێش + م ← بت کێشم

بـ + تان + گروو + ین ← بتان گرووین

بـ + ی + ڕێژ + ێت ← بی‌ڕێژێت

بـ + یان + چێژ + ن ← بیان چێژن

2 ـ ئامرازی (ش)ی عەتف:

ئامرازی (ش)ی عەتف، لە فرمانی رانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕی سادەی ئینشائی‌دا بەدوای نیشانەی ڕێژەی (ب)دا دێت و لەتەك پەرتەکانی‌تری فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

ـ نیشانەی ڕێژە (ب)

ـ ئامرازی (ش)ی عەتف

ـ ڕەگی فرمان

ـ راناوی لکاوی ك B

أ ـ وێنە بۆ تێپەڕ:

بـ + ش + کێڵ + م ← بش کێڵم

بـ + ش + هێن + ین ← بش هێنین

بـ + ش + ئەنگێو + یت ← بش ئەنگێوێت

بـ + ش + گەز + ن ← بش گەزن

بـ + ش + ماڵ + ێت ← بش ماڵێت

بـ + ش + گلۆف + ن ← بش گلۆفن

ب ـ وێنە بۆ تێنەپەڕ:

بـ + ش + خەو + م ← بش خەوم

بـ + ش + ڕۆ + ین ← بش ڕۆین

بـ + ش + گە + یت ← بش گەیت

بـ + ش + ب[9] + ن ← بش بن

بـ - ش + چ[10] ێت ← بش چێت

بـ + ش + فڕ + ن ← بش فڕن

3 ـ راناوی لکاوی ك A و ئامرازی (ش)ی عەتف پێکەوە:

راناوی لکاوی‌ك A و ئامرازی (ش) عەتف لە فرمانی رانەبوردووی ئینشائی تێپەڕدا دەشێت پێکەوەو بەدوای‌یەکدا بێن، بەڵام لە هاتنەکەیاندا هەندێ جار پێش وپاش

دەکەوون، ئەنجا:

أ ـ ئەگەر راناوەکە پێش ئامرازە عەتفەکە کەوت، ئەوا پەرتەکانی‌تری فرمانەکە وەها دەگونجێن:

- نیشانەی رێژە (ب)
- راناوی لکاوی ك A
- ئامرازی (یش) عەتف
- رەگی فرمان
- راناوی لکاوی ؤ B ، وەك:

بـ + م + یش + نێر + یت ← بمیش نێریت

بـ + مان + یش + دۆرێن + ن ← بمانیش دۆرێنن

بـ + ت + یش + سوتێن + م ← بتیش سوتێنم

بـ + تان + یش + سپێر - ین ← بتانیش سپێرین

بـ + ش + ی + دۆش - ێت ← بشی‌دۆشێت

بـ + یان + یش + هاوێژ - ن ← بیانیش هاوێژن

بـ ئەگەر ئامرازە عەتفەکە پێش راناوەکە کەوت، ئەوا پەرتەکانی‌تری فرمانەکە وەها دەگونجێن:

- نیشانەی رێژەی (ب)
- ئامرازی (ش)ی عەتف
- راناوی لکاوی ك A
- رەگی فرمان

- راناوی لکاوی ك B ، وەك:

بـ + ش + م + تۆرێن + یت ← بشم تۆرێنیت

بـ + ش + مان + کر + ن ← بشمان کرن

بـ + ش + ت + ناس + ێت ← بشت ناسێت

بـ + ش + تان + کوژ + ن ← بشتان کوژن

بـ + ش + ی + گر +م ← بشی‌گرم

بـ + ش + یان + نووس + ین ← بشیان نووسین

سێیەم ـ فرمانی داخوازی:

ئەگەر نیشانەی رێژەی (ب) خرایە بەرایی (رەگی فرمان)، ئەوا رەگەکە دەکات بە فرمانی داخوازی تێپەرو تێنەپەر، وەك:

أ ـ وێنە بۆ تێپەر:

بـ + نووس + ە ← بنووسە

بـ + چێن + ن ← بچێنن

ب ـ وێنە بۆ تێنەپەر:

بـ + خەو + ە ← بخەوە

بـ + فر + ن ← بفرن

نیشانەی رێژەی (ب) لە فرمانی داخوازی‌دا ئەمانەی بەدوادا دێ:

1 ـ راناوی لکاوی ك A

راناوی لکاوی ك A لە فرمانی داخوازی تێپەردا، یەکسەر بەدوای نیشانەی رێژەی (ب)دا دێت و لەتەك پەرتەکانی‌تری فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

- نیشانەی رێژەی (ب)
- راناوی لکاو ك A
- رەگی فرمان
- راناوی لکاوی ك B ، وەك:

بـ + م + کێش + ە ← بم کێشە

بـ + مان + جن + ن ← بمان جنن

بـ + ی + سر + ە ← بی‌سرە

بـ + یان + بەخش + ن ← بیان بەخشن

2 ـ ئامرازی (ش)ی عەتف:

ئامرازی (ش)ی عەتف لە فرمانی داخوازی تێپەڕ، یان تێنەپەڕدا یەك سەر بە دوای نیشانەی ڕێژەی (ب)دا دێت و لەتەك پەرتەکانی تری فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

- نیشانەی ڕێژە (ب)
- ئامرازی (ش)ی عەتف
- ڕەگی فرمان
- ڕاناوی لکاوی ك B ، وەك؛

أ ـ وێنە بۆ تێپەڕ:

بـ + ش + چێن + ە ← بش چێنە

بـ + ش + خوێن + ن ← بش خوێنن

ب ـ وێنە بۆ تێنەپەڕ:

بـ + ش + فڕ + ە ← بشفڕە

بـ + ش + نوو + ن ← بشنوون

3 ـ ڕاناوی لکاوی ك A و ئامرازی (ش) عەتف پێکەوە:

لە فرمانی داخوازی تێپەڕدا دەشێت ڕاناوی لکاوی ك A و ئامرازی (ش)ی عەتف بەدوای نیشانەی ڕێژەدا بێن، بەڵام هەندێ جار لە هاتنەکەیاندا:

أ ـ ڕاناوەکە پێش ئامرازەکە دەکەوێت و لەتەك پەرتەکانی تری فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

- نیشانەی ڕێژە (ب)
- ڕاناوی لکاوك A
- ئامرازی (ش)ی عەتف
- ڕەگی فرمان
- ڕاناوی لکاوی ك B ، وەك:

بـ + م + یش + نێر + ە ← بمیش نێرە

بـ + مان + یش + بە + ن ← بمانیش بەن

بـ + ش + ی + هێن + ە ← بشیهێنە

بـ + یان + ش + جوڵێن + ن ← بیانیش جوڵێنن

ب ـ ئامرازەکە پێش ڕاناوەکە دەکەوێت و لەتەك پەرتەکانی تری فرمانەکەدا وەها دەگونجێت:

- نیشانەی (ب)
- ئامرازی (ش)ی عەتف
- ڕاناوی لکاوی ك A
- ڕەگی فرمان
- ڕاناوی لکاوی ك B ، وەك:

بـ + ش + م + گر + ە ← بشم گرە

بـ + ش + مان + ئەنگێو + ن ← بشمان ئەنگێون

بـ + ش + ی + کر + ە ← بشیکرە

بـ + ش + یان + نووس + ن ← بشیان نووسن.

چوارەم ـ ئاوەڵناوی بکەر:

نیشانەی ڕێژەی (ب) ئەگەر خرایە بەرایی ڕەگی فرمان و ڕاناوی لکاوی ك B ی بە دوادا نەهات، دەبێتە ئاوەڵناوی بکەر، وەك:

بـ + بڕ ← ببڕ

بـ + کوژ ← بکوژ

بـ + چێژ ← بچێژ

بـ + نووس ← بنووس

بـ + خۆر ← بخۆر

بـ + پێو ← بپێو

لەدوای ئەم لێکۆڵینەوەیە دەتوانین ئەم (ڕیسا)یە بۆ

نیشانەکانی ڕێژەی فرمانی سادە دابنێین:

1 ـ لە زمانی کوردیدا دوو جۆر نیشانەی ڕێژە هەیە

أ ـ نیشانەی (دە)

ب ـ نیشانەی (ب)و (ب.. ایە)

2 ـ نیشانەی ڕێژەی (دە) قەدی فرمانی سادەی پێدەکرێتە:

أ ـ فرمانی ڕابوردووی ئیستیمراری سادە.

ب ـ فرمانی ڕانەبوردووی ئیخباری سادە.

3 ـ نیشانەی (ب)، ڕەگی فرمانی سادەی پێدەکرێتە:

أ ـ فرمانی ڕابوردووی ئینشائی سادە (ب.. ایە).

ب ـ فرمانی ڕانەبوردووی ئیلزامی سادە.

حـ ـ فرمانی داخوازی سادە.

د ـ ئاوەڵناوی بکەری سادە.

4 ـ نیشانەکان (ب)و (ب.. ایە) لە فرمانی سادەدا، ئەمانەیان بەدوادا دێت:

أ ـ ڕاناوی لکاوی(ئ)A بە تەنیا.

ب ـ ئامرازی (ش)ی عەتف بە تەنیا.

حـ ـ ڕاناوی لکاوی (ئ) A و ئامرازی (ش) عەتف بەجووتە.

لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا لە نیشانەکانی ڕێژەی فرمانی نسادە (دارژاو) دەدوێین.


سەرچاوەکان: ـ

1 ـ دەستووری زمانی کوردی ـ توفیق وەهبی.

2 ـ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ـ کۆڕی زانیاری.

3 ـ قواعدی زمانی کوردی بەرگی دووەم ـ نوری علی

4 ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری ـ بەرگی نۆهەم 1982 (ڕێنووس).

5 ـ لایەنێکی جیاوازی ـ د. وریا عمر أمین ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری بەرگی دەیەم.


(1) نیشانەی (ایە) بەتەنیا، دەخرێتە کۆتایی فرمانی ڕابوردووی دووری ئیخباری بۆ ئەوەی بکرێت بە فرمانی ڕابوردووی دووری ئینشائی، وەك

چاندبوو + ایە ← چاندبووایە

چووبوو + ایە ← چووبووایە

(2) لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا لەڕێژەی چاووگی ناسادە دەدوێین.

(3) ئەم ئامرازە لە دوای بزوێنەوە (ش)و لە دوای نەبزوێنەوە (یش دێت.

(4) بەپێی دەستوور دەبوو وەها ڕێك بخرایە:

(دە + ی + ش ← دەیش خوارد)

(5) لەبری نیشانەی ڕێژە (دە) نیشانەی (ئە)ش بەکارهاتووە.

(6) ئەگەر بمانەوێ ڕستەی (دەیانیش نێرین) شی بکەینەوە دەڵێین.

ـ (دە) نیشانەی ڕێژەی فرمانی ڕانەبوردووی ئیخبارییە.

ـ (یان) ڕاناوی لکاوی (ئ A) یە بەرکاری ڕاستەوخۆیە.

ـ (یش): ئامرازی

ـ (نێر): ڕەگی فرمانە.

ـ (ین): ڕاناو لکاوی (ئ B یەو بکەرە.

(7): ئەگەر قەدی فرمان کۆتایی بە پیتەبزوێنی (1) هاتبوو، لەبری ئەوە بخرێتە نێوان (ب.. ایە)وە، دەخرێتە نێوان نیشانەی (ب.. یە)وە چونکە ناگونجێت دوو پیتەبزوێن بەدوای یەکدا بێن، بۆ وێنە:

بـ + خوسا + یە ← بخوسایە

(8) ئەگەر قەدی فرمانەکە کۆتایی بە پیتەبزوێنی (ی) هاتبوو، قەدەکە دەشێت (ی) گونجاندیش بەدوایدا بێت، ئەوجا پاشکۆی (ایە) چونکە ناشێت دوو پیتەبزوێن بەدوای یەکدا بێن بەبێ ئەوەی پیتەگونجاندنی (ی) نەخرێتە نێوانیانەوە، وەك:

بـ + ی + بری + ی + ایە ← بیبرییایە.

(9) ڕەگی فرمانی (بوون)ە.

(10) ڕەگی فرمانی (چوون)ە.

# سیمای جیاکەرەوەو لایەنێك لە فۆنۆلۆژی زمانی کوردی

**غازی فاتح وەیس**
کولێجی ئەدەبیات زانکۆی سەلاحەدین

## پێشەکی

**فۆنۆلۆژی لقێکی زانستی زمانەو دوای مۆرفۆلۆژی دێت، چونکە لقەکانی زانستی زمان بەم شێوەیەی خوارەوە ڕیزئەکرێن.**

**سیمانتیك ← واتا سازی**

**سینتاکس ← ڕستە سازی**

**مۆرفۆلۆژی ← مۆرفیم سازی**

**فۆنۆلۆژی ← فۆنیم سازی**

**فۆنەتیك ← دەنگ سازی ←**

فۆنۆلۆژی لە ستراکچەری دەنگەکانی زمان ئەکۆڵێتەوە، واتە ڕیزکردن و کارگێڕانی (وەزیفەی) دەنگەکانی زمان.

سیمای جیاکەرەوەش[1] ، Distinetive Feature) یەکێکە لە ڕێبازەکانی فۆنۆلۆژی، بۆدۆزینەوەو دەستنیشان کردنی جیاوازی ولێکچوونی نێوان فۆنیمەکانی زمان پەیڕەوی ئەکرێ، بەپێی نواندن و وەزیفەی ئەو فۆنیمانە. بۆیەکەم جار زانای بەناوبانگ جاکۆبسن[2] جووت سیمای جیاکەرەوەی لەسەر ئەساسی تایبەتییەکانی فۆنەتیك دانا، بەتایبەتی جوڵانەوەی ئەندامەکانی ئاخافتن وتایبەتی فیزیکی. دوا بەدوای جاکۆبسن، چۆمسکی و هاڵی و پۆستاڵ دەستکاری سیمای جیاکەرەوەیان کردو بەشێوەیەکی ڕێك وپێك تر بەکاریان هێنا بۆ جیاکردنەوەی فۆنیمەکان و فۆنۆلۆژی وەچ کردنیان[3] ، «Generative Phonology» هێنایەکایەوە. فۆنۆلۆژی وەچ کردنیش تیۆری دیراسەکردنی ستراکچەری دەنگەکانی زمان ئەگرێتەوە. هەروەها شوێنی زانای بەناوبانگ «ترۆبێتزکۆی»[4] لە دیراساتی فۆنۆلۆژ یدا گەلێ بەرزە، بەتایبەتی لە قوتابخانەی لینگویستیکی پراگدا. بەم جۆرە سێ قوتابخانە لە مەزرای دیراساتی فۆنۆلۆژ یدا دەستنیشان ئەکرێ:

1 ـ قوتابخانەی پراگ کە (ترۆبێتزکۆی) بە سەرکردەی ئەژمێردرێ و خاوەنی تیۆری نیشانەکردنە«markedness».

2 ـ قوتابخانەی جاکۆبسن کە خاوەنی تیۆری جووت سیمای جیاکەرەوەیە.

3 ـ فۆنۆلۆژی وەچ کردن کە چۆمسکی و هاڵی بە دامەزرێنەری دائەنرێن.

بەڵام لە ڕاستیدا تیۆری نیشانەکردن و جووت سیمای جیاکەرەوە بە تەواوکەری یەکتر دائەنرێن.

سیمای جیاکەرەوە ئەبێ لەسەر ئەساسی دیراسەکردنێکی تەواوی فۆنەتیك دابمەزرێنرێ و چەمکی دابەش کردنی وەزیفەی دەنگەکانی زمان بگەیەنرێت بەدانەکانی فۆنەتیك و دانەکانی فۆنەتیکیش (دەنگەکان) ببەسترێن بە شێوەی جوڵانەوەی ئەندامەکانی ئاخافتن و بیستن و دەرك پێ کردنەوە، واتە بەستنەوەی فۆنیمەکان بە دەنگەکانەوەو بەستنەوەی دەنگەکانیش بە جوڵانەوەی ئەندامەکانی ئاخافتن و ڕەگەزەکانی بیستن و دەرك پێ کردنەوەو ئەمجادانانی سیمای

جیاکەرەوە. بەڵام لەم بەینەدا کێشەیەکی هەرە گەورە ئەکەوێتە پێش فۆنۆلۆژیزان و فۆنەتیکزانەوەو ئەویش ئەوەیە کە جیاکردنەوەی کەرەسەکانی فۆنەتیك شتێکی ئاسان نییە، چونکە دەستنیشان کردنی تەواوی سنووری دەنگەکان لە ئاخافتندا کارێکی مەحاڵەو نازانرێ لە کوێیەوە دەنگەکانی ئاخافتن دەست پێ ئەکەن و لە کوێ کۆتاییان پێ دێت. لەگەڵ ئەمەشدا هەموویەکێك لە ئێمە کاتێ کۆمەڵێك دەنگ لە شێوەی قسەدا ئەبیستێ، دانە دانە ئەودەنگانە وەرئەگرێ.[5] بەم جۆرە قسەکەر هەموو دەنگەکان بەسەر یەکەوە ئەدرکێنێ بۆ نموونە، کاتێ ووشەی «منداڵ» ئەدرکێنێ ناڵێ: م، ن، د، ا، ڵ. بەڵام بیسەر تارادەیەك بەجیا وەریان ئەگرێ.

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ڕاستی (حقیقە) هیچ کەرەسەیەکی فۆنەتیکی بەشێوەیەکی زۆر تەواو دەستنیشان ناکرێت، چونکە تایبەتییەکانی فۆنەتیکی شێوەی ڕووتیان تێدایە «شێوەی تەجرید» لەلایەکی ترەوە گەیاندنی چەمکی وەزیفەی دەنگەکان «سیگمێنت» (Segment) وەیا «فۆنیم» بە چەمکی کەرەسەکانی فۆنەتیك «دەنگ» و گەیاندنی چەمکی کەرەستەکانی فۆنەتیك بە شێوەی درکاندن و بیستن و دەرك پێ کردن بێ کەم و کوڕی نابێ. بەتایبەتی ئەگەر ویستمان سیمای جیاکەرەوە لەبەر ڕۆشنای ئەم جۆرە لێکدان و گەیاندنەدا دابمەزرێنین. لەهەمان کاتدا ناشتوانین تەنیا لە سەر ئەساسێ تایبەتییەکانی فۆنۆلۆژی ئەم جۆرە سیمایە دابنێین، چونکە تایبەتییەکانی فۆنۆلۆژی لە ڕاستییەوە زۆر دوورن. لەبەر ئەمە ئەبینین جۆرەها تیوێر هاتووەتە کایەوەو هەریەکەیان بەجۆرێك سیمای جیاکەرەوەی پێشنیار کردووە.

بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەساسی گریمانەیەکی تەواو دانەنراون و تارادەیەکیش نەبەستراون بە کەرەسەی ڕاستەقینەوە. بەم جۆرە هەندێ لەو تیوێرانە ئەتوانرێ بکرێن بە خاڵی دەست پێ کردن بۆ دانانی تیوێرێکی چەسپاو و هەندێکی تریشیان پێویستیان بە دەستکاریکردن هەیە، ئەگینا سیمای جیاکەرەوەی گشتی کارێکی مەحاڵە.[6]

هەروەکو ووتمان سیمای جیاکەرەوە بۆ ئەوە بەکارئەهێنرێ لایەنی جیاوازیو لێکچوونی نێوان فۆنیمەکان دەستنیشان بکرێت، بە پێی نواندنیان. بۆ نموونە سیمای جیاکەرەوەی [+ گڕی - گڕی][7] بۆدەستنیشان کردنی تایبەتییەکی ڕووتی (مجرد) چەند فۆنیمێك[8] بەکارئەهێنرێت و لە تیوێری فۆنۆلۆژی ووچ کردنیشدا سیمایەکی گرنگە بۆ هەمان مەبەست.

ئەم سیمایە، واتە [+ گڕی - گڕی]، لە سنووری فۆنەتیکی سروشتیشدا دەورێکی باڵا ئەگێڕێ، چونکە لەگەڵ چەند سیمایەکی دیکەدا ئەبێتە سیمایەکی زۆر گرنگ و پتەو، بەڵام لەهەمان کاتدا لە کەم و کوڕییەوە دوور نییە، چونکە هەروەکو ووتمان سنووری فۆنەتیك هێشتا بەشێوەیەکی تەواو لە شێوەی (مجرد) پاك نەکراوەتەوەو فۆنیمیش لە ڕووی وەزیفەوە جیاوازە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە. بۆ نموونە کۆنسنانتی ب لە زمانی کوردیدا لەهەموو شوێنێکدا گڕە بەڵام لە زمانی ئینگلیزیدا لە کۆتای ووشەدا کپە،[9] لەگەڵ ئەمەشدا ئەم فۆنیمە، واتە فۆنیمی /ب/ لە بەشی دەرەوەی فۆنۆلۆژیدا (بەشی چوونە ژوورەی فۆنۆلۆژی) بە [+ گڕ] لە قەڵەم ئەدرێ لەم دوو زمانەدا.[10] لەبەر ئەمە ناتوانرێ سیمای جیاکەرەوەی فۆنۆلۆژی گشتی بۆ هەموو زمانەکانی جیهان دابنرێ.

زانای بەناوبانگ جاکۆبسن لەسەر ئەساسی درکاندن، جووت سیمای جیاکەرەوە [+ کۆنسنانت ـ کۆنسنانت][11] دانا، بەڵام چۆمسکی و هاڵی هەوڵی ئەوەیان دا کە تایبەتی فیزیکیو بیستن لە تیوێری سیمای جیاکەرەوە وەدەرکەن و لە ڕێگەی دانانی ژمارەیەك سیمای جیاکەرەوەی زیاترەوە توانیان هەندێ کێشەی جیاکردنەوەی فۆنیمەکان بن بڕ بکەن.

بەڵام هەر خۆشیان ئەم کارە بە خاڵی دەست پێ کردن دائەنێن، چونکە دەستنیشان کردنی ڕەگەزەکانی فیزیکی

دەنگە ناتـوانـرێ بە تەواوەتی بهێنـرێنـە ئەنجام، جگە لەوەی رەگـەزەکـانی دەرك پێ کـردن زۆر دوورن لە رەگـەزەکـانی فۆنـۆلـۆژ ییەوە. هەروەها بەگوێرەی بۆچوونی (فانت)ی Fant) زمـانـەوان، ئەبێ سیمـای جیـاکـەرەوە لەسەر ئەساسی چەند بەشێکی دەستنیشـان کراوی رەگـەزەکـانی ئینکـۆد[12]، Encode) دابنـرێ، کە بۆمەبـەستی دەربـرین بەکارئەهێنرێن، ئینجا ئەتوانرێ دەستنیشانی هاودژەکانی ئەوفۆنیمانە بکرێ کە بەم شێوەیە سیمای جیاکەرەوەیان بۆدائەنرێ. جگە لەمەش بە گوێـرەی رای «فـانت» سیمـای جیـاکـەرەوە لەسـەر ئەسـاسی جولانـەوەی ئەندامەکانی ئاخافتن و دەرك پێ کردنیش دائەنرێ بەلام ووردی و شارەزاییـەکی تەواوی ئەوێ، جگـە لەوەی کە ئەبێ حیسـاب بۆجۆرەها رەگەزی دیکە بکرێ وەکو دنیامیکی هەواو میکـانیـزمی سیستـەمی ئاخافتن و کاری مێشك و باری دەروونی قسەکەر و بیسەر.

دەرك پێ کـردن (ادراك)[13] یەکێکـە لە رەگـەزە گرنگەکانی سیستـەمی ئینکـۆدو دیکـۆدو لیپـرسـراوە بەرانبەر بە هەلهێنانی رەگـەزەکـانی فۆنـۆلـۆژ ی. هەروەهـا سیمای جیاکەرەوە ئەبێ رەگەزی فیزیکی تێدا هەبێ، کە لەسیستەمی ئینکۆدو دیکۆددا رەنگە ئەداتەوەو حەدەسیش (حدس) دەور ئەگێرێ لەم بوارەدا.

ئەوەی شایـانی باســە پێـوەنـدی فیـزیکی لە سیمـای جیاکەرەوەدا دەستنیشان ناکرێ بەلکو رەگەزەکانی فۆنەتیکی پێ دەرئەخرێ.

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە بەپێی رای جاکۆبسن و هالی ئەتـوانـرێ وەزیفـەی فۆنـەتیکی لە سنـووری فۆنۆلۆژ یدا بەکـار بهێنـرێت، ئینجـا لەبـەر رۆشنـای ئەم بەکـارهێنـانـەدا ئەتوانرێ سیمای جیاکەرەوە دابنرێ.

ئەم دووزانـایە سیمای جیاکەرەوەیان دابەش کردووە بەسەر دوو بەشدا:[14] یەکەمیان بنەرەتییەو بریتیە لە جووت کردنی ئەو فۆنیمـانـەی کە بە پێی تایبـەتییـەکـانیـان بەرانبـەر بەیـەکدی دائـەنـرێن بێ ئـەوەی گوێ بە جیـاوازی ماوەی درکـانـدنیـان بدرێت. دووەمیـان عەرووزییـەو بە پێی جیاوازی سترێس و ئاوازەو تەوژمی هەوا ئەو فۆنیمـانـە بەرانبەر بە یەکدی دائەنرێن بەلام ئەم بەشـە بە پێی ماوە ئەگـۆرێ و بەستـراوە بە لەڤلی (ئاستی) سەرەوەی درکاندنی دەنگەکانەوە.

کە وا بوو جۆری یەکـەم (بەپێی رای جاکۆبسن) پێوەندی بە ماوەوە نییە، کەچی (فرانك پارکەر) جۆری کۆتای پێ هاتنی ماوەی درکـانـدنی ڤاوڵ ئەکـات بە سیمـای جیـاکـەرەوە بۆ دەستنیشان کردنی کۆنسنانتی وەستاوی کۆتایی ووشە، بۆ نموونە:[15]

S + OP → (+ Voice) (+ grdual termination)

کۆنسنانتی وەستاو ← [+ گڕ] [+ ڤاوڵی کۆتایی پێ هاتووی لەسەرخۆ]

بەم جۆرە ئەو کۆنسنـانتـەی کە ئەکـەوێتە کۆتایی ووشـەوە، ئەگـەر ڤاوڵـەکـەی پێشی لەسـەرخـۆ کۆتای پێ هات، ئەوا ئەو کۆنسنـانتـە کۆنسناتێکی گڕەو بە پێچەوانەوە کۆنسنانتەکە ئەبێتە کۆنسنانتێکی کپ. ئەوەی شایانی باسە لە زمانی کوردیدا ئەم دیاردەیە هەیەو ئەتوانرێ هەمان سیما بەکار بهێنرێت بۆ نموونە لە ووشـەی «پیـر» و «شیـر»دا ڤاوڵی /ی/ لەسـەرخۆ کۆتـای پێ دێت و لە ووشــەی «پیت»دا کوت وپـر کۆتـایی پێ دێت و ڤاوڵـەکـەش بەڤـاوڵێکی کورت دێتـەگـوێ، بەلام لە حالـەتی یەکەمدا، واتە لە ووشەی «پیر»دا، بە درێژ دێتەگوێ.

بەپێی جووت سیمـای جیـاکـەرەوەی جاکـۆبسن و هالی هەمـوو فۆنیمێـك ئەبێتـە [+ کۆنسنـانـت ـ کۆنسنانت] وەیا [+ ڤاوڵ ـ ڤاوڵ] و هەر سیمـایـەك لەم دوو سیمایە دوو نرخی هەیە یەکێکیـان (+) و ئەوی دی (-). ئەم دوو سیمـایـە لەسـەر ئەسـاسی درکـانـدن و شێـوەی فیـزیکی دەنگـەکان دانراون، چونکـە بۆنمـوونـە لە کاتی درکاندنی ڤاوڵدا هەوا بە ئارەزووی خۆی لە سییـەکـانـەو دێتە دەرەوەو فۆرمانتی رێك و پێکی هەیە بەلام لەکـاتی درکـانـدنی کونسنانتدا هەوا بە ئارەزووی خۆی

نایەتە دەرەوە دفورمانتی ڕێك و پێكی نییە . ئەم جووت سیمایە بۆ نیمچە ڤاوڵی /و/ =w/و /ی/ = /ل/ دەست نادەن چونکە ئەم دوو نیمچە ڤاوڵە نە ئەتوانرێ بە کۆنسنانتی تەواو دابنرێن و نەش بە ڤاوڵی تەواو. کە وابوو سیمای جیاکەرەوەی [+ ڤاوڵ – ڤاوڵ]وەیا [+ کۆنسنانت ـ کۆنسنانت] بە سەریاندا ناچەسپێنرێ .

بەم جۆرە ئەبێ سیمای جیاکەرەوەی [+ ڤاوڵ کۆنسنانت] وەیا [– کۆنسنانت ـ ڤاوڵ]یان بۆ دابنرێ . لێرەدا وادەرکەوت کە ئەبێ سێ جۆرە سیما هەبێ :

+ کۆنسنانت / هەموو کۆنسنانتەکان
ـ ڤاوڵ
+ ڤاوڵ
ـ کۆنسنانتەکان / هەموو ڤاوڵەکان
+ ڤاوڵ / نیمچە ڤاوڵی /و/و /ی/ [16]
+ کۆنسنانت

## سیمای جیاکەرەوە بۆ ڤاوڵەکانی زمانی کوردی

ڤاوڵەکانی زمان بەپێی شێوەی زمان و هەردوو لێو دابەش ئەکرێن . بۆ نموونە لە درکاندنی ڤاوڵی /ی/ دا بەشی پێشەوەی زمان بەرزئەبێتەوەو ئەوەندەی نامێنێ خۆی لە مەلاشووی ڕەق بدات . کەچی لە درکاندنی ڤاوڵی /و/ دا بەشی دواوەوەی زمان بەرزئەبێتەوەو نزیکی مەلاشووی نەرم ئەبێتەوە . ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە لە کاتی درکاندنی ڤاوڵی /ی/دا هەردوو لێوپان ئەکرێنەوە، بەلام لە کاتی درکاندنی /و/دا هەردوو لێو گرد ئەکرێنەوە (خڕ ئەکرێنەوە) . [17]

بەپێی ڕای زانایانی زمان ڤاوڵی /ی/و /و/ و /ـە/ تا ڕادەیەك لە هەموو زمانەکانی گێتیدا هەن .

لەبەر ئەمە ئەم سێ ڤاوڵە بە ڤاوڵی گشتی ، وەیا بە ڤاوڵی سروشتی دائەنرێن . ئەوەی شایانی باسە سیستەمی ڤاوڵی هەندێ زمان بریتییە لەم سێ ڤاوڵە ، بۆ نموونە زمانی عەرەبی : سیستەمی ڤاوڵی زمانی عەرەبی بەم شێوەیەیە : [18]

و ——————— ی

ە

هەروەها ئەم سێ ڤاوڵە ئەکەونە نێو سیستەمی ڤاوڵی زمانی کوردیشەوە، چونکە سیستەمی ڤاوڵی زمانی کوردی بەم شێوەیەی خوارەوەیە .

| | پێشەوە | پشتەوەی | پشتەوەی گردکراو |
|---|---|---|---|
| | | گردنەکراو | |
| بەرز | ی | ا | وو و |
| ناوەڕاست | ێ | | ۆ |
| نزم | ـە | آ | |

سیستەمی ڤاوڵی زمانی کوردی دابەش ئەکرێت بەسەر سێ نیمچە سیستەمداو بەم شێوەیەی خوارەوە :

نیمچە سیتەمی یەکەم :

| | پێشەوەی درێژ | پێشەوەی کورت |
|---|---|---|
| + بەرز | ی | ا |
| + ناوەڕاست | ێ | |

نیمچە سیستەمی دووەم :

| | پشتەوەی درێژ | پشتەوەی کورت |
|---|---|---|
| + بەرز | وو | و |
| + ناوەڕاست | ۆ | |

نیمچە سیستەمی سێیەم :

| | پشتەوەی درێژ | پێشەوەی کورت |
|---|---|---|
| + نزم | آ | ە |
| ـ ناوەڕاست | | |
| ـ بەرز | | |

ڤاوڵەکانی نیمچە سیستەمی یەکەم و سێیەم هەموویان [+

گرد نەکراو]ەن و ڤاوڵەکانی نیمچە سیستەمی دووەم هەموویان [+ گردکراو]ەن.

ئەگەر سەیرێکی ئەو سێ نیمچە سیستەمە بکەین ئەبینین سیمای جیاکەرەوەی [+ درێژ - کورت]و[- درێژ + کورت] دوو سیمای جیاکەرەوەن بۆ شەش ڤاوڵ لە ڤاوڵەکانی زمانی کوردی:

1 - + بەرز
+ درێژ ڤاوڵی
- کورت /ی/
+ پێشەوە
+ گردنەکراو
بۆ نموونە لە ووشەی «ژ ین»دا.

+ بەرز
- درێژ ڤاوڵی ;
+ کورت
+ پێشەوە
+ گردنە کراو
بۆ نموونە لە ووشەی «ژ ن»دا.

2 - + بەرز
+ درێژ ڤاوڵی
- کورت /وو/
+ پشتەوە
+ گردکراو
بۆ نموونە لە ووشەی «کوور»دا.

+ بەرز
+ کورت ڤاوڵی
- درێژ /و/
+ پشتەوە
+ گرد کراو
بۆ نموونە لە ووشەی «کور»دا.

3 - + نزم
+ پشتەوە ڤاوڵی /ا/
+ درێژ /ا/
- کورت
+ گردنەکراو
بۆ نموونە لە ووشەی «شان» دا.

+ نزم
+ پشتەوە ڤاوڵی
+ کورت /ە/
- درێژ
+ گردنەگراو

بۆ نموونە لە ووشەی «شەن»دا.

لێرەدا تەنیا ڤاوڵی /ۆ/ و /ێ/ لە سیستەمەکەدا مانەوەو سیمای [+ کورت - درێژ] و[- کورت + درێژ] بۆ ئەم دوو ڤاوڵە ناشێ. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ئەم دوو ڤاوڵە هەردووکیان کراوەن و بە ڤاوڵی ناوەڕاست دائەنرێن. بەم جۆرە تەنیا شێوەی هەردوو لێو ئەکرێت بە سیمای جیاکەرەوە بۆ ئەم دوو ڤاوڵەو بەم شێوەیەی خوارەوە:

4 - + دراوە ڤاوڵی
+ ناوەڕاست /ێ/
+ گردنەکراو
+ درێژ
- کورت
- گردکراو

بۆ نموونە لە ووشەی «دێ»دا.

+ کراوە
+ ناوەڕاست ڤاوڵی
+ گرد کراو /ۆ/
- گردنەکراو

- کورت
+ درێژ
بۆ نموونه له ووشه‌ی «دۆ» دا.

بەڵام ئەم سێ سیمـــایـــەی خوارەوە بەشێـوەیـەکی تەواو بۆ ڤاوڵـــەکـانی زمـانی کوردی ناشێن چونکـە چوار ڤاوڵی بەرزی هەیــەو جووت سیمـــای [+ بەرز- نزم] بە شێــوەیـەکی تەواو بەسەریاندا ناچەسپێنرێ.

1 - + بەرز ی، ا، وو، و
- نزم

2 - - بەرز/ ێ، ۆ
- نزم

3 - + نزم ا، ە
- بەرز

هەروەهـــا هیــچ ڤاوڵێـك نییـە نە بەرزبێ و نە نزم وەیـا هەم بەرزبێ و هەم نزم. لەبەر ئەمە ئەو چوار سیمایەی سەرەوەمان بۆ ڤاوڵەکانی زمانی کوردی داناوە.

## سیمای جیاکەرەوە بۆ کۆنسنانتەکانی زمانی کوردی

بەپێی رای زانـایـانی زمـان کۆنسنانتی /پ/، /ت/ و/ك/ تارادەیەك لە هەموو زمانەکانی جیهاندا بەدی ئەکرێن.[20] لەبەر ئەمە ئەم سێ کۆنسنانتە بە کۆنسنانتی سروشتی دائەنرێن.

ئەم سێ کۆنســنـــانتـــە لە سێ شوێنی جیـــاوازدا دروست ئەکـرێن و تارادەیـەکیش شوێنی دروست بوونیـان لەیەکدییەوە دوورە. بۆنموونە کۆنسنانتی /پ/ بە هەردوو لێو ئەدرکێنرێ، واتە بە بەشی پێشەوەی زار و کۆنسنانتی /ت/ بە سەری زمان و ئارۆ (پووك) ئەدرکێنرێ، واتە بە بەشی ناوەڕاستی زار دروست ئەکرێت و کۆنسنانتی /ك/ بە پشتی زمان و مەلاشوو دروست ئەکرێت کە بەشی دواوەوەی بۆشای زار ئەگرێتەوە.

بەم جۆرە ئەتوانرێ سێ سیما بۆ ئەم سێ کۆنسنانتە دابنرێ:

گرووپی یەکەم: + پێشەوە کۆنسنانتی
- ناوەڕاست /پ/
- پشتەوە

گرووپی دووەم: - پێشەوە کۆنسنانتی
+ ناوەڕاست /ت/
- پشتەوە

گرووپی سێیەم:
- پێشەوە کۆنسنانتی
- ناوەڕاست /ك/
+ پشتەوە

هەروەهـا لەبـەر ئەوەی ئەم سێ کۆنسنـانتـە بە کۆنسنـانتی سروشتی دائـەنـرێن، ئەتـوانـرێ ئەم سیمایەی خوارەوەیان بۆ زیاد بکرێت.

+ سروشتی کۆنسنانتی /پ/، /ت/، /ك/.

ئەو کۆنسنانتانەی کە ئەکەونە سنووری گرووپی یەکەمەوە ئەمانەی خوارەوەن:

پ، ب، م، و، ف، ڤ.

ئەم گرووپە «کۆمەڵە»، کە گرووپی /پ/ یە ئەکرێت بە دوو بەشەوە:

1 - گرووپی ف، ڤ بە لێـوی خوارەوەو دانـەکـانی سەرەوە دروست ئەکـرێن و تارادەیــەکیش نزیکی سنــووری گروپی دووەم ئەبنەوە کە گرووپی /ت/ یە، چونکە دانەکانی سەرەوە بەشداری ئەکەن لە درکاندنیاندا.

2 - گرووپی پ، ب، م، و، بە هەردوو لێو ئەدرکێنرێن.

سیمای جیاکەرەوەی ئەم دوو گرووپە بەم جۆرەیە:

+ لێوـــــ دانی ف، ڤ
+ پێشەوە

+ لێوی پ، ب، م، و.
+ پێشەوە

ئەو کۆنسـانتـانەی کە ئەکەونە سنووری گرووپی دووەمەوە، کە گرووپی / ت / یە، ئەمانەی خوارەوەن :
ت، س، د، ز، ڕ، ر، ل، ژ، ن ئەم کۆنسـانتـانە بە سەری زمان و ئارۆ (تا ڕادەیەك هەندێکیان بە مەلاشووی ڕەق) ئەدرکێنرێن.

+ ئارۆیی ت، س، د، ز، ڕ، ر، ل، ژ، ن
+ ناوەڕاست.

ئەو کۆنسانتانەی کە ئەکەونە سنووری گرووپی سێیەمەوە، کە گرووپی /ك/ە، ئەمانەی خوارەوەن.
ك، گ، چ، ج، ڵ، ی، ش، غ، خ
ئەم کۆنسانتانە بە پشتی زمان و مەلاشوو ئەدرکێنرێن.

+ مەلاشووی ك، گ، چ، ج، ڵ، ی، ش
+ پشتەوە غ، خ

لێرەدا تەنیا سێ کۆنسنانت مایەوەو ئەمانەی خوارەوەن :
ق، ح، هـ، کە بە قوڕگ ئەدرکێنرێن :

+ قوڕگی / ق، ح، هـ
+ پشتەوە

## سیمای جیاکەرەوە بەپێی تایبەتی فیزیکی.

بەپێی وێنـەگـرتنـەوەی دەنـگ، ئەبینین بەشی سەرەوەی وێنـەی هەنـدێ دەنـگ زاڵ ترە بەسەر بەشی خوارەوەیدا، واتە لەرەی ئەودەنگـانـە لە بەشی سەرەوەی وێنـەکـانـدا چڕتـرە لە بەشی خوارەوەی. بە پێچـەوانـەوە هەندێ دەنگی دیکە بەشی خوارەوەی وێنـەکـانیـان لە بەشی سەرەوەیـان چڕتـرە، ئەو دەنگانەی بەشی سەرەوەی وێنەکانیان چڕترە پێیان ئەوترێ [زەق]و[21] ئەوانـەی بەشی خوارەوەیـان چڕتـرە پێـیان ئەوتـرێ [خنکـاو]. لە درکـانـدنی دەنگی خنکـاودا بۆشـایی زار زۆرتر ئەکـرێتەوەو فۆرمانتی دووەمی دەنگی خنکاویش ئەنووسێت بە فۆرمانتی یەکەمەوە.
بەلام لە درکـانـدنی دەنگی زەقـدا بۆشـایی زار کەم تر ئەکرێتەوەو فۆرمانتی دووەمی ئەنووسێ بە فۆرمانتی سێیەمەوە.

بەم جۆرە کۆنسـانتـە لێوییەکان و مەلا شووییەکان و ڤاوڵەکانی پشتەوە ئەم سیمایەی خوارەوەیان بۆ دائەنرێ :

+ خنکاو
- زەق

بەلام کۆنسنانتە دانییەکان و ڤاوڵەکانی پێشەوە ئەم سیمایەی خوارەوەیان بۆ دائەنرێ.

+ زەق
- خنکاو

## سیمایە جیاکەرەوە بەپێی حاڵەت و شوێنی درکاندن.

درکـانـدنی هەنـدێ دەنـگ پێـویستی بە گرژ بوونەوەیەکی زۆری ماسـولکەکانی ئەندامەکانی ئاخافتن هەیەو هەندێکی تریـان کەم تر. ئەودەنگـانـەی کە لە کاتی درکـانـدنیـانـدا ماسـولکـەکانی ئەندامەکانی ئاخافتن زۆرتر گرژئەبنەوە پێیان ئەوتـرێ [قـورس]و[22] ئەوانـەی کەم تر پێـویستیـان بە گرژ بوونەوەی ماسولکەکان هەیە، پێیان ئەوترێ [سووك].
جۆری یەکەم ئەم سیمایەی خوارەوەیان بۆ دائەنرێ.

+ قورس ت، پ، ك، ت، ا، و، ۆ،
- سووك وو....... هتد.

بەلام جۆری دووەم ئەم سیمایەی خوارەوەیان بۆ دائەنرێ.

- قورس گ، د، ب، ی، ا، ێ.. هتد.
+ سووك

هەروەهـا چەنـد دەنگێـك درکـاندنێکی بەردەوامیان هەیەو چەنـد دەنگێکی دیکـە وەستـانێکی کوت وپـڕ لە درکاندنیاندا ڕووئـەدات. دەنگـە خشـۆکـەکـان درکاندنێکی بەرەدەوامیان هەیەو دەنگە گیرەکان بچڕاندنێکی کوت وپڕ لەدرکاندنیاندا ڕووئەدات.
بەم جۆرە [+ بەردەوام - بچـڕاو] و[- بەردەوام + بچـڕاو] ئەکرێن بە سیمای جیاکەرەوەی ئەو دەنگانە :[23]

\+ بەردەوام /ڤ، ف، ژ، س، ش، چ، ج

– بچڕاو

\- بەردەوام پ، ب، ك، گ، ت، گ

\+ بچڕاو

لێـرەدا کۆنسـانتـەکـانی زمـانی کوردی بەپێی حاڵـەتی درکاندن دابەش ئەکەین بەسەر ئەم گرووپانەی خوارەوەدا .

1 ـ کۆنسنانتە وەستاوەکان (گیرەکان) .

لە زمـانی کوردیـدا شەش کۆنسـانتی وەستـاو هەیـەو ئەمانەی خوارەوەن :

| لێوی | ئاڕۆیی | مەلاشوویی (رەق) |
| --- | --- | --- |
| پ، ب | ت، د | ك، گ |

2 ـ کۆنسنانتە لەرۆکەکان (خشۆك) .

لە زمانی کوردیدا دە کۆنسنانتی لەرۆك هەیەو ئەمانەی خوارەوەن :

| لێوی | ئاڕۆی (دانی) | مەلا شوویی (رەق |
| --- | --- | --- |
| ف ، ڤ | س ، ز | ش ، ژ |

| مەلا شوویی (نەرم) | قورگی |
| --- | --- |
| غ ، خ | ح ، هـ |

3 ـ کۆنسنانتە لووتیەکان :

لە زمانی کوردیدا دوو کۆنسنانتی لووتی هەیە :

| لێوی | دانی (ئاڕۆیی) |
| --- | --- |
| م | ن |

4 ـ کۆنسنانتە لاییەکان :

| ئاڕۆیی | مەلا شووی |
| --- | --- |
| ل | ڵ |

5 ـ کۆنسـانتـە گڤـۆکـەکـان : لە زمـانی کوردیدا دوو کۆنسانتی گڤۆك هەیەو هەردووکیان ئاڕۆیین : ڕ، ر.

6 ـ نیمچە ڤاوڵ :

| لێوی | مەلا شوویی |
| --- | --- |
| و | ی |

**دانانی نیشانە بۆ کۆنسنانتەکان و ڤاوڵەکان .**

---

هەروەکـو لە پێشەکی ئەم ووتارەدا بۆمان دەرکەوت کە سیمای جیاکەرەوەی [+ کۆنسنانت - ڤاوڵ]و[- کۆنسنانت + ڤاوڵ]و[+ گر - گر] کەم وکوڕییان تێـدا هەیـە . لەبـەر ئەمە سیمای [★ زرنیکۆك - زرینکۆك][23] کە سیمایەکی گشتی یە، بۆ کۆنسنانتەکان و ڤاوڵەکان دائەنرێ (خەفۆك لەباتی (- زرینگۆك) دائەنێین) .

| زرینگۆك | خەفۆك |
| --- | --- |
| 1 ـ ڤاوڵەکان | 1 ـ کۆنسنانتە وەستاوەکان |
| 2 ـ کۆنسنانتە لووتیەکان | 2 ـ کۆنسنانتە لەرۆکەکان |
| 3 ـ نیمچە ڤاوڵەکان | 3 ـ کۆنسنانتە قورگییەکان . |
| 4 ـ کۆنسنانتە لاییەکان | |
| 5 ـ کۆنسنانتە گڤۆکەکان | |

گرووپی یەکـەم نەغمەیەکی مۆسیقیان هەیە بە پێچەوانەی گرووپـی دووەمـەوە . هەروەهـا گرووپی یەکـەم لە ڕیـزی گرووپـی ڤاوڵـەکـان دائـەنـرێ، بەڵام گرووپی دووەم بە کۆنسنانتی بنەڕەتی دائەنرێ .

بەپێی سیمـای زرینگـۆك و خەفۆك نیشانەی (+) و(-) بۆ چەند فۆنیمێك دائەنێین .

| کۆنسنانتی | لایی | وەستاو | لووتی | لەرۆك |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| زرینگۆك | + | – | + | – |

Sonorant

| گڤۆك | قورگی | نیمچەڤاول | ڤاوڵ |
| --- | --- | --- | --- |
| + | – | + | + |

خەفۆك – + – + – + – –

Obstruent

لێـرەدا نیشـانـە بۆ هەمـوو کۆنسنانتەکان و ڤاوڵەکانی زمانی کوردی دائـەنێین بەپێی سیمـای جیـاکـەرەوەی زرینگـۆك و خەفۆك و پێشەوەو ناوەڕاست و پاشەوەو چەند سیمایەکی دیکەو بەم شێوەیەی خوارەوە .

| سیاڵان | ب | پ | د | ت | ج | چ | گ | ک | ف | ڤ | ز | س | ژ | ش | م | ن | ل | ڵ | ڕ | ر | و | ی | غ | خ | وو | و | ۆ | ا | ە | ێ | ی | I | ه |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زرینگاوک | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | + | + | + | + | + | + | + | + | - | - | + | + | + | + | + | + | + | + | - |
| خەفۆک | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | - | - | - | - | - | - | - | - | + | + | - | - | - | - | - | - | - | - | + |
| کۆنسۆنانت | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | + | ± | ± | + | + | - | - | - | - | - | - | - | - | + |
| ڤاوڵ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ± | ± | - | - | + | + | + | + | + | + | + | + | - |
| گڕ | + | - | + | - | + | - | + | - | - | + | + | - | + | - | + | + | + | + | + | + | + | + | + | - | + | + | + | + | + | + | + | + | - |
| کپ | - | + | - | + | - | + | - | + | + | - | - | + | - | + | - | - | - | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | - | - | + |
| پێشەوە | + | + | - | - | - | - | - | - | + | + | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | + | + | + | - |
| ناوەڕاست | - | - | + | + | - | - | - | - | + | - | + | + | + | + | - | + | + | + | - | - | - | - | - | - | - | - | + | - | - | + | - | - | - |
| دواوە | - | - | - | - | + | + | + | + | - | - | - | - | + | + | - | - | - | + | - | - | - | + | + | + | + | + | + | + | - | - | - | - | + |
| هنکاو | + | + | - | - | + | + | + | + | + | + | - | - | + | + | - | - | - | - | - | - | + | - | + | + | + | + | + | + | + | - | - | - | + |
| زەق | - | - | + | + | - | - | - | - | - | - | + | + | - | - | + | + | + | + | + | + | - | + | - | - | - | - | - | - | - | + | + | + | - |
| قورس | - | + | + | + | - | + | - | + | + | - | - | + | - | + | - | - | - | - | - | - | + | - | - | - | - | + | + | + | - | + | - | - | - |
| سووک | + | - | + | - | + | - | + | - | - | + | + | - | + | - | + | + | + | + | + | + | - | + | + | + | + | - | - | - | + | - | + | + | + |

## ئەنجام:

ئەو سیمایانەی کە بۆ فۆنیمەکان دامانناون بۆ مەبەستی پیشاندانی جیاوازی نێوان فۆنیمەکان بەکارمان هێناون، جگە لەوەی کە لەسەر ئەساسێکی زانستیانە ئەو فۆنیمانەمان دابەش کردووە، چونکە بنەڕەتی ئەو سیمایانە تایبەتییەکانی فۆنەتیکە (ئەگەرچی دەستنیشان کردنی تایبەتییەکانی فۆنەتیک بەشێوەیەکی تەواو کارێکی ئاسان نییە).

بەم جۆرە ئەساسێکی چەسپاومان بۆ فۆنیمەکانی زمانی کوردی داناوە و لە ئەلۆفۆنەکانمان دابڕیون. هەروەها ئەگەر هەرگۆڕانێك بەسەر دەنگەکانی زمانی کوردیدا بێت لە داهاتوودا، ئەوا بەئاسانی ئەتوانرێ ئەم سیمایانەی کە ئێستا دانراون بکرێن بە نیشانە بۆ دەستنیشان کردنیان. جگە لەمەش سیمای جیاکەرەوە ڕێگەیەکە بۆ بەراوردکردنی فۆنیمەکانی زمانێك لەگەڵ فۆنیمەکانی زمانێکی دیکەدا.

**پەراوێزەکان**

1 ـ فۆنۆلۆژی سود لە تایبەتییەکانی فۆنەتیك وەرئەگرێ بۆ ناساندنی فۆنیمەکان. ئەو تایبەتیانەش پێیان ئەوترێ «سیما». ئەگەر هەر سیمایەك لە فۆنیمێکدا هەبێ، ئەوا ئەو فۆنیمە عەلامەتی [+ ئەو سیمایە] وەرئەگرێ. وە ئەگەر هەر فۆنیمێك ئەو تایبەتییەی تێدا نەبوو ئەو [- ئەو سیمایە]ی بۆ دائەنرێ. بۆ نموونە سیمای لێوی لە دەنگی [م]دا هەیە و سیمای [+ لێوی] بۆ دائەنرێ.

2 ـ جاکۆبسن یەکێکە لە زمانەوانە بەناوبانگەکان و گەلێ نەزەرییەی دەربارەی فۆنەتیك و فۆنۆلۆژی داناوە. هەروەها ئەم زمانەوانە بە بەکارهێنانی ئامێری تایبەتی تاقی کردنەوەیەکی فراوان و ووردی دەربارەی دەنگەکانی زمانی ئینگلیزی کردووە، بەتایبەتی لەگەڵ (فانت) و (هالی)داو ئەمانیش دوو زمانەوانی گەلێ بەناوبانگن. لە تاقی کردنەوەکانیاندا تایبەتییەکانی فیزیکی دەنگیان بە ئەساسی جیاکردنەوەی دەنگەکان داناوە.

3 ـ چۆمسکی زانایەکی بەناوبانگی ئەمەریکیەو گەلێ نەزەرییەی دەربارەی زمان داناوە. بۆ نمونە نەزەرییەی «ووچ کردن» یەکێکە لەو نەزەرییە گرنگانەی کە دایناوە. ئەم نەزەرییەیە ئەوە دوویات ئەکاتەوە کە لە زماندا کۆمەڵێك دەستوور هەیەو تەنیا ئەو ڕستانە دروست ئەکەن کە واتاداروبێ کەم وکوڕیین، وەیا ئەو دەستوورانەی کە تەنیا فۆنیمەکانی زمانێك لەیەك ئەدەن لە قاڵبی بڕگەی فۆنەتیکیدا.

4 ـ ترۆبتسکۆی یەکێکە لە زاناکانی قوتابخانەی لینگویستیکی پراگ کە لە کۆتای بیستەکانی ئەم سەدەیەدا دامەزرا. ئەم قوتابخانەیە لە بیرو ڕای زمانەوانە ڕووسەکان و سویسرییەکان ئەکۆڵییەوە، واتە کارتێکردنی بیرو ڕای ئەو زانایانە بووە هۆی دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیە. بەپێی بۆچوونی ئەو زمانەوانە ئەبێ لە ڕێگەی وەزیفەی دانەکانی زمانەوە زمان شی بکرێتەوە.

5 ـ بڕوانە لاپەڕە (3)ی کتێبی:

«Generative Phonlogy, by S. Shane»

ئاخافتن بریتییە لە کۆمەڵێك دەنگی تێ هەڵکێش و لە لایەن قسەکەرەوە دەرئەبڕرێ، بەڵام کاتێ بیسەر ئەو ئاخافتنە وەرئەگرێ دابەشی ئەکات و دانەکانی لەیەك جیائەکاتەوە بۆ ئەوەی لەو ئاخافتنە تێ بگات.

6 ـ بەشێوەیەکی گشتی دەستوورەکانی فۆنۆلۆژی لە سنووری تاقە زمانێکدا بەکار ئەهێنرێن.

بەڵام زاناکانی زمان هەوڵی دانانی سیمای جیاکەرەوەی گشتی ئەدەن بۆ ئەوەی بۆ هەموو فۆنیمەکانی زمانەکانی گێتی دەست بدەن.

بۆ نموونە سیمای جیاکەرەوەی سروشتی یەکێکە لەو سیمایانەی کە ئەتوانرێ بۆ ئەو فۆنیمانە دابنرێ کە لە

هەمـوو زمانەکانی گێتیدا هەن، وەیا بۆ ئەو دەنگانەی کە منداڵ لەسەرەتادا فێریان ئەبێ .

7 ـ عەلامەتی [+] ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو فۆنیمە تایبەتی گڕی تێـدایە، واتە لەکاتی درکاندنیدا تاڵە باریکەکانی قورگ ئەجـووڵێنـەوە. وەعـەلامەتی [-] ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو فۆنیمە تایبەتی گڕی تێدانییە.

8 ـ لەم سەردەمەدا زانایانی زمان لەباتی زاراوەی فۆنیم زاراوەی سیـگمێنت بەکـار ئەهێنن Segment) چونکـە زاراوەی فۆنیم وەکـو کەرەسەیەکی فۆنۆلۆژی جۆرە لێکچوونێکی لەگەڵ زاراوەی فۆندا هەیە Phone) . ئینجا لەبەر ئەوەی ئێستە بەشێوەیەکی تەواو ئەتوانرێ دەستنیشانی سنووری فۆنـۆلـۆژی و فۆنـەتیـك بکـرێ، بەهـەمـان شێـوە ئەبێ کەرەسەکانی هەردوو بەشەکە بەتەواوەتی جیابکرێنەوە. لەبـەر ئەم هۆیـە زاراوەی سیگمێنت لەبـاتی فۆنیم بەکار ئەهێنرێ لە سنووری فۆنۆلۆژ یدا.

9 ـ بڕوانە لاپەڕە (103)ی کتێبی فۆنەتیك. بۆ نموونە دەنگی (ب)ی کۆتـایی ووشە لە زمانی ئینگلیزیدا ئەبێتە کپ، ئەگەرچی ئەم دەنگە لە بنەڕەتدا گڕە. هۆی گۆڕانی ئەم دەنگــە لە گڕەوە بۆ کپ لەم شوێنــەدا، ئەگـەڕێتـەوە بۆ ئەوەی کە ئەم دەنگە لە کاتی درکاندندا بەرەڵلا ناکرێ.

10 ـ بڕوانــە گۆڤــاری زانکــۆ ژمـارە (2) بەرگی (8) ساڵی 1982 . لە سنووری فۆنۆلۆژ یدا دوو بەش هەیە: یەکێکیـان بەشی چوونە ژوورەوەیەو ئەوی تریان بەشی چوونـە دەرەوەیـە. هەروەهـا لە فۆنـەتیکیشدا دوو بەش هەیــە: یەکێکیــان بەشی چوونـە ژوورەوەو ئەوی دی چوونـە دەرەوە. لەم بەینـەدا دەنـگ و فۆنیم گۆڕانیان بە سەردا دێت.

11 ـ هەرچـی کونسـنـانتـە سیمـای [+ کۆنسنــانت]ی بۆ دائـەنرێ، وەیا [- ڤاوڵ]. وە هەرچی ڤاوڵیشە سیمای [+ ڤاوڵ] وەیا [- کۆنسـنانتی] بۆ دائەنرێ.

12 ـ ڕەگـەزەکـانی ئینکـۆد ئەو تایبـەتییـانـەیە کە لە ئاخافتندا هەن. واتـە ئەو تایباتییانەی کە لە قسوی قسەکەردا هەن پێش ئەوەی بیســەر وەریــان بگــرێ. بەگـوێـرەی ئەو تایبەتییانە هەندێ سیمای جیاکەرەوە دائەنرێ.

13 ـ دەرك پێ کردن، بەشێوەیەکی سەرەکی لە دەرك پێ کردنی بیسـەر کاتێ قسـەکـانی قسەکەز وەرئەگرێ. بەگوێرەی دەرك پێ کـردنیش هەندێ سیمای جیاکەرەوە دائەنرێ. جگـە لەمـەش ڕەگـەزەکانی فیزیکی دەنگ و حەدەسی بیسەر قسەکەریش ئەکرێن بە ئەساس بۆ دانانی سیمای جیاکەرەوە.

14 ـ سیمـای جیـاکەرەوەی بنەڕەتی تەنیا بەپێی تایبەتیەکانی فۆنیم دائـەنـرێ. بەڵام بۆ دانـانی سیمای جیاکەرەوەی عەرووزی ئەبـێ حیســابـێـکـی تایبــەتـی بۆ ئەو گۆڕانـانـە بکرێ کە بە هۆی ستریس و ئاوازەو تەوژمی هەوا وەسەرهـەڵ ئەدەن ـ بۆ نمـوونـە سترێس ئەبێتە هۆی درێژکردنەوەی ماوەی درکاندنی دەنگ.

15ـ «فـرانـك پاکـەر» سیمـای جیاکەرەوەی [+ گڕی - گڕی] بە سیمــای تەواو دانــانێــت، چونکــە گەلێ کۆنسنــانتی گڕ لە ئاخــافتنــدا ئەبن بە کپ . بۆزانین بڕوانـە گۆڤـاری کاروان، ژمارە (6)ی ساڵی (1983) ووتاری «بە یەکداچوونی درکاندنی ڤاوڵ و کۆنسنانتە وەستاوەکان».

16ـ چونکــە نیـمـچــە ڤاوڵـی /و/ و /ی/ لە سیمـای [+ کۆنسنــانت]و [+ ڤاوڵ]دا هاوبــەشن، هەردووکیـان تایبەتییەکانی ڤاوڵ و کۆنسـنانتیان تێدایە. لەبەر ئەمە لە هەردوو حاڵەتەکەدا علامەتی [+] وەرئەگرن.

17ـ لە کاتی درکاندنی ڤاوڵی /و/ و/ وو/ و/ۆ/دا هەردوو لێو خڕئـەکـرێنەوە، بە پێچەوانەی ڤاوڵەکانی ترەوە. کەوابێ ڤاوڵــی /و/و/ وو/ و/ ۆ/ سیــمــای [+ گردکراو]وەرئەگرن و ئەوانی تر [ـ گردکراو].

18 ـ بروانە لاپەڕە (10)ی کتێبی :

«Generative Phonology»

19 ـ هەندێ ڤاوڵ بە بەشی پێشەوەی زمان ئەدرکێنرێن و سیمای جیاکەرەوەی [+ پێشەوە]یان بۆ دائەنرێ. هەروەها هەندێ ڤاوڵی دیکە لە کاتی درکاندنیاندا زمان بەرزئەبێتەوەو سیمای [+ بەرز]یان بۆ دائەنرێ. بەڵام لە کاتی درکاندنی هەندێکی تریاندا زمان نزم ئەبێتەوە، بەم جۆرە ئەم ڤاوڵانە سیمای [+ نزم]یان بۆ دائەنرێ و ئەوانەی لە کاتی درکاندنیاندا زمان لە ناوەڕاستی زاردا لەنگەر ئەگرێ سیمای [+ ناوەڕاست] وەرئەگرن. لە لایەکی ترەوە ماوەی درکاندنی هەندێ ڤاوڵ درێژەو هەندێکی تریان کورتە. ئەوانەی ماوەی درکاندنیان درێژە [+ درێژ]یان بۆ دائەنرێ و ئەوانەی ماوەی درکاندنیان کورتە سیمای [- درێژ]یان بۆ دائەنرێ. هەروەها لەبەر ئەوەی ڤاوڵی [ێ] و [ۆ] لە کاتی درکاندنیاندا هەردوو لێو ئەکرێنەوە سیمای [+ کراوە] وەرئەگرن.

20 ـ ئەو کۆنسنانتانەی کە لە هەموو زمانەکانی گێتیدا هەن سیمای [+ سروشتی]یان بۆ دائەنرێ. بۆزانین بروانە لاپەڕە (16)ی کتێبی (Generative Phonology).

21 ـ ئەو دەنگانەی کە بەشی سەرەوەی وێنەکانیان (دوای تاقی کردنەوەیان بە ئامێری تایبەتی) چڕەو بەزەقی دیارە پێیان ئەوترێ زەق و سیمای [+ زەق] وەرئەگرن، چونکە بە تەواوەتی ئەگوشرێن لە کاتی درکاندنیاندا، بەڵام ئەو دەنگانەی کە بەشی خوارەوەیان چڕترە پێیان ئەوترێ خنکاو چونکە بەتەواوەتی ناگوشرێن لە کاتی درکاندندا.

جۆری یەکەم لە درکاندندا ئاوازەیەکی بەرزی هەیەو جۆری دووەم ئاوازەیەکی نزم.

22 ـ لە درکاندنی هەندێ دەنگدا هێزێك و هەوایەکی زۆرتریان بۆ سەرف ئەکرێ و ماسوولکەکانی ئەندامەکانی ئاخافتنیش زیاتر گرژئەبنەوە، ئەم جۆرە دەنگانە سیمای [+ قورس] وەرئەگرن. لە لایەکی ترەوە هەندێ دەنگی دیکە هێزێك و هەوایەکی کەم تریان ئەوێ و سیمای [- قورس] وەرئەگرن.

بۆ نموونە دەنگی [پ] لەو دەنگـ ـیە کە قورسەو دەنگی [ب] سووکە.

23 ـ لە کاتی درکاندنی هەندێ دەنگدا هەوا بەردەوام لە سییەکانەوە دێتەدەرەوە. ئەم دەنگانە سیمای جیاکەرەوەی [+ بەردەوام] وەرئەگرن و ئەوانەی لەکاتی درکاندنیاندا هەوا ڕێگەی لێ ئەگیرێ سیمای [- بەردەوام] وەرئەگرن.

24 ـ زاراوەی زرینگۆك ئەوە ئەگەیەنێ کە هەندێ دەنگ هەوێنی مۆسیقییان تێدایە چونکە ئەتوانرێ لەرەکانیان درێژ بکرێنەوە، بە پێچەوانەی هەندێ دەنگی ترەوە کە ئەم تایبەتییەیان تێدانییە.

**سەرچاوەکان**

1 ـ بەزمانی کوردی:

ئەمین، وریا عومەر. فۆنۆلۆژی. گۆڤاری کاروان، ژمارە (20)ی ساڵی 1984. (ل 34 ـ 37).

مارف، ئەورەحمان حاجی. زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا. چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد. (1976).

وەیس، غازی فاتح، فۆنەتیك. چاپخانەی (الادیب) (1984).

وەیس، غازی فاتح. دەنگەکانی [ڵ]، [ل] و [ڕ]، [ر] لەژێر تیشکی فۆنەتیك و فۆنۆلۆژیدا. گۆڤاری زانکۆ ژمارە (2) بەرگی (8). 1982.

2 ـ بەزمانی عەرەبی:

حسان، تمام. مناهج البحث في اللغة. مطبعة النجاح الجديدة. الدار البيضاء. 1979.

خرما، نايف. أضواء على الدراسات اللغوية المعاصرة. المجلس الوطني للثقافه والفنون. الكويت (1978).

عمر، احمد مختار. دراسة الصوت اللغوي مطابع سجل العرب، القاهرة. 1976.

# ناوی کەسی وتوپۆنومیکی چەرخی هێللینی لە زمانی کوردی کۆندا

دکتور جمال رشید احمد

بەشی مێژوو/کۆلیجی ئەدەبیات

زانکۆی بەغدا

لە ژمارەی (103 ـ 104) سالی 1984ی ئەم گۆڤارەی (رۆشنبیری نوی)دا ووتاریکم بە ناونیشانی «تیشکێك لە سەر دۆکومێنتەکانی هەورامان» بلاو کردبۆوەوە، تێدا شەش خاڵم دەست نیشان کردبوو، کە پەیوەندیان بەو دۆکومێنتانەوە هەیە وپێویستیان بە روون کردنەوەیە. خاڵی یەکەم لەو خاڵانە کە دەڵێت:

«ئەو نێوانەی لە نێو تێکستەکەدا هاتوون ولە رووی زمان و مێژ ووەوە پێوەندی‌یان بە مێژ ووی کوردەوە هەیە لە سەردەمانی نێوەراست دا هەتا ئێستا روون نەکراونەتەوەو لێیان نە کۆڵدراوەتەوە»، گرنگی‌یەکی تایبەتی خۆی هەیە، کە پروفیسور (ئەلیس مینس) لە کاتی خۆیدا تەنها بە دوا دێری ووتارەکەیەوە دەست نیشانی کردبۆوەوە بە بێ ئەوەی بە درێژی روونی بکاتەوە، چونکە ئەو هەر وەکو خۆی دەڵێت: لە زمانی یونانی کۆندا پسپورە وزمانی کوردی وچەند زمانی‌تر لە سنوری پسپۆریتی ئەو بەدەرن.

بە پێی ووتارەکەی پروفیسور ئەلیس مینس (کە دوکتوری وێژەو ئەندامی کارای ئاکادیمیای بەریتانی ومامۆستای ئەرکیولوژی کۆنە لە زانکۆی کێمبرج دا)، کە لە رۆژنامەی (لێکۆلینەوەی هیللینستی ژمارە 35، سالی 1915، لاپەرە 22 ـ 65 بروانە:

«Minns E., Parchments of the Parthian Period from Avroman in Kurdistan, Journ. Hell. Stud. 35 (1915), PP. 22 - 65.

چاومان تەنها بە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی دوو (دۆکومێنت) لەو دۆکومێنتانە، کە بەپیتی یونانی نوسراون دەکەوێت، چونکە ئەویتریان نێررا بوو بۆ مامۆستا کاولی کە لە زمان و نوسینی ئارامی‌کۆندا پسپورە، وئەویش لە ووتارەکەیدا سەبارەت بە دۆکومێنتی سیهەم لە گۆڤاری کۆمەلەی شایانەی ئاسایی سالی 1919 بە ووردی بیرورای خۆی دەربریبوو.[1]

برِوانە : Cowley A., The Pahlavi Document From Avroman
Journal of the Royal Asiatic Society, 1919. PP. 147 - 154.

(هەروەها بروانە وینەی ئەم دۆکومێنتە ژمارە 5، 6 لەم ووتارەدا).

بێجگە لەم دوو کەسە هیچ پسپۆریك، چ مێژووزان یان لە زمـــان زان، لە ناوەروك و پیـــت و پلەی مێـــژوویـــی ئەم دیکومێنتانەیان نەکۆلیوەتەوە، مەگەر تەنها ناو وشێوەی دۆزینەوەی نەبێ کەکـــردوێتی بە وێنـــەی کتێبی خۆی.[2] لە پال هەنـــدی تیوریەك سەبارەت مێژووی زمانی کوردی لە سەرەتای باسەکەدا تەنها لە سەر ئەو دوو دۆکومێنتە یونانیەی مینس دەدوێم، بەلاّم پاشـــان، لە سەر دەق و زمـــان ونـــاو ووشـــە وواتـــا مێـــژوییەکانی ووشەکان ـ لە هەر سێ دۆکومینتەکان دا ـ دەدوێم.

لە راستیدا دوو پارچە یونانیەکان شێوەیەکی لاکێشی نارێکیان هەیە، بەرزاییان پانترە لە پانایان، یەکەمیان نزیکەی 5 ,9 × 6 ,5 ئینجـــە (14 × 24سم)، وئـــەویتـــریـــان 8 × 5 ,10 أو 1/2 10 ئینجـە (21 × 27سم)، وهـەر یەکـە لەم دیکـومیتانە دوو دەقی (تێکست) تێـدایـە (أ، ب) وهـەردوو دەقـەکە زۆر لە یەکتـری دەچن. بە پیچـەوانـەی پارچـە ئارامیـەکە کە تەنها یەك دەقە 6 × 3,75 أو 3/4 3 ئینجە (15 × 5 ,9سم)ە.

لە پشت دۆکـومێنتی یەکـەمـەوە پینـج دێـر بە نوسینی هەمـان ئەلیفبـائی دۆکـومینتی سێهـەم نوسراوە وبە شێوەی سەرەوخوار بە لای پشتی بەشی سەرووی دەقی (أ) بوە. لە هەمان کاتدا ئەم نوســـراوە بەو دوو دێـــرە دەچـــێ کە لە پشـــتـــی دەقـــی (B) وە لە دۆکومێنتی یەکەم دا ریز کراوە نزیکەی 3 ئینج (5 ,7سم) لە خوارویەوە.

ئیمـزاو مۆر (تصـدیق) کردنی ئەم بروانـامـەیـە (سـەنەدە) بە 1/4 1 ئینج (3سم) لە سەرەوە بەلای چەپەوە ئەگەر لە پشتیەوە سەیـر بکـەین تۆمـار کراون. وئـەو ناوانـە کە ئیمـزایـان پێ کراوە تێکچوون وهەر هەمان ناوی یونانین کە لە زۆر وولاتاندا بلاو بوویـوەوە ولێـرەدا سودیـان بۆ ئیمـە نیـە (سەیرێکی وینە ژمارە 1 بکـە) کاتێـك کە ئەم دوکـومێنتـانـە گەیشتبوونە دەست پروفیسور




وێنە ژمارە (١)

شێوەی دۆکومێنتێك بە مۆرێکی قوراوی پێش کردنەوەی

مینس یەکەمیان هێشتا هەر بە لوولی مابووەوە وئەکرابوو.

دوهەمیان وەکو دەست نووس (مخطوطه) بوە نیوەی خوارەوەی نەپێچرابووەوو بەشی سەرەوەی لە چەپەوە دەستی لیّ نە درابووەوو زۆر بە باشی پێچرابۆوو وبەدەرزی لە لای راستیەوە دوورابووەوە بە مەرجێك تەنها دەبوایە ئەم دەزووە بە برین یان بە شکاندنی ئەو دوو تومارە قوراویە کە لە سەریەوە بوو بکرابایە. لە بەر ئەمە پروفیسور مینس پێش کردنەوەیان، هەر یەکە وێنەیەکی بۆ گرتون، پاشان ئەو دەزووەی بریوە.

ئەو شتەی کە ئەم (کرێنامە)یەیان لە سەر نوسیوە پێست بوە ورەنگێکی زەردی تاریك یاقاوەیی هەبوە بەلاّم هێشتا هەر مووی بە سەرەوە مابوە.

ئەم جورە پێستە لە زۆر شوین بۆ نوسین بە کار هاتوە بە تایبەتی لە ولاتی ئیونیا (یونان) وئێران تەنانەت لە میسریش،[3] بەلاّم بە شێوەیەکی کەمتر، هەر وەکو چۆن لە ولاتی مێزوپوتامیاش زۆر باو نەبوە. هیرودۆت لە کاتی خوێندا سەبارەت بەم شێوە نوسینە دەلێت کەوا «بەربەرەکان (میللەتانی غەیری یونانی) پێستیان وەکو ئامێرێك بۆ نوسین بە کار هیناوە».[4] وئەمە پێستی گاو مەر وبزن، بە تایبەتی جوانەگا وبەرخ هی گیان لەبەرتر بوە، وتەناتەت پێستی ئاسکیش بە کار هاتوە. پاش ئەوەی باش شوراوەو موەکانی لیّ کراوەتەوەو بە بەردێکی تایبەتی ئەم پێسانە کوتراوە، پاشان بە تەباشیر سواوە تا رەنگی سپی بوە، لە کۆتاییدا بەشی ناوەوەی بەلای گوشتی شیوەیەکی جوانی بوە بۆ نوسین. پلوتارخ پێمان رادەگەیەنێت، کەوا لە کتیبخانەی پێرگامون Pergamun 200,000 پارچە پێستی نوسراو هەبوەو لەوێدا ماوەتەوە تا مارکوس ئەنتۆنیوس بە کیلیوپاترەی پێشکەش کردوە،[5] وئەم نوسراوانەیی هەورامان دەگەرێنەوە هەمان ئەم سەردەمەی کتیبخانەی پێرگامون.

هەر وەکو پروفیسور مینس دەگێریتەوە، ژمارەی ئەم جورە نوسراوانە، کە لە هەورامانەدا دۆزراونەتەوە زۆر بوون، بەلاّم تەنها سیّ پارچەی، لە رێگای پرۆفیسور براونەوە کە هاوریّ دکتور سەعید خانی کردستانی بوە دەست کەوتوە، کە لە سەردانێکیا بۆ شاری لەندەن بۆ داو دەرمان کرین چووە پێشکەش بە براونی کردوە، پاشان لە موزەخانەی بەریتانیادا پارێزراون و د. سەعید خان مافی لێکۆلینەوەی بە پرۆفیسور مینس بەخشیوە.

بابەتی هەر سیّ پارچە نوسراوەکان (کرێنامەو کرین و فرۆشتنی) چەند رەزێکە لە ناوچەی هەوراماندا. وئەوەی شایەنی باسە لەم کیشەدا کە سرنجی مێژونوس و وزمانەوان رادەکێشێت، سیّ خالی تایبەتین کە بۆ لێکۆلینەوەی مێژووی زمانی کوردی زور گرنگن.

**یەکەمیان:** ئەو ناوانەی کە بە چەند شوین و لادیّ وکەسەوە پێوەستی هەیە بیّ گومان چەند ناوێکی ناوچەیی وولاتی کوردەوارین لە سەدەی یەکەمی پێش زایینەدا، واتە پێش بلاو بوونەوەی ئایین وکولتورو هەلسوکەوتی ژیانی (مەسیحی وئیسلام). ئەم ناوانە لە زمانێك هەلقولاّون کە لەو ناوچەدا بە کار هاتوەو هەر یەکە لەم ناوانە واتایەکی تایبەتی هەبوە وەکو وشەیەك یا چەند وشەیەك بە کار هاتوە لەو زمانە ناوچەیی‌یەدا کە شێوەیێك لە شیوەکانی زمانی کوردی سەدەی یەکی پێش زایین بوە، چونکە نوسراوەکان دەگەرێنەوە. بۆ سالانی 88، 22، 11 پیش زایین بە پیّ‌ی بەراوورد کردنیان بەو سالە یونانی‌یانە کە لە سەر دەست نوسەکان تومار کراون.

بێجگە لەم راستیە، راستیەکی گرنگترمان بۆ روون دەبێتەوە ئەویش ئەوەیە کە لە رێ‌ی ئەم ناوانەوە دەتوانین بگەینە واتا بنچینەکانیان، ویەیوەندیان بەو دین و ئاینزانانەی وولاتی کوردەواری پێش مەسیحیەت وئیسلامەوە روون بکەینەوە، وئایا چ پەیوەندیەکیان لەگەل کولتوری میللەتانی هاوسیّ‌ی خۆیان هەبوە وشارستانیەتی هیللینی (یونانی) چ رولێکی کاریگەری بە سەر ژیانی کومەلایەتی وئابوری وسیاسی دانشتوانی وولاتی کوردەواری‌یەوە هەبوە. بەم جورە دەتوانین لەگەل بناغەی هۆش وبیری کوردی پێش دوو هەزار سالدا ئاشنایەتی پەیدا بکەین کە ئەمە مەبەستی هەرە گرنگی زانستی مێژووە.

زمان، بە شێوەیەکی گشتی، ئاوێنەی بیر وهۆشێکی تاك و کۆمەلێکە لە پلەیەکی مێژووی تایبەتیدا، وئەم بیرو هۆشە بە چەند بناغەیەکی سەرەکی ژیانەوە پێوەستە وەکو دەستەلاتداریەتی ژیانی رامیاری، وئایین، پلەکانی هەمە جۆری بەرهەم هینان

وەرجی جوگرافی و ئاو وهەوا و . . . هتد .

بۆ نزیك كردنەوەی ئەم تیوریە لە بیری خوێنەر ولەبەر شەوقی ئەو راستیانەی سەرەوەدا؛ سەرەتای چەرخی ئیسلامی تاكو ئیستا دەكەم بە وێنە بۆ چەند پلەیەكی مێژووی زمانی كوردی نوێ.

لەم پلەیانەدا ئەم زمانە لەگەڵ سێ جیهانی زمانەوانیدا پەیوەندی پەیدا كردوە.

(أ) لە بناغەدا كوردی وەكو زمانێكی كونسەرڤەتیڤی (پارێزەری هەلسو كەوتی كۆن) سەر بە خێزانی هیندو ئاورووپی دارێژراوەو پەیوەندی بەوجیهانەوە نەپچراوە بە تایبەتی زمانی فارسی.

(ب) لە رێی ئاینەوە لە دوای سەدەی هەفتی زایین وشەی هەمــە جۆری عەرەبی (كــە زۆربــەی زۆری ناون) لە كوردیــدا پەیدا بوون وەكو عبدالله، محمد، سعید، تقی وخیرالدین . . هتد. لە كوردیدا ئەم ناوانە واتاكانیان: بەندەی خودا، ستایش كراو، بەختیــار، پارێــزكــار (نــویژكەر یان دووركەوتو لە خراپە)، باشتــردین دەگــەیینن. لە لایــەن ناوی جوگــرافیشەوە ناوچەكانی وولاتی كوردەواری وەكو سولەیمانی، دیاربەكر وطور عابدین . . هتــد كە لە راستیــدا بێجكــە لە عەرەبی ناوی عبــری كونێش دەگــرێتــەوە. ئەمــە بێجگــە لەوەی كە كومەلێ نێوی ئارامی وەكو. مەتتی، حەننــا وبێتــواتــە وبــاعەذرا یان نێوی یونانی وەكو پوترس ومــەرقــوس و هتــد لە كوردی ئیمــرۆدا پەیــدا بوە كە هەر یەكــە واتــایــەكی تایبــەتی لەو زمــانــانەدا هەیە. لە لایەكی ترەوە ئەگەر بگــەرێینــەوە سەر چەنــد هۆنــراوەیەكی مەلای جزیری، لە سەدەی چواردەی زایینیدا ئەو كاریگــەریــەی زمــانی عەرەبی مان (كــە بەرێگای ئاینی ئیسلامەوە هاتووە) بۆ روون دەبێتەوە وەكو دەلێت:

خانی خانان لامعێ نەجما تە هەر پر نور بی
كەشتی یا بەختێ تە ئەز بابێ مخالف دوور بی

یان كە دەلێت:

ما جزیرێ شبە داری تەختی هەفت اقلیم بت
هەم بـ حكم وسەلتەنەت ئەسكەندەرو فەغفور بی

[بروانە: لاپەرە 660 ـ 663 (ئەلعەقد الجەوهەری شەرحی دیــوانی جەزیــری) چاپی 1959 قامشلی وصــادق بهــاءالــدین ئامێدی، هوزانڤانێت كورد، بەغدا 198 لاپەرە 47، 49].

بەم جۆرە دەتــوانین بلێین كە ئەم زمــانــە بێجگــە لە ئارامی لەگــەڵ زمــانێكی تــری گروپی سامی پەیــوەنــدی پەیــدا كردوە بە درێژای پتر لە (14) سەدە (كە ئەویش عەرەبی یە).

(ج) دەستــەلاتــداریــەتی سەلجــوقی ومــەغــول وتــەتــەر ودوواره‌وەكــانیــان لەوعێــلاتــە توركــانەی پتر لە 800 سالە بەسەر وولاتی كوردەواریدا دەمیان روێیوە بێگومان گروپێك ناوی سەر بە خێزانی زمانە (فینتو ـ ئیگور)و (ئورال ـ ئەلتای) لەم هەرێمەدا پەیــدا بوە وەكــو قەرەداغ، ساوج بولاق (ســابــلاخ) ئاق چەلــەر (آغــجــلر)، كوی سنــجــەق، قامــشلی پاشــان الله ویــردی، قەرەسلیم، یەشار، ئولو بەگ (وولی بەك)، . . هتد وئەمرۆ زۆر لەم ناوانــە قالبی كوردییــان وەرگــرتــوە وزمــانی كوردی پێــان دەولەمەند بوە.

لێرەدا چۆن دەتوانین یەكە (یەكە) ئەم ناوانە جیا بكەینەوە كە لە 1400 سالدا لە زمانی كوردیدا پەیدا بوە، وهەر یەكێكیان واتــاكــەی لێ بــدەینــەوە وبــزانین دەگــەریتــەوە چ گروپــە زمانێك بەهەمان جۆر دەبێت ئەو ناوانە كە لە دەستنوسەكانی هەوراماندا تومار كراوْن شی بكرێنەوە وبە وشەیەكی كوردی بزانرێن بە بێ ئەوەی سەیری بنەرەتیان بكرێت وهەر یەكەیان دەورێكی تایبەتی دەگێرینەوە لە بینای بیری كۆمەلی ئەو سەردەمە.

لەبەر ئەمە نابێت پێمان سەیر بێت كەوا دەقێك دەستنوس لە هەوراماندا دۆزرا بێتەوە چەند وشەیەكی ئارامی یان بە خەتی ئارامی ویونانی نوسرابن، چونكە تا ئەو سەردەمە ئارامی وپیتی نوسینیان دیاردەیەكی جیهانی رۆژهەلات بوو، بێجگە لەوەی كە هێشتا دەستەلاتداریەتی كەلچەری یونانی هەر باو بوە هەر چەندە لە باری سیاسیەوە هیچ دەوریكیان نەماوە.

دوهەمیان: ئایا ئەو زمانە، كە ئەم نوسراوانەی پێ تومار كراوە، چ زمانێكە وەگەڵ كوردی ئەمرۆدا چ پەیوەندیەكی هەیە بەتــایبــەتی لەلایــەن رێــزمــانــەكــەیــەوە؟. سەبــارەت بەم

مەسەلەیە پروفیسور مینس خۆی زۆر بە ئاشکرا دەلێت کەوا:

«دەبێت غافل نەبین لەوەی کە ئەم زمانە، لەم پارچە نوسراوانەدا زمانی کوردی کۆنە، یا زمانیکە کە هێشتا روون نەبوەتەوە». [6]

سێهەمیان: پیتی ئارامی ویونانی کە بۆ ئەم دۆکومێنتانە بەکارهاتوە، بە تایبەتی ئەو نیشانە تایبەتیانە کە لەگەڵ ئەم پیتانە بۆ مەبەستێکی تایبەتی تومار کراون، بێ گومان، لە بەر نزیك کردنەوەی ئەو جۆرە نووسینە بوە لە زمانی ئەو ناوچەیە، چونکە ئەم نیشانانە لە نوسراویکی تردا نابینرێت[7] ئەم جورە نیشانانە دەبێت لێیان بکولرێتەوە دەبێت بزانرێت چ دەورێکیان هەبوە لە نوسینی زمانێك لە ولاتی کوردەواریدا پاش پەیدا بوونی مەرجی ژیانیکی نوی کە بە هیللینی ناسرابوو، لە کاتێکدا کە لە رێی (بەهۆی) بازرگانیەتی‌یەوە نوسینی ئارامی وبەرێگای ئەم نوسینەشەوە هەمەجور ووشەی ئارامی لە زۆر ولاتانی رۆژهەلاتدا بلاو بووبوەوە، یەکێك لەو ولاتانە کوردستانی ئەمرو بوە. [8]

سەبارەت بەم دەست نوسانە سەرەتای کتێبی (نزانی و مزگانی)، کە سالی 1935 زایینی بە دەستخەت لەچاپ دراوە، بە نامەیەك دەس پێ ئەکات کە لە لایەن (حسن تقی زادە)وە لە ـ طهران 12 بهمن ماه 1309 ـ نوسراوە بۆ دوکتور سعید خان پێشکەش کراوە لەبەر ئەو کارە نایابەی کە نوسراوەکانی هەورامانی بۆ ولاتی بەریتانیا بردوە. وئەم کتێبی (نزانی) یەش بە (حسن تقی زادە) پێشکەش کراوە.

هەروەها (حیدر علی کمالی) لەم کتێبی ناوبراوەدا چەند سرنجێکی خۆی نوسیوە ودوکتور سعید خانی بە چەند ووشەیەکی ناسك هەلناوە وەکو (حضرت طبیب، دانشمند وفیلسوف روحانی معظم.. هتد) چونکە ئەم کتێبی (نزانی)یەی رازاندوتەوە.

پاشان دوکتور سعید پێشەکیەکی مێژوویی درێژی زمانی کوردی (هەندی جاریش بە مادی نێو بردوە) بۆ ئەم کتێبە نوسیوە وتێدا باسی ئەو دەستنوسانەی هەورامان دەکات ودەلێت:

«نوسراوێك لەسەر پێستێك بەخەتی پەهلەوی چەند هونراوەیەکە بە کوردی تومار کراوە کە لە ناوچەی سولەیمانیدا دۆزراوەتەوە، وئەم زمانە هەمان زمانە کە بابا تاهیر وسولتان سەهاك بە کاریان هێناوە». [9] پاشان دەلێت کە:

«شیخ أبوبکر أحمد بن وحشیە النبطی باسێکی خەتی نوسینی کوردانی کردوە کەوا دوو کەس بە نێوی (بینو شاد وماسی السوراتی) هەمەو زانیاریی وفەن وهونەر وکتیبی کوردیان کۆ کردۆتەوە وئەلف وبێیکی تایبەتیان بۆ کورد داناوە. [10] ودەگوترێت کەوا (مسروب)ی زانای ئەرمەنی (439م - ؟) ئەلف وبێیەکی دروست کردوە، بێجگە لە ئارامی وپەهلەوی هەندێ پیتی کوردیی خستوتە سەر». [11]

لەگەڵ ئەوەی دکتور سەعید خان پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ زۆر لە پسپورانی بەناو بانگ دا هەبووو ئاشنایەتی لەگەلیان پەیدا کردوە گۆرینەوە یان لە نێواندا هەبوە، بە تایبەتی رۆژهەلاتناسی بە ناوبانگی ئەلمانی ثیودور نولدکە، کە زۆر بە پەروشەوە ویستویەتی چاوی بە د. سعید بکەوێت وهەندێ لە زمانی کوردیدا ئاشنایەتی پەیدا بکات، وبەهەمانجور ئەدوارد براون وکەسانی‌تر، بەلام بەداخەوە سەرچاوەی ئەو تیوریانەی د. سعید خان کە لەمەو بەر باس کران هیچ دەست نیشان نەکراون.

لەگەڵ ئەمەشدا دوکتور زۆر بە روونی باسی چۆن دەست کەوتنی ئەو دەستنوسانەی هەورامانمان بۆ دەگێرێتەوەو دەلێت:

«پێش چەند سالێك گویم لە دۆزرانەوەی ئەم پێستە نوسراوانەی هەورامان بوو کە تا ئەو کاتە هەر بەبێ شی‌کردنەوەو خوێندنەوە مابوون. چەند جارێك بە نامە نوسین پەیوەندیم بەچەند ناسیارێکەوە کرد بۆ ئەو مەبەستە بەلام هیچ ئەنجامی نەبوو. لە بەر ئەوە لە کاتێکدا کە چووم بۆ دەرمان کردنی (عباس قلی‌خان) لە هەورامانیدا، دوای بێ ئومێدی تاریکیم روناکی رووی تێ‌کردم کاتێك کە ئەو دەستنوسانەم دەست کەوت.

ویـاشـان بردمن بۆ ئاوروپـا کە هەوالی لە دانشگـاکـانی بەرلین و مانچستـەر وکـەمبـرج و ئۆکسـفورد بلاو بووەوە. [12] لێرەدا دوکتور سەعید خانی کردستانی رامان ئاگەیەنێت کە ئەم پێستانەی لەکێ وەرگرتوە. وناوی شیخ علاء الدینی نەقشبەندی بە هیچ جۆرێك نابـات هەروەکـو لەپێشـەکی ئەو باسـەمـدا هاتـوە، کەدیسـانەوە سەبارەت بە دۆکومێنتانەی هەورامانەو لە ژمارە 103 ـ 104ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێدا بلاو کراوەتەوە.

بەلاّم ئەو کارە بە سودەی ئەو پاش نزیکەی هەشتا سال لە گۆڤاریکی کوردیدا وەکو (روشنبیری نوی)شی دەکرێتەوە لە ژێر تیشکی لێکۆلینەوەیەکی زمانەوانی ومێژوویی کوردیدا.

ئەمـانـەی خوارەوەش وەرگێـراوی کوردی دەقـە یونانیەکانن بە بەراورد کردنیـان لەگـەڵ دۆکـومێنتـە ئەصلیـەکـانـداو وەرگێـراوە ئینگلیزیەکانیان وژمارەی دێری هەر چوار دەقەکە بەرانبەر ژمارەی دێری دەقی یونانین.

## وەرگێرانی دەقی دۆکومێنتەکان بۆ کوردی بە پێ دەستکاری

دۆکومێنتی یەکەم

دەقی یەکەم A)

## دێرەکان:

1 ـ کاتی فەرمانرەوایی پادشای پادشایان ئەرساکیسی خیردار ودادپەروەر

2 ـ پرشنگدار ودۆست هیللین، وشاهبانوان سیاکیـبی خوشکی

3 ـ باوکی‌ی وژنی، وئاریازاتیس کە نازناوی

4 ـ ئەوتومایە کچی وژنی پادشای مەزن تیگرانیـس

5 ـ وئازاتیس خوشکی باوکی‌ی وژنی، لە سالی

6 ـ 225، مانگی ئەپیلایوس، لە هیپارخی بەیسێرە نزیك وێستگەی

7 ـ بەیئەبەرتا لە کوندی کوپانیس، بەرامبەر شاهێدان ئەمەی خوارەوە نوسرا لە

8 ـ دان پیانان وریکەوتن لە لایەن بەرەکیس

9 ـ وسوبێنیس کورانی مەیفۆریس، ئەمانە وەریان گرتوە لە گاتاکیس

10 ـ کوری ئۆپیاتیس بە پارەیەکی دراو سی دراخما نرخی.

11 ـ ئەو رەزەی کە لە دێی کوپانیسەو ناسراوە بە (دادباگانراس)

12 ـ بەشی مافی تێدایە..

13 ـ . . . لە هاوخاوەن لەگەڵ ئاو ودارایی رەزەکە

14 ـ لەجێی هاتـوچـونـەوەی ژووروەدەر وهـەرشتیك بەندیواری پێوە هەیە، پارچەیەکی دەگەرێتەوە بۆ بەرەکیس و

15 ـ پارچەیەکیش بۆ گاتاکیس بە مەرجێك کاتێك بە خاوەن بوونی رابوردوان

16 ـ گاتـاکـیس دەبێتـە خاوەنی ئەو رەزەی کە بە پارە کریـویـەتی هەتا هەتایە ئەو و

17 ـ نەوەی‌و ئەو کەرەستانەی تومار کراون بە شیوەیەکی گشتی لە رێکەوتنی

18 ـ کۆندا سالانە بە تەواوی هەموویان جێبەجێ دەکەن

19 ـ . . . ودەبێتە یاسا بە دەر بۆ بەرەکیس وبرای یا نەوەکانی یا هەر کەسێکی‌تر کە کاریان دەباتە سەر

20 ـ لە جیاتی ئەوان لە دەرکردنی گاتاکیس لەو رەزەی کە کریویەتی بە پارە، نە خۆی

21 ـ ونـە نەوەی وهـەر کەسێـك ویستی دەری‌بکـات یا لە کاتێکـدا هەرکەسێکی‌تر هەولی دەرکردنی بکات پێویستە هەلبوەشێنرێت.

22 ـ لە کۆتاییدا دەست درێژ (معتدی) بوەستێنریت وئەو وهەموو مافی بگەرێنیتەوە وئەمیش هەموو مافی دەکەوێت.

23 ـ ودوو ئەوەندەی نرخەکە کە وەری گرتوە دەیبژێرێت لەگەڵ غەرامەیێکی

24 ـ سەربار (اضافی)ی 200 دراخماو بۆ پادشاهیش هەمان دراو: بەلاّم

25 ـ هەروەها ئەگەر گاتاکیس بایەخی بە رەزەکە نەدا

26 ـ بە چاکی رابنەگرت ئەوا هەمان سەربار (إضافة) دەبێ بدا هەروەها

27 ـ ئاوەکە بۆ رۆژێك لە هەشت؟ روژان نیوەی وهەر چی رێ بدات

28 ـ وشەوان نیوەی. شاهێدان

# دەقی یەکەمی دۆکومێنتی یەکەم بە دەستوسی یونانی

## I.

A. βασιλεύοντος βασιλέων 'Αρσάκου εὐεργέτου δικαίου ἐπιφανοῦς καὶ φιλέλληνος, καὶ βασιλισσῶν Σιάκη; τε τῆς ὁμοπατρίας αὐτοῦ ἀδελφῆς καὶ γυναικὸς καὶ 'Αρυαζάτης τῆς ἐπικαλουμένη[ς] Αὐτομὰ τῆς ἐγ βασιλέως μεγάλου Τιγράνου καὶ γυναικὸς αὐτ[οῦ] καὶ 'Αζάτης τῆς ὁμοπατρίας αὐτοῦ ἀδελφῆς καὶ γυναικός, ἔτους εκ[ ́ μηνὸς 'Απελλαίου, ἐν ὑπαρχείᾳ Βαισείροις πρὸς σταθμῷ Βαιθαβάρτοις ἐν κώμῃ Κωπάνει, ἐπὶ τῶν ὑπογεγραμμένων μαρτύρων, ἐξωμολογήσατο καὶ συνεγράψατο Βαράκης καὶ Σωβήνης οἱ τοῦ Μαιφόρρου υἱοί, εἰληφέναι παρὰ Γαθάκου τοῦ Οἰπάτου ἀργυρίου ἐπισήμου δραχμὰς τριάκοντα, τειμὴν ἀμπέλου τῆς οὔσης ἐν κώμῃ Κωπάνει τὴν ἐπονομαζομένην Δαδβακανράς, τὸ ἴδιον μέρος, το ἐπιβάλλον αὐτῷ μέρος παρὰ τῶν συνκλήρων μετὰ ὕδατος καὶ ἀκροδρύοις καρποφόροις τε καὶ ἀκάρποις καὶ εἰσόδῳ καὶ ἐξόδῳ καὶ τοῖς συνκύρουσιν εἰς αὐτὴν πᾶσιν· ἔστω τὸ ἓν μέρος Βαράκει κ[αὶ] τὸ ἓν μέρος Γαθάκει, ἐφ' ᾧ παραλαβὼν ὁ δηλούμενος Γαθάκης ἕξει τὴν ἀργυρώνητον ἄμπελον εἰς τὸν ἅπαντα χρόνον, αὐτός τε καὶ τα ἔγγονα αὐτοῦ, τελῶντες κατ' ἐνιαυτὸν κοινῇ τὰ γεγραμμένα ἐν τῇ παλαιᾷ συνγραφῇ πάντα ἀπὸ πλήρους, καὶ μὴ ἐξέστω τῷ Βαράκει, μηδὲ τῷ ἀδελφῷ αὐτοῦ, μηδὲ τοῖς ἐγγόνοις αὐτῶν, μηδὲ ἄλλῳ μηθενὶ ὑπὲρ αὐτῶν, ἐγβαλεῖν τὸν Γαθάκην ἐκ τῆς ἀργυρωνήτου ἀμπέλου, μήτε αὐτόν, μηδὲ τὰ [ἔγ]γο[ν]α α[ὐτοῦ]· ὃς ἂν δὲ ἐγβάλῃ, ἢ ἄλλου ἐγβαλλομένου μὴ καταστὰς διεξά[ξ]ῃ, καὶ μὴ καθαρὰ ποιήσῃ, [ἔ]σται ἄκυρος καὶ προσαποτεισ[ει ἣ]ν ἔλαβεν τειμὴν διπλ[ῆν] καὶ ἄλλας ἐπιτείμου δραχμὰς [σ ́ κα]ὶ τῷ βασιλεῖ τὰς ἴσας· ἐὰν [δὲ κ]αὶ ὁ Γαθάκης ὀλιγωρήσῃ τὴν [ἄμπε]λον καὶ μὴ ποιήσῃ αὐτὴ[ν] ἔπαφον, ἀποτεινυέτω τὸ α[ὐτὸ ἐπί]τειμον· κα[ὶ] το ὕδωρ παρὰ ὀγδόην ἡμέρας τὸ ἥμισυ καὶ [τῆς ἐ]παγωγῆς ἐκτὸς το ἥμισυ· μάρτυρες, Χοσστρόης 'Ορκαδάτου, ['Α]πακης 'Υστοβώγου, Μει[ριδ]άτης 'Οχοβάγου. (*change of writing*) καὶ κρεῶν λε ́, ελος α ... ἄρτων κ ... βοῦς η ́, οἴνου κο. [β ́ καὶ] ἐνβάθρου δρ. α ́.

وێنە ژمارە (٤)

خوسترویس کوری ئورکەداتیس و ئەپاکیس

29 ـ کوری هیستۆبۆگیس، مەیریداتیس کوری ئوخوباگیس

. . . . . . . . . . . و 35؟ گوشت 1 ئیلوس؟

30 ـ 50 سەبەتە؟ نان، 8 گا، 2 کوپەمەی و1 دراخما بۆ کردنەخاوەن (تملیك).

## دۆکومێنتی یەکەم

### دەقی دوهەم B

1 ـ کاتی فەرمان ڕەوایی پادشای پادشایان ئەرساکیسی خێردار ودادپەروەر.

2 ـ پرشنگدارو دۆست هیللین، وشاباناون سیاکیسی خوشکی

3 ـ باوکی‌ی وژنی، وئاریازاتیس کە نازناوی

4 ـ ئەوتومایە کچ وژنی پادشای مەزن تیگرانیس

5 ـ وئازاتیس خوشکی باوکی‌ی وژنی، لە سالی

6 ـ 225، مانگی ئەپیلایوس، لە هیپارخی بەیسێرە نزیك وێستگەی

7 ـ بەیەبەرتا لە گوندی کوپانیس، بەرامبەر شاهێدان ئەمەی خوارەوە نوسرا لە

8 ـ دان پیانان وڕێکەوتن لە لایەن بەرەکیس

9 ـ وسوبێنیس کورانی مەیفوریس، ئەمانە وەریان گرتوە لە گاتاکیس

10 ـ کوری ئوپیاتیس بە پارەیەکی دراو سی دراخما نرخی

11 ـ ئەو ڕەزەی کەلەدێی کوپانیسە وناسراوە

12 ـ بە (گانزاك) و بەشی مافی تیدایە

13 ـ لەوە خویەتی لەگەڵ دارایی ڕەزەکە هەردو ئەوانەی بەبەرن یا بێ‌بەر

14 ـ لە جێ‌هات وچوونی ژوورو دەر، نیوەی

15 ـ بۆ بەرەکیس و نیوەیتری بۆ گاتاکیس بە مەرجێك لە کاتی خاوەن بوونی ئەوەی پێشو

16 ـ گاتاکیس دەبێتە خاوەنی هەتا هەتایە، خۆی و

17 ـ ئەوەی بۆ هەمووکاتێ هەر سالی بهێننە بەرهەم

18 ـ ئەو هەموو کەرەستانەی لە نێو ڕێکەوتنەکەدا هەیە

19 ـ بەشیوەیەکی گشتی؟ بە نە یاسایی بکرێت بۆ بەرەکیس یا

20 ـ بۆ کورانی یا برای یا هەر کەسێك لێ‌پرسراوی ڕەزەکە بێت

21 ـ لەوانەی دەست بۆ گاتاکیس درێژ دەکات یا

22 ـ ئەوەی وهەر کەسێك دەستی بۆ درێژ دەکات یا هەول دەدات کەسێك دەستی بۆ درێژ بکات دەبێت

23 ـ ئەم هەولدانانە هەلبوەشێنرێت لە کۆتاییدا دەست درێژ بوەستێنرێت ئەو هەموو مافی بگەرێنێتەوە، ئەمیش هەموو مافی دەکەوێت

24 ـ ودوو ئەوەندەی نرخەکە کە وەریگرتوە دەبیژێرێت لەگەل غەرامەیەکی

25 ـ سەربار (إضافی) 200 دراخما وبۆ پادشاهیش هەمان دراو بەلام هەروەهاش

26 ـ ئەگەر گاتاکیس بایەخی بە ڕەزەکە نەدا ونەیتوانی بیپارێزێت بە

27 ـ شیوەیەکی باش دەبێت هەمان غەرامە بدات،

28 ـ دەبێت ئاوەکەش هی ئەو بێت، ئەو بەشەی خۆی کە پیویستە بدرێت پێ

29 ـ لەگەڵ هاو بەشی‌ی خاوەنیەتی وەکو گەرەنتیەك یان لێ‌پرسراویکی هاوبەش. موریان کرد بەرەکیس و سۆبێنیس

30 ـ خۆسترویس و ئەپاکیس. . شاهێدان: دینوبازوس ئوروۆ. .

31 ـ مەیریداتیس کوری ئوخوباگیس، فرأهاتیس کوری سیکینیما، مەرزی. .

32 ـ دەبێت گاتاکیس بە بەرەکیس هەروەها یەك دراخما بۆ خاوەنیەتی بدات. . . . . 35 (؟) گوشت 25. . .

33 ـ 50 سەبەتە (؟) نان، 2 کوپە مەی

34 ـ . . . . . 25. . .، 8گا (؟) دەبێت بەرەکیس هەروەها لە ترێی گوشراو بدات بەگاتاکیس و مەیی نەگەیو (خمر غیر مختمرة)و جۆگەی ئاوو. . . و ترێی گوشراو

## دۆکومێنتی دوهەم

### دەقی یەکەم (A)

دیرەکان:

---

1 ـ کاتی فەرمان ڕەوایی پادشای پادشایان ئەرساکیسی خێردارو دادپەروەر وپرشنگدار ودوست هیللین

2 ـ وشاباناون ئولینیر، کیلیوپاترا، باسیرتا، بیئیباناپس

3 ـ لە سالی دو صەد ونەوەت و یەك لە هیپارخی باسیرائۆرا نزیك ویستگەی ئیسدیس

4 ـ لە دێی کوفانیس بەرامبەر شاهێدان ئەم دان پیانانە نوسرا

5 ـ ورێ‌کەوتنێك نێوان ئەسپوماکیس کوری گاکیس کرا کە لە دینیس کوری گاتاکیس

6 ـ پەنجاو پێنج دراخما بە پارەیەکی دراو سەند وەکو نرخ وئەو رەزەی دا کە کەوتۆتە لەو دێی دەشتەی کە

7 ـ بە دادباکا باگە ناسراوە لەگەڵ جێی هاتوچونەوەی دەرەوەو ناوەوە بە ئاویەوە بەگشتی لەگەڵ هاوبەشی خاوەنەکانی

8 ـ سنوری‌و ئەم دیو ئەو دیوی جوگـاکـان لە روژهـەلاتیـەوە لەگەڵ خاوەنەکانی بەپێی ئەم رێکەوتنە بێت

9 ـ سالانە هەمیشە دەبێت بدەن (وەکو سکیلوس)

10 ـ یەك دراخما دو کوپە مەی، 21 سەبەتە نان و پێنج گا ودو جو...

11 ـ وئەو بەلێن دەدات کە ئەم پەیمانەی ناوچانە هەلناوەشێنێت خۆی یا هەر کەسێك

12 ـ دوای خۆی دێت...

13 ـ بە هەر جۆرێك وهەر چونێك بێت

ئارامـاسـدیس کوری ئیـودابـوخیس، مێـراداتیس کوری میراباناداکیس گیریکیس کوری ئەردینیس. ئەم مۆری کرد

(کفیل) ئەرفاسـتاتیس کوری دەرگینیس.

## دۆکومێنتی دوهەم

### دەقی دوهەم (B)

دێرەکان:

1 ـ کاتی فەرمـان رەوایی پادشـای پادشـایـان ئەرسـاکیسی خێـردارو دادپەروەر وپرشنگدار ودوست هیللین

2 ـ وشاباناوان ئولینیر، کیلیوپاترا، باسییرتا، بیـشیباناپس

3 ـ لە سالی دو صەد ونەوەت ویەك لە دێی کوفانیس ولە هیپارخی باسیرائورا

4 ـ نزیك ویـستگەی دیـساکیدیدا وبەرامبەر شاهێدان ئەم دان پیانانەی خوارەوە

5 ـ نوسرا وپەیمان بەسترا لە لایەن ئەسپوماکیس کوری گاکیس کە لە دینیس

6 ـ کوری کاتاکیس پەـ[illegible] بە پارەیەکی دراو سەند وئەو

7 ـ رەزەی کە کەوتـوەتـە ئەو دێی دەشتـەی بە دادبـاکـابـاگە ناسـراوە لەگەڵ شوین هات

8 ـ وچـروی ژ وورەوە ودەرەوە وئـاو دەگـەرێنـەوە بە شێـوەیەکی گشتی لەگەڵ هاوبەشی خاوەنەکان: سنوورو لاکانی جوگاکان

9 ـ وەکـو پەیمـانـە کۆنـەکـە دەمێنـەوە هەمـوو سالێکیش دەبێت بۆ خاوەنیەتی (مولکایەتی)

10 ـ یەك دراخما، دوو کوپە مەی، 21 سەبەتە نان و پێنج گا وەکو سکیلوس ویەك دراخما وەکو سکیلوس بۆ کەفیل

11 ـ مۆرکەرەکان ئەسـتاتیس کوری دەرگینیس کە ئامادە بوو دانی بە کەفالەتی خۆی نا

12 ـ .... رابووردوو کوتیلا (کوپە) دوان

13 ـ ولـە فرۆشیـار وکـەفیـل سەرێـژ (فـائض)ێك وەردەگیرێت ئەگەر هات و هەر کەسێك داخوازیەکی (دعوی) پیشکەش کرد بۆ ئەو رەزەی کە ئیستا

14 ـ فرۆشـــرا بە هەرچی جۆرێـــك بێت ئەو داخـوازیـە وئـەگـەر هەولدانێك (نەپارێزرا) بۆ لابردنی دەخرێتە پشت گوی

15 ـ ئەو کۆمـەلـەی کە کار دەکـەن بەبێ سەرێـژ (فـائض) دەدەن وبریاری یاسا

16 ـ دوصەد دراخمایەو هەمان دراو بۆ خەزێنەی پادشا شاهێدان ئەراماسدیس

17 ـ کوری ئێودا بوخیس، گیریکیس کوری ئەردینیس، میراداتیس کوری میراباناداکیس.

## شی کردنەوەی

**ئەو ناوانـە کە لەم دوو دۆکـومێنتـەدا تومـار کراون و لە سەدەی یەکی پێش زاینـدا لە زمـانی دانشتـووی کوردی ناوچەی هەوراماندا باو بووە (بەبێ پاشگری یونانی).**

### ناوی جوکرافی‌و توپونومیك:

(1) بەیثە بەرتا: بەشی یەکەمی ئەم ناوە (بیث) ئارامی‌یە بە واتای (ئاوایی) وبەشی دوهەمی ناوێکی کوردی ناوچەیی‌یە بەواتای (بەرز؟) وبە کوردی ئەمرۆ واتای بەرزاوە؟ (بەرتاوا) دەگەیەنێت.

تا ئیستـا لەم جۆرە ناوە لەکـوردوستـاند بەرچو دەکەوێت وەکو

## دەقی درهەمی دۆکومێنتی یەکەم بە دەستنوسی یونانی

B βασιλεύοντος βα[σι]λ[έων Ἀρσ]ά[κ]ο[υ εὐεργ]έτου δικαίο[υ]
ἐ]πιφανοῦς καὶ φιλέλλη[νος, καὶ β]ασιλισσῶν Σιάκης τε τῆς ὁμ[οπα]-
τρίας αὐτοῦ ἀδελφῆς καὶ γυναικὸς κα[ὶ] Ἀ[ρυα]ζάτης τῆς ἐπικαλ[ου]-
μένης Αὐτομὰ τῆς ἐγ βασιλέως μεγάλου Τ[ιγρά]νου καὶ γυναικὸς
καὶ Ἀζάτης τῆς ὁμοπατρίας αὐτοῦ ἀδελφ[ῆς κα]ὶ γυναικός, ἔτους
εκ΄ μηνὸς Ἀπελλαίου, ἐν ὑπαρχείᾳ Βαισείροι[ς] πρὸς σταθμῷ Ἐαι-
θαββάρτοις ἐν κώμῃ Κωπάνει, ἐπὶ τῶν ὑπογεγραμμένων
μαρτύρων, ἐξωμολογήσατο καὶ συνεγράψατο Βαράκης
καὶ Σωβήνης οἱ τοῦ Μαιφόρρου υἱοί, εἰληφέναι παρὰ Γαθάκου
τ[οῦ] Οἰπάτου υἱοῦ ἀργυρίου ἐπισήμου δραχμὰς τριά-(*altered to* τεσσαρ[a])κοντα, τει-
μὴν ἀμπέλου τῆς οὔσης ἐν κ[ώμ]ῃ Κωπάνει τὴν ἐπονομαζο-
μένην Γανζακήν, τὸ ἴδιον μέρος τὸ ἐπιβάλλον αὐτῷ τὸ
ἥμισυ μετὰ ἀκροδρύοις καρποφόροις τε καὶ ἀκάρποις καὶ εἰσό-
δῳ καὶ ἐξόδῳ καὶ τοῖς συνκύρουσιν εἰς αὐτὸν πᾶσιν, τὸ ἥμι-
συ Βαράκει καὶ τὸ ἥμισυ Γαθάκει, ἐφ᾽ ᾧ παραλαβὼν ὁ δηλού-
μενος Γαθάκης ἕξει εἰς τὸν ἅπαντα χρόνον, αὐτός τε καὶ τὰ
ἔγγονα αὐτοῦ εἰς τὸν ἅπαντα χρόνον, τελῶντες κατ᾽ ἐνιαυ-
[τὸν] τῶν γινομένων ἐν τῇ συγγραφῇ πάντα ἀπὸ πλήρους
[τουτῇ ?], καὶ μ[ὴ ἐ]ξέστω [τῷ Β]αράκει μηδὲ τοῖς ἐγγόνοις αὐ-
[τοῦ, μηδὲ τῷ ἀδελ]φῷ, [μηδὲ] τῷ μεταλαμβάνοντι τὴν ἄ[μ]-
[πελον] π[αρ᾽ αὐτῶν, ἐγβ]αλε[ῖν μηδὲ] τὸν Γαθάκη[ν, μηδὲ τὰ]
[ἔγγο]να αὐτοῦ· ὃς ἂν δὲ ἐγβά[λ]ῃ, ἢ ἄλλου ἐγβαλλ[ομένου μὴ]
[κ]αταστὰς διεξάξῃ, καὶ μὴ καθαρὰ ποιήσῃ, ἔ[σ]τα[ι ἄκυρος]
[καὶ] προσαποτεισάτω ἣν ἔλαβεν τειμὴν διπλῆν κ[α]ὶ ἄλλα[ς ἐ]-
πιτείμου δραχμὰς σ΄ καὶ τῷ βασιλεῖ τὰς ἴσας· ὁμοίως δὲ
καὶ ἐὰν ὁ Γαθάκης ὀλιγωρήσῃ τὴν ἄμπελον καὶ μὴ ποιή-
σῃ αὐτὴν ἔπαφον, ἀποτεισει τὸ αὐτὸ ἐπίτειμον· ἕξει δὲ καὶ
τὸ ὕδωρ τὸ ἐπιβάλλον αὐτῷ μέρος μ[ετὰ τῶ]ν συν[κλ]ήρω[ν].
ἔγγυον δὲ καὶ συνέγδοτον κατέστησεν [Βαράκης καὶ Σωβήνης]
Νοσατρόην καὶ Ἀπάκην· μάρτυρες, Δηνόβαζος Ορο[. . . . .],
Μειράδατης Ὀχοβάζου, Φραάτης Σεκυνήματος, Μαρζυ[. . .]
ρης. δώσει δὲ καὶ ὁ Γαθάκης τῷ Βαράκει ἐνβάθρου δρ. α΄, κρεῶν εκ (?) [. . .]
(*inter lineas*) κ[. .]κε, [β]ους ή (?)
ἄρτων κ[a] γ΄, οἴνου κ[o] β΄· δώσει δὲ καὶ Βαράκης Γαθάκει ἀπὸ ληνοῦ τὸ]
(*inter lineas*) κα
ρημα καὶ ἀπόρρυμα καὶ ασι κ[. .]εζην καὶ στέμφ[υ]λα ἀγέμιστ[α].

وێنە ژمارە (٣)

بێواته (بێتواته) هەروەها بێوین (بتوێن)... هتد دوور نیە ئەم ناوە هەر (بیت بەروا)ی ئاشوری بێت، کە لەلای ئۆارتوەکان بە (بەرواتا) تومار کراوە.

(٤) بەیسێرە: ناوێکی کۆنی کوردیە بە واتای (بێ‌سەرە؟) و ئیستاش لە چەند شوێنی تری کوردستان دا باوە وەکو ئەو ناوچەیەی کەبە ئاوی باسەرا لە سەنگاودا (چمچمال) بەناو بانگە.

(3) گانزاکی (گەنزەکی): بەشی یەکەم واتای (کنز؟) دەگرێتەوە، (ەك) پاشگرێکی ناوچەی کوردستانی کۆنە پێش چەرخی پورت. دیسان ئەمە ناوی شارێك بووە لە ئاتروپاتین خوار گۆمی وورمێ نزیك سابلاخی ئەمرۆ لەکۆندا (گەنزاکا) ووتراوە پاشان بوە بە (گەنجەك).

(4) داد باکا باگ، داد باکانراس: بە هەردوکیان واتای (خودادات)ی ئەمرۆیان هەیەو بەڵام ئەو خودایە بە (باگ) ناسرابوو کە ئیستا شێوەی (بوگ)ی وەرگرتوە لە زمانانی سلاڤیدا. ئەم ناوە بە شێوەی (باگا) بوو لە نێو میدیەکاندا ولەم جورە ناوانە (باگداتی، باگاتونا، باگ پارنا باگ ماشتو، باگ بارتو) وەروەها لەگەڵ ناوی خوری (پاگ پاك هوتیشوپ، باگ - تیشوپ) لە هەزارەی یەك پێش زایین لە کوردستاندا زۆر باو بوە.

(5) دیساکدی: ناوێکی توپونومیکی ناوچەیی‌یە

(6) کوپان، کوفان: هەردوو شێوە ناوی‌هەمان دی‌یە ئەگەر (کوپ)ی کوردی نەبێت واتاکەی(کانی) ئەکەدیە ئەو جۆرە ناوانە لە ناوچەکانی وولاتی کوردەواری زۆر باوە وەکو بوبان، لەیلان. لەکاتێکدا بکرێت بە دوو برگە (کو - پان) ئەوا برگەی دوهەمی ئەم ناوە باوە لەکوردیدا. کوفان (کوپان) ئەمرو (کوفە)یە ناوی کەسیەتی

---

(1) ئازاتە: بە واتای (بەگزادە)ی ئەمرۆیە لە کوردیدا هەرچەندە وشەی (ئازات) ئەمرۆ دوو واتای پەیدا کردوە:

أ - ئازاد واتە سەربەخو.

2 - ئازا واتە گەرناس ومەرد بەڵام ئەم شێوەیە بەواتای (سەردار، سەرکردە) بوولەکۆندا لەو کاتەدا کە ئەم ووشەیە تۆمارکراوە ئەم چینە کۆمەلایەتی‌یە (سواران)یشی گرتوتەوە.

(2) أپاك

أپاکان: ئەم ناوە ناوێکی کەسیەتی باوبوە، سەرکردەی لەشکری شاپوری دوهەم ئەم ناوەی هەبووە.

(3) ئاراماسد: لە بنەرەتا (ئارامازد)ە بەواتای (لە ئارای حکمەتی راستدا) یان (لەگەڵ حکمەتدا) شێوەی کۆنی لە ئاشوریدا (ئاسارا مازاش)ە.

(4) ئەرتاس ئات: لە بنەرەتا (ئەرتا ئاستاتا)یە بە واتەی نەوەستاوی پاك (طاهر). ئەرتا (پاك)، ئەستاتا (نەوەستاوە)

(5) ئەردین: لە بنەرەتا لە ئەرتا (پاك)و داینا - دین (دیانە) پێك هاتوە واتە (طاهرالدین).

(6) ئەرساك (ئەرشاك): لە ووشەی ئەرشا (وورچ) هەڵقولاوە. و(ك) پاشگریکی ناوچەیی‌یە.

(7) ئەروازاتی: لە بنەرەتا ئەم ناوە بەشی یەکەمی ئەروا وەکو (ئەرڤا، ئەوروا) لە ئاڤیستادا دەبینرێت بەواتا (گورج) یان (بەهێز) لەگەڵ ئازاتە (بەگزادە، کور، نەوە). وەهەندێ ناو لەم شێوەیە لەو کاتەدا باوبوە وەکو (وەهەشت ئازاتە) واتە (بەگزادەی چاك - چاك لاو). هەروەها (چیهر ئازات) بەواتای (بەگزادەی بلند - بلند لاو)، وئە مرۆ ئەم ووشەیە بەشیوەی (زاد) واتە نەوە لەکوردیدا ماوە. بەڵام دوور نیە ووشەی (ئەوروا) هەر (ئاهورا)ی کۆنە واتە ناوەکە دەبێتە (ئاور زاد) ئەمرۆ.

(8) ئەسپوماك: لە ناوی (ئەسپ) لەگەڵ پاشگێکی کۆن پێك هاتوە. لەوانەیە لەووشەی (ئەماك)ی کۆن پەیدا بوویێ کەواتاکەی لە زمانی پورت و سەکەس وسەرمات (دروست کەر، بەنا) دەگرێتەوە. ئەم جۆرە ناوە لە هەموو زمانانی هیندو ئاورووپی باو بوە وەکو (ئەسپابار)ی ئالانی، (ئەسپەروخی) بولگاری (هست ئەسپای) هەخامەنشی، کونداسپا، کوشتاسپا.. هتد.

## دەقی یەکەم و دوەم لە دۆکومێنتی دوەم بە پیتوسی یونانی

A βασιλεύοντος βασιλέων Ἀρσάκου εὐεργέτου δικαίου ἐπιφανοῦς καὶ φιλέλληνος, καὶ βασιλισσῶν Ὀλεννειείρης, Κλ[εο]πάτρας, Βασείρτ[α]ς καὶ Βισθειβάναπος, ἔτους ἑνὸς ἐνενηκοστοῦ διακοσιοστοῦ, ἐν ὑπαρχείαι Βαιτιρ[αύροι]ς πρὸς σταθμῶι Δησακῖς ἐν κώμηι Κωφάνει, ἐπὶ τῶν ὑπογεγραμμένων μαρτύρ[ων], ἐξωμολογήσατο καὶ συνεγράψατο Ἀσπωμάκης Γαάκου ἔχειν παρὰ Δήνης Γαθάκου ἀργυρίου δραχμὰς πεντήκοντα πέντε τιμήν, καὶ δεδωκέναι ἐν ψ[ειλο]φύτωι ἄμπελον τὴν ἐπικαλουμένην Δαδβακαβὰγ σὺν εἰσόδωι καὶ ἐξόδωι καὶ ὕδασι τοῖς ὑπάρχουσι μετὰ τῶν συνκλήρων· ὅρια καὶ γειτνίαι ἀπὸ τῶν ἀνατολῶν μετὰ τῶν συνκλήρων καθὼς ἐν τ[ῆ]ι συγγραφῆι· τελέσουσι δὲ αἰεὶ κατ' ἐνιαυτ[ὸ]ν σκέλος δραχμὴν μίαν, οἴνου κοτύλας δύο, ἄρτ[ω]ν κα', βοῦς πέντε, κριθῶν δύο· ἐπ[εσχέ]το δὲ μηδενὶ τῶν προγεγραμμένων ἀθετήσειν, μήτε αὐτὸν μηδὲ τοὺς μεταλα[μβάνοντ]ας παρ' αὐτοῦ τρόπωι μηδενί. Ἀραμάσδης Ἰωδαβόχθ<ο>υ, Μιραδάτης Μιραβανδάκου, Γερ[ίκ]ης Ἀρδήνου· κατέστησεν Ἀρθαυθάτης Δαργήνου.

o o o o o o o o o o o

B βασιλεύοντος βασιλέων Ἀρσάκου εὐεργέτ[ο]υ δικαίου ἐπιφανοῦς καὶ φιλέλληνος καὶ βασιλισσῶν Ὀλεννιείρης, Κ[λ]εοπάτρας, Βασείρτας, Βισθειβάναπος, [ἔτο]υς ἑνὸς ἐνενηκοστοῦ διακοσιοστοῦ, ἐν κώμηι Κωφάνει ἐν ἐπαρχείαι Βα[ιτιρ]αύροις πρὸς σ[τα]θμῶι Δησακιδίδοις, ἐπὶ τῶν ὑπογεγραμμένων μαρτύρων, ἐξωμολογήσατο καὶ συνεγράψατο Ἀστωμάκης Γαάκου ἔχει[ν] παρὰ Δήνης τοῦ Γαθάκου ἀργυρίου δραχμὰς πεντήκοντα πέντε, καὶ δ[εδ]ωκέ[ν]α[ι] α[ὐ]τοῦ ἄμπελον ἐν ψειλοφύτωι τ[ὴ]ν ἐπικαλουμ[έν]ην Δαυβακαβὰγ [σὺν] εἰσόδωι καὶ ἐξόδωι καὶ ὕ[δ]ασι τοῖς ὑπάρχουσι μετὰ [τῶν] συνκλήρων· ὅρια καὶ γειτνίαι καθὼς ἐν τῆι παλαιᾶι συγγραφῆι· τελ[έ]σου[σιν δ]ὲ κατ' ἐνιαυτὸν ἐμβαίνον δραχμήν, ἄρτων κα', βοῦς πέντε, σκέλος δραχμὴν μίαν σκέλος. βεβαιωτὴν δὲ κατέστησεν Ἀσθάτην Δαργήνου ὃς κ[αὶ] πάρω[ν] ἐξωμολογήσατο βεβαιώσειν δύο κοτύλας προγεγραμμένας· ἐξάξοντα[ι] δ' ὅ τε πεπρακὼς καὶ ὁ βεβαιωτής, ἐάν τις ἐμποιήθῃ τῆς πεπραμμένης ἀμπέλου τρόπωι μηδενὶ μηδενὶ μηδὲ παρευρέσει μηδεμιᾷ, εἰ δὲ μή, τήν τε ἀθέτησιν εἶναι αὐτὴν ἄκυρον κ[αὶ] τὸν ἀθετήσαντα ἐκτείσειν ἄ[νευ] δίκ[ης] καὶ κρίσεως δραχμὰς διακοσίας καὶ εἰς τὸ βασιλικὸν τὰς ἴσας· μάρτυρες, Ἀραμάσδης Ἰωδαβόχθου, Γερίκης Ἀρδήνου, Μιραδάτης Μιραβανδάκου.

وێنە ژمارە (٤)

1 שנת ///ק ירהא ארותת מיבנו פתכפך ברי תורין
2 //..ו ליכי כרמא אסמך מה אבי ישדן פלג יאת
3 רזבנו אויל ברי בשנין דד אהי כלא זוין דןן /////
4 מה מן בזמהותי א.. ח.. המי ..דלו קדמתה
5 שהדין תירך ברי אפין.... ברי ישט ארשתת
6 ברי אבנו נריפנהי ברי מתרפדי כ..ך ברי מאתבגג
7 ...... כרמא אסמתן כרמא ויט: אויל מן
8 פתכפך כלא חזן ןןן /////



وێنە ژمارە (٥)

دەستنوسی ئارامی لەدۆکومێنتی سێیەمی هەورامـــان دا

TABLE II.




... انه ی چواره م وپینجهه م پیته ئارامیه کانن که له دۆکومینیته ئانی

...د وارامانداا تومار کراون له‌گه‌ل به راوورد یا به هه مان پیت لـــه

دۆکومینیته کانی ...انی دا!

وێنه ژماره (٦)

(9) **بەرەك**: ناوێکی ئارامی‌یـە بەواتـای (بـرکـات)ی عەرەبی شێـوە کۆنـەکـەی لە ئارامیـدا (بـاریقـا)یـە بە واتـای (بـەرەکـەت هاووردوو). بەڵام شێـوەی (بـارەك) ناوێکی کوردی کۆنـەلـە (بارەکە) هەڵقوڵاوە بەواتای (سوار) یان (باری سەرئەسپ).

(10) **باسیرتا**: بە واتای (سورانەوە بە دەوروبەردا).

(11) **گاتاك**: لە بنەرەتا لە وشەی (گاتاکە) دروست بووە بە واتای بێستان، لەگەڵ پاشگرێکی ناوچەیی (ك).

(12) **گیریك**: بە (گەیریکا)ش لە هەندی نووسراو دەبینرێت بە واتای (ژیان لە چیادا - چیایی، شاخی؟).

(13) **دەرگین**: ئەم ناوە لە وشەی (دەرگا واتە درێژ) لەگەڵ (ئەنا - ین) بە واتـای دەم پێـك هاتـوە بە هەردوو بەشـەکـە واتای دەم درێژ دەگەیەنێت.

(14) **دینی**: واتە (دینی)ی ئەمرۆ.

(15) **دینوباز**: شێوەی کۆنی (دەینا ڤازە) بە واتای (بەرزکەرەوەی دین - رأفـع الـدیـن). بەشـی یەکـەم لەم ناوەدا (دیـن)ە بەشی دوهـەمـی (بـاز)ە واتـە (دەسـت و قۆل) ئەم جورە ناوە لەو سەردەمـەدا لە وولاتی کوردەواریـدا باو بوە وەکـو (مـونـوبـاز) پادشای هەولێر کە لە خێزانی (سەکەسی)یان بوو ووشەی (باز) لە (بازنگە)ی کوردیدا ماوە.

(16) **کیلیوپاترە**: بێگومان ناوێکی یونانی‌یە ولە کوردستاندا باو نەبوە.

(17) **مەرزپـان**: بەشی یەکـەمی ئەم ناوە لە وشـەی (میهـرزات) سەری هەڵـداوەتـەوە وئیستـا شیـوەی (میـرزا)ی وەرگـرتوە. لە بنەرەتا واتای (میهرلاو)ی گەیاندوە.
بەشی دوهـەم (پـان) هەر (بـان)ە پاشگرێکی کوردیە کە بوەتە (وان) ئیستـا. لە پال ئەمـەشـدا مەرزبـان (پـاسـەوانی سەرسنور)یشی گەیاندوە.

(18) **میرابەندەك**: واتە میهر بەندەك - دیلی میهرا (کە خوای زانیاری وروشنایی بەیانیـانـە). شێوەی کۆنی (میترابانداکا)یە. بەند (دیل، کارکەر، تابع، بەستراوبە یەکێك) دەگەیەنێت. کا (ك) پاشگرێکی ناوچەیی‌یە.

(19) **مەیریـدات**: واتـە میهـردات - میهـرداد (ئـەوە کە خودا میهـرا داویەتی). تاسەر دەمی ئیسلامی ئەم ناوە لەناو کوردەواریدا باوبوە.

(20) **ئۆیـات**: بەشی دوهـەمی ئەم وشـەیـە (پـاتی) ئاڤیستایی‌یە بە واتـای (پـارێـزەر، حاکم، دەستـەڵاتـدار). ناوەکـە دەبێتـە (پارێزراوی چاك). لەکوردستاندا زۆر ناوی لەم جۆرە ناوەیە وەکـو (دەهیـوپـاتی - حاکم الاقلیم، میثـرا پاتی حامیـە الالـە میثرا، زانتوپاتی - رئیس القبیلة، نماناپاتی - رئیس العائلة، کاراپاتی - قائد القوات الغیرالنظامیة... هتد.

(21) **ئورکەدات**: واتە زێرداد جار بەجاریش لەگەڵ ناوی گورگ داد تێکەلاو دەبێت.

(22) **سی‌یەکی**: بە واتای (سی ویەکەمین 31) هەندی جار ئەم ناوە بە شێـوەی سیـاوکـوس دەبینـرێت لەوانـەیە ناوی (سیاوگویز؟) هەمان ناو بێت.

(23) **سوبێن**: لە بنـەرەتـا (شـوبێن یاشیبنا)ی ئارامی‌یـە بە واتـای گەنجی ناسك (الشاب اللطیف).

(24) **تیگـران**: ئەم ناوە لە ناو ئەرمـەنیـانـدا باوە کە ئیستـا شیـوەی (دیکران)ی وەرگرتوە. لە بنەرەتا لە ووشـەی (تیگرا)ی میدی بە واتەی (تیژ) سەری هەڵداوە.

(25) **فرات**: شێوەی راستی (فراهاتا)یە بەواتای (تێگەیشتوو).

**دەقی دۆکومێنتی سیهەم کە بە پیتی ئارامی نوسراوە**

**دێرەکان:**

---

(1) شنە /// ق یەرەخا ئەرونەت مەیبانو پەتەسپەك بەری تورین.
(2) //.. و (لـ)یەکی کەرمە ئەسمەك مەن ئەبیرشرن پەلز یات.
(3) رەزبانو ئەریل بەری بەشنین دەد ئەخی کەلا زوزن 10 + 20 + 20 + 5 [666 ///.
(4) مەن من بومخوتی 1..... ح... هەممی ئەدلو (ئەرلو) قەدەمتەخ.
(5) شەهدین تیرك (تیریك، تورەك) بەری ئەپین ی... بەری رەشنو ئەرشتەت.
(6) بەری ئەبنو گریپنەهی بەری میترەپەدی سینەك بەری.
(7) ماتبەنگ کەرمە ئەسمتەن کەرمە؟ ئەریل من.
(8) پەتەسپەك کەلا زوزن 10 20 20 5.

(بۆ واتای ئەم دیرانە لەگەڵ لێکدانەوەی بگەرێرەوە کوفاری کاروان ژمارە 10).

**ئەو ناوانەی کە لەم دۆکومێنتە تومار کراون لەگەڵ واتا مێژوویەکانیان.**

(1) **ئەروتەت**: لە سەر دۆکومێنتەکە بە شێوەی (أروتت) تومار کراوە. ئەمە ناوی مانگی (هەوردات ـ هەورڤەتات) ە بە واتای (هوڤار دات ـ هواردات ـ خواردات).

لە کۆتاییدا خور دات (عطاء اله الشمس) بوە. لە بابلیدا بۆتە خوموردات ولە هیندیدا سوڤاردات ولە میتانیدا شواردانا.

(2) **مەییان**: ووشەیەکی کوردیە کە بە شێوەی (میبنو) تومار کراوە. بە واتای (مەی دروست کر).

(3) **پەتەسپەك**: ناوی مەییانەکەیە کە لە کوردستاندا ناوێکی کەسی بوە وبە شێوەی (پتسپك) تومار کراوە واتە (پەت ـ سپە ـ ك) سەرلەشکر؟

(4) **تورین**: ناوی باوکی مەییانەکەیە.

(5) **ئەسمەك**: ناوی بازرگانی مەیە.

(6) **رەزبان**: لە دۆکومێنتەکە بە شێوەی (رزبنو) تومار کراوە بەواتا (رەزەوان).

(7) **ئەریل**: خاوەنی رەزەکەیە.

(8) **بەشنین**: ناوی باوکی خاوەن رەزە.

(9) **تیرك**: لە (تیر) پێك هاتوە کە لە بنەرەتدا (تیردات)ە واتە (میتردات) یا میهرداد ـ تیرداد.

(10) **رەشنو**: ئەم ناوە لە ناوی فریشتەی رەشنو پەیدا بوە وەکو هەمان جور ناو (ئەرشتت) وهاوری خوای میثرایە.

(11) **ئەرشتەت**: ناوی فریشتەیەکە لەگەڵ سراوشاو راشیو وهتد.

(12) **گریپنەهی؟** لەوانەیە ناوێکی یونانی بیت (وەکو أنتیوخوس گریپوس).

(13) **میتراپادی**: ئەم ناوە لە زۆر سەرچاوە تومار کراوە ولە ناو میدیاندا باو بوە (بـروانــە هیـرودوت کتیبی 3 بەشی 120) بە واتـەی (میهرا پاریزراو) = محفوظ الاله میهرا لە بنەرەتا (میثراپاتی)یە.

(14) **سینەك**: لە هەندی شوین بە سیناك تومار کراوە (بروانە قاموسی یوستی Justi). وبۆتە ناوی شۆین بە شیوەی سیناکا لە باکوری وروژئاوای زاخۆ ولە کاتی جەنگی پورث وکراسوسی رومانی بە ناوبـانــگ بوە وەلەچـــەرخی شارە کوردیــەکـانی سەر دیجلە ساریسا، ساتالکاو پیناکا بوە.

**سەرچاوە وتێبینیەکان:**

1 ـ سەبـــارەت بە دێکـــومێـنتی سیهـــەم، کە بە پیتی ئارامی نوســـراوە، بروانــە ئەو ووتــارە کە لە گوڤـاری کاروان دا بلاوکراوەتەوە لە ژێر ناونیشانی:

د. جمال رشید أحمد، دراسة وثیقة من وثائق هورامان التأریخیة.

گوڤاری کاروان ژمارە 10، هەولیر 1983.

2 ـ بەوێنە لە کتیبی (تأریخ مردوخ)دا دەست بۆ ئەم مەبەستە بەم جۆرەی خوارەوە درێژ کراوە:

«لە هەمان کاتدا کورد خطی یونانی وآرامی سریانی بەکـار هینـاوە. بەو بەلگـەیـەیی کەوا سێ پارچەی (ئیجار نامە) کە لە سالی 1328 قمری هجری (سید حسین) ناوێـك لە مەنسـوبـەکـانی شێـخ عەلائـودین لە ناوچـەی (أورامــان) لە ناو کوپـــەیێ پر هەرزن پەیــدا کردوە. لە دوایـیـدا ئەم پارچـە پێستـانـە بە رێگای پرۆفیسور (براون) گەیشتــە دەست پرۆفیســور مینس پسپوری خط وزمـانی یونـانی. یەکێـك لەم پێستـانـە بە زمانی بەهلەوی وخطی ئارامی سریـــانی‌یـــە دەگـــەریتـەوە سالی 88 پێش زایین ولەراستیدا 11 سالْ پ. ز د. جمال/ دوو پێستەکەی تر یونـانی‌یـە وهـەردوکیان یەك ناوەرۆکیان هەیە ئەم هەر دوو نوسراوە دەگەرێنەوە زەمانی فەرهادی چوارەم کە یەکێکە لە شاهانی (پارث) واتە زەمانی ئەشکانیان تومار کراون (22 ـ 21 پ. ز)/ لەراستیدا 88 ـ 22 پ. ز د. جمال/ وئـــەمـە بەلگـەیـەکـە کەوا ناوچـەی (هـەورامـان) لەژێـر دەستەلاتداریەتی أرمنستان (ئەرتاکیس یان ارتاکیــاس) بوە.

بروانە: تأریخ مردوخ، جلد اول. لاپەرە 39، 40.

3 ـ بروانـــە: د. عبـدالـلطیف احمـد علی، مصـادر التأریخ الرومانی بیروت. 197، ل 160.

4 ـ بروانە: هیرودوت، کتیبی پێنجەم. بەشی 58.

5 ـ بروانە: د. عبداللطیف احمد علی. سەرچاوەی پێشو. ل 162.

لە راستیــدا ووشـــەی (المجلد)ی عەرەبی کە بە واتـــای کوردی ئەمـرۆ (بـەرگ) دەگـرێتـەوە لە بنـەرەتا لە ووشەی

(جلد)ەوە پەرەی سەندوە کە بە واتای (پیستی) کوردیە، چونکــە هەر بابـەتێکی نوسین لە سەر یەك پارچـە پێست نوسراوەتەوەو بە (بەرگ)ێك زانراوە.

6 - بروانە: ووتارەکەی پروفیسور ئەلیس منیس، لاپەرە 65.

7 - بروانە: ووتارەکەی کاولی، لاپەرە 11. ئەم جورە نیشانانە ئیستاش کورد لە سەر پیتە عەرەبیەکان بە کار دێنن.

8 - ئارامیـەکـان بەشێکن لەو کۆمەلـە میللەتانە کە لە دوورگەی عەرەبەوە بلاوبونەتەوە وولاتانی تر، یەکەم جار ناویان لەو دەقانەدا هاتوە کە دەگەرێنەوە بۆ سەدەی 15 ـ 14 هەمی پێش زایین. ئەمـانـە لەو کاتـەدا وەکـو کۆچـەر لە بیـابانی رۆژئـاوای مێـزوپـوتـامیادا بلاو بوو نەوە. (بۆ ئەم مەبەستە سەیـریکی کتیبی د. مراد کامـل، د. محمـد حمـدی البکـری، تأریـخ الأدب السـریـانی من نشأته الی الفتح الاســلامی. طبعـة المقتطف بمصـر 1949 بەتـایبـەتی لاپەرەی 3 ودوایی بکە).

زمانی ئارامی بەرە بەرە زال بوە بەسەر ئەو زمانانەدا کە لە هەمان خێزانی زمانەوانیەوە هەلّقولاّون. لە بەر ئەمە زمانی ئەکـەدی وکـەنعـانی وزمـانـانی‌تـری توانـدوّتـەوە. لەگەلّ ئەوەشدا ئەم زمانە وای لیّ هاتووەکە لە وولاتی پرث دا (عیـراق وئیـران وکـوردسـتـان وپـارثیـا وشـوینـانی تری رۆژهەلاتی ناوەراست) لەگەلّ میسر وفەلەستینشدا بوو بە زمـانیکی باوەر پیّ‌کـراو کە پارچـەنـوسراوی دەولەتیان پیّ تومار دەکرد.

وکـۆنتـرین نوسـراو بەم زمـانـە لە هەلکـەنـدراوەکـانی (زنجرلی) نزیك عینتاب لە خوارووی تورکیای ئەمرۆ بەر چاو کەوتـوە، کە دەگـەرێتـەوە بۆ سەدەی نۆی پێش میلاد وهی (بنموّ وکورەکەی برکُب) پاشای (شمأل) بوە.

ئەم زمانە دەکرێت بە دو بەشەوە:

1 ـ ئارامی رۆژهەلات لە عیراق و کوردستان وسەروی میزوپوتامیادا.

2 ـ ئارامی رۆژئاوا لە سوریە وفلسطین وطورسینا.

(بۆ ئەم مەبەستە بروانە: أ. ولفنسون، تأریخ اللغات السامیة.

بیروت 1980، لاپەرە 117).

لەگـەلّ ئەمـەش ئیـودور نولـدکـە لە کاتی خویـدا ئەم زمـانــەی دابــەش کردبــوە سەر دوو بەش. بەشــە رۆژهـەلاتیـەکـەی شیـوەکـانی تەلمودی بابلی، سریانی، مەنـدائی وبیّجگـە لەمـانە بەشە رۆژئاوایەکە دەیگرتەوە کە (تـدمـر)ی‌و (نـەبـەطی)و (جلیلی)و (سـامری). . هتد،

بروانـە ووتـارەکـەی د. مراد کامـل، د. محمـد حمـدی البکری. ل 5 وبەهەمان جور لەم کتێبەی خوارەوە دابەش کراوە:

فؤاد حسنین علی، التـوطئـة فی اللغـة العبریة [القاهرة] 1940 ل. 7، 8.

نەخشــەو نوســراوەکــانی وولاتی ئاشـور بە تایبـەتی سەردەمی سـەرگون (722 ـ 705 پ. ز) دەست نیشانی ژمــارەیــەك لە ناوی ئارامی دەکــەن کەوا خاوەنـەکـانی بازرگـانـەتیـان لە وولاتی ئاشـوردا کردوە. بیّ گومان ئەم بازرگــانــە ئارامیــانــە لەگـەلّ دانشتـووی کۆنی وولاتی کوردەواری‌دا پەیوەندیەکی ئابوریان بەستوە کە بوەتە هۆی بلاوبوونەوەی شێوەی نوسینیان لەوێدا.

9 ـ بیّ‌گـومـان سعیـدخـان لێـرەدا مەبـەستی ئەو هۆنـراویـە کە سەرەتاکە بەم بەیتە دەست پیّ‌دەکا:

هورمزگان رمان ئاتران کوژان  ویشان شاردەوە گەورەی گەورەکان

بیّ ئەوەی جیّ‌وشـویّنی ئەم بەیتـانـە بزانـریّت لەکـویە رشیـد یاسمی وەکـو بەلگـەیەك لە کتیبی (کرد وپیوستگی نژادی أو ل 119 ـ 120) بۆ کۆنیــەتی زمــانی کوردی باسی کردوە، هەروەهـا خوالیّ‌خـوشبـوو مامـۆستـا عەلاء الـدین سەجـادی هەمـان ئەو بەیتانەی لە کتیبی مێژووی ئەدەبی کوردیــدا دوپــات کردۆتـەوە. هەنـدیّ نوســەری کوردی تریش لە کتێبی خۆیـانـدا باسی ئەم هونـراوەیـان کردوە، بۆیـە بوەتـە سەرچـاوەیـەکیش بۆ مێژ و وئەثنوگراف نوسی سوڤیتی ڤلچیڤسکی کەبلێت:

«ئـەم هونـراوانـە لە سالانـی بیستـدا لە ناوچـەی سولەیمانیدا دۆزراونەتەوە»و بە شیوەیەکی دریژ باسی ئەو رەوشتانە دەکات کە پەیوەندی بە دەقی هونراوەکەوە هەیە. بروانـە: ۆ. فلچیـفسکی، کورد. موسکـو-لینگـراد 1961، ل 93، 94، 156، 157، 158 بە زمانی روسی.

هەروەها رودینکو ئەم هونراوانەی گوریەوەتە سەر زمانی روسی بروانە م. ب. رودینکو، سەبارەت بە مەسەلەی ئەدەبی کوردی. لیکـۆلینـەوەی میـژووی شارستـانیـەتی میللەتـانی رۆژهـەلات. گوڤـاریکە بەبۆنەی کۆچی دوایی ئاکـادیـمیـك ی. أ. ئوربیلی چاپ کراوە. لینینگـراد 1960، ل 434.

10 - خوالیٰ خۆشبـوو مامـۆستـای میـژونـوس حوسەین خوزنی موکریانی سالانی سی ئەم کارەساتەی دووپات کردبووەوە، کە پاشان لەلایەن هەندی کەس خرابوە بەر رەخنە. بەلام لەگـەل ئەوەی دوکتـور سەعیـد خانیش سەرچـاوەی خۆی دەست نیشان ناکات، ئەو قسانە لە یادگاری أحمد کوری وحشیـەی نبطی وەرگیـراوە کە نیـوی کتیـبەکـەی (شـوق المستهـام في معـرفـة رمـوز الاقـلام)» کە لە (241)ی کۆچیدا نووسیویەتەوە لەم بابەتەوە دەلیت:

«لە بەغدا لە (ناو وسی)دا چاوم بە 30 بەرگە کتیبی کوردی کەوتـووە، کە بەو پیتـە کوردیـانـە نووسراونەتەوە، ئیستـاش لە شامیٰ دووبـەرگم لەوانـە لە لایـە، یەکیکیان باسـی پەروەردەکـردن و چەقـانـدنی دارە خورمـایـان وئـەویتـریـان لە بابـەت دوزینـەوەی ئاوە لە جیگـایـانی ووشك و بیٰ ئاودا. ئەوانەم وەرگیرانە سەر زمانی عەرەبی تا ئادەمیزاد سوودو کەلکیان لیٰ وەرگرن». پاشان احمد بن نبطیە بەووردی باسی ئەو ئەلف و بیٰی کوردیە دەکات کە ئەو بەرگـە کتیبـانـەی پیٰ نـووسـرابـوون. بۆ ئەم مەبـەستە هەروەها بروانە:

گیـو موکـریـانی، فەرهەنگی مەهاباد. چاپی یەکەمین هەولیر 1961، ل 771، 772.

11 - پیشـەکی کتیبی (نـزانی) بە دەست خەتی دوکتـور سعیـد خانی کردستانی تهران 1309، لاپەرە (ط، یا، یب، یە).

12 - بروانە هەمان سەرچاوەی پیشوو.



چەند نموونەیەکی (دراخما)ی یونانی (هیللینی)

# بیبلیۆگرافیای وتاری زمانەوانی لە بارەی زمانی کوردییەوە لە گۆڤارە کوردی و بێگانەکانی سالانی ١٩٤٠ - ١٩٧٠ دا

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

بەشی دووەم

99- قەنـاتـی کوردۆ (کـوردۆیـێـف)، رەخـنـە لە بیـروبـاوەڕی هەڵـە لەبـارەی زمـانی کوردییـەوە ،گۆڤاری «کـورتـەی دەنگـوبـاسی ئامـۆژگـای ڕۆژهەلاتناسی» ،ب 12، 1955، ل 43 ـ 61 .

ئەم وتـارە بە زمـانی ڕووسی یـەو ڕەخنـەیـە لە بیـروبـاوەڕی هەڵە لەبـارەی ئەسڵی کوردیو شوێنی زمـانی کوردی لەنێـو زمـانـە ئێـرانیکـانـدا . . . بیـرورای ناڕاست و دوور لە زانسنییـانەی ن. ماررو شاگردان و لایەنگیرانی شیدەکاتەوە[6]

100 ـ قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف)، وشە ژمارەییەکان لە زمـانی کوردیـدا، «کـورتـەی دەنگـوبـاسی ئامـۆژگـای ڕۆژهەلاتناسی»، 1956، ب 22،ل 28 ـ 36 .

ئەمە لێکۆڵینەوەیە لەو وشانەی واتای ژمارەیان تێدایە.

101 ـ ب.ڤ. میللێر، نموونەی شێوەی کوردەکانی ئازربـایجـانی سۆڤێت، گۆڤـاری «کـارەکـانی ئامـۆژگـای زمانناسی»، 1956، ب 4،ل 343 ـ 355 .

ئەمـە کۆمـەڵێ تێکستـە کە مانگی ئابی 1935 لە چەنـد گونـدێکی کوردنشینی ئازربـایجـانی سۆڤێت تۆمارکراوە هەروەها کراوە بە ڕووسیو هەندێ مەسەلەی زمانەوانیشی لەسەر بنیادنراوە.

102 ـ ئی. ئی. تسـوکـەرمـان، لەبـارەی ڕێـزمـانی کوردیـیـەوە، گۆڤـاری «کـارەکـانـی ئامـۆژگـای زمانناسی»، 1956 ،ب 4،ل 5 ـ 58 .

ئەم وتارە لەبارەی جنسەکانی ناوەوەیە لە زمانی کوردیدا

103 ـ قەنـاتی کوردۆ (کـوردۆیێف)، زمـانی کوردی ،گۆڤاری «ئێرانی ئەمرۆ»، مۆسکۆ، 1957،ل 60 ـ 075

باسی ئەسڵی زمانی کوردیو هەندێ کێشەی ڕێزمانی کوردی دەکات.

104 ـ یو.یـو. ئاڤـالیـانی، کێشـەی جیـاکـردنـەوەی کرداری لێکدراوو ئیدیۆمی کرداری (بە کەرەستەی زمانی کوردی)، گۆڤـاری «کـورتـەی دەنگـوبـاسی زانکـۆی سەمەرقەند»، سەمەرقەند، 1958، ل 40 ـ 43 .

ئەم وتـارە کە لەبـارەی جیـاکـردنەوەی کرداری لێکدراوو ئیدیۆمی کرداریەوە دەدوێ ،کورتەی ئەو باسەیە کە یویو ئاڤالیانی سلە کۆنفرانسی چوارەمی زمانناسی لە مەرقەند خویندویەتی یەوە.

105 ـ قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف)، دەربارەی کێشەی ڕوونـانی وشـە لە زمـانی کوردیـدا، گۆڤـاری «کێشـەی ڕێـزمـان و مێـژووی زمـانـە ڕۆژهەلاتی یەکان»، مۆسکۆ ـ

**لینینگراد، 1958، ل 109 ـ 142.**

ئەم وتارە بە شێوەیەکی گشتی لە دوو کێشە دەدوێ:

1 ـ جووتە وشە لە رووی واتاو رێزمانەوە، 2 ـ رۆنانی ناوی مەعنا لە زمانی کوردیدا.

**106 ـ عەبدولقادر قەزاز، زمانی کوردی، گۆڤاری «هیوا»، ژ 1، ساڵی 1، بەغدا، 1957، ل 15 ـ 18.**

نووسەری ئەم وتارە ئامۆژگاریی کوردان دەکا بە زمانی کوردی بدوێن و بایەخ بە زمانەکەیان بدەن و نرخی بزانن.

**107 ـ فاضل، زمانی کوردی، گۆڤاری «هیوا»، ژ3، ساڵی1، بەغدا، 1957، ل 15 ـ 17.**

نووسەر لەم وتارەدا لایەنی وتەکانی مامۆستا عەبدولقادر قەزاز دەگرێو ئەمیش ئامۆژگاریی کوردان دەکا بە زمانی کوردی بدوێن و هەندێ قسەی زانایان لەبارەی بایەخ دان بە زمانی زگماکەوە دێنێتەوە.

**108 ـ ب.، چۆن زمانەکەمان بنووسین، گۆڤاری «هیوا»، بەشی یەکەم، ژ 4، ساڵی 1، بەغدا، 1957، ل 10 ـ 17؛ بەشی دووەم، ژ6، ساڵی 1، بەغدا، 1957، ل 8 ـ 19.**

نووسەری ئەم وتارە دەربارەی جۆری لێکۆڵینەوەی رێنووسی کوردی دواوەو باسی ئەو مەرجانەی کردووە کە دەبێ لە چاکترین ئەلفوبێدا هەبن دوای لێکۆڵینەوە لە نووسین بە پیتی عەرەبیو لاتینی، بە بەڵگەی راست و زانستی ئەوەی نیشان داوە کە ئەلفوبێ لاتینی لەگەڵ زمانی کوردیدا پتر دەگونجێ.

**109 ـ فوئاد زەکی هەناری، نووسینی تیپی (دال) بە شێوەی سلێمانی، گۆڤاری «هیوا»، ژ7، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 19 ـ 21.**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو (د)ە دەکا کە لە ناوچەی سلێمانی کلۆر دەکرێو نیشانیدەدا کە ئەمە نابێ لە زمانی ئەدەبیدا رەنگ بداتەوە.

**110 ـ م.م.، نووسینی زمانی کوردی، گۆڤاری «هیوا»، ژ8، ساڵی1، بەغدا، 1958، ل9 ـ 14.**

مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لەم وتارەدا دەربارەی وێنەی هەندێ دەنگو نووسینی هەندێ وشە چەند پێشنیارێکی کردووە.

**111 ـ فرمانی ئێستەمان، گۆڤاری «هیوا»، ژ9، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل7 ـ 18.**

نووسەر لەم وتارەدا باسی پەیدابوونی چوکلەو پیت بۆ دارشتنیانی کردووەو ئەو قۆرتانەشی نیشان داوە کە لە رێنووسی کوردیدا هەن، لەبارەی ئەو فرماناشەنەوە دواوە کە لەسەر شانی خوێندەوارانن.

**112 ـ جەمیل بەندی رۆژبەیانی، چۆن زمانەکەمان بنووسین، گۆڤاری «هیوا»، ژ10، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل8 ـ 11، 89 ـ 94.**

مامۆستا رۆژبەیانی لێرەدا موناقەشەی رای نووسین بە عەرەبیو لاتینی دەکاو لەو دەنگانە دەدوێ کە نیگاریان دەوێ.

**113 ـ محەمەدی مەلا کەریم، بە کام شێوەی زمانەکەمان بنووسین، گۆڤاری «هیوا»، ژ5، ساڵی 2، بەغدا، 1958، ل 23 ـ 27، 72 ـ 75.**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی زمانی ئەدەبیی کوردی دەدوێو شێوەی سلێمانی بە بناغەی زمانی ئەدەبی دادەنێو واش بە باش دەزانێ بە شێوەکانی تر دەوڵەمەندبکرێ.

**114 ـ ئیبراهیم باڵدار، خوێندن بە زمانی کوردی، گۆڤاری «هیوا»، ژ11 ـ 12، ساڵی 2 بەغدا، 1959، ل6 ـ 17.**

ئەم وتارەی لەم باسانە پێکهاتووە: «بۆچی ئەبێت بە زمانی کوردی بخوێنین»؛ «زمانی شیری هۆی تێگەیشتن و دەربرین و پێگەیشتنە»؛ «لەگەڵ خوێندن بە زمانی شیری، کەی باشە دەست بە فێرکردنی زمانێکی دووەم بکرێت؟»؛ «ئەوانەی دوور لە وڵاتی خۆیان ئەژین و بە زمانێکی تر قسەئەکەن و ئەخوێنن»؟ «خوێندنی پلەی سەرەتایی بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنە، نەك بۆ فێرکردنی زمانێکی دووەم»؛ «زمانی کوردی زمانی گەلەکەمانە، زمانی باوباپیرو گەنجینەکانی زانستیو

میـژوومـانـه»؛ «زۆری ڕۆڵـەکـانی کورد کۆڵن لە نووسین و خوێنـدنـەوەی زمـانـەکـەیـانـدا»! «بـۆ ژیـانـەوەو پێش خستن و پەرەپێدانی زمانەکەمان».

**115 ـ طاهیـر صادق، فەرهـەنگی خاڵ، گـۆڤـاری «هیوا»، ژ5، ساڵی 3، بەغدا، 1960، ل 68 ـ 69.**

ئەم وتارە بریتی‌یە لە کورتە نرخاندنێك و چەند ڕەخنەیەك لە بەرگی یەگەمی فەرهەنگی خاڵ.

**116 ـ عیـصـمـەت شەریـف وانـلی، مەسـەلـەی یەك خسـتـنی زبـانی نووسینی کوردی: کرمـانجی یا سۆرانی؟، گۆڤـاری «هیـوا» ژ30، ساڵی 4، بەغـدا، 1960، ل 19 ـ 35.**

نووسەر لەم وتارەدا دوای هێنانەوەی هەندێ نموونەو بەڵگە وا بە ڕاسـت دەزانـێ، کە لە باری ئەمـڕووی کورددا بە هەردوو شێـوەی کوردیی خوارووو ژووروو بنـووسـرێو کاتێ وەزعێکی لەبـار دێتـە پێشـەوە لەبـەر ڕوونـاکیی بەرنـامـەی زمانناسانمان دا دەست بە یەکخستن بکرێ.

**117 ـ حەمـە جەزا، وەڵامی ڕەخنـەکـەی فەرهـەنگی خاڵ، گۆڤاری «هیوا»، ژ30، ساڵی 4، بەغدا، 1960، ل 40 ـ 43.**

نووسـەری ئەم وتـارە لایـەنی مامـۆسـتـا خاڵ دەگـرێ لە تۆمـارکـردن و لێکـدانـەوەی هەنـدێ وشەداو ڕەخنەکانی مامۆستا طاهیر صادق ڕەت دەکاتەوە.

**118 ـ طاهیـر صادق، دوو پیتی بێ وێنـە، گۆڤـاری «هیوا»، ژ31، ساڵی 4 بەغدا، 1961، ل 52 ـ 53**

مامۆستا طاهیر صادق وا پێشنیاردەکا بۆ ئەو (ك)و (گ) انەی لەپێش (ی، ێ، وێ، وی) یەوە دێن و شێـوەی تەلـەفـوزیـان دەگۆڕێ، پیتی تایبەتی دابڕێژرێ.

**119 ـ عیـزەدین مستـەفـا ڕەسـووڵ، مامـۆستاو زانای کورد دوکتۆر بەکایێف، گۆڤاری «هیوا»، ژ31، ساڵی4، بەغدا، 1961، ل 54 ـ 56.**

نووسـەر لەم وتـارەدا باسی کارە زمـانـەوانی‌یـەکـانی مامۆستا چەرکـەزی بەکـۆی کردووە، بە تەتـایبەتی «فەرهەنگی کوردی ـ زمانی کوردەکانی تورکمەنستان و زمانی کوردەکانی ئازربایجان ڕووسی»و . . . هتد

**120 ـ پاکیـزە ڕەفیق حیلمی، وەڵامێکی زمـانـەوانی، گۆڤاری «هیوا»، ژ32، ساڵی 4، بەغدا، 1961، ل 28 ـ 32.**

لەم وتارەدا ئەگەرچی کەمێ ڕەخنە لە مامۆستا طاهیر صادق گیراوە، بەڵام بە گشتی لایەنی پێشنیارەکەی گیراوە، کە بۆ ئەو (ك)و (گ) انەی لەپێش (ی، ێ، وێ، وی) یەوە دێن و شێوەی تەلەفوزیان دەگۆڕێ، پیتی تایبەتی دابڕێژرێ.

**121 ـ مەعرووف خەزنەدار، دوو تیپی بەوێنە، نەك بێ‌وێنـە، گۆڤـاری «هیـوا»، ژ32، ساڵی 4، بـەغـدا، 1961، ل 42 ـ 43.**

مامـۆستـا خەزنـەدار لەم وتارەدا ئەو پێشنیارەی مامۆستا طاهیر صادق ڕەت دەکـاتـەوە، کە بۆ (ك) و (گ)ی پێش (ی، ێ، وێ، وی) پیتی سەربەخۆ دابنرێ.

**122 ـ طاهیر صادق، ڕۆژژمێر یان ڕۆژمێر، گۆڤاری «هیوا»، ژ32، ساڵی 4، بەغدا، 1961، ل 50 ـ 51.**

مامـۆستـا طاهیـر صادق لەم وتـارەدا وا پێشنیاردەکا بنووسرێ «ڕۆژمێر» بۆ بەڵگەش هەندێ وشەی لێکدراوی وەك: «قژن = قژ + ژن»؛ «ئاوێنە = ئاو + وێنە». . . ی هیناوەتەوە

**123 ـ پاکیـزە ڕەفیق حیلمی، دیسـانـەوە لەگـەڵ کاك طاهیـر صادق، گۆڤـاری «هیـوا»، ژ33، ساڵی 5، بەغدا، 1961، ل 30 ـ 32.**

نووسـەر لەم وتـارەدا وەڵامی مامـۆستـا طاهیر صادق دەداتەوە سەبـارەت بە نووسینی هەنـدێ وشـەی لێکـدراوو ڕای لەگـەڵ بۆچوونەکانیدا ناگونجێ.

**124 ـ طاهیـر صادق، پیتـە ناسـازەکـان، گۆڤـاری «هیوا»، ژ33، ساڵی 5، بەغدا، 1961، ل 33 ـ 35.**

ئەم وتـارە بە کورتی باسی دەنگـە بزوێنـەکـانی زمانی کوردی‌یەو ژمارەیانی بە حەوت دەنگ داناوە.

**125 ـ جەمـال جەلال، دوو پیتی بەوێنـە، گۆڤـاری «هیوا»، ژ33، ساڵی 5، بەغدا، 1961، ل 39 ـ 40.**

مامۆستا جەمال جەلال لەم وتارەدا ڕەخنە لە طاهیر صادق و پاکیزە ڕەفیق حیلمی دەگرێ ،کە بەلایانەوە وایە دەبێ بۆ ئەو (ك) و (گ) انەی لەپێش (ی ،یٚ،وێ، وی) یەوە دێن پیتی تایبەتی دابنرێ . .هەروەها لایەنی مەعرووف خەزنەدار دەگرێ کە ئەو ڕایەیانی ڕەت کردۆتەوەو لە کۆتاییدا هەندێ بەڵگەی زمانەوانی بۆ ئەم مەبەستە دێنێتەوە.

**126 ـ عەبدولستار کاظم، ئاژاوەی زاراوەکان، گۆڤاری «هیوا» ژ34، ساڵی 5 ،بەغدا، 1961، لە 23 ـ 27.**

مامۆستا عەبدولستار کاظم لەم وتارە کورتەدا هەندێ زانیاری باشی لە بارەی ڕێگەی سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردییەوە خستۆتە پێش چاو.

**137 ـ جەمال جەلال عەبدوللا، زمانەکەمان ،گۆڤاری «هیوا»، ژ34، ساڵی 5 ،بەغدا، 1961، ل 23 ـ 27.**

ئەم وتارە لە سێ باس پێکهاتووە: «1 ـ پیت یا تیپ»؛ «2 ـ پیتی بێدەنگ و دەنگدار»؛ «3 ـ باسی هەندێ وشەی لێکدراو».

**128 ـ جەمال جەلال عەبدوللا ،مەبەست چی‌یە لەم هەموو وشە تازانە، گۆڤاری «هیوا»، ژ36، بەغدا، 1962، ل 17 ـ 20.**

نووسەر لەم وتارەدا ڕەخنە لە کۆمەڵێ وشەی نوێباو دەگرێو بەکارهێنانیان بە شتێکی نادروست دادەنێو داوا لە نووسەران دەکا وشەی نالەبار نەهێننە زمانی کوردی‌یەوە.

**129 ـ جەمال خەزنەدار ،مامۆستای زانا تۆفیق وەهبی‌و (شەفەق)، گۆڤاری «شەفەق»،ژ 2،ساڵی 1، کەرکوك، 1958، ل 13.**

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ مامۆستا جەمال خەزنەداردا ماناو واتاو ئەسڵی وشەی «شەفەق»ی لێك داوەتەوە.

**130 ـ تۆفیق وەهبی، لێبوونەوەی ناوی کەرکوك ،گۆڤاری «شەفەق»، ژ3، ساڵی 1، کەرکوك، 1958، ل 4 ـ 5**

مامۆستا وەهبی لەم وتارەدا لەبارەی ئەسڵ و ڕوونانی وشەی «کەرکوك» ەوە دواوە.

**131 ـ بلە، خۆپاراستن لە لایەنگیریی ناراستی، گۆڤاری «شەفەق»، ژ5 ـ 6، بەغدا، 1958، ل 6 ـ 11.**

مامۆستا بلە لەم وتارەدا بە وردیو ڕاستی باسی مێژووی پەیدابوونی هەندێ پیت و نیشانەی کردووەو بێلایەنانە هەقی بەوانە داوە، کە لەو مەیدانەدا کاریان کردووە.

**132 ـ جیهان صدیق شاوەیس، وشەی (تمثیل)، گۆڤاری «شەفەق»،ژ 7، ساڵی 1 ، کەرکوك، 1958،ل 7 ـ 8.**

نووسەر لەم وتارەدا وشەکانی «لاسایی» و «نواندن»، کە هەندێ کەس لەجیێ «تمثیل» بەکاریدێنن ڕەت دەکاتەوەو بە زمانی کوردیدا گەشتێك دەکا بۆ دۆزینەوەی وشەیەکی لەبار بۆ ئەو مانایە.

**133 ـ شێخ حەسەن، بەشێك لە قەواعیدەکەی پایە بڵند تۆفیق وەهبی، گۆڤاری «پێشکەوتن» ،ژ 1، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 14 ـ 16؛ ژ5، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 7 ـ 8.**

ئەم دوو وتارە بەشێکی کەمی سەرەتای کتێبی «قواعد اللغة الكردية»ی مامۆستا تۆفیق وەهبی‌یە وەمامۆستا شیخ حەسەن کردوویەتی بە کوردی.

**134 ـ تۆفیق وەهبی، بەخێوکردنی زمانەکەمان بە وشەی وێژە، گۆڤاری «پێشکەوتن»،ژ 4، ساڵی 1 ،بەغدا، 1958، ل 1 ـ 3.**

نووسەر لەم وتارەدا ئەوەی نیشان داوە ،کە بەکارهێنانی وشەی «وێژە» بە مانای «ئەدەب» ڕاست نییە.

**135 ـ مامۆستا، بێژانەوەی وشە ،گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ5، ساڵی 1، بەغدا، 1958 ،ل 1 ـ 2.**

مامۆستا تۆفیق وەهبی لەم وتارەدا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە وشەی «ئاهەنگ» بە مانای «حفلة» هەڵەیە.

**136 ـ تۆفیق وەهبی، سوپاس، گۆڤاری**

**«پێشکەوتن»، ژ5، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 3 ـ 5.**

نووسەر لەم وتارەدا وەڵامی ئەو نووسینە دەداتەوە، کە بەناوی «فرمانی ئێستەمان»ەوە لە ژمارە (9)ی ساڵی (1)ی گۆڤاری «هیوا»دا بڵاوکراوەتەوە (بڕوانە: وتاری ژمارە 252) هەروەها باسی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی خۆی کردووە کە بۆ دانانی هەندێ پیت و نیشانە داوێتی.

**137 ـ پۆستەی خوێندەوارە بەرزەکان، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ5، ساڵی 1، بەغدا 1958، ل 13. 14.**

لێرەدا کۆمەڵێ وشەی کوردی بڵاوکراوەتەوە کە مامۆستا عەبدولخالق حسەین جەباری ناردوێتی. گۆڤاری «پێشکەوتن»یش لە هەندێکیان دواوە.

**138 ـ مامۆستا، وشەوانی، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ6، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 1 ـ 4.**

مامۆستا تۆفیق وەهبی لەم وتارەدا مانای وشەی «بەزم»و «گۆبەند»ی لێك داوەتەوە.

**139 ـ تۆفیق وەهبی، دەستوور، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ6، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 5 ـ 7.**

نووسەر لەم وتارەدا لە چۆنیەتی نووسینی هەندێ ئامرازو وشە دواوە.

**140 ـ تۆفیق وەهبی، فۆتۆگراف، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ6، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 8 ـ 9.**

نووسەر لێرەدا وێنەی ئەو پیت و نیشانانەی خستۆتە پێش چاو کە لە زووەوە داینـاون و وا رادەگەیەنێ کە ئەوە لاپەڕەیەکە لەو دەستنووسەی مامۆستا ئەنوەر سائیب کە ساڵی 1925دا بۆی پاکنووس کردووە.

**141 ـ تۆفیق وەهبی، وشەوانی، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ7 ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 2 ـ 4.**

نووسەر لەم وتارەدا لە وشەکانی: «وشە، واچە، ئاخاوتن، وتن، واتە»ی کۆڵیوەتەوە.

**142 ـ تۆفیق وەهبی، پیرەمەگروون، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ8، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 1 ـ 4.**

نووسەر لەم وتارەدا هەوڵی داوە ئەسڵی وشەی «پیرەمەگروون» ساغ بکاتەوە.

**143 ـ تۆفیق وەهبی، بۆ جەنابی مامۆستا سەعید صدقی بەڕێز، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ8، ساڵی1، بەغدا، 1958، ل 5 ـ 6.**

نووسەر لێرەدا کەمێك باسی سەرچاوەی پەیدابوونی هەندێ نیشانەی سەر پیتەکانی کوردی کردووە.

**144 ـ ن. ، دیسانەوە (ئەلفوبێ نوێ دانەری ئیبراهیم باڵدار)و بەراوردی ڕەخنە زانستییەکەی مامۆستا مستەفا صالح کەریم و وەڵامەکەی مامۆستا ئیبراهیم، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ9، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 4 ـ 6.**

نووسەر لەم وتارەدا لە «ئەلفوبێ نوێ»ی مامۆستا ئیبراهیم باڵداری کۆڵیوەتەوەو هەندێ ڕەخنەی زمانەوانی لێ گرتووەو پەنجەی بۆ پێویستی جیاکردنەوەی (ر)ی لاوازو (ڕ)ی قەڵەو ڕاکێشاوە.

**145 ـ شێخ حەسەن، ڕەخنەیێکی زانستی لە مامۆستای بەڕێز جەمیل ڕۆژبەیانی، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ 10، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 4 ـ 8.**

نووسەر ڕەخنەی لەو وتارەی مامۆستا ڕۆژبەیانی گرتووە، کە لە ژمارە (10)ی ساڵی (1)ی گۆڤاری «هیوا»دا بڵاوی کردۆتەوە. بەشی زۆری ئەم وتارە باسی پێویستی دانانی چوکڵە بۆ (ڕ)ی سەرەتای وشەو ڕەت کردنەوەی نووسینی دوو (ر)بۆ (ڕ)ی قەڵەوە.

**146 ـ عادیل عیرفان، هەڵمەقۆکردن بە نووسینی کوردیو وشەی عەرەبی، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ10، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 18 ـ 20.**

مامۆستا عادیل لەم وتارەدا باسی پاشاگەردانیی نووسینی وشەی عەرەبی کردووە.

**147 ئیبراهیم ئەمین باڵدار، ئەگەر گوڵ نەبیت، درکیش مەبە، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ11، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 14 ـ 17.**

ئەمە وەڵامی وتاری مامۆستا (ن)ە ،کە لە کتێبی «ئەلفوبێی نوێ»ی گرتبوو (بڕوانە: وتاری ژمارە 294)

148 ـ مانای چەند وشەیەك، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ 14، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 7؛ ژ15، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 6؛ ژ16، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 7.

ئەمە چەند وشەیەکی (زازا)و (سلێمانی)ین بەرانبەر یەك دانراون.

149 ـ عمر محمود حسن دولة، اللغة الكردية ولهجاتها، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ14، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 3 ـ 4.

ئەم وتارە بە زمانی عەرەبییەو بە کورتی باسی دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەکات.

150 ـ س. ، گیرەشێوێنی، گۆڤاری «پێشکەوتن»، ژ16، ساڵی 1، بەغدا، 1958، ل 10.

مامۆستا س. لەم وتارەدا بە چەند وشەیەك باسی دەوری مامۆستا تۆفیق وەهبی لە دانانی نیشانەی سەر پیتەکاندا دەکات.

151 ـ ی.ل. ، ئیملای کوردی، گۆڤاری «بڵێسە»، بەشی یەکەم، ژ1، ساڵی1، سلێمانی، 1959، ل 73 ـ 74؛ بەشی دووەم ،ژ2، ساڵی1، سلێمانی، 1959، ل 66 ـ 67؛ بەشی سێیەم، ژ3، ساڵی 1، سلێمانی، 1959، ل 74 ـ 75.

نووسەر لەم سێ ئەلقەیەدا باسی چۆنیەتی نووسینی یێ همزەو لامی قەڵەوو ڕێی قەڵەوو واوی کورت و درێژ و کۆنسۆنانت و یێ کورت و درێژ و کۆنسۆنانت و واوی پێوەندیو وشەی لێکدراو. . .ی کردووە.

152 ـ کەمال مەزهەر ئەحمەد، سەرنجێکی مێژوویی لە زمانەکەمان ،گۆڤاری «بڵێسە»، ژ3، ساڵی 1، سلێمانی، 1959،ل 35 ـ 42.

نوسەر لەم وتارەدا وەڵامی ئەو بیرورایانە دەداتەوە، کە زمانی کوردی بە بەشە دیالێکتێکی فارسی دادەنێن.

153 ـ نووری عەلی ئەمین، زاراوەی زانستی، گۆڤاری «بڵێسە» ژ6، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 28 ـ 31.

نووسەر لەم وتارەدا لەبارەی چۆنیەتی داڕشتن و دانانی زاراوەی زانستییەوە دواوەو هەندێ دەستووری بۆ ئەو کارە خستۆتە پێش چاو.

154 ـ فەرهەنگی بڵێسە، گۆڤاری «بڵێسە»، ژ6، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 38؛ ژ7، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 44 ـ 45 ؛ژ8،ساڵی 1، سلێمانی، 1960،ل 54 ـ 55.

ئەمە فەرهەنگۆکێکی وشەی کوردیو عەرەبییە. ئەوەی لە ژمارە (6) و (8)دا چاپکراوە مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم ناردوێتی ئەوی ژمارە (7)یش نێرراوی مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانییە.

155 ـ کامیل بەسیر، دوارۆژی زمانەکەمان و چۆنیەتی لێکۆڵینەوەی، گۆڤاری «بڵێسە»،ژ9، ساڵی 1، سلێمانی، 1960،ل 12 ـ 17.

نووسەر لەم وتارەدا دژی ئەو بیروڕا هەڵەیە وەستاوە کە وا دادەنێ، گوایا کورد زمانێکی تایبەتی یەکگرتووی سەربەخۆی نییە. . . باسی بەشەکانی زانستی زمانی کردووەو لەبارەیانەوە ئاوڕی لە زمانی کوردی داوەتەوە. . . سەبارەت ڕێگەی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی دواوە.

156 ـ ج. ڕۆژبەیانی، ویژ، گۆڤاری «بڵێسە»، ژ9، ساڵی 1، سلێمانی، 1960،ل 42 ـ 43.

ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە لە وشەی [ویژ]و هەروەها وەڵامێکە بۆ وتاری» بەخێوکردنی زمانەکەمان بە وشەی (ویژە)ی مامۆستا تۆفیق وەهبی کە لە ژمارە (4)ی ساڵی (1)ی گۆڤاری «پێشکەوتن»دا بڵاویکردۆتەوە. (بڕوانە: باسی وتاری ژمارە 275).

157 ـ چەرکەزی بەکۆ باکاییف، زمانی کوردی ،گۆڤاری «زمانە خاوەن نووسینە تازەکانی میللەتانی سۆڤیەت»، مۆسکۆ، 1959، ل 468 ـ 474.

158 ـ یو.یو. ئاڤالیانی، کرداری لێکدراو لە زمانی

**کوردیدا، گۆڤاری «کارەکانی زانکۆی ئوزبێکستان»، ب 95، 1959، ل 137 ـ 150.**

ئەم وتارە بە زمانی رووسی‌یەو باسی ئەو کردارە لێکدراوانە دەکات کە بە یاریدەی ناو رۆنراون.

**159 ـ قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف)، دەربارەی دوو بنچینەی رۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری «کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی»، 1955، ب 29، ل 65 ـ 74.**

ئەم وتارە لە مەسەلەی دارشتن و لێکدان دەدوێ لە رۆنانی وشەی ناسادەی کوردیدا.

**160 ـ ئی. ئی. تسوکەرمان، لەبارەی یەکێتی رەگەزی نیشانەی کرداری کاتی ئێستاو حالەتی چازرەوە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووررووی زمانی کوردیدا، گۆڤاری «کێشەی رۆژهەلاتناسی»، 1959، ب 2، ل 148 ـ 155.**

ئەم وتارە لەسەر لێکدانەوەی رێژەی : 1 ـ ئەز بکەڤم، ئەزێ بکەڤم ؛2 ـ ئەز بکەتاما، ئەزێ بکەتاما . . . سازکراوە.

**161 ـ عومەر عەبدولرەحیم، فەرهەنگی نەورۆز ،گۆڤاری «نەورۆز»، ژ1، سالی 1، سلێمانی، 1959، ل 88؛ ژ2، سالی 1، سلێمانی، 1959، ل 47**

هەندێ وشەو زاراوەی هەمەچەشنەی کوردین و بەرانبەریان واتا عەرەبی یەکەیان نووسراوە.

**162 ـ شێخ حەسەن، وشەی بەڕێوەبەرایەتی و زانیاری، گۆڤاری «نەورۆز»، ژ3، سالی 1، سلێمانی، 1959، ل 37 ـ 42.**

مامۆستا شێخ حەسەن لەم وتارەدا لەوە کۆلیوەتەوە ئایا ئەوە راستە کە هەندێ کەس وشەی «بەڕێوەبەرایەتی» و«زانیاری» لەباتی دوو وشەی عەرەبی «مديرية» و «معارف» بەکاردێنن یان نا.

**163 ـ نووری عەلی ئەمین، زاراوەی زانیاری لە زمانی کوردی‌دا، گۆڤاری «نەورۆز»، ژ3، سالی 1، سلێمانی، 1959، ل 60 ـ 63.**

ئەم وتارە باسی گیروگرفتی نەبوونی زاراوەی زانستی دەکات لە زمانی کوردیداو لە کۆتاییدا بۆ دارشتنی زاراوە دوو رێگە دەست نیشان دەکات (1 ـ هەلبژاردن؛ 2 ـ داتاشین)و لێیان دەدوێ.

**164 ـ قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف)، ماناو فەرمانی پاشگری (ك ـ ەکە) لە زمانی کوردیدا، «لێکۆلینەوە لە مێژووی کولتووری گەلانی رۆژهەلات» (بۆ بیرەوەریی ئەکادێمی ئی. ئا. ئۆربیلی)، مۆسکۆ ـ لێنینگراد، 1960، ل 361 ـ 368.**

نووسەر لەم وتارەدا لە ماناو فەرمانی پاشگری (ك ـ ەکە) دواوەو لەگەل ئەو پاشگرانەدا بەراوردی کردوون کە هەمان مانا دەگەیەنن و هەمان فەرمان دەبینن.

**165 ـ عومەر عەبدولرحیم، فەرهەنگی رۆژی نوێ، گۆڤاری «رۆژی نوێ»، ژ2، سالی 1، سلێمانی، 1960، ل 14؛ ژ3، سالی 1، سلێمانی، 1960، ل 94؛ ژ4، سالی 1، سلێمانی، 1960، ل 91.**

تێکرای ئەم سێ بەشە (154) وشەو زاراوەی هەمەچەشنەی کوردین و بەرانبەریان بە عەرەبی مانایان نووسراوە.

**166 ـ کەریم زەندی، نەژادی میللەتی کورد وە بنچینەی زبانی، گۆڤاری «رۆژی نوێ»، ژ2، سالی 1، سلێمانی، 1960، ل 15 ـ 22.**

لە سەرەتای ئەم وتارەدا بە کورتی باسی دیالێکتەکانی زمانی کوردی کراوەو دوایی بە درێژی لە بەشە دیالێکتەکانی لوری کولراوەتەوەو بەراورد لەنێوانیاندا کراوە. . . رای هەندێ لە زانایان سەبارەت بە ئەسلێ زمانی کوردی خراوەتە پێش چاو و ئەو رایە رەت کراوەتەوە کە زمانی کوردی بە دیالێکتێکی فارسی لەقەلەم داوە.

**167 ـ شێخ حەسەن، زمانەکەمان، گۆڤاری «رۆژی نوێ»، ژ3، سالی 1، سلێمانی، 1960، ل 91 ـ 93.**

نووسەر لەم وتارەدا لە دوو وشەی «زبان» و «زانیاری»ی کۆلیوەتەوە.

**168 ـ لیژنە، زاراوەی بیرکار ،گۆڤاری «رۆژی**

نوێ»، ژ5، ساڵی 1، سلێمانی، 1960 ،ل 59 ـ 66؛ ژ6، ساڵی 1، سلێمانی، 1960،ل 79 ـ 87.

ئەمە کۆمەڵێك زاراوەی سەر بە (حساب) و (هندسة)و (مثلثات)ن لە لایەن مامۆستایان. ئەبوبەکر هەوری، جەمال جەلال، جەمال ئیبراهیم، ئەحمەد هەردی، عوسمان عارفەوە دارێژراوەو دانراوە... ئەمە نزیکەی (600) زاراوەیەك دەبیّو شێوەی ڕێکخستنی عەرەبی ـ کوردییە.

**169-دوکتۆر قادر شاڵی ،زاراوەی تەندروستی، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ5، ساڵی1 سلێمانی، 1960 ل 85، ژ6، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 101.**

ئەمە (66) زاراوەیەو زوربەی ناوی نەخۆشییەکانە، شێوەی ڕێکخستنی عەرەبی ـ کوردییە.

**لیژنە، زاراوەی پەروەردەی نیشتمانی، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ6، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 88 ـ 100؛ ژ7، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 122 ـ 125.**

170-ئەم زاراوانە بۆ قوتابخانە سەرەتایی‌و ناوەندییەکان لە لایەن مامۆستایان: شاکیر فەتتاح، ئیسماعیل فەرەج، ڕەفیق فەتحوڵڵا، سامی حسەین ناظم، عەبدولکەریم شێخ محەمەد، عومەر عەبدولرەحیم، محەمەد توفیقەوە ئامادەکراوە... نزیکەی (600) زاراوەیەك دەبیّو شێوەی ڕێکخستنی عەرەبی ـ کوردییە.

**171 ـ مارف خەزنەدار، زمانەوانی ،گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ6، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 23 ـ 26؛ ژ8، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 13 ـ 18؛ ژ 11، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 38 ـ 45.**

مامۆستا مارف خەزنەدار لەم زنجیرە وتارەدا سەبارەت بە نووسینی هەندێ پیت و وشەو ئامراز دواوە:

بەشی یەکەمی بریتییە لەم باسانە: «1 ـ (کوردستان) یا (کوردوستان)؛ 2 ـ واوی عەتف ؛3 ـ (ر)یا (رر)؛ 4 ـ (زمان) یا (زبان)».

لە بەشی دووەمدا لەبارەی «1 ـ (دووەم) یا (دوهەم)؛ 2 ـ ناوی عەلەم؛ 3 ـ (سلێمانی) یا (سولەیمانی) یا (سلەیمانی)؛ 4 ـ (یەکێتی سۆڤیەت) یا (یەکێتی شوورەوی)؛ 5 ـ (ناوەڕۆك) یا (ناواخن) »ەوە دواوە.

بەشی سێیەم دەربارەی «1 ـ کابرایی ـ کابرایێك) یا (کابرایە ـ کابرایەك)؛ 2 ـ (لەدایك بوون) یا (زایین)؛ 3 ـ (تیپ) یا (پیت)»ە

**172 جەمال نەبەز، زاراوەکانی لیژنەی (ریاضیات) لەژێر وردەبینی لێکۆڵینەوەدا، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، بەشی یەکەم، ژ6، ساڵی 1، سلێمانی، 1960 ،ل 102 ـ 109، بەشی دووەم، ژ7، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 112 ـ 121؛ بەشی سێیەم، ژ8، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 85 ـ 91؛ بەشی چوارەم، ژ11، ساڵی 1، سلێمانی ،1961، ل 106 ـ 111...**

ئەم زنجیرە وتارە لەبارەی ناتەواوی‌و کەم وکورتی‌و وەرگێران و دارشتن و داتاشینی ئەو زاراوانەوە دەدوێ کە لیژنەی «زاراوەی بیرکار» دایان ناوەو لە ژمارە (5)و (6)ی ساڵی (1)ی گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»دا بڵاویان کردۆتەوە.

**173 ـ شێخ حەسەن، زمانەکەمان، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ7، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 89 ـ 91.**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی وشەی «ئاشتی»و «خوێندکار»و «گیونامە» کۆڵیوەتەوە.

**174 ـ أ. جیژنی، فراوانی زمانی کوردی، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ7، ساڵی 1، سلێمانی، 1960، ل 97:**

أ. جیژنی بۆ نیشاندانی دەوڵەمەندیی زمانی کوردی کۆمەڵێ وشەی هاوواتای بڵاوکردۆتەوە.

**175 ـ أ. جیژنی، زمانی کوردی، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ11 ،ساڵی 1، سلێمانی، 1961، ل 1 ـ 4.**

ئەم وتارە کورتە بەراوردێکە لە نێوان دیالێکتی ژووروو خوارووی زمانی کوردیدا، بەتایبەتی لە ڕووی بەکارهێنانی جێناوەکان و تێداچوونی (د)ی هەندێ وشە لە کرمانجیی ژووروداو بوونی (و) بە (ڤ)و بەکارهێنانی (ێك) وەك نیشانەی

نەناسیاوی لە کرمانجیی خوارووداو بوونی بە (ەك) لە کرمانجیی ژووروودا. . .

**176 ـ عەلائەدین سەجادی، دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ 12، سالی 1، سلێمانی، 1961، ل 11 ـ 18.**

مامۆستا سەجادی لەم وتارەدا باسی پەیدابوونی پیتەکانی (ۆ، ێ، ڵ، ڕ) دەکات لە جیهانی چاپداو بە کارو کردەوەی خۆی دادەنێ.

**177 ـ نەجمەدین مەلا، گەنجینەیەکی پڕ گەوهەری کوردان (الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة)، گۆڤاری «ڕۆژی نوی»، ژ12، سالی 1، سلێمانی، 1961، ل 21 ـ 25.**

ئەم وتارە لەبارەی فەرهەنگی «الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة»وەی یوسف ضیا پاشای خالدیەوە دەدوێ، کە سالی 1310 ك لە ئەستەموول بلاوی کردۆتەوە.

**178 ـ غەفوور ڕەشید، سەرنجێك لە پەڕاوی زاراوەی زانستی کوردی، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ12، سالی 1، سلێمانی، 1960، ل 27 ـ30.**

ئەمە لێدوانێکە لە کەم و کورتیو ناتەواوی زاراوەکانی بەشی جوگرافیای ئەو کتێبەی نەقابەی مامۆستایان بە ناوی «زاراوەی زانستی» یەوە بلاویان کردۆتەوە.

**179 ـ جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی، ڕاست کردنەوە، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ12، سالی 1، سلێمانی، 1961، ل 59 ـ 64.**

مامۆستا ڕۆژبەیانی لەم وتارەدا بیروڕای خۆی بەرانبەر هەندێ نووسین ،بەتایبەتی وتاری مامۆستا خەزنەدار کە لە ژمارە (6، 8، 11)ی گۆڤاری «ڕۆژی نوێ» دا بلاوی کردۆنەوە ،تێدا دەربڕیوە.

**180 ـ صادق بەهائەدین زمانەکەمان، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، بەشی یەکەم ،ژ1، سالی 2، سلێمانی، 1961 ،ل 77 ـ 81؛ بەشی دووەم، ژ2، سالی 2، سلێمانی، 1961، ل 14 ـ 18.**

مامۆستا صادق بەهائەدین ئەم وتارەی بە شێوەی کرمانجیی خواروو نووسیوەو هەولی داوە هەلەکانی ئەو وتارەی أ. جێژنی ڕاست بکاتەوە، کە لە ژمارە (11)ی سالی (1)ی گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»دا بلاوی کردبووەوە. . .لێرەدا نووسەر لە بارەی ڕووی بەکارهێنانی جێناوەکان و تێداچوونی (د)ی هەندێ وشە لە کرمانجیی ژووروداو بوونی (و) بە (ڤ)و بەکارهێنانی (ێك) وەك نیشانەی نەناسیاوی لە کرمانجیی خوارووداو بوونی بە (ەك) لە کرمانجیی خوارووردا. . .دواوە.

**181 ـ باوکی میدیا، شێوەکانی زمانی کوردی یەك ناگرێ بێئەوەی کۆزمانێکی کوردی پێك نەهێنرێ ،گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ2، سالی 2، سلێمانی، 1961، ل 75 ـ 76.**

ئەم کورتە وتارە هاندانی نووسەرانە بۆ دەست کردن بە سازکردنی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی.

**182 ـ طاهیر صادق، هەلەی نووسین، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ3، سالی 2، سلێمانی ،1960 ،ل 65 ـ 67.**

مامۆستا طاهیر صادق لەم نووسینەدا ڕای خۆی سەبارەت بە نووسینی وشەی دارێژراوو لێکدراوو وشەی کۆتایی هاتوو بە (ی) لە دۆخی ئیزافەداو واوی پێوەندی . . .نیشان داوە.

**183 ـ باخەوان، کوردی پەتی، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ4، سالی 2، سلێمانی، 1961 ،ل 38 ـ 39.**
**ئەم کورتە وتارە باسی دەولەمەندیی زمانی کوردی دەکات و گلەیی لەو بارە دەکا کە بووە بە هۆی ئەوەی**

هەندێ فەرمانبەران ئاخاوتنیان پڕ وشەی عەرەبی بێت.

**184 ـ باوکی میدیا، زمانی کوردی زمانێکی زیندووە، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ4 ،سالی 2، سلێمانی، 1961، ل 110 ـ 111.**

نووسەر لەم وتارەدا دژی ئەو پڕوپاگەندەیە وەستاوە، کە دەلێ زمانی کوردی زمانێکی زیندوو نییە. . . سەبارەت بە دەولەمەندیو خۆشیی زمانی کوردی هەندێ دواوەو وتەی چەند زانایەکیشی کردووە بە بەلگە.

**185 ـ شێخ حەسەن، زمانەکەمان، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»، ژ5، ساڵی 2، سلێمانی، 1961، ل 31 ـ 33.**

نووسەر لەم وتارەدا جارێکی تریش دەربارەی وشەی «زانیاری» دواوەو بە هەندێ بەڵگەی نوێ واتای لێك داوەتەوەو وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە ،کە بە هەڵە بەکاریدێنن.

**186 ـ شێخ حەسەن، زمانەکەمان گۆڤاری «ڕۆژی نوێ»،ژ6 ،ساڵی 2، سلێمانی، 1961، ل 15 ـ 17**

نووسەر لەم وتارەدا باسی (ی)ی ئیزافەو واوی عەتف دەکات و بە بەڵگەو نموونەوە وای دەسەلمێنی کە پێویستە:

1 ـ (ی)ی ئیزافەی بە دوا (ی)دا هاتوو بنووسرێ؛ 2 ـ واوی عەتف بە جیا بنووسرێو بە وشەی پێش خۆیەوە نەنووسێنرێ.

**187 ـ قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف)، گەردانی کرداری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا ،گۆڤاری «وتاری نوێنەرانی سۆڤێت لە کۆنگرەی بیست و چوارەمی ڕۆژهەڵاتناسیدا»، مۆسکو، 1961، ل 9.**

مامۆستا کوردۆ لەم وتارەدا بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خوارووو بە کورتی لە شێوەکانی کرداری تێپەڕ دواوە.

**188 ـ نڤیسینا کوردی بتیپێت لاتینی، گۆڤاری «ڕوناهی»، ژ2، ساڵی 1، بەغدا، 1960، ل 6 ـ 9.**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجی ژووروو نووسراوەو لەسەر بناغەی ئەلفوبێ (33) پیتی‌یەکەی جەلادەت بەدرخان چۆنیەتی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی شەرح دەکاو نموونە بۆ هەر یەکێك لە پیتەکانی ئەو ئەلفوبێ‌یە دێنێتەوە.

**189 ـ قەناتێ کوردۆ، تاریخا نڤسیاندن و چاپکرنا فەرهەنگێت کوردی ،گۆڤاری «ڕوناهی»، ژ7 ـ 8، ساڵی 1، بەغدا، 1961، ل 4 ـ 11.**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجی ژووروو نووسراوە و باسی مێژووی نووسین و چاپکردنی فەرهەنگە کوردییەکان دەکات.

**190 ـ صادق بەهائەدین، زمانێ کوردی ،گۆڤاری «ڕوناهی»، ژ7 ـ 8، ساڵی 1، بەغدا، 1961، ل 23 ـ 39.**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجی ژووروو نووسراوەو دەربارەی تاك و کۆیە لە زمانی کوردیدا.

**191 ـ قەناتێ کوردۆ، گرامانیکا زمانێ کوردی ،گۆڤاری «ڕوناهی»، ژ7 ـ 8، ساڵی 1، بەغدا، 1961، ل 107 ـ 110.**

گۆڤاری «ڕوناهی» وای بە پێوست زانیوە ئەو کتێبی ڕێزمانەی مامۆستا کوردۆ بۆ قوتابخانە کوردییەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیەتی نووسیوە ،بە چەند ئەڵقەیەك بڵاوبکرێتەوە. لێرەدا پێشەکی‌ی ئەو کتێبە بڵاوکراوەتەوە.

**192 ـ صادق بەهائەدین ،گراماتیکا زمانێ کوردی، گۆڤاری «ڕوناهی»، ژ1، ساڵی 2، بەغدا، 1961، ل 24 ـ 28.**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجی ژووروو نووسراوەو لە بەشە ئاخاوتنی «جێناو» دەدوێ.

**193 ـ صادق بەهائەدین، تیپ یا پیت ،گۆڤاری «ڕوناهی»، ژ2، ساڵی 2، بەغدا، 1962،ل 8 ـ 9.**

نووسەر لەم وتارەدا کە بە شێوەی کرمانجی ژووروو نووسیوێتی لەوە دەدوێ کە بۆ «حرف»ی عەرەبی لە دوو وشەی «پیت» یان «تیپ» کامیان ڕاستترە بەکاربهێنرێ.

**194 ـ یو. یو. ئاڤالیانی ،هەندێ حاڵەتی ئیدیۆمی کرداری لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری «کارەکانی زانکۆی ئوزبێکستان، ژ113، 1961 ،ل 85 ـ 99.**

ئەم وتارە بە زمانی ڕووسی‌یەو باسی ئەو ئیدیۆمانە دەکات، کە کردار دەوری سەرەکی لە ڕۆنانیاندا دەبینێ.

**195 ـ یو. یو. ئاڤالیانی ،کرداری لێکدراوو کێشەی کرداری تێپەڕو تێنەپەڕ لە زمانی کوردیدا ،«کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی فیلۆلۆژیی ئێرانی»، لێنینگراد، 1962، ل 3 ـ 5.**

ئەم نووسینە کە بە زمانی ڕووسی‌یە کورتەی ئەو وتارەیە، کە یو. یو. ئاڤالیانی لەو کۆنفرانسە زانستی‌یەدا خوێندوویەتی‌یەوە، کە شارەزایانی زمانە ئێرانی‌یەکان ساڵی 1962 لە زانکۆی لێنینگراد گرتیان.

**196 ـ ئی. ئا. سمیرنۆڤا، گەردانی کرداری تێپەڕ لە دیـالێکتی خوارووی کوردیــدا، «کــورتـەی وتـارەکـانی کۆنفرانسی فیلۆلۆژیی ئێرانی»، لێنینگراد، 1962، ل 23 ـ 24.**

ئەم وتارە بە زمانی ڕووسی نووسراوەو کورتەی ئەو وتارەیە، کە ئی. ئا. سمیــرنــۆڤــا لەو کۆنفــرانســـە زانــستی‌یــەدا خوێنـدوویـەتی‌یـەوە، کە شارەزایانی زمـانـە ئێرانی‌یەکان ساڵی 1962 لە زانکۆی لێنینگراد گرتیان.

**197 ـ ئی. ئی. تسوکەرمان، شوێنی وشەی سەرەکی لە دەستەواژەی دژواتادا، «گۆڤاری فەلەستین»، مۆسکۆ، لێنینگراد، 1962، ب 7، ژ70، ل 159 ـ 161.**

ئەم کورتــە وتـارە کە بە زمـانی ڕووسی‌یـە لەسـەر بنچینـەی لێکۆڵینەوەی دەستەواژەی وەك: «دایك و باوك»؛ شەو و ڕۆژ»؛ «ژن و پیاو»؛ «ئەرزو ئاسمان» . . . دامەزراوە.

**198 ـ چەرکـەزی بەکـۆ (بـاکــایـێف)، مێــژووی لێکـۆڵینـەوەی زمـانی کوردی لە ڕووسیـاو یەکێتی سۆڤێت، «لـەبـارەی مێـژووی لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانی‌یەکانەوە»، مۆسکۆ، 1962، ل 100 ـ 117.**

مامۆستا بەکۆ لەم وتارەدا، کە بە زمانی ڕووسی نووسویەتی، باسی زوربــەی ئەو کارە زمـانــەوانی‌یـانـەی کردووە کە بەر لە شۆڕشی ئۆکتــۆبــەر لە ڕووسیــای قەیســەری‌و دوای شۆڕش لە یەکێتی سۆڤێت لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراون.

**199 ـ یو. یو. ئاڤالیانی، دەستووری ڕیژەی کردار لە زمانی کوردیدا (دیالێکتی کرمانجیی خواروو)، «کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی ڕۆژهەلاتناسان»، باکۆ، 1963، ل 6 ـ 7.**

ئەم وتــارە بە زمــانی ڕووسـی‌یــەو کورتــەی ئەو باســەی ئاڤالیانی‌یە، کە لە کۆنفرانسی ڕۆژهەلاتناساندا، کە لە (11 تا 16)ی حوزەیـران 1963 لە باکـۆ بەستـرا، خوێندوویەتی‌یەوە.

کورتەی ئەم باسانە لە لایەن زانکۆی ئازربایجانەوە چاپکراوە.

**200 ـ چەرکــەزی بەکـۆ (بـاکـایێف)، هێـز لە بەشـە دیالێکتی کوردی تورکمەنستاندا، «کۆکراوەی ئێراناسی»، مۆسکۆ، 1963، ل 166 ـ 172.**

ئەم وتــارە بە زمــانــی ڕووســی‌یــەو لەوە دەدوێ کە هێــز (النبرة ـ S ress) لە بەشــە دیــالــێــکــتــی کوردی تورکــمــەنــســتــانــدا لەچ شوێنێکی وشەدا دادەنرێ‌و دەوری چی‌یە . . .

**201 ـ د. ن. مەکـەنـزی، کـرمانجی‌و کوردو گۆران، گۆڤـاری «میللەتـانی ئاسیاو ئەفەریقا»، مۆسکۆ، 1963، ژ1، ل 162 ـ 170.**

**202 ـ ئی. ئی. تســوکــەرمــان، سەرنــج لەبــارەی فۆنـەتیکی زمـانی کوردییـەوە، «کـۆکـراوەی ئێـراناسا»ن، مۆسکۆ، 1963، ل 159 ـ 165.**

ئەم وتارە بە زمانی ڕووسی نووسراوەو لەبارەی بوونی (ژ) بە (ی ـ ژ) یەوە دەدوێ.

**203 ـ ئی. ئی. تسـوکـەرمـان، مانای فۆرمی لێکدراو (بـە کەرەستـەی زمـانی کوردی)، «گـوڤـاری ئەنجـومەنی زانستی ئامۆژگای زمانناسی»، لێنینگراد، 1963، ل 14 ـ 15.**

ئەم نووسینە کە بە زمانی ڕووسی‌یە کورتەی ئەو وتارەیە کە تسـوکـەرمـان لە کۆڕێکی فراوانی ئەنجـومەنی زانستی ئامۆژگای زمـانـنـاسی لە لێنینگـراد خوێندوویەتی‌یەوەو بە کەرەستەی زمانی کوردی واتاو مانای وشە لێکدراوی لێك داوەتەوە.

**204 ـ قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف)، پاشگر لە زمانی کوردیـدا، «کـورتـەی هەواڵـەکـانی ئامـۆژگـای میللەتـانی ئاسیا»، ژ67، 1963، ل 32 ـ 37.**

ئەم وتــارە بە زمــانی ڕووسی یــەو نووســەر لە زوربــەی ئەو پاشگــرانــە دواوە تێــدا، کە ناوە ئاوەڵنــاوو ئاوەڵکــار سازدەکــەن و بەسەر چەند گرووپێکدا دابەشی کردوون.

**205 ـ ئی. ئی. سمیرنوڤا ،پێوەندیی ڕەگەکانی کردار لە زمــانی کوردیــدا (دیــالێکتی سۆرانی)، «کــورتــەی هەواڵەکانی ئامۆژگای میللەتانی ئاسیا»، ژ67، 1963، ل 38 ـ 40.**

نووسەر لەم وتارەدا کە بە زمانی ڕووسی نووسیوێتی دەربارەی پێــوەنــدیی نێــوان ڕەگی کرداروبنــاغــەی کردار لە دیــالێکتی کرمانجیی خوارووودا دواوە.

**206 ـ ئی. ئی. تسوکــەرمان ،دیــاریکــردنی واتــای کرداری تێپــەڕ لە زمــانی کوردیــدا، «گۆڤاری فەلەستین»، ب11، ژ74 ،مۆسکۆ ـ لێنینگراد، 1964، ل 39 ـ 44.**

ئەم وتارە بە زمانی ڕووسی یە. نووسەر لەم وتارەدا لە ڕێگەی هێنانەوەی چەند نموونەیەکی کرداری تێپەڕو تێنەپەڕەوە لە هەندێ فەرهــەنگی کوردیو بەراوردکــردنیــان و نیشــانــدانی دەوریــانــەوە هەوڵیداوە ماناو واتای کرداری تێپەڕ دەست نیشان بکات.

**207 ـ ئی. ئی. تسوکەرمان، خاسیەتی ڕستەی نیهاد ڕستــەیی لە زمــانی کوردیــدا، «گــوڤــاری فەلەستین» ،ب 13، ژ76، مۆسکۆ ـ لێنینگراد، 1965، ل 160 ـ 165.**

ئەم وتارە بە زمانی ڕووسی یە و نووسەر لەسەر بناغەی هەندێ تێکــستی فۆلکلۆر لەو جۆرە نیهــادانــە دواوە تێــدا، کە نە بە وشــەیــەك یان بە دەستــەواژەیــەك هاتــوون ،بەڵکو بە ڕستەیەکی سەرلەبەر دەربڕراون.

**208 ـ محەمەد صالح سەعید، پیتی (ە) لە کوردیدا، گۆڤاری «گزنگ»، ژ1، ساڵی 1، سلێمانی، 1967، ل 5 ـ 8.**

نووســەر لەم وتــارەدا لەم ئەرکــە جۆر بە جۆرانــە دواوە، کە دەنگی بزوێنی (ە) لە زمانی کوردیدا دەیبینێ و شازدە ئەرکی بۆ دەست نیشان کردووە.

**209 ـ محەمەد صالح سەعید، زمانی کوردی و پیتی (و) لەگــەڵ (ی)دا، گۆڤــاری «چیــا»، ژ2، ساڵی 2، سلێمانی، 1968، ل 23 ـ 33.**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا لە جۆرەکانی دەنگی (و) و (ی) دواوە و لە دواییشدا ئەرکەکانی بە دوور و درێژی باس کردوون.

**210 ـ ؟، اللغة الكردية، گۆڤاری «چیا»، ژ2، ساڵی 2، سلێمانی ،1968 ،ل 5 ـ 8.**

ئەم وتارە بە زمانی عەرەبی یە و دەربارەی پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی دەدوێ لەوە دەچێ مامۆستا محەمەد صالح سەعید بێ.

**211 ـ قەنــاتی کوردۆ (کــوردۆیێف)، شوێنی وشــەی پێــوەنــدی لە زمــانی کوردیــدا «نــووســراوە دێــرینــەکــان و مەســەلــەی مێــژووی کولتــووری گەلانی ڕۆژهــەلات»، لێنینگراد، 1969، ل 136 ـ 138.**

نووســەر لەم کورتــە وتــارەدا کە بە زمانی ڕووسی نووسیوێتی بەتایبەتی لە وشەکانی (ژ ـ ش /یش) دواوە.

**212 ـ زارێ یوسف، فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی، «نــووســراوە دێــرینــەکــان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات»، لێنینگراد، 1969، ل 167 ـ 169.**

نووسەر لەم وتارەدا کە بە زمانی ڕووسی نووسیوێتی، کەمێ دەربارەی شێوەی کارکردن و شێوازی دانانی ئەو فەرهەنگە کوردی (کرمانجیی خواروو) - ڕووسی‌یە دەکات، کە لەگەڵ قەناتی کوردۆدا خەریکی دانانی بوون[7]

213 - م.ب. ڕودێنکۆ، هەندێ تایبەتێتی زمانی ئەدەبیی کوردی سەدەکانی ناوەڕاست، گۆڤاری «فیلۆلۆژیی ئێرانی»، مۆسکۆ، 1969، ل 104 - 107.

نووسەر لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە لە داستانی «یوسف و زلێخا»ی سەلیمی سلێمانەوە هەندێ تایبەتێتی زمانی کوردیی ئەو سەردەمەی لە بەکارهێنانی وشەو ڕێژەدا دیاری‌کردووە.

214 - ئی. ئی. تسوکەرمان، نیشانەی نەناسیاویی کۆ لە بەشە دیالێکتی خۆراساندا، گۆڤاری «فیلۆلۆژیی ئێرانی»، مۆسکۆ، 1969، ل 107 - 110.

ئەم وتارە بە زمانی ڕووسی‌یەو نووسەر دەربارەی نیشانەی (ینی / نی)ی کۆی نەناسیاوی دواوە تێیدا.

215 - زارێ یوسف، لەبارەی تایبەتێتی بەکارهێنانی پریپۆزیشنی (بۆ)وە لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا، گۆڤاری «فیلۆلۆژیی ئێرانی»، مۆسکۆ، 1969، ل 111 - 113.

ئەم وتارە کە بە زمانی ڕووسی‌یە بە کورتی باسی زووربەی ئەو تایبەتیانەی تێداکراوە کە لە بەکارهێنان و دەورو گەیاندنی واتای پریپۆزیشنی (بۆ)دا هەیە.

216 - جەمال شالی، نووسینی کوردی و پێشخستنی، گۆڤاری «سلێمانی»، ژ8، ساڵی 1، سلێمانی، 1969، ل 14 - 20.

نووسەر لە سەرەتادا باسی ڕەوانی و خۆشی و دەوڵەمەندیی زمانی کوردی دەکات و چەند کتێبێکی کوردی دەکاتە نموونە... بۆ پەرەپێدانی زمان و نووسینی کوردی هەندێ تیبینی خستۆتە پێش چاو... دەربارەی دانانی زاراوە و دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤاردواوە.

217 - ئیبراهیم عومەر قازی، چاپەمەنی تازە، گۆڤاری «سلێمانی»، ژ10، ساڵی 1، سلێمانی، 1969، ل 25 - 30.

نووسەر لەم وتارەدا نامیلکەی «دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی»ی هەڵسەنگاندووە، کە مامۆستا أ.ب. هەوری ساڵی 1968 بڵاوی‌کردۆتەوە.[8]

پەراوێزەکان:

(6) ئەم وتارە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی کوردی، بڕوانە: پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ، هەندێك بیروباوەڕی هەڵە لەبارەی زمان و مێژووی کوردەوە، بەغدا، 1973 - 1974، ل 69 - 105.

(7) ئەم فەرهەنگە ساڵی 1983 بڵاوکراوەتەوە. دەربارەی ئەو بەرهەمە، بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، هەوڵێکی مەزنی نوێ لە جیهانی فەرهەنگە نووسی کوردیدا، گۆڤاری «کاروان»، ژ17، هەولێر، 1983، ل 22 - 29.

(8) بەداخەوە بۆ نووسینی ئەم باسە، نەك هەر هەندێ گۆڤاری کوردیمان دەست نەکەوت، بەڵکو نەشمانتوانی باسی ئەو وتارانە بکەین، کە بە هەندێ زمانی ڕۆژئاوایی یان ڕۆژهەڵاتی نووسراون. هیوامانە لە دەرفەتێکدا ئەو کەلێنە پڕبکەینەوە.

1985/3/12

بابـەتی «عـەلی تەرەمـاخی»و یەکـەمین ڕێزمان نووسی کورد، پێویستی بەلێدوان و لێکۆڵینەوەی زانستانەی دی هەیە، چاوەڕێی لێکدانەوەی شارەزایانی تری بواری زمانەوانین.

«ڕۆشنبیری نوێ»

# بەلێ .. عەلی تەرەماخی

## یەکەمین ڕێزمان نڤیسێ کوردە

حجی جعفر

هێژا «رەشید فندی»د گۆڤارا رۆشنبیرێ نوێدا، ژمارە (103 - 104)، سالا 1984، گوتارەك پر بها بناڤ و نیشانێت (بۆچی عەلی تەرەمـاخی ئێکـەمین رێـزمـان نڤیسێ کورد نە بیت؟) بەلاڤەکریە، د پێشەکیا ڤێ گوتارێدا دکەڤتە گەنگەشەکا زانیاری د گەل‌وان نڤیسـەڤـان و رۆشنبیرێت ل سەر (دەستـوارا زمـانێ عەرەبی ب کوردی)، یا زانایێ هێژا عەلی تەرەماخی نڤیسی[1].

گەنگەشا ڤێ پێشەکیێ ل سەر هندێیە، ئایا عەلی خەلکێ «تەرەماخ»ە[2]، یان ژی خەلکێ «تەرمووك»ە[3]؟

ئایا ئەڤ زانایە شاعیر بویە ،یان نەء؟

پاشی بۆ خوێنـدەڤـانی خویـا دکـەت کو عەلی تەرەمـاخی ئێکەمین رێزمان نڤیسێ کوردە و خەلکێ «تەرەماخ»ە[4].

لێ گوتـارا مە خۆ لدور هنـدێ نا هەلاڤێـت، کا «عـەلی تەرەماخی‌یە»، یان ژی «عەلی تەرموکی‌یە»؟

شاعیر بویە، یان نەء؟

ئارمانجا ڤێ نڤیسـینێ تنێ ئەوە بەرسڤا ڤێ پرسیارا خوارێ بدەت:

«ئایا ئەم دکارین وێ رێزمانا عەلی تەرەماخی ب سەرەتایەك بچویك بۆ نڤیسینا رێزمانا کوردی دانین؟»

پشتی من «دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی» یا عەلی

تەرەماخی بیاشی خواندی، من دەست هاڤێتە خواندنا گوتارا کاك «رەشید»، ئەو ژی من باش خواند لدیف را گوتارا رؤوف ئەحمەد ئالانیم خوند «ه»، پاشی ئەز گەیشتمە هندێ، کو ئەز نە شێم بەرسڤا وێ پرسیارا هە بدەم هەکە ل سەر وان نموێنێت رێزمانا کوردی نە ئاخفم بێت کو عەلی تەرەماخی نڤیسین، چونکی:

1 ـ هەتا نهۆ کەسێ ئەڤ نمۆنە لێك نە داینە و شروڤە نە کرینە، کا هەتا چ رادەیەك عەلی تەرەماخی د رێزمانا کوردیدا راست بویە؟

2 ـ ب لێك دان و شەکرنا وان نمونا، دێ گەهینە راستیێ، کا تەرەماخی ئێکەمین رێزمان نڤیسێ کوردە، یان نەء؟

3 ـ هێژا رەشید فندی د بەرسڤەکێدا گوتیە، شیکرن و شەکرنا رێزمانا تەرەماخی و پێدا چوونا وێ ،بلا ژ ئێکێ دیرا بیت [6].

ب راستی عەلی تەرەماخی (1591 ـ 1592) ب سەرەتایەك موکم دەست ب رێزمانا کوردی کریە، هەرچەندە مەخسەدو مەبەستا وی نە بویە رێزمانا کوردی شروڤەکەت، بەلێ نە چار بویە جار جارا دگەل رێزمانا فارسی هندەك سەر قەلەمێت تیژو بها ل رێزمانا کوردی ژی بدەت.

ئەمێ نهۆ ب وان نمونادا چینە خوارێ یێت کو عەلی تەرەماخی ل سەر رێزمانا کوردی نڤیسین، داکو بکارین بەرسڤا پرسیارا خۆ بدەین.

1 ـ «فرمان ـ فعل»:

تەرەماخی دبێژیت:ـ

(د زمانێ کورمانجیدا پێنج صیفە دەر دکەڤن، زێدە نابێ وەکو نها:

(دچی)، (دچە)، (دچن)، (دچم)، (دچین)، أفعالید مایی ژی لڤان قیاس بکە، ئەڤنە پێنج صیفات ژی ضمایرێد کورمانجی هەنە وەکو نها:

تو، ئەو، هون، ئەوان، ئەم، مە، ئەڤە شەش ضمیرە ژی، ضمایرێد وان أفعالانە، دگەل وان تێنە عەملاندن....) [7].

وەکی هون دبینن، ئەڤ بۆ چوونە گەلەك یا ب قوەتە، هەرچەندە کێماسییا بێ بار نە بویە...

یا راست شەش صیفە د تصریفا فعلێدا هەنە ،بە پێ دەم و کەس و ژمارە، نەکو پێنج وەك:

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | ئەز دچم | ئەم دچین |
| دووەم | تۆ دچی | هۆن دچن |
| سێهەم | ئەو دچە | ئەو دچن |

بەلێ ئەم دکارین بێژین (وان) خوار، بۆ کەسێ سێهەمی کۆ وەکو دیارە راناوێ (مە)، لهرە جهێ خۆ نینە ،چونکی د گەل فرمانا تێنەپەر (لازم) بکار ناهێت.

● دبحثا مصدریدا دبێژیت.

(... مصدر جهێ صدورا افعالانە... مثلاً وەکو نها: (کرین، برین، خورین) یانی مطلق (کرین)و (برین)و (خورین) مرادە، پاشی وەکو صیفە ژێ جودا دبن، وی وەختی فعل و فاعل و مفعول ماضیو مضارع ژێ معلوم دبە...) [8].

گەلەك راستە دەمێ دبێژیت، چاووگ سەرچاوەی فرمان و بکەرو بن کارە........بەلێ (کرین، برین، خورین) نابنە چاووگ!

بەلکو (کرن، برن، خوارن) چاووگن......

هەروەسا کێماسییێت ڤێ گوتنێ ئەوە کو ،زنجیرا رستا خۆ شێلایە!

ـ فعل و فاعل و مفعول و ماضیو مضارع ـ دڤییا هۆ بایە (فعلا ماضیو فاعل و مفعول.....)

کێماسییا دی چ مصدر بۆ مە نە هینایـنە و فرمان و ناڤێ بکەدیو ناڤێ بن کاری ژێ دروست کربیت وەك:ـ

| | | فرمان | | |
|---|---|---|---|---|
| چاووگ | رابردوو | نهۆ | داهاتوو | داخوازی |
| خواردن | | دخۆم | دێخۆم | بخۆ |

ناوی‌بکەر ناوی‌بن کار

خورا خواری

رابردووی (سادە) دوور تەواو بەردەوام

(خوار) (خواربوو) (خواریە) (دخوار)

هەر دڤی فصلی‌دا تەرەماخی دبێژیت:-

(دکرمانجیدا ژی عەلامەتێ فعلا مضارع داله د ابتدادا دبه، ئەگەر فعل متعدی‌بە، مثلاً وەکو نها:

(دده)، (دبـه)، (دچـه)، ئەگـەر فعـل لازم بی ایجاری ئەو دال د ئاخرێ فعلێدا هەیە، وەکو نها:

(سوار دبه)، (رادکه)، (رادبه) ....)[9].

ب راستی تەرەماخی شەهرەزایێ رێزمانا کوردی بویە، بەلێ هەمی گاڤا ئارمانج نه هەنگاڤتی‌یە، راستە نیشانا فرمانا «د»یە بەلێ، دچیتە پێش فرمانا تێ‌پەرو تێ‌نەپەر (متعدی‌و لازم) نەکو دچیتـه دویمـاهیـا فرمـانـا تێ‌نـەپـەر (لازم)، وەکـو تەرەماخی بۆ دچیت، نمونا (دده، دچه، دبه) هەمی دراستن.

بەلێ فرمـانـا «دچـه» متعـدی نینه، بەلکو لازمە.... هۆسا تەرەماخی نه کاریە فرمانا تێ‌پەرو تێ نەپەر ژ یەك جودا بکەت.

دبحثا اسمێ فاعلیدا دبێژیت:

(لاکن د الفـاظێـد کورمـانجی بخـو سەر اسمێ فاعل بلفظ بتنێ نابێ، بەلکو لازمە لفظا «ای» دبەری وی کەلامی بێتە ذکر کرین، وەکـو نهـا ژ بوی مفـردان دبێـژی (ای کوشتی)، (ای کری)، (ای خوری)، ئەڤنە مفردین چە مذکر چە مؤنث، چە حاضر، چە غائب)[10]

هەکە هیرك هیرك بەرێ خۆ بدەینە نمونێت ژووری، دێ بۆ مە دیار بیت کو (ای کوشتی)، (ای کری)، (ای خوری)، نابنە ناڤێت بکەر «اسم فاعل» بەلکو «کوشتی»، «کری»، «خوری» یان «خواری»

هەر سێ ناڤێت بن کارن «اسم مفعـول»ن ئەممـا «ای یاکـو تەرەمـاخی هینـای‌و دبێـژیت نیشـانـا ناڤێ بکـەرە!! یا راست ئامرازێ بانگ کرنێ‌یە،

وەکو:

(ئەی هەڤالۆ! دەلالۆ !تۆ هەر تشتی د زانی)[11].

یان:

ئەی فەلەك !فەلەك! ئەی زالم فەلەك!

کا ئەو کوردستان؟ کا برجێ بەلەك؟[12].

بەلێ گەلەك راستە دەمێ دبێژیت:-

(ئەمما ئەسمێ فاعلێد تثنیەو جمعێد زمانێ کورمانجی بغیرژ لفظا (ای)د ابتدادا ،د ئاخریدا لفظا نون و هایەك دبێ........

مثـلاً وەکـو نهـا: (ای کوشـتنـە)، (ای کری‌نـە)، (ای خوری‌نە)، یانی ئەو تثنیە و جمعێد کو کوشتنە .و کرینە و خورینە)[13]

لێ دیسـان (کـوشتنـەو، کرینە ،خورینە) ناڤێت بکەر نینن، بەلکو ناڤێت بن کارن «اسم مفعول» ناڤێت بکەر ژ وان دێ بنە:-

مێرکوژ - کەرا - خورا

نمونە:

(کەراڤ خوراڤ، نه کەرۆ دل کەسەرۆ)[14].

دبحثا ئەسمێ مفعولیدا دبێژیت:-

(لاکن د ئەسمێ مفعولی زمانێ کورمانجیدا د ئاخریدا لفظ (یا) دبی ئەو عەلامەتێ ئەسمێ مفعولی‌یە، وەکو نها:

(کـوشتی) و(بـری) و(گـرتی)، ئەڤنـە ناڤن ژ بوی مفـردێـد مقتول و بری‌و گرتیان، یانی مفردەك هاتیە کوشتن و برین و گرتن چ مذکـر، چ مؤنث، چە غائب، چە حاضـر، ئەممـا تثنیـەو جمـعـێـد وان ژی یا الـف یاو نون دبن ،مثـلاً وەکـو نهـا: (کـوشتیـان، بریـان، گرتیـان) ئەڤنـە ژ بوی تثنیـە و جمعێـد مفعولانە، یانی ئەڤنە ئەسمێ ژ بوی تثنیە و جمعێد مقتولان و کوشتی‌وبری محجوسان، چە مذکر ،چە مؤنث ،چە حاضر، چ ژی غایبە)[15] گەلەك راست و دروست (عەلی تەرەماخی) بۆ

ڤی بابەتی چوویە دەمێ دبێژیت لفظا (یا) عەلامەتێ بن کارە (اسم مفعول)، بەلێ پەیڤا (کوشتی)، جار کریە ناڤێ بکەر جار کریە ناڤێ بن کار، وەکو وە دیتی.

دیسان ب راستی نیشانا کومبینێ دیار کریە.

دبحثا نهی‌یدانە دبێژیت:

(نـەهیـا کورمـانجی ژی حسیبکـە کو ئەو ژی مثلێ نەهیـا فارسییە، ئەو ژی بمیم و نونە وەکو نها دبێژی:ـ

(مەکە)، (مەکن)، (نەکە)، (نەکەن)، (ناکەم)، (ناکین).[16]

ئەڤـە ژی راستـە ،بـەلێ روون نەکـریە کا چ دەم دێ (نە، مە، نا) بکارهێن.

نە: بۆ نەهیێ بوریە، وەك: نە چوو ـ نە خوار.. هەروەسا بۆ نەهیا داخوازی بکاردێت ،وەك: نە کە، نە خو، نە چە...

نا: بۆ نەهیا نهۆ بکاردێت، وەك:

نا چم، نا چین، نا کەین....

مە: بتنێ بۆ نەهیا داخوازیە و جوداهی دناڤ بەینا (مە) و (نە) نینە لڤی حالەتی، وەك: مە چە ـ نە چە، مە خۆ ـ نە خۆ..

دبحثا غایبدانەو ضمایرێدا، دبێژیت:

(ضمایرێد غایبێد زمانێ کورمانجی ژی حسێبکە وەکو زمانێ فارسییە:

(ئەو، ئەوی ،وان، ئەوان) ضمایرێد غایە ئەڤنە معلومی تەیە)[17].

یاراست:

(ئەوی، ئەوێ ئەوان) نابنە راناو بەلکو (اسماء الاشارە)نە

راناو ئەڤەنە:

(ئەو، وی ،وێ، وان).

بەلێ راست گوتیە دەمێ دبێژیت:

(توو، ئەز ئەم، هون) راناوێت نهۆنە.

دبحثا ئەسمادا دبێژیت:

(ئەسمایێد کورمانجی ژی مفرد جودانە، وەکو نها (مروڤ، دار، هەسپ) ئەڤنە مفردین یانی فردەك ژ ڤانا، لاکن تثنیە و جمعێـد وانـا ژی وەکـو فارسیـان بالف و نونان تێ‌تن وەکو نها: (مـروڤـان)، (داران)، (هسپـان) ئەڤنـە ژ بوی تثنیـەیی ژیو جمعێ ژی تێ‌تن و فەرقا مذکرو مؤنثی ژی نابێ، یانی ژڤانا هەردوو یانی ژ ڤانا جماعەتەك هەر دو ژی دبن)[18].

گەلـەك راستـە نیشـانـا کومبینێ (الف و نون)ە دڤـان ناڤـدا ،بەلێ دەمێ دبێژیت، (ئەڤنە ژ بو تثنیەیی ژی و جمعێ ژی تێ‌تن و فەرقـا مذکـر و مؤنثی ژی نابێ....)، ئەڤـە راست نینە، چونکی هەکە راست بیت بۆ (داران، مرۆڤان)، راست نینـە بۆ (هـەسپـان)، چونکی (هـەسپ) بخـو دنێـرن، لێ بەرامبەری هەسپی ماهینە.

کێماسییادی لهرە ئەوە، کو چ بەحسێ ئامرازێ (ێد، ێن)ـ کو ئامرازێت کومبینێ‌نە ـ نە کریە.

دبحثا ئەسمایێد الأشارة، دبێژیت:

(اسماء الأشارەتێد کورمانجی ژی هن، وەکو نها:

(ئەڤ ژ بوی حاضری مفرد، چە مذکر، چە مؤنث، (ئەڤنە) و(ئەڤانا)ژ بوی تثنیەو جمعێد حاضران بلا فەرق، (ئەو)ژ بوی مفـردێ غایبـە، (وە) ژ بوی مفـردێ مخـاطبێ حاضـرەیـە بلا فەرق، (وان)، (ئەوان)، ئەڤ هەردو ژی ژ بوی تثنیە و جمعێد غایبانن بلا فەرق)[19]

گەر ب وردی بەرێ خۆ بدەینە ڤێسینا ژووری دێ بۆ مە دیار بیـت

کو چەنـد تێکـەلی هاتیـەکـرن، دنـاڤ بەرا، (اسمـاء الأشارة)و راناوا، وەك: (وە، وان) راناون نەکو (ئەسماء الأشارة) نە.

دیسان چەند ناڤێت نیشانە ژبیرکرینە وەك:

(ڤی، ڤێ، ئەڤ، ئەڤێ، ئەوی، ئەوێ).

دبحثا ندادا ـ،دبێژیت:

(دزمـانێ کورمـانجی ژی حرفـا ندایی لفـظ (أو) وەکـو نهـا دبێژی: (أو محو)، (أو عیشێ)، یا یا دئاخرێ عەلامەتێ تانیثی‌یە)[20].

راستە (ێ) نیشانا مێ‌یە، بەلێ (ۆ) ژی نیشانا نێرە هەروەسا

راسته (ئو) نيشانا بانكرنێيه، بەلێ پا يا بتنێ نينه چونكى ئەڤ ئامرازێت خوارێ ژى ئامرازێت بانكرنێنه:

(ئەى، يا، وا، ئه...)[21].

دبحثا ئەستفهاميدا، دبێژيت:

(دزمانێ كوردى ژى، وەكو نها ،بێژى كو:

(آيا سەرێ هەيڤێ بويه)، ئەڤژى استفهاما كورمانجيه)[22].

پەيڤێت دى ژى هەنه بۆ پرسيارێ وەك:

(ئەى، كى، كەى، كەنگى، كا، كوا، كو، كيژان، چەوا ،چەند، گەلو، چڤا....)[23]

دبحثا مضاف و مضاف اليەدا، دبێژيت:

(لاكن د زمانێ كورمانجيدا عەلامەتێ ئيضافەيى (يايه)د ئاخرێ مضافيدا، لفظ دبى، ئەو عەلامەته، ئەڤنه مضاف و مضاف إليەنە مثلاً وەكو نها: (هەسپێ خواجه)، (كورێ مەلا)، (غولامێ مير) ئەڤ يايه دەلالەت دكه كو ئەڤنه مضاف و مضاف إليەنه.)[24]

راسته (ێ) نيشانا (مضاف و مضاف إليه)، بەلێ (الف) ژى نيشانا مضاف و مضافێ إليه.

(ێ) بۆ نێرينەيه، (الف ـ أ) بۆ مێينەيه وەك:

كورێ مير ـ كچا مير.

دبحثا نەسبێدا دبێژيت:

(دلسانێ فارسى‌و كورديدا ژى (بصرەوى)، (شامى) بكوردى.)[25]

لهـره مەبـەست ئەوەيه كو (ى) لديماهيا ناڤێ (شام) يا (النسبه) يه، ئۆ راسته ،وەك هەولێر ـ هەولێرى، دهوك ـ دهوكى.

هەتا نهۆ هەنه ڤێ (ى) دگەل (ى)يا مەعنەوى ژ يەك جودا ناكەن، بۆ نمۆنه:

ل پۆلا چوارێ ئامادەيى ل بابەتێ (دروست كردنى ناوى مەعنەوى) نڤيسيه:

هەولێر ـ هەولێرى

جوان ـ جوانى

هەردوو (ى)بـ يايا مەعنەوى داناينه!

بەلێ هەر هنگى ـ ل چەرخێ 16 ـ 17 تەرەماخى ب راستى ئەڤ جودا كرنه زانيه.

لديماهيێ دێ ڤێ پرسيارێ كەين:

ئايا يێ كو بەرى (400) ساله، بەحسێ:

(تصريف فعلا، راناوا، چاووگى، ناڤێ بكەرى، ناڤێ بن كارى، نيشانا نەفى، نيشانا فرمانا نهۆ، نيشانا بانگ كرنێ، نيشانا مێ، نيشانا كومبينێ، مضاف و مضاف إليه) كربيت و لێ‌ڤەكۆلابيت، دێ بيته يەكەمين رێزمان زان؟

بێ‌گومان نابيته يەكەمين رێزمان نڤيسێ كورد بتنێ، بەلكو يەكەمين پەخشان نڤيسى كوردە ژى[26]

## ژێدەرو پەراوێز

1 ـ ژ رۆژهەلاتناسا و ژ كوردان ل سەر رێزمانا عەلى تەرەماخى ئاخڤتينە وەك:

(لووس پول مارگريت، اليكسندرژابا، تومابوا، مينوروسكى، محـمـد عەلى عەونى، بلەچ شێركو، علي سيدۆگورانى، د.معروف خزنەدار، د. عزالدين مستەفا رەسول..........

2 ـ تەرەماخ: گوندەكە دكەڤيتە كوردستانا توركيا، ل ناڤ بەينا (هەكارى‌و مەكسێ) بنێرە، رۆشنبيرى نوێ ژمارە (103 ـ 104) ل 237

3 ـ ترموك: گوندەکه دکەڤیته کوردستانا تورکیا لناڤ بەینا (ماکو)و (هەکاری)، بنێرە، خلاصة تاريخ كوردو كوردستان، ل 353 من ژ هێژا صبری بوتانی ژی بهیست، کو گوندێ تەرموك هەیە، دیسان تومابوا ژی دبێژیت، (عەلی تەرموکی)، بنێرە، (مع الاكراد) ترجمة ئاواز زەنگنە، ل 145

4 ـ بنێرە، گوتارا کاك رەشید فندی ،رۆشنبیری نوێ ل 236، دیسان بنێرە گوتارا کاك ئەحمد ئالانی، رۆشنبیری نوێ ،ژمارە (103 ـ 104) سالا 1984 ل 51

هێژا ئەحمەد ئالانی، رێزمانا (تەرەماخی) دگەل ریزمانا (سعید صدقی) ژ لایێ رێنڤیسینێ‌ڤە بەراورد کریە.

6 ـ د کۆرەکێ ئەدەبیدا، ل ئێکەتیا نڤیسەڤانێت کورد، تایێ دهوکێ، کاك رەشید ئەڤ گوتنە گوت بوو..

7 ـ دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی، عەلی تەرەماخی، د. معروف خزنەدار، بەغدا، 1971، ل 47

8 ـ هەمان ژێدەر، ل 48

9 ـ هەمان ژێدەر ل 48

10 ـ هەمان ژێدەر ل 48 ـ 49

11 ـ أواو دەستورا زمانی کوردی، جەگەرخوین، بەغدا، 1961، ل 8

12 ـ هەمان ژێدەر ل 88

13 ـ هەمان ژێدەر، دەستورا زمانی عەرەبی ....ل 49.

14 ـ فلکلۆر.

15 ـ هەمان ژێدەر دەستورا زمانی عەرەبی ل 49 ـ 50

16 ـ هەمان ژێدەر ل50

17 ـ هەمان ژێدەر ل 50 ـ 51

18 ـ آواو دەستورا زمانی کوردی، جەگەرخوین، ل 72 ـ 73

19 ـ دیسان بنێرە، هاوکاری، د. وریا عمر ئەمین، ژمارە 768،

1984/12/20

20 ـ هەمان ژێدەر، دەستورا زمانێ عەرەبی ..ل 51

21 ـ هەمان ژێدەر،ل 52

22 ـ هەمان ژێدەر،ل 52

23 ـ آواو دەستوار زمانێ کوردی، جەگەرخوین، ل 86

24 ـ هەمان ژێدەر دەستوری زمانی عەرەبی،ل 52

25 ـ هەمان ژێدەر،ل 53

26 ـ هەتا نهۆ کوردێت کرمانجیا خوارێ دبێژن (مولودناما شێخ حوسێنێ قازی) یەکەمین پەخشانا کوردیە، لێ نهۆ راستیەکا دی پەیدابوو ئەو ژی نڤیسینا عەلی تەرەماخیە یاکو (300) سالا بەری مولودناما شێخ حوسێنێ قازی هاتیە نڤیسین.

1985/3/23

# نیشانەکانی کۆ لە زمانی کوردیدا

هیمداد حوسێن

**سەرەتایەك :**

باوەکو ئاشکرایە هەر زمانەو خاوەن چەند دیالێکتێکی سەرەکی وگۆڤەری تایبەتی یە، لەزمانی کوردیشدا چوار دیالێکتی سەرەکی و بنجی بەرچاو دەکەون، ئەوانیش (دیالێکتی کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووروو و هەورامی و لووڕی)ن لێکۆڵینەوە لە زمان و ڕێزمانی ئەم چوار دیالێکتە کراون، بەڵام زۆربەی لێکۆڵینەوەکان دەربارەی کرمانجی خوارووو ژوورو کەمێکیش هەورامی یە. بەگوێرەی نیشانەکانی «کۆ»ش لێکۆڵینەوەیەکی وا بەرچاو ناکەوێ وا بەتێرو تەسەلی لەهەر چواریان دوابێت. بۆیە وا لێرەدا ئەم کارە ئەنجام دەدەین، ئومێد دەکەم جێگەی خۆی بگرێتەوە.

1 ـ نیشانەکانی «کۆ» لە دیالێکتی کرمانجی خوارووداپێناسی نیشانەکانی «کۆ»:

ئەو نیشانەن، کە دەچنەسەر ناوە وەو ناوەکە لە تاکەوە دەکەن بەکۆ.

1 ـ نیشانەکانی کۆ لە دیالێکتی کرمانجی خوارووودا: ان، ات، گەل، ەها

نیشانەی ان: 1 ـ نیشانەی «ان» دەچێتە سەر ئەو ناوانەی کۆتاییان بە دەنگی نەبزوێن هاتبێ ،وەك :

ئەو ڕۆژە لەسەر قسەی کرێکاران بە تەما بووم باوکم ببینم سەرم بتراشێ.[1]

ڕۆژ + ان ← ڕۆژان

2 ـ ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە دەنگی بزوێنی «ە» هاتبوو (نیمچە بزوێنی ی ـY) لەنێوان نیشانەی «ان»و بزوێنی «ە» دروست دەبێت، وەك: تەواو تەواو وێنەیان لە مێشکمدا چەسپی بوو.[2]

هەروەها هەندێ جار ئەگەر کۆتایی ناوەکە بزوێنی «ە» بوو، لە کاتێکدا نیشانەی «ان»ی کۆ وەردەگرێ، بزوێنی «ە» لەنێوان دەچێ، بەهۆی هاتنی دوو بزوێن پێکەوە، وەك : بەپەلکە زەردە زێڕینەکانی تیشکی خۆری سبەینانی هەڵدەمژی و.....».[3]

هەروەها گەر ناوەکە کۆتایی بە بزوێنەکانی (ا ، ۆ، ێ، ی) هاتبوو، ئەوا لەکاتی وەرگرتنی نیشانەی «ان»ی کۆدا نیمچە بزوێنی (ی ـY) لەنێوان نیشانەی «ان»و بزوێنەکانی (ا ، ۆ، ێ، ی)دا دێتەکایەوە. نموونە:

(ۆ): ئەو مرۆیانەی بە ساوایی مردن[4].

(ا): زۆرینەی ئەو خاوەن بیروڕایانەی لەبارەی کۆمەڵایەتیو مرۆڤەوە دەدوێن وەها رادەنوێنن، کەمرۆڤ لەهەر پلەیەکی شارستانیدا بێت بایی ئەو پلەیە چالاکیو زانین و هۆش تێ هەڵدەکشێت[5].

(ێ): لەگەڵ هاورێیان بە وەفایە.

(ی) کورسییان مەگوێزنەوە.

هەروا ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (وو) هاتبوو، ئەوا لەنێوان نیشانەی «ان»ی کۆو بزوێنی (وو)، نیمچەبزوێنی (و ـW) وەردەگرێ، هەروەك:

لە نێو دار سەرووان چی دەکەی؟

لەگەڵ دوو رووان مەدوێ.

3 ـ ناوی ناسراو بەیارمەتی (ەکە)، دەتوانێ نیشانەی «ان»ی کۆ وەربگرێ: أ ـ ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە نەبزوێن هاتبوو:

پیاو + ەکە پیاوەکە + ان پیاوەکان

ژن + ەکە ژنەکە + ان ژنەکان

ب ـ ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە بزوێنەکانی (ا، ۆ، ێ، ی) هاتبوو، کە نیشانەی ناسیاری «ەکە»ی وەرگرت، نیمچە بزوێنی (ی ـ Y) لە نێوان دوو بزوێن دێتە ئاراوە، جاکە نیشانەی «ان»ی کۆشی چووە سەر، بزوێنی کۆتایی «ەکە» لەنێوان دەچێ.

بۆوێنە:

مامۆستا + ەکە مامۆستایەکە + ان ← مامۆستایەکان.

دراوسێ + ەکە دراوسێیەکە + ان ← دراوسێیەکان.

کورسی + ەکە دۆیەکە + ان ← دۆیەکان.

پ ـ ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە بزوێنی (ە، وو) هاتبێ، وەك بزوێنەکانی (ا ، ۆ، ێ، ی) نابێ. بەگوێرەی ناوی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (ە)، کە نیشانەی ناسراوی «ەکە» وەردەگرێ یەکێ لەپیتە بزوێنەکان دەڕواو کە نیشانەی کۆی «ان» یشی هاتە سەر بزوێنی «ە»ی کۆتایی «ەکە» لەنێو دەچێ، وەك:

نامە + ەکە ← نامەکە + ان ← نامەکان

پێچکە + ەکە ← پێچکەکە + ان ← پێچکەکان

بەگوێرەی ئەو ناوانەشی، کە کۆتاییان بە بزوێنی (وو ـW) هاتووە، نیشانەی «ەکە»ی ناسیاری وەردەگرێ و پاشان نیشانەی «ان»ی کۆش وەردەگرێو بزوێنی دوایی «ەکە» لە نێودەچێ، وەك:

سەروو + ەکە ← سەرووەکە + ان ← سەروەکان

شوو + ەکە ← شووەکە + ان ← شووەکان

●نیشانەی ات:

ئەی جامیعی دونیاو قیامەت بە خەیاڵات

ئەو رۆژە کە مردی نە ئەووت بوو نە ئەمت بوو[6]

سەرنج: نیشانەی «ات» زیاتر لەو ناوانە وەدەردەکەوێ کە غەیرە کوردین، لە عەرەبیو فارسیشدا بۆ «کۆ» بەکاردێت.

1 ـ نیشانەی «ات» دەچێتە سەر ئەو ناوانەی کۆتاییان بە نەبزوێن هاتووە، وەك: باخ + ات ← باخات

خەیاڵ + ات ← خەیاڵات

2 ـ نیشانەی «ات» دەچێتە سەر ئەو ناوانەی کۆتاییان بە بزوێنەکانی (ە، ێ، ا) هاتووە، بەڵام (بەپێی یاسایەکی فۆنەتیکی) ئەم دەنگانەش بەشداری دەکەن و دەکەونە پێش نیشانەی «ات»، [ج ، هـ، و]، نموونە:

میوە + ج + ات ← میوەجات

دێ + هـ + ات ← دێهات

سەوزە +و + ات ← سەوزەوات

شووشە + و + ات ← تاوەشووشرع

ئاغا + و + ات ← ئاغاوات

3 ـ نیشانەی «ات» کە دەکەوێتە کۆتایی ناوەکە وناوەکە لە تاکەوە دەکات بەکۆ، لە هەمان کاتدا دەتوانێ نیشانەی ناسیاری «ەکە»ش وەرگرێ، وەك:

سوزە + و + ات ← سەوزەوات + ەکە س← ەوزەواتەکە

4 ـ نیشانەی «ات»ی کۆ، کە دەچێتە سەر ناوەکەو پاشان نیشانەی ناسیاریش وەردەگرێ (وەك نموونەی سەرەوە)، **دەتوانێ**

نیشانەیەکی دیش کۆی وەربگرێ، کە ئەویش «ان»ە.
واتا دوو نیشانەی کۆ لەیەك ناودا ،وەك:
شووشە + و + ات شووشەوات + ەکە شووشەواتەکە + ان شووشەواتەکان.
دێ + هـ + ات دێهات + ەکە دێهاتەکە + ان دێهاتەکان.
● نیشانەی «ها»:
نیشـانـەی «ها» زیـاتـر لە زمـانی فارسیـدا بۆ کۆ بەکـاردێت و بەتـایبـەت بۆشتی بێ گیـان (جـامـد)، لە (فـارسی دەری - فارسی نوێ)دا بەنموونە: کتاب + ها = کتابها
سال + ها = سالها
بەڵام ئەمـرۆ لە کوردیشـداو بەتـایبـەتی لە نووسینی بواری ئەدەبیدا لەلایەن نووسەراندا باوە وجێگەی کردۆتەوە.
بۆ وێنە: لەتەك هەموو عەزاب و ژیانی هیوادا
ئەم رەنجی ساڵەهایەم کە کَشتی چوو بە بادا[7]
● نیشـانـەی گەل: نیشـانـەی گەل بە زۆری دەکـەوێتـە دوای ناوەوە، بەڵام هەندێ جاریش لە پێش ناوە وەدەردەکەوێ.
کوڕ + گەل ← کوڕگەل
سەگ + گەل ← سەگ گەل (سەگەل)
مێ + گەل ← مێگەل
گەلەگورگ [ گەل + ە+ گورگ ]ئەم «ە»یەی ناوەڕاست بۆ ئاسان کردن و سووك کردنەوەی کردنەوەیە.
نموونە: ئێوارەیە وا، دەرکەوە ساجوانە کچی دێ،
ئەی ویردی قسەو بەستەیی گشت کوڕگەلی سەرڕێ![8]
هەنـدێ باری دیش هەن بۆ کۆ کردنـەوەی ناو لەدیـالێکتی کرمـانجی خواروودا ،وەك بەکـارهێنانی ژمارە و هەندێ ووشەی واهەن ،خۆیان لە خۆیان دا واتای کۆ دەبەخشن، وەك:
دەسـم دامـێنت ئەی میللەت! لەخـوت هەرگیـز نەبی بایی
نەهێڵی خوێنی لاوانت ئەبەد بڕوا بەخۆرایی.[9]
نموونەیەکی دی:
دانیار لە تەنیشت من لەسەر قۆمەتە قرشەیەك لێی ڕاکشا.[10]
دوو بنەماڵە لە عێراق وئێرانا سەرۆکایەتی و فەرمانڕەواییان بوە.[11]
ووشـەی دیش زۆرن: چەپکێ ،دەستەیە، دەرزەنێك، لێژنە ،هۆز، برێ، کۆمەڵێ، ...هتد.
هەنـدێ جاریش بەبێ نیشـانـەو ئەو حاڵـەتـانـەی لەسـەرەوە باسمان کرد ناوەکە واتای کۆ دەبەخشێ ،وەك:
کراس لە بازاڕ گرانە.
2 ـ نیشانەکانی کۆ لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو دا ئەوەی تا ئێستـا زۆر ئاشکـراو ڕوونـە، لە دیـالێکتی کرمانجی ژووروو دا نیشانەی کۆ «ان ،ات ،ەها» ئەوا بە نموونە لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:
1 ـ ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە نەبزوێن هاتبوو، ئەوا ڕاستەوخۆ نیشانەی «ان»ی پێوە دەلکێ ،وەك:
خانێ خانان لامعێ نەجما تە هەر پڕ نوربی
× × ×
کەشتی یا بەختێ تە ئەز بایێ مخالف دوربی[12]
دل دبەندا گرها زوڵفانم
عاشقێ نازك و مەحبوبانم[13]
× × ×
سینگێ زەر مەمیانە مەمۆ زوزانێ لاوانە مەمۆ.[14]
2 ـ وەك دیالێکتی کرمانجی خواروو ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە بزوێنەکانی [ە، ا ،ێ و، ی] هاتبوو ئەوا نیمچە بزوێنی (ی - ۷) لەنێوان نیشانەکەو بزوێنی کۆتاییدا دروست دەبێت، وەك:
پێ + ی + ان = پێیان
سە + ی + ان = سەیان
مرۆ + ی + ان = مرۆیان
قومری + ی + ان = قومرییان[15]
سەرنـج :- بە پێـویستـی نازانم دووبـارەی بکەمەوە، کە چۆن نیشانەکانی (ات، ەها)ش دەکەوێتە کۆتایی هەندێ ناو و واتای کۆ دەبـەخشن. هەروەك پێشتـرێ باسم کرد، تەنهـا لە چەنـد ووشەیەکی کەم بەرچاو دەکەون نیشانەی نەناسیاری کۆ(in , n)... بۆ (هن) دەگـەڕێتـەوە کە ئەمـەش کورتکـراوەی (هنـە) هنـەك (هەندەك)ە. شێوەی (هنە وهن) لە دیالێکتی کرمانجیدا دەوری

دیارخەری دەگیرێ لەگەڵ بەخشینی واتای کۆی نەناسیاری:

هنـــە زارو گازێت تژی بەر ملا دفـرۆتن (عـەرەب شامیلۆف 298) هن خەڵـــك راسـت بەراست دشکـــەفتـــان دە روودنین (هاوار، ژمارە 34) (16)

هەر ئەم حاڵـەتـە لە دیـالێکتی کرمـانجی خواررووش بە رچاو دەکەوێ، بەتایبەتی لە ناوچەی بنگرد و پژدەر...

پار بەهارێ مالن بارکر بۆ کوێستانێ دارشمان (مەکەنزی ـ 170) (17)

3 ـ نیشانەکانی کۆ لە دیالێکتی هەورامی دا نیشانەکانی کۆ لە دیالێکتی هەورامی‌دا ئەمانەن:

(یٚ، ان، ات، گەل).

نیشـــانـەی «یٚ»: ئەو ناوانـەی کۆتـاییـان بە بزوێنی (ە، ا) هاتووە، کاتێ نیشانەیٚ «یٚ»ی کۆ وەردەگرن، بزوێنی (ە، ا) لە نێو دەچن، وەك:

بزە + یٚ ← بزیٚ (بزنان)

خونچە + یٚ ← خونچیٚ (خونچان)

کناچە + یٚ ← کناچیٚ (کچان)

برا + یٚ ← بریٚ (برایان)

گەڵا + یٚ ← گەڵیٚ (گەڵایان)

دانا + یٚ ← دانیٚ (دانایان)

بەڵام ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە نەبزوێن بوو، ئەوا راستەوخۆ «یٚ» وەردەگرێ، وەك:

کاڵەك + یٚ ← کاڵەکیٚ (کاڵەکان)

نەچیر + یٚ ← نەچیریٚ (نێچیران)

کیف +یٚ ← کیفیٚ (جزدانان)

کەڵەشێر + ← یٚ کەڵەشێریٚ (کەڵەشێران)

ئەگـــەر ناوەکـــە کۆتـــایی بەبـزوێنی (وو، ی ،یٚ) هاتبـوو، ئەوا راستەوخۆ نیشانەی «یٚ»ی کۆ وەردەگرێ:

هەرسی + یٚ ← هەرسیٚ (فرمێسکان)

کاراتری + یٚ ← کاراتریٚ (کۆتران)

مەی + یٚ ← مەیٚ (مەران)

شوو + یٚ ← شوویٚ (شووان ـ مێردان)

موو +یٚ ← موویٚ (مووان ،«موو» تاکیەتی)

زارۆ + یٚ ← زارۆیٚ (منالان)

مرۆ + یٚ ← مرۆیٚ (هەرمێیان)

نیشـانـەی «یٚ»ی کۆ دەچێتـە سەر ناوی ناسـراویش هەروەك دیالێکتەکانی دیکە.

نیشانەی ناسیاریش لە هەورامی دا بۆ نێر (ەکە)یە، بۆ مێ «کیٚ»یە.

کور + ەکە ← کورەکە + یٚ ← کورەکیٚ (کورەکان)

نەمام + ەکە ← نەمامەکە + یٚ ← نەمامەکیٚ (نەمامەکان)

پیا + ەکە ← نەمامەکە + یٚ ← نەمامەکیٚ (نەمامەکان)

پیا + ەکە ← پیاکە + یٚ ← پیاکیٚ (پیاوەکان)

ئاواراە + ەکە ← ئاوارەکە + یٚ ← ئاوارەکیٚ (ئاوارەکان)بۆنێر

ژەنە + ەکیٚ ← ژەنەکیٚ + یٚ ← ژەنەکیٚ (ژنەکان)

کناچە + ەکیٚ کناچەکیٚ + یٚ بۆمێ کناچەکیٚ (کچەکان)

سەرنـج: ئەوەی زۆر سەرنـج راکیشـەرە ئەوەیە، کە نیشانەی «یٚ» لە دیـالێکتی هەورامی‌دا نیشـانـەی «کـۆ» یشـە و نیشـانـەی (نەناسیاری) شە و کورتکراوەی «یێك»ە، وەك چۆن لە دیالێکتی کرمانجی خواروو یشدا بەرچاو دەکەوێ:

کورێك کورێ

لە هەورامیشدا، وەك:

گوڵ + یٚ گوڵیٚ

لە راستیـدا نیشـانـەی «یـوە» یش بەکـاردێ بۆ نە ناسیـاری، بەڵام «یوە» دەتوانێ بچێتە سەر ئەو ناوانەی کۆتاییان بە بزوێن و نەبـزوێن هاتـووە، بەڵام «یٚ» تەنهـا دەتـوانێ بچێتـە سەر ئەو ناوانەی کۆتاییان بە نەبزوێن هاتووە.

نیشانەی «ان»:ـ

سپەردم بە نوور بارگەی ئیمامان
چندێ نوور بەخش بۆ پەی سۆب و شامان (18)

× × ×

ئەو سەد ساك سۆ چۆوەندار جە شاخان
چ پەروا دارۆ عەرعەر جە باخان (19)

ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە نەبزوێن هاتبوو، ئەوا راستەوخۆ نیشانەی «ان»ی کۆ وەردەگرێ، وەك:

راویار + ان ← راویاران (رێبواران)

نەزان + ان ← نەزانان (نەزانان)

چەم + ان ← چەمان (چاوان)

ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە بزوێن هاتبوو، ئەوا نیمچە بزوێنی (ی - ٧) دێتە ئاراوە، وەك لەم نمونە شیعریەدا دەردەکەوێ:

دانایان وەرزش، دانش کەردەتەی
پەی ئازارێ دەرد، نیشان دان دوو بەی[20]

وە لەم نموونانەی سەرەوە وە دەرکەوت، نیشانەی «ان»ی کۆ لە دیالێکتی هەورامیشدا بەکاردێ و بەتایبەتی لە شیعری شاعیرەکان ئاشکرا دیارە.

نیشانەی ات (هات، جات):

وەك مامۆستا محەمەدەمین هەورامانی دەڵێ: پاشبەندی [هات] و [جات] وەك نیشانەی کۆ دەخرێنە پاشکۆی دوو سێ ناوێکەوە بە مەبەستی کۆ کردنەوەی هەمەجۆر.[21]

میوە + هـ + ات ← میوەهات

میوە + ج + ات ← میوەجات

دێ + هـ + ات ← دێهات

نیشانەی گەل:-

شەمی جە شەرح دووریی دووبارە
داخ هیجر وەصڵ دڵەی صەد پارە[22]

هەندێ جاریش ناوەکە خۆی لە خۆیدا واتای کۆ دەگەیێنێ:

دەسێ (دەستەیەك)، دەرزەنێ، باقە، ریز، پۆڵ، هوز، . . .

زوانێ چەنیت هەر شەو نەیۆ باس
فرقە فرقە بۆ چون سفتەی پەلاس[23]

4 - نیشانەکانی کۆ لە دیالێکتی لووری دا :نیشانەکانی کۆ لە دیالێکتی لووری دا ئەمانەن:

[و، یا، ان

کوڕ + و = کوڕو (کوران)

بەچە + و ← بەچو

بوز + و ← بوزو

نیشانەی یا:

دەس + یا = دەسیا ، دەستیا (دەستان)

چوو + یا = چوویا

گوو + یا = گوویا[24]

بە تێروانینی ئەم نموونانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ ، ئەگەر کۆتایی ناوەکە بە بزوێن بوو، وەختێك نیشانەی «و»ی کۆی بچێتە سەر، بزوێنی کۆتایی ناوەکە لە نێو دەچێ، بە هۆی هاتنی دوو بزوێن پێکەوە، وەك:

بەچە + و = بەچو

ئەگەریش کۆتایی ناوەکە نەبزوێن بوو، ئەوا راستەوخۆ نیشانەکە وەردەگرێ.

لە نیشانەی «یا» یش وەك دیارە دەچێتە سەر ئەو ناوانەی کۆتاییان بە بزوێن و نەبزوێن هاتووە.

نیشانەی ان :-

چیو حەسرەت مەنان پەی شاد بیومەو.
چیو وەفاداران دەحیا پیمەوە[25]

× × ×

ماچان کە غەزالان چەڕنی شۆرە زەمینە
بەس ئاهوی من جیش کە لەم دیدە ڕماوە[26]

× × ×

کەبۆو نەنیشیت ئەو گۆڕی داران
خاس خاس نەخۆنیت نەغمەی بەهاران[27]

لەم نموونانەی سەرەوە نیشانەی «ان»ی کۆ راستەوخۆ بە ناواەکانەوە لکاوە، چونکێ کۆتایی ناوەکان بە نەبزوێن هاتووە. بەڵام ئەگەر کۆتایی ناوەکە بەبزوێن هاتبوو ئەوا نیمچە بزوێنی (ی - ٧) دێتە ئاراوە ، وەك:

دونا + ی + ان = دونایان (زانایان)

درو + ی + ان = درویان (درۆیان)

بەڵام لە کاتێکدا ناوەکە کۆتایی بە بزوێنی (ە) هاتبوو، ئەوا راستەوخۆ نیشانەی «ان»ی کۆ وەردەگرێ و بزوێنی کۆتایی ناوەکە لە نێو دەچێ ، وەك:

خونچە + ان خونچان.

هەروەها پێویستە باسی ئەوەش بکەین، کە نیشانەی «ان»ی کۆ دەچێتە سەر ناوی ناسراویش.

نیشانەی ناسراویش «ەکە»یە.

نموونە:

کوڕ + ەگە ← کوڕەگە + ان ← کوڕەگان

دڵ + ەگە ← دڵەگە + ان ← دڵەگان

ئەمەو لە کاتێکدا گەر کۆتایی ناوەکە بە بزوێن هاتبوو، ئەو کاتە نیشانەی «ەکە» دەبێتە «گە »، وەك:

قەومەیل براگان نەماگە هوشم

شیەی کۆڵگاو بێئامان وەگوشم[28]

نیشانەی گەل:

گەل گەل نازاران هانە ژێری تاق

ماشتای زەڕین سیم دان لە دەوری ناف[29]

کۆ کردنەوەی ناو بەیارمەتی ژمارە:

تاییفەی گیسە، لەپای خزووردیم

دوو سپا برۆیە لە تاق ئەبروو دیم[30]

× × ×

ئەو ناوانەی خۆیان لە حاڵەتی «کۆ» دان:

پۆل، تایفە، تاخم، چەپکێ، کۆمەڵ، . . .

تاییفەی گیسە، لە پای خزوور دیم

دووسپا برۆیە لە تاق ئەبروو دیم

لەبەر ڕۆشنایی ئەم لێکۆڵینەوە دەگەینە ئەوەی بڵێین، نیشانەی «ان» بۆ حاڵەتی کۆ لە زمانی یەکگرتووی ئەدەبیمان لەجێی خۆیەتی، چونکێ لە هەر چوار دیالێکت بە چاکی ڕۆڵی خۆی دەگێڕێ. هەروەها دەردەکەوێ، کە نزیکییەکی ئێجگار زۆر لە نێوان نیشانەکانی کۆ و ڕێزمان بە گشتی لە نێوان دیالێکتەکانی زمانی کوردی دا هەیە.

پەراوێزەکان:

1 ـ جەنگیز ئیتماتۆف:

جەمیلە، (وەرگێڕانی :جەوهەرکرمانج)، هەولێر ،1981، لا 19.

2 ـ هەمان سەرچاوە: لا ـ 60.

3 ـ هەمان سەرچاوە: لا ـ 60.

4 ـ مەسعوود محەمەد ،مرۆڤ و دەوروبەر، بەغدا، 1984، لا 91

5 ـ هەمان سەرچاوە، لا ـ 69.

6 ـ مارف خەزنەدار (دوکتۆر): ، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغدا، 1977، لا 87.

7 ـ کاکەی فەللاح: کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، بەغدا، 1980، لا ـ 158.

8 ـ گۆران: دیوانی گۆران، بەرگی یەکەم، محەمەدی مەلا کریم کۆی کردوەتەوە و ئامادەی کردوەو پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، بەغدا، 1980، لا ـ 32.

9 ـ کاکەی فەللاح: کاروانی شیعری نوێی کوردی ،بەرگی یەکەم، بەغدا، 1980، لا ـ 143.

10 ـ سەرچاوەی یەکەم: لا ـ 22.

11 ـ (بنەماڵە) خۆی ناوێکی کۆیە، بەیارمەتی ژمارەی (دوو)، لەدوو لاوە کۆیە.

12 ـ صادق بهاء الدین ئامێدی: هۆزانڤانێت کورد، چاپا یەکێ، بەغدا، 1980، لا ـ 41.

13 ـ هەمان سەرچاوە: لا ـ 175.

14 ـ احمد عبدالله زەرۆ و خالد حسین یعقوب.

سترانێت شاهی و دیلانا، کۆمەلاٸێکێ، بەغدا، 1980، لا 26.

15 ـ گیوی موکریانی: ئەلف و بێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی، بە زاراوەکانی سۆرانی، بادینی، فەیلی، هەورامی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، 1972 لا ـ 131.

16 ـ ك. ك. کوردۆیێف (پرۆفیسۆر): ڕێزمانی کوردی بەکەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، (وەرگێڕانی دکتۆر کوردستان موکریانی)، هەولێر، 1984، لا ـ 63.

17 ـ هەمان سەرچاوە، لا ـ 64.

18 بێسارانی (دیوان) کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە کیومرث نیك رفتار، مطبعة الادیب البغدادیة، بەغدا، 1982،

لا ـ 28 .

19 ـ هەمان سەرچاوە، لا ـ 30 .

20 ـ هەمان سەرچاوە، لا ـ 104 .

21 ـ محەمەد ئەمین هەورامانی: زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوورد دا، بەغدا، 1981، لا ـ 285 .

22 ـ محەمەد عەلی قەرەداغی: شارۆیەك لە ئەدەبی مەولەوی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، بەغدا، لا ـ 241 .

23 ـ هەمان سەرچاوە: لا ـ 248 .

24 ـ حەمیدی ئێزەد پەناهـ: فەرهەنگی لەك ولور، لێدوان و بەراوروکردنی مەحموود زامدار، بەغدا، 1978، لا ـ 218 ـ 219 .

25 ـ رؤوف احمد ئالانی: کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا، بەغدا، 1981، لا ـ 183 .

26 ـ هەمان سەرچاوە: لا ـ 185 .

27 ـ مدحی مەندەلاوی: شاکەو خان مەنسوور، گۆڤاری کاروان، ژمارە 16، کانوونی دووەم، ساڵی دووەم 1983، لا 73 .

28 ـ هەمان سەرچاوە: لا ـ 73 .

29 ـ هەمان سەرچاوە: لا ـ 74 .

30 ـ هەمان سەرچاوە: لا ـ 75 .

**سەرچاوەکان:ـ**


1 ـ ئەورەحمانی حاجی مارف (دوکتۆر): ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، مۆرفۆلۆژی، بەشی‌یەکەم ناو، بەغدا، 1979 .

2 ـ ك. ك. کوردۆیێف (پرۆفیسۆر): ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی‌و سۆرانی، (وەرگێرانی دکتۆر کوردستان موکریانی)، هەولێر، 1984 .

3 ـ احمد حسن احمد: ڕێزمانی کوردی، چاپی یەکەم، بەغدا، 1976 .

4 ـ محەمەدەمین هەورامانی: زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوورد دا، بەغدا، 1981 .

5 ـ دکتۆر نەسرین فەخری و دکتۆر کوردستانی موکریانی: ڕێزمانی کوردی، هەولێر، 1982 .

6 ـ ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم (دکتۆر): دیالێکتەکانی زمانی کوردی (ئامادە کردن)، هەولێر، 1983 .

6 ـ تەوفیق وەهبی: دەستووری زمانی کوردی، جیزمی یەکەم، بەغدا، 1929 .

7 ـ زمانی کوردی، بەغدا، 1974 .

8 ـ ئەورەحمانی حاجی مارف (دوکتۆر): کۆی ناو لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، بەغدا، 1978، لا ـ 185 ـ 224 .

9 ـ سعید صدقی کابان: مختصر صرف و نحوی کوردی، بەغدا، 1928 .

10 ـ نوری عەلی ئەمین: ڕێزمانی کوردی ،سلێمانی، 1960 .

11 ـ حەمیدی ئێزەد پەناهـ: فەرهەنگی لەك و لور، لێدوان و بەراوورد کردنی (مەحموود زامدار)، بەغدا، 1978، (بەشی ڕێزمان، لا 216 ـ 229).

12 ـ گیوی کوکریانی: ئەلف و بێ‌ی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی، بە زاراوەکانی سۆرانی، بادینی، فەیلی، هەورامی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، 1972 .

13 ـ محەمەد ئەمین هەورامانی: تەماشا کردنێکی سەرپێی زاری سۆرانی و زاری هەورامی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی دووەم بەغدا، 1974،لا 117 ـ 160 .

# رەوشا هەر زمانەکی سڤکی یە

ئیسماعیل تاها شاهین

مرۆڤ دکێشا پێش دە چۆنا خوەدە گاڤ بۆ گاڤێ ژ بۆ سڤك کرنا بارێ دنیاداری یێ خوە ل بزاڤا دەستەسەکرن و نخاندنا دەوروبەرێ خوە گرێ ددت. وەناکت چ ژ بەر لەپان قورتال بت بلا حەرکی زمان ژی بت. زمان ژی وەك ئاشکەرایە خاسیەتەکا شارستانی یە، رەوشت و تیتال و راڤێژین جڤاکی و پێکا شارستانیەت و هشمەندی یا مللەت کارەکی مەزن لێ دکن. چ پێشکەفتن و گوهۆرینا بسەر دەراڤێن ژێ گۆتی دە بێت ل زمانێ مللەتی ب خوەژی دەردکەڤت. ئەڤە ژی هندێ دگەهینت کو ساخلەمی یا زمانی و شەنگە دارێتن ب هندێ نایێ لدوو پەیڤێن کێم ل کارو باڤ مری بگەرن. شێوازێ ئەردگرو دارێتنا چێتر ئەدە کوریا پەیڤا سڤك و کورت ڤەبڕ و تێر ڕامان بگرت، چونکو زمان مینا هەر خاسیەتەکا شارستانی بەربەر سڤکی یێ ل خوە وەردپێچت. نابت ئەم «دکن» ژنوو پێڤە ب «دکرن» بنڤیسن چونکو مەلایێ جزیری بڤی رەواتەی بەرچاڤ کری یە، دیسا نابت «شاندن»ب «شەهاندن» بدنە قەلەم، تەنی ژ بەر هندی کو خانی هۆ بلێڤ کری یە. گوهۆرین نە ساویرە ژێ بترسن، نەژی هند سادەو ساکارە بهێسانی دەستان ژێ بشۆن. نە وژدانە کەڤناتی یێ بکنە چکی و برووێ هەر کەڤنارەکێ ڤە رادن تەنێ ژ بەر هندێ کو وەخت ب سەرڤە چۆیە، و دیسا نە دری یا خوەدەیە بنە کۆرەو مەرەقدارێن هەر رێکەکا هندەکان خوە پێ کری تەنێ ژ بەر هندێ کو وان بەری مە خوە پێ کری یە. دڤێت ئەم بزانن زانست یەکا خوەیەو چاڤ لێکرن یەکا خوە. . چاڤ لێکرن هەیە خوە داکراسێ زانست و زانینێ دە دنخێڤت و لبەر چاڤێ گەلەکان برەوش و پەرگال دکەڤت، نەمازە هەکە ب رێکا یێ داردەست وارخوەش بوو بت. مرۆڤی بن دەست بتبعەت و تابارا خوە گەلەجا چاڤ ل یێ داردەست دکت، فەلاتا خوە دچاڤ لێکرنێ رە دبینت. راستە، و جهێ خوەدەیە ئەم کاروانێ خو، ددەراڤێ پێش کەفتنێ دە ژیێ کەسێ کێمتر نەبینن، لێ دکراسێ کوردەواری یا خوەدەو ب چاڤێ وەرگرتنا تشتێ یێ ڤیاو ب کێرهاتی. دڤێت ب چاڤێ سالەیی یا نژیارا گۆتنێ و دەولەمەندی یا وێ ژ ئالی یێ دەربڕینێ ڤە، دەربڕینەکێ ژ یەکێ چێتر ب بینن و هەر ب ڤێ رێکێ یەکێ ژبەر یەکێ داگێرن.

ئەڤ ژی بارێ مە گشتانە. . نەدخێرا زمانێ مە دەیە هەرەك مینا خوە تێ ب هەرزت و داخوازا هندێ بکت، کو پەیڤێن وی لسەرێ لیستێ بێنە رێزکرن، وهەر ئەو ببنە بابەت و هووردێ نڤیسینا کوردی، نەمازە هەکە چ بەلگەو نیشان ژی ل پشت نەبن. یەکەتی یا زمانێ مە یەکەتی یا مەب خوەیە، ژ بۆ ئەم چاڤێ خوە بدنە یەکەتی یا خوە دجهێ خوەدەیە هەر خواندەوارەك ژمە ژ رەخێ خوەڤە.

1 ـ زمانێ خوە ژدەڤ خواری یێ بتراشت و ول هێڤی یا هندێ نەمینت کو پەیڤێن خوە تك و پێك مینا دئاخفتنێ دە تێن، سەرکاغەز کت. . ئاخفتن هەیە ناکەفتە کراسێ رێزمانا کوردی

مینا:
«ناچیٚ بت» جهای «چیٚ نابت»
«مالا میٚرایه» جهای «مالا میٚرانه»
«خودان ئەزمانیٚت دریٚژ ن» جهای «خودانیٚت ئەزمانیٚ دریٚژ ن»

«شەرژیٚ کرن» جهای «سەرژیٚ کرن»

2 ـ خوە دچـارچـوڤـیٚ زاراڤـیٚ زاراڤیٚ خوە ب خوەدە ئاسیٚ نەکت. . هەمـوو زاراڤـان هەوجـەیی ب هەڤـدوو هەیـە. وەکی زمانیٚ مە یەکەو ژ بن کارەکیٚیە، نە تازەیە کراسیٚ زاراڤیٚ خوە بخوە بکنە بەر هەر پەیڤەکا ژ زاراڤەکی دن بیٚ وەرگرتن. ب ڕامانەکا بیٚ تووڤل، نڤیسینا «ڤ» ب «و» دپەیڤا مروٚڤ و کوٚڤاردە ل جەم هنە برایێن مە ییٚن ڕەخیٚ سوٚران، نیشانا بیٚ دلیو ژیٚك ڕەڤینیٚیە ب چ ڕەنگیٚ هەی!!

3 ـ سەرەکیٚ ببتە یەکـەتیـیـا زمـانیٚ خوە ولـسـەر دەستوور و ئاوایێن هەڤپشـك راوەستت، ژ بـوٚ ریٚ خوەشکـرنـا، زمـانـەکی هەڤگرتی ـ یەکگرتی. ب ڕامانەکا روٚنتر پرانییا کوردان نیشانا «بوو» بدوو کرنا دوور بوٚرییا چیروٚکی (م خواربوو ـ م کربوو) ڤە دکن. هەکە «بی» بیەکجاری ژی بیٚ راکرن، ریٚزمانا مەیا گشتی لەنگ نابت. دیسا دفەرمانا بنەکرنیٚ دە ئەوا پیٚشگر پیٚرە مینا؛ «رامەبە، روومەنە» پرانییا کورداں، ڕەخیٚ بەهدینان تیٚنە ـ ئالاڤا نەکرنیٚ ددنە پیٚشییا پیٚشگری ـ پیٚشگری ددنە پیٚشییا ئالاڤا نەکرنیٚ (نە ـ مە)؛ و ئاخفتنەکا نەگەلە ژڤیٚ فەرق بوٚ پیٚش خستن و پاشخستنا نیشانا کرنا بوٚری «د» یا پیٚشگریٚ «ڤە» پیٚرە تیٚ گوٚتن. و سەرباریٚ چەندا بوٚری ڕەخیٚ بەهدینان «ئیٚ» زیٚدە ب سەر کرنا بیٚ هیٚز «خستن» ڤە دکن، و ئەڤ زیٚدەیی یە ژی تەنیٚ ل بەهدینان بەرچاڤە؛ لەورا راکرنا ویٚ ژ هیٚلانا ویٚ چیٚترە.

مەرجـەك ژ مەرجیٚن زمـانیٚ یەکگـرتی دڤیٚ سڤکی بت و سڤکی ژی د زمانیٚ مەدە بدو ریٚکان ئاڤەدەر دبت:

1 ـ کیٚم کرنا تیپ و ئالاڤان:

ئەوە ئاخفتن کورت بیٚتە ڤەبرین و ژگرانییٚ بیٚتە شوشتن. سەبا گرانییٚ گەلەجا پەیڤا خویانی جهـ ژ بەر دچت و یا بیانی شوونـا ویٚ دگـرت؛ ئەڤـە هەکـە یا بیـانی ژیٚ سڤـك تر بت. بکاریٚ سڤکییٚ جارنا زمان ژ توٚکا ریٚزمانا خوە دەردکەڤت و ب ریٚزمانەکا سەرپلکیو نەگەلە بنەجهـ بانا دبت.

و ب هندیٚ ریٚزمان ژیٚرە کیٚشییا ئاخفتنیٚ دکت. . ل ئیٚرە یا باش ئەوە ئەم رەنگیٚ دورستیٚ پەیڤیٚ ژ دەست خوە نەکن ئانکو برەنگ و رەواتیٚ دورست بنڤیسن و هنگیٚ هەکە سڤك ژی بیٚ خواندن خەم نینە.

دزمـانیٚ فارسی دە گەلـە پەیڤ بزمـانـەکی عەمەل سڤك تیٚنە خواندن لیٚ هەر برەنگیٚ دورست تیٚنە نڤیسین مینا: «خواهر: خوهـ، خوشك»ب «خاهر» تیٚ خواندن لیٚ برەنگیٚ پیٚشین تیٚ سەرکاغەز کرن. . و لپەی کیٚل و بیٚژنگا بوٚری د جهیٚ خوەدەیە زمانیٚ مەییٚ نڤیسینیٚ کاڤی یەکا هوٚ بەرچاڤ کت، نەکو دا چاڤ ل ییٚ ویٚڤەتر بکت، بەلکوو ژ بەر هندیٚ کو نەریزمان یا کیٚم بوٚ ئاخفتنیٚ داگیـرت، نەژی ئاخفتن ژ پیٚ ریٚـزمـانیٚ دەرکـەڤت. دیاردا مە بفارسی ڤە دالەقاندی برەنگەکی نەی بیٚخیٚر دزمانیٚ مە ب خوەژی دە هەیە. خارن، ڤەخارن، خاستن و خاندن و گەلە پەیڤیٚن ژڤی نفشی ییٚن سیٚ باریٚن ڕەخیٚ بەهـدینـان ـ نابیٚـژم هەمی؛ چونکو خەلکیٚ دەشتا دوبانیٚو بەربنی ییٚ چیاییٚ بیٚخیٚرو خەلکیٚ چیـاییٚ شنگـاریو گەرگـەریو کیکـان برەنگیٚ دورست بلیٚڤ دکن ـ و گەلە خەلکیٚ بوٚتان جهای «خوارن، ڤەخوارن، خواستن، خوانـدن» بکـارتینن، و پرانییـا نڤیسـەڤـانیٚن ڕەخیٚ بەهـدینـان برەنگیٚ دورست سەرکـاغـەز ناکن. نڤیسینـا پەیڤیٚن ژیٚگوٚتی برەنگیٚ رەسەن نەکیٚماسییە نڤیسەڤان خوە ژیٚ بکرن. هەکە بزانن بەر پیٚ چوٚنەکا میٚرانەیە بەر بزمانەکی یەکگرتی و ییٚ کول و کوٚڤـانـا وی خزمـەتـا ژ دل بت، لکـەریٚ عینـاتیٚ سوار نابت. کورت کرمـانجی ئاخفتنـا ڤەبـر هنـد ژیـا دریٚـژ دادر ماقوول ترە هندی بیٚسەر نەبووی، و دەڤ خواری ژی نە ژکوٚکا زمانیٚ مەیە.

2 ـ بهەڤ گوهارتنا دەنگان: ـ

ئەوە دەنگیٚ سڤـك شوونـا ییٚ گران بگـرت، یان دەنگیٚ خویانی سەری ژ ییٚ بیانی بستینت، بمەرجەکیٚ بچنە سەریٚك (نیٚـزیکی هەڤ بن). ئەڤـە ژی مینـا کیٚم کرنـا تیپ و ئالاڤـان

نیشانا پێشکەتنا زمانی‌یەو دەستەکی درێژ د پێك ئانینا زاراڤان دە هەیە. گەلەجا جودایی‌یا دنێڤبەر وان دە ژ چارچوڤێ ڤێ گوهارتنێ دەرناکەڤت، لەورا دجهێ خوەدەیە ئەم بزانن کیژ دەنگ ژ کیژان کوردی ترە، دا بهێسانی بکارن هەر پەیڤەکا ئەم لێ بگومان داگەریننە سەر بنەکوکا وێ، و بسەر وی کراسی هلبن ئەوێ زمانێ مە بو پەیڤا بیانی کەر دکت.

ژ دەنگێن ب هەڤ تێنە گوهارتن:

1 ـ ت = چ

مینا: تەت = چەچ/ ویت ویت = ـ ویچ ویچ تەپولە = چەپولە/ تونە = چونە/ حوت = ـ حوچ/ توزانم = چوزانم. ب هزرا من «ت» دبتە «چ» و دەنگێ «چ» ل ئێرە خوەشترەو سڤك ترە ژی.

2 ـ چ = پ

مینا: چرتکاندن = پرتکاندن/ چریسك = پریسك/ چڤکەن = پڤکەن. «پ» ژ کوکا گوتنی‌یە.

3 ـ خ = ك

مینا: خەر = کەر خەنین = کەنین/ خەلەندوز = کەلەندور/ کوخك = کوکە. «ك» کوردی‌ترە ویتر شایی وەرگرتنێ‌یە. پەیڤێن پێشین رەنگێ فارسی پێڤە دیارە.

4 ـ د = ز

مینا: دانا = زانا/ مراد = مراز/ دلوپ = زلوپ/ کاغەد = کاغەز/ خدمەت = خزمەت: برێنە مرادو کاغەدو خدمەت کو د بنکارا خوەدە بیانی‌نە، بدەنگێ «ز» کراسەکی کوردی گرتینە.

5 ـ ك = ق

مینا: قەلشتان = کەلشتان/ چقل = چکل/ بژقاندن = بژکاندن/ پەقاندن = پەکاندن/ قەزوان = کەزوان/ خەلق = خەلك و هتد. «ك» ژ «ق» رەسەنترە، د. ئاورەحمان ژ کیسێ چ. بەکو دبێژت: «فونێمی (ق). لەوە دەچێ لەگەل ئەو وشانەدا هاتبێ، کە لە زمانی عەرەبی‌و تورکی‌یەوە هاتوونەتە ناو زمانی کوردی‌یەوە، وەك: (ئەقل... قەبر. قاپ... قول.. هتد)..»[1]

6 ـ ك = ی

مینا: سەکڤان = سەیڤان/ مەکتەب = مەیتەب/ چەکمەچە = چەیمەچە. ئەڤ جوونە گوهارتنە ل بوتان هەیەو د ناڤ هنە کوچەرێن دەشتا دوبانێ ژی ببەر گوهێ من کەڤتی‌یە (هاجان). و دیارە ژی بهەڤ گوهارتنا بوری پەیڤێن پاشین رەنگەکی کوردی دگرن.

7 ـ ب = م = ڤ = و

مینا: ئاموزا = ئاپوزا/ هلێبری = هلێڤری/ ئاو = ئاڤ/ باب = باڤ/ زمستان = ژڤستان/ نخامتن = نخاڤتن/ سموره = سڤوره/ درەم = دراڤ/ نمێژ = نڤێژ/ خەون = خەڤن/ زەمین = زەڤی/ سەلام = سلاڤ/ جەماندن = جڤاندن/ تەبایی = تەڤایی/ زبر = زڤر/ دبێژن = دڤێژن/ ناو = ناڤ.. وهتد. «ڤ» ژ تەڤان رەسەنترە. دکتور جەمال نەبەز د راستا وێدە دبێژت: دەنگی «ڤ» لە باری فونولوژی‌یەوە کونترە لە «و» هەروەها لە سەر زمان شیرین ترو جوانترەو لەوەش بترازێ زوربەی زوری نەتەوەی کورد بەو جورە دەری دەبرێ»[2] لێ ماموستا جەگەر خوون دبێژت: «ڤ» د کوکا خوەدە «و»یە پاشی بوویە «ڤ»[3]... ب هزرا من ئاخفتنا د. نەبەز چێتر دکەڤتە کراسێ باوەری‌یێ‌و سەربارێ هندێ ژی (سەلام، جەماندن و درەم) د کوکا خوەدە بیانی‌نەو بدەنگێ «ڤ» قالبەکی کوردی گرتینە.

8 ـ ژ = ج

مینا: باجێر = باژێر/ هەنجیر = هەژیر/ تانجی = تاژی/ وجدان = وژدان/ دوژوون = دوجوون/ چڤان = ژڤان/ نجدە = نژدە.. هتد.. دەنگێ «ژ» ل ئێرە کوردی ترو سڤك ترە.

9 ـ س = ش

مینا: بابەلیسك = باگەلیشك/ شوبات = سوبات پشیك = پسیك/ شۆر = سوور/ شەوتین = سۆتن/ تاشت = تاست/ تاش = تووس. . هتد. ب هزرا من «س» سفكترو خوەش ترە.

10 ـ هـ = ح

مینا: هەفت = حەفت/ هەسكی = حەزكی هەژێكرن = حەژێكــرن. . هەر چەنــدە رەنگێ پێشین كێم ل كارە، دگـەل هندێ ژی ئەوە بنكار. ل ئێرە برەنگێ پێشین بێنفیسین و بێی پاشین بێخواندن زیان ناكت.

11 ـ هـ = و، ئـ

مینا: وندا = هندا/ وشك = هشك/ ورچ = هرچ/ ئەور = هەور ئەســپ = هەســپ/ نەوال = نهــال/ زوا = زوهــا. . هتد. . بهزرا من «هـ» سفك ترە.

12 ـ خ = هـ

مینا: خەلەك = هەلەقە/ خرس = هرچ/ خوری = هری/ خوردە = هووردە/ تەلــخ = تەحــل (خ نەژكـۆكـا گۆتنێـە)/ خوون = هوون (هەورامی یە). . وهتد. ل ئێرە بەربەلاڤی جهێ خوە دبینت و ئاخفتن هەر یا وێیە!!

13 ـ ز = ژ

مینا: دلسۆز = دلسۆژ/ زەبەش = ژەبەش/ زەهر = ژەهر، ژاری/ زیـرەك = ژیـر. . هتـد. ل ئێرە دەنگێ «ژ» كوردیترەو سفك ترە ژیو سەرباری هندێ بەربەلاڤ ترە ژی.

14 ـ ف = پ، ب

مینـا: فەیـرۆ = پیـرۆ/ فرەهـ = پەرەهـ/ فافـۆن = بافۆن. . هتد. «ف» و «ب» دبنە «پ».

15 ـ غ = خ

مینـا: باغ = باخ/ غافـل = خافـل/ غەلـەط = خەلـەت/ غەریم = خەریم/ غەرامەت = خەرامەت/ غولام = خولام/ ساغ = ساغ = ساخ/ باغچە = باخچە بناغە = بناخە. . هتد. دەنگێ «خ» كوردیترو راستر و سفك ترە. «غ» دبنیاتا خوەدە نە كوردیـیــە. پەیڤێن (خـافـل، خەلـەت، خەریم، خەرامـەت، خولام)ژ عەرەبی هاتینە وەرگرتن، وساغ ژ توركی. . بناغە ژی د كۆكا خوەدە ژ (بن + ئاخ) پێكهاتی‌یە.

16 ـ د = ت

مینا: ناردن = هنارتن/ ژماردن = هەژمارتن/ خواردنەوە = ڤەخوارتن. . هتد.
بهزرا من «ت» سفكترە.

17 ـ س = ك، گ

مینا: سڤاندە = گڤاندە/ سەوال = كەوال/ سەعات = كات (ژ ساعەت بوویە سەعات پاشێ سات پاشێ كات). . بهزرا من «س» بوویە «ك» «گ». ئانكو ك، گ سفكترن.

18 ـ ل = ز

مینا: گلیز = گریز/ بلوول = بلوور، بلوێر/ بلا = بەرا/ قوول = كوور. . هتد. لئێرە «ر» سفك ترو بەربەلاڤ ترە.

19 ـ د = گ

مینا: ددان = دگان/ هندی = هنگی/ دیا من = گیا من (د نێڤ گەرگەرییان دە لكارە. . هتد. رەنگێ پێشین بەربەلاڤ ترە.

20 ـ س = چ

مینــا: برسی = برچی/ فرس = هرچ. لئێــرە «س» بوویــە چ». و بن كار ژی هەر ئەوە.

21 ـ وو = وی، وێ

مینـا: خوون = خوین، خوێن (هنـەك بخـەلـەتی خین ژی دنـڤیسن)/ دوور = دویــر/ كۆرە = كوێــر/ سوور = سویــر،

سویــر. هتــد. دەنگێ «وی» و «وێ» بنـەکـوک و بەکـارا وان بدورستی نەهاتی‌یە دیارکرن، لێ هەر بێنا بیانی ژێ تێ و ژ دەڤ خواری‌یێ پێڤەتر نینە. دکتۆر جەمال نەبەز د دەرگەلا ڤێ چەندێ دە دبێژت: «ئەگەر بێت و ئەم وێنە دەنگی‌یە لە زمانە ئەدەبی‌یـەکـەمـاندا لابچێ، لە کاتێکیشدا زۆربەی زۆری کورد زمانان بەکاری ناهێنن، دیارە هیچ زیانێك بەزمانی نووسینمان ناگەیەنێ، بەڵکوو دەنگێك لە ئەلف و کەمان کەم دەکاتەوە، و زمـانـەکـەمـان سووکتـر دەکا، بە وەی کە دەنگێکی لەسەر زمان گران، ناهێڵێ». [4] رەخێ بەهـدینـان گەلـە پەیڤێن عەرەبی ژێ دکێشنە ڤی کراسی وەکە: مەجبوور، مەقبوول و هتد.

22 ـ ئا = ێ

مینا: عاجز = عێجز/ دانان = دێنان/ جاری‌یە = جێری/ تەنیا = تەنێ/ حساب = حسێب/ کتاب = کتێب/ خودا = خودێ، خوەدێ/ چاك = چێ/ پا = پێ. . هتد. رەنگێ بـ (ێ) کوردی‌ترە.

برێنێ (عـاجـز، جاری‌یـە، حساب، کتاب)چ کراس گرتینە دەمێ کەڤتی‌نە نێڤ زمانێ‌مە؟!

23 ـ وو = ۆ

مینــا: چوون = چۆن/ سوور = سۆر/ سووتــان = سۆتن/ جووت = جۆت. . هتد. ل ڤێرە دەنگێ «ۆ» سڤك ترەو سانەهی تر ژێ تێ خواندن.

24 ـ ی = ێ

مینا: ئینان = ئێنان، هینان/ میوە = مێو/ میوان = مێڤان/ ریز = رێز. . هتد. ب هزرا ،ن دەنگێ «ێ» چێتر دکەڤتە سەر زمان. و زمان چێتر دگەریت.

25 ـ ئە = ێ

مینا: پەنجـا = پێنجی/ مەویـژ = مێـویژ هەژیر = هێژیر/ یەك = ئێك/ پەچە = پێچە. . هتد. لڤێرە هەر چەندە دەنگێ «ێ» سڤك ترە، لێ بەربەلاڤی یێ ژێ ئاخفتنا خوە هەیە.

26 ـ ئا = ێ، ی

مینا: خوارزا = خوارزی/ ئانین = ئینان، ئێنان/ نهال = نهێل/ ماردین = مێردین/ باژار = باژێر. . هتد. بۆری‌یە.

27 ـ ۆ = ێ، ی

مینــا: لۆتـك = لیتـك/ شۆڤ = شێڤ بۆن = بێن، بین/ مۆری = مێروولە، مێری/ پۆست = پیست، پێست. . هتد. «ێ» و «ی» سڤك ترن.

28 ـ وو = ی

مینـا: تووژ = تیـژ/ شوور = شیـر، ـ شمشێـر، شمشوور. دەنگێ «ی» سڤك ترە.

29 ـ ئە = ئا (بەرجەکێ ع، ح، هـ لپاشبن)

مینا: طعم = تام/ تەحل = تاڵ/ تەحر = تارە/ شەهر = شار/ مەهر = مارە/ کەهنی = کانی/ کەهر = کار/ ژەهر = ژاری/ چەهــڤ = چاڤ دەهــوەت = داوەت/ بەهــر = بار/ پەحتن = پاتن/ تەحتی = تاتی/ پەحن = پان. . هتد. «ئا» کوردی ترەو سڤك ترە، نیشانا پێش کەڤتنا زمانی تێرە بەرچاڤە. دەنگێ «ئە» ل هنە ئەردان دەڤ خواری‌یەو لهندەکان دەنگەکی بیانی‌یە.

برانۆ سڤکی چاوا بت، ساخلەمی‌یێ دخوازت و ساخلەمی ژێ ژبۆ هەر زمانەکێ زێ‌یە، ریزمان ڤێ‌یە!!

**پەراوێز:**

1 ـ د. ئاورەحـمـانـی حاجـی‌ی مارف: زمـانـێ کوردی لەبـەر رۆشنـایی‌ی فۆنـەتیکـدا، بەغـدا (چـاپخانەی کۆری زانیاری کورد) 1976/ بپ: 48.

2 ـ د. جەمال نەبەز: زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ 1976/ بپ: 59.

3ـ جەگـەر خوین: «آواو دەستـوورا زمـانێ کوردی، بەغـدا (چاپخانا صلاح الدین) 1961/ بپ: 180.

4 ـ د. جەمال نەبەز: ژێدەرێ بۆری/ بپ: 63.

# پەیوەندییەکانی نێوان

# سلێمانی و کفری

مستەفا نەریمان

شاری (سـلێـمــانـی) کارێـکی گەورەی کردوەتــە سەر زوربـەی ئەو شارانـەی کە تێکـەلاوی‌یان لەگەڵیدا هەبووە، یەکێك لەو شارانەی کە لە ژێر تیشکی کارکردنی سلێمانیدا لە روی ئابـوری‌و رۆشنبیـری‌و کۆمـەلایـەتی‌یـەوە بوژابێتەوە شاری (کفری)یە.

(کـفــری) ئەکــەوێـتــە بەشـی خۆرئــاوای باشــوری سلێمـانی‌یـەوەو ئەگـەر راستەوخۆ شەقامێك دوڵ و چیاکانی نێـوان ئەم دوو شارەی تەی بکــردایــە لە یەکـتـرەوە هەر بە دووصەد کیلۆمەترەیەك دوور ئەبوون و بەس.

پێش ئەوەی شاری (ســلێـمــانـی) لە ئارادابــوو بێـت (کفــری) بریتی بووە لە ئێستگــەیـەك بۆ ئاڵ و گۆڕ کردنی پۆستـە (بـەریـد) نێـوان بەغدادو کەرکوك ئەو حەلە نزیکەی دووســەد ماڵێکی تیـابـووە، پاش بنیـات نانی سلێمـانی لە ساڵــی 1199ی کۆچـی بەرامبــەر بە 1784ی زایـیـنـی (کفری) کەوتە سەر شارێگەی نێوان (سلێمانی ـ بەغداد)، لە هەفتەیەکدا کاروانێك دووکاروان لە سلێمانی‌یەوە بە بارە تووتن و مازووکـەتیـرەو پێستـەوە ئەکـەوتنـە رێ بەسێ قۆناغ ئەگـەیشتنـە (کفری) لەوێشـەوە بە چوار قۆنـاغ ئەگـەیشتنە بەغـداد، کاروان لە رۆژێکـدا لە قۆنـاغێکـەوە بۆ قۆنـاغێك

که له سەر چاوەدا له سلێمانی‌یەوە هاتوون زیاتر بە یەکترەوە نووسـانـدوونی یەکێـك لە هەرەناودارەکانی سەیدەکان (سید محسن ئاغا) بوو کە شێخ مەحمودی گەورەو نەمر دووجار لە دیـوەخـانـەکـەیـدا میـوان بووە جارێکیـان کە لە شعیبـە گەڕاوەتەوەو جاری دووەمیان کە لە ئەسارەت بەرەڵلا بووە، سید محسن ئاغا سەرۆکی شارەوانی بووەو خاوەن کتێبخانەو دەست و مەقـام بوە ئەو کۆشکـەی دروستی‌کـردبووو شێخی تیـادا میـوان بووە ئێستـاش وەك خۆی ماوەتـەوە گەڕەکێکی دیکـەی گەڕەکـەکـانی (کفـری) تا ڕۆژی ئەمـڕۆمان بە ناو گەڕەکی (سەیدەکان)وە ماوەتەوە.

کاك ئەحمەدی شێخ (1207 ـ 1305) کە چووەتە حەج بەم شارەدا تێپەڕیوەو ئەمری داوە مەدرەسەیەك و مزگەوتێك دروست بکرێ، لەو سەرەوە کەگەڕاوەتەوە فەرمایشتەکەی بە جێ هێنـراوە تا ئێستـا ئەو مزگـەوت و مەدرەسـەیـە لە یەك شوێندا ماون و خزمەت کراون.

شێخ عومەر نەقشبەندی (شێخی ضیاء الدین 1255 ـ 1318) ساڵی 1307 کۆچی ئەچێتە کفری‌و ئەمر ئەکات خانـەقـایـەك دروست بکـرێ، کتـوپـڕ مەجیـد پاشا پارچە ئەرزێکی خۆی لە ناو شاردا پێشکـەش ئەکـات و خانـە قاکـەی بەبـاربۆی خەڵك لە سەر دروست ئەکرێ، شێخی ضیـاء الـدین بەم کردەوەیـە زۆر دڵگـەش ئەبێت (نظـام الدین)ی کوڕی لەوێ بۆ ماوەیەك ئەهێڵێتەوە مفتی کفری (ئیسمـاعیـل ئەفـەنـدی) کچی خۆی لێ‌مارە ئەکات ئێستا کوڕو کوڕەزاکـانـی لەو ئافـرەتـەی خەڵـکی کفـریـن و پەیوەندی‌یان لە نێوان ئەو دووبنەماڵەیەدا.

هەر گەشت وەرو شوێنـەوارنـاس و زانـایـەکی بێگـانـە ڕوویـان بکـردایـەتـە کوردستـان ئەوا یا لەم سەرەوە یا لەو سەرەوە هەر بە کفـریـدا تێ‌ئـەپـەڕین وەك ئەم ناودارانـە (ماکدوناڵد لە ساڵی 1817دا)

(بۆرتەر لە ساڵی 1818دا) (کلودیوس ریچ لە ساڵی 1820دا).

(سید محمد کە بە ـ منشی بەغدادی ـ ناسرابوو لە ساڵی 1820دا).

هەر لە سلێمانیەوە جگەلەو دوو بنەماڵەو ئەو دوو زاتە بە ناوبانگە دەیەها کەس بۆ کاسبکاری ڕوویان کردوەتە کفری زووربـەی بەرگـدروو چەخـمـاخـسـازو زیـن و بەرگە درووەکانی‌کفری خەڵکی سلێمانی‌بوون، لە قەرەداغیشەوە دەیـەهـا خێـزان بەرەوخوار بونەتەوەو ڕوویان کردوەتە کفری‌و تیادا سامانێکی باشیان کۆکردوەتەوەو ناویان دەرکردووە وەك (حاجی ڕەشید)و (ئەمین چەلەبی) برای کە لە سەردەمێکدا سەرۆکی شارەوانی بووە.

لە هۆزە هەرە گەورەکانی کورد هۆزی (جاف) کە بەرەو گەرمیـان ئەبـوونـەوە ئەگـەیشتـە دەوروپشتی (کفـری) لە شاکـەل و شیـروانـەو زەنگیـابـادو دەوروپشتی چیمـەن و تا سنـوری قەرەتـەپـە ئەڕۆیشتن، بەرووبومی مەڕو ماڵاتی ئەم هۆزە وەك خوری، موو، بەرگـن، ڕۆن، پەنیـر، ماست، هۆڕو شۆڵەکە ورایەخ لەبازاری کفریدا ساغ ئەبووەوە، ئەم هۆزە کە لە بەهـارانـدا بەرەو کوێستـان وەرئـەچـەرخـاو ئەکـەوتـەڕێ وەك شەمـەنـدەفـەرێکی زۆر درێـژ ڕیچکـەی ئەبـەست کە درێـژایـەکـەی دەکیلۆمەترەی ئەگرتەوە، جاف نزیکەی سی تیرەی لێ‌ئەبێتەوە، چ لە کۆچ و بارکردن و لە لەوەڕی گەرمیـان و کوێـستـانـدا شوێن هەر تیـرەیـەك دیـاری‌کـرابـوو، لە ڕێـرەوەکـەیاندا (گەلاڵی) ئەکەوتە پێش چونکە هەم ئازاو هەم بەغەوارە دانرابوون تیرەی (بەگزادە) بە خۆیان و پشت ماڵەیانەوە ناوەراستیان گرتبوو، ئەم هۆزە ساڵی دوو ڕێرەویان هەبوو لە هەر ڕێرەوی‌یەکیاندا نزیکەی هەزارو پێنجـەد کیلۆمـەتـرە ڕێگـەیان ئەبری، لە کوێستاندا ئەگەیشتنە شنۆو بیجار بەڵام کە سنوور دەست نیشان کرا ڕێگـەی ئەو دیـویـان لێ‌بـراو پێش بینی‌یـەکـەی (حـاجی قادر)هاتە دی کە ئەڵێت:

نزیگەی پەنجا شەست کیلۆمەترەی ئەبری، قوناغەکانی ئەو حەلەی نێوان سلێمانی و بەغداد ئەمانەبوون (سلێمانی، تیمار - کربچنە، خانی برایم خانچی، کفری، قرەتەپە، دەللی عەباس، خان بەنی سەعد، بەغداد) کاروان لەو سەرەوە بە ئەنواعی کەل و پەل و خواردەمەنی نوێ‌و شەکرو چاوە ئەگەرایەوە، لەم سەرو لەو سەرەوە ئەبێ ئەو خەڵکە لە کفری لابدەن، شەوێك دووشەو بمێننەوە بازرگان و کاروانچی‌و رێبوارەکان لە کاروانسەراکاندا باریان ئەخست و ئەچوون لەگەڵ دانیشتوانی کفریدا یەکدگیرئەبوون، خەڵکەکەش بە رووخۆشی‌یەوە پێشوازی‌یان لێ‌ئەکردن و دەرگایان بۆ ئەخستنە سەر گازی پشت، لە سەرەتای دامەزراندنی ئیمارەتی بابانەوە کاربەدەستانی ئەو ئیمارەتە چەند جارێك هەوڵی ئەوەیان داوە کفری بخەنە ناو جغزی خۆیانەوە، لە ساڵی 1812دا ئەورەحمان پاشای بابان بە لەشکرێکی گەورەوە هێرشی‌بردو کفری خستە ژێر رکێفی میرەکانی بەبەوە، والی بەغداش بەهێزێکی گەورەترەوە هات و لەو بەری روباری کفری کە (دەوڵخانە)ی پێ‌ئەڵێن شەرێکی قورس نێوان هەردوو لەشکر بەرپابوو لە ئەنجامدا لەشکری ئەورەحمان پاشا شکستی هێنا.

پاش هەرەس هێنانی ئیمارەتی بابان لە ساڵی 1851دا چەند میرێکی دیاری لەو بنەماڵەیە لە کفری نیشتەجێ‌بوون وەك (قادرپاشا)و (ئیسماعیل بەگ)ی برای، ئیسماعیل بەگ لە ناوشاردا چەند خانوو بەرەیەکی دروستکردو خەڵکەکەش لە دەوری کۆبونەوەو خانویان دروستکرد تا ئێستا گەرەکێك لە گەرەکەکانی کفری بە ناو ئەو (ئیسماعیل بەگ)وە هەر ماوە. قادر پاشایش لە دەوروپشتی کفری زەوی‌و زاری لە دەوڵەتی عوسمانی ئیلتیزام کردو ئاوەدانی کردەوە پاش خۆی (مەجید پاشا)ی کوڕی جێی‌گرتەوە، مەجید پاشا لە پێشدا قایمقام بوو، لە کۆیەو رانیەو شامیەدا قایمقامی کردوە کە باوکی کۆچی‌دوایی کرد دەستی لە وەزیفە بەرداو هاتەشار کۆشك و سەرایەکی دوو نهۆمی زۆر گەورەی دروستکرد لەو کۆشکەدا بیست ژورو سەردابێکی گەورە هەبوو لە ناو سەردابەکەدا فوارەیەکی ئاو لە ناوحەوزێکی مەرمەردا هەبوو، زوربەی ژوورەکانی ناو ئەو کۆشکە بە کاشانی رەنگاورەنگ رازابووەوە، جگە لەم کۆشکە (مەجید پاشا) کاروانسەرایەکی سی ژووری لای دەرگای سەرەرێی سلێمانی دامەزراند بۆ ئەوەی بازرگان و رێبوارەکانی سلێمانی تیادا. بحەسێتەوە، پاشا لەو سەردەمەدا کتێبخانەیەکی باشی هەبوو زاناو ئەدیب و شاعیرانی ئەو سەردەمەی تیادا کۆئەبونەوە، (شێخ رەزای تاڵەبانی) بە تورکی ستایش پاشای کردووە ئەڵێت:

**شخص کامل ئەگەر بولونە بوگون**

**مەرحەمەتلو مەجید پاشادر**

دودمان ملوك بابانك ـ قاڵمە بر شەمسی عالەم ئارادر

واتە «ئەگەر لە شوێنەوارو وەجاغی بابانەکان یەکێك مابێتەوە ئەویش مەجید پاشایە کە وەك هەتاو ئەو ناوەی روناك کردوەتەوە».

جگە لە بابانەکان لە سلێمانی‌یەوە لقێك لە ساداتی بەرزنجە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە روویان کردوەتە کفری (سید عومەر) ناوێك لەئەولادی (شێخ عەلی وەندرێنی) چوەتە ئەو شارەو لەوێ بناغەی بۆ سەیدەکانی بەرزنجە داناوەو لە ماوەیەکی کورتدا ئەو بنەماڵەیە بە هۆی ژن و ژن خوازی‌یەوە لەگەڵ هۆزەکانی (زەنگنەو جاف و وەناوی) بونەتە یەکێك لە بنەماڵە ناودارەکانی کفری لەو دوایی‌یەشدا (سید حسین ئاغا)یان خوشکی (مەجید پاشای بابان)ی مارەکردوە، ئەمەش پەیوەندی ئەو دوو بنەماڵەیەی

**وا ریگەتان ئەبەستن عیلاتی (جاف)و (بلباس)**
**گەر مردوونە لە گەرمیان مەمنوعە بچنە کویستان**

پاش لە ناوچوونی ئیمارەتی بابان ئەستیرەی شیخانی بەرزنجە درەوشایەوە پیاوانی وەك (کاك ئەحمەدو شیخ سەعیدو شیخ مەحمود)یان تیادا هەلکەوت، (شیخ سەعید) لە سەردەمی سولتان عبدالحمیددا ناوبانگی دەرکردبوو چەند جاریك چوبوە ئەستەمول و هەندیك لە زاناو رۆشنبیرانی سلیمانی لەگەل خۆبردوو لەوێ چاویان بە سولتان کەوتبوو پەیوەندی‌یان لە نیواندا بەهیزبوو، کە بەرەی (اتحادو تەرەقی) لە سالی 1908دا عبدالحمیدیان لە تەخت هینایە خوارەوە، لقی ئەو حیزبە لە سلیمانی دەستی‌دایە شکات کردن لە بەرەی شیخان، لە سەرەنجامی پیلانیك شیخ سەعیدو شیخ ئەحمەدی کوری‌و شیخ مەحمود بانگ کرانە ئەستەمول لەموسل ئەلقەیەك لەو پیلانە بەکارهینراو ئەوەبوو شیخ سەعیدو شیخ ئەحمەدی کوری کوژران وشیخ مەحمود دەربازبوو، کوردستان هاتەجۆش و خرۆش، شاری (کفری)یش بۆ ئەم کارەساتە هەستایە سەرپێ (میرزا خەلیل منەوەر)ی شاعیر کارەساتەکەی بە دووسەد دیرە شیعر دەربری‌و چووە بنج و بناوانی مەسەلەکەوەو داستانیکی دل تەزینی ئەوتوی هۆنیەوە کە کەس تا رۆژی ئەمرۆمان وەك ئەو وا شیعری لەو کارەساتەدا بەکار نەهیناوە، وەك ئەلیت.

**جەم بیـن چەنـد نەفـەر بێ رەحم و ئینصـاف**
**پەی مولـك بەغـداد کیـشـان تەلـغـوراف**
**یەك تەلـێ دیـگـەر بە مووصـل ماوا**
**تەلـکـاری کەردەن صوب تا خۆرئـاوا**
**چەنـد تەلـغـورافـێ پەی باب عالـی**
**پەی شیـخ الاسـلام میـرلـیـواو والـی**

سەرەنجامی ئەو تەلغورافانەش بەم جۆرە پیشان ئەدات کە ئەلیت:

**تا ئاخـر فەرمـان هات لە ئەسـتـەمـبـول**
**شیـخـان سەوق بیـو پەی شار مووصـل**
**بە ئەمـرو فەرمـان زات شاهـانـە**
**شیـخـان پەی مووسـل گشـت بیـن رەوانـە**

**ئینجا ئەچیتە ناو کەرەساتەکەو ئەلیت:**

**نار عەداوەت جەمـابـەیـن گـرا:**
**بە قووەی مەمـسـەك ئیـفـك و ئیـفـتـیـرا**
**ئەهـالـی مووصـل ئاوردەن هجـووم:**
**نیـشـانـەی مەحـشـەر رۆژیـی مەعـلوم**
**بە ویـنـەی تەگـەرەگ رەصـاص بێ حەد:**
**ریـزان جە ئەنـدام زات شیـخ ئەحـمـەد**

**لیـرەدا خەلیـل منـەوەر پەردە لەسـەر کاربـەدەستـانی عوسمانی هەلئەدات و ئەلیت:**

**خۆ حوکـم رۆمـی نەعـام دیـارەن:**
**مەغـدوران پامـال، دەورغـەددارەن**
**عثـمـانـلیـلرن بودر ئیـکـرامـی:**
**نەشـەرتـی واردر، وەنـە کەلامـی**
**یوقـدر ئیـجـرائـات تابـاب عالـی:**
**نە لەسـەر عەسـکـەر نەخـۆ لە والـی**

واتـە (عوسمانی‌یـەکان نەشەرتیان هەیەو نەگوێ ئەدەنە قسـەی خۆیـان هەر لە والی‌و سەر عەسکـەرەوە بگـرە تا بەردەرگـای سولتـان لە بابی عالی هەمـوویـان وەك یەك وەهان) - بروانە شاعیری چەوساوەکان -

شاری (کفری) هەر بەمەشەوە نەوەستا بەلکو یەکیك لەو کەسانەی کە مایە فیتنەو داردەستی بیگانەبوون خۆی کوتابوە

ئەم شارە سەیدەکانی کفری لە نێوە شەودا چوونە سەری و (بەها عبدالله)ی ئاژاوەگێریان لە تۆڵەی شێخدا شەت و پەت کرد.

هەر کە بەریتانیای داگیرکەر پێی نایە سەر خاکی عیراق ئەوا شێخ مەحمودی نەمر دوژمنایەتی عوسمانی خستەلاوە جاری (جیهـاد)ی‌دا هەزار سوارەی کوردی لە ژێـرئـالآ شەکـاوەکـەیـدا کۆکـردەوەو چوە کۆڕی شەڕەوە رۆژی 12ی نیســانی 1915 لە شعێبــە بەشـداری ئەو شەڕەی کرد لەو دەشتەدا خوێنی سەدەها کوردو عەرەب تێکەڵاو یەکتربوون و داری ئازادی‌یان پێ ئاودا.

سوپای عوسمانی بەرەودوا کشایەوە تا ساڵی 1918 لە سنوری ولایەتی موسڵ پەڕینەوە ئەودیو، لە تشرینی ساڵی 1918دا نوێنـەرانی بەریتـانیـاش چوونـە سلێمـانی و شێخ مەحمود حوکمرانی گرتە دەست.

لە گەرمیان و دەوروپشتی کفری‌یەوە ئەم ناودارانە چوونە لای شێـخ و پیـرۆزبـایی‌یـان لێ‌کـردو پشتیگـری خۆیـان پیشـانـدا، وەك (بـرایم خانی دەلـۆ، عەلی ئاغای زەنگنە، کەریم بەگی جاف، رەفعەتی بەگی داودە، سید محمدی جەباری) کاربەدەستانی بەریتانی دوای ئەوەی تورکەکان لە شەڕدا شکستیان هێناو کشانەوە کەوتنە بروبیانوگرتن لە شێخ مەحـمـود، شێـخیش لە 20ی مایـسی 1919دا ئالآی شۆڕشی دژی بەریتانیای داگیرکەر هەڵکردو ئنگلیزەکانی لە دەبـۆکـە قایم کردو ئالآی بەریتـانیـای هێنـایـەخـوارەوە، ئنگـلیـزەکـانیش لە کەرکـوکـەوە بەهێـزێکی گەورەوە بەسەرکرادیەتی (فرایزەر) کەوتنەرێ، سوپای شێخ مەحمود لە دەربـەنـدی‌بازیان خۆی ئامادەکردبوو، ئەوسوپاگەورەیەی بەریتـانیـا نەیتـوانی بەرەوروو بەرنگـاری سوپـاکـەی شێخ ببێـت، بەڵام بە هۆی مشیـری حەمـەی مام سلێمـانی هەمەوەندەوە لەدزەرێگایەکەوە سەرکەوتنە سەر ریزەشاخەکەو خۆیـان کردە ئەودیـوەوەو لە پشتـەوە ئابلوقـەی هێـزەکـەی شێخیـانـدا ئەوەبـوو لە 19ی حوزەیـرانی 1919دا شێخ بە ریندار بەدیل گیراو لە بەغداد حوکمی ئیعدامی بە سەراسپێنراو پاش ئەوە حوکمەکەی گۆڕاو بە دیلی‌رەوانەی هندستان کرا.

پاش دورخستنــەوەی شێـخ کوردستـان بە خامـۆشی بۆ داگیـرکـەران نەمـایـەوە بەڵکـو ئەو نیشتمـانپەروەرانەی کە لە گەرمیان سەر بە شێخ بوون قسەیان کرد بە یەك و راپەڕینی گەلی عیراقیان لە ساڵی بیستدا بە هەلێکی گونجاو زانی و پەیوەندی‌یان لەگەڵ ئەو شۆڕشگێڕانەدا کردو ئالآی شۆڕشیان هەڵکرد لە چواردەی ئابی 1920دا شۆڕشگێڕانی خانەقی بە سەرۆکایەتی (خورشید بەگی دەلۆ) شاری خانەقینیان لە دەست بەریتـانیـا رزگـارکرد لە 20ی ئابیشدا شۆڕشگێڕانی (دوز خورمـاتـوو) بە سەرۆکـایـەتی (رەفعـەتی سمایل بەگی داودە) شاری دوزیان لە چنگی بەریتانیا دەرهێناو ئالآکەیان هێنــایـە خوارەوە لە 22ی ئابیشـدا (بـرایم خانی دەلـۆ) بە هاوکـاری بەشێـك لە جاف شاری کفـری‌یـان رزگـارکـردو ئالآی بەریتـانیـایـان هێنایە خوارەوەو حوکمێکی ناوچەیی‌یان دامـەزرانـدو (سلمنت)ی جێ‌گـری حاکمی ئنگلیـزی‌یـان بەدیـل گرت دووجـار بەخـورتی ئنگلیـزی داگیرکەر ویستی کفـری بگـرێتـەوە پێی نـەکرا ئنجا کەوتە گفتوگۆکردن لەگەڵ برایم خان، ئنگلیــزەکــان ئامــادەیی‌یـان پێشـانـدا ئەگـەر (سلمنت) بەرەڵلابکرێ برایم خان ئەبێتە قایمقامی کفری و پەنجـا هەزار روپیــەی ئەدرێتێ، برایمخـان وەڵامی دانـەوە قایمقامی ناوێت و پەنجا هەزار روپیەیان ئەداتێ و سلمنتیش بەرەڵلا ئەکات بە مەرجێك شێخ مەحمود لە دیلی بەرەڵلا بکـرێت و بگـەرێتەوە کوردستان کاربەدەستانی بەریتانیا لەم مەرجـە ئالـۆزبـوون ووتیان ئێوە جارێکی‌تر چاوتان بە شێخ مەحمود ناکەوێت.

بە پێی یانداشتەکانی (رەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجە) دانیشتـوانی سلێمــانی لەو حەلــە بەدڵ و بەگیـان لەگـەڵ

شۆڕشی برایم خاندابوون و چاوەڕێی ئەوەیان ئەکرد بزانن ئاخۆ سەرەنجامی ئەم شۆڕشە ئەگاتەچی؟

پاش ئەو گفتوگۆیە بە چەند ڕۆژێك بە هێزێکی گەورەی بەریتانیا کەلە کەرکوك بوو بە سەرۆکایەتی (لۆنگریك) بەرەو کفری کەوتنەڕێ (شێخ قادری سیامەنسور) کە یەکێك بوو لە لایەنگرانی شێخ لە ناوچەی قەرەحەسەنی باشووری کەرکوك پەلاماری هێزەکەیدان و لەیەخەیان نەبووەوە تا فرۆکەکانی بەریتانیا هەر پێنج ئاوایی یەکانی بۆمباباران کرد، هێزەکەیان بەرەو دووز کەوتەڕێ لە ڕێگا شێخ حەمیدی تاڵەبانی بە سێ سەد سوارەوە تێکەڵیان بوو، لە هەرچوار لاوە ئابڵوقەی شۆڕشگێرانی دوزیان دا، شەڕگەرم بوو، تا دوا فیشەك بەرەنگاری ئەو سوپاگەورەیەیان کرد لەسەر لاشەی چل و چوار شەهید ئەو سوپایە چوونە ناوشاری دوزەوەو دە ئاوایی شۆڕشگێرانیشیان بۆمبا باران کرد.

پاش ئەوە هێزەکە بەرەو کفری کەوتەوەڕێ، دانیشتوانی کفری لە زەرەروزیانی شاری دوز باخەبەرکران تکایان لە برایم خان کرد بێ خوێن ڕشتن شارەکە بە جێ بهێڵێ تاکارەساتەکەی دوز لێرەش دوپات نەبێتەوە، برایم خان ناچار لە شار کشایەوە دەستی دایە شەڕی پارتیزانی و سوپای بەریتانیاو دەست و پێوەندی ڕژانە ناو شارەوە، بەشێك لە شۆڕشگێرانی دەلۆ روویان کردە چیای (حەمرین) لەوێ سالێك لەگەڵ هۆزی (عەزە)ی عەرەبیدا پێکەوە هاوکاری یان کرد.

(کفری) لەم ڕاپەڕین و شۆڕشەیدا پێ و شوێنی سلێمانی گرتبوو (برایم خان)یش یەکەم داوای گەڕانەوەی شێخ بوو، ئەگەر بە ووردی بڕوانین یەك چوونێکی تەواو لە نێوان شۆڕشی سلێمانی ساڵی 1919 وشۆڕشی کفری ساڵی 1920دا هەیەو لەم چەند خاڵانەدا خۆیان ئەنوێنن.

1 ـ لە سلێمانی (سۆن) بە چاوێکی سووکەوە ئەیڕوانی یە جەماوەرو داوای لە خەڵك کردبوو لەکاتی ڕابوردندا کە بەرزەپێ لە بەری هەستن هەروەها (سلمنت)یش ئەو داوایەی لە دانیشتوانی کفری کردبوو.

2 ـ پاش هەفتەیەك لە سەر حوکمرانی شێخ ئنگلیزەکان لە تاسلوجە پەلاماری هێزی شێخیاندا لە ئەنجام ملازم (پۆل)و دوانز دە کەسیان لێ کوژران، لە کفریش پاش هەفتەیەك لە سەر حوکمرانی برایم خان ئنگلیزەکان هێرشێکی گەورەیان هێناو دەیەها کەسیان لێ کوژرا.

3 ـ لە دەربەند، ی سەربە سلێمانی (مشیری حمەی مام سلێمان) پێشرەوی هێزی بەریتانیابوو دژی سوپای شێخ مەحمود لە کفریش (شێخ حەمیدی تاڵەبانی) پێشرەوی هێزی بەریتانیا بوو دژی شۆڕشگێرانی دوزو کفری.

4 ـ شۆڕشی سلێمانی نزیکەی مانگێك دەوامی کرد لە 21 ـ 5 تا 1919/6/19 شۆڕشی کفریش نزیکەی بیست ڕۆژێك دەوامی کرد.

5 ـ چ لە سلێمانی و چ لە کفری ئاڵای بەریتانیا داگیراو حوکمێکی ناوچەیی دامەزرا وزوربەی جەماوەر پشتگیری یان لێ کردن.

ئەو شۆڕشەی کە دانیشتوانی سلێمانی بە سەرۆکایەتی شێخ هەڵیان گیرساندبوو بە بەدیل گرتنی شێخ و کۆتایی هات بەڵام بەداگیرکرانی کفری و دوز شۆڕشی گەرمیان دوایی نەهات بەڵکو سەرکردەکانیان خۆیان نەدا بە دەستەوە پاش ئەوان سەید محمەدی جەباری لە مایسی 1921 ڕاپەڕی و کەریم فەتاح بەگی هەمەوەندیش هەستایە سەرپێ و مەحمودبەگی دەلۆیش لە خانەقی سەری

بەرزکردەوە.

هەمـوو ئەم راپـەرین وبـزوتنـەوانـە بۆ گەڕانـەوەی شێـخ مەحـمـودبـوو، لە دواییـدا ئنگلیـزەکـان ناچـاربـوون شێـخ بگێـرنـەوە کوردستـان ،هـەرکـە ئەم دەنگـوبـاسە بلاوبووەوە کوردستان بەرگی شادی پۆشی ولە سلێمانی یەوە وەفدێك بۆ پێشـوازی کردنی شێـخ لەم کەسـانـە پێـك هات (ئـەحمەد تۆفیق، حمـەی ئەورەحمـان ئاغـا، عیـزەت بەگی جاف، مستەفا پاشای یا. مولکی)، ئەوسا ئێستگەی شەمەندەفەر بۆ کوردستـان تا (کنگـربـان)ی لای کفـری بوو، وەفـدەکـە گەیـشتنـەکفـری و رەفیق حلمیش لە خۆیـەوە لە ناو ئەو خەلکەدا بوو.

رۆژی 21ی ئەیـلولـی 1921 رۆژێکی پرشنگـدارە لە مێـژووی شاری کفـریـدا لەو رۆژەدا دانیشتـوانی شار بە گەورەو بچـوکـەوە بە سوارەو پیـادەوە رژابـونـە ئێستگـەی شەمـەنـدەفـەری (کنگـربان) کە بە حەوت کیلۆمەترەیەك لە خۆر ئاوای کفـری یـەوەیـە ،سوارەی هۆزەکانی دەورویشتی. کفری بە کوردو عەرەبەوە لەوێ بوون، هەرکە شەمەندەفەر وەستـاو دیمـەنی شێـخ دەرکـەوت درا لە تەپـل و تەقـەی تفەنگ، دەست پێ کراو سۆزی دەروێش و بانگ و ئاوازی ئەو خەلکـەو هۆسـەی عەرەبی دەنگیـان چووبوە ئاسمانەوەو گوێی دوژمنی کەرکردبوو لە ئێستگەوە تا شار کە سەعاتە رێگـەیـەك ئەبێت و نابێت بە سێ سەعـات چووە سەر، لە دەرگـای شاریـشـدا ئافـرەتان بە هەلهەلەو مندالان بە چەپلە ڕێزان پێشوازی یان لە شێخ کرد، شێخ مەحمود سێ رۆژ و سێ شەو لە مال (سید محسن ئاغا)دا ئەوا پێشوازی خەلکی ئەکردو سوپاسی ئەکردن، شێخ روانی برایم خانی نەبینی کە بیستی ئەمـری خوای کـردووە فرمێسکـەکـەی بە فەقیـانە کەی سریـەوەو گێـرایـەوە کە ئنگلیـزەکان لە دیلێتیدا پێ یان وتـوە برایم خانـا هەستـاوەتـە سەپێ و داوای گەڕانـەوەی ئەکـات، شێـخ هەردوو کورەکـەی برایم خان (عـەزیـزو شەرەف)ی بانگ کردو هەریـەکـە سەعـاتێکی پێ بـەخشین پاش ئەوە شێـخ کەوتـەوەرێ رۆژی 30ی ئەیلولی 1921 گەیشتـە سلێمانی بە هەمان دەستور لەوێ پێشوازی یەکی گەرمتری لێ کرا.

تا شارێگـەی نێـوان کفـری و سلێمـانی هەبـوو ئەوا وەك شادەمـارێـك ئەم دوو شارە پێکـەوە جەمسـەردرابوون، هەر رووداوێـك لە سلێـمـانـی رووی دابـێـت لە کفـری رەنگی داوەتـەوە هەرخـواردن و خواردنـەوەیەکی بە تام و هەر شتێکی نایاب لە تەورێزو قەوقاسەوە هاتبێتە سلێمانی ئەوا گەیشتوەتە کفری هەر دەنگوباسێك لە ئەستەمول و بەغداوە بگـەیشتـایـەتـە کفـری گوێی سلێمـانی زرنگـانـدوەتـەوە هەرچـەنـدە ئەو رێگـە کاروانـە ئێستـا کوێربوەتەوە بەلام بە هۆی رۆشنبیـری یـەوە پەیـوەنـدی نێوان نەك ئەم شارە بەلکو شارەکانی دیکەمان پێکەوە لەوسا پتەوتر بوونەتەوە.

# کاروانی

## ١٧٨٤، مۆسیقاو

● هەر گەلێـك لەم جیهـانـەدا، خاوەنی گۆرانیی‌و مۆسیقـای تایبـەتی خۆیـەتی. لە سەر (پلە)و (پـەردە)ی پەیـژەی مۆسیقای خۆی، ئاوازو گۆرانیی ڕەسەنی دادێنێ‌و دادەنێ.

● ـ مۆسیقـای هەر نەتـەوەیـەك قەبـاڵـەیەكی گرنگە بۆ (بوون)و (بڵندی)و (بەش و بەهرەی پێشكەوتنی ئەو گەلە. لە ناو هەموو هونەرەكان دا (مۆسیقاو گۆرانیی بەرزترین پلەو پایەیان هەیە، !.

● ـ سەبارەت بە گرنگی‌و بایەخی ئەم هونەرە، (كۆنفۆشیوس Confucius) (551 ـ 478 پ‌ب).

دەڵێت: «ئەگەر دەتەوێ پلەی پێشكەوتن و شارستانیەتی هەر گەلێك بزانی گوێ لە مۆسیقاو گۆرانی‌یان بگرە»

ـ هەر سەبارەت بە بەرو بایەخی ئەم هونەرە

دەڵێت: «ئـەوەم لا گرنـگ نی‌یـە، كێ یاسـا بۆ خەڵكی دادەنێ، ئەوەم لا گەورەیە كێ گۆرانیی‌یان بۆ دادەنێ؟»[1].

●(باستان)و (باوان)ی ئێمەیش لەم ڕۆژهەڵاتەدا، «وەكو بەردی بن گۆم» نەبـوون، بەڵكـوو خاوەنـی (ئـەدەب)و (زانـست)و (هونەر)و (ڕۆشنبیری)ن

● ـ لە بازگەو بواری «گـۆرانیی‌و مۆسیقـا»دا، «نـەغمـەپەرداز»و «نـەواسـاز» خاوەن «گـۆرانیی‌و ئاواز» بوون، (پـەردەنـاس)و (پیسپۆڕو پێزانی) زۆریان لەو هرنەرەدا تێدا هەڵكەوتووە.

● لە بارتـرین بەڵگـەو بێگـومـانی بۆ ئەم ڕادەو ڕازەمـان، (نۆتەو نەغـمـە) یەكی ناسـك و ناسـراوە لە پەیـژەی مۆسیـقـای ڕۆژهـەڵاتی‌دا، كە پێ‌ی دەوتـرێ (نـەغمەی كورد) هاوسەنگ و هاوئاهەنگی نەغمەی (می‌بیمۆڵ)ە پەیژەی مۆسیقای ڕۆژاوایی‌دا.

ـ ئەم (نەغمە) یە، گەلانی (عەرەب و تورك و فارس و هیندو ئازربایجانی) لە دانانی ئاوازی مۆسیقاو گۆرانی‌ی، خۆیان دا بە كاری دێنن.

ـ هەروەهـا مەقـامێكی یەكجـار دڵنـەوازو خۆش ئاواز هەیە لە هەوا كلاسیكی‌یـەكـانی ڕۆژهەڵاتی‌دا، كە پلەكانی دەنگی ئەم مەقامە، لە پەیژەی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی‌دا لەم نەغمانە پێك دێت.

وپێ‌ی دەوترێ مەقامی «كورد»!

ئەم (مـەقـام)و (نـەغمـە)یە ،سەبارەت بە (ناو)و (كەلەپوور) و(هـەست)و (چمكی مێـژوویی)یـەوە، مۆری بیـرو بەهـرەو بلیمەتی كوردیی پێوەیە، لە دانان و ناونانی (كورد)، خۆیەتی ! بروا ناكەم بیانییەك ،لە بەرچاوی كاڵی كورد ئەو ناوەی لێ‌نابێت.

ـ (تۆمابوا)ی كوردناس دەڵێت:ـ

«لـە كۆن دا مۆسیقـای كوردی كاری كردووەتـە سەر گەلـە دراوسێ‌یـەكـانی، لە سەردەمی ساسـانی‌یەكان دا، مۆسیقایەكی یەكجار بەرزیان هەبووە . (زریاب) ی مۆسیقاژەنی بە ناوبانگ لە بنەماڵەیەكی كوردەو خەڵكی (موسڵ)ە، ژیانی هونەریی لە بەغداد دەست پێكردووە. زۆر بە چاكی‌و هۆشیارانە لە دیوەخانی (عەبدول ڕەحمان)دا لە (كوردۆا) پەیمانگەیەكی مۆسیقای تێدا دامـەزرانـدووە، هەر زریـاب یش بووە كە«ژێ»ی پێنجەمی لە ئالەتی (عوود)دا، داهێناوە.»[2]

ـ بۆیە (یو، ئە، ئۆربێلی 1887 ـ 1961) كوردناس دەڵێت:

# گۆرانیی لە شاری سلەیمانی ی ١٩٨٤

عثمان شارباژێری

«زۆر شاعیـــرو مۆسیقـازان لە ڕۆژە لاتـدا کورد بوون، بەڵام خزمـەتی (ئـەدەب)و (ئـاواز)ی گەلانی تـریـان کردووە، ونـاویان مێژووی گەلانی دیکەی ڕازاندووەتەوە.»[3]

- کۆمەڵەی (إخوان الصفا) کە خاوەن پێرەو پیلانی «پۆڵەتیقا»و ئایینی بوون، هەزار ساڵ بەر لە ئەمـڕۆ لە شاری «بـەسـرە» سەریـان هەڵـداوە، لە نووسـراوێـکیـان دا ناوی گۆرانـی ی کوردیی یان هێناوەو دەڵێن:-

«هەر گەلێك بۆ خۆی خاوەنی ئاوازو گۆرانی ی خۆیەتی، کە پێ ی دڵخـۆش دەبن و چێـژ ی لێ وەردەگـرن، کە بە گۆرانی ی گەلێکی دیکە وا شادمان نابن، وەك گۆرانی ی (دەیلەم)و (تورك) و(عەرەب)و (کورد)و (فارس)و (ئەرمەن) و(زنجی)و (ڕۆم)»[4]

- ئەم برە (هـەوا) کلاسیکی یـانـەی لە کۆنـەوە، بۆمـان ماونـەتـەوە. وەکـوو (ئـەڵـلاوەیسی، ئای، ئای، خاوکـەر، خورشیـدی، هۆرە، گەبـر، نیـوەشـەو قەتـار حەیـران لاووك) نمـوونـەیـەکی نایـاب و ناوازەن بۆ شارەزایی و سەردەرچـوویی پێشینانمان لەو پیشەیەدا.

- شاعیـری نەمـرو ناسـراوی کورد «عبداالخالق ی ئەسیری» چاکی بۆ چووەو جوانی فەرمووە.

«ئیـدیعـای عیلمی مۆسیقای ئەمن ئیـپات دەکات «ڕاست و سیگاو بەیات و لاوك و حەیران ی من»[5]

- سەبارەت بە مۆسیقاو گۆرانی ی لە شاری سلەیمانی دا، بە تایبەتی لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی (بابان)دا، تافێکی بێ تریفەو تاریـك و تەمـان توش دێت دەکـەوینـە وەرزێکی ساردو بێ سەرچـاوەوە. تەنیـا چەنـد تاڵـە ترووسکەیەکی کز هەیە، بۆ ئەم باس و خواسـە، کە لەم ڕێگـە پڕ قەمـچ و پێچـە تۆزێـك بەری چاومان ڕووناك بکاتەوە.

- لێـرەدا بە پێ ی توانـا خۆمـان لە قەرمو قەوارەی ئەم بابـەتـە گرنگە ئەدەین. هیوامان هەیە هەر کەسێکی تریش شتێکی لە باردا هەیە، خزمەت و خەمخۆری خۆی لەم لایەنەوە پێشکەش بکات.

- مامۆستای مێژوونووسی کورد (محمد أمین زکی بەگ) دەڵێت:

«ئەمارەتی - بەبە - لە سەرەتای سەدەی هەژدەمین ی میلادی لە (شـاربـاژێـر) لە تەرەف - سلیمـان بەگ - یا «بـابـا سلێمـان» کوڕەزای فەقێ ئەحمەدی دارشمانە وە، دامەزرا.»[6]

- لە قەباڵەیەکی مێژوویی دا سەبارەت بە (میرنشینی بابان) نووسـراوە «سـاڵی 1669)م (میـرسـولـەیمـان) لە (مـاوەت)ەوە پایتەختی گواستۆتەوە بۆ (قەڵاچوڵان)[7]

- قەڵاچوڵان کەوتووەتە بناری شارۆکەی (چوارتا)ی مەڵبەندی (شارباژێر)، مامۆستای زانا (شێخ محمدی مەردۆخ) دەڵێت.

«سلێمانی لە کۆن دا کوردەکان پێ یان ئەووت ( شارباژێر) لەم دوایی یەدا،- ابراهیم پاشا - بە ناوی باپیری یەوە، (ناوی نا)و سەر لە نوێ بنیاتی شارەکەی ناوە»[8]

- مامۆستا «علاء الدین سجادی»یش هەروا دەڵێت:

[«شارباژێر» ئێستا سلێمانی پێ ئەڵێن][9]

«قـەڵاچـوڵان» ماوەی (115) سەدو پازدە ساڵ پێتـەختی فەرمانڕەوایی (بابان)بووە.

- (محمـود پاشـا) ساڵی (1778ب)کـە جڵەوی بەڕێوەبردنی

ئەو میــرنشینــەی گرتــە دەست، لە ڕۆژگــاری خۆیدا لە بنــاری شاخی (گۆیژە) لای دێی مەڵکەندی، نزیك سەرای ئێستای سلێمانی قەڵایەکی سەختی بنیات نا.[10]

ـ دوای ئەم (ابراهیم پاشا) بوو بە فەرمانڕەوا، سەبارەت بە باری (ڕامیاری) یا (شارستانی)یا سروشت و هەڵکەوتی شوێنی (قــەڵاچــوڵان) لە بارەی (بــووم و بەرتــەنگی)و (کــووڕو کێی‌و کلایی) خاکــەکــەی بووبێت کەڵکــەڵــەی شارگــۆڕکێ کەوتــووەتە کەللەی ئەم «پــاشــا»یــەوە. بۆیــە «ســەرا»و (خــانــوو)و (بــازاڕ)و (مــزگــەوت) و «گــەرمــاوی» لای (قــەڵا) کەی نزیك مەڵکەندی درووســت کردووە، ساڵــی (1784ب)، بــە تەواوی پایتــەختی گوازتووەتەوە بۆ (شاری نوێ).

«بــەو بۆنــەیــەوە لە سەر هەمــان گرد، کە پێــیــان ووتووە گردی قشــڵە، لە ڕۆژی هەینی دوای هاتنیــان دا بە کۆبــوونـــەوەی دانیشتوانی شارو فەرمانبەران لەگەڵ [دەستەی مۆسیقای میری]و (دەهۆڵ و زورنا)بە ناوی (سلەیمانی) یەوە، دوو ڕۆژ کراوە بە (بەزم و ئاهەنگ)و شەکراوی پیرۆزی خۆشی خوراوەتەوە.[11]

ـ ئەم ناوە نوێیــە «سلەیمــانی»بــە باڵای ئەم شارە ساوایــەدا براوە، ئەبێ لەبــەر پیــرۆزیو پێنــازینی ناوی (بــابــا سلێمــان)ی باوانیان و هەم بۆ دەربڕینی (ڕێز)و (ڕاستی) بووبێ بۆ (سلێمان پاشای) والی ئەو ڕۆژگارەی بەغدا، وەك کورد دەڵێت (بەتیرێك دوونیشانی شکاند)!

ـ ئەم شارە مانگ لە دوای مانگ و وساڵ لە دوای ساڵ لە ڕووی (ئــاوەدانی)و (فــراوانی)و (شارستانی)و (بازرگانی) یەوە، بە خۆیدا هاتووەو هەراش بووە. کارو کارداریی‌و کاروانکاریی کەوتوونەتە گەڕ.

1 ـ کاروانی سلەیمانی ـ کەرکووك.

«لــەگــەڵ خۆیــان دا (دەغــڵ و دان)و (هــەنگــوین)و (گوێز)و (مەڕ)و (میوە)و (مازوو) و (لۆکە) یان بردووە. لەو سەریشەوە بە باری (پێڵاو)و (پۆشاك)ەوە گەڕاونەتەوە.

2 ـ کاروانی سلەیمانی ـ موسڵ

«لــەگــەڵ خۆیــان دا (گــوێــز)و (مێــوژ)و (میــوە) یان بردووە، لەوسەرەوە، کەل و پەلی (شامی)و (دیاربەکری) یان هێناوە.

3 ـ کاروانی سلەیمانی ـ ئەرزڕۆم

«مــانگی جارێــك بووە، لەگــەڵ خۆیــانــا (قاوە) (خورما) لەو سەرەوە (ئاسن)و (مس) یان هێناوە.

4 ـ کاروانی سلەیمانی بۆ (هەمەدان)و (سنە) مانگی جارێك بووە. لە سلەیمانی‌یەوە هەموو جۆرە (کەل وپەل) یکیان بردووە، لەو سەرەوە (سەمغ)و (میوەی ووشك)و (هەنگوین)و (ئاسن) یان هێناوە.

5 ـ کاروانی سلێمانی ـ تەورێز

«مانگی جارێك بووە، لەگەڵ خۆیان دا (خورما)و (قاوە) یان بردووە، لەو سەرەوە (ئاوریشم)و شتی‌تریان هێناوە.

6 ـ کاروانی سلێمانی ـ تاران

لە سلێمانی‌یەوە (شەکر)و (چا)و (خورما)یان لەگەڵ خۆیان دا بردووە، لەم سەرەوە (ئــاوریــشــم)و مالــی (هــەشتــەرخــان)و شتی‌تریان هێناوە.[12]

7 ـ کاروانی سلێمانی ـ بەغداد

«کاروانێك بەرێ دەخرا بۆ (بەغداد)لە سلێمانی‌یەوە (ترش)و (تووتن) و(کەتیرە)و (سابوون) یان بردووە لەو سەرەوە (خورما)و (قاوە)و (قوماش) یان هێناوە[13].

ـ ئەم پێــوەنــدیو بەنــدیــوارەی شاری سلێمــانی لەگــەڵ ئەو (شــار)و (شــوێنــانــە)دا، وەك چۆن لە بارەی بازرگــانی (بــردن)و (هێنان)و (دەست کەوت و درامەت)و (کڕین و فرۆتن)ەوە، ئاڵ و گۆڕو سەوداو مامەڵەیەکی گەرم و گرنگ پەیدابووە. هەروەها برێ (خــوو وخــدە) و(ڕۆشنبیــریی)و (هــونــەریی)و (ئــەدەبی) یش لە نێواندا ئاڵوگۆڕ کراوە.

ـ بە تایبــەتی لە بارەی (گــۆرانی‌ی‌و ئاوازو مۆسیقــا)وە ئەو کاردارو کاروانی‌یــانــەی کە ئامشــۆی ئەو شارانــەیــان کردووە، کەڵکیان لە (هونەر) و(هەوا) و(زانیاری) ئەو شوێنانە وەرگرتووە، لەگەڵ خۆیانا هەم بردوویانەو هەم هی ئەوانێشیان هێناوە.

ـ لە (سنــە)و (ســابــلاخ)و (ســەقــز)و (ســەردەشت)و (بــانە)و (بــۆکــان) ەوە ،کــە بوومــزادو لانکــەی (گــۆرانی‌ی بەستــە)ی کوردین، ئەو ئاوازانەی لەو ڕۆژگارەدا بوون و باو بوون، بە هۆی کاروانی‌یــەکــانـــەوە بە تایبـــەتی لە سەر زارو زمـــانی گوێنــدەو

گۆرانی بێژەکانەوە گەیشتوونەتە شاری سلێمانی. لە (تاران)ەوە بره مەقامێکی (فارسی)، لە (موصل) و (بەغداد) ەوە هەندێ مەقاماتی عیراقی.

- لە (ئەرزرۆم)و ناوچەکانی زاری (ژێ بابۆ)وە، هەواکانی (لاوك)و (لاوژە).

- لە (هەولێر) ەوە حەیران.

- لە کەرکوك و دەوروبەری کەرکوکەوە هەوا کلاسێکی یەکانی گۆرانی ی کوردیی وەك مەقامەکانی (ئەڵلاوەیسی، قەتار، خورشیدی، خاوکەر، ئای ئای گەیشتوونەتە شاری سلەیمانی، هەروەها لە (سلێمانی) شەوە (هەواو هۆنراوە)ی بێگەردو چاك و پاك چووەتە ئەو شارو شوێنانە، !.

- (مستەفا بەگی کوردی)[14]

- ئەم شاعیرە گەورەوگرانەی کورد، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم دا ژیاوە لە یەکێك لە هۆنراوەکانیدا زۆر بە زانایی و شارەزایی ناوی ئەم (گۆرانی یانە)ی هێناوە، کە لە سەردەمی ئەودا، لە سلێمانی دا ووتراون وەك مەقامەکانی (خاوکەر، قەتار، نیوەشەو) کە ئەمانە (هەوا)ی خۆماڵی کوردیین. ناوی (قەزاز) (حەزین) (ناری) (تاهیری) (ابراهیمی) هێناوە. کە ئەمانە مەقاماتی (عیراقی)ن.

- ناوی (دەشت) (سێگا) (نەوا) (چوارگا)ی هێناوە. کە ئەمانە مەقاماتی (فارسی)ن.

- ناوی (حیجاز) (راست)ی هێناوەکە مەقاماتی - رۆژهەڵاتین.

- مستەفا بەگ، ناوی ئەم ئامرازە مۆسیقاییانەی هێناوە. (سینەکەمان) (تەنبور) (دەف) (ساز) کە هەموویان لە تەخت (باند)ی مۆسیقای کوردیی و رۆژهەڵاتی دا بە کار ئەبرێن ولێ ئەدرێن.

- ناوی ئەم گوێندەو گۆرانی بێژانەی هێناوە کە لەو رۆژگارەی کوردەواری و سلێمانی دا، ژیاون. (ئەورەحمان) (رەسوڵ) (صالح) (فەتحی) (مصطفی) (یونس) (محی الدین) (قەرە) (مستێ).

- ناوی ئەم مۆسیقازانانەی هێناوە، (ئاغازەنون) (ئەلکە) (ئەسعەد). ئەم ناوهێنانە تاپۆیەکی تەواوە بۆ مێژووی مۆسیقاو گۆرانی ی لەو رۆژگارەدا.

- مامۆستا (علاء الدین سجادی) زۆر بە جوانی بۆی چووەو دەڵێت:-

«کوردی» هەر لە خانەی عەشق دا، دیوەخانێکی دروست کردووە بە برە شیعرە بەرزەکەی باسێکی ئاهەنگی ئەو دەورە بۆ (تەئریخ) ئەگێرێتەوە.[15]

● - (خاوکەر)ەی خانمە (قەتار)ەی

سەوزەی نەسمەجان

(رەقسی - سمکە) نازی شەهرا شوب

غەمزەی سەروی ناز.

●(ئاغازەنون) لێ بدا (سینەکەمان)

فارس گرفت

(ئەلکە) - [تەنبوورو دەف]

(ئەسعەد)بدا دەستی بە (ساز)

● (مستێ) (إبراهیمی)و

(ئەورەحمان) (تەوا)

(فەتحی) - (حەزین)

(مصطفی) (ناری و سێگا)

(یونس) بڵێ (دەشتی وحیجاز)

● با (رەسوڵ) هەڵداتە (راست)و

(صالح) بڵێ (نیوەشەوی)

(محی الدین) - (چوارگا)و

(قەرە) دەنگی بڵند بکا بۆ (قەزاز)

---

جار بە جار بە کزێکەوە

هەستێ لە (پەردەی - تاهیری)

یارەکەی عاشق کوژەو

مەعشوقەی دوژمن نەواز[16]

---

- مامۆستا (سجادی) دەڵێت:- «سەیری ئەکەی کوردی لەو شیعرانەدا وێنەیەکی (بەزم) و (ئاهەنگی) ئەو رۆژەی (سلێمانی)و (کوردەواری) ئەگێرێتەوە.

یەکە یەکە ناوی (گۆیندەکان) دێنێ لەگەڵ ئەو گۆرانی‌یانەی کە ئەو سەردەمە باو بوون.»[17]

- (لە ڕۆژی / 8 / مایس / 1820ب.) ئینگلیز یەکەم پێی ناوەتە خاکی سلێمانی‌یەوە ،کە ئەویش (کلۆدیۆس جێمس ریچ)« «CLaudis james Rich» ، کە بووە بە میوانی (مەحموود پاشای بابان)، کە لەو تافەدا تەمەنی مەحموودپاشا سی‌و پێنج (35) ساڵان و هی (شار) (36) سی‌و شەش ساڵان بووە وا!

- بە شێوازێکی شیاو و ناوازە، پێشوازی‌و پاینازی ئەو میوانەی کردووە.

- (ریچ Rich) سەبارەت بە (گـۆرانیی)و (مـۆسیقـا)و (هەڵپەڕکێ) لە سلێمانی‌دا، دەڵێت:-

ئەوەی بشێ بیڵێین پاشا کانی (کورد = بابان) لەگەڵ پیاو ماقوڵەکانی‌یان دا ،حەفتەی جارێك یا دووجار کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی گوێ لە بەزمی (گۆرانی‌و مۆسیقا) بگرن، مۆسیقاکەیان لەم ئامرازانە پێکهاتووە، (دەهۆڵ و زورنا) (شمشاڵ) (تەپڵ)و (دەف)و (بلوێر)و (دووزەلە).

- لە شەوانی سلێمانی‌دا دەڵێت:-

«دوێنێ شەو کۆبووینەوە گوێمان لەو دوو شوانە کوردە گرتبوو کە شمشاڵیان لێ‌ئەدا دەنگی شمشاڵەکانیان (نزم)و (خۆش)و (دڵگیر) بوو. خۆش ترین ئاواز کە لەم ئاهەنگەدا گوێم لێ‌بوو، گۆرانی‌ی (لەیلێ گیان)و (ئەز دەناڵم) بوو.»

- دەربارەی هەڵپەڕکێی کوردی لە شاری سلێمانی‌دا، دەڵێت:-

«بیستم شایی‌ژن هێنانە، بڕیارم دا بچم و یەکێك بم لە بینەرانی ئەو زەماوەندە. چووین دیمان حەوشەی خانووەکە بووە بە (شانۆی شایی‌یەکە)، پیاوان دەستیان گرتبوو، لە شێوەی بازنەیەکی دانەخراودا هەڵدەپەڕین، هەڵپەڕینەکە ناوی (چۆپی = چەپی (عشمان) بوو. ئەم هەڵپەڕکێیە گۆرانی‌یەکی ئیرلەندی هێنایەوە یادم کە ناوی «Rising on gad an sinking on sugan» بوو. بەوەی جارێك بەرز ئەبوونەوەو جارێکیش نزم ئەبوونەوە.»

- لە بارەی هەڵپەڕینی ئافرەتان یش)ەوە دەڵێت:-

«دەهـۆڵ و زورنـا دەستی‌پێکـردەوە، نزیکەی سی (30) ئافرەتێك ،دەستیان گرتبوو، هاتنە ناو حەوشەکەوە، بە ڕۆیینێکی نەرم و نیان و ڕێك و پێك، ئەم ئافرەتانە زۆر بە جوانی خۆیان ڕازاندبووەوە، (خشڵ) یان لە خۆیان دابوو، بەرگی ڕەنگاو ڕەنگی ئاوریشمین یان پۆشی‌بوو، بێ (پەچەو ڕووبەند) بوون). بە ڕاستی دیمەنێکی دڵگرو جوانم دی. کە (باو) ێکی نوێ بوولام، چونکە تا ئێستا ئافرەتی ڕۆژهەڵاتیم نەدی بوو ،کە ئاوا بە سەربەستی‌و بێ ڕووبەند لەگەڵ پیاودا تێکەڵاو بین!(ئاوازەکان) زۆر هێمن وهێور بوون بەم هەڵپەڕکێیە زۆر دڵخۆش بووم.»[18]

## گۆیندەو گۆرانی‌بێژەکان و مۆسیقازانەکان لە سلێمانی‌دا:

● حەسەنی ئامێ (1821 - 1885)

- یەکێك بووە، لە گۆیندە دەنگخۆشەکانی سلێمانی، (بەستەبێژ)و (بەیتخوان)و (مەقام زان) ێکی شارەزاو بەتوانا بووە. لە مەقامەکانی (قەتار)و (خاوکەر)و (ئای ئای) دا، زۆر زاناو گۆیا بووە. ئەڵێن ئەم هۆنراوەیەی (مەولەوی)، لە سەر زار بووە.

«خەرمان خەمان هاوەکەل باوە

شەنکەر ،یەکێکە، دوو شەن بە لاوە»

---

«هەر ساتێ دووریت، سەد ساڵەن جەلام

دەردم کاری‌یەن، وەسەر گەردت بام»

---

● - حەمە شێرە (1840 - 1894)

- دەنگێکی بڵندگۆو گوڵبانگی بووە، بەستەبێژێکی بەهرەمەند بووە، کەسێك بووە خوێندەوارو شارەزاری ئەدەبیاتی ئێرانی بووە، زۆری شیعرەکانی (قاانی)و (حافظ)و (سەعدی) زانیوە، بە مەقامەوە، ووتوونی. خولیاو خووی زۆری لەگەڵ (بەنگ)دا بووە ئەم گۆرانی‌یانەی لە کۆرو کۆمەڵی بەنگێشان و بە هۆشان دا ووتووە. وەك مەقامەکانی (شوور غەمەنگێز، دەشت، هومایۆن)وبەستەکانی (سەیزادە، خاڵەی ڕێبوار، کۆلۆنجەڕێ ڕێ، دادەنگە ،دەم قەندو لێوقەند).

«ئەم قەنـدو لێـوقـەنـد
گشـت گیـانـت قەنـدە
سەوزەی بالاّ بەرز
دڵ لای تۆ بەنـدە.»

---

«مـوددەی حەوت ساڵـە
ئەم داخـە پێـمـە
سەحـەر هەڵئـەسـم
زووخـاو پڕ جێـمـە»

---

● کاکە ڕەشی ئەحان (1845 ـ 1898)

ـ دەنگـخـۆشێکی شۆخ وشـەنـگە، خوێنـدەوار، خاوەن بەهرەیەکی خوایی، لە مەقامەکانی کوردیدا سەردەرچوو و لێزان بووە، بە تایبـەتی مەقـامی (ئـای ئای) بەڵام بێـوەڵـەتی یەخـەی ئەگـرێ، بە هۆی (حـەمـەشێـرە)ی هاوڕێ و هاوڕۆژی ، فێری (بەنگە کێشان) ئەبێت.

تا دەیگـەیـەنێتـە ڕادەیەکی وا، کە (خزم و خوێش و خێزانی) لێی وەڕز دەبن لە ئەنجام دا ژنەکەی دەستی لێ هەڵ ئەگرێ و وازی لێ دێنێ! ئەو ڕووداوە جگەر برە، کارێکی زۆر ئەکاتە سەر گیان و ژیان و گوزەرانی، بە جۆرێك وەك دێوانەو دڵـسوتاوێك بە ناڵـەی (ئـای ئای)، کۆڕو کۆمـەڵ یش تێ ئـەگەیەنێ و بەڵکو لە کوچەو کۆڵانەکان یش دا، دەنگی خۆی ئەدا بە گوێی زەمانەداو شەو لە ڕۆژ گرێ ئەداو مناڵانی گەڕەکیش لە خۆی ئەورووژێنێ، بە هۆنراوە بە ناوبانگەکەی (حەمە ئاغای دەربەند فەقەرەیی) یەوە

«مـیـرزام تەواری. . . .
شیـروانـی بازی ،تـەرلان تەواری
شەرت بێ ،دوعـا، نەکـێـشـم نەفـەس
تا سەبـەب.کار، یار، مەبـۆ وەقـەفـەس»

ئەم شیعرەی (حەمە ئاغا) دەڵێن بۆ (ئەحمەد پاشای بابان)ی وتووە.

«حـەمـە ئاغـا ئافـرەتێکی خۆشـویسـتـووە، یەکجـار عاشقی بووە، (عـەشقی مجنـون بۆ لەیـل). (ئـەحمەد پاشـا)ئـەو ئافـرەتـە مارە ئەکا. ئەمە زۆر کاری کردووەتە سەر هەست و هۆشی ئەو شاعیرە. بەو هۆنراوەیە داوای گەڕانـەوەی یارو دڵـدارەکـەی کردوەتـەوە. (پـاشـا)، کە ئەوەی زانـیـوە بە هەمـوو (تـەدارەك و خشـڵـەوە)، خۆشەویستەکەی بۆ ناردووەتەوە.[19]

ـ جا (کاکە ڕەشی) گۆێندەش بە مەردی (حەمەئاغا) چووە!!

هەر بەو یادگارەوە ئەم هۆنراوانەی بە (ئای ئای) یەوە وتووە، بە هیوای ئەوەی ژنەکەی بگەڕێتەوە لای،

ـ بەڵام (بـۆفی فتح الله)، ساڵی پار لە سلێمانی کە تەمـەنـی «پـتـر لە سەدو دە ساڵ) تێ پـەڕی بوو، کۆچی دوایی کرد، ئەو شیعرانەی (حەمە ئاغای) بۆ مز ئەخوێندەوەو ئەیووت خۆم گوێم لە دەنگی (کاکەڕەش) بووە کە بە مەقامی (ئای ئای) ئەم شیعرانەی ئەووت:

«بـازم فرێـیـەن پەی تەنـافـەوە
سەیـادان وێـڵەن بە قوڵـڵەی قافـەوە»
«هـەر کەس بازەکـەی دەرکـردووم لە ڕێ
بە سەرمـای پایـیـز ئازیـزی بمـرێ»
«بـازم بازنـیـیـەن، سیـنـە پڕ خاڵـەن
منـیش جە دوای‌بـاز حاڵـم بێ حاڵـەن»
«بـازم باز نیـیـەن، نەو شیـروانـی یـەن
خۆی لە بەگـزادەی شەمـێـرانـی یـەن»

ـ بۆ دەقی ڕاستیی (میرزام تەواری) بڕوانە ڕۆژنامەی (ژین) ژمارە (1358). لەوێدا نووسراوە.

---

● ـ عەزیزی ئامینە 1850 ـ 1915)

ـ پیرەمێردی شاعیرو زانا بە شان و باهووی ئەم دەنگخۆش و گۆێندەداو هەڵئەدا:

«شیعـری مەولـەوی بە دەنگی خۆش و (هیجـرانی)[20] ـ (عـەزیـزی ئامینـە) لە ناو ئێمـەدا برەوی پەیـداکـرد. (عـەزیـز) گۆێندەیەکی (عەزیز) بووا!

له مەجلیس دا (هیجرانی)و له چییادا (قەتار) هەر لەو ئەهات، ئەمە ڕاستە کە بەیانی یەك لە ڕاوەکەودا ، قەتارێکی خوێند، کەوی کۆسارانی هێنایە (جونبوش)و (قاسپە)ی لە بەهاراندا لە ئێواراندا لە سەر کارێزی شەریف) کە دەیگوت:-

«بەهارەن، سەوزەن، ئاوەن، پێکاوەن»

- یا بەیانی یان کە بە (قەتار)ەوە ئەیگوت:

«لە وورشەی شەونم لە توێی پەردەوە»[21]

«نەرگس، مەست، مەست چەم، بڵاو کەردەوە»

● - گوڵ جەمین «1870 - 1924»

- ناوی «گوڵ جەمین» کچی عەبدوڵڵای کوڕی مەلا سەعیدی حەبە جوانێیە.

- لە ڕەچەڵەکدا خەڵکی دێی مرانێی لە مەڕ (سیوەیل)ە

- لە خوێندنەوەی (مەولوود)دا (ئاوازەخوان)ێکی دەنگخۆش بووە.

لە (زەماوەند) و(ئاهەنگ)دا بەستەبێژێکی بە توانا بووە.

لە مەقامەکانی (حەیران) و(ئای ئای)و (لاوك)دا گۆیاو گۆیندە بووە.

- لە (بەیت و باڵۆرەدا) شارەزار بووە، داستانەکانی (لاس و (لەشکری) و(قەروگوڵەزەد)د (مەم وزین)ی بە ئاوازەوە، ووتوونی.

- ئەم ئافرەتە کوردە، جلی پیاوانەی لەبەر کردووە، لە (سلێمانی) و (سنە)و (سابڵاخ)و (بانە) ئاهەنگی گێڕاوە، لە شایی و داوەتدا بەستەبێژێکی بەهرەمەندی ڕۆژگاری خۆی بووە. سەردەمای گەنجی لە شاری سلێمانی بە سەربردووە، دواجار شووی کردووە بە کوڕێکی خەڵکی (بانە) ئیتر نەگەڕاوەتەوە سلێمانی و لە (بانە) کۆچی دوایی کردووە. لەو شارە وەچەی لە دوا جێماوە.

لە (بەستە) بەناوبانگەکانی، کە ئەو ئافرەتە گوێندەیە ووتوونی ئەمانە بوون:- (هەی بێ دەبڵێن بێ) (خاسێ تۆ خانمی) (شەو بۆ مەنزڵەکەی نوسرەت خانم) (شایەر بێ لە ناو باخ بێ، ئەو باخەش لە سابڵاخ بێ!!)

(سەڵتەنە) و (هەرزاڵێ).

«هەرزاڵێو هەرزاڵێ - لە هەوار هەڵمان داوە»

«قوربانی ئەو بەژنەت بم - شلکە ڕیحانەی ساوا»

---

«مەمکی شەمامەی حەوترەنگ - خالق نەخشی کێشاوە»[22]

«چاوی ئەڵێی چرایە - بۆ جەژنێ هەڵگیرساوە»

● - (مەلا ڕەعنا) -

- دایکی (صدیقە الملایە)ی بە ناوبانگ و کە بە گۆرانی بێژی عەرەب ناسراوە، ئەم (مەلا زەعنا)یە، مەولوود خوێنێکی زۆر تەواو و نایاب و دەنگخۆش بوو ، قوتابخانەیەکی بچووکی هەبوو، بەرامبەر مزگەوتی (شێخ سەلام) بوو، چونکە ژێوانێکی قسنەکەی (شێخ مستەفا) هەبوو، بە تەنیشت ماڵەکەیانەوە، دەف لێدەرێکی زۆر نایاب بوو.

(1910 - 1912) - مەلا ڕەعنا ئیش و کاری نانکردنی ماڵان ی ئەکرد. لە ماڵی ئێمە (لێرەدا مەبەست لە مامۆستا ئەحمەد خواجەیە - (عثمان) - نان پێوە دەربوو. (کۆڵوو)ی نانە سووتاوەکانی کۆ ئەکردەوە، لە بیرمە ئەیووت (بۆ کسۆکە ترەکیوەکان)[23]. ئەو کاتە (صدیقەمەلا)یە، لە تەمەنی (8/9) (هەشت نۆ) ساڵێدابوو، چاوی وەردینەدار (تەرخۆما)ی هەبوو. دایکم پێی ئەووت (مەلا ڕەعنا) منداڵەکانمان ووردن، تکایە (صدیقە) لە ماڵەوە بە جێ بێڵەو (ناوەشکێنە) و(کولێرە بە ڕۆنی) بۆ ببەرەوە

- لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا (صدیقە) وون بوو.

- لە ساڵی (1941)دا لەگەڵ دەستەیەك (تیاترۆ) بە گۆرانیی بێژی هاتبوو، بۆ سلێمانی لە دوورەوە بە دەنگ منی (ئەحمەد خواجە)ی ناسی یەوە، لە پەردەکە دەرهات باوەشی پێدا کردم.»[24]

(مامۆستا عبدالکریم العلاف لە کتێبەکەیدا (قیان بغداد فی عصر العباسی والعثمانی و الأخیر)دا دەربارەی (صدیقە الملایە) دەڵێت:

(صدیقەالملایە) ناوی (فرجة) کچی (عباس)ە لە ناو کچانی گەڕەکدا لە هەموویان ناوازەو نازدارتربوو، دەنگێکی یەکجار خۆشی هەبوو، بەخیلیان پێ ئەبرد، لە هەرەتی گەنجێتیدا،

سەدیقە مولایە



ئەچووە کۆڕو کۆمەڵی (مەولودخوێن) ەوە، دەنگێکی ئاگرینی هەبوو، سەبارەت بەوەی کە (مەولودخوێنێکی چاك بوو ناونرا (صدیقە الملایە) ئەم کچە لە سای دایکی‌دا لە ژیانێکی خۆش و حەساوەو داوێن پاکی‌دا ئەژییا، بەڵام ڕۆژگار ناچاری کرد کە بچێتە (مەلها)وە.

- گۆرانی بێژێکی هەڵکەوتوو بوو، لە پاش ساڵی (1918)ەوە لە (کۆمپانی‌یەکانی قەوان تۆمارکردن). . لەگەڵ گۆرانی‌ی تۆمارکردن خەریك بووە. لەگەڵ دامەزراندنی ئێستگەی رادیۆی عیراق (1936 - عثمان) یەکێك بووە لە گۆێندە ناسراوەکان و لەوێدا گۆرانی‌یەکانی خۆی بلاوەکردەوە. لە گۆرانی‌یە دیارو بە ناوبانگەکانی (أفندی لایفندی) (یاصیاد السمج) (علی جسر المسیب سیبونی) (جواد جواد مسیبی) (ربیتك أزغیرون حسن)[25]

● - مەولود خوێن لە پیاوان دا:

- «دوای مردنی خاکی (1326کۆ) حاجی عەزیزی قەفتان مەولودێکی کرد، زۆر کەسی بانگ کردبوو لە ناو ئەوانەدا (مەلا حەمە سووری خانەقا) و (مەلا حسەینی سەبیلچی) یشیان تیا بوو، کە دەنگیان خۆش بوو، شیعریان بە (نقام = مەقام - عثمان -)( ئەخوێندەوە.»[26]

● - مەلا فەتاح:

______ خەڵکی سلێمانی بووە، خوێندەوار، دەنگ خۆش ،مەقام زان، گەرۆك ،پێش جەنگی یەکەمی جیهان، لە سلێمانی‌یەوە چووە بۆ ئێران لە (هەمەدان) شەوی (سەبا) موحەرەم لە کاتی (شین و سنگ کوتان)دا، قسە ئەکات و رەخنە ئەگرێ پارچە پارچەکرا. زۆر زیرەك و گۆرانی‌زانێکی پوخت بوو.»[27]

● - حەمەی حەماعەلی خومخانە:

- لاوێکی ووریابوو، لە تەمەنی 13/12 ساڵیدا لە خۆیەوە هەمە جۆرە گۆرانی‌یەکی ئەوت. لە پرێکا بوو بە (عوود لێدەر) بەڵام چۆن (عوود) یك!؟

- لە (دەزوو) کشتەکێکی سێ تاڵی لە سەر (نیوەتەنەکە) یەکی نەوت، بەستراوی درووست کردبوو. هەرچی گۆرانی‌یەکی ئەووت لە سەری دەرئەهێنا ئێمە سەرمان سوڕ ئەما. !

چۆن ئەوەی زانیوە؟ لێمان ئەپرسی ،ئەیووت «مێشکم ئاودارە» بەداخەوە پاش چەند ساڵێك ،لە کاتێکدا عوودەکەی لێ‌ئەدا، دڵی‌وێستا، بەلادا هات و مرد.»[28]

● - رەشە شایەر (1874 - 1927).

- گۆرانی‌بێژێکی میللی‌و هونەرمەندێکی ساکارو تەردەست و دەم گەرم بووە (بەیت و بەندو باوی) زۆری زانیوە، بەستەبێژێکی بە کارو دەنگخۆشێکی (بەزماوەر) بووە دەنگ و ئاوازێکی بە سۆزو سازی پێوە بووە. لەگەڵ مۆسیقاژەنێکی میللی، کە ناوی (سەعەگنە) بووە، لە گۆوەندو گوڵمەزو ئاهەنگەکانی سلێمانی، بە تایبەتی کە لە (سەرچنار) سازکراوە، کۆڕگەرم کەرو بەزم ئاوەر وشادی هێن بوون.

- مامۆستای زاناو مێژوونووس (ئەحمەد خواجە (903،))[29] دەڵێت:

- لە ناوشاری سلێمانی شایی‌و هەڵپەرکێ گێر بوو، ڕۆژانی هەینی‌و چوار شەممەوان سەیران بوو، (رەشە) بەرنە ئەکەوت. بەزم گێڕو گۆرانی بێژێکی فۆلکلۆری بوو ، پێش جەنگی یەکەم پاش جەنگی‌یەکەم نەخوێندەوار بوو زۆر کۆمێدی بوو .»[30]

● - عەلی خان

______ ئەم هونەرمەندە کورێکی خەڵکی (سابلاخ) بووە. نابینابووە، لە (مەهاباد)ەوە لە دەست ئێش و ئازاری عەجەمەکان کە بە کوردەکانیان ئەگەیاند، هەڵاتووەو هاتووەتە شاری

سلێمانی ساڵی (1920).

گۆیندەیەکی زاناو (تارژەنێکی) بێ وێنە بووە!

لەو سەردەمەدا (رادیۆ) دانەهاتبوو، (عەلی خان) بە شەو لە چایخانەکان لەگەڵ دوو کەسی تر، یەکێ (تەپڵ)و ئەویتر (دایەرە زەنگی)[31] لێ ئەدا، بۆ، خوێشی (بەستە)ی ئەووت، بەستەکەی بە (تار) دووبارە ئەکردەوە. زۆری بەستەکانی لەم بابەتانە بوو:

«هەر چەند نوێژ ئەکەم نوێژم بەتاڵە»

«ئەلحەمد ئەخوێنم تۆم لە خەیاڵە»

«جووتێ کەوشی رەش باناڵچەدار بێ»

«بینێ بە جەرگما با مۆری دیار بێ»

«نەشەرتت، شەرتە، نەفامت، فامە»

«یەك پەرە کاغەز، دوعاو سەلامە»[32]

**● ـ ئەحەی ناسر (1876 ـ 1923)**

ـ ئەم بەهـرەوەرە، لە سلێمانی لە گەڕەکی سەرشەقام لە دایك بووە، لە خێزانێکی هەژار، لە تەمەنی دوانزدە ساڵاندا، چووەتە بەرخوێندن، لای مەلای مزگەوتەکان کتێبەکانی (گوڵستان)و (بۆستان) و(پەندی عەتتار)ی تەواو کردووە.

ـ وازی لە خوێندن هێناوەو خەیاڵ و خولیای کەوتووەتە سەر ئاوازو گۆرانی‌ووتن.

ـ دژی نەریتە ناهەموارەکانی کۆمەڵایەتی بووە، زۆر رقی لە زۆردارو ستەمکار بووە.

ـ گاڵتەی کردووە بە جیاوازی چینایەتی.

ـ هەمیشە مەست و سەرخۆش بووە، هاورێی گیانی بە گیانی جامی مەی بووە جارجاریش، کە پەژارەی زۆر ئەبوو، مژی لە (تلیاك)ئەدا، هەندێ جاریش جگەرەیەکی (بەنگی) بۆ فیز ئەنا بە لای لێوییەوە ئەو کاتە خۆی بە پاشای سەر زەمین نەئەگۆڕێوە.

ـ لە ژیان دا زۆر سادەو ساکار بووە، حەزی بە پارەو سامان نەکردووە.

ـ پیاوێکی زۆر دڵنەرم و بە رەحم بووە.

بەزەیی زۆر بە هەژارو بێ‌نەوادا هاتووەتەوە.

لەم بارەیەوە گۆڤاری (خواندەنیهای) فارسی، کە لە (تاران) چاپ کراوە لە یەکێك لە ژمارەکانیا ئەڵێ:ـ

«جارێك ئەحمەدی ناصر گۆرانی‌بێژی بە ناوبانگی کوردستانی عێراق ـ کە خەڵکی شاری سلێمانی‌یە، لە خیابانەکانی (لالەزار)ی ـ تاران ـ ئەسوڕایەوە. !

چاوی بە کابرایەکی دەروێشی ڕووت و داماو کەوت دەروێش داوای چەند پوولێکی لێ‌کرد، ئەحمەد هیچی پێ‌نەبوو.

بە کابرای دەروێش ئەڵێ: «کەوڵ و کەشکۆڵەکەتم بدەرێ ئەم گوزەرو بازاڕەت بۆ ئەگەڕێم ،خۆت و بەختت چیم دەستکەوت!.

دەروێش (کەوڵ وکەشکۆڵ و پۆستەکەی پێ‌ئەدا»و ئەویش ئەچریکێنێ‌و خەڵکی گوزەر ئەم دەنگەیان نەبیست بوو، بڕوایان نەئەکرد ئەمە دەنگی ئینسانێك بێ. !!

هەموو بە جارێك سەرسام و حەیران بوون، بە سەدان بەڵکوو بە هەزاران کڵاوو تەقیلە بە ئاسمانا هەڵدرا. !

هەر کەسێ دەستی ئەکرد بە گیرفانیاو چی بە دەستەوە بهاتایە لە (تاکەو جووتە) ،خۆی ئەگەیاندە دەروێش ئەحمەدو ئەیکردە ناو کەشکۆڵەکەیەوە. هێشتا نەگەیبووە ناوەڕاستی گوزەرەکە کەشکۆڵەکە مالآن ماڵ بوو!! لە تاکەو جووتە. ئیتر .ئیتر (کاکە ئەحە) وورتەی لە خۆی بڕی‌و گەڕایەوە بۆ لای دەروێش هەرچەند خۆی پارەو پوولی پێ‌نەبوو، بەڵام تاکەیەکی لەو پارەیە هەڵ نەگرت هەمووی بە خڕی‌یەکەوە کردە کۆشی مام دەروێش.»[33]

ـ زۆر ڕاستە ئەحەی ناسر دەنگێکی خواپێداوو وخۆشی هەبووە زووربەی زۆری مەقامە ڕۆژهەڵاتی‌یەکانی زانیوە، سەرەڕای مەقامە کوردی‌یەکان. وەکوو دەڵێن (مەقامی سەفەر)[34]

کە تایبەتە بە شاری سلەیمانی. ئەم ئاوازە ـ ئەحەی ناسر ـ لە (نەغمەی بەیات) دەری هێناوەو ئەو (تەرزە هەوا) یەی لێ پێکهێناوە کە تام و تەزووو تایبەتی‌یەکی خۆی هەیە، هەرچەند خوردەزادی مەقامی (بەیات)ە بەڵام کاڵایەکی ئاوازی کوردی بە باڵادا براوە. لە پۆلێنی مەقامەکانی (ئای ئای)و (ئەڵڵاوەیسی)و (خاوکەر) دادەنرێ.

ـ (ئەحمەدی ناسر). زۆر کەسی ناسراوی کۆمەڵی ئەوسای

کوردەواری دۆست و ئاشنای بووە، سەبارەت، بە (نەوا)ی نایاب و ناسك و ئاوازە ناوازەکانی، لەو کەسانە (محمود پاشای جاف)و (سەید ئەحمەدی خانەقا)و (حەپسەخانی نەقیب).

(مامۆستا ئەحمەد خواجە ئەڵێت:ـ

ـ ئەحەی ناسر: «دەنگ خۆش، مەقام شوناس، ڕووخۆش، دەروێش، بێ‌ماڵ و خێزان، زۆرتر ژیانی لە ئێران لە (کرماشان و هەمەدان)دا بووە.

ـ لە هەموو مەقام و دەستووری گۆرانیی‌دا؛ لەو پەڕی دانایان دا بووە. حەزی لە هەموو شتی جوان ئەکرد. خوێندەوارێکی باش بوو، ڕەنگە شیعری هەموو شاعیرانی (کورد)و غەیری کوردی زانیبێت دوورنی‌یە. بەڵام زۆر بە گران ئەیووت.

زۆر ئێواران (من)و (شێخ نووری شاعیر)و ئەحەی ناسری هونەرمەند کۆڕی بەزم و ئاهەنگمان بووە.

ـ (شێخ نووری)دەنگخۆش و مەقام زان بوو.[35]

ـ «ئەحەی ناسری بلیمەت و بەهرەمەند لە دەمەی مەستی‌و بێ هەستی‌دا دەمانچەیەك ئەنێ بە (کاکی) کانی‌سپیکەیەوە لە ڕێکەوتی 1923/9/24 دا، (مارفی ئەحلان) کە ئامۆزای (کاکی)یە لە تۆڵەی ئەو تاوانەدا، تفەنگێك ئەنێ ئەحەی ناسرەوە سەرەنجام بەو زام و کەسەرە بە خەمینەوە لە ڕۆژی 1923/9/30 کۆچی دوایی ئەکات، لە گردی سەیوان بە خاکی ئەسپێرن.»[36]

چرای ژیان و هونەری ئەم بەهرەمەندە لێرەدا ئەکوژێتەوە.

ـ [1919 ـ 1920]

ـ «کاتێك درۆو دەلەسەی ئینگلیزەکان کەوتە ڕوو، ئەو بەڵێنانەی، کە دابوویان بە کورد وبە (شێخ مەحمود) لێ‌ی پاشگەز بوونەوە. ئێمەش کۆمەڵە گەنجی خوێن گەرم بووین مێشکمان بە بیرو باوەڕی کوردایەتی پڕ بوو. شەو بە کۆڵاندا ئەسوڕاینەوە (سروودی تورکی)و (گۆرانی‌ی کوردی) مان دژی دەوڵەت ئەووت. یەکەمین گۆرانی‌یەك کە لە تورکی‌یەوە گۆڕی بوومان بۆ کوردی‌و بە دەنگێکی خۆش ئەمان ووت ئەمە بوو.

«هەرایە، پشێوی‌یە، دوژمن گەیشتە لانەی شێر»

«کێ ئەتوانێ بوەستێ بەرامبەر کوردی دلیر؟» .

ئەوتراو ئەوترایەوە، دەماو دەم بە ناو منداڵانی گەڕەکدا بڵاو بووەوە. وای لێ هات کەوتە سەر زمانی گەورەو بچووك.»[37]

● ـ 30/ ئەیلوول /1922

پاش سێ ساڵ دیلی‌و دەربەدەری‌و دەردی سەری (شێخ مەحموودی قارەمان)؛ لەو ڕۆژەدا گەیوەتەوە شاری سلێمانی:

مامۆستا (رفیق حیلمی) ئەڵێت:

«ئێمەش دەستەی مامۆستاکان لە ناو خۆماناو (قوتابی‌یەکان) چیمان پێ کرا، کردمان ، «گۆرانی‌ی بە پیرەوە چوون ـ نشید الأستقبال» لە لایەن نیشتیمانپەروەر، مامۆستا (زێوەر)ەوە ڕێکخراو فێری دەستەی گۆرانی‌ی قوتابی‌یە دەنگخۆشەکان کرا هێشا شێخ مەحمود لە بەغداد بوو، لە ناوچەکەی بەردەمی (دەبۆ) (قوتابخانەی نموونەیی سەعادەت) ئەیانخوێند هیچ جارێ نەبوو فرمێسکی شادی بە چاوی (زابتەکان)و (لاوەکان)دا نەیەتە خوار[38]

ـ مامۆستا (حمدی صاحیبقران) یش دەڵێ:ـ

«تەقەی تۆپی سەلام و دەنگی
(مۆسیقا)و (دەهۆڵ) یەککەوت»
«وەهام زانی سلێمانی ئەبێتە،
(جەنەت)و (مەحشەر)»

---

ـ هەر لەو کاتەوە مامۆستا (زێوەر) سەرو ساختی لەگەڵ جیهانی (ئەدەب) پەیداکردووە، لایەنی (نیشتیمان پەروەری وکوردایەتی) زۆر گرتووە، هۆنراوەی هەست بزوێن و پڕ تەووتین ی داناوە، کە بۆ (هەوای گۆرانی‌ی)و (ئاوازی سروود) بشێن.

ـ «پیرەمێردی شاعیر زۆر ڕێزی لە مامۆستا زێوەر (1875 ـ 1948) گرتووە. کە بابەتی (سروودی نیشتیمانی) وباسی ئەکرا، مامۆستا (زیوەر)ی لە ژوور هەمووانەوە دائەنا. بە ڕاستی‌ی ئەو سروودانە لەو سەردەمەدا کارێکی زۆر بەهێزیان هەبووە بۆ جوڵاندنەوەی هێزی نەتەوایەتی.»[39]

مامۆستا زیوەر گەلێك هۆنراوەی بۆ هەوای (سروود) داناوە.

لێرەدا کەمێکیان وەك نموونە پیشان ئەدەین. کە زوربەی ئاوازی ئەو سروودانە لە (تورکی)یەوە، وەرگیراون.

● - (واوەتەن)

واوەتــەن خەمــلیــوە وەك گوڵ

نەو بەهــاری میــللەتــە

باخی حەیاتی) (ئەساسی ئەم مەدرەســەیــە) (ئـەی شاگردانی وەتەن) (هێند شیرینەلام).[45]

● - (ت 2/1922).

- لە بانگەوازێکدا کە (شێخ مەحمودی) نەمر لە سلێمانیدا بلاوی کردووەتەوە، داوا ئەکا (نمایش) ێکی جەماوەری بکرێ دژی ئەو دەستــەو تاقمــانــەی کە ئەیانــەوێ مافی کورد پێشێل بکەن .

«لـەو نمایشـەدا دەستـەی پیادەو تیپ تیپ سوارەی سوپا بە چەك و هەمـوو تەدارەکیـیەوە، لە بەردەم (مـەلیـك مەحمـوودی یەکـەم)دا تێپەربـوون لە لایـەن (گـەنجـە دەنگخـۆشـەکـان)و دڵسۆزەکانەوە، ئەم ووتارە (هۆنراوە - عثمان) بەرزو بە نرخەی (شێخ نووری) بە ئاوازی سروودی سوپاییەوە، لە پێشداری سوپاوە ئەوترا.

«ئەی عەسکەر، ئەی منداڵ و جگەر گۆشەی وەتەن»
«ئێوە بە گیان، بەدڵ، پارێزگاری وەتەن ئەکەن»
«ئێوەن بە دڵ، کە سەرفی ئەکەن، غیرەت و بەدەن»
«ئێوە وەتەن لە میحنەت و زیللەت نەجات ئەدەن»
ئامادەن بۆ کەفەن.[46]

- شێخ نووری شێخ ساڵح (1895 - 1958).

«شێخ نووری وەك چۆن شاعیرێکی بەرزو بلیمـەت بووە، هەروەها لە بەهرەی دەنگخۆشیدا، دەنگێکی خواپێداو خۆشی هەبووە. (قادری حاجی حسین» ئەڵێت.

«شێخ نووری» بە ناویـانگ بوو بە (شاعیر)و (دەنگخوش)و (جــوان). مەقــامــەکــانی (ســەفـەر)و (قـەتـار)و (خـاوکـەر)و (ئەڵڵاوەیسی) زۆر بەوەستایانە ئەوت و دەنگی خۆش و خەمرەوێن بوو.[47]

- مامۆستـا شـاکـر فتـاح ئەڵێ: ساڵی 1926 لە قوتابخانەی (ئەوەلی سلێمانی) قوتابی بووم، (شێخ نووری) شاعیر ئەهات سروود وگۆرانیی فێرئەکردین. یەکێك لەو سروودانە (ئەو لادی وەتەن) بوو. مامۆستا عبدالقادر قەزازیش ئەڵێ تەمەنم دە دوانزە ساڵان بوو لە قوتـابخـانـەی (سـەرەتـایی سروودی (ئـەو لادی وەتەن)یان فێر ئەکردین»

- مامۆستا ئەحمەد خواجە ئەڵێت:

«شێخ نووری، دەنگ خۆش، مەقام زان، شاعیر، ئەحەی ناسـری هونـەرمـەنـد زۆر حەزی لە دەنگی شێخ نووری ئەکرد پێی ئەووت (نووری، تەنیا کورکەیەکم بۆ بکە، ئیتر بەسمە، تا بەیانی گۆرانی بڵێم و نەیبرمەوە»[48]

- شێخ نوری شاعیر. هۆنراوەی سروودی زۆرە لەمانە (ئێمە کەشافەین) (عیلمە میللەت).

● - 18/ کانوونی یەکەم /1923

(سمـــایـــل ئاغـا - سمکـۆ)ی جەنگـاوەرو جەوامێـری کوردو عەجــەم شکێن، لەو رۆژەدا کە هاتـــووەتـە سلێمـانی بۆ دیـارو دیـداری (شێـخ مەحمـوودی مەلیـك) پێشـوازییـەکی دڵنەوازو ئاوازەی کراوە.

(مــامـۆستــا رفیق حیلمی 1898 - 1960) ئەڵێت «رۆژ ئاوا بوو، کە لە (مستەفاپاشا)وە، کاغەزێکم وەرگرت، داوای ئەوەی لێئەکردم، کە هەر بەو شەوە (گۆرانییەکی جوانی میللی) رێك بخەم و فێری قوتابییەکانی بکەم بۆ ئەوەی، کە لە بەرەو پیری (سمکــۆ)دا بخـوێنـرێتـەوە. دەزبــەجێ چوومـە، مەکتـەبی (ئـەعـدادی)، شەو بوو، بە رۆژ ،لـەبــەر ئەمــە بە ئاسـانی قوتابییەکان کۆکرانەوە، تا نیوە شەو لەگەڵ دەستەی قوتابییانی گۆرانیی خەریك بووم، هەموو شتێك جێبەجێ کرا»[49]

- لێرەدا مامۆستای زاناو مێژوونووس خۆی ئاشکرا ئەکا وەك چۆن هەســتــیــارو هۆنــەر بووە، هەروەهــا (هــەواخــوان)و (ئاواززان)یش بووە، سەبارەت بەم گۆرانییە یا خۆی ئاوازەکەی داناوە یا خود لە (هەوا)ی تورکی وەریگرتووە. چونکە مامۆستا (رفیق حیلمی) هۆنــراوەی (کــوردین ئێمـە)ی هەیـە کە هەر لەو رۆژگـارەدا ئەو هۆنـراوەیـەی دانـاوە لە سەر ئاوازی تایبەتی فێری

قوتابی‌یان کراوە لە شاری سلێمانی‌دا کە لە ئاوازی (بـرگیزلی سیس)ی تورکی وەرگیراوە.

سروودێکی دیکەشی هەیە بە ناوی (وەتەن) کە ئاوازەکەی لە گۆرانی‌ی (داغلر آشارەق)ی تورکی وەرگیراوە.

مامۆستا (رفیق حیلمی) ئەڵێت: ـــــ «باندێکی بچووکی (مۆزیقە) شمان پەیدا کرد، کە قوتابیەکانی (قوتابخانەی ناوەندی محمودی) ئەچوون بۆ مەشق (مۆزیقەیان) لێ‌ئەداو بە ئاوازی ئێجگار بە سۆز (گۆرانی میللی)یان ئەخوێند».

● 14/ نیسان /1923

- مامۆستا ئەحمەد خواجە ئەڵێت:

«لەو رۆژەدا ئەچووم بۆ (هەڵەدن) بۆ لای (شێخ مەحمود) سوارێکم بیــووە هاورێ دەنگێکی یەکجـار خۆشی هەبـوو، بە ئاوازی (ئای ئای)زۆر بە سۆزەوە ئەم هۆنراوانەی ئەووت.

«ئـەی خوای بانـی سەر

کوشـــندەی هەزار»

تاکـەی ئەمانکـەی لە گیـانمـان بێـزار.»

دوایی دەستی‌کـرد بە (حـەیـران) ووتن بەڵام من خوێن لە جگەرم ئەتکا.[50]

- ئەم سوارە ناوی (حەمە کوردە)یە. مامۆستا دەڵێ:

«حەمەکوردە» مزگەر بوو، دانیشتووی گەرەکی سەرشەقام بوو لە سلێمانی. دەنگی یەکجار خۆش بوو، لە گۆرانی‌ی (حەیران)و (ئـای ئای)و بەستـەی فۆلکلۆری‌دا بێ وێنـە بوو. کوری بەزم و ئاهەنگ بوو، خۆی کارگوزار بوو پێویستی بە کەس نەبوو، ئەو حەیرانەی ئەو ئەیووت تا ئێستا لە کەسێکی ترم نەبیستووە، تا ساڵی (1925) ئەم دی»[51]

● - مامە (. . .)؟

- هەروەها مۆسیقازانێکی بلیمەت مان هەبوو، پێ‌یان ئەووت (مـام. . .) لە دێی جاسـەنـە ئەژیـا، بە گەنـجی‌و باوی سەربـازیـدا لە دەستـەی مۆسیقـای سوپـای عوسمـانلی‌دا (مـۆزیقـەلێـدەر) بووە لە تەمـەنی حەفتا ساڵی‌دا لە ئەشکـەوتی (جـاسـەنـە) لە بارەگـەی (شـۆرشی شێـخ مەحمـود)دا بە (شمشاڵ)و (قرنـاتە)و (بۆری) هەزاران مەقام و بەستەی لێ‌ئەدا، بە تایبەتی (شینی دڵداران) بە داخەوە، ناوی خۆی‌و باوکیم لە بیـرچـووەتـەوە رەنگـە لە دێی (جـاسـەنە) خزم و کەسی مابێ‌و بناسرێ (1923 - 1924).[52]

● - عەبە حەیران: (1893 - 1972)

- لە دێی مرانێی شارباژێر لە دایك بووە.

- لە (چوارتا)و (سلێمانی) ژیانی بە سەر بردووە.

دەنگخۆش و گۆیندەیەکی لێ‌هاتوو بووە، بە تایبەتی لە ووتنی مەقامی (حەیران)دا، بۆیە هەر بەو (ناوە)شەوە ناسراوە.

- گۆرانی‌ی بێژ و شاعیری میللی دەربارەی (شێخ مەحمودی نەمر)بووە. بەشداری زوربەی ئەو شەرانەی کردووە، کە دژی ئینگلیـزەکـان کردوویـانـە هان و دنـەی شۆرشگێـرەکانی کوردی داوە، بۆ پەلامار، بە ئاوازی بە سۆزو گۆرانی‌ی سەرگەرمی‌یەوە.»[53]

● - رۆوف بەگ:

کوری سمایل بەگ برای رەزا بەگی مەشهوور، یەکەم کەس بوو لە سلێمانی‌دا (عوودژان و لێدەر)بوو.

ئامـادەی هاتـن و بەزم گێـران بوو. گۆرانـی‌ی تورکـی زۆری ئەزانی، بەڵام دەنگی یاریدەی نەئەکرد!

(ئەکرەم)ی کوری‌و چەند کەسێکی تری فێری (عوود) لێدان کرد. (ئـەکـرەم) بوو بە، بەرێـوەبـەری دەستـەی مۆسیقـای سوپای‌عێراقی وا بزانم لە ساڵی (1924)دا بوو.[54]

● - صبری کاکە رەش:

- دوای جەنگی یەکـەم لە تورکیـاوە بە ئەفســەری هاتـەوە سلێمـانی (دەنگخـۆش)و (مـەقـام زان)بـوو. لە ناو دەوست و برادەرانی درێغی لە ووتن نەئەکرد. (شێخ مەحمود) دەنگەکەی خۆش ئەویست! زۆر جار بانگی‌ئەکرد گۆرانی‌ی بۆ بڵێ ساڵی (1924) بوو بە ئەندازیار.[55]

● - (ئەحمەد دیلان)

خوێنـدەوار بوو دەنگخـۆش شیعـرزان ،مـەقـام خوێن لە ناو کۆرو پیـاوانی بەرێـزدا لە مەقـامەکان بە کوردی‌و غەیری کوردی شیعری ئەخوێندەوەو ئەیووت، زۆر کەم تێکەڵی هەبوو. (ساڵی 1920)[56] مامۆستا (رەشید نجیب)یش دەڵێ: وەك دێتەوە ف

بیرم (مەلا ئەحمەدی دیلان) لە یاری نجانێن دا پاڵەوانێکی بێ هاوتابوو، ئەشێ بەر لەو (فنجانێن زانی)بە هونەرتر هەبوو بێ. بەڵام ئەو دەنگـە خۆشـەی ئەو ئەو شیعـرە جوانـانەی ئەو ئەیزانی، ئـەو رووخـۆشی و نوکتـەزانی یـەی بەلای ئەوەوە هەبـوو لە کەم یاریکەری تردا بینراوە.[57]

● - رەشید صدقی:

(کوڕی قادر ئەفەندی گەورە).

دەنگە خۆش بوو خۆی زۆری حەز لە گۆرانیی ووتن ئەکرد. بە بێ، پێـووتن ئەیـووت. زۆر جار پێمـان ئەووت بام داوات لێبکـەین گۆرانی یـەکـەت مەشکێنە ئەیووت (دەنگە و گۆرانیی خۆی رێزدارە (صدرنشینی مەجلیس و ئاهەنگە[58] !

● - ئەحەی خولە:

———— ئەمیش یەکێـك بوو، لە گۆرانی بێـژەکـانی سلەیمـانی بەر جەنـگ و دوای جەنگی یەکەم، (دەنگ خۆش)و (شـانـامـە خوێن)و (مـەقـام زان)و[59] لە کۆڕی دانیشتن دا، قسەخۆش و ئاهەنگێڕبوو.

● - ئەحمەدی سەعید (1900 - 1938)[60]

ناوی (ئەحمەد) کوڕی (سەعید) کوڕی (ئەحمەدە قیتە) یە.

- لە سلێمانی لە گەڕەکی (پیرمەسوور) لە دایك بووە.

- دەنگخۆشێکی بەهرەمەند ومەقام زانێکی چاك بووە.

سەبارەت بە هونەرەکەی زۆر رێزی لێگیراوە لە کاتێکدا کە لە پێنجوین (رئیس عرفا)ی پۆلیس بووە، لە ساڵی (1936) لە سەر داخوازی وەکیلی موتەسەریفی سلێمانی (ناجی هورمزی) داوەتی بۆ بولبولی کوردستان (سەید عەلی ئەسغەر)ی کردووە.

لە (بلکیان) دووشەو بەزمی (گۆرانیی و گۆوەند)یان ساز کردووە[61]. ئەم بەهرەمەندە لە (کۆمپانی قەوان) لە بەغدادەوە داوای لێکـراوە کە گۆرانـی یـەکـانی بۆ تۆمـاربکـەن لەبـەر کەمتەرخەمی و کاروباری خۆی نەچووە بە دەنگیانەوە، داخەکەم شوێنـەواری دەنگی لە دوا بەجێ نەمـاوە لە مەقـامی (سێگـادا) یەکجار وەستابووە کە بەم هۆنراوەی مستەفا بەگی کوردییەوە ووتویەتی:-

«شەهیدی عەشقم و مەمشۆن و کفنم بۆ مەکەن یاران

«گەواهی حەشرە، بۆ دەعوای شەهادەت بەرگی خوێنینم»

ئەم (بەستە) یەش بەم هۆنراوەیەوە بە دەنگی ئەو ووتراوە:

«ئەوا گەیشتەجێ قەتاری سنە»

«یەکێکیان تیایە نازداری منە»

«سەرقافڵەچی گیان، بگرە لەنگەرێ»

«لەگەڵ تۆدایە ناسکە دولبەرێ»[62]

● - حەمەی عەلۆ (1870 - 1931)

- مامـۆستـا نجم الـدین مەلا ئەڵێ: گۆینـدەکـانی وولاتی سلێمانی ئەوەی من دیومن (حەمەی عەلۆ)و[63] ...

- مامـۆستـا (ئـەحمـەد خواجـە) ئەڵێ:- گۆینـدەیـەکی خوێنـدەوار، شیعـری شاعیـرانی ناوداری لە سەر مەقـامـەکانی (سێگا)و مەقامە ناودارەکان ئەیووت.[64]

- مامـۆسـتـا بێخـود (1875 - 1955) سەبـارەت بەم (گـۆینـدە)یـەو بەهـرەی دەنگخـۆشی یـەکـەی لە تاکە دێرێکیدا دەست نیشانی کردووە. دەڵێت:-

«شووڕەیێ بە یادی لێوی بڵێ ئەی (حەمەی عەلۆ)[65]

«ئەمما بە شیعری مونتەخەب و بەیتی (فەرد)ەوە.»

## (1926 - 1927)

● - (عبدالواحدکوڕی حاجی مستەفا 1886 - 1973)

خەڵکی شاریکـۆیـەیـە، لە ئەستـەمبـوڵ بڕوانـامـەی کۆلێژی سوپایی وەرگرتووە. هەر لەوێش فێری هونەری (مۆسیقا)بووە.

(پیـانـۆ) زانێکی شارەزا بووە، کە هاتـووەتـەوە عێـراق، ناردوویانە ئەسلێمانی: وەکوو خۆی ئەڵێت:[66]

«لـە سلێمـانـی (تیپێکی مۆسیقـا)م پێـك هێنا، کە ئەویش لە سەر (نۆتە)ی تازە بوو. لە سەر ئەم ئاوازانە بوون.

(کـراچیت) (کـۆیـیـەر) (سـەمی کـۆیـیـەر) لە ماڵی خواجـە ئەفەندی، کە نزیك مزگەوتی گەورە بوو (ماڵی خواجە ئەفەندی) بووە (قـوتـابخـانـەی مۆسیقـا) لەو کاتـەدا نزیکەی پەنجا قوتابیم هەبـوو. لەوانـە مامـۆستایان (شاکر فەتاح)و (ڕەفیق چالاك)[67] بوون وەك لە بیرم بێ:

ـ هەموو ئێوارەیەك پرۆڤەی مۆسیقامان ئەكرد، قوتابی لە ناو سلێمانی‌دا ئەهاتن، بۆ فێر بوونی (مۆسیقا) دوای ئەوەی ئینگلیزەكان بە سەرۆكایەتی (میجەر كلاین = كلین)!

سلێمانی‌یان داگیركرد. ، ئەم قوتابخانەیەی تێكداو زۆر ئازاری ئەندامەكانی ئەم تیپەی داومنی نەفی (فاو)كرد

ـ مامۆستا ئەحمەد خواجە ئەڵێت: ئەمە ڕاستە (عبدالواحد) دەرسی مۆسیقای بە قوتابی‌یان ئەووت بەڵام (ڕەفیق چلاك)ی تێدا نەبووە. تاكوو (عبدالواحد) لە سلێمانی ئافرەتێكی خواست كە ناوی (صدیقەخان) بوو ئامۆزای باوكم بوو.

ـ مامۆستا (شاكر فەتاح) دەڵێت:

«ئەو تیپە مۆسیقایە ساڵی 1926 /1927 بوو، كە لە سلێمانی چیرۆكی شانۆیی (نیرۆن) پێشكەش كرا بڕێ پارە كۆكرایەوە، چەند (ئامێرێكی هەوایی مۆسیقا)ی پێ‌كڕرا، مامۆستا (عبدالواحد حاجی مستەفا) وانەی مۆسیقای فێر ئەكردین، كە لەو ڕۆژەدا (مۆسیقا لێدان) یەكجار عەیب بوو، بەڵام من یەكەمین كەسێك بووم چوومە تیپی (مۆسیقا)و ئالەتی (كۆرنێت = قرناتە)م دەست دایە كە فێری ببم. لە ئەندامەكانی ئەو تیپە (ڕەحیم كریم) كە ئێستا زەعیمی موتەقاعیدە ، (ڕەمزی قەزاز) (جمال مجید)بوو ئەفسەر (جلال مجید)و (فائیق زیوەر = بەختیاری شاعیر)[68] پرسیم ئەی (ڕەفیق چلاك)تان لەگەڵدا بوو؟ ووتی «نەخێر نە لەو تیپەدا بوو نە هاوتەمەنی ئێمە بوو.»

ـ ئەوەی شایانی ئەم باسە بێ (تەمسیل لە شاری سلێمانی)دا لەو ساڵانەدا ئەم چەند (شانوگەری‌یانە) پێشكەش كراوە.

1 ـ لە تەرەف تەلەبەكانی مەكتەبەوە بۆ مەنفەعەتی كەشافە شەو سێ‌شەمموی ڕابووردوو (27 تەمووز 1926 ـ عثمان)

لە بینای مەكتەب دا لە ژێر عینوانی (نەتیجەی سەفاهەت و سەعی) ڕوایەیەك تەمسیل كرا، لەگەڵ ئەوەی كە (یەكەمین جار) یان بوو، حەقیقەتەن زۆر جوان تەمسیل كرا. جێی تەقدیرو تەحسینی هەموو لایەك بوو. بژی موحیبانی عیلم و ئەدەب[29].

ـ ئەم تەمسیلی‌یە وەك باس كرا بۆ (مەنفەعەی كەشافە)بووە، دەبێ لە پارەی ئەم تەمسیلە ئەو ئالەتە مۆسیقایانە كڕدرابێ، بەڵام ئەو تەمسیلەی (نیرۆن) كە مامۆستا (شاكرفتاح) ناوی هێنا.

2 ئەو (تەمسیل)ە لە (بینای قوتابخانەی زانستی)دا كراوە لە ڕۆژانی 27/28/ تەممووزی /1927 دابووە.

لە ژێر ناوی (زوڵم و زۆرداری ئیمپراتۆری ڕۆمانیا!!»[70]

3 ـ هەر لەو ساڵانەدا ( تەمسیل)ێك بۆ (مەنفەعەتی زانستی) پێشكەش كراوە لە شەوی «شەممە 29/ ئاب /1928 دەربارەی (شۆڕشی گەورەی فەرەنسا)[71]

ـ ساڵی (1928)

ـ «بە موناسەبەتی بەهارو سەفوەتی هەواوە (هەیئەتی تەعلیمیەی مەكتەبی ئەوەلی سلێمانی) بە ناوی (تەتیقات) و(كەشافە)وە ،چوون بۆ سەیران بۆ قەراغ شار، كە بە باغی (شێخ مەحموود)ەوە مەشهوورە. سەعادەتی موتەسەڕیف،[72] بۆ مەسروریەت و دڵخۆشی تەلەبەكان تەشریفیان بردە مەوقیعی سەیرانەكە،

ـ بە لای ڕاستی‌یانەوە (باندی مۆزیقەی) مەكتەب، دەستی‌كرد بە نەوعی (هەواڵێدان) (تاقمی شەرقی بێژ) بە (ئەنواعی گۆرانی‌ی وەتەنی) حازرین یان تەفریح كرد.

ـ لە خیتامی (نوتق)و (شیعرەكاندا) (بە گۆرانی‌ی وەتەنی‌و مۆزیقە) حازیرون مەسروور كرا.»

ـ لە هەمووی خۆش تر چەند شیعرێكی فائیق عەبدوڵلا «فایەق بێكەس ـ عثمان»بوو، كە بە سەر كەرەكەیەوە لە بەردەم عوموما ئیرتیجالەن بەحسێ لەمەدح و تەشویقێ كەرەكەی خوێندەوە. موقابیل بە وەیش لە تەرەف (موتەسەریف)ی شەوی‌خۆشەویستمانەوە، (دە ڕوپیە) بەخشیشی دایە. ئەمە هۆنراوەكەیە

خۆت لەڕێ لادە بۆ ئەسپ تازی
با نە ختێك بۆتان بكەم ڕەبازی
بژی كەرەكوڵ چەند نەشئە بەخشی
بەهەیبەت كەرو بە هیمەت ڕەخشی[73]
قوربانە سادەی بێرە چوار ناڵە
هەر جۆیەكت خواردبێ حەڵاڵە

ڕووی خۆت سپیکە لە ناو ئەم خەڵقە
دەخیلە نەم خەی لەم جێیە ڕەقە
گوێت قوت کەرەوە، کلك ڕاوەشێنە
هەر چییەکت تیایە لێرە بینوێنە[74]

- فائیق بێکەس (1905 - 1948)

- هۆنراوەکانی ئەم شاعیرە خزمەتگوزارەی کورد، برێکی باشیان لە بواری (گۆرانی ی)و (سروود)دا کەڵکیان لێ وەرگیراوە. چەند پارچەیەکی نایاب و ناوەزەیان کراون بە سروود، وەك هۆنراوەکانی (شاخی ڕەنگاو ڕەنگی گوێزە)و (دڵ لە دەردی وتەن پەست وگیراوە) خوایە وتەن ئاواکەی) (ئەی دلێران) (لاوانی وتەن)و هەندێکی تریان بە (هەوا)ی تایبەتی دەگوترێن وەك (ئەی مانگ) (سەدەی بیستەمە) (بەهار نامەوێ جوانیت بینم).

- لێرەدا لە سەرمانە ئیستێك بکەین و چوست و چالاکی پیرەمێردی شاعیری بە ناوبانگی کورد (1867 - 1950) فەرامۆش نەکەین.

لەو ڕۆژەوە (22/ شوبات) 1926 کە پیرەمێرد، هاتۆتەوە شاری سلێمانی تا ئەو دەمەی، کۆچی دوایی کردووە.

سەرومر ژیان وگیانی خۆی کردووەتە .قەبەڵی (ئەدەب و زانست و هونەری) کورد، سەبارەت بە (ئاواز)و (سروود)و (گۆرانی ی) کوردی کەم تەرخەمی نەکردووەو بەرو بیری پر برەوی هەیە لەم بوارەدا مامۆستا (هاوار) دەڵێت: «پیرە مێرد» لەو سەردەمەدا ،لە تورکیا بوو ئەو (سروودو گۆرانی ی)و (هەڵبەستانەی) کە لە دەمی مامۆستایان و قوتابیان و ڕۆشنبیرانی ئەوسای تورکیا یا بە (گۆرانی ی)یا خود بە هۆی گۆڤارو ڕۆژنامەوە ئەخوێندەوە، ئەمانە هەمووی کاری تێکردبوو.

- کە گەڕایەوە بۆ کوردستان، هەر کە پێی نایە ناو شەمەندەفەرەوە، بەرەو ڕووی دایکی نیشتمان کەوتە ڕێ هەر لەو کاتەوە بە خەیاڵ قوتابخانەکانی کوردستانی ئەهاتە بەرچاو، کەوا هەموو ریزبان بەستووەو گۆرانی ی ئەڵێن:-

«شەماڵ دێنێتە گوێم، دەنگی منالانی قوتابخانە»

«(نەشیدی میلیلی) یان لاهوتی یە، قووتی دڵ و گیانە»

- پیرە مێرد گەلێ (سروودو گۆرانی ی) بۆ لاوان وتووە. بەشی زۆری مەقامەکانی (ئاوازەکانی - عثمان)ئەو سروودانە لە سەر کێشی ئەو (سروود)و (گۆرانی یانە)بووە کە بە تورکی لە تورکیا گوێی لێبووە. ئەم وتەیەی مامۆستا (هاوار) لە شوێنی خۆیدایەو جوانی بۆ چووە، چونکە سروودی (کە دەڵێن ئەمرۆ دەشت و کێوشینە) هۆنراوەی پیرەمێردەو یەکەمجار بە دەنگی بولبولی کورد (مەلا کەریم) لە سەر قەوان تۆمار کراوە (لە ساڵانی 1928/1929)دا، ئەم سروودەئاوازەکەی لە گۆرانی یەکی تورکی (ئادلەر ساحلەندە) وەرگیراوە.[75]

- ساڵی 1926 هۆنراوەیەکی وتووە بە ناوی (ئێمە کوردین) کە دەڵێت:

«ئێمە کە کوردین لە لامان وایە
زوبانی کوردی زۆر بێ هاوتایە»
«لاوکی کوردی دەنگی زەبوورە
جەنتول مەئوا، لە شارەزوورە»
ئاوازی ئەم سروودە لە گۆرانی یەکی عەرەبی یەوە
وەرگیراوە بە ناوی (سمعت شعرا)[76]

- هۆنراوەیەکی تری داناوە بۆ (سروود)بە ناوی:
«وا بوو بە شەرو هەڵلا - جیهان خرۆشا»
«لاوان مان لە جێ هەڵسان - خوێنیان جۆشا»
(چناق قلعە ئیچندە)[77]

- گۆرانی ی (گلەیی لە کەس ناکەم - بۆ بەختی خۆم ئەگریم) ئاوازی ئەم گۆرانی یە لە هەوایەکی تورکی (کدرم وار قەرە گوێزلەر) وەرگیراوە[78]

- پیرەمێرد زۆر هۆنراوەی تری هەیە، کە کراون بە (سروود)، یا (گۆرانی ی) وەکوو (ئەی نەوجوانانی وتەن) (ئەی‌برادەران با بچینە یاری) (نەسرین گوڵی نەسرینە) (گۆرانی جەژن و بەهار گوڵ و گوڵزار - زۆر بە نەشئەدا) گۆرانی ی (دانیشتبووین لەگەڵ یار -

من سەرمەست و ئەو هوشیار) گۆرانی ی (خۆزگە)و (مژدە) (چەند خۆشە)و (ئەی کچینە)و (تازەگوڵی چیمەنین) (دڵ گەشایەوە). سروودی (ئەمرۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە) جگە لەمانەش زۆری هۆنراوەکانی بە دەنگی گوێنەدەو گۆرانی بێژەکانی کورد ووتراون و کراون بە گۆرانی ی.

ـ مامۆستا (هاوار) دەڵێت:

(پیرەمێرد)زۆر دڵتەڕ بوو حەزی لە (بەستە)و (گۆرانی ی) کردووە. بە زۆری هەوڵی داوە گۆرانی یەکانی کوردی ببوژێنێتەوەو لە مەترسی لە ناو چوون، ڕزگاریان بکات. زۆر حەزی لە (قەتار)و (ئەڵڵاوەیسی)و (حەیران)و (خاوکەر)و (خاڵەی ڕێبوار) کردووە بۆیە هەموو جارێك پەنای ئەبردە بەر (ڕەشۆڵ) پیی ئەوت سارشۆڵ قەتارێك بڵێ با خەمی سەردڵم بڕەوێتەوە.[79]

(توخوا سارەشۆڵ تۆش قەتارەکەت)

(سەدای سوب سەحەر پای کۆسارەکەت)

ـ لە شاری سلێمانی دا زۆر شاعیری تر بووەو هەیە کە هۆنراوەکانیان کراوە بە (سروود)یا بە (گۆرانی ی)( هەریەکە بە پیی (بەش)و (بەهرە)ی خۆی. لەمانە (علی باپیراآغا ـ کەمالی) (ع. و. نوری) (گۆران) (ئەخۆڵ) (أ ـ أ) (علی عارف آغا) دیلان) (کامەران) (هەردی) (ع.ع. شەونم) (کاکەی فەللاح) وگەلێکی تر.

## ـ سەیرانی قەسابەکانی سلێمانی (1928)

ـ لە ڕۆژی دووشەممە 1928/5/7، قەسابەکان تەرتیبێکی ئیداریان لە ناو خۆیانا تەرتیب کرد. بۆ ڕەئیسی ئیدارەی ئەم سەیرانە (فەرەج کوردی)یان لە ناو خۆیانا تەعین کرد.

بە جۆرێکی (منتظم) ئەسبابی زەوق (حوشتری لۆکە)و لە ئینسان لە (شکڵی بزن) داوچەند کەسێك لە (شکڵی مەیموون) دا، چەند کەمێك (دەهۆڵ و زورنا) یان (احضارو ترتیب)کرد.

حەرەکەتیان کرد بۆ (سەرچنار) لەوێدا دەوانزدە خێوەتیان هەڵدابوو، سەیرانە کە تا پێنج شەممە دەوامی کرد. ڕەئیس و سەیرانکەران با خصوص جەنابی (سەعید خەلیفە کەریم)و (حەمەی عەزیز)کە موحیبی عیلم و عیرفانن بۆ ئەوەی خزمەتێکی مەعاریف بکەن لە ناو خۆیانا ،لەوانەی (ئیتاعەی ڕەئیس)یان نەئەکرد، موەقەت حەپسیان ئەکردن و جەزایان لێ ئەسەندن بۆ (ئومی یە) کانی قوتابخانەی زانستی کە بە شەو ئەخوێنن سەدو حەفتا ڕوپیەیان کۆکردەوە تەسلیمی هەیئەی ئەو مەکتەبەیان کرد[80].

ـ لە ساڵانی بیست بەرەوژوور، چەند گوێنەدە وگۆرانی بێژێکی بەهرەمەندی (گرامەفۆنی)لە سلێمانی دا، دەرکەوتوون، بە هۆی دەنگ و ئاوازە بە سۆزەکانیانەوە کە لە سەر (قەوان) تۆماریان کردووە، لە کۆمپانی یەکانی (بەیزافۆن)و (ئۆرێون)لە بەغداد، (دەنگ)و (ئاوازە)یان، نەك هەر لە سلێمانی بەڵکو گەیشتووەتە گەلێ کوچەو کەناری تری کوردەواری . لەمانە:

**مەلا کەریم**



ـ مەلا ئەریم (کەریم ئەحمەد محەمەد ـ 1885 ـ 1938) کە بەناوبانگە بە (بولبولی کورد). ئەم هونەرمەندە دەنگخۆشە لە

شاری (سابڵاخ) لە دایك بووە، بەڵام هێشتا (مێردمناڵ)بووە، (سابڵاخ)ی بە جێ هێشتووەو ڕوو بە سلێمانی بووەو کردوویەتی بە شارو شوێنی خۆی هەر لە سلێمانیشدا کۆچی دوایی کردووە. نزیکەی (30) سی گۆرانیی چاك و پاکی لە سەر قەوان تۆمارکردووە، لەوانە (دەچمە ـ سەر ناڵەشکێنە) (کاڵێ هەی لیمۆ) (ئاگربارانە) (شلێیار) (کەدەڵێن ئەمرۆ) (وەرگەڕێ ئاوێزانت بم) (خانمی مەزەدار) (هێزی پام نی‌یە) (ئەگەر هات و بزانی من چلۆنم) غەزێمێ) دیسان هات) (هاتەوە بابێتەوە) هەروەها مەقامەکانی (هومایۆن) (غەمەنگێز) (گەبر) (قەتاری‌سنە) سروودی (چەندشیرینە لام دارو بەردی وەتەنم) (فەخرە بۆ ئێمە کوردستان) (دڵ لە دەردی وەتەن)!

زوربەی زۆری گۆرانیی‌و ئاوازەکانی ئەم هونەرمەندە لە دوای خۆی بە دەنگی (گۆرانی‌بێژەکانی) تری کورد تۆمارکراون، لەوانە (عەلی مەردان) (مەزهەری خالقی) (حەسەن زیرەك) (تایەر تۆفیق) (عەزیزی شاروخی) (مامڵێ).[81]

- دایکی جەمال (1908 - 1979)

ناوی (بە هیجە إبراهیم یەعقووب)ە[82]

- ئەم ئافرەتە دەورێکی دەوڵەمەندو دیاری هەیە لە تۆمارکردنی گۆرانیی کوردیدا ،لە ڕۆژگاری خۆیدا، لە کۆمپانیایەکانی (بەیزافۆن)و (ئۆریۆن)، چەند (بەستە)و (بەرهەمێکی) باشی‌و بەهاداری هەیە لە سەر قەوان تۆمارکراون بۆ پاشەڕۆژی مێژووی ئاوازو مۆسیقای کوردی جێگەیەکی تایبەتی خۆیان دەگرن، لەو ئاوازانەی کە (دایکی جەمال) تۆماری کردوون (هەی بەللا)و (هەی گوڵ) (هەی ئاغاوئاغا) (هەی‌جانێ) (هەی ڕۆحی شیرینم) (خانمی سلێمانی) (ئەسڵی وەسڵت سلێمانی) (هەی بێنن بێنن) (ئامین و ئامین)و سروودی (وەتەنی من کوردستانە)و زۆری‌تر.

ئەم ئافرەتە لە ڕەسەندا (بن جوو)بووە، بەڵام بووە بە مرسوڵمان (نۆموسلمان) وشووی کردووە بە پیاوێکی خەڵکی سلێمانی کەناوی (ح.س) ائەم هونەرمەندە لە سلێمانی ژیانی بە سەر بردووە

**حەمری ئەفەندی**



- حەمدی ئەفەندی:

(حەمدی ئەمین 1894 - 1948)

- لە شاری سلێمانی لە دایك بووە، مرۆڤێکی (دەنگخۆش)و (ڕووخۆش)و (قسەخۆش)و (هێمن و مەنگ و میوان دۆست) بووە.

- لە کۆمپانیای (بەیزافۆن) چەند قەوانێکی تۆمارکردووە، لەوانە مەقامەکانی (سێگا)و (ئای ئای)و (نەوا) لەگەڵ بەستەی لە (خەرەی نێری نێری ئەوەکەتانە - لە ماڵی دۆستان بێ سەربەلەرزانە)! ئەم هونەرمەندە ڕەوت و ڕۆڵێکی ڕووگەشی بووە لە ڕۆژگاری خۆیدا لە ڕاژەی هونەری ئاوازی کوردیدا ڕۆشنایشی بۆ ئەمڕۆی گۆرانیی کوردی هەیە. کاك (کەمال ڕەئووف محەمەد) دەڵێت:) یەکەم گۆرانیی بێژی سەرقەوان: «یەکەم کوردی لای خۆمان کە. لە سەر قەوان، گۆرانیی گوتبێت، حەمدی ئەفەندییە»[84]

بە چی‌دا دەزانین؟ ئەم ووتەیە لێکۆڵینەو ڕۆچونێکی قوڵی پێدەوێ چونکە تا ئەمڕۆکە تاکە قەوانێکی (حمدی ئەفەندی) دیار نی‌یەو نەدۆزاوەتەوە.

تا بە ژمارەی یا (نومرە)ی سەر قەوانەکەیدا بە راوردی بکەین لەگەڵ (نومرە)ی قەوانە کوردییەکاندا، ئەوسا ڕاستییەك

دەردەکــەوێ. بەڵام (ڕازو ڕای) ڕووت و بێ بەڵگـە جێی بڕوا نی یــە، (دەڵێن) جێی متمــانـەنی یـە. ! چونکـە کاك (جـلال جۆیــار)یش دەڵێ «حسین اسمـاعیـل = حوسـەی حەبـە تۆزی (1885 ـ 1939) لەدوا، دوای ساڵانی (1922)دا کۆمپانیای دەنگە تۆمارکردن لە سەر قەوان پەیدا دەبێ (حسێن اسماعیل) پێش (کاویس آغا) ـ (یەکەم کەس دەبێ دەچێ قەوان تۆمار دەکا»[85] بۆ چاکتر چوون بۆ ئاشکرا کردنی ئەم لایەنانە مامۆستا (محمد گبانچی 1903) دەڵێت:

(مەقامی لامی) ساڵی (1931) کە لە (بەرلین) بووم لە سەر قەوان

لەوێ ئەو مەقــامـەم تۆمـارکـردووە، ئەو مەقـامـە لە پێکهێنـان و داهێنانی خۆمە)

ـ بەڵام مامۆستا (عطا ترزی باشی) بە شێوازێکی زانستی یانە ئەم ڕاستی یانە دەخاتەڕوو:

ـ گۆرانیی بێــژێــك کە ناوی (حســەین کوردی)یـە مەقـامی (لامی)بـەر لە مامۆستـا (محمـد گوبـانچی) تۆمـارکـردووە، بە هۆنـراوەی (أريـد أروح للبنـدر) لە (کـۆمپـانیـای بەیـزافـۆن) لە سەرقەوان، بە ناوونیشانی ژمارە (ب /83733) (ساڵی 1925).

ـ هەروەها (مامۆستا محمد گبانچی) لە کۆمپانیای (بەیزافۆن) هەمان (مەقامی لامی) تۆمارکردووە بە هۆنراوەی (نحل جسمی) ژمارەی قەوانەکە (ب /83777) لە (ساڵی 1925)دا. بەمەدا دەرئەکەوێ کە (حسەین کوردی) بە (44) قەوان بەر لە مامۆستا (گـوبـانچی) ئەو مەقـامـەی تۆمـار کردووە[86] ئەمە (بەڵگەیەکی ڕاست و درووستـە) ئەم ڕازە گۆتـرەگۆیی نی یە). ڕوونکردنەوەی یەکەمین گۆرانیی بێژی کوردی سەر قەوان دەبێ بەم (تەرزو) (تەرازووە)بێ.

ـ لێرەدا دێینەوە سەر باسی مۆسیقا لە شاری سلێمانیدا.

1929 ـ 1930

«خـەڵـك بە شورەیی ئەزانی منـاڵی خۆی بنێـرێتـە قوتابخانە ،خۆ ئەگەر ببووایە بە (دیدەوان)و جلی دیدەوانی لەبەر بکردایە، ئەژنۆی دەربکەوتایە هەر مەپرسە.

ـ جگە لەوەش ئەگەر بچوایە ناو تیپی (مۆسیقا)و (دەهۆڵ)ی لێ بدایە، یان ببووایە بە (بۆریژەن)ئەوە هەموو شتێك ئەقەوما. قوتابخانەی ناوەندیو سەرەتایی سلێمانی یەك (تیپی مۆسیقا)ی هەبوو.

ئەم ئامرازانەشیان هەبوو. (دەهۆڵ)ێکی گەورە، (یەك زیل) (دوو تەپڵی بچووك) (چەند بۆری (بۆقیە) یەك

ـ لە قاتــابیــانی ئەو سەردەمـە کە لە تیپی مۆسیقـادا بوون: (تۆفیق)ە ڕەش، (کمال ڕەشید 1918)، (فاضل عیرفان) چەند قوتابی یەکی تر.[87]

ـ 1932 ـ

قوتابخانەی مەکتەبی ئەووەل کە تەدیبی ناسراو

ـ مامـۆستـا (عبـدالـواحـد نوری) بەڕێـوەبـەر بووە. باندێکی مۆسیقــای بە هاوکــاری چەنــد مامـۆستـایـەکی مۆسیقـازان لە قوتـابخـانـەکەدا، دامەزراندووە، ئەو ئامرازانەی کە هەیان بووە. «دەهۆڵ)ێکی گەورە، (دوو ترامپێت) (زیل)ێك.[88]

ـ «هـەر لەم ساڵانـەش دا لە قوتـابخـانـەی (فـەیسـەڵی)یەدا بانـدێکی مۆسیقـا هەبـووە، ئەو ئامـرازانـەی کە لە قوتـابخـانەی (ئـەوەڵی سلێمــانی)دا بوون، کەڵکیــان لێ وەرگـرتـوون. ئەو مامۆستایانەی لەو سەردەمەدا مۆسیقایان فێری قوتابی یان کردووەو ڕۆشنبیـری مۆسیقـایـان لە سلێمانیدا بڵاوکردووەتەوە ،ئەگەر بە شێوەیەکی فراوان یش نەبووبێ ،بەڵام لەو سەردەمەدا زۆر بووە. لەو مامۆستایانە (بەتراکی) عوودی لێداوەو فێری قوتابی یانی کردووە.

(ســەرکیس سیمـۆن) (مـاندۆلین)ی لێداوەو فێری قوتابی یانی کردووە. (عەلی کاکەمین)کە ئەفسەرێك بووە.

لە کاتی خۆیــدا لە سوپـای عوسمـانلیدا، کە هاتـووەتـەوە سلێمانی بووە بە مامۆستاو قوتابی یانی فێری (مۆسیقا) کردووە. خۆی (کلارنێت)ی لێداوە. بە زۆری کە بۆی لوابێ ئەم ئالەتە لێ بدا لە دەشت و چۆڵیدابووە. بە تایبەتی لە گردی (سەیوان!!)[89]

ـ 1937 ـ

ـ لە قوتـابخـانـەی (نـاوەنـدی سلێمـانی)دا باندێکی مۆسیقا

دامەزراوە لە ساڵی (1937)دا، کە ئەم زاتانە لەو ڕۆژگارەدا لە تیپی مۆسیقای قوتابخانەدا بوون:

1 ـ شوکت ڕشید سەعاتچی (1922) شمشاڵ و عودو (کەمان)ی زانیوە

2 ـ محمد صالح عەنبەر.

3 ـ (جمال) کە بوو بە حاکم!!

● ـ هەر لەم ساڵانەشدا خێزانێکی مۆسیقازان هەبوون کە سەرو ساختێکی زۆریان لەگەڵ هونەری مۆسیقادا هەبووە، سەبارەت بەو ڕۆژە ڕۆشنبیری مۆسیقایان لە سلێمانیدا بڵاوکردووەتەوە) تەمی تانەو تەشەریان تواندووەتەوە. هەردوو برا (مدحت موبارەك) کە کاتبی (موتە سەریف) بووەو (طلعت موبارەك) مامۆستا بووە.(90)

ـ 1946 ـ

ـ لەم ساڵەدا لە سلێمانی شانۆگەری (لە ڕێی نیشتمان)دا لە سەر شانۆی هاوینەی قوتابخانەی گۆیژەی کوران پێشکێش کرا هەروا (محمود حەمەی لەیلێ) ئۆپەریتی (گوڵی خوێناوی) ووتووە.

ئەم مۆسیقازانانە هاوکاریان کردووە.

(ڕۆبین ئۆفیك) کە مامۆستا بووە لەو دەمەدا، کەمانچەی لێداوە ،(بهجت ڕشید سەعاتچی) کەمانچەی لێداوە (شوکت ڕشید سەعاتچی) کەمانچەی لێداوە، (اسطیفان) عووردی لێداوە (ئەنترانیك گەرەبیت) (فلووت)ی لێداوە: .

ـ گۆیندە و گۆرانیی بێژی ئەم سەردەمەی سلێمانی برێکی باش و بەهرەدار هەبووە، بەڵام ئەوانەی لە ناو کۆڕو کۆمەڵی ئەو ڕۆژەدا بوون (ڕەشۆڵ)و (محمودی حەمەی لەیلێ) (مامۆستای شاعیر محمد صالح دیلان) (قادر حاجی حسین) (أبراهیم حەزین) وبرێکی تربوون.

● ـ ڕەشۆڵ: (ڕەشید کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی میرزا عەزیز (1912 ـ 1974).

لە سلێمانی لە دایك بووە، دەورێکی دیاری هەیە سەبارەت بە (مەقام)و (ئاوازی) کوردی

لە کوردستاندا بە تایبەتی لە شاری سلێمانیدا. ئەم بەهرەمەندە، هەر لە منداڵییەوە حەزی لە گۆرانیووتن کردووە لە ساڵانی 1928 / 1930 لەگەڵ بولبولی کورد (مەلاکەریم) چووە بۆ بەغداد وپێکەوە لە سەر قەوان بە (دیوتەو دوو قوڵی) گۆرانیی (کەوای بەرت ماهوتە) (خاسێ تۆخانمی) (دڵ لە دەردی وەتەن) تۆماریان کردووە.(95)

ـ لە ڕۆژنامەی (ژین) (819) ـ 7 ـ شباط 1946 نووسراوە:

«لە ڕۆژی شەممەو 26 (کانوونیدووەم) ساڵی 1946دا کە بیستەم ساڵی ڕۆژنامەی (ژین)بوو، دوای نیوەڕۆ ئاهەنگێك گێرا لە خانووی (فائیق هوشیار)، (بەستەی هەی ژین) لە لایەن جووتە بولبول (ڕەشۆڵ و مەحمود)ەوە بە کەمانچەوە، کەمانچەکەش یەکێك لە گەنجە خوێندەوارەکان (بەهجەت ڕەشید) لێیئەدا. هەروەها مەقامی (قەتار) بە شیعری (پیرەمێرد)ەوە (ساقی بە عەشقی بەرزی خاکەکەم) (بەیادی قەومی دڵ خەمنا کەکەم)

لە لایەن جووتە بولبول (ڕەشۆڵ و محمود محمد).

هاروەها مەقامی (خوکەر)بە شیعری (مەولەوی) (بەرێکەوت دەرکەوت لە گۆشەی ڕەشماڵ) لە لایەن جووتە بولبول (ڕەشۆڵ و محمود).(92)

ـ (محمود) لێرەدا مەبەستی لە (محمودی حەمەی لەیلێ)یە ئەم هونەرمەندە ،گۆڤاری گەلاوێژ لە ژمارە (3 ساڵ 6) 1945 دا، وا پێیدا هەڵدەدا:ـ

ـ بێچووە بولبولی کوردستان (محمود محمدی لەیلێ)یش وەك (قومری) ئەیچریکان و دەنگی وەك زەنگوڵە ئەزرنگایەوە. ئەمە لە ئاهەنگێکدا بووە کە یانەی سەرکەوتن لەو ساڵەدا لە بەغداد گێڕاویتی.

ـ سەبارەت بە (ڕەشۆڵ)یش

ـ هێشتا منداڵ بووە لە تاقمی (ئاوازەخوان)و (سروود خوێن)ە کاندا بووە کە لە پێش مەوکبی (شێخ مەحموودی مەلیك)دا گۆرانیی ووتووە.

ـ ساڵی 1930 لە شەڕی (ئاوباریك)دا بەشداری ئەو شەڕەی کردووە کە دژ بە ئینگلیزەکان کراوە، بە ئاوازی بە

سۆزەوە، هانی شۆرشگێڕەکانی کوردی داوە، بە مەقامی (قەتار)ەوە ئەم هۆنراوەی (پیرەمێرد)ی ووتووە.

(چەند بەرزییە لە بەندەنی بەرزی نزارەوە)

(هەڵمەت بەری بە لاوکی کوردی و قەتارەوە)

لە کۆتایی چلەکاندا چووەتە ئێستگەی کوردی عێراق[93] چەند (مەقام و بەستە)یەکی تۆمارکردووە، لەوانە مەقامەکانی (قەتار) (خاوکەر) (دەشت) بەستەکانی (گوڵاڵەسوورە) (ئەم بەرئەوبەرە)و بە دوو قۆڵی لەگەڵ (محمود محمددا) گۆرانیی (ئایشیلێ تازەنینێ)و (دەستم لێمەدەن بەزام زەلیلم)یان تۆمارکردووە.

ـ هەروەها ساڵی (1970) مەقامی (قەتار)و بەستەی (ئۆخەی گردەکەی یارە)ی بۆ تەلەفزیۆن تۆمارکردووەو (نەوار = شریطیکی) تۆمارکراوی هەیە کە لە ئاهەنگی ماڵاندا ووتوویەتیی

● ـ تەلە (طالب مجید قادر عثمان)

(1915 ـ 1978)

ـ لە سلێمانی لە گەڕەکی (سابونکەران)لە دایك بووە.[94]

ـ لە ساڵی (1943)دا وەك گۆیندەیەکی ناسراو، ئەچێتە ئێستگەی کوردی عێراق و لە و دەمان و زەمانەدا ،گەلێ کەسانی خەمخۆری گۆرانیی کوردی لەو دەزگایەدا کار دەکەن، لەوانە خوالێخۆش بوو (عادل عیرفان)و مامۆستا (کامل کاکەمین)، کە بە دەیان گۆیندەو گۆرانیبێژی چاك و چالاکیان پێگەیاندووەو بە ئامێزێکی کراوەو دڵێکی فراوان پێشوازیان کردوون، گۆرانییان بۆ تۆمارکردوون کە هەریەکێك لەو گۆرانییانە، گەوهەرێکی یەکدانەیە لە گەنجینەی گۆرانیی کوردیدا. یەکێك لەو گۆیندانە (طالب مجید)ە کە بە (تەلە) بەناوبانگ بوو. (تەلە) یەکێك بوو لە گۆیندە بەستەبێژ و بەهرەمەندەکانی شاری سلێمانی. ئەم گۆیندەیە سەبارەت بەوەی ژیان و گوزەرانی بە زۆری بە ناو توێژی رەنجدەرو رەشۆکیدابوو، تێکەڵی زۆر کۆڕو کۆمەڵی گۆیندەو گۆرانی بێژەکان بوو بوو، زۆر (دێهات و کوچەوکەناری کوردەواری گەڕابوو، چونکە لە سەرەتای ژیانیدا پیشەی (قەتارچی) بووە. لە (بانە)و (بۆکان) و(سنە)و (سابلاخ)ەوە گەلێك بەستەی رەوان و رەسەنی کوردی وەرگرتبوو، گەلێك (بەند)و (بەیت) و(هەوا)ی ناوازەی لە دەمی گۆیندەکانی ئەو شارو شوێنانەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووە سلێمانی،

ـ بۆیە لە ئێستگەی کوردی گەلێك لەو گۆرانییە خۆشانەی تۆمارکردووە، وەك گۆرانییەکانی (خانمۆڵێ) (بارانە) (مەگری مەگری) (زێنەبێ) (سەڵتەنە) (ریحانەم دێراو دێراوە) (پێم لێنیبوو کە زارا)...

ئەم هونەرمەندە دەنگخۆشە وەك زۆربەی گۆرانیبێژەکانی تری کورد لە ژیانێکی پڕ ژان و ژووڵو وخوار و بێ نازدا دەژیاو لە پیریو پەککەوتوییدا دەردی هەژاری بە مەرەدێکی بردبوو ناچار بوو کە (سواڵ) بکا، چاوی لە دەستی خواپێداو وخێرخوازان بووە، لە رۆژی 1978/1/10 بە کەسەرو کەساسییەوە کۆچیدوایی کرد، لە گردی سەیوان بە خاك سپێراوە. زۆر دەوڵەمەند دەمرێ کەڵکی بۆ (خوێش و خێزانی) دەبێو بەس، بێ ناوونیشان وەك «بەردی بن گۆم» نقوم بە خاك و خۆڵ دەبێ بەڵام هونەرمەندێکی هەژار دەمرێ، بیرو سامانی بۆ گەلەکەی بە جێ ئەهێڵێ، بە ناودێری دەمێنێتەوە، (تەلە)ش یەکێکە لەو سەربازانە.

● ـ «ئیبراهیم حەزین»

(1917 ـ 1970)

لە سلێمانی لە گەڕەکی (کانی ئاسکان) لە دایك بووە.

کەسێکی (خوێندەوار) (ئایین پەروەربوو) لە کۆڕی (مەولودخوێندن)دا هەم لە (تەواشیح و ستایشی پێغەمبەر)دا، زۆر بە سۆزو کوڵ دەنگی گوڵبانگی خۆی ئەدا بە گوێی مرۆڤ و رۆژگاردا.

لە ژیانیدا بە پیشەی (چایچێتیو کوتاڵ فرۆشتنەوە) ،گوزەرانی خۆیو خێزانی دابین دەکرد.

لە ساڵانی 1947/1948 ئەچێتە ئێستگەی کوردی عێراق و چەند گۆرانییەك تۆمار ئەکا لەو گۆرانییانە ،بەستەکانی (لیمۆهەی لیمۆ) (ئامین و ئامین) (حەبیبم)و (یارجوانە)و برێکیتر.

ابراهیم حەزین دەنگێکی خۆش و خەمینی هەبوو.

ساڵی (1956)بە کوتاڵ فرۆشی رێی کەوتە (چوارتا)و لەو

ڕۆژگــارەدا لە ماڵــی ناسیــاوێکی گۆرانیی بۆ ئەوتن، گوێم لە دەنگیبوو کە مەقامی (ئای ئای) ئەوت بە هۆنراوەیەکی مامۆستا (ئەخۆڵ). کە ئەم چەند دێڕەی زۆر بەلاوە خۆش بوو دووبارەی ئەکردەوە.

«یاران، کەوەختێ ،مردم، یا کوژ رام»
«یاسینم خوێنراو بە خاك سپێرام»
«پەی بڵێن بە یار، هەر ساڵی جارێ»
«بە لاما بروا هەروەك ڕێبوارێ»

---

● «عبدالقادر حسەین محمد»

(1922) - (1984)

● بە ناویــانگــە بە قادری حاجی‌حســەین، لە سلێمــانی لە گەڕەکی (گۆیژە) لە دایك بوو.

● (دەنگێکی خۆشی)هەیە مرۆڤێکی (قسەخۆش)و (ڕووخۆش)ە

● ساڵی (1942) چووەتە ئێستگەی ڕادیۆی کوردی عێراق لەو ئێستگەیەدا ئەم چەند گۆرانی‌یەی بە تۆمارکراوی هەیە (گڵ کۆی تازەی لەیــل) (گــوڵم گوڵم) و (بــە خەیــاڵی ئەو) ومــەقــامی عوششاق)و مەقامی (غەمەنگێز). یەکێك لە گۆرانی‌یەکانی خۆی لا خۆشــە کە ئەویش (گــوڵی سەربــەستی)یــە بە دەنگێکی پاك و پاراوەوە ئەیڵێ .بــەڵام داخــەکــەم دەمێکــە وازی لە گۆرانیی تۆمــارکــردن هێنــاوە. تەنیا بۆ خۆی‌و خزم و دۆستان و خەمرەوێنی جار جاریــك بە دەنگێکی دڵــدوێن تێ‌دەچــریکێنێ. ئەڵێ لە ساڵانی (1937)دا هاورێیــەکی دەنگخــۆشم هەبــوو کە لەو ڕۆژگارەدا مەقامی (سەفەر)ی چاك ئەووت ناوی (عەزیزی مەلا خالید)ەو خەڵکی سلێمانی‌یە.

● - محمدصالح دیلان.

(1927) «محمد صالح ئەحمەد دیلان کوڕی ملاصالح».

- لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی گۆیژە لە دایك بووە.

- بەهرەی (هەواداهێن)ی‌و (هۆنراوە دانێن)ی لە باوکی‌یەوە بۆ ماوەتەوە.

- کە بێینــە سەر باسی گۆرانــیی لە شاری سلەیمــانی، ناتوانین ناوی (دیلان)ی شاعیر فەرامۆش بکەین.

- بەڵێ (دیلان) یەکێکە لە شاعیرە ناودێرو ناوازەکانی کورد، بەڵام بە ڕای من کەسێکە لە هەرە دەنگخۆش ترین و گۆیاترین گۆرانی‌بێژەکانی ئەمرۆی کوردەواری‌مان لە ووتنی (مەقام)دا. بە تایبــەتی مەقــامــەکــانی (ڕاست)و (سێگــا)و (عــەجەم) و (سەبا) (موحەییەر)و (سەفەر)و (ئەڵڵاوەیسی) دەنگی نەواکانی (دەروێش عەبــدوڵــلا) (ئــەژدەهــاك) (ئــەی نائومیدی) (وەفدی کوردستان) (نەورۆز) لە گیان و گوێی زوربەی کەسانی کۆمەڵی ئەمرۆی کوردەواری‌دا دەژی‌و دەزونگێتەوە.

● - کەریم جەلال کابان (1929).

- لە سلێمانی لە دایك بووە.

- ساڵی «1944» چووەتــە ئێستگــەی ڕادیــۆی عێراق و چەند گۆرانی‌یەکی لە مەکتەبەی ئێستگەدا هەیە وەك

(بــەری‌بــەیــانــە زرەی فنجــانە) (یارجوانە) (لەمابەینی گوڵ و گوڵزار) (خۆزگەم بەپار).

- لە ساڵی (1976)دا کە بووە بە ئەندام لە تیپی مۆسیقای کوردی لە سلێمــانی‌دا ،چــەنــد گۆرانی‌یــەکی تەلــەڤــزیــۆنی تۆمارکردووە. وەك (یاران وەسیەتم) (شەو) (خەنەبەندان).

● - شەماڵ صائب (1931).

- لە سلێمانی لە دایك بووە.

- هەر لە منداڵی‌یەوە خۆشەویستی‌و خولیای مۆسیقای لە دڵدابووە.

- لە هاوینی ساڵی 1947 دەورەیــەکی مۆسیقــا فێــرکــردن لە سلێمــانی‌دا کراوەتــەوە کە مامــۆستــایــان (جمیــل بشیــرو سالم حسین و غانم حدادو. . .) دەرسیان ووتووەتەوە (شەماڵ صائب) لەم دەورەیەدا وەك قوتابی‌یەکی چالاك دەرکەوتووە.

- لە ئێستگەی کوردی عێراق وەك مۆسیقازان و گۆرانی‌بێژێك دەست بە کاربــووە. لە ڕادیــۆی کوردی‌و کۆمپــانیای چەقماقچی (قــەوان تۆمــار کردن) لە بەغــداد، چەنــد گۆرانــی‌یــەکــی تۆمارکردووە، لەوانە (هەرێ لەیلێ) (پێم بڵێ) (ئازیز بەهارە) (بۆ هاتی) (هاوار سەد هاوار) (بەردەبەردە) (دەمەکەت بێنە) (بۆتۆیە دڵ)و . . .

هی دیکــەش! (شــەماڵ صائب)وەك گۆرانی‌بێژەکانی کۆن،

ڕێبازو شێوازی (لاسایی کاریی)و (تووتیواری) نەگرتووە. بەڵکوو یەك سەڵـەف بە (نـەغمـەی نوێ)و ئاوازی (جـوان و جوێ) هاتـووەتـە ئاراوە، و پارێـزگـەری کەلـەپـوورو ئاوازی ڕەسـەنی کوردیشی کردووە ئەگەرچی زۆر دڵگریی و تامەزرۆیی ئاوازەکانی (فەرید)ی هونەرمەند لە بڕێکی کەم لە گۆرانییەکانیدا دیارن. ئەمەش پرتەوپرشنگێکی ڕازاوەتریان داوە بەو ئاوازانەی.

● ـ عثمان عبدالرحمن (صابونچی):

(1931 ـ 1970؟)

ـ لە سلێمانی لە گەڕەکی (صابونکەران) لە دایك بووە.

ـ لە سالأنـی 1945 /1946 چووتــە ئێستگــەی ڕادیــۆی کوردی عێراق.

ـ چەند گۆرانییەکی تۆمارکراوی هەیە، وەك گۆرانییەکانی (لە بیرت نەچم) (ئەی کچی جوان) (خۆزگە وا بوایە)و بڕێکیتر.

ـ سەبـارەت بە گۆرانـیی‌و مۆسـیقـای کوردی لە تەمـەنی هونەریی خۆیدا خزمەتی خۆی بە جێ هێناوە یەکێك یش بووە لە ئەندامانی تیپی مۆسیقای مەولەوی).

● ـ دەروێش عەبدوڵلا (1890 ـ 1958)

«عەبدوڵلا قادر محمد»

ـ «پیـاوێکی ڕەنـد، قەڵـەنـدەر، گەڕۆك، بـەهـرەمـەنـد دەنگ خۆش، دەفژەن»بووە.

ـ زوربەی ژیان و گوزەرانیی لە سلێمانیدا بووە، هەر لەم شارەشدا کۆچی دوایی کردووەو لە گردی (شێخ محی الدین) بە خاك سپێراوە.

لە شەوێـکـی ڕەمـەزانی سالّی (1955)دا لە ماڵی (شێـخ محـەمـەدی مەحـوی) نەوارێکی تۆمـار کردووە، کە مەقامەکانی (هومایۆن)و (سێگا)و بەستەکانی (غەزالێ) (خوایە هەڵکەی بای شەماڵێ) (بۆم لێدەچەنگ و عوودە) (خەدەنگی قەوسی ئەبرۆی تۆ) (قـوربـانی دوو ئەبـرۆی) (وەك قومـری لە باخ و جۆبـاران) (هـەورێکی هێنـا) (پـرسیم لە چیمـەن) (ئەگەر بمێنم) (هەرمێ وەی وەی هەرمێ)

ـ کە گۆرانیـیـەکـانی نمـوونـەیـەکی نایـابن بۆ گۆێنـدەیی‌و شارەزایی (دەرویش عەبدوڵلا) لە بەستەو مەقامی کوردیدا. ئەو کەلـەپـوورە هونـەرییـەی لە دوای خۆی بە جێی هێشتـووە، کەڵـکـی پێـویـە بۆ دواڕۆژی گۆرانـیی کوردیـی (دەروێش عەبـدوڵـلا) برایـەکی هەیـە بە ناوی (فـەقێ اسمـاعیـل سەرمـا بردوو)، ئەمیش دەورێکی دیاری هەیە لە بلأوکردنەوەی (بەیت)و (بەند)و (بەستە)ی ڕەوان و ڕەسەنی گۆرانیی کوردیدا

ـ «مامۆستا گیو موکریانی» دەڵێت:ـ بەشێك لە بە سەرهات و هەڵبـەستـەکـانی (ئـەدیب مەلا ڕەسووڵ مەلا صادق (1291 کۆ /1351 کۆ.) لە فەقێ إسماعیل وەرگرتووە.

«فـەقێ أسمـاعیـل»، کـە پەنجا ساڵە هەر جۆرە گۆرانییی‌و بە ستـەیـەکی کە لە (سـابـلأخ)یدا ،داهـاتبێ بە هۆی دەنگی خۆش و لەرەی دەفـەکـەیـەوە بە ناو برا کوردەکـانی گەرمێنیدا «کوردستانی عێراق عثمان بلأو کردووە تەوە.»

ئەم «فـەقێ ئیسمـاعیـل»ەی کە مامـۆستـا گیومرکریانی ناوی دێنێ برای «دەرویش عەبدوڵلای» دەفژەن و دەنگخۆشە، ژیان و گوزەرانی بە زۆری لە شاری سلێمانیدا بە سەر بردووە، دەڵێن بەهرەمەندێکی دەنگخۆش و شیعرزان و هەوا خوانێکی هونەرمەندە.

داخــەکــەم خۆم نەمــدیــوە ونــازانــم ئێستــا کە، لە کوێ نیشتەجێیەوە چ کارەیە.

«مـامـۆستـا هاوار» «سـەرمـابردەڵە»یەکی تر ناودێنێ‌و دەڵێت: «دەروێش عەبـدوڵـلای سەرمـابردەڵە»ش بە خۆی‌و شمشاڵەکەی کوڕو کاڵی ئەهێنـایـە جۆش و خرۆش ئاوازی (خـاڵـەی ڕێبـوار) هەموانی ئەبرد بە ئاسمانێکی خەیالأوی سەیردا ل 47 (دیوانی پیـرەمێـرد» بەلأم (کـۆسـپ و کلووف)و ژیـانی پڕ کە سەرو کوێرەوەری ئەو بەهرەمەندانە، مەودای ئەوەی نەداون کە هونەری خۆیـان بگـەیـەنـنـە (ئێستگـە)و سەر قەوان!!. ئەو گەنجینە گەوهەرینە بە خۆرایی لە دەست چوون.



● ـ (فەرەج)ی حاجی ڕەشید:
(1922 ـ 1979).

ـ فەرەج مرد، کەس ناوی نەبرد!

ـ بە نێـوبـانـگ بوو بە (فـەریـد). چونکـە لە هەرەتی هەرزەکاری‌دا زۆر حەزی لە دەنگی (فەرید ئەترەش) کردووە.

ـ بەڵام خۆی هەر گۆرانـی‌ی فۆلـکـلۆری‌و کۆنـی کوردی دەزانی، فێری بە سەر گۆرانی‌ی بێگانەوە نەبوو.

داخی بە جەرگـم کەسێ بە (گـوێـنـدەو گۆرانـی‌بێـژ)ی نەئەزانی، بەڵام ئاوازەکانی خۆی بە تایبەتی (ماریانا)و (مارگێ) نەك لە وولاتـی کوردەواری، بەڵکـوو لە (گـازینـۆ)کـانی (شـانـزلیـزی)ی‌یـە لە (فەرەنسا) بڵاودەکرێتەوە!!

ـ چەنـد گۆرانی‌یـەکی تۆمـارکـراوی لە دوا جێمـاوە. وەك مەقامی (خەنەباد) (لە بەرنازی چاو بازان) (ئەرێ هات) (خۆم بە خولامی سوخمەی کۆنی) (لە سیلەی شێخ مەولانا) (مارگێ) (ماریانا).

ـ (فـەرەج)بـە ڕاستی‌ی شەیـداو سەودا سەری (بـەستـە)و (مەقام)ی کوردی بوو. ئاواتی ئەوە بوو بە هۆی (تەلەفزیۆن)ەوە دەنگی بگەیەنێ بە جەماوەری کورد بەڵام ئاواتەکەیان پێ‌شێل کرد. ●

ـ گۆرانی‌بێژێکی تیپی مۆسیقای مەولەوی بوو.

ـ بەر لە مردنی (خەڵات و ڕێزلێنان)ی نەقابەی هونەرمەندانی عێراقی پێ‌درا. مردو بە مراد نەگەیشت ئەو خەڵات و بەراتە بینێ.

(فـەرەج) کوری کۆڕو بەزم هێن و قسـە خۆش و گۆوەنـدگێـڕ بوو. هەتا بڵێ‌ی (سەیر)و (ساکار) بوو لە داستانی (بەهەشت و دۆزەخ)دا ،وا باسم کردووە. چونکە بە دڵ خۆشم ئەویست.

«فـەرەج پیـاوێـکـی کۆکـە
حانـوتـێـکـی گەڕۆکـە»
«لـە سەیـرانـا جێ‌ی نیـازە
دوکـانـی (تـرش)و (پـیـاز)»
«هـەر لۆچـێـکـی گیـرفـانـی
پڕ (بـرمـە)یـەو (بـریـانـی)

«نــوکــتــەی مزرو بە تامــە
شەیــدای بەســتــەو مەقــامــە»
«هــەوای مارگــیو ماریــانــە
بەزمــی پیــاوی بێ دیــیــانــە!!
«خــۆ بەســتــەی سوخــمــەی . کۆنــی
وەك مێــخــەك دەروا بۆنــی»
«مــەقــامــی (نــەیــرۆز) ماوە
هێــشــتــا تۆمــار نەکــراوە»
**حەسەن زیرەك**



● **حەسەن زیرەك (حەسەن عەبدوڵڵا 1926 ـ 1972)**

ـ (حــەســەن زیرەك)بە گۆیندەیەکی گەورەو گرانی کوردستان دادەنــرێــت. بەڵام تافێــکی تایبــەتی ژیــانی هونــەری ئەم بەهرەمەندە ،ناتوانین چاوپۆشی لێبکەین و فەرامۆشی بکەین، کە سەردەم و ساڵانێك (1956 ـ 1957) لە شاری سلێمانیدا بە سەری بردووە. کە جێــگــەی ژیــان و گوزەران و جوگــەی ژووان و زوربەی ئاوازەکانی لەم شارەدا هەڵگرتووە!.

ـ تەشق و تەوژمی (هەوا)ی بێگانە گۆیی، لە ناو خەڵك دا شکــانــد، سەر لە نوێ ناوو نازی دایــەوە بە ئاوازی ڕەســەنی کوردیی ،کەشێکی لە بارو پڕ بەری بۆ گۆرانیی خۆماڵی خوڵقان.

ـ ئەم بەهرەمەندە (بەستەبێژە) بلیمەتەی کورد، مۆری دییارە بە مێژووی گۆرانیی‌و مۆسیقای شاری سلەیمانییەوە، ناتوانین بکولی ئەم (ڕاز)و ڕاستییە) بکەین. !

● ـ ڕەفیق چلاك (ڕەفیق تۆفیق ـ 1924 ـ 1973)

ـ ڕەفــیــق چالاك. وەك ئەدیــب و ئەکتــەر بوو. هەروەهــا (مەقام زان)و (بەستەبێژێکی) بەهرەمەند بوو دەنگێکی خۆش و خەمینی هەبــوو، بەڵام خەمخــۆرو خەملێنی دەنگی نەبــوو. لە کەیداو لە کوێدا حەزی بکردایە، لەوێدا تەردەســت و دەم گەرم ئەهاتە کۆڕ.

ـ بەرو بێــری هونەریی تۆمــارکــراوی لە دوا جێمــاوە کە کەلەپوورێکی بە کەڵکن لە گەنجینەی گۆرانیی کوردیدا. لەو ئاوازانــەی تۆمــاریکــردوون (ئەیچاو چەشنی بازی قەفەز) (دوو ئاوانەکەی. . ) (مردنە بێ تو ژیانم) (دادەنگ) (ئارامی ئارامی) (ئــامــۆزاگیــان) (سەوزەمەڕۆ سەوزەکە)و زۆری تر ئەوەی شایانی ناوهێــنــان وریــزلێــنــان بن لێــرەدا، چەند کەسانێکی کە لە کۆڕی گۆرانییدا خزمــەتیــان هەیــە (حــەمــەی بەکــر) (محمــود تۆفیق شلك) (ئــەحــمــەد شــەمــاڵ) (أمین ابــراهیم) (محمــد پیروەیس) (عمر ڕەزا) (سیروانی) (ابراهیم محمد) (قادر کابان) و زۆری ترا!.

ـ جارێکیتر دەگەڕێینەوە سەرباسی مۆسیقا لە سلێمانیدا.

● ـ «1947»

ئەم ساڵە سالێکی پڕ پیت و پەرژەوەند دادەنرێت لە مێژووی شاری سلێمانیدا لەو ساڵەدا بەردی بناغەی مۆسیقایەکی ڕێك و پێــك دانــراوە کە تەلاری ئەم تیپە مۆسیقــایی یانەی سلێمانی لە سەر بنیات نراوە. لە سەر (ڕا)و ڕاسپاردەی (حەننا بەترۆس) کە سەرۆکی یەکەم تیپی ئۆرکێسترای عێراقی بووە، بڕیاردراوە، کە لە هاوینی ساڵی (1947)دا دەورەیــەکی فێــرکــردنی هونــەری مۆسیقا لە سلێمانیدا بکرێتەوە

ـ لە هاوینی ئەو ساڵەدا، دەورەیەکی مۆسیقا کراوەتەوە کە ئەم مامۆستایانە دەرسی مۆسیقایان فێری قوتابیانی ئەو (خولە) کردووە.

**خولی فێربوونی مۆسیقا لەسلێمانانی ساڵی 1947.**




«جەمیل بەشیر ـ غانم حەداد ـ سالم حسەین، بە ترۆس حەنا بەترۆس ـ منیر ئەڵلاوێردی ـ یعقوب یوسف)

ئەو قوتابیانەی کە لەو دەورەیەدا بەشداریان کردووە ئەمە ناوی هەندێکیانە.

(بەهجەت ڕەشید ـ قادر دیلان ـ رضا شێخ محمد گوڵانی ـ شەماڵ صائب ـ ڕۆبین ئۆفیك ـ سەرکیس کیغام ـ عبداللەمیدیا ـ نوریعەنبەر ـ احمدی حەمەی لەیلێ ـ ئەحمەد زرنگە ـ غەریب میرزا کریم ـ محموود محمد لەیلێ ـ جەمال فتاح ـ علی أحسان ـ جمال احمد کمال احمد ـ جمال عبدالله ـ توفیق حسن ـ عبدالله جاف) لە وێنەکەدا ئەو سێ منداڵەی کە دیارن کوڕی مامۆستا

(حنابطرس)ن.

(1948)

ـ لە قوتابخانەی (غازی) کوران ئاهەنگێك گێڕراوە شانۆگەری (مەنۆچەر) پێشکەش کراوە ئەم هونەرمەندانە ئاهەنگی مۆسیقاو گۆرانییان پێشکەش کردووە.

(بەهجەت رەشید ـ کەمان) (نوری عەنبەر ـ عود) (ئەحمەد ڕەحیم ئوتوچی ـ دەف) (ئەنوەر ئەسکەندەر عەلەکە ـ دەنگخۆش)

## ساڵی (1955

## ـ تیپی مۆسیقای مەولەوی ـ

ـ ئەم تیپە لە ساڵی (1955) لە شاری سلەیمانیدا دامەزراوە ،لە بەهرەمەندە مۆسیقازانەکانی کورد کە بۆ یەکەمجار بووە، تیپێکی مۆسیقا بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لە کوردستانی عێراقدا پێکهاتووە. لە ئەندامەکانی (قادر دیلان) (ولیەم یۆحەننا) (بەهجەت ڕەشید) نەژادعەبدە) (حاتەم سەعید) (هادی عەنبەر) (ئومێد مەدحەت موبارەك) (سەردار ڕەمزی) (ساجد ڕەفیق) (محمد فەرەج) (قادر کوردیی) (شوکت رەشید) (نوری بە دەوی) بە مۆسیقا هاوکاریو هاوئاهەنگی ئەم گوێندەو گۆرانیبێژانەی سلێمانیو کوردەوارییان کردووە.

(ڕەسۆڵ) (محمد صالح دیلان) (حەمەی بەکر) (باکووری) (شەماڵ صائب) قادر حاجی حسین) (عەلی مەردان) (سێوە) (ابراهیم محمد) (ڕەفیق چالاك) (عمر رضا) (حەمەی مامڵێ) (فرج حاجی رەشید) (عثمان صابونچی) (خەلیلی صدیقی) (بەختیار عبدالرحمن)

ـ لە ساڵی (1957) بە شێوەیەکی ڕەسمی ئەم تیپە

(ئیجازەی) وەرگرتووە وناونراوە (تیپی مۆسیقای مەولەوی)بۆ باربووی لێقەوماوەکانی لافاوەکەی سلەیمانی لە (کۆیە)و (هەولێر) ئاهەنگیان گێراوەو چالاکی هونەریی خۆیان نواندووە.

لە بەندی (2) یاسای کۆمەڵی هونەرە جوانەکان دا (1957) نووسراوە.

«ئامانجی بەرزکردنەوەی سەوییەتی تێگەیشتنی گەل و پێگەیاندنی چێژی هونەروەری لە ڕێگای ئاهەنگی تەمسیل و مۆسیقاو گۆرانیی»

- ئەم تیپە دەورێکی یەکجار دەوڵەمەندی هەیە لە پێگەیاندن و خەملاندنی هونەری سازو ئاوازی کوردیدا، تا نەورۆزی ساڵی 1963 بەردەوام بووە،

عثمان شاربازێری   ولیم یوحەنا



## 1961 / 1960

● - لەم ساڵانەدا مامۆستا (ولیەم یۆحەننا) لە قوتابخانەی مامۆستایانی سلەیمانی دانرا کە وانەی (سروود)و (مۆسیقا) بڵێتەوە هەر لەو کاتەدا تیپێکی خونچیلانەی لەو قوتابییانەی حەزیان لە هونەری مۆسیقا بوو، پێك هێنا. ئەندامەکانی کە لە بیرم بێ (جەلیل مستەفا - ئۆکردیۆن - ) ئەمڕۆ لە هەولێر مامۆستایە، (مستەفا ڕەئووف - شمشاڵ) مامۆستایە لە (چوارتا) (عثمان شاربازێری - گۆرانیبێژو ئالەتی عوود).

چەند قوتابییەکی تر (کۆرس)بوون.

لەو ساڵەدا بە هاوکاری مۆسیقای کەمانی مامۆستا (ولیەم چەند گۆرانییەکم لە سەر (نەوار = شریط - ڕیکۆردەر) تۆمارکرد لەوانە مەقامی (سەفەر) (هومایۆن) (سەبا) (ئەی خوا لەم ئاگرباارانە)و بڕێکی تر، بە هۆی نووسەری ناسراوی کورد مامۆستا (محمد ملا کریم) ئەو شریطە گەیشتە ڕادیۆی کوردی عێراق تا ئەمڕۆش ئەو گۆرانییانە لەو ئیستگەیەوە بڵاودەکرێتەوە. سەبارەت هەر بەو گۆرانییانە بوو، مامۆستا نەجمەدین مەلا (1898 - 1962) لە ڕۆژنامەی ژین ژمارە (1671) - 1962/4/5 نوسیوێتی ئێستاش دەنگە خۆشمان زۆر، وەکوو (دیلان) (مەحموود تۆفیق) (چالاك) (عثمان شاربازێری) (ڕەشۆل) (کەریم مەحموود).

- وەکوو مامۆستا (ولیەم یوحەننا) دەڵێت:

هەر لەو ساڵانەدا 1962 / 1963 (ئەنوەر قەرەداغی) و(محمد حسەین)و دوا جار (فەرەنسیس داوود)و (خالد سەرکار) هاتنە تیپی مۆسیقای مامۆستایان وئەتوانم بڵێم تیپی مۆسیقای ئەم قوتابخانەیە (هاندەرو هۆیەك)بوو، بۆ درووست بوونی (تیپی مۆسیقای سلێمانی) چونکە ئەندامە چالاکەکانی ئەم قوتابخانەیەو زانستگای هونەرە جوانەکان هەوڵیان یەکانگیربوو ئەو تیپە پێکهات.

لە ساڵانی 1965/1964 کاك (ئەنوەرقەرەداغی)و چەند کەسێکی تر تاقمێکی مۆسیقایان پێك هێنابوو، ڕێکەوت لە هاوینی ساڵی (1964)دا لە ماڵی (مستەفا ڕەئووف) ،کە شمشاڵی لێئەدا بە هاوکاری (فەرەنسیس داوود)،کە ئالەتی عوودی لێئەدا چەند گۆرانییەکم تۆمارکرد، ساڵی (1965) ئەو شریتەم برد بۆ ئیستگەی ڕادیۆی کوردی بەغداد - لیژنەی تاقیکردنەوەی گۆرانیی ومۆسیقای ئەو سەردەمەی ئیستگە، تەنیا گۆرانییەکیان هەڵبژارد (ئەی کیژۆڵە) کە ئەو گۆرانییە تا ئەمڕۆ لە مەکتەبەی ڕادیۆی کوردی - بەغدایە - مۆسیقاکەی هی (ئەنوەر قەرەداغی)یە کە تازەکاریو تازە کوورەیی ئەو هونەرمەندەی پێوە دیارە.!

- لە ساڵی 1968 تیپی بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی سلەیمانی هەبووە: (بڵاوکراوەی سلێمانیّ) لە ژمارە(2) ئابی 1968دا نوسیویەتی تیپی مۆسیقای پەروەردەی سلێمانی لە ڕۆژی 1968/6/30 بەشداری ئەو ئاهەنگەی‌کرد، کە نەقابەی مامۆستایان لە سلێمانی گێراویەتی بە هۆی کارکەنار بوونی (14) (مامۆستا)وە، لەوێدا سروودی (کە دەڵێن ئەمرۆ دەشت و کێوشینە) لەگەڵ چەند گۆرانی‌یەکی کوردی‌یان پێشکەش کردووە.

## - 1969 -

- لە ساڵی 1967 تیپی مۆسیقای سلێمانی هاتووەتە (ئارا)وە لەگەڵ تیپی نواندنی سلەیمانی پێکەوە بوون لەچەند ئاهەنگێکدا پێکرا بەشداریان کردووە.

(بڵاوکراوەی سلێمانی) لە مانگی کانوونی دووەم 1969 نوسیویەتی.

«دەمێك بوو، شارە خۆشەویستەکەمان دوور بوو، لە سازو ئاوازو هونەر، بەڵام ماوەیەك لەمەوبەر ئەو تەلیسمە شکایەوە لەم ماوەیەدا قوتابی‌یانی زانستگەی مامۆستایان چیرۆکی (بریار وئەنجام) بە هاوبەشی تیپی مۆسیقای سلێمانی پێشکێش کرد هەروا چەند پارچە ئاوازو گۆرانی‌یەکی کوردی لە لایەن تیپەکەوە بە هاوکاری هونەرمەندان (إبراهیم محمد) پێشکێش کران

- لێرەدا ئەڵێین ئەگەر (تیپی مۆسیقای مەولەوی) بەردێکی لە بناغەی تەلاری هونەری ئەم شارەدا ،دانابێت، بێگومانین لەوەی کە تیپی مۆسیقای سلێمانی، ئەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی تەلارەکە.

- تیپی مۆسیقای سلێمانی لە ساڵی (1970)دا وەك تیپێکی سەربەخۆ کەوتووەتە چالاکی نواندن بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و پیلاندار، ساڵی (1973) میری بە ڕەسمی ڕێی دامەزراندنی داوە.

ئەو هونەرمەندانەی ئەم (تیپەمۆسیقا) یەیان دامەزراند:

- «ئەنورە قەرەداغی - ولیەم یوحەننا - موحەمەد حسەین - فەرەیدون دارتاش - فەرید عیسا - فەرەنسیس داوود ئەم هونەرمەندانەی تریش دەورێکی باڵایان بووە لەو تیپەدا (صلاح رؤوف، عثمان محمد، ئەسعەد قەرەداغی حسەین قەرەداغی - جەمال شادان - جەمال کابان، عومەر سەرکار، ئەو گۆرانی‌ی بێژانەی لەگەڵ ئەو تیپەدا گۆرانی‌یان ووتووە (ابراهیم محمد) )توفیق عەلی) (ئەسعەد قەرەداغی) (حەسەن گەرمیانی) (کاژاو شەوکەت) (عبدالقادر حەسەن) (کریم کابان) (عباس محمد)و گەلێکی‌تر.

● لە ساڵی (1969) تیپێکی مۆسیقا سەر بە کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی - لقی سلێمانی دامەزراوە کە گەلێ بەرهەمی چاك و پاکیان پێشکەش کردووە چ لە سەر شانۆو چ لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن دا لە ئەندامەکانی ئەو تیپە (شوکت رشید) (نامدارقەرەداغی) (صلاح ڕەشید) (علی حەمەڕەزا) حەمە سەعید عەبدوڵلا) (شێرکۆ عادل) هوشیار کمال) لە گۆرانی‌ی‌بێژەکان (محمدنێرگز) (عثمان عەلی)و (صلاح مجید) وهەندێکی‌تر.

● - ساڵی (1972) لە لایەن قوتابیانی زانکۆی سلێمانی بە ڕێبەری - ئەنور قەرەداغی - تیپی مۆسیقای (زانکۆ) دامەززاوە.

● - لە ساڵی 1974 - 1975 لە زانکۆی سلێمانی بە سەرپەرشتی مامۆستا (ولیم یوحەننا) تیپی مۆسیقای (زێرین)و (زیوین) دامەزراوە.

● - لە ساڵی (1975)دا لە قوتابخانەی ئامادەیی‌کچان تیپێکی مۆسیقای ئافرەت دامەزراوە.

● - لە ساڵی (1976) لەگەڵ تیپی مۆسیقای (زانکۆ)ی سلێمانی‌دا لقێکی تری لێ‌بووەتەوە، بە ناوی (تیپی مۆسیقای میللی).

● - لە ساڵی (1976)دا (تیپی مۆسیقای مەولەوی دامەزرا کە ئەندامەکانی بەشی زۆریان ئەو هونەرمەندانەی لە مەڕ تیپی مۆسیقای کۆمەڵی هونەرو وێژەی سلێمانی بوون و جیابوونەوەو ئەو تیپەیان پێك هێنا لە مۆسیقازانەکان (نامدار قەرەداغی) (عەلی حەمەڕەزا) (حەمەسەعید عەبدوڵلا) (سامی سلەیمان) (کاوەقادر) حەسەن ئەحمەد خدر)و لە گۆرانی‌بێژەکان (محمد نێرگز)و

(صلاح مجید) و(ئەحمەد شوشەچی).

● ـ لە ساڵی (1977)دا لە قوتابخانەی بێخود)ی سەرەتایی کوڕان، تیپێکی قوتابخانە پێکهاتووە بە هان و هەوڵی ئەم هونەرمەندانە (نامدار عومەر قەرەداغی) (حەمەسە عید عەبدوڵلا) (کاوە قادر) لە قوتابییەکان (ئاری عارف) (ئاری ابراهیم) (ئاری عبدالواحد) (ئالان عارف) (دارا عەبدوڵلا) (کارزان قادر) (کارزان عومەر) (کاروان قادر)و چەند کەسێکی‌تر.

● ـ بێجگە لەم تیپانە لە سلێمانی‌دا تیپی مۆسیقای ترزۆرە بە تایبەتی پاش ساڵی (1980) گەلێك (تیپ)و (تاقم)و (تویژ)و (تەخت)ی مۆسیقا.

لە سلێمانی‌دا هاتوونەتە ئاراوە، برێکی هێندیکیان خزمەتی هونەریی کوردی وپێشی دەخەن.

*تیپی مۆسیقای خانەی مامۆستایان
*تیپی مۆسیقای مەولەوی.
*تیپی مۆسیقای بابان
*تیپی مۆسیقای هاوناز
*تیپی مۆسیقای کانی
*تیپی مۆسیقای شیلان
*تیپی مۆسیقای میللی سۆران
*تیپی مۆسیقای سارا
*تیپی مۆسیقای ژووان
*تیپی مۆسیقای سۆز
*تیپی مۆسیقای مەهاباد

● ـ لێرەدا ناوی ئەو کەسانە دەبەین کە لەگەڵ گۆرانی‌ی‌و مۆسیقاو ئاوازدا خەریك بوون، هی‌وایان تێدایە، کە چەند رۆژێکی کەم بووەو وازی هێناوە، هی‌وایان هەیە سەرومر هەتا کۆتایی ژیانی لەگەڵ ئەو هونەرەدا بوون، هی‌واشیان تێدایە کە خاوەن بەهرەو بەرهەم دارن، هی‌واشی تیایە تافێکی تایبەتی لە ژیانی‌دا لەو هونەرە نزیك بووەتەوە وازی هێناوە. هەرچی چۆنێك بێ وەك کورد فەرمووی‌ەتی (ئەوەی دەنکە گەنمێکی پاشای خواردبێ) بە پەرێزی گۆرانی‌ی‌و مۆسیقادا رۆیبێ وەك ناوهێنان و رێزلێنانێك.. لە کاروانی مۆسیقاو گۆرانی لە شاری سلەیمانی‌دا ئەیخەینەوە یادو چ کەسێکمان لە یاد کردبێ داوای لێبوردن ئەکەین ئێمە ئەوەندەمان لە تواناد بوو.

ـ ئەلف ـ

*) ابراهیم حەزین (گۆ)
*) ابراهیم محمد (گۆ)
*) ابراهیم سعید (گۆ)
*) ئاوات احمد (گۆ)
*) ئاوات چالاك (گۆ)
*) اسطیفان (مۆ)
*) ئەحمەدی ناسر (گۆ)
*) ئەحمەدی سعید (گۆ)
*) ئەحمەد خولە سنەیی (شەماڵ) (گۆ)
*) ئەحمەد محمود (گۆ ـ ئەکتەر)
*) ئەمەی خولە (گۆ)
*) ئەنوەر صالح علی (مۆ)
*) ئەنوەر قەرەداغی (مۆ)
*) ئەحمەدی حەمەی لەیلێ (گۆ)
*) ئەدیب حسین (مۆ)
*) اسعد قەرەداغی (مۆ ـ گۆ)
*) ئەنترانێك گەرەبێت (مۆ)
*) ئەلبێرت عیسا (مۆ)
*) ئەمین شوکت (کاژاو) (گۆ)
*) ئەمین ابراهیم (گۆ)
*) بەتراکی (مۆ)
*) بەهجەت رەشید سەعاتچی (مۆ)
*) بەهیجە إبراهیم یعقوب (1908 ـ 1979) گۆ
*) پرتەو عبدالعزیز (گۆ)
*) جەلال ئەحمەد وەیسە (کۆچەر) (1943) (گۆ)
*) جمال جەلال قادر (گۆ ـ مۆ)

*) جەمال وەستا عەلی (گۆ)
*) جەمال شادان (مۆ - گۆ)
*) جەمال ئەحمەد (مۆ)
*) جەمال تۆفیق (مۆ)
*) جەمال کابان (مۆ)
*) جەزا زەنگەنە (گۆ)
*) جەلال عەزیز (مۆ - گۆ)
*)
*) دلشاد مەسرەف (گۆ)
*) دلێر ابراهیم (مۆ)
*)
*) هوشیار احمد (مۆ)
*) هوشیار کمال (مۆ)
*) هادی عەنبەر (مۆ)
*)
*) ولیم یۆحەننا (مۆ)
*) حازم حداد (مۆ)
*) حاتەم سعید (مۆ)
*) حەسەن گەرمیانی (گۆ)
*) حەسەنی نەی (مۆ)
*) حەسەنی ئامێ (گۆ)
*) حسەین قەرەداغی (مۆ)
**) حسەین (مەلا) (گۆ)
*) حەمەی عەلۆ (گۆ)
*) حەمە شێرە (گۆ)
*) حەمە کوردە (گۆ)
*) حەمە رؤوف عبدالله (گۆ)
*) حەمەی حەمە عەلی خومخانە (گۆ - مۆ)
*) حمدی ئەمین ئەفەندی (گۆ)
*) حەسەن زیرەك (گۆ - مۆ)
* طالب مجید (تەلە) (1915 - 1978) (گۆ)
*) طاعت مبارك (مۆ).

*) کەریم ئەحمەد (مەلا) (1885 - 1938) (گۆ)
*) کەریم شایەر (گۆ)
*) کەریم محمود کابان (1929) (گۆ)
*) کەریم خەمزەیی (1949) (گۆ)
*) کاکەرەشی ئەحان (گۆ)
*) کمال رەشید سەعاتچی (1918) (مۆ)
*) کەلثوم احمد (گۆ)
*) کارزان قادر (مۆ)
*) کاروان قادر (مۆ)
*) کامەران عبدالمجید (گۆ)
*) کاوە ژاژەڵەیی (گۆ)
*)
*) گۆران ابراهیم (مۆ)
*) محمد صالح دیلان (1927) (مۆ - گۆ)
*) محمود محمد لەیلێ (گۆ)
*) محمد ابراهیم عبدول (گۆ)
*) محمد پیر وەیس (گۆ)
*) محمد قەدری (مۆ - گۆ)
*) محمد صالح شەریف (نێرگز) (1944) (گۆ)
*) مدحت مبارك (مۆ)
*) محمد حسەین (مۆ)
*) محمد حەسەن (گۆ)
*) نامدار عومەر قەرەداغی (1951) (مۆ)
*) نوری شێخ صالح (مۆ - گۆ)
*) نوری عەنبەر (مۆ)
*) نەورۆز عەلی (1961) (گۆ - مۆ)
*) نجاة عەبدە (مۆ)
*) ساجد رفیق (مۆ)
*) سیروانی (ر - ب) (گۆ)
*) سەردار رەمزی فەتاح (مۆ)
*) سەرکیس سیمۆن (مۆ)
*) سەرکیس کیغام (مۆ)

* ) عائشة عەلی (گۆ)
* ) عبدالله حاجی الیاس (مۆ)
* ) عەلی احسان (مۆ)
* ) عەلی کاکە أمین (مۆ)

* ) عبدالواحد حاجی مستەفا (مۆ)
* ) عبدالقادر حاجی حسین (گۆ)
* ) عبدالقادر حەسەن (گۆ)
* ) عەبە حەیران (1893 ـ 1972) (گۆ)

* ) عبدالله قادر محمد (دەروێش 1890 ـ 1958) (گۆ ـ مۆ)
* ) عەزیزی ئامینە (گۆ)
* ) عەزیزی مەلا خالد (گۆ)
* ) عبدالله رسول (گۆ)

* ) عبدالرحمن قەدری (مۆ)
* ) عەبەی سەیزادە (مۆ)
* ) عەزۆلە (مۆ)
* ) عباس محمد (گۆ)

* ) عثمان حسەین (گۆ)
* ) عثمان علی محمد (گۆ)
* ) عثمان صابونچی (گۆ ـ مۆ)
* ) عثمان محمد (مۆ)
* ) عثمان عەلی مارف (شارباژێری) (هۆ ـ گۆ ـ مۆ)
* ) عومەر سەرکار (مۆ)
* ) عومەر رەزا (گۆ)
* ) عومەر خەمزەیی (گۆ)

* ) فاضل مجید (گۆ)
* ) فاروق محمد (گۆ)
* ) فاتح (مەلا) (گۆ)
* ) فەرەیدون دارتاش (مۆ)

* ) فەرەنسیس داود (مۆ)
* ) فەرید عیسا (مۆ)
* ) فەروج حاجی رشید (1922 ـ 1979) (گۆ)
* ) صباح احمد (گۆ)

* ) صباح محمد (مۆ)
* ) صلاح رؤوف (مۆ)
* ) صلاح مجید (گۆ)
* ) صالح اسماعیل (گۆ)

* ) صالح کارگەچی (گۆ)
* ) صلاح رشید (مۆ ـ گۆ)
* ) قادر دیلان (گۆ ـ مۆ)
* ) رەعنا (مەلا) (گۆ)

* ) رەفیق تۆفیق (چالاك 1924 ـ 1973) (ئەکتەر ـ نوسەر ـ گۆ)
* ) رەشید عبدالله عزیز (رەسول) (1912 ـ 1974) (گۆ)
* ) رەشید صدقی قادر (گۆ)
* ) رەشید شایەر (گۆ)

* ) رۆبین ئۆفیك (مۆ)
* ) رەزا (شێخ رەزای گولانی) (مۆ)
* ) رؤوف بەگ (گۆ)
* ) شوکت رشید سەعاتچی (1922) (مۆ)
* ) شوکت رشید (1932) (مۆ ـ گو ـ هۆ)
* ) شەماڵ صائب (مۆ ـ گۆ ـ هۆ)
* ) (تۆفیق)ە رەش (مۆ)

* ) تۆفیق عەلی (گۆ)
* ) خالد سەرکار (مۆ)
* ) خەسرەو رەفیق (گۆ)
* ) غەریب میرزا کەریم (مۆ)

## «پاشکۆو پەراوێز»

1 ـ گۆڤاری (العربي)ژ (98) ساڵی 1967.

2 ـ ژیانی کوردەواری (تۆمابوا)ل 145 حەمە سەعید حەمە کەریم لە عەرەبی‌یەوە کردوویەتی بە کوردی

3 ـ گۆڤاری رۆژی کوردستان ژمارەی (1974/2/19 ل 12.

The Music and The musicaL insTrumenT oF The Arabs. 1916. H.G. Farmer.

5 ـ گۆڤاری (زاری کرمانجی) ژمارە (14)ل 17 ـ رەواندز (1928)

6 ـ خلاصەیەکی تأریخی کوردو کوردستان (ج ا) 1931 مامۆستا محمد امین زەکی بەگ.

7 ـ مێژووی (ئەمارەتی بابان) ـ نوری قەفتان.

8 ـ مێژووی (کوردو کوردستان) (مەردۆخ) گۆرینی (م. فیدا. (ب 2)ل 75 ـ 1958

9 ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ل 376 چاپی‌یەکەم 1952 مامۆستا علاء الدین سەجادی

10 ـ نوسینەکانی مامۆستا (جەمال بابان) دەربارەی میرنشینی بابان

11 ـ گفتو گۆیەك لەگەڵ مامۆستا (ئەحمەد خواجە ) 1984

12 ـ (ئەحەی ناسری هونەرمەند) مامۆستا (غفور رشید داراغا)

13 ـ

. NarratiVe OF aResident in Kurdistan, cLaudius james Rich.

14 مستەفا بەگی کوردی (1809 ـ 1849) مامۆستا سجادی ل 296م. ئە. کوردی

ب ـ (1812 ـ 1851)ژ (50) رۆژی کوردستان (ص ح غالب)

ج ـ (1782 ـ 1859) مامۆستا (هۆشەنگ) هاوکاری ژ (741).

15 ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ل 307 ـ 308 1952

16 ـ لێدوانێکی کورت لە مەقام و مۆسیقای کورد ل 25 (ع.ع.ش)

17 ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ل 307 ـ 308

18 ـ گەلاوێژ (8سال 8) 1946 عبدالقادر خفاف.

19 ـ گۆڤاری (رۆژی نوێ) (12 سال 1) 1960 ل 81

20 ـ (هیجرانی) مەقامێکە زادەی نەغمەی (بەیات)ە.

21 ـ (رۆحی مەولەوی) ـ پیرەمێرد ـ ل 1935/2

22 ـ گۆڤاری (بەیان) ژمارە(75) گوڵ جەمین ـ عثمان شارباژێری

23 ـ کسۆکە نزەکیوەکان واتە سەگەزاوەکان!

24 ـ نامەیەکی مامۆستا ئەحمەد خواجە

25 ـ قیان بغداد ـ عبدالکریم العلاف (1969).

26 ـ شێخ محمەدی خاڵ ـ ملامحمدی خاکی.

27 ـ نامەیەکی مامۆستا ئەحمەد خواجە.

28 ـ سەرچاوەی پێشوو

29 ـ ئەحمەد کوری خواجە عەزیز ئەفەندی وەسمان ئاغایە ساڵی (1903) لە سلێمانی لە دایك بووە.

30 ـ نامەیەکی مامۆستا (ئەحمەد خواجە).

31 ـ دایەرەزەنگی: دەفێکی بچکۆلەیە ئەلقەی زریزەیی بە دەوردا دەگیرێ‌و رەزمێکی بەزم هێنی هەیە.

32 ـ گۆڤاری بلێسە (6سال 1) 1959.

33 ـ مامۆستا غفور رشید داراغا. ئەحەی ناسری هونەرمەند

34 ـ مەقامی سەفەر: زادەی نەغمەی مەقامی (بەیات)ە

35 ـ نامەیەکی مامۆستا ئەحمەد خواجە

36 ـ ل 58 ئەحەی ناسری هونەرمەند.

37 ـ مامۆستا ئەحمەد خواجە

38 ـ یاداشت، رەفیق حلمی، (بەرگی ە)

39 ـ هاوار (محمدرسول) دیوانی پیرەمێردی نەمر.

40 ـ زێوەر (سۆزی نیشتیمان)ل 113

41 ـ زێوەر (سۆزی نیشتمان) ل 110

42 ـ محمود زامدار (دەروازەیەك بۆ ئاوازی کوردی)

43 ـ محمود زامدار سەرچاوەی پێشوو.

44 ـ زێوەر (سۆزی نیشتمان) ل 114

45 ـ سەرچاوەی پێشوو

46 ـ رۆژنـــامـەی کوردستـان ژ (2) چیم دی بەرگی (1)ل

129 ـ ئەحمەد خواجە

47 ـ قادری حاجی حسەین. لە چاو پێکەوتنێکدا.

48 ـ ئەحمەد خواجە لە چاوپێکەوتنێکدا

49 ـ یاداشت (رفیق حیلمی) بەرگی (6)

50 ـ چیم دی (احمد خواجە) بەرگی (2)

51 ـ نامەیەکی مامۆستا ئەحمەد خواجە.

52 ـ ئەحمەد خواجە لە چاوپێکەوتنێکدا

53 ـ فریا جاف (هاوکاری) 1983

54 ـ 55 , 56 ئەحمەد خواجە

57 ـ رشید نجیب: گەلاوێژ (5 ساڵ 8) 1947

58 ـ 59 مامۆستا ئەحمەد خواجە

60 , 61 , 62 رۆشنبیری نوێ ـ عثمان شارباژێری

63 ـ ژین (1671) 1962/4/5 مامۆستا نجم الدین مەلا

64 ـ مامۆستا احمد خواجە

65 ـ دیوانی بیخود 95

66 ـ هاوکاری ـ (هوشیار عبدالرحمن) 1974

67 ـ رفیق چالاك لەو سەردەمـەدا منـاڵ بووە، بێگـومانم کە دەرسی مۆسیقای لای ئەو مامۆستایە نەخوێندووە.

68 ـ مامۆست (شاکر فتاح) گفتوگۆیەك 1984/6

69 ـ رۆژنامەی (ژیان) ژ (26) /1926

70 ـ ژیان (26) /1926

71 ـ ژیان (127) 1928

72 ـ احمد بەگی تۆفیق بەگ بووە.

73 ـ بڕوانە دیوانی بێکەس (چ 2)ل 171 نووسراوە بە (هەیبەت)

74 ـ (ژیان) ژمارە (111) 1928/4

75 ـ گەلاوێژ (3ساڵ 5) 1944

76 ـ پیرەمێردی نەمر ل 347 ـ محمد رسوڵ هاوار

77 ـ سەرچاوەی پێشوو ل 353

78 ـ سەرچاوەی پێشوو ل 360

79 ـ سەرچاوەی پێشوو ل 342

80 ـ (ژیان) ژمارە (114) 1928/5

81 ـ بولبـولی کورد (مـەلاکـەریم) رۆشنبیـری‌نـوێ ـ (98) عثمان شارباژێری

82 ـ دایـکی جەمــاڵ (بهیجــە 1908 ـ 1979) ئەم ناوو مێژووە لە نوسینێکی کاك کەمال رؤوف محمددا هاتووە لە هاوکاری‌دا.

83 ـ حمدی أفندی (1894 ـ 1948) بڕوانە نوسینی کاك کمال فرج تۆفیق (ژین) ژمارە (62) /1972

84 ـ (کاروان) ژ (10) ـ کمال رؤوف محمد 1983

85 ـ هاوکاری ژ (725) جلال جۆبار /1984

86 گۆڤاری (التراث الشعبی) (2ساڵ 11) 1980 مامۆستا (عطا تررزی باشی)

87 ـ أ ـ كاك شوكت رشيد سەعاتچی ـ کەمانژەن ـ

ب ـ كاك بەهجەت رەشید سەعاتچی ـ مۆسیقازان

88 ـ (ژیان) ژمارە(342) 1932

89 ـ كاك شوكت رشيد سەعاتچی ـ کە مانژەن.

90 ـ سەرچاوەی پێشوو.

91 ـ هاوکاری ژمارەکانی (714 ـ 717 ـ722) (رەشۆل)

نوسینی ـ عثمان شارباژێری

92 ـ سەرچاوەی پێشوو.

93 (رەشۆل) هەمان سەرچاوە.

94 سوپاسی مامۆستا (ئەحمەد خواجە) دەکەم کە دەربارەی برێ لە گۆرانی بێژەکانی سلێمانی زانیاری دامێ.

هەروەها سوپاس بۆ مامۆستاو هونەرمەندی مۆسیقازان (ولیەم یۆحەننا)، کە دەربارەی تیپی سروودو مۆسیقای قوتابخانەی مامۆستایان ی سلێمانی ساڵی (1960 ـ 1961)و تیپی مۆسیقای سلێمانی برێ زانیاری دامێ لەگەڵ چەند وێنەیەکی (تیپی مۆسیقای ساڵی 1947) لە سلێمانیو (تیپی مۆسیقای مەولەوی.

95 ـ رۆژی 1984/6/14 لە نوسینەوەی ئەم ووتارە بوومەوە بۆیە دەستکاری ئەو ووتانەم نەکردووە کە دەربارەی گۆرانی‌یو قەوانەکانی (حەمدی ئەفەندی) دواوم.

لە رێکەوتی رۆژی 1984/11/22 لە شاری سلێمانی و لە ماڵی كاك (أ.ح. عباس)کە لە رۆژگاری باوکی‌یەوە چەند

(قەوانێکی کۆن)یان هەڵ گرت بوو، ئەو قەوانانە بە (پارە) دەست من کەوت (17) قەوان بوون، (6) شەش قەوانی گۆرانی‌ی کوردی‌یان تێدابوو. لەوانە گۆرانی‌ی (سید عەلی ئەسغەری کوردستانی)و (مەلا کەریم) و (قەتا رو خاوکەری حەمە أمین تاڵەبانی) تیابوو. بەڵام ئەوەی کە زۆر دڵشادی کردم کە (قەوانێکی) گۆرانیی (حەمدی ئەفەندی) یان تیابوو چونکە تا ئەم کاتە کەسێك نەبوو گۆرانی‌یەکی تۆمارکراوی حەمدی ئەفەندی چنگە بکەوێ لە مێژە بە دوایدا دەگەرێین.

وا من گۆرانی‌یەکی ئەو بەهرەمەندەم دوزی‌یەوە کە: ناوو نیشان و ژمارەی (قەوان)ەکەو ناوی (کۆمپانیا) کەیە کە تۆماری کردووە. جا بەم ژمارەیەدا دەردەکەوێ کە (حەمدی ئەفەندی) ئەگەر یەکەمین گۆرانی‌ی بێژێکی کورد بێ گۆرانی‌ی قەوانی تۆمار کرد بێ.

1 ـ کۆمپانیا

نوسراوە: غەزەلی محوی (مەهوی) =

(لە) [دەنا کەس کاریا] ـ

حمد افندی ناجی

دیوی‌یەکەم

دیوی دووەم

یارە (ناجی) ناز ناوی (حمدی ئەفەندی‌یە).

His MASTERS VOICe

Ghazali mahwy

Denakes kerieh

Hamdy EFF .Naji

A -

641

18 - 212 865

B x 4371

18 - 212 866

B X 4372

# سەرنجێ لە نووسینی کوردناسە ئینگلیزەکان لە پاش شەڕی یەکەمی جیهانیدا

د. أحمد عثمان أبوبكر
كۆلێجی ئەدەبیات زانکۆی بەغدا

مەبەستمان لە ووشەی کوردناس لەم ووتارەدا هەرکەسێکە کە ئاگای لە کاروبارو وولاتی کورد بوو بێت، هەروەها ئەو کەسانەش شتێکی بەرچاویان لە ڕوویێك یان لە لایەنێك لە لایەنەکانی باسی کوردناسیدا نووسیبێت یان شوێنەوارێکیان لە بەشێك یان لە بابەتێك لە بابەتەکانی کوردناسیدا بەجێ هێشتبێت.[1]

لێرەدا ئێمە سەرنجێك لە کاروکردەوەی ئەو کوردناسە ئینگلیزانە دەدەین کە لە پاش شەڕی یەکەمی جیهانیدا دەرکەوتوون و لەو بڕوایەش داین کوردناس مەرج نی‌یە زمانی کوردی بزانێت، واشی بە چاك دەزانین کە جوغزی باسەکەمان وەتەنگ بێنین و وابکەین تایبەتی بێ تەنیا بەو کەسانەی بەر لە پەیمانی سیڤەری ساڵی 1920 لە کاروباری کوردی دوواون یان لەسەریان نوسیوە، بێگومان ئەوانەش کە لە سەردەمی ژیانی خۆیاندا یان لەم ڕۆژانەدا هەندێ ناوبانگیان دەرکردبێت زۆر نین (هەر کەمێکیان ئێجگار بەناوبانگن)، بەڵام دەتوانین بڵێین هەندێ بەرهەمی ئەو کوردناسانە بەگشتی نەناسراون یان بە ووردیو روون و رەوانی باس نەکراون، جگە لەوەش وا پەسەند دەکرێت ماوەی لێکۆڵینەوەکەمان لەمەش تەسکتر بکەینەوە ،چونکە ئامانجمان ئەوە نی‌یە لە هەموو ئەو ئینگلیزانە بدوێین هەر لە کۆتایی شەڕی جیهانی‌یەوە تا ئێستا، بەڵکو بە ماوەی دوو ساڵی پاش شەڕەکە ئیکتیفا دەکەین، سەرباری ئەوەش دەمانەوێ بە تەنیا دوو کەسیان کە مێجەر نۆئیل و ج. ر درایڤەرن باس

بکەین، لەدواییشدا ماوەی باسەکەمان تەسکتریش دەبێتەوە کە ناچار دەبین تەنیا بە دەست نیشان کردنی بەرهەمێك لە بەرهەمەکانی ئەوەی دووامینیان وازبهێنین. بەو هیوایە شتێك باس بکەین هێشتا لام وابێ زۆر باس نەکراوە یان بە تەواوی باس نەکراوە، هەروەکو لە دواییشدا دەردەکەوێ ئەو لایەنەی تا ئێستا زۆرکەم نەبێ روون نەکراوەتەوە کردەوەکانی میستەر درایفەری کوردناسە کە بەتەواوی و پڕ بە پڕی پێویست نەناسراون، بەتایبەتیش ئەو لێکۆڵینەوە یان ئەو راپۆرتەی ـ وەکو خۆی ناوی لێ دەنێ ـ کە نوێەرەی نووسینەکانیتی لەم بوارەداو رەنگبێ لە رووی سەرچاوەو کەڵك بەخشینەوە بە چاکترین بەرهەمی ئەو بژمێردرێت.

بەڵام دەبێ یەکەوهەل دەست بە باسی نووسینەکانی مێجەر نۆئێل بکەین نەك هەر لەبەر ئەوەی کە بە دۆستی کورد دادەنرێت بە تایبەتی وەکو لە نووسینەکانی خۆیدا ئەوەی پیشان داوە، بەڵکو بە تایبەتی چونکە درایفەر سوودی لە نووسینەکانی ئەو وەرگرتووەو کردوونی بەسەرچاوەو لە گەلێك بواردا شتی لێ وەرگرتوون. مێجەر نۆئێل چوار نووسینی کورتی لێ بەجێ ماوە:

یەکەم: یادداشتێکی بڵاونەکراوە دەربارەی گەشتێك کە لە زستانی ساڵی 1918ەوە تا بەهاری ساڵی 1919 لە ناوچەکانی کوردەواریدا کردوویەتی.

دووەم: لێکۆڵینەوە (یان راپۆرتێك) بەناوی تێبینی‌یەك لە حاڵی کورد، ئەمەش لێکۆڵینەوەیەکی بەکەڵك و رەسەنە.

سێیەم: یادداشتێك دەربارەی گەشتی دووەمین جاری لە ناوچەی کوردەواری‌ی ئەنادۆل دا لە حوزەیرانی ساڵی 1919ەوە تا دوا دوای ئەیلولی هەر ئەو ساڵە. ئەم کتێبەش لەوانەیە گەورەترین کتێبی نۆئێل بێت کە 76 لاپەڕەی قەبارە گەورەیە بە چەندین وێنەی هەتاوی رازاوەتەوەو ناوی عەشیرەت و مێژووی بنەماڵەی بەدرخانی و باسێکی لەسەر پەندی پێشینانی ناوچەی هەکاری تێدایە.

چوارەم: راپۆرتێك دەربارەی ئەو رووداوانەی کە بوونە هۆی گیرانی نۆئێل بەدەست چەکدارانی جنکلی لە ئێراندا، جگە لە چەند راپۆرتێکی هەمە جۆری تر.

ئەوەی دەربارەی کردەوەی کوردناسە ئینگلیزەکانی دوای یەکەم شەڕی جیهانی تا ساڵی 1920 پێویستە بگوترێ ئەوەیە زوربەیان لە شێوەی راپۆرت دایە، واتا بریتین لەو هەواڵ وا ئاگادارییانە کە ـ هەندێ جار لەنزیکەوە ـ دەربارەی کاروباری ناوچەکەو هەڵسوکەوتی عەشیرەتە کوردەکان و هەڵوێستی سیاسی بەگشتی دەستیان کەوتووە، ئەم راستی‌یەش کردەوەکانی مێجەر سۆنی بەناویانگیش دەگرێتەوە نە خسووس ئەو راپۆرتانەی کە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی نووسیونی و ئەو چالاکییەش کە لە رۆژنامەنووسی‌ی کوردیدا نواندوویەتی، هەروەها کتێبەکەی کاپتان های (دوو ساڵ لە کوردستان) دەگرێتەوە سەبارەت بەوە کە لێکۆڵینەوەو یادداشتە دەربارەی ناوچەی کوردەواری لەو ماوەیەدا هەر بەم جۆرەش لۆنگریگ و مس بێڵیش.

لە لایەکی دیکەشەوە، هەقی ئەوەمان بەدەستە چەند کەسانێکی تر بخەینە پاڵ کوردناسەکان، با نووسەرو لێکۆڵەرەوەش نەبن، وەکو لۆرد کیرزنی وەزیری ناوداری دەرەوەی بەریتانیا، چونکە کە بەڵگەنامە سیاسی‌یەکانی دەرەوەی بەریتانیا لە ماوەی دوای شەڕەکە بخوێنینەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەم لۆردە جگە لەوەی خاوەن کتێبە ئاگاداریشی لە مەسەلەو کاروباری کوردیدا کەم نی‌یە، بەڵام لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆری نامەو برووسکەنامەکانی لە بابەت کاروباری کوردی‌یەوە لە دوای شەڕ هێشتا بڵاو نەکراونەتەوە بۆیە وا دەخوازێت باسکردن و کۆڵینەوە لە نووسینەکانی بۆ بۆنەیەکی تر هەڵبگرین، هەر لێرەشدا راست نی‌یە ئەرنولدو لسن و مس بیل و هاو وێنەکانیان لە بیربکەین.

ئامانجیشمان لەم باسە تەنیا پێشکێش کردن یان کۆڵینەوە لە نووسین و بەرهەمی ئەو کوردناسانەیەو بەلای ژیانی خۆیانەوە ناچین مەگەر ئەوەی پەیوەندی بەو نووسینانەوە هەبێت کە سەرچاوەیەکی رەسەنی مێژووی کوردی ئەو ماوەیەن.[3]

نووسینەکانی درایفەر بە بەشێکی تەواوکەری کردەوەی ئەوانی

تر دادەنرێت و شوێنێکی باشی لەنێو ئەوانەدا بۆ خۆی داگیر کردووە، بەتایبەتی لێکۆڵینەوە یان راپۆرتەکەی کە بەناوی (کوردو کوردستان)ە[4] بە تەواوکەرو روون کەرەوەی نووسینەکانی مێجەر نۆئیل و هی تر دادەنرێت. کەوابێ لەم لایەنە شەوە بایەخی لێکۆڵینەوەکەی درایڤەر دەردەکەوێت.

درایڤەر - هەروەکو خۆی دیاری کردووە - یەکێك بووە لە کارگێرو بەرپرسیارەکانی بەریتانیا لە رۆژهەڵاتی ناوەراست و فەلەستین، پاشان لە کۆلیجی ماجدولینی زانکۆی ئۆکسفورد لە دوا ساڵی 1920 دامەزراوە لەوێ چەند باسێکی نووسی وەکو (ئاینی کورد)و (باسێك لە مێژووی کورد)و... تاد یەکەم باسیشی وەکو گوتمان (کوردو کوردستان)ەکەی بە ئینگلیزی لە ساێ 1919دا لە فەلەستین چاپ کراوە، دانەیەك لەم کتێبە کە ئێستا لە موزەخانەی بەریتانیا دایە بە قەڵەم ساڵی 1920ی لەسەر نووسراوە بەڵام لە ناواخنەکەیدا دیارە کە درایڤەر لە هاوینی 1919دا دەستی بە نووسینی کردووە، هەروەها لە لیستەی سەرچاوەکانی کتێبی (عیراق 1900 - 1950)ی لۆنگریگ دا دیارە کە ساڵی 1953 لە لەندەن چاپ کراوە نووسراوە لە ساڵی 1919 دەرچووە، هەروەها کتێبی (کورد ماف)ی رامبۆش کە ساڵی 1948 چاپکراوە، ساڵی 1919ی بە ساڵی دەرچوونی کتێبەکە چەسپاندووە.

**ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکەی (کوردو کوردستان):**

ئەم نامیلکەیە لە پێشەکییەکی بچووك و سێ بەش پێکهاتووە.

**پێشەکی:** ئەویش دوو بەشە:

أ. بەشی یەکەم: ناوی (کوردو کوردستان)ە کەوا چوار پەرتە:

1 - کوردستان و سنوورەکەی

2 - کوردستانی باکوور

3 - کوردستانی باشوور

4 - کورد.

ب - بەشی دووەم: ناوی (عەشیرەتە کوردەکانە)و لەم پەرتانە پێکهاتووە:

1 - کوردی دەوروبەری ئورفە

2 - کوردی عەشیرەتی مللی

3 - کوردی تورعابدین و نسێبین

4 - کوردی کوردستانی باکوور

5 - کوردی ناوچەکانی ئەرزەرۆم و گۆمیوان

6 - کوردی کوردستانی باشوور.

7 - کوردە یەزیدییەکان.

ج - بەشی سێیەم: بە ناوی (جووڵانەوەی کوردایەتی)یە ئەویش دوو پەرتە:

1 - مێژووی جووڵانەوەکە

2 - رەگ و سەرچاوەو هۆیەکانی جووڵانەوەی کوردایەتی.

بەشی دووەمیش پاشکۆیەکی Appendix بەناوی عەشیرەتە کوردەکانی دەرەوەی کوردستانی لەگەڵە ئەویش سێ پەرتە:

1 - عەشیرەتەکانی نێوان ئەرزەرۆم و سیواس و مەرعەش

2 - عەشیرەتەکانی ئەنەدۆل.

3 - عەشیرەتە کوردەکانی سووریە.

**پێشەکییەکە:**

درایڤەر لە پێشکەکییەکەدا ناوی لێکۆڵینەوەکەی بە راپۆرت دەباو دەڵێ سوودی لە ژمارەیەك سەرچاوە وەرگرتووە، لەوانە راپۆرتی کاپتەن وولی و مێجەر نوئیل و لێکۆڵینەوەی سێرمارك سایکس دەربارەی عەشیرەتە کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها پشتی بە کتێب و راپۆرتە رەسمییەکانی بەریتانیا بەستووە کە لە ساڵانی شەردا دەرچوون. خۆی لای وایە شتی تازەتر لەبارەی عەشیرەتەکانەوە زانراوەو هەر لەو دەمەشدا پێی

لێدەنێ کە دەبێ پشت بە باس و لێکۆڵینەوەی زیاتر ببەستێ تا ئەو زانینانە تەواوتر بن.

**بەشی یەکەم: -**

درایڤەر کە باسی وولاتی کوردان دەکا دەڵێ وولاتێکی بەرفراوان و چیایی‌یە، پاشان سنوورەکەی دەست نیشان دەکات و لای وایە زوربەی عەشیرەتە کوردەکان لە چیا دادەنیشن و لەو بروایەدایە عەشیرەتی کورد ژیانی دامەزرءاویو کشتوکاڵی پێخۆشەو پەسندی دەکاتن. بەڵام کە دەڵێ ناوچەی (وان) هەمووی ئەرمەن نشینە بەهەڵە چووە. پاشان باسی دابەشکردنی ناوچە کوردی‌یەکان دەکا لەلایەن بەرێوەبردنەوە لە سەردەمی عوسمانی‌یەکاندا. ئنجا کەمێك بە پولوپۆ تر لە کوردستانی باکوور دەدوێو لای وایە هەرێمی خوارووی کوردستانی باکوور زوربەی زۆری دانیشتوانی تێدایەو بەناوبانگترین عەشیرەتەکانیش لەو بەشە دادەنیشن. کوردەکان لە زۆربەی ئەم ناوچانەدا دامەزراون و بە پیشەسازی بەناوبانگن، مەبەسیشی خەڵکی دیاربەکرو ئورفەو ماردین و وێران شەهرو دەوروبەرەکانیانە. درایڤەر دەڵێ: عەشیرەتی داکشوریو تامێکی بەناوبانگو دامەزراون چونکە لە تەنگانەدا مەسیحیەکانیان دەپاراست.

کوردستانی باشووریش لە خوارووی گۆمی وانەوە تا شاری مەندەلی درێژ دەبێتەوەو ئەم هەرێمە بە لانکی گەلی کوردی نەوەی گەلی کۆنی کوردوینی دادەنرێت، هەندێ لە شارەکانیشی ئەمانەن: جزیر، زاخۆ، ئالتون کۆپری، ئەربیل، کەرکوك، رەواندز، سلێمانی، کۆیە. دەڵێ کوردەکانی کەرکوك بە زار زمانی موکری قسە دەکەن. لەلایەکی تریشەوە لەو بروایەدایە کە ئەو زمانە کوردی‌یەی پێی دەڵێن کرمانجی زار زمانێکی فارسی‌یە، هەروەها دەڵێ راپۆرت و نووسینەکانی خەڵکی بیانی رەووشتی کورد بەچاك دەزانن و جوتیاری کورد رەنجبەرێکی چاکەو گەلێ خاوەن پیشەو ئاسنگەری کارامەیان تێدایە، کوردەکان میوان پەروەرن و بەرچاو بەر دڵ فراوان و شەرکەری لێهاتوون، حکومەتی عوسمانی توانیویە لەو هەموو رەووشتە پەسندانە کەڵك وەربگرێت.

درایڤەر دەڵێ لە قۆناغی دوای ساڵی 1866دا کوردەکان چ جوتیارو چ شار نشینەکانیان لە عیراقدا ناویان دەرکردو پلەی کاریگەریان هەڵکشاو چەند پیاوێکی پایە بەرزیان لێهەڵکەوت، لەو بروایەشدایە کە لوری ئێران لکێکی گەلی کوردە.

کەدێتە سەرباسی سەرۆکە کوردەکان ناوی جەنرال شەریف پاشای بەناوبانگ دەبات و دەڵێ ئێستا (ساڵی 1919) وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانی‌یە. بێگومان ئەمەش راست نی‌یە، بەڵکو شەریف پاشا کە سەفیر بوو لە سوێد، لە ئەورووپا نیشتەجێ بوو بوو، سەرۆکی وەفدی کوردیش بوو بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس لەو ساڵەدا، دیارە ئەو جۆرە هەڵە بچووکانە شتێکی ناسروشتی نی‌یە بەتایبەتی کە درایڤەر بە ماوەیەکی کورت دوای شەرەکە لێکۆڵینەوەکەی خۆی نووسیوە.

پاشان باسی ناودارێکی دیکەی کورد دەکات کە ناوی زەکی پاشای بە (حەلەبی) ناسراوەو ببوو بە سەرۆکی ئەرکانی سوپاو وەزیری ناوخۆ، لە دواییدا بووە یاوەری قەیسەری ئەلمانیا.

**جووڵانەوەی کوردایەتی: -**

درایڤەر دەنووسێ: جووڵانەوەی نیشتمانی‌ی کوردی لەلایەن ئورەییا بەگ (ئەحمەد ئورەییا)ی بەدرخانی‌یەوە لە ساڵی 1908 (ساڵی شۆرشی دەستووری لە تورکیا) سەری هەڵدا. لە ساڵانی شەرەکەدا جووڵانەوەکە کەمێ کز بوو، بەشێکیش لە کورد لەگەڵ حکوومەتی عوسمانیدا هاوکاریان کردو هەندێکیشیان دژی ئەرمەنەکان وەستان. لەلایەکی تریشەوە دەڵێ زوربەی کوردەکان لە راستیدا دژی حکومەتی عوسمانی

وەستان بەتايبەتی لە پێنج ساڵی دواییدا (1914 ـ 1918) لەم بوارەدا بە تايبەتی باسی سەرۆکەکانی عەشیرەتی بازیکی کورد دەکات.

لە کوردستـــانی باشـــووردا سێ هـــۆ هەبـــو بۆ بەهێـزبـوونی جوولانـەوەی رزگـاریخـوازی کوردی، درایفـەر لە پەراوێزی ئەم شوێنەدا دەڵێ: کاتێك کە قونسولی ئینگلیز لە تەبریز لە ناوچەی سابلاغ (مـەهـابـاد) دەگەڕا سەرۆکێکی کوردی موکری ئاوات و بیـــرو لێکـدانـەوەی کوردە سەربـەستـەکـانی پێ راگـەیـانـدووەو کوتـوویـەتی کەوا کوردستـانی سەربـەست چاکتـرین رێگـەیە بۆ چارەســەرکـردنی مەسـەلـەی ئەرمـەن بە ئاشتییـانـەو بە یاریی حکوومەتی بەریتانیا.

لەبابەت ئەو هۆیانەش کە کاریان کردوەتە سەر بەهێزبوونی جوولانـــەوەی کوردایـــەتی لە کوردستـــانی باشـــووردا، درایفـــەر دەنـووسی: هۆی یەکـەم بێـزاریی کوردەکـان بوو لە سیاسەتی زۆردارانـەی عوسمـانییـەکان، هۆی دووەم کردەوە ناشیرینەکانی سەربازانی رووس و سێیەمیش هەڵویستی بەریتانیەکان بوو کە کورد دەیان ویست سوود لە هەڵوێستیان وەربگرن.

درایفـەر هەنـدێ نمـوونەی کردەوەی کاربەدەستانی عوسمانی باس دەکات و دەگێرێتەوە پیاوێك بەناوی مستەفا پاشای باجەلان کەســەرداری کوردە باجـــەلانـی یـــەکـــان بوو لە سـالـی 1912 بەگومانی ئەوە لایەنگری ئینگلیزە ماوەیەك گیرا، هەروەها دەڵێ لە ساڵی 1914دا جەنرال شەریف پاشا رایگەیاند ئەگەر شەڕ قەومـا ئامـادەیە یاریی سوپـای ئینگلیـز بکات، بەڵام گوێ بە پێشنیازەکەی نەدرا چونکە وا چاوەڕوان نەدەکرا شەڕ کوردستان بگـرێتـەوە. ئەم جۆرە هەڵـوێستـانـە روونی دەکەنەوە کە هەندێ کوردی سەربــەست لەتـاو هەڵـوێستی بەدی عوسمـانییـەکـان پشتگیریی ئەو جۆرە رایەیان دەکرد.

لەجێیـەکی دی بەبـۆنـەی ناوهێنانی شێخ مەحموودەوە دەڵێ بەداخـەوە ئەوان ـ واتـا ئینگلیـز ـ نەیانتوانی هەتاسەر دۆستایەتی لەگـەڵ دۆستـە تازەکـانیـان واتـا شێـخ مەحمـوودو لایـەنگـرانی بپارێزن، لەوانەیە درایڤەر لەناو ئەو ئینگلیزانەدا تەنیا کەس بێ کە بەم وێنەیە لەم بابەتەوە رای خۆی دەرببڕێت. پاشان دەڵێ، لە تشـرینی دووەمی 1918دا مێجـور نۆئێـل نێردرایە سلێمانی، ئەویش یەکســـەر شێـخ مەحمـوودی بە حوکمـدار دامـەزرانـد، حاکمی مەدەنییش لە یەکی کانوونی یەکەمدا بە فرۆکە چوو بۆ سلێمانی و لەوێ کۆنگرەیەکی بەست 60 سەرۆکی کوردی تێدا کۆکردەوەو باری سیاسیی تازەی لە مەدوای تێگەیاندن.

لێـــرەدا دەرکـــەوت کە هەستـــی نیشتمـــانپـــەروەری قووڵ و رەگ داکوتاوەو پاش وتووێژێکی دوورو درێژ رێککەوتن لەگەڵیان پێك هات.

درایفـەر دەست نیشـانی بانگـاشـەی فەرەنساییەکان دەکات و پاشان دەنووسێ:

پاش شەڕی گەورە جوولانـــەوەی نیشتمـــانی لە کوردستـانی باشوور سەرلەنوێ گڕی سەندەوە.

لێـرەشـدا پێـویـستە رواڵەتێکی دەگمەن باس بکەین، ئەوەبوو هەنـدێ لە کاربـەدەستـە ناوەدارە عوسمـانییەکان لە جوولانەوەی کوردایـەتیدا بەشـدارییـان دەکـرد، وەکـو عەلی ئیحسـان پاشاو هەنـدێ سەرکـردەی حیـزبی (یـەکێتیو سەرکەوتن)، ئەم عەلی ئیحسان پاشایە سەر لەشکری سوپای عوسمانی بوو لە ویلایەتی مووســـڵ لە کوردستـــانی باشـــووردا لە رۆژانی دوایی شەڕی جیهانیدا. بەقسەی درایفەر عەلی ئیحسان پاشاو کاربەدەستانی تورکـــی شاری خەرپـــووت لە کانـــوونـــی دووەمـــی 1919دا کوردەکانیان هان دەدا تا لە کۆنگرەی ئاشتیی کە لەو رۆژانەدا لە پاریس دەبەسترا داوای مافی رزگاریی خۆیان بکەن. عەلی ئیحسان سەری لە سەرۆکە کوردەکان دەداو بۆ ئەم داخوازییانە گفتـوگـۆی لەگـەڵ دەکـرد و لە دژی بێگـانـانی دەورووژاندن، هەروەها چەك و تفاقیشی دەدانێ. نووسەر دەڵێ ئەم سەرکردە عوسمـــانیـیـــە تەنـــانـــەت پێش شەڕیش پەیـوەنـدی بەو گەورە کوردانـەوە هەبـوو وبـەیـەکێـك لە بەرپـرسیـارانی قەسـابخانەی ئەرمـــەنیـیـــەکـــان دەژمێـردرێ. ئەوەبـوو لە دوا دوای کانـوونی

دووەمدا نیشانەی ڕاپەرین و جووڵانەوە لەناو کوردەکانی دیاربەکر دیاری دا ئەمەش هەر بە هۆی چالاکی‌یە گەرموگوڕەکانی عەلی ئیحسانەوە بوو کە تەنییەوە ئەم هەرێمەش.

درایڤـەر لەسـەر قسـە دەڕوات و دەڵێ: ئەگـەرچی عەلی ئیحسـان لەسەرەوە لەپێنـاوی سەربـەخـۆیی کوردستان دا کاری دەکـرد بەڵام لە ژێـرەوە مەبـەستی جێ پێ لـەق کردن بوو بە دەسەلاتی دەوڵەتانی هاوپەیمان لەوێدا.

کەوا هیـوای ئەوەی دەکـرد نەیـەڵێ ئەو دەوڵـەتـانە کوردستان داگیر بکەن، بەشکو لەم ڕێگەیەوە بەزەبری هێز بتوانێ وولاتەکە بخاتەوە سەر دەوڵەتی عوسمانی.

هەر لەو مانگی کانوونەدا، سێر مارك سایكس دوو نوێنەری نارده ناوچـە کوردییـەکـانی مدیـات و توور عابـدین بۆ ئەوەی

هەر لەو مانگی کانوونەدا، سێر مارك سایكس دوو نوێنەری نارده ناوچـە کوردییـەکـانی مدیـات و توور عابـدین بۆ ئەوەی وێبکـەوێ ودڵینـا بێت ئایـا کوردەکـان یاریی ئینگلیز دەکەن و تاچەند دەتوانن دوور لە عەلی ئیحسان و دوور لە ئامانجەکانی بووەستـن. لەم ڕووەشـەوە دوو سەرۆکی کورد کە عەلی باطی مزیـری‌و ڕەشیـد مدیـاتین لایـەنگیـریی خۆیـان پێشان داو ڕایان گەیـانـد کە دەتـوانن 5000 چەکـدار بۆ ڕۆژی مەیـدان ئامـادە بکـەن و ملیـان بۆ قایمقـامی مدیـات کەچ نەکـردو سکالانامەی سەربـەخـۆیی کوردستـانیان مۆر نەکرد. بەڵام درایڤەر سەرباری ئەمـە دەڵێ: هەڵـوێستی عەشیـرەتـەکـانی دراوسێ‌ی ئەم دووانە تەواو بە پێچەوانەوەبوو ئەمەش چونکە عەلی ئیحسان پەیوەندیی تونـدوتـۆڵی پێـوە کردبـوون. پاش بیستنی ئەم هەواڵـە سێر مارك سایكس ئامۆژگاری ئەم دووانەو عەبدولعەزیزو ملكی ئاغای کرد کە بەهیچ جۆرێك توخنی عەلی ئیحسان نەکەون و ئاگایان لە دیانەکان بێت. ئەمانیش هەموو بە قسەیان کرد.

درایڤـەر هەروەهـا دەڵێ: حیـزبێکی نوێ پەیـدابوو دروشمی (سـەربـەخـۆیی کوردو تورك)ی هەڵگرتبـوو بەو ئامـانجە ئەگەر کورەکان نەچوونە ژێر باڵی ئیمپراتورییەتی تورك کارێکی وابکەن نەهێڵن وولاتەکەیان بچێتە ژێر دەسەلاتی بێگانەوە.

لە دیـاربـەکـریش کوردێکی (عـەلی بەگ) ناو هەوڵی دا بە پرس وڕای عوسمـانییـەکـان ڕۆژنـامـەیـەك دەربکـات کە ببێتـە ئۆرگانی ئەو حیزبە نوێیە.

پاش ئەمـە، سەرەك عەشیـرەتی کوردی کتکـان بـسراوی کە لەگـەڵ کوردەکـانی شێخـان هاوسـوێند بوو لەبەر ئەو مەترسی‌یە نوێیـە پەنـای بردە بەر ئینگلیـزەکـان، بەڵام سەرۆکـەکـانی تر هەڵوێستیان بەجۆرێکی دی بوو. بسراوی ناوی مستەفای کوڕی شاهێن بەگ و بۆزان کوڕی نەحـوی‌و حاجی ئەحمـەدو غالیب بەگ و کوڕەکانی دەهێنێ کەوا دووبەرەکی دەنێنەوەو ئاژاوەو هەرا بەرپـا دەکـەن و لایـەنگیـری بەهێزی دەوڵەتی عوسمانین. پاش چەنـد حەفتـەیـەك جووڵانـەوە تازەکـە پەلی هاویشت و هەنـدێ سەرۆکـی تریـشـی گرتــەوە، تەنـانـەت عەلی باتیش هەر ئەو داخوازیانەی دەگوتەوەو ئەو هەڵوێستەی پێشان دەدا. بەڵام هەر لەو دەمـەشـدا کوردەکـانی ناوچـەی سعـرت لە خوارووی گۆمی (وان) ڕاست بوونەوەو پەلاماری حکوومەتیان داو دوو ڕەشاشیان داگیـر کرد. بەم جۆرە هەنـدێ هۆز بەجـەرگـانـە لە ڕووی حکوومەتی عوسمانی هەڵگەڕانەوە

دەبێ ئەوەش بزانین کە درایڤەر زۆر وورد نی‌یە لە دیارکردنی ناوی شوێن و کەسـانـدا هۆیـەکـەشی ئەوەیـە ئەو وەختـەی ئەو دەستی بە نووسین کرد بوو زۆر لە مێـژ نەبـوو شەڕی جیهـانی دوایی هاتبـوو وبـاری کۆمـەڵ و سیـاسی زۆر گۆڕابـووو هەمـوو شتێك وهەموو هەڵوێستێك باش ڕوون نەبوبۆوە خەڵکەکە بێزار بوون و دادیان بوو لە دەست حکوومەتی تورك هەروەکو درایڤەر دەڵێ، لەلایـەکی دیکـەشـەوە خەڵکـەکـە لە دژی هەمـوو دەستـدرێـژی‌یەکی داگیرکەرانی بێگانە دەوەستان. درایڤەر دەڵێ جگە لەوە کە هەموو گەلان بۆ مافەڕەواکانی خۆیان تێدەکۆشان، بەڵام هۆیـەکـی تر پاڵی بە کوردەکـانـەوە دەنـا کە هەوڵـی نیشتـمـانپـەروەری بدەن و گری نەتـەوەیـەتی لە دڵیـانـدا هەڵـدەگیـرسـانـد ئەویش ئەو دەنگو دۆرە بوو کە گوایا دەوڵەتانی

هاوپەیمان دەیانەوێ دەوڵەتێکی یەکگرتوو بۆ ئەرمەنەکان دابمەزرێنن کەوا بەشێکی زۆر لە کوردو وولاتی کورد دەگرێتەوە بەم جۆرە زۆربەی زۆری کوردان رایان وەهابوو مافی رەوای ئاشکرای خۆیان دەست بخەن و ئەوانیش وەکو گەلانی تر داوای دامەزراندن و پشتگیریی دەوڵەتێکی کوردی بکەن، هەستیان دەکرد کە مایەی کوێرەوەریی داخێکی گەورەیە ئەگەر لەناو گەلانی دانیادا هەر ئەوان بێ بەش بمێننەوەو خەباتی دوورو درێژی ساڵانیان بەبا بچێت.

دەربارەی ئەو کەسانەش کە لە کۆڕی خەباتی کوردایەتیدا کاریان دەکرد درایفەر نەیتوانیوە شتێکی زۆرمان پێشکێش بکات، بەڵام بەڵگەنامەکانی تری بەریتانیا باسی هەندێکیانیان کردووە، ئەوەتا لە دایەرەی گشتی تۆمارەکانی بەشی وەزارەتی دەرەوەدا بەڵگەنامەیەك هەیە کاپتەن میلز نووسیویەتی کە ئەفسەرێکی سیاسی بووە. باسی چەند سەرۆکێکی کورد دەکات کە بابەخیان بە کاروباری گشتی داوەو لە کۆڕی کوردایەتیدا چالاکییان نواندووە، جگە لەمانەش باسی عەلی باتیی رەشید مدیاتیی عەبدولرەحمان شەرناخیی هی تر دەکات، سەرباری هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵەی کۆنی (یەکێتیی پێشکەوتن). [٦]

لە دیاربەکر یانەی کوردان کرایەوەو دەستی بەکارکرد، سەرۆکەکانی یانەش ئەمانە بوون: شەربەتچی شەمدین ئۆغلو عەبدولرحمان و صەلاح بەگ ئەلسەیید... ئەمانە پەخشنامەو چاپەمەنییان لە شەقامەکاندا بڵاو دەکردەوەو داوایان لە هەموو کوردان دەکرد کە ببنە ئەندامی یانەکە.

لە ماردینیش یانەی کوردان لەلایەن حەوت سەرداری بەناوبانگ هەڵدەسوورا لەوانە: عەبدولرەزاق شاهتانە وعەبدولقادر پاشاو شاکر بەگی کوڕیی نەجیب ئەفەندیی شەوکەت ئەفەندیی شێخی شاهتانەو قادر چەلەبی شاهتانە.. ئەمانە یادداشتێکیان نووسی کوردو تورك و مەسیحیەکان مۆریان کرد. داوای سەربەخۆیی خۆیی (ذاتی) کوردستانیان تێدا کردبوو. بەڵام زۆر کەسیش، وەکو درایفەر دەڵێ مۆریان نەکرد یەکێك لەمان مار ئەلیاسی پەتریرکی کڵێسەی سریان بوو.

لە 19ی مارتی 1919دا یوسف حەیدەرو خێرەددین زەرگەلی (نووسەری ناسراو) دوو رۆژنامەنووس بوون لە رۆژنامەی (المفید) کە لە دیمەشق دەردەچوو کاریان دەکرد ووتارێکی درێژیان لەبابەت سەربەخۆیی کوردستانەوە نووسیی دانەیەکی زۆری ئەم ژمارەیە لە شەقامەکانی شاری حەلەبدا بڵاو کرایەوە.

لەم بابەتەوە درایفەر دەڵێ ناونیشانی ووتارەکە «نامەیەکی کراوە بۆ کوردەکانی کوردستانی باکوورو باشوور»بوو دوو نووسەرەکە گلەیی لە برا کوردەکانیان دەکەن چونکە هەڵویستێکی دوورەپەرێز بەرامبەر بە سیاسەت دەوەستن و داوا لە کوردان دەکەن کە چاو لە برا عەرەبەکانیان بکەن کە توانیویانە سەربەخۆیی خۆیی بۆ وولاتی خۆیان بەدەست بهێنن، بۆیە داوا دەکەن لە پێناوی کوردستانێکی سەربەست دا خەبات بکەن کە بەلای ئەوانەوە بریتییە لە ولایەتی ئەرزەروم، وان و بتلیس و خەرپووت و دیاربەکرو شارانی تر.

عەلی باتیی سەرۆکی کوردەکانی عەشیرەتی هاڤیرکا لە دوایی مانگی مارتدا کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکان کردو لە ناوچەی مەلاتیەش دا کوردەکان یەکگرتوو بوون (لە بارەی ئەو ناوچەیەوە بروانە یادداشتە رۆژانەکەکانی میجۆر نوئیل)، کە خەلیل بەگی (بەدرخانی)ی موتەصەریف، هەروەکو درایفەر دەڵێ پشتگیرییەکی تەواوی خەباتی ئەوێی دەکرد لە پێناوی کوردستانی سەربەخۆدا.

هەروەها درایفەر دەنووسێ: سەرۆکە کوردەکانیش لە سنووری ئێران لە شوباتی 1919دا بۆ رێکخستنی راپەڕین لە دژی کاربەدەستانی ئێران کۆڕێکیان بەست و وادیارە زۆربەی بەشدارانی کۆڕەکە دەنگیان لەگەڵ راپەڕینەکە دابوو ناوچەکانی راپەڕینە کوردییەکەش گۆمی وان و هەرێمی ئەذربێجانی ئێران بوو.

لە ناوچەی سیلوان، صادق بەگی سەرۆکی کوردەکانی جزرو

بۆ رزگارکردنی کوردستان لە رووی عوسمانی‌یەکان راپەری. هەرچی عەشیرەتەکانی ناوچەی هەکاری‌یە هەر لەسەرەتاوە سەربەخۆ مانەوە.

پاش ئەوەی حکوومەت عەلی ئیحسان پاشای لە شوباتی 1919دا گوێزایەوە، شەوقی بەگ و صیدقی بەگ و حاجی بەگی لە شوێن ئەو دانا. لەلایەکی تریشەوە نا کۆکی نێوان عەشیرەتەکان هەروەکو درایڤەر دەڵێ، کۆسپێ بوو لە رێی یەکیەتی‌ی خەباتی نیشتمانی‌دا.

پاش ئەوە دەنووسێ: سەرۆکەکانی شاری سیڤرك سەردانی کاربەدەستانی دیاربەکریان کردو بریاریان دا چەند پەلێکی چەکدار لە تورك و عەشیرەتە کوردەکان پێکەوە بنێن بۆ بەربەرەکانێ‌ی بیانی‌یەکان لە سیڤرك و دیاربەکرو ئورفە. مەحموود بەگی سەرۆکی عەشیرەتی مللی‌و عەبدولقادر دیرایی[8]

سەرۆکی عەشیرەتی کوردەکانی قەرە کیچ لە بەندیخانە بەردران و حکوومەتی تورك بەڵێنی دا کە مەحموود بەسەرۆکی عەشیرەتی مللی کە گەورەترین عەشیرەتە دابنێ، ئەویش لەگەڵ هەندێ سەرۆك و لەگەڵ عەشیرەتی (جحیش)ی عەرەب رێك کەوت کە پەلاماری بێگانەکان بدەن.

لە 12ی مارتی 1919دا سەرۆك بسراوی‌و چەند کەسێکی کەم لە هەڤالانی سەری لە سەر کردەکانی سوپای ئینگلیز دا.[9]

هەر لەو کاتەشدا جەودەت بەگ (لەوانەیە دکتور عەبدوڵلا جەودەت بێ) وعەبدولقادر پاشا (شەمدینانی) سەرۆکی (کۆمیتەی) سەربەخۆیی کوردستان نوینەرانی خۆیان ناردە ناو عەشیرەتە کوردەکان بۆ هاندانیان و شەرکردن لە دژی بیانی‌یەکان. بەڵام چەند سەرۆکێکی زۆرکەم رایان لەگەڵ دان لەوانە خەلیل جازال کە لە عەمباری‌داغ بەرەو باشووری ماردین دادەنیشت، هەروەها سەرۆکەکانی کوردی غوررزو حسین باکاروی ماسیرتا، لە هەمووشیان بەهێزتر خەلیل جازال بوو کە نزیکەی 5000 چەکداری دەبوو.

لە 1919دا هەواڵ واهات کە هەوڵ درا یانەیەکی کوردان لە شاری ئورفە بکرێتەوە، بەڵام ئەم هەواڵە نەهاتەدی، تاقانە هۆی ئەمەش ئەوەبوو کە هەڵوێستی سەرۆکەکانی ئەم شارە هێشتا یەك لایی نەبووبوو. لەلایەکی دیکەشەوە هێزەکانی عوسمانی لەگەڵ هێزەکانی عەشیرەتی مللی رێك کەوتن و سێ تۆپی مەیدانیان بە مەحموود بەگ دا.

هەروەکو لەمەوپێش گوتمان و دەبێ بیڵێین درایڤەر سوودی زۆر لە نووسین و یادداشتە رۆژانەکانی مێجەر نۆئیل وەرگرتوە بەنموونە درایڤەر چەندوچونی باری سیاسی شاری دیاربەکر لە مایسی ئەو ساڵەدا بەم جۆرەی خوارەوە لە یادداشتەکانی نۆئیل وەردەگرێت:

«بۆ ئەوەی شتێکی راست دەربارەی یانەی کوردان بڵێین، پێویستە دانی پێدابنێین کە ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی ئەو یانەیە بۆ بەختیاری‌و بەرژەوەندی کوردستان کاردەکەن، بەرای من چاکترین ئەندامەکان بریتین لە:

کامیل بەگ خەیالی زادەو شەوکەوت کوری ئیسماعیل زازاو ئیحسان بەگ و دکتۆر فوئاد بەگ (لە ئەنجامی بەشداربوونی لە شۆرشەکەی شێخ سەعیدی پیران لە ساڵی 1925دا لە سێدارە درا) وئەکرەم بەگ. سەرەتا یانەکە لە ژێردەستی حکوومەتی تورك دا بوو بەڵام پاشان زیاتر سەربەخۆ بوو تا ئەو رادەیەی حکوومەتی عوسمانی دایخست و سەرۆکەکانیشی لە 4ی حوزەیراندا لە بەندیخانە نا».

درایڤەر دەربارەی ئەو بەندوباوەی داکەوتبوو سەبارەت بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمەنی دەڵێ: ئەگەر جارێکی دی کوردستان بکەوێتەوە ژێر دەستەڵاتی عوسمانی‌یەکان ئەوا هەلی چارەسەرکردنی مەسەلەی ئەرمەنەکان بەشێوەیەکی ئاشتیانە لە دەست دەچێ. هەر لەبەر ئەوەش بوو مێجەر نوئیل (لەلایەن حکوومەتی بەریتانیاوە) مەرەخەس کرابوو بەناوی حکوومەتەوە جاری لێبووردنی هەموو ئەوانە بدات کە لە قەسابخانە (جێ‌ی داخە)کەی ئەرمەنییان دا بەشدارییان کردبوو. واتا لێبووردنی

گشتی بریاردا.

مێجەر نوئیل لە یادداشتە رۆژانەکەی مانگی مارت تا نیسانی 1919دا روونی کردوەتەوە لەو بڕوایە دایە مەسەلەی نەتەوەیی پێشەنگی هەموو ئاوات و داخوازییانە، بەردەوام ئەو هەستو هۆشە رەوایە پەرە دەستێنێ. وەنەبێ کوردیش حەز بە هەراو ئاژاوە بکات بەهیچ جۆریك، ئەگەر مافە رەواکانیان بەهەند بگیرێت.

هەر لەو لێکۆڵینەوەیەی درایڤەردا گەلێ زانیاری دەربارەی ژین و گوزەرانی عەشیرەتەکان و گەلی کورد دەخوێنینەوە، بەشێکیشیان تا زەن، واتا گرنگن، لەم ڕووەوە لێکۆڵینەوەکە لەچاو مێژووی ئەو ماوەیە دا بە سەرچاوەیەکی یەکەمین و رەسەن دادەنرێت، ئەوەتا دەبینین ناوی عەشیرەتەکان و هەواریان و سەرۆکەکانیانی باس کردووەو نەخشەیەکیشی لە پاشکۆدا داناوە، لێرەو لەوێش هەندێ ژمارەی نووسیوە وەکو ئەوە کە دانیشتوانی شاری ماردینی بەنزیکەی 40000 کەس داناوە وسێ عەشیرەتی کوردی ناسراوی تێدا نیشتەجێیە کە ئەمانەن میشکی، داشیو میدلیکانی. لایوایە دیاربەکر بەناوبانگ ترین شاری باکوورەو50000 کەسی تێدا دەنیشێو کوردەکانی شاری نسێبین بە نزیکەی 6500 خێزان. دادەنێو ئەو عەشایەرەی لەم شارەدا دادەنیشن ئەمانەن: داکشوریو تامیکیی کورد و (طەی)ی عەرەب. درایڤەر دەنووسێ، یانەی کوردانی دیاربەکر، یەکەم هەل لە دژی دەسەلاتی ئینگلیز لەناوچەکەدا کەوتە جموجووڵ و بەڕێوەبەرەکانی لە 21ی مارتی 1919دا بەم مانایەوە بەیاننامەیان بلاو کردەوەو لەگەڵ سەرۆکە کوردەکان و غەیرەکورد کۆ بوونەوە، لەوانە حاجی ئەحمەدی سەرۆك عەشیرەتی سەرکوجیو سەردیم پاشای سەرۆکی کوردانی حازۆ ومفتیی شیفرك و دوو گەورەی دیریك، بەیەکەوە مشووری پارێزگاری ماردین و دیاربەکریان لە هێرشی بەریتانیەکان ڕێك خست. هەر لەوکاتەشدا نەجمەدین کوڕی ئەمین ئەفەندیو شەوکەت بەگیان ناردە مدیات بۆ هاندانی خەڵکەکەی. . شایانی باسە قەشەی سریانە کاتولیکەکانیش یەکێك بوو لە دوژمنانی دەستەلاتی بەریتانیا.

لە 25ی مارتدا لیژنەی نەتەوەیی کورد لە ئەستانبول بەرێگەی مووسڵەوە نوێنەرانی خۆی نارده سلێمانی. نامەی تایبەتیان بۆ کوردی ناوچەکە پێبوو تا لە پێناوی سەربەستیی وولاتەکەیاندا کار بکەن، سەرۆکی نوێنەرەکان دەوڵەمەندێکی رواندزیی تەمەن 45 ساڵی بوو ناوی خلوصی بەگ و پەیوەندی بە بنەماڵەی بەدرخانییەوە هەبوو. جاران کابرایەکی خاوەن دەسەلات بووو بەو ئامانجە تێکەڵ بە جوولانەوەی کوردی بو بوو بەڵکو لەو ڕێگەیەوە دەسەلاتی جارانی بگێرێتەوە کە حیزبی (یەکێتیو پێشکەوتن) لێی زەوت کردبوو.

یەکێك لە ئەنجامەکانی ئەو هەراو ئاژاوانە کوشتنی کاپتەن پیرسن بوو بەدەستی عەشیرەتی گۆیان لە 4 نیساندا لە نێوان بیلوو میرگیدا، کەوا بەقسەی عەبدولرەحمان (شەرناخی) داردەستی ئەحمەد حیلمی ئەفەندی کوڕی حاجی محەممەدی خلوارزیی مفتیی جزیرەی ئیبن عومەر کوژرا. . . دەنگ وابوو ئەو عەبدولرەحمانە لەگەڵ سەرۆکی کوردەکانی صالحان رەمەزان و کەسانی دی لە دژی بیانییان کۆمەڵیان بەستبووو لە ئەزیخ دا چەك و تفاقیان کۆ کربووەوە.

لەبەری ئیرانەوە هەواڵ واگەیشت کە کوردەکانی ئەوێ لە ڕووی حکوومەتی بێهێز راپەریون و حاکمی شاری سەلماسی نزیك گۆمی ورمێیان گرتووو (خوێ)یان گەمارۆ داوە، بەلام دەنگوباسەکانی جێگری قونسولی ئیسپانی لە سەلماس جۆراو جۆر بوو، کە گوتویەتی هۆی بنەرەتی هەراکە دەگەرێتەوە بۆ ناردنی بۆمبایەك بۆ ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ)و تەقینەوەیو لە ئەنجامدا کوژرانی چەند کەسێك لە پیاوەکانی. قونسوڵەکە گرتوویەتی ئیسماعیل ئاغا لە ڕاستیدا دۆستی مەسیحیەکان بووو حەزی دەکرد بگەڕێنەوە هەواری خۆیان، ئنجا درایڤەر دەڵێ دەگوترا ئیسماعیل ئاغا سمکۆ لە (نەهری) دادەنیشیو سەرۆکی کوردەکانی شوکاکە، کوردەکانی گەردیو برادۆستیش دان

بەسەرۆکایەتی دادەنێن، بەلام رەنگبێ ئێستا لێی جیابووبنەوە. سمکۆ لەگەڵ عەبدولقادر (شەمدینانی) ناکۆك بوو. هەردوو بنەماڵەش خۆیان لە رووسیا نزیك دەکردەوە، پاش رووخانی رووسیا روویان کردە تورکیا، پاش رووخانی تورکیاش هەوڵیان دەدا لەسەر حیسابی ئەو ئاواتی خۆیان بهێنتە دێ.[10]

درایڤەر لەبابەت پیاوانی جوولانەوەی کوردییەوە دەنووسێ بەم شێوەیە زەحمەت دەبێ بیرو باورو نیازی بەرزی ئەوانەی لە ئەستانبوڵ داوای تێکۆشان دەکەن لە پێناوی جوولانەوەی کوردیدا پێوانە بکرێت، هەروەها ئەوانەش کە لە کوردستاندا ئەو جۆرە کارەیان لە ئەستۆ گرتووە، تەنیا ژمارەیەکی کەمیان لە (تاقیکردنەوە) یەکی ووردی لەم بابەتە دەردەچن، چونکە زوربەیان بەدوا بەرژەوەندی خۆیان کەوتوون.

ئەگەر وامان دانا، درایڤەر دەڵێ، کۆنگرەی ئاشتی دانی بەسەربەخۆیی کوردستان دا نا، هەڵبژاردنی حوکمران پێویستی بەچارە سەرکردن دەبێت. لە لایەکی ترەوە درایڤەر سەردارو سەرۆکە کوردەکان ئەوانەی بەکەڵکی ئەوەبێن بۆ حوکمرانی یەکەم ناودێر بکرێن باس دەکات و لە نێوان ئەواندا مەحموودی سەرۆکی عەشیرەتی مللی بەدڵەو لای وایە مەحموود ئینتیدابی بەریتانیای پێخۆش دەبێت.[11] هەروەها دەڵێ چاودێریکەران گشت لەسەر ئەو رایەن کە رەگەزی هاندان لە جوولانەوەی کوردیدا سەرچاوەکەی لە ئەستانبوڵە. ئەوەی ئاشکراشە سەرکردەکانی ئەم جوولانەوەیە بریتین لە عەبدولقادرو سەید تەهای زاوای و دکتۆر عەبدوڵلا جەودەت و سلێمان نەظیف و کوڕانی بەدرخان. ئورەیا بەگیش یەکێکە لەو بەدرخانییانەی لە میصر دادەنیشن و لایەنگرێکی توندی بەریتانیایە. ئەو حیزبە نەتەوەیی یە راستەقینەش کە لە ئەستانبوڵ کار دەکات لایەنگری بەریتانیایە نەك تورکەکان. لەلایەکی تریشەوە حیزبی کوردی - تورکی بەگشتی ئەندامانی (یەکێتی و پێش کەوتن) دەینوێنن.

بەم شێوەیە لێکۆڵینەوەکەی درایڤەر پڕە لە شیکردنەوەو زانینی گرنگ و نوێ و بەتام و دڵراکێش، لە ئەنجامدا وای دەبینێ سەرەرای لێنەهاتوویی زوربەی سەرکردە کوردەکانی جوولانەوەی کوردایەتی بەلام هیواش هەیە کە بیروباوەڕی بەرزو پاك پاڵیان پێوە دەنێ کار بکەن، جا شتێکی سروشتی یە ئەم بەشە لایان وابێ ئەگەر کورد حوکمێکی خۆیی (ذاتی) دەست بکەوێ، مەرجێکی سەرەتایە بۆ بەردەوام بوونی قەوارەی نەتەوەیی و سیاسی ی گەلی کورد. بەلام لەلایەکی ترەوە گومان لە توانای کورد دەکات بۆ وەرگرتنی ئەسپابەکانی شارستانەتی بەیەك جار کەوا گەلانی ئەورووپا بەچەند سەدەیەك پێی گەیشتوون لەبەر ئەوە لای وایە دەبێ دەولەتێك لە دەولەتە گەورەکان بە ئینتیداب کاروباری وولاتی کورد هەڵسوورێنێ.[12]

لێکۆڵینەوەکەی درایڤەر بەشێکی تری بەناوی (زیادکردن و راستکردنەوە) یەو دەڵێ ئەو چەند برگانەی خوارەوە دەربارەی عەشیرەتە کوردو ئەرمەنە تێکەلاوەکانە جەنابی مەگردیچیانی قەشەی ئەرمەنی نووسیویەتی کە لە ساڵی 1896 ەوە لە قونسوڵخانەکانی بەریتانیادا کاری دەکردو لە ساڵی 1904دا بووە جێگری قونسوڵی ئینگلیزی لە دیاربەکر.[13]

لە دواییدا، لە راستی دوور ناکەوینەوە ئەگەر بڵێین یەکێك لە مەرجەکانی کوردناس ئەوەیە بەلای کەمەوە بابەتێکی نووسیبێ کە ناونیشانی کوردی پێوە بێت، یان بابەتێکی بۆ کاروبارێکی کوردەواری تەرخان کردبێت و لە چەند رێکەوت و بۆنەیەکدا بەنووسین یان بە ئاخاوتن یان لە کۆڕی تومارکراودا باسی ئەو باس و بابەتانەی کردبێ، بێگومان ئەمانەش لەو ماوە کورتەی دوای شەڕی یەکەمی جیهاندا ئەوەی دەست نیشانمان کرد کەمن، بەلام لەپاشانا ژمارەیان رووی لە زیادی کرد.

**(ع. بیمار کردوویە بەکوردی)**

پەراوێز:

* نووسەر ووشەی کوردلۆغ و مستکردی عەرەبی بەکارهێناوە، من کوردناسم پێ باش بوو بەڵکو لە هەر دوو زاراوە ئینگلیزیو عەرەبی‌یەکەشم لا پەسندتردیت. (بیمار).

(1) بۆ زێدە روون کردنەوەو بەربلاویی بابەتی کوردناسی واچاکە باسە بەکەڵکەکەی د. جمال نەبەز بخوێنەوە کە بەناوی (کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەلمانیادا) بەکوردی لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ 1974 چاپ کراوە.

(2) Note On The Kurdish Situation by Major E. M. C. Noel, Political department, Govt. of India, on Special Duty in Kurdistan, July, 1919

(3) بروانە (كردستان في عهد السلام) د. احمد عثمان ـ گۆڤاری (الثقافة) ژمارە 11 ـ 12 کانوونی یەکەم، بەغدا 1979، ژمارە (1) و (2)ی 1980.

(4) Driver, G. R. Kurds and Kurdistan stime 1919.

Printed by The G. S. I. Printing Sectiom, Mont Carmel, Pale

لێکۆڵینەوەکانی تری درایفەر ئەمانەن:

1 ـ بلاوبوونەوەی کوردان ـ گۆڤاری کۆمەڵەی ئاسیایی، کەرتی چوارەم، لەندەن /1921.

2 ـ ناوی کوردو پەلوپۆ زمانەوانەکانی ـ هەر ئەو گۆڤارە/ 1923.

3 ـ ئاینی کورد، گۆڤاری قوتابخانەی خوێندنە رۆژهەلاتی‌یەکان، بەرگی (2)، لەندەن، 1921 ـ 1923.

4 ـ چەند لێکۆڵینەوەیەك لە مێژووی کورد، هەر ئەو گۆڤارە خۆی، بەرگی (3) 1921 ـ 1923.

5 ـ باسێك لە گۆڤاری ئاسیایی، بەرگی (17)، ژمارە (52)، لەندەن 1922.

(5) Longrigg. S. (IRAQ 1900 - 1950) London. P. 410

(6) ئەو بۆچوونە هەڵەیەو لەسەر چ بەڵگەو سەرچاوەیەکی ئەم بابەتە دانەمەزراوە.

(7) (PRO), AIR 20 - 721, 5132, Mousul (8 Th April, 1919) To: G. H. Q. Mills, Capt. S. S. O. Kirkuk, P. P. 23.

میلز ناوی هەندێ لەو سەرۆکە کوردانە دەهێنێ کە لە جووڵانەوەی کوردایەتی‌دا کاریان کردووە وەکو لە دیاربەکر مستەفا بەگ و زولفی بەگ و عادل بەگ و شەریفی کوری مفتیو حەقی بەگ و دکتۆر جەودەت و موصللو محەممەد لە ماردینیش قادر بەگ و حاجی عەبدولرەحمان کاواس وسەرۆکی پێشووی شارەوانیو سەرۆکی شارەوانیی نسێبین و قادوس بەگ. دەڵێ زولفی بەگ و قادر بەگ بران و دکتۆر جەودەت نزیکترین هاوڕێی رەشید پاشای والی پێشوو بوو ئەوەی خۆی کوشت.

(8) هەر لەو سەرچاوەی پێشووەدا دەربارەی سەرۆکی عەشیرەتی قەرە کێچ نووسراوە: سەرۆکی عەشیرەتی قەرە گێچ کە عەبدولقادر الا درغە لە بەندیخانەی دیاربەکر بوو، هەروەها ئیسماعیلی کوری ئیبراهیمی سەرۆکی عەشیرەتی مللی لە شوباتی 1919دا لە بەندیخانە دابوو... ل (3).

(9) ئەمانە کاتێك روویان دا ئەودەمەی هێزی ئینگلیز چەند ناوچەیەکی وەکو دیاربەکرو ئورفەو مدیاتی لە شوباتی 1919دا بەپێی بەندەکانی شەڕوەستانی مودروسی نێوان تورکیاو هاوپەیمانەکان داگیر کرد.

لە ئەنجامدا سەرۆکەکانی تورك و کورد بەرامبەر بە باری تازە جوێ جوێ هەڵوێستیان پیشان داو هەڵوێستێکی یەکگرتوویان نەبوو، چونکە رووداوەکان زوو دەهاتن و دەچوون و لەو ماوە کورتەی دوای شەڕی یەکەمی جیهاندا شتی ناکاو زۆر بوو.

(10) Driver Gr Kurdistan and The Kurds, Printed by The G. S. I

(11) هەر ئەو سەرچاوەیە لاپەرە (100).

(12) هەر ئەو سەرچاوەیە لاپەرە (102).

(13) هەر ئەو سەرچاوەیە لاپەرە (103).

# دەربارەی سەرچاوە تورکییەکانی مێژووی کورد

بابەتی

«دەربارەی سەرچاوە تورکییەکانی مێژووی کورد» لەگەڵ ئەوەی باسێکی نوێیە، بەهۆیەوە دەستکەوتەکانی کوردی عیراق لە سایەی شۆرشەکانی 17 ـ 30 تەموزدا دەست نیشان ئەکرێت و هەر لەم ڕووانگەوە ئەو جیاوازییەی، کە لەنێوان کوردی عیراق و کوردی وولاتانی دراوسێمان دا هەیە ئەتوانرێت بخرێتە ڕوو.

«ڕۆشنبیری نوێ»


دوکتۆر جەبار قادر غەفور

کۆلێجی ئەدەبیات زانکۆی مووسڵ


دەربارەی کورد بە گشتیو مێژووی کورد بە تایبەتی نووسراوە بە زمانی تورکی کەمن و پرن لە هەڵوێستی دوور لە زانست و بیروباوەری هەڵەو شۆڤێنی.

تەنانەت سەرچاوەیەکی «زانستی» وەکو «ئینسکلۆپیدیای تورکی» دەربارەی کورد ئەڵێ «زوربەی کوردەکانی تورکیا بە تورکی قسە دەکەن و وەکو تورك ژیان بە سەر ئەبەن و ئێمەی تورك هیچ کاتێك بەوویان ناژمێرین کە ئەمانە سەر بە نەتەوەیەکی تر بن»[1].

ئەو بیروباوەڕە چەوتەی کە ئەڵێ گوایە کورد بە ڕەگەز تورکەو لە کاتی خۆیدا لەبەر هێرشی مەغۆلەکان پەنایان بردوەتە بەر چیاکان و زمانی نەتەوەیی «خۆیان» لە بیر چوەتەوەو ئێستا بە «زمانێکی نوێ، کە بریتی‌یە لە ووشەی عەرەبیو فارسیو تورکی قسەدەکەن» تاوەکو ئێستاش لە بەرهەمی نووسەرە تورکەکاندا بەرچاو دەکەوێت.

تەنها بۆ ئاسان کردنی لێکدانەوەی ئەم سەرچاوانە دەیان کەین بە سێ بەشەوە ئەگەرچی لە زۆر شوێندا پەیوەندیو تێکەڵاوی لە نێوانیاندا هەیەو جیاکردنەوەیان کارێکی ئاسان نیە : ـ

بەشی یەکەمیان ئەو سەرچاوانەیە کە ڕاستەوخۆ بیروباوەڕی وبۆچووەکانی چینی دەسەڵات داری وولات بەرامبەر بە میللەتی کورد دەخەنە ڕوو.

بەشی دووەمیش بریتی‌یە لەو سەرچاوانەی، کە نووسەرو مێژوونوس و ڕۆژنامەنووس و ئابوریزان و پسپۆری کۆمەلایەتی

تورك دەربارەی میللەتی کورد نووسیویانەو تۆماریان کردووە. ئەم نووسەرانە هۆی جیاواز پاڵی پێوە ناون دەربارەی کورد بنووسن لەبەر ئەوە ئامانجەکانیان و ئەنجامی بەرهەمەکانیشیان جیاوازن. زۆربەی زۆریان هەوڵیان داوە بیروباوەڕەکانی چینە دەسەلاتدارەکانی ولات ڕاست دەرخەن و پشتگیری لە سیاسەتەکەیان بەرامبەر بە کورد بکەن. لەگەڵ ئەوەدا لەم ساڵانەی دواییدا نووسەری تورکی واش پەیدا بووە کە بە شێوەیەکی زانستی باری کورد لێك بداتەوەو بگاتە ئەنجامی زانستی گرنگ. نووسەری تورکی واش پەیدا بووە، کە مەینەتی و زیندان و ئەشکەنجەی زۆری کێشاوە لەبەر ئەوەی دانی چاکەی بە کورددا ناوەو ئامادە نەبووە، لە بیروباوەڕەکانی پاش گەزبێتەوە، چاکترین نموونەی ئەم جۆرە نووسەرانە دوکتۆر ئیسماعیل بێشکچی‌یە، کە بۆ چەند ساڵێك خرایە بەندیخانەوە بە هۆی ئەو کتێبەیەوە، کە دەربارەی ڕۆژهەلاتی تورکیا بلاوی کردەوە.

بەشی سێیەمی نووسراوە تورکی‌یەکان لە لایەن نووسەرە کوردەکانەوە نووسراون. ئەم سەرچاوانە گەلێ زانیاری و هەواڵی گرنگیان تۆمارکردووەو یارمەتی مێژوونووس دەدەن وێنەیەکی باشتری باری کوردەکانی تورکیا بکێشێ. ئەم سەرچاوانەش لە هەڵە بەری نین.

هەندێکیان بەرامبەر بە هەڵوێستی شۆڤێنی نووسەرە تورکەکان تووشی ئەوە ئەبن کە لە مێژووی کورد بکۆڵنەوە بە شێوەیەکی پچراوو باری گشتی ولات بخەنە پشت گوێ. هەندێکی تریشیان تەنها دووپاتی زانیاریەکانی سەرچاوەکانی مێژووی کورد دەکەنەوە بێ ئەوەی هیچی بخەنە سەر.

سەرچاوەکانی بەشی یەکەم بایەخێکی یەکجار زۆریان بۆ مێژوونووس هەیە. لە هەموویشیان گرنگتر بەرگەکانی «دەستوور»ە کە بریتین لە یاساکانی «ئەنجومەنی مەزنی میللی تورکیا»، لە دەستووردا یاساکانی پەرلەمانی تورکیاو روون کردنەوەکانیان تۆمار دەکرێ.[(2)]

لە بەرگەکانی «دەستوور»دا گەلێ زانیاری دەربارەی میللەتی کورد هەیە، بە تایبەتی ئەو یاسایانەی کە پەرلەمان لەبیستەکان و سیەکان دا دەربارەی کورد بڕیاری لە سەر داوە.

یەکەمین یاسای بناغەیی کۆماری تورکیا «anayasa» یەکە لە ساڵی 1924دا بڕیاری لە سەر دراو بە «دەستووری» ساڵی 1924» ناوی دەرکردوە، کەرەستەیەکی چاك ئەدا بە دەستی مێژوونووسەوە بۆ دەست نیشان کردنی هەڵوێستی کاربەدەستانی ولات بەرامبەر بە کورد. ماددەکانی ئەم یاسایە سیاسەتی ئەم کار بەدەستانە زۆر بە باشی ڕوون دەکاتەوە.

بۆ نموونە ماددەی «88» هەموو دانیشتوانی ولات بە تورك دائەنێ. ماددەی دووەمیشی زمانی تورکی بە زمانی ڕەسمی ولات لە قەڵەم داوە. بەم شێوەیە ناوەرۆکی ئەو ماددانە ئەو ڕاستیە ئەخەنە پشت گوێ کە لەم وولاتەدا جگە لە تورك چەند میللەتێکی تر دەژی.

جگە لەوە هەموو ماددەکانی دەستووری ساڵی 1924 بەهەمان شێوە داڕێژراون. لێرەدا چەند نموونەیەك دەهێنمەوە.

ماددەی دەیەم مافی هەڵبژاردنی بە «هەموو تورکێ»، کە تەمەنی گەیشتبێتە «22» ساڵ، داوە.

ماددەی یازدەهەمیش ئەوە ڕائەگەینێ کە «هەموو تورکێك» لە تەمەنی سی ساڵیدا بۆی هەیە بە نوێنەر هەڵبژێردرێ.

ماددەی شەست و هەشت «هەموو تورکێ» بە سەربەست دائەنێ و یاسا ئەبێ ئەم سەربەستیە بپارێزێ.

ماددەی شەست و نۆش ئەڵێ «هەموو تورکەکان» لە بەردەم یاسادا یەکسانن.

ماددەی نەوەت و دووش مافی سیاسی و پایە وەرگرتن لە دەزگا میریەکاندا بە «هەموو تورکێ» دەبەخشێ.[(3)]

بەم شێوەیە ئەبینین کە ماددەکانی دەستوور تەنها باسی تورك دەکاو دان بە بوونی کوردو میللەتانی تردا لە تورکیادا نانێت لەگەڵ ئەوەی چەند جارێك دەست کاری هەندێ لە ماددەکانی دەستووری ساڵی 1924 کراو. لە ساڵی 1961دا دەستوورێکی

نوێ بڵاوکرایەوە، بەڵام ئەو ماددانەی باسیان لێوە کران وەکو خۆیان مانەوەو هیچ دەستکاریان نەکرا.

تەنها بۆ نموونە لە ساڵی 1945دا بە گوێرەی یاسای ژمارە 4695 بڕیار درا، کە تێکستی دەستووری لە ووشە عەرەبیو فارسیەکان پاك بکرێتەوەو ووشەی تورکی لە شوێنیان دا بنرێ. دوای ئەوەی لیژنەیەکی تایبەتی ئەم ئەرکەی بە جێ هێنا دەرکەوت کە تەنها شارەزایانی زمان ئەتوانن لە تێکستی نوێ بگەن. لە بەر ئەوە بڕیار درا فەرهەنگۆکێکی بۆ دابنرێ.

ئەم کارەش بێ سوودبوو، لەبەر ئەوە بە گوێرەی یاسای ژمارە 5997 لە ساڵی 1952 بڕیار درا بگەڕێنەوە سەر تێکستە کۆنەکەی دەستوور.[4]

ئەمە هەمووی لە کاتێکدا ڕووی ئەدا کە دەیان ماددەی دەستوور پێویستی بە دەست کاریو دەیان کێشەی وڵات چاوەڕوانی چارەسەرکردن بوون.

لە 9 تەمموزی ساڵی 1961 دەستووری نوێی تورکیا کەوتە کارکردنەوە، بەڵام لە بواری سیاسەتی نەتەوەییدا هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ دەستووری پێشوودا نەبوو.[5]

دوای ڕاپەڕینی ساڵی 1925 پەرلەمانی تورکیا دەیان یاساو بڕیاری، بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکانی کورد، دەرکرد. هەر لە کاتی ڕاپەڕینی ساڵی 1925دا بە ناوی «پاراستنی هێمنیو ئاسایش»ەوە چەند یاسایەك بڵاوکرایەوە. دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەش گەلێ بڕیارو یاسا بڵاوکرایەوە.

بۆ نموونە لە 19 حوزەیرانی ساڵی 1927دا یاسای ژمارە (1097) دەربارەی گواستنەوەی ئەو بنەماڵە کوردانەی دەسەڵاتدارانی وڵات گومانیان لە هەڵس و کەوتیان ئەکرد، بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژ ئاوای وڵات، دەرکرا.[6]

ماددەی یەکەمی ئەم یاسایە مافی گواستنەوەی «1480» بنەماڵەی کوردی «یاخی بووی» لە ویلایەتەکانی ئورفەو بایە زیدەوە بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای وڵاتی، بە میری دابوو.

ماددەی دووەمیش کۆتایی ئابی هەمان ساڵی بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو گواستنەوەیە دابین کردبوو. دەربارەی ئەو خێزانانەش، کە زەویو زاریان هەبوو، لێ کۆتایی تشرینی دووەمی هەمان ساڵ (واتە ساڵی 1927) دوا مۆڵەت بوو بۆ گواستنەوەیان. بە گوێرەی ماددەی پێنجەمی ئەو یاسایە ئەبوایە ئەو خێزانانە لەو جێگانە دابمەزرێن کە میری لە ویلایەتەکانی ڕۆژئاوادا بۆی تەرخان کردوون.[7]

یاسای ژمارە (1178)یش کە لە (5) تشرینی یەکەمی ساڵی 1927دا بڕیاری لە سەر درا هەر دەربارەی ئەوانە بوو، کە لە یاسای پێشوودا باسیان لێوە کرابوو. بەندەکانی ئەوە دەرئەخەن کە گەلێ لەوانەی بەر ئەو یاسایە کەوتبوون ئەو شوێنانەیان کە میری بۆی تەرخان کردبوون، بە جێیانهێشتبوو گەڕابوونەوە ناوچەکانی خۆیان.[8]

یاسای ژمارە «1505» یش، کە لە (2) حوزەیرانی 1929دا دەرکرا بەو ناوە دەربارەی دابەشکردنی زەویو زار بوو بە سەر جووتیارەکانی ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام ئامانجی ڕاستەقینەی دەست گرتن بوو بە سەر زەویو زاری ئەو بنەماڵانەی کە بە گوێرەی یاسای ژمارە (1097) دوور خرابوونەوە.[9]

لە «5» ئایاری ساڵی 1932دا پڕۆژەی یاسایەکی نوێ دەربارەی گواستنەوەی کوردەکان بڵاوکرایەوە. لەگەڵ ئەوەی کاربەدەستان بڵاویان کردەوە کە ئەم پڕۆژەیە دوای دە ساڵ جێبەجێ دەکرێ. بەڵام تەنها دوای دوو ساڵ لە (21) حوزەیرانی 1934دا پەرلەمان یاسای ژمارە «2510» دەرکرد.

ئەم یاسایە بۆ تورکە ئاوارەکان بوو کە لە وڵاتەکانی بەلقان دەرکرابوون، بەڵام لێکدانەوەی بەندەکانی گومان لەوەدا نایەڵێ کە ئەم یاسایە بۆ جێبەجێ کردنی پڕۆژەی ناو براو بوو.[10]

ئەمانەو سەدەها یاساو بڕیاری تر وەکو یاسای ژمارە «4305»[11] لە (11) تشرینی دووەمی ساڵی 1942داو یاسای ژمارە «4530» لە (15) مارتی 1944داو گەلێکی تر، لە بەرگەکانی دەستووردا مرۆڤ دەتوانێ زانیاری بە نرخ و نەزانراو

دەربارەی کوردی تورکیا وەدەست بێنێ.

سەرچاوەیەکی گرنگی‌تری ئەم بەشە بەرگەکانی «سەرژمێری ساڵانە»یە، کە هەموو ساڵێك بڵاودەکرێتەوەو زانیاری بە نرخی تێدا تۆمار دەکرێ.[12] زانیاریەکانی ئەم سەرچاوەیە بایەخێکی زۆری بۆ لێکدانەوەی باری ئابووری‌و دیموگرافی‌و تەندروستی‌و رۆشنبیری کوردی تورکیای هەیە. ئەوەشمان هەمیشە لە یاد بێ کە تەنانەت ئەنجامەکانی سەرژمێریش لە تورکیادا لە شێواوی‌و ئاڵۆزی دوور نین، چونکە هەندێ لە کاربەدەستانی وڵات ئەمیش بۆ بەدی هێنانی سیاسەتەکەیان بە کار دێنن. بۆ نموونە لە تورکیادا باسی میللەتان و کەمایەتیەکان بە هیچ شێوەیەك ناکرێ، لە ئیستاتستیکدا تەنها باسی زمانی دایکی ئەکرێ، واتە دانیشتوانی وڵات بە گوێرەی زمانی دایکیان دابەش ئەکرێن، بەڵام لێرەشدا جێگای دەسکاری هەیە، چونکە ئەوەی هەندێ تورکی بزانی ئەوا زمانی «دایکی» هەڵبەتە تورکی‌یە ئەوەشی هیچ تورکی نەزانێ ئەو کاتە بە گوێرەی ئەو زمانەی قسەی پێ ئەکا دەنووسرێ.

لەبەر ئەوە ئەنجامەکانی سەرژمێری پشتیان پێ نابەسترێ‌و ئەبێ مرۆڤ هەمیشە ئەم راستیانەی لەبەر چاو بێ کاتێ ئەم سەرچاوەیە بەکار دێنێ. لێرەدا هەندێ نموونەی‌تر دێنمەوە.

بەگوێرەی سەرژمێری ساڵی 1927 ژمارەی ئەوانەی زمانی کوردی‌یان بە زمانی دایکی خۆیان داناوە (1,184,446) کەس بوون،[13] لە ساڵی 1935یشدا (1,480,246) کەس بوون،[14] کە لە هەردوو حاڵەتدا دەیکردە نزیکەی 10٪ دانیشتوانی وڵات، کە چی لە ساڵی 1945دا ژمارەی کورد زمانەکان تەنها (1,362,895)[15] کەس بوون، واتە (117,351)کەس کەمتر لە ساڵی 1935 لە کاتێکدا کە دانیشتوانی تورکیا زیاتر لە دوو ملیۆن و نیو زیادی کردبوو. دوای ئەمە بە بیست ساڵ واتە لە ساڵی 1965دا ژمارەی ئەوانەی زمانی کوردی‌یان بە زمانی دایکی خۆیان دەزانی تەنها (2,370,000)کەس بوون کە ئەکاتە نزیکەی 7٪ دانیشتوانی وڵات،[16] واتە لە ساڵی 1965 رێژەی کوردەکان 3٪ کەمی کرد لەچاو ساڵی 1927دا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مێژوونووس دەتوانێ زانیاری بە نرخ و گرنگ لەم سەرچاوەیە بە دەست بێنێ. بۆ نموونە بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی 1927 رێژەی کورد زمانەکان لە هەندێ لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی وڵاتدا بەم شێوەیە بوو:

لە ویلایەتی بایەزید 58٪و لە بەتلیس «مووش» 75٪و دیار بەکر 69٪و ئەلیازیگ 53٪و هەکاری 89٪و ماردین 61٪ وسعرەت 75٪و وان 77٪.[17]

لە هەندێ ویلایەتی تریشدا وەکو ئەرزەنجان 41٪و مەلاتیە 42٪و ئورفە 42٪ دانیشتوانی زمانی کوردی‌یان بە تەنها زمانی خۆیان دەزانی. جگە لەوە ژمارەی کوردەکان لە سیواسدا 42,270 کەس و غازی‌عەنتێب 16,348و ئەنقەرە 21430 کەس بوو.[18] پرۆسێنتی کورد زوربانەکانیش لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا 34,4٪ دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بوو.

هەروەها گەلێ زانیاری بە نرخ دەربارەی باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و تەندروستی کورد لە بەرگەکانی سەرژمێری ساڵانەدا هەیە.

بە گوێرەی هەمان سەرژمێری ساڵی 1927 ژمارەی ئەوانەی خوێندەواریان دەزانی لە هەندێ ناوچەکانی کوردا لە 2٪ دانیشتوان تێ‌نەدەپەری وەکو ویلایەتی هەکاری. بە گوێرەی سەر ژمێری ساڵی 1935یش رێژەی خوێندەواران لە ماردین 4,5٪ وموش 5,5٪و سعرەت 2,5٪و ئورفە 4,5٪و وان 3,6٪ دانیشتوان بوو.[19]

ویلایەتی واش هەبوو تەنها دوو قوتابخانەی تێدا هەبوو، وەکو هەکاری هەندێ ویلایەت کەمێك چاکتر بوو، بەڵام بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ژمارەی دانیشتواندا نەدەگونجا. بۆ نموونە پارێزگایەکی وەکو دیار بەکر تەنها نۆزدە قوتابخانەی لێ‌بوو، سعرەتیش حەڤدە قوتابخانەی تێدا هەبوو.[20]

لەگەڵ ئەوەی دانیشتوانی «ئەنادۆڵی رۆژهەڵات» نزیکەی

پێنج یەکی هەموو دانیشتوانی وولاتیان پێك دەهێنا، ژمارەی قوتابخانەو مامۆستاو خوێندکار تەنها 10٪ ژمارەیان لە ولاتدا دەگرتەوە.[21]

لە بواری تەندروستیدا باری کوردستان لە مەش خراپتر بوو، لە هەندێ ویلایەتدا تەنها پزیشکێکی لێ نەبوو، هەندێکی تریش یەك پزیشك بۆ هەموو ویلایەتەکە.[22] بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە لە سیەکاندا لە کوردستانی تورکیا تەنها قەرەوێڵەیەك لە نەخۆشخانەکاندا بەر (200) هەزار کەس دەکەوت، ئەمە لە کاتێکدا کە ژمارەی فەرمانبەرو پیاوانی ئاسایش لە ژماردن نەدەهاتن. بۆ نموونە لە سەرەتای سیەکاندا لە هەموو ویلایەتی دیاربەکردا تەنها (83) مامۆستا هەبوو، لە کاتێکدا کە (396) حاکمی لێ بوو.[23] بەم شێوەیە بەرگەکانی ئیستا تستیك زانیاری زۆرمان دەخەنە بەردەم و یارمەتی مێژوونووس لە وێنەکێشانی باری کوردی تورکیادا دەدەن.

ئاشکرایە، کە ووتەو نووسراوەو بۆچوونی کاربەدەستانی هەر وولاتێك سەرچاوەیەکی سەرەکی سیاسەتی ناوەوەو دەرەوەی ئەو ولاتەیە.

کاربەدەستانی تورکیا گەلێ جار باسی کوردیان کردووەو بیروباوەڕی خۆیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد دەربڕیوە.

موستەفا کەمال گەلێ جار باسی کوردی کردوە، بە تایبەتی لەو ووتە یەیدا کە لە کۆنگرەی دووەمی «پارتی گەلی کۆماری»یدا خوێندیەوە. خوێندنەوەی ئەم ووتەیە شەش ڕۆژی خایاندو لە دواییدا لە کتێبێکی سێ بەرگیدا تۆمارکرا.[24] لەم ووتەیەدا زۆر باسی پەیوەندی کردنی لەگەڵ ئاغاو سەرەك هۆزو پیاوە ئاینیەکانی کوردا کردوە، هەروەها بە دوورو درێژی باسی ڕاپەڕینی قۆچگیری‌و هاتنی میجەر نۆئێل بۆ کوردستان و تێکۆشانی ڕێکخراوە سیاسیە کوردییەکانی دوای شەڕی جیهانی یەکەم دەکا.[25] جگە لەمانە لەم کتێبەدا چەندەها نامەو بروسکەی ئەتاتورك بۆ سەرەك هۆزو ئاغا کوردەکان تۆمار کراوە، وەکو ئەو نامانەی بۆ سەرۆکی هۆزی موتکی حاجی موسا بەگ، کە لە دەی ئابی 1919دا ناردووە، هەروا بۆ عەبدورڕەحمان ئاغای شرناق لە (13) ئابی هەمان ساڵداو گەلێکی تر.[26]

بە بیروباوەڕی موستەفا کەمال ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان «زیان بە نەتەوەو خیلافەت دەگەیێنێ لەبەر ئەوە ئەبێ هەموو بزوتنەوەیەکی کورد سەرکوت بکرێ».[27] لە بروسکەیەکیشدا بۆ یاریدەدەری والی دیاربەکر لە (15) تەمموزی ساڵی 1919دا پێشوازی لە داخستنی یانەی «کورد تەعالی جەمعیەتی» لە دیار بەکر کردووەو ئەڵێ «هەر کۆمەڵەیەك هەوڵی پەیداکردنی دووبەرەکی بدا، ئەبێ بە زووترین کات دابخرێت. لەبەر ئەمە پێشوازی لەو هەنگاوەت بەرامبەر بە یانەی کوردی دەکەم».[28]

عیسمەت ئینەنۆش گەلێ جار باسی کوردی کردوە.[29] بۆ نموونە لە (30) ئابی ساڵی 1930یدا، کاتێ سەرەك وەزیران بوو، لە ئاهەنگی کردنەوەی هێڵی ئاسنی سیواسدا ڕووی کردە ئامادە بووان و ووتی «لەم ولاتەدا تەنها تورك مافی داواکردنی مافە نەتەوەییەکانی خۆی هەیە، هیچ ڕەگەزێکی تر ئەم مافەی نیە. ئەو ڕۆژەی ئەم هێڵە دەگاتە سنوورەکان هیچ گومانێك لەمەدا نامێنێ‌و هەموو پیلانێك بەرامبەر بەم ڕاستیە دەرووخێ».[30] هەر ئەم پاشایە بوو لە کاتی کۆنفرانسی لۆزاندا کوردو تورکی بە هاوبەش لە ولاتدا دائەنا. کاربەدەستانی تری ولاتیش هەر بەو شێوەیە بیریان دەکردەوە. وەزیری «دادپەروەری» لە سییەکاندا مەحموود ئەسعەد لە شاری (ئۆدیمش) لە بەردەم هەڵبژێرەکانیدا ووتی «ئێمە لە سەربەسترین ولاتی جیهاندا کە تورکیای پێ‌دەڵێن، دەژین. نوێنەرتان شوێنێکی لەمە چاکتر نابینێتەوە بۆ ئەوەی بیروباوەڕەکانی خۆی ڕاستەو خۆ دەرخات. من هەستی ڕاستەقینەی خۆم ناشارمەوە، تەنیا تورك لەم ولاتەدا خاوەن دەسەلاتە، ئەوەش کە بە ڕەگەز تورکی پاك نیە، ئەوا تەنها مافێکی هەیە، کە کارەکەر بێ. با دۆستان و دوژمنان ئەم ڕاستیە تێ‌بگەن و با چاکانیش بیزانن».[31] بیروباوەڕی سکرتێری گشتی پارتی گەلی کۆماری فەرمانڕەواش جیاوازی لەگەڵ ئەوانی تردا نیە نیهال ئادسزی.[32] بە ناوبانگ لەوەش

دوورتر ئەرواو بەوە قایل نابێ کە ئەو هاوولاتیانە «مافی کارەکەریان» پێ ببەخشرێ بەڵکو ئەبێ «ئەوانەی تورك نین فرەدرێنە دەرەوەی ولات».(33)

دوای ئەوەی بیروباوەڕی دیموکراسی و یەکێتی گەلان و برایەتی بە جیهاندا دوای شەڕی جیهانی دووەم بڵاوبووەوە، کاربەدەستانی ئەم ولاتە لە سەر بۆچوونەکانی خۆیان مانەوەو هیچ گۆڕانیان بە سەردا نەهات.

دوای کودەتای ساڵی 1960 کاربەدەستە تازەکانی ولات دڵسۆزی خۆیان بۆ ئەو بیروباوەڕە دەربڕی. لە 24 تشرینی یەکەمی ساڵی 1960دا سەرەك کۆماری ئەو ڕۆژانە جەمال گیورسل لە شاری دیاربەکر ڕووی کردە کوردەکان ووتی «کوردنیەو هەموو تورکن. ئەوانەی ئەیانەوێ لە یەکمان کەن تۆوی جوداکاری دەچێنن... ئەو خاکەی زیاگیوك ئەلپی پێ‌گەیاندوە بە هیچ شێوەیەك نابێ خاکی کورد بێ. نەك تەنها لێرە، بەڵکو لە هەموو ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتدا تەنها تورك دەژی».(34)

(60) مرۆڤ دەتوانی سەدەها نموونەی لەم جۆرە بێنێتەوە.

ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تورکیا چ ئەوانەی میری بڵاویان دەکاتەوەو چ ڕۆژنامەو گۆڤاری پارتە سیاسیەکان سەرچاوەیەکی گرنگی تری ئەم بەشەن. لێرەدا بە بۆنەی ڕووداوە گەورەکانی کوردستانی تورکیاوە گەلێ هەواڵ و زانیاریان تۆمارکردووەو زوربەی زۆریان ڕاستەو خۆ بیروباوەڕی دەسەلاتدارانی ولات دووپات دەکەنەوە.

بۆ نموونە ڕۆژنامەکان لە ساڵی 1925دا دەیان ڕیپۆرتاژ و وتاریان دەربارەی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران تۆمارکردوە، لە ساڵی 1930یشدا بە بۆنەی ڕاپەڕینی ئاگری داغەوەو لە ساڵانی 1937 ـ 1938 بە بۆنەی ڕاپەڕینی دەرسیمەوە گەلێ هەواڵ و ڕیپۆرتاژ و زانیاری دەربارەی ناوچەکانی کوردەواری لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تورکیادا بڵاوکراونەتەوە.

ئەم ڕیپۆرتاژانە باسی «سەرکەوتنەکانی» سووپای «تورکیا بە سەر «یاخی بووە دواکەوتووەکاندا» ئەکەن و بە هەستێکی پڕ لە کینەو ڕەگەز پەرستی‌یەوە باسی کورد دەکەن. تەنانەت نووسەری یەکێ لەم ڕیپۆرتاژانە ووتارەکەی بەم شێوەیە دەست پێ دەکات «سێدارەکانی دەرسیم بە لاشەی یاخی بووەکان ڕازانەوە...».(35)

ڕۆژنامە کانیش هەمیشە نووسیویانە، کە لە تورکیادا کوردنیە بۆ نموونە ڕۆژنامەی «سۆن پۆستە» لە (11) نیسانی ساڵی 1945 دا نووسیویە ئەڵێ «هیچ کاتێك لە تورکیادا کەمایەتیکی کورد نەبوە. نە نیشتەجێ و نە کۆچەر، نە خاوەن هەست و نە بێ هەست».(36) هەروەها ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی شەستەکان و حەفتەکان گەلێ جار باسی کوردیان کردوە لە هەندێ ڕۆژنامەو گۆڤاردا گۆڕانێکی کەم بەرامبەر بە میللەتی کورد بەدی ئەکرێ بە تایبەتی لەو سەردەمانەی کە هێزە دیموکراتیەکانی ولات سەرئەکەون و ڕێگای هەندێ چالاکی ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی بە هێزەپێشکەوتوخوازەکانی ولات ئەدەن.(37)

بەشی دووەمی سەرچاوە تورکی‌یەکانی مێژووی کورد بریتی‌یە لەو کتێب و لێکۆڵینەوانەی کە نووسەرە تورکەکان دەربارەی کورد تۆماریان کردوە. هەندێ لەم سەرچاوانە هەمووی بۆ باسی کورد تەرخان کراوە، هەندێکی تریشی لا بەلا باسی کوردیان کردوە.

زوربەی زۆری ئەم نووسەرانە بەرهەمەکانیان بۆ لایەنگیری کردن لە هەنگاوەکانی میری بەرامبەر بەکورد تەرخان کردوە، کەمێکیشیان هەستی مرۆڤایەتی و زانست پاڵی پێوە ناون دەربارەی کورد بنووسن. هەندێ لەم نووسەرانە لە گەڵ ئەوەی ناوی «لێکۆڵینەوەی زانستی» لە بەرهەمەکانیان دەنێن، بەڵام هیچ پەیوەندیەکان بە لێکۆڵینەوەو زانستەوە نیە. باشترین نموونەی ئەم جۆرە بەرهەمانە کتێبەکەی محەمەد فەخرەددین کیرزی ئۆغلوە، کە «هەوڵێکی زۆری داوە» ڕەگەزی کوردمان بۆ «بدۆزێتەوەو هاوڕەگەزیمان» لەگەڵ تورکدا بکا بە «ڕاستیەکی

مێژوویی کە جێی گومان نەبێ».[38] لە هەمووی سەیر تر ئەوەیە، کە ئەم «زانایە» لە تورکیادا بە پسپۆری مێژووی کورد دائەنرێ، تەنانەت زیاتر لە سەدجار ووتاری دەربارەی ڕەگەزی کورد لە دەزگا سیاسیو ڕۆشنبیریەکانی تورکیادا خوێندوەتەوە. لەهەموو لایەکیش هەر ئەو قەوانە سواوەی لێ ئەدایەوە کە کوردو تورك یەك ڕەگەزن، تەنها پروپاگەندەی ئیمپریالیزم ئەیەوێ تووی جوداکاری بچێنێ. لە کۆرێکی تایبەتیدا کە بۆ «روون کردنەوەی»ڕەگەزی کورد تەرخان کرابووو لە ساڵی 1963 دا بەسترا، نوێنەرانی ڕۆژنامەکانی «میللەت»و «جومهوریەت»و «تەرجومان»و «سۆن حەوادیس»و گۆڤارەکانی «سۆسیال عەدالەت»و «دەنگ»و گەلێکی تر ئامادە بوون. کیرزی ئۆغلۆش «تەنها پسپۆرو شۆرە سواری ئەم بوارە» ئامادەبوو. ئەم کۆرە ڕووداوێکی سەیر بوو، چونکە زوربەی ئەوانەی ئامادەی بوون هیچیان دەربارەی کورد نەدەزانی، کەسیش داوای لێ نەکردبوون ڕەگەزی «وون بووی» کوردمان بۆ بدۆزنەوە. تەنها بۆ نموونە ووتەی هەندێ لە ئامادە بووەکانی کۆرەکە لێرەدا دەهێنمەوە:

نوێنەری ڕۆژنامەی «تەرجومان» ووتی «من بە خۆم خەڵکی ئەلازیگ (العزیز)م، بەڵام ووشەی «کورد»م خۆش ناوێ، لەبەر ئەوە هیچ شتێکی کوردی نیە».

نوێنەری ڕۆژنامەی «سۆن حەوادیس» مومتاز فایق فێنك بەشداری لە لێکدانەوەی ڕەگەزی کوردا کردوو ووتی «ئێمە لە یەکەوە دوورنین... تەنانەت سەرنووسەری ڕۆژنامەی «ئولوس» جیهاد بابان کوردە سەلیمی برایو شوکروڵای مامی کە لە تەهرانن، ئەوانیش کوردن. من ئەمەنە دەربارەی کورد دەزانم».

نوێنەری ڕۆژنامەی «یەنی ئەستەموڵ» ئەولیا ئۆغلۆش بیروباوەڕی خۆی لەم بارەیەوە دەربڕیو ووتی «من کورد نیم و دان بە بوونی کوردا نانێم، بەڵام برا گەورەکەم کوردە... من لەگەڵ خۆمدا چەند تێبینیەکی یلماز ساری ئۆغلۆی هەڤاڵم، کە شارەزای ڕۆژهەڵاتە، هێناوەو لێرەد بۆتانی دەخوێنمەوە. یلماز ئەڵێ: لە ولاتی ئێمەدا ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوانیە، ئەبێ دەمی کورد داخرێو سەری لەلاشەی جیابکرێتەوە من ئەم بیروباوەڕەی هەڤاڵەکەم بە دڵەو لایەنگیری لێ دەکەم...». ئەمە ووتەی هەندێ لە ئامادە بووەکانی ئەم کۆرە سەیرە بوو. هەندێ لە ئامادە بووەکانیش بە پێچەوانەی ئەو بیروباوەڕانەوە قسەیان دەکرد، بەڵام ژمارەیان کەم بوو، لەمانە مووسا عەنتەر کە بە خۆی نووسەرێکی کوردەو ئەحمەد حەمدی بەشار نوێنەری گۆڤاری «بارش دونیاسی»و عەبدی ئیپکچی نوێنەری ڕۆژنامەی «میللەت»و دۆغان ئاوچی ئۆغلو لە گۆڤاری «یۆن»ەوە.

یەکێ لە ئامادە بووەکان بە چەند ووشەیەکی پڕ لە مانا هەڵوێستی خۆی لەم بارەیەوە دەربڕی، ئەویش تورهان تۆکیل بوو، نوێنەری گۆڤاری «سۆسیال عەدالەت» کە ووتی «من هیچ ناڵێم لەم بارەیەوە چونکە ڕاستی نابێ بوترێو درۆش پێویست نیە». دوای ئەوەی ئەمانە لێ بوونەوە «پسپۆر» دەستی کردە قسەکردن و ووتی«... من لێکۆڵینەوەیەکم دەربارەی ڕەگەزی کورد بڵاوکردەوە، کە تاوەکو ئێستا لە پەنجا شوێندا لە چاپ دراوەتەوەو لە سەد جێگەش ووتارم دەربارەی ئەم کێشەیە خوێندوەتەوە... من هەمیشە لە سەر ئەو باوەڕەم کە کورد بە ڕەگەز دەچێتەوە سەر تورك».[39]

زوربەی سەرچاوەکانی تری ئەم بەشە جیاوازیەکی ئەوتۆیان لە گەڵ کتێبەکەی کیرزی ئۆغلودا نیە، لەگەڵ ئەوەشدا مێژوونووس دەتوانێ زانیاری بە کەڵکیان دەربارەی کورد لێ وەدەس بێنێ.

کتێبەکەی والی ئەرزەنجان لە بیستەکاندا عەلی کەمالی[40] گەلێ زانیاری دەربارەی باری کۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕۆشنبیری کوردەکانی ئەو ناوچەیەی تێدا تۆمار کراوە. عەلی کەمالی بە دوورو درێژی باسی جوتیاران و چەوسانەوەو زۆرداری ئاغاو دەربەگی کورد دەکا. هەروەها گەلێ زانیاری دەربارەی ڕاپەڕینی قۆچگیری بڵاودەکاتەوە. نووسەری ناوبراو دەگێڕێتەوە کە تەنانەت ئەو کوردانەی ئەچوونە شارەکان بۆ کارکردن

ڕزگاریان لە باج و خەراجی ئەم دەرەبەگانە نە دەبوو. بۆ نموونە نوێنەری یەکێ لەو ئاغانەی کە دەسەڵاتی بە سەر (230) گوندی ناوچەی دەرسیمدا هەبوو، هەموو ساڵێ دەچوە ئەستەموڵ بۆ کۆکردنەوەی باج و سەرانە لەو کوردانەی لەوێ کاریان دەکرد.[41] هەروەها باسی داواکاری سەرکردەکانی ڕاپەڕینی قۆچگیری دەکاو دەڵێ لە (11) ماری ساڵی 1921 دا بروسکەیەکیان بۆ ئەنجومەنی میللی مەزنی تورکیا ناردوتێیدا داوایان کردبوو پارێزگایەکی تایبەتی لە ناوچەکانی قۆچگیریو دیفریکیو ڕەفاحیەو قوڕووچایو کەماخ دروست بکرێو کوردێك بکرێ بە والی ئەم ناوچەیە.[42] ئەمانەو گەلێ زانیاری تر لە کتێبەکەی عەلی کەمالیدا بەرچاو دەکەون، کە ئەتوانن یارمەتیەکی زۆری مێژوونووسیو ئەتنۆگراف بدەن، لە تێگەیشتنی باری ئابووریو سیاسیو کۆمەڵایەتی کوردا لەو سەردەمەدا.[43]

هەربەو جۆرە ڕۆژنامەنووسی تورك نەشئەت حەقی کە چەند جارێك لە بیستەکاندا چوتە کوردستان لە کتێبەکەیدا «دەرەبەگ و دەرسیم»،[44] باسی دەسەڵاتی بێ سنووری دەربەگی ئەو ناوچەیەی کردوە. لە شوێنێکدا دەڵێ «دەرەبەگی کورد نەك تەنها خاوەنی زەویەیە بەڵکو خاوەنی ئاو و لەوەڕگەو خانووەکانی گوندەکەشە. بە وتەیەکی تر خاوەنی تەواوی ناوچەکەی «خۆیەتی» . تەنانەت هەندێ جار خاوەنی سەدەها گوندە».[45]

دەربارەی کۆکردنەوەی باجی دەیەك «ئەعشاری» دەڵێ:

«هەشتا لە سەدی ئەم باجە ئەچوە گیرفانی کۆکەرەکانیەوە. باج کۆکەرەوەکان لە خاوەنی زەویەکی (25 ـ 30) دۆنمی ئەوەندیان باج وەرئەگرت کە لە گوندێکی گەورە کۆ ئەکرایەوە. ئەوەشی نەیتوانایە باجە بدات ئەوا قین و دوژمنایەتی باج کۆکەرەوەکان دەرژا بە سەریا».[46]

ئەو دەرسیمەی کە لە ساڵانی 1937 بۆ 1939دا چینە دەسەڵاتدارەکانی وڵات بە ئاگرو ئاسن دایان مرکانەوە، لە کاتی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی نەشئەت حەقیدا جێی شانازی ڕژێم بوو، چونکە لە لەبەر هەڵوێستی چەوتی هەندێ لە سەرەك هۆزەکان کوردەکانی ئەم ناوچەیە بەشداریەکی ئەو تۆی ڕاپەڕینەکانی 1925و 1930یان نەکرد. لەبەر ئەوە کاربەدەستانی وڵات بە هەموو لایەکدا بڵاویان ئەکردەوە کە ئەوان لە کوردەکانی دەرسیم «چاوەڕوانی هەڵوێست و کاری شۆڕشگێرانە ئەکەن، نەك ڕاپەڕینی دواکەوتوو».[47]

لەگەڵ ئەوەی ئەم نووسەرە دان بە باری تاڵی کوردەکاندا لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا دەنێ، لە نرخاندنی ڕاپەڕینەکانی 1925و 1930یدا بیروباوەڕی کاربەدەستان دووپات دەکاتەوە.

محەممەد شەریف فرات (یاخود فورات) کتێبەکەی بۆ مێژووی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا بە گشتیو شاری ڤارتۆ بە تایبەتی تەرخان کردوە.[48]

ئەم نووسەرە گەلێ زانیاری دەربارەی ڕووداوەکانی ڕاپەڕینی ساڵی 1925 لە ناوچەی ڤارتۆدا تۆمارکردوە. ڤارتۆ کە دەکەوێتە ویلایەتی موشەوە یەکێك لە ناوچە سەرەکیەکانی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران بوو. لەم ناوچەیەدا خالید جبرانلیو یووسف زیا گەلێ چالاکیان نواندو پەیوەندیان لەگەڵ سەرەك هۆزەکانی ڤارتۆو مەلازگرت و خنس و سوڵحان و چەپاقچورا کردو داوایان لێ کردن بەشداری لە ڕاپەڕینەکەدا بکەن. هەروەها نووسەری ناوبراو گەلێ هەواڵی دەربارەی «کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان»و سەرکردەکەیو چالاکی ڕۆشنبیری ئەم کۆمەڵەیە وەکو لەچاپ دانی دیوانەکانی مەلای جزیریو ئەحمەد خانی، تۆمار کردوە.[49]

م. ش. فورات بە دوورو درێژی باسی شەڕەکانی ساڵی 1925 دەکاو هەواڵی زۆر دەربارەی بەرەکانی ئەم شەڕانەو سەرکردەکانی ڕاپەڕینەکە تۆماردەکا. لێرەدا ڕووداوەکانی ڕزگارکردنی شارەکانی سوڵحان و مەلازگرت و دەوروبەری مووش و خۆئامادەکردن بۆ هێرش بردنە سەر ئەرزەڕووم دەخەوێنینەوە. هەروەها هەڵوێستی هەندێ هۆزی کوردمان

بەرامبەر بە ڕاپەڕینەکە بۆ روون دەکاتەوە، وەکو هۆزی هورمك کە لە یەکەم ڕۆژەوە دژی وەستا.

هەروەهــا هەواڵــەکانی دەسگیــرکــردن و گواستنــەوەی شێـخ سەعیدو هەڤاڵەکای بۆ دیاربەکر بەرچاو دەکەوێ لە کتێبی ناوبـراودا. [50] لەگـەڵ ئەوەی فورات بیـرویـاوەڕە ڕەسمیـەکـانی وولاٚت دەربـارەی ڕاپـەڕینی شێـخ سەعیـد دوو پات دەکـاتەوە، بەڵام هەر بە خۆی زانیاری وا تۆمار دەکا کە ئەو بۆ چوونانە پووچ دەکاتەوە.

بۆ نمــوونـە دەڵی گوایـە شێـخ سەعیـد «پێنـج هەزار لیـرەی ئالتــوونی لە ئنگلیــز وەرگــرتــوە، بەرامبــەر بە بەرپــاکــردنی ڕاپەڕینەکە». ئەمە لە کاتێکدا کە هەر بە خۆی دەڵێ کە شێخ سەعیــد «پیــاوێکی زۆر دەوڵــەمــەنــد بووو ساڵی (10)ڕان مەڕومــاڵاتی دەنـاردە بازاڕی حەڵـەب و بۆ فرۆشتن و بە پارەکەی شت ومـەکی دەکـڕیو دەیهێنـایـە ئەم ناوچـانـەو بازرگانێتی پێوە دەکرد. بەم شێوەیە پارەیەکی زۆری لاکۆبووەوە». [51]

ئەمانەو دەیان هەواڵ و زانیاریتر لە کتێبی ناوبراودا دەبینرێن و یارمەتی مێژ وو نووس ئەدەن لە لێکدانەوەی ئەم ڕووداوە گرنگەی مێژ ووماندا.

لە ساڵی 1955دا بەهجــەت جەمــال کتێبێکی دەربــارەی ڕاپــەڕیــنـی ساڵی 1925 بلاٚوکــردەوە، [52] لەگــەڵ ئەوەی کە ئامــانـجـی ئەم نووســەرە ڕەشکــردنی ئەو ڕووداوە بوو، بەڵام هەواڵ و زانیــاری زۆری تێــدایـە کە سود بەخش و بە کەڵکن.

بەهجـەت جەمـال کە باسی ڕووداوەکـانی ڕاپـەڕینـەکـە دەکا بە دوورو درێــژی شیــان دەکــاتــەوەو ڕۆژ بە ڕۆژ ڕووداوەکــانی ئەگێڕێتەوە. باسی رزگارکردنی شارەکان و دیل کردنی والیەکانی دیابەکرو مەلاٚتیە دەکاو ئەڵێ «تەنها مابوو دیاربەکر داگیرکەن سەر بەخۆیی کوردستان دیاری بکەن». [53] هەروەها بە ووردی باسی هەنگـاوەکـانی میـری بۆ دامـرکـاندنەوەی ڕاپەڕینەکە دەکا، وەکو یاسای ژمارە (578) کە لە (2) مارتی ساڵی 1925 بڕیاری لە سەر دراو «دادگاکانی سەربەخۆیی» کە مافی زۆریان درابوویە بۆ سەرکوت کردنی ڕاپەڕینەکە. [54]

جگــە لەمـانـە بەهجـەت جەمـال جیـاوازی بیـرویـاوەڕو بۆ چوونـەکـانی کاربــەدەستــانی وولاٚت بەرامبـەر بەڕاپـەڕینـەکـە دەست نیشـان دەکـاو ووتـەی نوێنـەری ئەرزەڕووم دێنێتەوە کە لە پەرلـەمـانـدا ووتی «من باوەڕ ناکـەم لێرەدا دەستی بێگانە هەبێ چونکە گەنج و مووش لە ناوەڕاستی ولاٚتدان. ئەگەر پەیوەندیان لەگەڵ بێگانەدا هەبوایە ئەوا ئەبوایە یاخی بوونەکە لە ناوچەکانی سەرسنووردا بەرپابوایە». [55] سەرباری ئەمانە نووسەری ناوبراو دوا ووتـەکـانی سەرکـردەکـانی ڕاپـەڕینەکە پێش لە سێدارەدانیان تۆمـار دەکـا، [56] کە مێـژ وو نووس دەتـوانێ بیـان کاتـەبـەڵگەی دەستی کاتێ باسی هۆیەکانی ئەم ڕاپەڕینە دەکا.

کتـێـبــەکــەی مەتــیــن توێـکــەریش بۆ هەمــان ڕووداو تەرخان کراوە. [57] ئەم نووسەرە بە هۆی نزیکیەوە لە سەرچاوەی هەواڵـەکـان گەیشـتـوەتە گەلێ هەواڵ و زانیاری نەزانراو دەربارەی ڕاپەڕینی ساڵی 1925. [58]

مەتین توێکــەر بە شێــوەیــەکی ڕێـك و پێـك ڕووداوەکـانی ڕاپـەڕینـەکـە ڕیـز دەکاو هەنگاوەکانی میری بۆ دامرکانەوەی شێ دەکـاتـەوە. باسی ئەوە دەکـا کە جەندرمە کوردەکان بە خۆیان و چەکەکانیانەوە دایەنە پاڵ «یاخی بووەکان». [59]

هەروەهــادەربــارەی گەمــارۆدانی شاری دیـاربـەکـرویەیەکـدا چوونـەکـانی ترئەدوێ. [60] هەندێ هەواڵی نەزانراویش تۆماردەکا، کە هەڵـوێستی کاربـەدەستـانی ولاٚت دەرئەخـا. مەتین توێکـەرئەڵێ کەلە تورکیادازۆرکەس باوەڕی بەوەنەدەهات کە «یاخی بووەکان» بەهاندانی ئینگلیـزڕاپـەڕیون، تەنانەت سەرەك وەزیران لەساڵی 1924 وسەرەتای ساڵی 1925 فەتحی بەگ باوەڕی بەم قسەیە نەدەهات. دوابەدوای ئەمە باسی هەوڵ وتەقەلای فەرمانڕەوایانی ولاٚت دەکا بۆوەدەس هێنانی تەنها بەڵگـەیـەك بادروستکـراویش بێت بۆتاوانبارکردنی شۆڕشگێڕەکان لەم بارەیەوە. نووسەری ناوبراوئەم ڕووداوەدەگێڕێتەوەودەڵێ:

پۆلیسی نهێنی تورکیـاپێش ڕاپەڕینەکە بەماوەیەك یەکێك لەپیاوەکانی خۆی لەژێــرپەردەی فەرمــانبـەرێکی پایـەبـەرزی وەزارەتی دەرەوەی

بەریتانیادا بۆ ووت و وێژکردن لەگەڵ سەرکردە کوردەکاندا ناردە ئەستەموول.

ئەم کابرایە خۆی بە شێخ عەبدولقادرو کوێر سەعدی ناساند ناوی میستەر تۆمسنی لە خۆی نابوو و تەنانەت یەك ووشەش ئنگلیزی نەدەزانی. دوای ووت و وێژێکی زۆر کە «میستەر تۆمسن» هەر گفت و پەیمانی هەڵدەڕژاند، گوایەئنگلیز یارمەتی زۆری کوردەکان ئەدات ئەگەر ئەمان دژی کەمالیەکان ڕاپەڕن، چەند کاغەزێکی پێشکەشی عەبدولقادرو هەڤاڵەکانی کرد بۆ ئەوەی مۆری کەن، تاوەکو ئەم پەیمان و ڕێك کەوتنە شێوەیەکی یاسایی وەرگرن، بەڵام لەگەڵ هەموو تەقەلای تۆمسن دا شێخ عەبدولقادرو هەڤاڵەکانی قایل نەبوون کە «ڕێك کەوتنەکە» مۆرکەن.[61] ئەمە یەکێك بوو لەو «بەڵگانەی» ساڵەهای ساڵ کاربەدەستانی ئەم وڵاتە هەرەشەو گورەشەی بڵاوکردنەوەیان دەدا، بەڵام هیچیان بڵاونەکرانەوە لە بەر هۆیەکی بچووك، چونکە بەڵگەی وا لە مێشکی کاربەدەستانی وڵاتدا نەبێ لە هیچ شوێنێکی تر نەبوو. بەم شێوەیە کتێبەکەی مەتین توێکەر لەگەڵ بۆچوونە چەوتەکانیا، هەواڵ و زانیاری گرنگی تێدا تۆمارکراوە.

کتێبەکانی شەوکەت سوریا ئایدەمیر یارمەتی مێژوونووس دەدەن بە قووڵی لە سیاسەتی کاربەدەستانی وڵات بە رامبەر بە کەمایەتیەکان بگات. کتێبی یەکەمیانی بۆ ژیان و چالاکیەکانی ئەتاتورك تەرخان کردو لە سێ بەرگدا بڵاوی‌کردەوە.[62] کتێبی دووەمیشی لە سەر ژیان و فەرمانڕەوایی عیسمەت ئینەنۆ بوو.[63]

ئایدەمیر گەلێ زانیاری دەربارەی ئەم دوو سەرکردەیەو سیاسەتیان بەرامبەر بە کورد تۆمار کردوە.

هەروەها مێژوونوسی تورك تاریق زەفەر تونەیا لەو کتێبەیدا کە بۆ مێژووی ڕێکخراوە سیاسیەکان لە تورکیادا لە ماوەی سەدەیەکدا (1859 ـ 1952) تەرخانی کردوە گەلێ جار باسی ڕێکخراوە ڕۆشنبیری سیاسیە کوردەکان دەکا. بۆ نموونە گەلێ جار باسی «کورد تەعاوون جەمعیەتی»و «کورد تەعالی جەمعیەتی» کردووە.[64]

بە گوێرەی زانیاری‌یەکانی ت. ز. تونەیا دەستەی بەڕێوەبەری «کورد تەعالی جەمعیەتی» لەم کوردانە پێك هاتبوو «سەرۆکی کۆمەڵەکە سەید عەبدولقادر سەید عوبەیدوڵا ئەفەندی شەمدینانلی. جێگری یەکەمی سەروك ئەمین عەلی بەدرخان و جێگری دووەمی سەرۆکیش فەریق فوئاد پاشا بوو. سکرتێری گشتی فەریق هەمدی پاشاو لێپرسراوی دارایی سەید عەبدوڵا بوو. ئەندامەکانی دەستەی بەڕێوەبەریش ئەمانە بوون: ئەحمەد عەلی بەدرخان و سولەیمانیەلی محەمەد ئەمین بەگ و خواجە عەلی ئەفەندیو شەفیق ئەرڤاسلیو شوکری بابان زادەو (سەر نووسەری ڕۆژنامەی تەرجومان بوو) وفوئاد بابان زادەو فەتحوڵا ئەفەندی «بازرگان»و محەمەد شوکری سەکبان».[65]

هەروەها تونەیا باسی «کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان» «کوردستان ئیستقلال جەمعیەتی»ی‌و یانەی کوردی لە دیار بەکرو ئەندامە چالاکەکانیو چالاکی سیاسی کوردەکانی لە دوای شەری جیهانی یەکەم لە ئەستەموولا کردوە.[66]

ف. ج. ئاشکون لەو کتێبەیدا، کە بۆ ڕووداوەکانی کۆنگرەی سیواس تەرخانی کردووە، هەندێ جار باسی کوردو کێشەی کورد دەکاو لە شوێنێکدا دەڵێ، کە «کێشەی کورد لە کۆنگرەی ئەرزەڕوومدا باس کرا».[67]

هەندێ سەرچاوەی تورکی هەن بە پێچەوانەی ئەم سەرچاوانەوە لە کوردو مێژووی ئەکۆڵنەوەو نوسەرەکانیان ڕێبازێکی زانستیان گرتوتە بەر بۆ لێکدانەوەی باری کوردی تورکیا. باشترین نموونەی ئەم جۆرە بەرهەمانە کتێبە بە نرخەکەی دوکتۆر ئیسماعیل بێشکچی‌یە.[68] دوکتۆر ئیسماعیل بێشکچی[69] بە شێوەیەکی زانستانەو دوور لە تەسك بینی لە باری ئابووریو کۆمەلایەتی ڕۆژهەلاتی تورکیا ئەدوێو هەوڵی دەست نیشان کردنی هۆیە ڕاستەقینەکانی ئەو بارە ناخۆشەی داوەو گەیشتوتە ئەنجامی گرنگ، کە ئەتوانن وێنەیەکی ڕاستەقینەی کۆمەڵی کوردەواری تورکیا پیشان بدەن.

دوکتۆر بێشکچی بە دوورو درێژی باسی شێوەکانی

چەوسانەوەی جوتیاران لە لایەن ئاغاو دەرەبەگ و میریەوە دەکاو رەخنە لە هەنگاوەکانی چینە دەسەلاتدارەکانی ولات دەگرێ، کە هیچیان نەکردوە لە پێناوی گۆرانی ئەم بارەدا.

نوســەری ناوبـراو دەلێ کاربـەدەسـتـانی ولات وا دەزانن بە دوورخستنـەوەی چەنـد ئاغایەك «میللەتی ئەنادوولی رۆژهەلاتیان لە دەستیـان رزگـارکـردو کامـەرانیو بەختـەوەری ئاسمـانی رۆژهەلاتی گرتوە. ئەم کاربەدەستانە نایانەوێ ئەوە تێبگەن کە ئەم جۆرە هەنگاوانە هیچ سودیان نیە». [70]

لەگـەڵ ئەوەی دوکتـۆر ئیسمـاعیـل بێشکچی کتێبـەکـەی بۆ لێکـدانـەوەی باری کۆمـەلایـەتیو ئابـووری تەرخان کردوە بەلام هەنـدێ جار هەواڵ و زانیـاری مێـژ وویش دەربـارەی رووداوە گرنگەکانی رۆژهەلاتی تورکیا تۆمار دەکا. [71]

لە کتێبـەکـەی ئوستـونگیـولیشـدا هەنـدێ هەواڵ و زانیـاری دەربارەی هەلوێستی کاربەدەستانی تورکیا بەرامبەر بە گەلی کورد بەرچـاو دەکـەوێ. ئوستـونگیـول ئەم سیـاسـەتە ریسوا دەکاو بە توندی رەخنەی لێدەگرێ. [72]

جگـە لەو سەرچـاوانـەی باسیان لێوەکرا مێژوونووس دەتوانێ کەلـك لە کتێبـەکـانی زیـاگیـوك ئەلپ «دەربـارەی هۆزە کوردەکـان»و [73] ی. ل. کەراڵ و [74] دەیـان سەرچـاوەی تر دەربارەی مێژووی نوێو هاوچەرخی تورکیا وەرگرێ.

بەشی سێیـەمی سەرچـاوە تورکیـەکـان لە لایـەن نوسـەرە کوردەکـانـەوە تۆمـار کراون. ئەم بەرهـەمـانـە کەمن و لە لایـەن ناوەرۆکیشەوە جیاوازن.

لە سییەکاندا «خۆیبون» گەلێ نامیلکەو بلاوکراوەی بە چەند زمانێك تۆمارکرد. هەندێ لەو بلاوکراوانەش بە زمانی تورکی بوون. [75] بلاوکـراوەکـانی خۆیبـون بایـەخێکی زۆریان هەیە بە تایبەتی بۆ ئەوانەی لە مێژووی هاوچەرخی کوردی تورکیا دەکۆلنەوە.

یەکەمین کتێب لە لایەن کوردێکەوە دەربارەی مێژووی کورد بە زمانی تورکی نووسرابێ. کتێبەکەی عەبدولعەزیزیامولکیە. [76] لەم کتێبەیدا عەبـدولعـەزیـزیامـولکی باسی مێـژووی کوردو سنووری کوردستان و دەســەلاتی عوسمــانی وفەرمــانــرەوایی سوڵتــان عەبـدولحـەمیـدو تورکـەلاوەکـان وکورد لە کاتی شەری جیهانی یەکەمدا و راپەرینی شێخ سەعیدوگەلێ بابەتی تردەکا. [77]

کتێبەکەی دوکتۆر محەمەد نوری دەرسیمی «دەرسیم لە مێژووی کوردستـانـدا» [78] شوێنێکی تایبـەتی لە نێـوسەرچاوەکانی ئەم بەشەدا هەیـە، چونکـە نووسەرەکەی چالاکانە بەشداری گەلێ ئەورووداوانەی کردوە کە باسیان دەکات.

لەگـەڵ ئەوەی ناونیشـانی کتێبەکە ئەوە ئەگەیەنێ، کە تەنها دەربارەی کوردەکانی ناوچەی دەرسیم بێ، بەلام ناوەرۆکەکەی گەلێ لەو ناونیشانە فراوان ترەولێـرەدا دوکتـۆر دەرسیمی باسی گرنگتـرین رووداوەکـانی کوردسـتـانـی تورکـیـا لە پێش شەری جیهـانی یەکـەمـەوە تاوەکـو کۆتـایی شەری جیهـانی دووەم دەکا. کتێبەکەی دوکتۆرم. ن. دەرسیمی سەرچاوەیەکی یەکجار بە نرخە بۆ لێکدانەوەی مێژووی نوێ و هاوچەرخی کوردی تورکیا.

ئەم سەرچــاوەیــە بە نەخشـەیـەکی ناوچـەی دەرسیم، کە، شوێنی بلاوبونەوەی هۆزە کوردەکانی تێدا دەست نیشان کراوە، دەست پێ دەکـا. دەربـارەی ووشـەی دەرسیم نوسـەر دەلێ کە ئەم ووشەیە لە دوو برگە پێك هاتوە.

لە «دەر» واتـە دەرگـا «سیم» واتـە زیـو. بە لێکـدانەوەی ئەم دەرسیم واتە دەرگای زیوین و دەلێ «دەرسیم بە راستی دەرگای کوردستـانـە». مێـژوونـووس و جوگـرافیـەکانی یۆنان لە سەدەی شەشــەمــی پێش عیـســادا بە «دەرەنـیس» ناویــان بردووە لە نووسینەکانی بێستوندا ئەم ناوچەیە بە «زوزا» ناو براوە. ئەمەش بە بیروباوەری دوکتۆر دەرسیمی لەوەوە هاتوە کە خەلکی دەرسیم بە شێوەی زازا قسە دەکەن. [79]

دوکتـۆر دەرسیمی لاپــەرەکــانی (1 ـ 17) بۆ باسی باری جوگـرافیو سنـووری دەرسیم و رووبـارەکـان و کشت و کاڵ و ئابـووری ئەم ناوچـەیـە تەرخـان کردوە. دوا بە دوای ئەمە باسی پەیدابونی دەزگاکانی دەولەتی عوسمانی لەم ناوچەیەدا دەکا (ل

17 ـ 18)و ژیانی ناوخۆی هۆزەکان و قوتابخانەو باری خوێندەواریو مەسەلەی زمان و ئایین و نەریت و جەژن و خوێن سەندنەوەو دوژمنایەتیو شایی و دەخاڵەت و گەلێ نەریتی تر لاپەرەکانی «18 ـ 42» دەگرنەوە.

بە کورتی باسی ناوچەکانی نزیك دەرسیم دەکات وەکو خەرپوت و هۆزان و ئۆڤاجیك و چوار سەنجەق و گەلێ شارو ناوچەیتر (ل 43 ـ 56).

ژمارەی دانیشتوانی دەرسیم و باری ناوچەکانی مەلاتیەو سیواس و ئەرزەنجان گرنگترین باسەکانی سەر لاپەرەکانی (57 ـ 74)ن.

راپەرینەکانی خەڵکی دەرسیم دژی سوڵتانە عوسمانیەکان تاوەکو شەری جیهانی یەکەم و باری کوردەکانی دەرسیم لە کاتی ئەم شەرداو هێرشی رووس و ئەرمەن بۆ سەر ناوچەکەو رووداوەکانی تری ساڵانی شەر لاپەرەکانی (75 ـ 120) دەگرنەوە.

ئەو راپەرینەی، کە نووسەر بە خۆی یەکێك لە بەشدارە چالاکەکانی بوو، بایەخێکی زۆری لەم کتێبەدا دراوەتێو زانیاریو بەڵگەی دەگمەنی زۆری دەربارە بلاوکراوەتەوە (ل 120 ـ 172).

لە ژێر ناونیشانی «دەرسیم لە کاتی راپەرینەکەی شێخ سەعیدا» گەلێ زانیاری دەربارەی هەڵویستی کوردەکانی دەرسیم و رووداوەکانی راپەرینەکە تۆمار کردوە (ل 173 ـ 190).

دوا بە دوای ئەمانە باسی پیلانەکانی میری بۆ دامرکاندنەوەی کوردەکانی دەرسیم دەکاو دەربارەی راپەرینی هۆزی قۆچان لە ساڵی 1927و راپەرینە گەورەکەی ئاگری داغ ئەدوێ ( ل 190 ـ 252).

لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا دوکتۆر دەرسیمی باسی خۆبوون و سەیدرەزاو شەری دەرسیم و پیلانەکانی میری بۆ قەلاچۆکردنی کوردەکانی دەرسیم دەکاو دەقی نامەی سەرکردەکانی دەرسیم بۆ «کۆمەڵەی گەلان» بە تورکیو فەرەنسی تۆمار دەکاو رووداوەکانی راپەرینی دەرسیم دەخاتە روو (ل 253 ـ 339).

شایانی باسە دوکتۆر نوری دەرسیمی هەواڵ و زانیاری وا تۆمار دەکا کە لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا دەست ناکەوێ. بە گشتی ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی بە نرخی مێژووی کوردی تورکیایە. لەگەڵ هەموو ئەوانەی باسمان کردن کتێبەکەی دوکتۆر دەرسیمی لە هەندێ هەڵەو کەلەبەر بێ بەش نیە، کە بە هیچ شێوەیەك لە بایەخەکەی کەم ناکەنەوە.

محەمەد ئەمین بۆزئەرسلان «شێرۆ» یەکێکە لەو روشنبیرە کوردانەی گەلێ خزمەتی مێژوو کولتووری کوردی کردوە.[80] لە ساڵی 1966دا بۆزئەرسلان کتێبێکی لەژێر ناونیشانی «کێشەکانی رۆژهەلات»دا لە ئەنقەرە بلاوکردەوە.[81] ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی گرنگی لێکدانەوەی باری سیاسیو ئابووریو کۆمەلایەتیو رۆشنبیری کوردەکانی تورکیایە لە دوای شەری جیهانی دووەمەوە. بەشی یەکەمی کتێبەکەی (ل 7 ـ 47) بۆ لێکدانەوەی باری ئابووری رۆژهەلاتی تورکیا تەرخان کردووە زەویو زارو داهاتی جوتیاران و، ئەنجامی بە کارهێنانی ئامێری میکانیکی لە کشت و کاڵداو، باری خاوەن زەوییە بچووکەکان و، کێشەی جەنگەڵەکان و، ئاژەڵداریتیو، شارو کۆچ کردن بۆ شارەکان و، قاچاخچیێتیو هۆیەکانیو، بازرگانێتی لە رۆژهەلاتداو، بازرگانێتی یا دەلالی؟ ئاغاو فایزو، قەرزەکانی بەنق بەکێ ئەدرێ؟ برینی رەش و باری رێگاوبان گرنگترین باسەکانی ئەم بەشەیە، کە بە شێوەیەکی زانستیانەو بێ پێچ و پەنا دەیانخاتە روو.

بابەتەکانی بەشی دووەمی (ل 48 ـ 70) کتێبەکەی بۆزئەرسلان کە لە باری کولتوری رۆژهەلاتی تورکیا ئەدوێ، ئەمانەن: ـ

خوێندن وقوتابخانەکانی گوندەکان، خوێندن بە پارە، نەخوێنەواری، مەسەلەی زمان لە رۆژهەلاتدا، کۆت و زنجیری

پروپــووچ و بێ سوودی ئیستگــەکــانی رادیــۆ. لەم بەشــەدا نووســەری ناوبــراو گەلێ زانیــاری بە نرخ دەربــارەی ژمــارەی قوتـابخـانـەو خوێنـدکاران و گوندە بێ قوتابخانەکان تۆمار دەکا. جێی خۆیـەتی لێـرەدا بڵێین کە بۆزئـەرسـلان هەمـوو بەشێ لە بەشـەکـانی کتێبـەکـەی بە ماددەیـەکی دەستووری وڵات and-yasasi دەست پێ دەکا.

وەستـایـانـە ئەو ماددانـە هەڵـدبـژێـرێ، کە مافی خوێندن و کارکــردن و تەنــدروستـی بە دانیشتــوانی وڵات دەبــەخشن و دەپـارێـزن. هەر بەو شێـوەیـەش و بێ ئەوەی تەنـانەت بە تەنها وشەیەکیش باسی ئەوە بکا، لە لێکدانەوەکانیا ئەوە دەرئەخا کە ئەو ماددانە تەنها لە سەر کاغەز نووسراون و لە ژیانی رۆژانەدا نەك تەنها پەیرەو ناکرێن، بەڵکو بە پێچەوانەیانە کار دەکرێ.

بەشی سێــەمی ئەم سەرچــاوەیــە «بــاری کۆمــەڵایــەتی رۆژهەڵات» (ل 70 ـ 98) لەم بابەتانە ئەدوێ:

یاسای کۆمەڵی داخراو، هەستی چینەکانی ژێرەوە، جیاوازی مەزەب، ژیـانی هۆز، خانـوو بەرەی رۆژهــەڵات، ژن هێنان و شیـربـایی کچ هەڵگـرتن، باری ئافـرەت و جیابوونەوە، خیزان و منـداڵ زۆری باری منـداڵان و دوژمنـایـەتیو خوێن سەندنەوە. لێرەدا بۆز ئەرسلان وەکو رۆڵەیەکی کوردەواری کە چەرمەسەری زۆری بە دەست ئەو نەخــۆشیـانـەی ئەو کۆمـەڵـەوە چێشتوە بە ووردی ئەو بابـەتـانـە باس دەکـاو رەخنـەیان لێ دەگرێو هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدا.

باری تەندروستی رۆژهەڵات بەشی چوارەمی کتێبەکەی (ل 98 ـ 116) بۆ تەرخــان کراوەو نووســەر باســی کەم خۆراکـی (یـاخـود تێـرنـە خواردن)و بێ ئاویو باری ناو ماڵ و ئەوانـەی لە تاریکیــدا دەژین و، ئەوانــەی لەگــەڵ مەڕو ماڵاتــدا دەژین، پزیشـك و چارەسـەرکـردنی نەخۆشیو، منداڵ بوون و بێدایانی وگـەلێکی تـر دەکـا، لێرەشدا بۆزئەرسلان وەکو هەموو بەشەکانی تری کتێبەکە گەلێ زانیاری بە کەڵك تۆمار دەکا.

لە بەشی پێنجەمدا (ل 117 ـ 135) باسی پەیوەندی میریو دانیشتوانی رۆژهەڵات دەکاو گرنگترین باسەکانی ئەم بە شەش ئەمــانــەن: هەڵــوێـــســتــی خەڵــك بەرامبــەر بە میــریو هەڵوێستی میری بەرامبەر بە خەڵك و، پەیوەندی فەرمانبەران بە هاووڵاتیانەوە، جەنابی یاسا، ئەنجومەنی پیرانی دێو جەندرمە لە رۆژهەڵاتدا. بوزئەرسلان رەخنە لە سیاسەتی کاربەدەستانی وڵات بەرامبـەر بە رۆژهــەڵات دەگـرێو وێنـەیـەکی راستەقینەی باری سیاسی ناوچەکە دەکێشێ.

گرنگترین باسەکانی. بەشی شەشەمی سەرچاوەی ناوبراو، کە دەربـارەی «دیمـوکـراسیو سیاسەت لە رۆژهەڵاتدا». ئەمانەن: ئومێـدە کوژاوەکـان و، دیمـوکـراسی ئابـووری بەدی نایە، باری دیمـوکـراسی لە رۆژهــەڵاتــدا، پارتـە سیـاسـەکان و سەرچاوەی دەسەڵاتیان، بە کار هێنانی چەك لە سیاسەتداو لە هەڵبژاردنەوە بۆ هەڵبژاردن. لێرەدا باسی ئەوە دەکا، کە پارتە سیاسەکان تەنها لە کاتی هەڵبژاردنا رۆژهەڵات و هاووڵاتیانی ئەم ناوچەیەیان بیر دەکـەوێتـەوەو پەیمـان و گفتی زۆروبـڵاو بە سەر خەڵکدا دابەش دەکەن، هەر کە هەڵبژاردن تەواو بوو، جارێکیتر ئەم ناوچەیە دەچێتە گۆشەی لەبیر کردنەوە. جگە لەمە باسی دژواری پارتە سیاسیەکان و وێکدا چوونە خوێناویەکانیان دەکا.

لەبــەشی حەوتـەمـدا (ل 146 ـ 151) کە بۆ لێکـدانـەوەی بەشی رۆژهــەڵات لە پلانــەکــانی پەرەپێــدانــا تەرخـان کراوە نووسەرباسی رێو بان و چاککردنی کشت و کاڵ و پیشەسازیو دروست کردنی کۆشك و تەلار بۆ دەزگا میریەکان دەکا.

بەشی هەشتــەم (ل 151 ـ 175) بۆ دەست نیشــان کردنی رێگــای پەرەپێــدان و پێش خستنی رۆژهــەڵات تەرخـان کراوەو رەخنــە لە پلانــەکــانی پەرەپێدان دەگـرێ کە پێـویستیـەکـانی رۆژهەڵات دەخنە پشت گوێ.

لە بەشی نۆیەمیشدا «ل 176 ـ 189» نووسەر هەوڵ ئەدا رێگەی دەرچوون و رزگار بوون لەو بارە ناخۆشە دەست نیشان بکـات و تەنهـا رێگـە لەوەدا ئەبینێ کە ئەبێ ئابـووری وڵات لە ژێر چاودێری راستەوخۆی دەوڵەتدا بێ.

بەشی دەیەم، کە دوا بەشی ئەم کتێبە نایەبەیە لە ژێر ناونیشانی «ڕۆژهەڵات لە ڕۆژنامە نووسی‌یدا». (ل 189 ـ 204) تۆمار کراوە. لەم بەشەدا بۆزئەرسڵان هەندی وتەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تورکیا دەربارەی ڕۆژهەڵاتی وڵات دێنێتەوە، وەکو ڕۆژنامەکانی «میللەت»و «یۆن»و «ئونچو»، گۆڤارەکانی «بارش دونیاسی»و «میللی یۆڵ»و گەلێکی تر.

ئەم کتێبەی محەمەد ئەمین بۆزئەرسڵان سەرچاوەیەکی بە نرخەو مێژوونووس دەتوانێ کەڵکی زۆری لێوەرگرێ.

جگە لەو کتێبەی بۆزئەرسڵان گەلێ بەرهەمی تری دەربارەی مێژووو ئەدەبی کورد هەیە. بۆ نموونە لەو کتێبەیدا کە لە ساڵی 1964دا دەربارەی دەرەبەگایەتی بلاوی کردەوە، گەلێ زانیاری دەربارەی ئاغاو دەرەبەگ لە ناو کوردا هەیە.[82] هەروەها (شەرەفنامە)و (مەم و زین)ی کردوە بە تورکی. جگە لەوە بەشێکی کتێبەکەی ئیبن و لئەزرەقی «مێژووی ئامەدو میافارقین»ی کردووە بە تورکی‌و لە ژێر ناونیشانی «مێژووی کوردی مەروانی»یدا تۆماری کردووە.[83] بۆز ئەرسڵان پێشەکیەکی کورتی بۆ نووسیوەو گەلێ پەراوێزی بە نرخی بۆ پێشەکی چاپە عەرەبیەکەو دەقی کتێبەکە نووسیوە، کە ژمارەیان بە سەر یەکەوە (285) پەراوێزەو کتێبەکەی بە ڕاستی دەوڵەمەند کردوە. سەرباری ئەمانە شێرۆ گەلێ کتێب و لێکۆڵینەوەی دەربارەی مێژوو وزمان و ئەدەبی کورد تۆمارکردوەو[84] گەلێ کتێبی بە نرخشی دەربارەی مێژووی وڵاتان و گەلانی جیهانی نووسیوە یاخود وەرگێراوەتە سەر زمانی تورکی[85].

مەحمود باکسی ڕۆشنبیرێکی تری کوردە کە زیاتر لە (15) ساڵە خەریکی بلاوکردنەوەی کتێب و نامیلکەیە دەربارەی مێژووی کورد[86].

مەحمود باکسی لە ژێر ناونیشانی «کورتەی مێژووی کورد»دا کتێبێکی لە «ئیسڤیچ» واتە لە سویدا بلاوکردەوە[87]

نووسەر بە پشتیوانی (22)سەرچاوەی تورکی‌و فەرەنسی‌یەوە هەوڵی داوە کورتەیەکی مێژووی کورد بخاتە ڕوو، ژمارەی کوردەکان بە نزیك (16) ملیۆن لە قەڵەم ئەدا[88].

بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بۆ کورتەیەکی مێژووی کورد لە کۆنەوە تاوەکو سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەیووبیەکان تەرخان کراوە لەم بەشەدا باسی ئیمپراتۆریەتی میدیو بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بە ناو کوردەکاندا دەکاو هەندێ زانیاری دەربارەی میرنشینەکانی شەددادی‌و حەسنەوی‌و مەروانی‌و ئەیوویی تۆمار دەکا. (ل1ـ 11)

دوا بە دوای ئەمە باسی بلاوبوونەوەی دەسەڵاتی عوسمانی بە سەر کوردەکانا دەکاو لە شەڕی چالدێران ئەدوێ. هەروەها هەڵوێستی میرە کوردەکان لە سوڵتان سەلیم دەست نیشان دەکا. زۆر بە کورتی باسی کورد لە سەدەی نۆزدەهەمداو ڕاپەڕینەکانی ئەم سەدەیە دەکاو دەزگای سوارەی حەمیدییە بە شێوەیەکی زانستانە دەنرخێنێ‌و لە پەیوەندی کوردو تورکە لاوەکان ئەدوێ‌و ڕەخنە لە سیاسەتەکەیان دەگرێ (ل12 ـ 33).

لە بە شێکی تردا (ل34 ـ 43) باسی پەیوەندی میللەتی کوردو کەمالیەکان دەکاو یارمەتیەکانی بۆ بزوتنەوەی کەمالیەکان لە جەنگی ڕزگاریدا پیشان ئەداو خراپەکاری‌و سیاسەتی کەمالیەکان بەرامبەر بەکورد پیشان دەدات.

هەروەها گەلێ زانیاری دەربارەی ڕاپەڕینەکانی شێخ سەعیدی پیران و ئاگری داغ و دەرسیم تۆمار کردووەو بە کورتی باسی ڕێکخراوی خۆیبونی کردوە (ل44 ـ 58).

لاپەرەکانی (59 ـ 66)ی بۆ ڕووداوەکانی کۆماری مەهاباد تەرخان کردوە.

بەشێکی کتێبەکەشی بۆ باسی زمانی کوردی‌و دیالیکتەکانی‌و ئەدەب و فۆلکلۆری کوردی‌و شاعیری کورد جگەرخوێن و ئایین و باوەڕ لە ناو کوردا تەرخان کردوە (ل 67 ـ 85).

دوا بەشی کتێبەکەی (ل86ـ 149) کە گەورەترین بەشەکانیەتی مەحمود باکسی بۆ مەسەلەی کورد لە تورکیای تەرخان کردوە. لێرەدا نووسەر باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و ڕۆشنبیری کورد شی دەکاتەوەو هۆیەکانی ئەم بارە گرانە

دەست نیشان دەکاو هەوڵی دەست نیشان کۆماندۆس کردنی ڕێگای چارەسەر کردنی ئەداو بە دوورو درێژی باسی هێرش و دەست درێژ یەکانی کۆماندۆس بۆ سەر ناوچەکوردەکان دەکاو گەلێ نموونەی دڵ تەزێن لەم بارەیەوە دێنێتەوە.

شایانی باسە کە مەحمود باکسی زوربەی لایەنەکانی ئەم بەشەی لە ساڵی 1971 دا لە نامیلکەیەکی سەربە خۆدا تۆمار کردبوو[89]. جگە لەو بەرهەمانەی ڕۆشنبیری ناوبراو چەند کتێبێکی تریشی بڵاوکردوەتەوە[90]. لە ساڵی 1975 دا لە ئەنقەرە کتێبێکی بەنرخ دەربارەی ڕاپەڕینی قۆچگیری لە لایەن «کۆمەڵ»ەوە تۆمار کرا[91].

هۆی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە لە پێشەکیەکەیدا ڕوون کراوەتەوە بە وەی کە لە سەر چاوەکانی مێژ ووی هاوچەرخی تورکیادا ڕووداوەکانی ئەم ڕاپەڕینە بە شێوەیەکی شێواو دەخرێنە بەر چاو. بۆ پەرچ دانەوەی ئەوبارەو دەرخستنی سروشتی ڕاستەقینەی ئەم بزوتنەوەیە کۆمەڵ بڕیاری داوە ئەو هەواڵانەی لە سەرچاوەکاندا دەربارەی ڕاپەڕینی قۆچگیری تۆمار کراون کۆ بکاتەوە لە توێ کتێبێکی سەربە خۆدا لەگەڵ پەراوێزو ڕوون کردنەوەی پێویستدا تۆمار بکا[92].

شایانی باسە زانیاریەکانی ئەم کتێبە لە کتێبەکانی (ئەتاتورك و[93] نوری دەرسیمیو[94] ڕەحمی ئەپەك و[95] کەنعان ئێسینگین[96])ەوە وەرگیراون. هەروەها (40) پەراوێزی بە نرخیان بۆ نووسیوە. بایەخی ئەم سەرچاوەیە لەوەدایە کە بیرو باوەڕی چوار بەشداری سەرەکی ئەم ڕووداوەی تێدا تۆمارکراوە. نوری دەرسیمی لە گەڵ شۆڕشگێڕەکانی قۆچگیریداو ئەو سیانەکەی تر لە دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەدا، بۆیەکا ئاگایان لە هەموو ڕووداوەکانی هەبوو. لە پەراوێزەکانیشدا گەلێ زانیاری بە نرخ دەربارەی «کوردستان تەعالی جەمعیەتی»و سەرکردە چالاکەکانی تۆمار کراوە. هەروەها گەلێ باسی شێخ عەبدولقادرو خەلیل خەیالی و دوکتۆر محەممەد شوکری سەکبان کراوە. بۆ نموونە ئەو دوکتۆر محمد شوکری سەکبانەی، کە لە دوایدا داوای تواندنەوەی کوردی دەکرد بە تایبەتی لەو کتێبەیدا کە لە ساڵی 1933 بە زمانی فەرەنسی بڵاوی کردۆتەوەو سەیری لێ ئەهات کە کورد لە تواندنەوە دەترسێ، چونکە بەلای ئەوەوە تواندنەوەی بێ هێزەکان لە لایەن هێزدارەکانەوە بەختەوەریان دەکا.

هەروەها بە لای ئەمەوە داواکاری حویندن بە زمانی کوردی لە سەر بناغەیەکی پتەو دانەمەزراوە[97]. هەر ئەو سەکبانە بە «ئیدیۆلۆژ و خەباتکەری ئاگرینی کۆمەڵەی هیوا دائەنرا»، بەڵام بە وتەی نووسەرانی کۆمەڵ لە دواییدا «سەد لە سەر سەد بیری گۆڕیو بوو بە کابرایەکی ئینکارچی»[98]. واتە ئینکاری ڕابووردووی خۆی دەکرد. شایانی باسە کە مامۆستای خوالێخۆشبوو ڕەفیق حیلمی کاتی خۆی بەر پەرچی بیروباوەڕە ناڕاستەکانی سەکبانی داوەتەوە[99].

کتێبی «لە دونیادا کورد هەیە» لە (242) لاپەڕەدا تۆمار کراوە.[100] بەشی یەکەمی بۆ مێژ ووی کورد لە کۆنەوە تاوەکو کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم و بەشی دووەمی بۆ مێژ ووی کورد لە کاتی جەنگی ڕزگاریخوازی تورکیاداو بەشی سێیەمیشی بۆ کۆنفرانسی لۆزان و بەشی چوارەمی بۆ ڕاپەڕینەکانی کورد لە 1923 وە بۆ 1945 و بەشی پێنجەمی بۆ باری کورد لە دوای شەڕی جیهانی دووەمەوە تاوەکو سەرەتای حەفتەکان تەرخان کراون. هەروەها باسی زمان و ئەدەب و فۆلکلۆری کوردان دەکا. بەگشتی زانیاریەکانی ئەم کتێبە دووپات کردنەوەی زانیاریەکانی سەرچاوەکانی سەرەوەیە.

لەسەر هەمان شێوە کتێبێك دەربارەی زانای پێشکەوتنخوازی تورك دوکتۆر ئیسماعیل بێشکچی لە ساڵی 1973 دا بڵاوکراوەتەوە[101].

کتێبەکەی دوکتۆر شڤانیش گەلێ زانیاریو بۆ چوونی بەکەڵکی دەربارەی مێژ ووی کورد بە گشتیو کوردی تورکیا بەتایبەتی تێدایە.[102] ئەمانەو دەیان لێکۆڵینەوەو وتارکە لە ڕۆژنامەو گۆڤارە تورکیەکاندا بڵاو کراونەتەوەو مێژ وو نووس

ـەتـوانێ کەڵکی زۆریـان لە لێکـدانەوەی ڕووداوەکانی مێژووی
ـوی‌و هاوچـەرخی کوردا لێ وەرگـرێت جێی خۆیـەتی لێـرەدا
ـوتـرێ، کە نووسـەری ئەم چەنـد دێـرە دەیـان سەرچـاوەو
ـێکـۆڵینـەوی تری تورکی هەیـە، کە دەستی پێ نەگـەیشتـوەو
ـەیتوانیوە دەربارەیان بدوێت.

پەراوێزەکان:

«Hayat ansiklopedisi» C. 7, Istanbul, (1
1932, S. 2966.

«Düstur» 3 - cu tertip, C. 1 - 29 (2
Istunbul Ankara, 1929 - 1948

3) عەبدولجەبار قادر غەفور، بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی تورکیا لە نێوان هەردوو شەڕی جیهانیدا، مۆسکۆ، 1977، ل ل 72 ـ 73 «بە زمانی ڕووسی».

4) ل. ئەرناتسکەیاو، ك. مەلاخۆڤسکی، دەربارەی دەستووری ساڵی 1961، لە کتێبی «کێشەکانی تورکیای هاوچەرخ»دا، مۆسکۆ 1963، ل ل 111 ـ 112.

«بەزمانی ڕووسی».

Turkiye Cumhuriyeti Anayasasi, (5
Ankara, 1961.

«Düstur» Cilt 8, Ankara 1928, SS. 1668 - 1970 (6

7) سەرچاوەی پێشوو.

«Düstur» Cilt 9, Ankara 1928 , SS. 13 - 14 (8

«Düstur» Cilt 10, Ankara 1934, S. 1793 (9

«Düstur» Cilt 15, Ankara 1934, SS. 1156 1165 (10
دەربارەی پرۆژەی یاساکە تۆما بوا زانیاری بە نرخی تۆمار کردوە.
بڕوانە:
Rambout L., Les Kurdes et Le
droit Paris, 1947, PP. 32 - 33.
هەروەها بڕوانە:
دوکتۆر م. ئە. ئەسراتیان، سیاسەتی کاربەدەستانی تورکیا بەرامبەر دانیشتوە کوردەکان، لە گۆڤاری «کورتە هەواڵەکانی ئامۆژگای میللەتانی ئاسیا».
بەرگی «30» مۆسکۆ، 1960، ل ل 131 ـ 134.
«بەزمانی ڕووسی».

«Dustur» C - 24, Ankara, 1943. SS. 9 - 13 (11

«Istatistik yı[illegible]gi (12

Istatistik yilligi, C. 4, Ankara 1931 (13
SS. 63 - 64.

Small Statistical abstract of Turkey, (14
No 291, Ankara, 1948, P. 86.

Küçük Istatistik yillligi, Nr 330, (15
Ankara, 1951 - S. 60.

16) کۆماری تورکیا، مۆسکۆ، 1975. ل ل 30 ـ 31.
«بەزمانی ڕووسی».

Istatistik yillligi, C. 5, Nr 21, Ankara, 1931, 1932, SS.
70, 71. (17

Istatistik yilligi, C. 4, Ankara 1931, SS. 63 - 64 (18

Istatistik yillligi, C. 20, Ankara, 1952, SS. 96 - 98. (19

Istatistik yillligi, C. 4, SS. 104 - 105. (20

21) د س. زالڤریێف، ئەنادۆلی ڕۆژهەلات، تبیلیس، 1936، ل 30 «بە زمانی ڕووسی».

Istatistik yillligi, C. 4, S. 131 (22

Istatistik yillligi, C. 5, SS. 64 - 65, 130. (23

Ataturk K. M., Nutuk - Gazi Mustafa (24
Kemal tara Findan Cumhuriyet Halk
Firkasinin 15 - 20 tesrinievvel 1927
tarihleri arasinda toplanan Ikinci
Buyuk Kongresinde Soylen mistir
Cilt I - III, Ankara - Istanbul 1928 - 1934.

هەروەها بڕوانە:

Ataturkun Soylev Ve demecleri,

C. I - 4, Ankara, 1961 - 1964.

Ataturkun Ozel mektuplari, istanbul, 1961.

(25 Ataturk, Nutuk, C. I, SS. 70, 83, 118, 125

هەروەها: Cilt 2, SS. 442, 629, 630.

26) موستەفا کەمال ڕێگەی تورکیای نوێ، بەرگی یەکەم، مۆسکۆ، 1929 ل ل 234 ـ 238.

«بە زمانی ڕووسی».

27) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل 255.

28) هەمان سەرچاوە، ل 203.

(29 Inonunun Soylev Ve demecleri, Istanbul, 1946.

(30 «Milliyet» ,N, 1936, 31. 8. 1930

(31 «Milliyet» ,N, 1955, 19. 9. 1930

(32 «Milliyet» ,N, 17. 10. 1931

33) گۆڤاری «هەواڵەکانی ئەکادیمیای زانستی یەکێتی سۆڤیەت»، ژمارە، 8 مۆسکۆ 1949، ل 101 «بە زمانی ڕووسی».

34) بڕوانە ڕۆژنامەکانی:

«Kim» 24. 4. 1961.

«Hurriyet» 25. 10. 1960.

35) ڕۆژنامەی «تان» یش لەم بارەیەوە نووسیبووی (دەرسیم مەلبەندی بزوتنەوەکە ویران دەکرێ و دانیشتوەکانی دوور ئەخرێنەوە بۆ ناوچەکانی تری وڵات.. بەم شێوەیە «تورکەکانی» دەرسیم دەگەڕێنەوە باوەشی میللەتەکەیان».

لە دوکتۆر ئەسراتیان، سەرچاوە ناوبراوەوە، ل 136 وەرگیراوە.

(36 «Son Posta» 11. 4. 1946.

37) بۆ نموونە بڕوانە:

«Zafer» 22 - 24. 10. 1973.

«Cumhuriyet», 11 - 13. 9. 1960 7. 5. 1961.

«yeni Akis» Sayi: 1, agustos, 1966 /

Sayi: 2, Eylul, 1966.

«Hurriyet», 26. 9 - 1960: 23. 10. 1960 I

20 - 27. 12. 1960.

(38 Kirzioglu M. F., Her bakimdan Turk olan Kurtler, Ankara, 1964.

(39 «Deng» dogunun Sesidir, yili 1, Sayi: 2, 15 Mayis 1963, S. 12.

(40 ALi Kemali, Erzincan, Tarihi, Cografi, Iktisadi, etnografi, Idari, Ihsai tetkikat tecrubesi, Erzincan, 1932.

41) سەرچاوەی پێشوو، ل 197.

42) هەمان سەرچاوە ل ل 163 ـ 164.

43) هەمان سەرچاوە، ل ل 180، 196 ـ 197، 208.

(44 Nesat Hakki, Derebeyi Ve Dersim, Ankara. 1931.

45) سەرچاوەی پێشوو، ل 10.

46) هەمان سەرچاوە ل 11.

47) هەمان سەرچاوە، ل 42.

(48 Firat M. S. Dogu Illeri Varto tarihi Ankara , 1961.

49) سەرچاوەی پێشوو، ل ل 118 ـ 125.

50) هەمان سەرچاوە، ل ل 139 ـ 147.

51) هەمان سەرچاوە، ل ل 131، 149.

(52 Behcet Cemal, Seyh Sait Isyani, Istan bul 1955.

53) سەرچاوەی پێشوو، ل ل 29 ـ 35.

54) هەمان سەرچاوە، ل 58.

55) هەمان سەرچاوە، ل 52.

56) هەمان سەرچاوە، ل 92.

57) Metin Toker, Seyh Sait Ve Isyani, Ankara, 1968.

58) مەتین تویکەر زاوای عیسمەت ئینەنۆ بوو.

59) Metin Toker, Seyh Sait Ve Isyani S. 17

60) سەرچاوەی پێشوو، ل ل 60 ـ 61 ، 85.

61) هەمان سەرچاوە، ل ل 49 ـ 52.

Aydemir, S. S. Tek adam, C. 1 - 62. Istanbul 1963 - 1964.

63) Aydemir, S. S., Ikinci adam, Ismet Inonu, C. I - 2, Istanbul, 1968.

64) Tunaya, T. Z., Turkiyede Siyasi Partiler (1859 - 1952), Istanbul, 1963.

65) سەرچاوەی پێشوو، ل 429.

66) هەمان سەرچاوە، ل ل 30، 429 ـ 431، 546.

67) Askun, V. C. Sivas Kongresi, Istanbul, 1964, S. 73.

68) Ismail Be Sikci, Dogu Anadolunun duzeni, Sosyo - ekonommik Ve etnik temelleri, Ankara, 1970.

69) دوکتۆر ئیسماعیل بێشکچی لە ساڵی 1939 لە شاری ئیسکیلیپ لە ویلایەتی چوروم هاتوەتە دونیاوەو خوێندنی لە چوروم تەواو کردوەو لە ساڵی 1962دا کۆلێجی زانستە سیاسیەکانی تەواوکردوە. لە ناوچەکانی بتلیس و هەکاری سەربازی بە سەر بردوەو شارەزایی لەگەڵ کۆمەڵی کوردەواریدا پەیداکردوە. دوای وەرگرتنی بڕوانامەی دوکتۆرا بوو بە مامۆستای زانستی کۆمەڵایەتی لە زانکۆی ئەرزەڕوومەداو کەوتە لێکدانەوەی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردەوە. دوکتۆر بێشکچی خاوەن بیرێکی پێش کەوتوخوازەو لە سەر کتێبی ناوبراو خرایە بەندیخانەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

Ismail Be Sikci Ve Bazi Kurt Koylerinin Iddianameleri, Nr - 6 UPPSala, 1973. SS. 3 - 5.

70) Be Sikci, I., Dogu Anadolunun duzeni, SS. 60, 97 - 101.

71 ـ سەرچاوەی پێشوو، ل 308.

72) چاپە تورکیەکەی بەم ناونیشانەیە:

Ustungel, S., Sava, S yolu, Sofya, 1950

واتە «ڕێگای خەبات». لێرەدا چاپە ڕووسیەکەی بە کارهێنراوە. بڕوانە:

س. ف. ئوستونگیول، لە زیندان و لە «سەربەستیدا» مۆسکۆ، 1952.

73) Ziya Gokalp, Kurt asiretleri Hakkinda Sosyolojik Incelemeler, KOMAL, Ankara, 1975.

74) Kara L. E. L, Turkiye Cumhuriyeti tarihi (1918 - 1960), Istanbul, 1963.

75) «تورکیەدە کوردلرك قتل عامی» قاهرة، 1930

هەروەها.

«تورك عفو عمومیس قارشیسندە کوردلر سنە 1933» کورد خویبون جمعیتی نشریاتندن، عدد 8.

76) عبدالعزیز یاملکی، کوردستان و کورد اختلاللری، جلد 1، تهران، 1946.

77) مامۆستا دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد گەلێ زانیاری دەربارەی عەبدولعەزیز یامولکی و بەرهەمەکانی تۆمار کردووە. بڕوانە:

دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، بەغدا، 1983 ل ل 136، 138، 226.

78) Dr. M. N. Dersimi, Kurdistan tarihinde Dersim, Halep, 1952.

79) سەرچاوەی پێشوو، ل 1.

80) ژمارەی بەرهەمە چاپکراوەکانی محەمەد ئەمین بۆزئەرسلان (شێرۆ) ئەگەنە (17) کتێب و دەیان لێکۆڵینەوەو ووتار کە لە رۆژنامەو گۆڤارەکانا تۆماری کردۆە.

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم رۆشنبیرە بروانە.

نەریمان (لە نووسەرە دڵسۆزە ئاوارەبووەکانمان محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان «شێرۆ») ـ کاروان ـ ژمارە (19). نیسانی 1984، ل ل 72 ـ 73.

81) Mehmed Amin Bozarslan, Dogunun Sorun Lari, Ankara, 1966.

82) M. A. Bozarslan, IsLamiyet Acisindan Seyhlik - Agalik, Ankara, 1964.

83) IBnul - Ezrak, mervani Kurt Leri tarihi, Turkcesi: M. E. Bozarslan, Istanbul, 1975.

84) مامۆستا نەریمان لە ووتارەکەیدا دەڵێ کتێبێکی دەربارەی کۆماری مهاباد لە ساڵی 1967دا بڵاوکردوەتەوە.

بروانە: ـ «کاروان» ژمارە ـ 19 ـ نیسان 1984، ل 73.

85) وەکو کتێبەکەی جەواهیر لال نیهرۆ:

Dunya tarihinden Parcalar.

86) رۆشنبیری کورد مەحمود باکسی نزیکەی (15) ساڵە لە ئەوروپا دەژی، لە سەرەتاوە لە ئەڵمانیاو پاشان لە سوید.

87) Mahmut Baksi, Kisaca Kurt tarihi Isvec, 1972.

88) سەرچاوەی پێشوو، ل 3.

89) Mahmut Baksi, Turkiyede Kurt Sorunn, Isvec, 1971.

90) هەروەها بروانە:

M. Baksi, Sadi Alkilic Davasi, Istanbul, 1969.

M. Baksi, Mezra Botan, Istanbul, 1968.

M. Baksi, Vatandas, Hakki, Berlin, 1970.

91) Kocgiri Halk Hareti (1919 - 1921) KOMAL, Ankara, 1975.

92) سەرچاوەی پێشوو، ل ل 5 ـ 19.

93) Kemal Ataturk, Nutuk, C. I - III.

94) Dr. Dersimi, M. N, Kurdistan tarihinde Dersim.

95) Rahmi Apak, Turk Istikial Harbi, Ic Ayaklanmalar (1919 - 1921) Ankara, 1964.

96) Kenan Esengin, Milli Mucadelede Ic Ayaklanmalar, Ankara, 1965.

97) کتێبەکەی دوکتۆر شوکری سەکبان بەم ناونیشانە بوو:

Dr. Ch. Sekban, Le Question Kurde Paris, 1933.

هەروەها بروانە:

دوکتۆر عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، ب. ش، 1973، ل 68 ـ 69.

98) Kosgiri Halk Hareketi, SS. 33 - 34.

99) بروانە: دوکتۆر کەمال مەزهەر، مێژوو، ل 331.

100) Dunyada Kurt Vardir, DDKOnun Savunmasi, Uppsala, 1973.

101) Ismail Besikci ve Bazi Kurt Koylulerinin Iddianameleri, Uppsala, 1973.

102) Or. Sivan, Kurt millet haraketleri ve Irakta Kurdistan Ihtilali, Stockholm, 1975.

# شاری خنجیلانەی پێنجوێن لە مێژوودا

**غفور میرزا کریم**

مرۆڤی کورد هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە بە بیری تیژ ی و ئاسۆی دەماخی بەرفراوانی بەشان و بازووی بەهێزو ئەستووری لەم خاك و نیشتیمانەیدا بۆ مانەوەی بوونی وە دابین کردنی پێویستەکانی ژیانی وەبەرەوپێش چونی لە کاروانی شارستانیەتی و ئاوەدانی دا هەرگیز لە خەبات کردن بەرامبەر سروشت وەزەبرو زەنگەکانی وەدژ بەزۆرداران وەچەرخی سپڵەو ناهەموار نەوەستاوەو سستی نەنواندووە.

بەداخەوە لە کێومال کردن بە ناو ئەرشیفی رۆشنبیری کوردی هەژارو کەساس دا بۆدیاری کردنی مێژووی شاری پێنجوینی بێ ناز کەوتوو کەرەسەیەکی بەپێزوو باس و خواستێکی ئەوەندە چروو پرمان دەستگیر نابێت تابتوانین بەووشکە کەڵەکی بەدروستی بناغەو دارایی باسەکەمانی پێ دابمەزرێین وە برازێنینەوە تا ئەم شارە خنجیلانەیەی سەرسنووری ناوچەی شلێرو ناوخوان لووتکە لە ئاسمان چەقیوی پێنج وێنەی دڵگیر جێگاو شوێنی دیای کراوی نازداری لە ناو کۆمەڵە شارەکانی کوردستاندا بە شکۆمەندانە بکاتەوە وەبە مافی سروشتی و تایبەتی خۆی شادو یەختەوەر بێ وەدەست لە مل هیواو ئومێدی بەرزی بکا..

راستت ئەوی مەگەر لەم بوارو هەڵوێستەدا هەرکتێبە بە نرخەکەی مێژوونووسی بەرزی کورد ئەمین زەکی بەگ بە ناونیشانی (مێژووی شاری سلێمانی) ببێتە فریاد رەس و چاوساغ و سەرچاوەی شیکردنەوەو لێکدانەوەی و روون کردنەوەی باسەکەمان هەرچەندە بۆشمان هەیە کە نوقلانە بۆ پاشەرۆژ ی رووناك و سەرکەوتوش لێ بدەین وەهیواو ئومێد نەبڕین و چاوەڕوانی ڕەنجی پڕ کۆششی ڕۆشنبیرانی کورد بکەین تا بەیەکجاری سەرتۆپی نەزانبینی ئەم باسەمان بۆ دادڕن دەرگای نەهێتنی مان بۆ پشکێتن وەئاسۆی لیڵی ئەم چمکە تاریکیە مێژوویەمان بۆ رووناك بکەنەوە تا تاسەو ئارەزووی خوێنەرانی کورد بشکێ وە شاری پێنجوین کوردستان بە نازداری لە پێشەڵانی کۆمەڵگەی کوردیدا

بەسەرلووتکەی مێژووەوە لەنگەر بگرێوە بێتیە مایەی شانازیو پایەی بەرزی بۆ رۆڵەکانی.

بەپێی جێگاو شوێن شاری پێنجوین ئەکەوێتە ناوچەرگەی هەرێمی شارەزوورەوە ئەم هەرێمەی یە قەبارە گەورە بەخاك و زەوی خێرو پیت و بەمێژوو ناسراووی بنکەی شارستانیەن و ئاوەدانی لەم سەرزەمینەدا ناوبانگی دەرکردووە. کە گەریدەدەی ناسراوی سەردەمی ئیسلامی (یاقوت حەمەوی) بەم چەشنەی خوارەوە سنورەکەیمان بۆ دیاری ئەکاو ئەڵێت: «هەرێمی شارەزوور ئەکەوێتە نێوان هەولێرو هەمەدانەوە» جا لەبەرئەوەی هەردوو شارەکە لە شارە کۆنەکانی کوردن بۆیە رەپ و راست ئەتوانین بڵێین کە ئەم رووبەرە سنووری شارەزوورە کە بی گومان ئەگەر لەپێش زایینی یشدا بەرفراوان و گەورەتر نەبووبێ هیچ کەمتر نەبووە، جا ئەگەر بمانەوێ لە ریشەی مێژووی ئەم شارە دڵ رفێن و خەم رەوێنەی پر لە باخ و باخاتە بەدروستی بگەین پێویستە جاوێك بە مێژووی دێرینی هەرێمی شارەزووردا بخشێنین.

شیاوی سەرلێ دانە مێژووی ئاوەدانی و شارستانیەت و بناغەی دامەزراندنی دێهات و شار هەڵبەستنی جۆگەو بنیات نانی پردو داهێنانی دیاردەی پێشکەوتن وەسەرکەوتنی کاروانی مرۆڤایەتی لەم مەڵبەندی شارەزوورەدا ئەگەرێتەوە بۆچل یا پەنجا سەدە لەمەوبەر کەبەپێی بەڵگەنامەی مێژوویی لەم مەڵبەندی شارەزورەدا بناغەی نزیکەی (156) شاری گەورە هەبووە وەشوێنەوارەکانی یە زەقی بینزاون، ئەمە جگەلەوەی کە ئەم ناوچەیە لە چەقی رێگای هاتووچۆی نێوان مەدائن وە هەمەدان دابووە وەهەروەك پردی نێوان رۆژهەلات و رۆژ ئاوادا هەڵکەوتبوو کە شاری «نیم ئەزراە» کە گولعنبر (خورماڵی ئێستا) بە نیوەرێی ئەم رێگا دوروو درێژ وو پانە ئەژمێردا.

لەبەر ئەم هۆیانە بە گشتی هەموو پارچەوپێ دەشت و ناو دۆڵ و دەوەنگ وکێو کەژی ئەم ناوچەیە بەرگی ئاوەدانی و شارستانیەتی پوشی بوە وەبە مەزنی و گرنگی ناویان دەرکردووە.

بەم چەشنە ناوچەی پێنجوینیش لەم بوارە مێژوویدا بەشی خۆی لە پنیش کەوتن وە ئاوەدانی دا هەمیشە بەر کەوتووە هەرچەندە لەناو دوو توێی ئەم رۆژگارەدا دیاردەیەکی گرنگ یا رووداوێکی مەزن یا خاڵێکی پرشنگداری وای بە خۆوە نەدیوە کە ناونیشانی شکۆو ئەورەنگی دەربخاوە پایەو پلەی بگەیەنیتە سەرپۆپەی بەرزی، یا ئەستێرەی بەختی ئاسمانی لیل و تاریکی رووناك بکاتەوە.

بویە لە مێژووی پێش زاینن دا پنجوین ناوی یە ئاسایی وەبەم چەشنەی خوارەوە دی «قەراڵی ئاشوریەکان» ئاشور ناصر پال پێش زایین بە چەند سەدەیەك بە لەشکرێکی بێ شوماری بەهێزەوە بەشەر بە ناودەربەندی یازیاندا تێ بەر ئەبێت بەهەموو توانایەوە هێرش بۆسەر (زاموا، لولوی یان) دانیشتووی هەرێمی شارەزوور ئەبات جا لەبەر ئەوەی بەرگری دانیشتوان ئەوەندە بەئین و تیژ بوو ئاشووریەکان بە سێ هێرش توانیان ئەم وولاتە بگرن. هێرشی یەکەم پاش داگیرکردنی دەربەندی بازیان بەسەرگردی گۆیاڵەدا ئەچنە وولوبلاخ وگردەبۆر. لە هێرشی دووەمدا دۆڵی سورداش ئەگرن وەلەپاشدا ئەگەرێنەوە بۆ قەلای موان کە تیایا پایگایەکی سپایی دائەمەزێنن وەلە هێرشی سێ هەمدا لە موانەوە پەلامار ئەدەن وەئەگەنە ناڵ پاریز وپێنجوین کە دانیشتوانی ناوچەکە بە توندی بە رووياندا ئەتەقێتەوەو کوشتارێکی زۆریان لێ ئەکەن بەلام لەگەڵ ئەمەشدا لەشکری ئاشوری هەرمل ئەنێن بۆ پێشەوە تا دەشتی قزلجەو ناوچەی مەریوان راناوەستن، بەلام لە ئەنجامدا.. بەهۆی بەرگریی بەتینی دانیشتوانەوە ئاشوریەکان بەناچاری پاشەکشێ ئەکەن وەئەگەرێتەوە بۆپایگا سوپاییەکانیان لە موان. بەم چەشنە دەرئەکەوێت کە گزنگی ئاوەدانی و تروسکەی شارستانی و بنکەی دیوەخانی ژیانی کۆمەلایەتی وەپێشکەوتن لە مێژەوە لەم ناوچەی پێنجوینەدا ریشەی قوڵی داکوتاوەو پەلو پۆی هاویشتووە.

بەلام بەداخەوە تا ئێستاش ساڵ و کانی دامەزراندنی ئەم

شاره خنجیلانـه دڵ ڕفێنـه بەدپـاری کراوی نازانین بێ‌گومان هەروەکو زۆر جێگاو شوێنی تری ئەم کوردستانە دور نیە بەدەم ڕەوتی پێشوی کاروانی ژیان و پێشکەوتن و سەرکەوتنی مرۆڤی کوردەوە بنـاغـەی دامەزرابێ ، دوور نیە وەکو زۆر جێگای تر لە تاکـە ماڵێکی ڕەزەوانی گوێ کانیـەکـەوە، یان لە ڕەشمـاڵ نشینێکی سەر بە هۆزە کۆچـەریـەکـانی گەرمیـان و کوێستـان کەرەوە یان [1] خێزانێکی باخەوانەوە بە درێژایی ڕۆژگار بەپێی پێـویستی کومـەڵ ئاوەدان بوبێتـەوە ولـەچـەند ماڵێکەوە بووبێ بەکـوێـرە دێیـەك وە چوبێتـە ئەم چوارچێـوەیـەیی ئێستـای هاوچـەرخـەوە . . لە دواییدا ساغ کردنەوەی ئەم ڕاستیەش هەر ئەکـەوێتـە سەر ئەستـۆی ڕۆشنبیـرانی کورد کە ئومێدەوارین لە ماوەیـەکی نزیـك دا بە کۆششی بە پێـزیـان ئەم گرێ کـوێرانەو نهێنی یـانـە بکـەنـەوە وتا رووی سپی وولاتەکەمان وەمێژ ووی نەنـاسـراوی گەلـەکەمان ڕوون بێتەوە وبزانرێ . ئەوەی لێرەدا بووتـرێ کلافـەی ڕپانـنامەی شاری پێنجوین لە مێژ وودا بریتی یوولـەسـەر گوزشتـەی ژ یـانێکی ئاسای بێ‌گیروکێشەی قوڵ و گیروگرفتی دژ وارو. هەمیشە لە یازاری گەرمی ڕووداوی مەزن و قەومـاوی گرنـگ و بەسـەرهـاتی وانـاوداردا نەژ یـاوە تا ناوی بخـرێتـە خانەی گەورەیی یەوە وەلەلاپەڕەکانی مێژ وودا بەزەقی بدرەوشێتـەوە وبـەسـەر لوتکـەی بەرزی وگرنگیەوە بەگرنگی بمێنێتـەوە . بۆوینـە لە ساڵی 1226 زاینی دا ناوچەی پێنجوین دووچـاری بومـەلـەرزیـەکی بەتین بوو کە لەئـەنجـامـدا ماڵ وێـرانی و دەردەسـەری یـەکی بێ ئەندازە بەسەر دانیشتووەکانی هاتـووەخانـەت پریشکی ئەم ناهـەمـواری ووێران کاری بە زۆر ناوچـەی شارەزووریشی گرتـوتـەوە بەلام ئەم بومـەلـەرزەیەو ئەو بومـە لەرزانەی تریش کە بەسەریاهاتوە نەبووە بە هۆی ئەوەی کە شاری پێنجـوین ناوی پێـوە دەرکـات ووەکـو شاکـارێك لە ڕووداوەکـانی نەخـراوەتـە ناو دووتـوێی مێـژ ووییـەوە وەوەکو گۆمی زرێ بار ئەفسانەو چیرۆکی بە دەوریا نەتەنراوە وەنەبووە یە دیاردەیەك و خاڵێکی گرنگ لە ژ یانیدا .

هەڵکـەوتنی مەڵبـەنـدی پێنجـوین لە دووریـانی هەرێمی شارەزوورو مەریـوان وەچەقی سەرەری سنەو مهاباد دا کارێکی تایبـەت دەورێکی دیـاری کراوی لەسـەر بەسەرهاتی گرنگ و ڕووداوی مەزنی ئەم ناوچـەیـە گێـراوەو نوانـدووە، ناکـۆکی و دووبـەرەکی بەتینی دەوڵـەتی صەفـوی و دەوڵـەتی عوسمـانی تەقـەلاو کۆششی میـرنشینی بەبـە بۆپارێـزگـاری قەوارەی نیشتمـانیـەتی ، لە چنـگ هارینی و لەناوبردنی لەناو بەرداشی ئەم دوو هێـزەدا ئەم قەومـانـە بەکـەموزۆری وێنەی لە ناوچەی پێنجـوینـدا ڕەنگی ئەدایـەوە مۆرك و نیشـانـەی تایبـەتی بەنـاوچـەوانی ناوچەکـەوە ئەنـا کە لە ئاکـامـدا شوێنـەوارو سەرگـوزشتـەی ئەم باس و خواستـانـە لە دەروونی کۆمـەڵانی خەڵکی دا ئەچەسپێ و لە گوێیاندا ئەزرنگایەوە، شەڕی دوانزە سوارەی مەریـوان ساڵـی 1088 کۆچی وەکـو ڕووداویـەکی نەتـەوایـەتی کە باسی ئەکـەوێتـە ناوچـەی پینجـوینـەوە لەم چەرخـەی ئەمـڕۆدا دەروونی شاعیـری بەرزی کـورد شێخ سەلامی هێنایە هەژان بۆیە لە ساڵی 1934 بەم هۆنراوە بەپێزە مێـژ وییـەیی خوارەوە سەرگـوزەشتـەی دوانـزە شێـری بێشەی کوردستـان دوانـزە پڵنگی بەهەڵمەت دوانزە شاسواری شمشێر هەڵگـرو قەرەبیـانـو بەدەست لە دوانـزە لاوە بە دوانـزە تەپڵەوە بەشـەبیخـون کردن تاوو هەڵمـەتی شێـرانە ئەکەنە سەر دوانزە هەزار لەشکـری ئێـرانی کە لە ئەنجـامدا ئەم لەشکرە زلە وەکو پۆری خوراوی لێ‌دی بە دەست چەنـد هەڵـۆیـەکی کوردەوە ڕوون ئەکاتەوەو ئەخاتە بەردەستی ڕۆڵەکانی .

### گفتوگۆی ملەکەوە

هەی ملەکـەوە بۆچـی دامـاوی
بۆچـی وا کەوەو شیـن هەڵگـەڕاوی
بۆ ڕەنـگـی خاکـی لە ڕووت بڕاوە

بۆ چی سەوزەگیت لێ نەڕواوە
بۆچی ئاوەڵو شیوەڵو دۆڵی
بۆ چی بێدەنگی بۆچی وا چۆڵی
کوا سروەو شنەو کزەی شەماڵت
کوا هاژەو تافەی ئاوی قەد پاڵت
جوابم بەرەوە تۆ بەدەست و برد
شاخی سەربەرزو قەڵای قەومی کورد
زۆر بە کەساسی شاخی کۆنە ساڵ
جوابی دامەوە بەزمانی حاڵ
شاخێکی بەرزو سەوزو سەخت بووم
پڕ گوڵ و نەسرین پڕ لە درەخت بووم
قەزوان و مازو بەڕوو ڕەشە دار
وەڵگو، کێکف و ڤیقڵ و چنار
هەموو چین بەچین بەریز لە داوێن
بەهەوای نەسیم وەك عەتری خاوێن
باوەشێنیان بوو لە خوارو لە ژوور
لای من بوو ئاوی حەیاتی مەشهور
لەبەهارەدا وەختی خێڵەو ژوور
ڕەنگاو ڕەنگ ئەبووم بە گوڵ زەردو سوور
لە تەوقی سەرم تا بە پێی دەشتا
ئەرازامەوە وەك باخچەی بەهەشت
ئاڵ و شین و مۆر کۆمەڵی فەڕ بووم
تۆپی گوڵباخ و میناو شەست پەڕ بووم
بوکێ بووم تارام ئەدا بە سەر دا
ڕوو زەردیم ئەدا بە ڕووی قەمەر دا
پۆل پۆل نازداران گەردن پڕ خاڵان
ڕوومەت پەرەی گوڵ باڵا شمشاڵان
بەنیوە نیگای چاوی کاڵەوە
بەورشەو پرشەی کوڵم و خاڵەوە
بێپەروا بێباك بەخۆشی سەربەست
لەلای من (چۆپی) شایان ئەبەست
خاوەنی پێشەو مێرگی دڵگیر بوون
لانەی شێران و جێگەی نێچیر بووم
برای هاوپشتی (ئەریوان) من بوم
ڕێی (دوازدە سوارەی مەریوان) من بووم
شێر لە پێشەما نرکە نرکی بوو
دوژمن لەبەرما چرکە چرکی بوو
کوانێ نەعرەتەی شێری ژیانم
کوا زیرەی پڵنگی بەری بەیانم
کوا چریکەی باز لەسەر کلاوان
کوانێ قاسپەی کەو لەگون شتاوان
پێت بڵێم بۆچی شین هەڵ گەڕاوم
بۆ بوم بەقەقنەس بۆچی سوتاوم
دیم ڕژا خوێنی ئەولا دەکەی خۆم
بەسەرما ووتی: جگەر گۆشەی تۆم
خوێنی ناحەقی ڕۆڵەی کوردانم
بەسەرما ڕژا جەرگی سوتانم
ڕژا بەسەرما خوێنی گەرمی کورد
سووتام هەڵقرچام شەق و پەقم برد
چەن جار سووتام و هەڵگرامەوە
بووم بەخۆڵەمێش دامرکامەوە
نازانم ئێوە چلۆن ژیاون
هاوار وەکو من چۆن نەسووتاون
من بۆ انتقام هەر چاوەروانم
بەڵکو ڕاپەڕێ قەومی کوردانم
من قەڵای ئێوەم منم سوپەرتان
گوم نەکەن خوێنی براو پدەرتان
بڕژێنن خوێنی دوژمن لەبەرما
لێبدەن تەپڵی شادی بە سەرما
وەختی سارێش بێ مەر برینەکەم

**سوور بکرێ بە خوێنی ڕەنگە شینەکەم**

پێنجوین بەوێنەی شارە سنوورەکانی تری کوردوستانی عیراق ڕەواندوز خانەقین لە شەری یەکەمینی جیهاندا (سەفەر بەگلك) جێگاو شوێنی ئیستراتیجی‌وە تایبەتی لەناوچەکانی جەنگی دا پەیداکردبوو وەراستەوراست ناوی بەمەیدانێکی جەنگی گرنگ دەرچوبوووە ناسراو بوو شەری خوێناوی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و روسیای قەیسەری ئەم ناوچە دڵگیرو جوان پڕ خێرو بێری دووچاری وێران کاری و تالان و کوشتن و برین و بارودۆخێکی ناهەموار کردبوو کە لە ئەنجامی ئەم شەڕو رووداوە جەرگ برانەدا ناوی پێنجوین وەناوچەکە کەوتە سەرلاپەرەی مێژوویی یەکەمین جەنگی جیهانی یەوە وەگرنگی و تایبەت مەندی بەبالآی مەڵبەندەکەدا براو وەناوی لە جیهاندا بلاو بووەوە.

وەلێرەدا جێگای خۆیەتی کە بڵێین کە ناوی شێخ محمودی نەمرو سەرکردایەتی کردنی لەشکرێکی کورد بۆ بەرگری کردن لە هێرش بەرانی ڕوسیای قەیسەری وەپاراستنی خاکی نیشتمان زۆربە زەقی یەتە بەرچاو کە لە دواییدا ئەم شەڕە بەرگری و سەرکردایەتی‌یی وێنەی شێخی مەزن لە مەیداکی شەڕدا بۆ بە هەوێن کە شێخی نەمر لە پاشەڕۆژدا بتوانێ کەڵك وسوودێکی گرنگ لەم تاقی کردنەوەی ژیان و مەشقی سەرکردایەتی و بارودۆخی تایبەتی سروشتی ناوچەکە بە سەرکەوتوویی یەوە بۆ بەرژەوەندی جولانەوەی نیشتیمانی کورد وەربگرێ. بۆیە ئەتوانین بڵێین کە ئەم شەڕی جیهانیەو گوتاوەروەکانی ناوبانگی پێنجوین و سەرکردایەتی شێخ محمودە نەمروگوندی ولەژێر، پیران، بارەگای شێخ و لایەنگرەکانی بگەیەنێتە ئاسۆی جیهان و بەگرنگی و مەزنی لە لاپەرەکانی مێژووی کوردا تۆمار بکرێ. بەپێی بیروراو لێکۆلینەوەی زانایان و مێژووناسان سروشت ـ بەمانای گشتی ـ دەوری تایبەتی و دیاری کراوی لە پێکەوەنانی بناغەدانانی شیرازەی دەزگای دەوڵەت و یەکێتی نیشتیمانی پێش کەوتن و ئاوەدان کردنەوەودا مەزراندنی شارستانیەت لەم وولات یا ئەو وولات لەم سەرزەمینەدا گێراوەو نواندوە.

زۆر دوور نەروین ئەگەر رووباری دیجلەو فورات بە خاکی وولاتی عیراق میسوپۆتامیادا نەرویشتایە بێ‌گومان ئەم وولاتە هەر بەچۆل و بیابانی بەوشکو برنگی بەمردوویی، بێ بەخشندە ئەمایەوە، بۆیە دەڵێن وولاتی عیراق بەخشندەو دەست کردی هەر دوو رووبارە واتە ئەگەر ئەم دوو رووبارە نەبوایە وولاتی عیراق ئەمرۆ لەسەر شانۆی ژیان دا نە ئەبوو.

هەروەها سروشت بە گشتی بەفرو بارانی زۆر هەوای سازگار کێوکەژ و کانیاو چەم وزێی‌و دۆڵ و دەونگ ودارستان دەستی بالآو دەورێکی گرنگی لە چاوهەڵهێنانی یەکەمین مرۆڤ و پشکوتونی خونچەی ژیان بناغەدانانی شارستانی و بنکەی ئاوەدانی و پێشکەوتن و جوان وقەشەنگی و دڵگیری لە کوردوستان دا گێراوەو نواندوە. بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو بارودۆخە گونجاو وهەل ومەرجە رەخساوەش دا ئەگەر مرۆڤی کورد بیری تیژی و بازووی بەهێزی نەخستایەتە کار ئەم بەهەشتی سەرزەمینە هەر بە بەیارو بیشەلان و بێ سوود بێ ژیان بەهێلانەی پەپوکونی چەقەڵ و رێوی ئەمایەوە. بەم چەشنە دەستی رەنگینی مرۆڤی کورد هەمیشە بۆ جوان کردن و دەوڵەمەندو رازانەوەی ئەم بووکی نازداری ئەم کوردستانە لە کاردا بووە.

شوێنی سەختی بێ ئاوی بەهەڵکەندنی کارێزو ئاوراکێشان بۆی ئاوەدان کردوتەوە. بەتل دان بە گابەردو شکاندنی تاوێری ناوچیاکان جێگاو زەمینەی بۆ کشتوکاڵ چاندن کردن خۆش کردوە لەبن قەد پاڵی شاخەکان لەسەر بەردی رەق بناوانی خانووبەرەی چین لەسەر چین بەرەو ئاسمان بەرز کردەوتەوە.

بەپاچ و پێمەرە باخ و باخات لە ناوجەرگەی کێوکەژدا کردوتەوە لە پێی‌دەشت و دەوەنەکانی جێگا بۆلەوەڕو پاوانەی بۆمەڕو مالات ساز کردوە..

له بواری مێژوویی پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دا پەندو ئامۆژگاریەکانی زەردەشتی یش بێ ووچان مرۆڤی کوردی بۆ کاروئیش کردنی بەسوود هان ئەداو پاڵ پێوە ئەناو هەمیشە بۆ ئەم مەبەستەوەووزەی زیاتر بەرزئەکردەوە بۆ وێنە لە بەرنامەی ووتەکانی زەردەشت دا وا هاتووە کە گوایا شەیتان لە بیشەڵان خاك و دەشتی بەیار شیوو جێگای تاریك وچەنگەڵ دا خۆی مەڵاس داوە وئەژی ئیتر بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانی شەیتانی نەگریس خوای ئەهریمەن و شەڕ لەم شیوو جێگایانەدا هەڵکەنی هەلرفینی شوێنەواریان کوێرکاتەوە پێویستە گوڕباتە خۆی قولنگ هەڵگری بەگاسن ورگی زەوی هەڵداری وتۆی ژیان و ئاوەدانی بەو شیوو دۆڵ وپەنا پاسارانە بوەشێنێ وتیایا دار بنێژی وباخ و باخات بهێنێتە بەرهەم وبنکەی شارستانیەت دامەزرێنێ .

ئیتر لەناوجەرگەی پیویستیەکانی کۆمەڵەوە بەدەم ڕەوتی رۆژگاری پێشکەوتنەوە مرۆڤی کورد بە درێژایی مێژوو بە تواناو هێزی تیژی لە مەیدانی ئاوەدانی وکۆمەلایەتی وئابوری دا دەستکەوت و سەرکەوتنی نوێ وزۆری بەدی هێناوە بە هەزارەها دێهات و سەدەها شارو شاروچکەی پڕ لە باخ و باخات و خانووبەرەو چاوگەی شارستانی ئاوەدان کردۆتەوە .

ئیتر نەك تەنها توانیویەتی کەڵك و سوودێکی زۆر لە سروشت وبەبەخشندەکاتی وەرگری وبەس بەڵکو بۆ چاك کردن و دەوڵەمەند کردن وەزۆری بەرووبووم لە رووی چەندایەتی یەوە بی یا چونیەتی لە کوشش دابوە. هەربووینە لە هەرمی کێویلە هەرمی گولاوی لەدار بەروو بەرووی تاڵەوە بەرووی شیرین پیك هێناوە یا وەکو پیرەمێرد دەڵێت لە تەنها دارمیویەکەوە (34) سی وچوار توخمی تری بخاتەوە بە واتایەکی تر ئەم باخ و باخات ودارو درەختە میوەدارە ئەم میرگو میرغوزارە کە ئەمڕۆ تارای سەوزی وجوانی بەسەر کوردستان دا پوشیوە بەری رەنج و شیلەی بیروکوششی بە پیزی ساڵەهای ساڵی مرۆڤی کوردە .

ڕاست ئەوی ریشەی ناوی پێنجوین لامان بە دروستی روون نیە بەڵام هەرچوونی بێ لە ووردبونەوەو تاووتوی کردن بەناوەکەدا بۆ روشنبیری کورد دەرئەکەوی کە ئەم ناوە لە دوو ووشەی رەسەتی کوردی پیك هاتوە . ووشەی پێنج روون و ئاشکرایە بەڵام لەسەر ئەوی تر بورە مشتومڕی هەیە . لەم هەڵویستەدا نابی ئەرکی تایبەتی بەریز جمال بابان بۆ ساغ کردنەوەی ئەم ناوە فەراموش کەین کە ووشەی وێنە هەڵئەبژێری وە پەسندی ئەکا کە رۆشنبیرانی کوردی یش لەم بارەیەوە هەمان بیرورا وبوچونیان داناوە هەیە کە تا ئیستاش کەسی تر بەڵگە بەرپەچی ئەم بیرورایەیان نەداوەتەوە .

شیاوی باسە : ناوی زۆربەی دیهات و شارو شارو چکەکانی کوردستان لە ناخی باروودۆخی سروشتی مەڵبەندەکەوە هەڵقولاوە جا لەبەر ئەوەی پێنجوین یش لەناوجەرگەی کومەڵە چیایەکی دڵرفینی پڕ لە باخ و باخات دڵگیر دا هەڵکەوتوە کە سروشت هەرجارەی بەرگ وێنەیەکی تایبەتی بە باڵادا ئەبڕی وبەتانوو پویەکی دیاری کراو ئەیرازێنیتەوە . گاهـ وینەی لە بریقەی باخ وباخاتە سەوزەکەیەوە ئەنوێنی هەندی جاری تر لە وینەی قەد پاڵی کێوی ئاسناوەی زەردو سوورەوە وەر ئەگری گاهـ لە رەنگی بەفری سەرچیاکانیەوە سپی ئەکاتەوە، بویە مرۆڤ کە ئەروانیتە ئەم پارچە بەهەشتە لەهەر وەرزێکدا یا لە هەر مانگ وروژێك دا بەچەند رەنگی بە دیاری تر با بلیین بە پینج وێنە: دێتە پێش چاوی وەرەنگ ئەداتەوە بویە بێ چەندو چوون ئەتوانین بلیین کە ناوی پینج وینە پڕ بە پڕیەتی هەرچەندە بۆ دواروژی یش نوقلانەی سەرکەوتن بۆ روشنبیرانی کورد لی ئەدەین وە هیواو ئوومێد ئابرین کە لە دووا رۆژدا بە لێکۆڵینەوەی بەپێزو بەبیرورای مێژووتر و بەلیکدانەوەی زانیاری تر ئەم باسە دەولەمەندوە رازاوە تر ئەکەن . جگە لەمە هونراوەکەی شێخ سەلام لە بابەت ملەکەوەوە بە بەڵگەیەکی تر بۆ پینج وینەیی ئەم شارە دا ئەنری .

ئەمە جگەلەوەی ئەگەر مرۆڤ چاوبە ناو دیوانو کتێبەکانی شاعیرو نوسەرانی کوردا بخشینی ئەبینی کە لەسەر وینەی رەنگاو رەنگی مەڵبەندەکانی کوردستان باس و خواستی زۆر هەیە ـ بووینە بێ کەس بەم چەشنەی خوارەوە بە سەر شاخی گویژەدا هەڵئەدا ودەلیت.

**شاخی رەنگاو رەنگی گوێژە باعیسی کەیفوو سروور**
**هەر دەمە بەرگی ئەپووشی گاهـ سپی گاهە وزوو سوور**
**وەصفی قوومی کورد ئەکەی توو بەم هەموو رەنگانەوە**
**رەنگی سوورت شاهیدە بۆ کورد کە قەومێکی جەسوور**
**بەرگی بێ‌گەردوو سپی‌پشت دیارە وا هاوار ئەکا**
**قەومی کورد دڵ ساف و پاکن مێلەتێکی بی‌قسوور**
**بەرگی سەوزی‌پشت دەڵی ئەم خاکە هەرشینایییە.**
**پڕ لە دەغل و دان و کانی سەر بەرزن پڕ لە نوور**
**ئەی وەتەن شایانی فەخری واجبە مەدحت بکەم**
**داروو بەردت عەینی گەوهەر خاك و خولت وەك بلوور**

جابەو چەشنەی کە پاخچەیەکی خنجێلانە کەپرەو رازاوەیە بە گوڵو گوڵزارد داروو درەختی هەمە جۆرە کە هەر داروگوڵی ناوو وبەری‌و بوونی تایبەتی ودیاری‌کراوی خوی هەیە هەروەها لە کوردستـان یش دا هەریـەکـە لەم مەڵبەنـدو دیهات و شارو شاروچکـانـە بەنـاویکی تایبەتی یـەوە ناوبـانگی دەرکـردووە بەبـەرگێکی دیـاری‌کـراوەوە ناسراوەوە بەموورك و نیشانەیەکی جیاواز ناوی دەرچووە.

شاری پێنجـوین لە ناو ئەم کومـەڵـە شارو ئاوادانیـەدا لە خانەی ئاسایی‌دایە بە مەڵبەندیکی کویستانی باخ و باخات دار شاری هەرمـی گوڵاوی کانـی ئاسـن میـوەی زۆرو دووبەرە هەنـگـویـن کانی و کاریـزی سازگـار دار بەروو دار گویـزو بەخشنـدەی زۆری سروشت کەتیرەو مازوو سەعلەم و گەزوو گوڵو گولزاری هەمە چەشنە ناوی رویشتیوەو ناسراوەپێنجوین لە ساڵانی پاش جەنگی یەکـەمی جیهـانی (سەفەر بەگلك) هەر بەوینـەی تیگـرا دیهـات و شارو مەڵبەندەکانی تری کوردستان لەنـاو گووتـەوارووی دەردی کوشەندەی کومەڵایەتی‌وە لە شەوە زەنگی دواکـەوتن و هەژاری‌و نەزانین دا ئەژ یـا لەم روژگـارەدا هەتـا سـاڵـەکـانی سی‌یش وە بەرەودوواش ئەم شارە لەبـازنەی گونـدیکی گەورەدابـوو تروسکەی هیچ پروژەیەکی شارستانی وەئاوەدانی ئەم ناوچەیەی رووناك نەکردبووەوە ئیتر نەدەزگای ئاوو رووناکی نەچـاوگـەی فێـرگـا وەنەهیچ دەزگایەکی پێشکەوتن وئاوەدانی نەهاتبووە کایەوە.

وەرێگـای هاتـووچۆی نێـوان پێنجـوین و سلێمـانی بەهـۆی سواری‌و وڵاخ کاروان لە رێگەی کەلی گوێژەوە وەشار باژێرەوە بوو لەو سەردەمـەدا هێشتـا رێگـای ئۆتـۆمبیـل لەو ناوچـەیـەدا نەکـرابـۆوە بۆیە تێکرا جوڵانەوەی بازرگانی و هاتووچۆکردن بە وڵاخ و کاروان بۆ. کاروان لە سلێمانیەوە بۆ ناوچەی شارباژێر لە دوایی‌دا بۆ پێنجـوین و ناوچـەی مەریـوان و سنـەو مهـاباد دا بەبـەردەوامی لە هاتـووچۆدا بوو هەوڵ کولە سلێمـانیەوە بەرەو گوێـژە ئەکـەوتـە رێی لە چایخـانـە خنجیـلانەکەی قەد پاڵی گوێژە پشویەکیان ئەدا لەم چایخانەیە وەکو مامۆستا شاکر فتاح لە نامیلکـەکەیدا بەناونیشانی (گەشتی پێنجوین)دا باسی ئەکا هاوشـانی چایخـانـەکـانی سلێمـانی بوو پاشـان لەوێوە بەرەو بنـاویلە ئەرۆیشتن ئەم گونـدی بنـاویلەیە کە ئەمەندە کاروان و رێبوار پیاگوزەریان کردووە لە سایەیدا حەساونەتەوەو شەویان بە ئاهـەنگ وزەماوەند تیابردوتە سەر بەناویەوە پەندی بەناوبانگی کوردی (شـایـیـەکەی بناویلە)ی لی‌ی پەیدابووەو بەسەریا براوە وەپێیـەوە ناوبـانگی دەرکـردووە لە دوایی‌دا کاروان بەنـاودێ نۆ دێی دا بێشکـەی چاوهـەڵهێنـان و لە دایك بوونی زاناو دانای کورد شێـخ مارفی نۆدێـدا تێ ئـەپـەرێ وەئـەچێتـە ناوئاوایی چنگیانەوە ئەم گوندەی کە ئاوادامان لە ناوگەڵای سەوزی پەڵە رەزدا نقـوم بووە کە ناوبـانـگـی بە بەروبـومـی زۆری تری لەنـاوچـەی شاربـاژێـردا دەرکـردووە دواتـر بە ئاڵیـاوەو بە ناوچـەرگـەی شاخی تاریـەر بەرەو ناودەشتی کاکی بە کاکی قزلجەدا تێ ئەپەرێ وەئەچێتە ناو پێنجوینەوە پێنجوین کەوکۆتە ناو باوەشی سێ شاخی گەردن کەشی سەختە وەکێوی ئەحمەد هاجـەر، کێـوی بەرکێـوی بلکیـان ئەم سێ کێـوە لە سێ لاوە

شاپەری باڵی جوان و ڕەنگینیان بەسەر پێنجوێندا کێشاوە وەکردویانە بە بوکی ڕازاوەی کوردستان. پێنجوین پڕە لە کانی گەورە گەورەی ئاوی سارد بەڵام بەداخەوە ئاوەکەی قورسە کانیەکی تیایە لەبەر قورسی ئاوەکەی پێی دەڵێن (ئاوئاسن) هەروەها کانیەکی تریشی تیایە کەپێی دەڵێن کانی (ئاوی حەیات) کە ئاوەکەی لە هەموو ئاوەکانی تر شیرنترو سارد ترە،

تیتر دوو نیە ئەم ئاوە قورسەی پێنجوێن لە ئەنجامی کانە ئاسناوەکانی پشت چیایی پێنجوین وە نەبێ لە ساڵەکانی سی داتەنها دوو باخی گەورە هەبوو یەکێکیان چوار باخ ئەوی تریان بلکیان ئاوی باخی بکلیان ئەوەندە ساردە کە ئەگەر هێشووە تیری تێ خرێ یەکسەر دەنکەکانی ئەقلیشا. ئیتر مرۆڤ بەهەرچی لایەکدا ئەڕوانێ هەموو باخ و باخات و سەوزو سوور ئەکاتەوە، میوان یا ئەگەر ڕێبوار لە دوورەوە ڕێی بکەوێتە پێنجوین هەول جار وەکو گوندێك دێتە بەرچاوی بەڵام کەیەتە ناوەوە وەچاوی بەدوکان و بازاو چایخانەو قەیسەری و مزگەوت و خانویەرەکانی ئەکەوت وەکو شارێکی گەورەی ڕێك وپێك ئەهاتە بەرچاو. لە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی (سەفەر بەگلك) هەر تەنها پەنجا دوکان و چوار چایخانەی گەورەوە قیسەریەك و چوار مزگەوتی گەورە کە هاوشانی مزگەوتەکانی سلیمانی بۆ دوو سەد وپەنجا خانوی دوو نهۆمی تیا بوو دیارە لە پێش شەڕدا پێنجوین لەم ڕادەیە فراوانترو پێشکەوتوترو ئاوەدان تر بووە چونکە شەڕ بەتایبەتی شەڕی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی روسیای قەیسەری ناوچەی پێنجوین بەمەرویەك بردبو زۆر خانویەرەی بەپێوە نەهێشت بەڕەنگێ قاتوقری خستە ناودانیشتوانەوەکە ژمارەی دانیشتوانی پێنجوین لە ساڵی سی‌دا هەر بە 1200 کەس دائەنرا.

جگە لە باخ و باخاتی زۆروەمەڕ و ماڵاتێکی بێ شوماریش لە ناوچەی پێنجویندا بەخێو ئەکرا تەنانەت گۆشتی سلێمانی بەشی زۆری لە پێنجوینەوە ئەهات و وەپێویستەکانی لەم ڕووەوە دابین ئەکرا. بازاڕی گەورەو بەرفراوان دوکانی زۆری هەمە چەشنە پیشەو گوزەری ئاسنگەری و چەقۆگەری، ناڵبەندی، مس گەری، قەساب کەباب چی، سەوزی فرۆش، سەرتاش، وورردە واڵا فرۆش جگەرە فرۆش. بوونی ئەم پیشانە یەڵگەی بە هێزو لەبەرچاوە بۆ سەلماندنو ڕیشە داکوتانی بنکەی شارستانی و بناوانی ئاوەدانی لەم شارەدا. جگە لەمەش هەڵکەوتنی پێنجوین لەسەر دووڕێیانی بازرگانی نێوان سلێمانی و ناوچەی مەریوان و سنەو مهاباد برەوی بەبزوتنەوەی هاتووچۆو گەرمی بازاڕی کڕین و فرۆشتن ئەدا وەپەریشکی شارستانیەتی زیاتر تیایا بلاو ئەکردەوە کە لە ئەنجامدا قەوارەی شارەکەی لەهەموو ڕوومەیدانێکدا بەرەو گەورەترو بەرفراوانترو گەشە سەندو تر ئەبرد سروشتی پڕ ڕەنگین و بەپێت و بەفەڕ دارو دەوەنگە و دارستان و باخ و باخات چڕوپڕوبەروبووم داری ناوچەی پێنجوین سامانێکی لەبن نەهاتووە بەخشندەیەکی بەرفراوانی بەدانیشتوانی ڕەوابینیوەوخستیوتە بەر دەستیان کەیەکێ لەم بەخشندانە کەتیرەیە کەلەوەختی دیاری‌کراودا دەستەیە لە مرۆڤ کەپێیان ئەوتن کەتیرە هەڵکەند لە ناوچەکەدا بلاوئە بوونەوە بەتایبەتی بەچیاکان وە پێ‌دەشتەکان ئەکەوتنە پشکنین تا ئەچوونە سەربنجە گیایەك کە پێی دەڵێن (گەوون) بە چەقۆدەستیان بە برینی چڵ وپەلەکانی ئەکرد کە لە پاش چەند ڕۆژێ لەچێگا برینەکە. مادەیەکی شل کەپێی دەڵێن کەتیرە دەر ئەهات کە لە دوایی ووشك کردنەوە لە پریاسکە یان چارۆکە یان کۆڵوانەدا کۆیان ئەکردەوە وئەیان هێنایە بازاڕی پێنچوین و بەنرخی تایبەتی بەبازرگانەکانیان ئەفرۆشت.

شیاوی باسە لە بوارێکی مێژوویی‌دا بەشێك لە دانیشتوانی ناوچەی پێنجوین ژیان و گوزەرانیان کەوتبووە سەر هەڵکەندنی کەتیرەو فرۆشتنی ئەم بەرهەمە لەوەختێکدا کە کەتیرەو مازوو پێستەو ڕیخوڵە لە کوردوستانەوە بەبار بەڕێگای جۆراو جۆردا ئەگەیشتە ئەوروپا وەبەوێنەی کەرەسەی خاوو دروست کردنی کەل وپەل لە کارخانەکاندا بەکار ئەهێزا. لەم مەڵبەندەدا جگە لە کەتیرەو مازوو بەرهەمی سەعلەمیش بەناوبانگ بووە سەعلەم گیایەکە وەکو گەوون..

مرۆڤی شارەزا چۆون بنە گوزروان بەپاچە کۆڵ لە ئەرد بنکەکەی هەڵدەکەنێ ئا بەوجۆرەش بنکی ئەم گیایە هەڵدەکەنن بنکی سەعلەم لە تورێکی خڕ ئەچێ لە ناوییدا دەنکە هەیە پاش ئەوەی ئەو دەنکانە دەرئەهێنن. وئەیخەنە سەر ئاگرو دەیکولێنن تا ئەوچڵك وپیسایی یەی کە پێوەیەتی لێ بێتەوە ئەوسا لەبەر رۆژ هەڵی دەخەن پاش ووشك بوونەوە ئەیخەنە چارۆکەوبۆشاری دەهێنن بە دوکان دار ئەیفرۆشن شیاوی باسە سەعلەم بۆهەلامەنت وبۆگەلێ نەخۆشی تر بەکاری ئەهێنن.

هەروەها لەم ناوچەیەدا جگە لە کشتوکاڵی خەلەونۆك و نیسك وماشیش دانیشتوان کشتوکاڵی گاڵی شیان ئەکرد کە لەبوارێکی مێژوویی دا ئیتر لەبەرکەم گوزەرانی وەدەست کورتی کۆمەڵانی خەڵکی بەهارینی وتێکەڵ کردنی ئاردەکەی لەگەڵ ئاردی گەنموجۆدا نانی خەپلەیان لێ دروست ئەکردولەگەڵ خواردنی تردا ئەیان خوارد بەتایبەتی لەکاتی گرانی یە گەورەکان ورۆژانی قات وقڕی بەوێنەی ئاردی بەڕوو ئەیان کرد بەنان وەیۆ خواردن کەڵك و سوودی زۆریان لێ وەرئەگرت. وەهەروەها کۆمەڵانی خەڵکی کەڵکی زۆریان لە داری بەلەکیش ئەکرد لەپێش دا ڕەگەکەیان هەڵئەکەندو ئەیان خستە سەرئاگر تا ماوەیەك ئەیان کوڵان تاوەکودووشاوی لێ ئەهات کە لە دوایی دا بەوێنەی دەرمان بۆچاك کردنەوەی، زامی وولاخ بەکاریان ئەهێنا.

هەروەها گەزۆ لە یەکێك لەبەرهەمە بەنرخە گرنگەکانی ناوچەی پێنجوین پڕ دارستانی داربەڕوو باخ وباخاتی هەمیشە سەوزی پڕ میوە دائەنرێ گەزۆبەرهەمێکی کۆنی مرۆڤە لە بەڵگەنامە مێژوویەکانی سومەری وئەکەدی لە تەورات ولە قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە لەسەر چۆنیەتی پەیدابوونی لە ئاسمانەوە دەبارێ یان بەری ڕووەکە یابەری ئاژەڵە مشتومڕی زۆری لەسەرە بەڵام واباوە کە لە سەرچڵ ولقی داربەڕووپەیدا ئەبێ وەکاتی پەیدابوونی ئەکەوێتە سەرەتای پایز لە کوردەواریدا دەڵێن کاتێ گەلاوێژ ئەکەوێ وزۆوپەڵە ئەدا وەپایزەکەی تەڕئە بێ لەیەکدانی هەوروتریشقە دا گەزۆئەبارێ وە دێتەبەوڕاستت ئەوێ زۆر ووتن ودرێژەدان لەم بایەئەوە لە ناوەڕۆکی باسەکەمان دوور ئەخاتەوە ئەوەێ پێویستە لێرەدا بوترێ دانیشتوانی پێنجوین لە ڕۆژگارێکی دێرینەوە توانیویانە بەبیری تیژ یان پەی بە دۆزینەوەویەکەڵك هێنانی ئەم بەخشندە سروشتیە بەرن کە لە ئەنجامدا ئەم کارە لە کاروانی پێشکەوتنی کۆمەڵگەی کوردیدا بەگرنگ و مەزن بەدیاردەیەکی پێش کەوتن وە شارستانی ئەژمێرێ بەم چەشنە گەزۆ لەبەرهەمێکی سروشتی بەکەڵکی سوود بەخش مرۆڤەوە بەپێی پێویستی ڕۆژگار چووە خانەی کەلوپەل وناو بازاڕی کڕین و فرۆشتنەوە ئێمە لەسەرگوزشتەی پەیدابوون وکەڵك وەرگرتن لەم بەخشندە سروشتە ئەوەندە نازانین بەڵام ئەوەی لەبیرەوەری ئێمەدا نەخشی بەستووە ئەوەیە کە خەلکی ئەم ناوچەیە لە پایزدا گەڵای تاڵی دار بەڕووی خاوەن هەمەچەشنە بەریان ئەتەکان ولەژێر دارەکەدا جاجمیان یا ڕاخەریان دا ئەخست دوای ئەوەی کە گەزووەکەیان لەگەڵ گەڵاکاندا دائەکوتاو کۆیان ئەکردەوە یان ئەیان خستە مەشکەوە یالە تەلسیك یا چارۆکەدا لە بازاڕدا ئەیان فرۆشت کە کۆمەڵانی خەڵکی ئەیان کڕی ئیتر بۆخواردن بێ یان بۆدەرمانی سورێژە یا بۆنەخۆشی تر بەکاریان ئەهێنا ـ شیاوی ووتنە گەزوولە دێهاتەکان وە لەزۆر شاردا لە زۆر ماڵی بەتایبەتی لە ماڵانی دەست ڕوویاندا هەبوو. . وولەدواییدا حەڵواچیەکان ی سلێمانی حاجی فتاحی حەلواچی، حاجی حەملان هتد حاجی قادر، حاجی سەعید. . هتد. لە گەزۆحەڵوای گەزۆی بە ناوبانگیان دروست ئەکرد وەئەیان فرۆشت کە خەڵکی بە سنووقی بچووك بە دیاری بۆخۆشەویست ودۆستۆ ئاشنایان یا بۆ فرۆشتن بۆ بەغدا وەشارەکانی تری عیراقیان ئەبرد.

ڕاستت گەرەکە سروشت تێکڕا ووزەو توانای بێ سنووری

وەستایی وکارەمایی بێ هەوتایی لە پێناوی ڕەنگینی و جوان کردن و ڕازاندنەوەی ئەم ناوچەیەدا بە دروستی خستوتە کار بۆیە بێ پەروا ئەتوانین بڵێین کە وێنەی جوان و قەشەنگی کوردستانی گەورە لەم پارچە بەهەشتەدا بەزەقی ئەبینین. لە بەهاردا سەرتاپاگیری ئەم ناوچەیە بە تارای سەوزو شین و زەرد دائەپۆشرێ لەناو ئەم باخ و باخات و مێرگو مێرگوزار و چیمەن و لالەزاردا مرۆڤ گوڵی هەمە چەشنەی دڵرفێنی حەیران بووی ئەبینی وەدێتە پێش چاوی کە مەگەر هەرگوڵ پەرستێ بتوانی گوڵ بژێریان کات سەر لەناوەکانیان دەربکات، ناویان بزانێ بەبۆنیاندا بیاناسێتەوە.

لەناو ئەم گوڵاڵانەدا گوڵێکی باڵا بەرزی زۆر بچوك هەیە کە هەمیشە سووتاو کوشتەی قاقای پێکەنین، بزەی خەندەیەکی مرۆڤە بۆیە ئەگەر یەکێك بەلای‌دا تێپەڕ کات وەتەنها زەردە خەنەیەك بەلێویدا بێت ئەم گوڵە بەسەر تەوقی سەردا بەسەر لق و پۆپیا بەرئەبێتە خوارەوەو ئەکەوێتە باوەشی زەوی‌یەوەو ئەبێتە خۆراکی مارو مێرو کەبەم گوڵە دەڵێن گوڵە خەندەران.

گوڵێکی ڕەنگ زەردو زێرنییش هەیە مرۆڤ کە بەلایدا ئەڕوا خۆی پێ ناگیرێ هەر ئەبێ گوڵێکی لێ بکاتەوە ئیتر ئەم گوڵە ئەوەندە ناسکەو بۆن خۆشە ئەمەندە ڕۆخۆش و بەسەزمانە. کە هەنگیش بۆی جگەر سووتاوە بەڕەنگێ کە هەراسی پێ سەندووە بۆیە ناویان ناوە «گوڵە هەنگ». . دیارە زۆربەی هەنگوینی هەنگ بریتی‌یە لەشیلەو هەلاڵەی ئەم گوڵە هەر لە بەرئەم هۆیە شە کە دوویەرەی هەنگوینی پێنجوین ناوبانگی دەرکردووە وەخەڵکی زۆری ئەکرن وە بەدیاری بۆ دۆست و خۆشەویستەکانیان ئەبەن خۆ ئەوە لە گوڵە زەردەی قەد پاڵە شاخەکانی پێنجوین هەر مەپرسە ئەم گوڵە ئەرخەوانیە یی کە مرۆڤی ناوچەکە بەپێی پێویستی ڕۆژگار توانیویانە بۆ کەڵك و سوودی خۆیان بەکاری بهێنن بۆیە خەڵکی لەبەهاردا دەست ئەکەن بە هەڵپچڕو کاندنی و کۆکردنەوەی پاشان لە سەر ئاگر ئەیکوڵێن بەڕەنگێ تائەبێ بەشیلەو لە دوایی‌دا ئەیکەن بەحەڵوا پێ ی دەڵێن حەڵوای گوڵەزەردکە جاران بەڵکو ئەمڕۆش لە زۆرماڵدا خوانی پێ خوری یان پێ ئەرازانەوە وەلەگەڵ خواردنی نایابدا ئەخورا.

لەدوایی‌دا ئەم ناوچەیە ئەوەندە دڵگیر و قەشەنگ و بەفەڕو بەخشندەدارە هەرچەندە شاعیران بەبالایا هەڵدەن وە نوسەران· لەبارەیەوە بنووسن هێشتا گەزیان کورت ئەهێنێ وەلەدەوری خۆیاندا ئەسوڕێتەوەو ئامانج ناپێکن.

ناوچەی پێنجوین لەناو چوارچێوەی کۆمەڵە شاخێکی سەخت و دژ واردا هەڵکەوتووە کاتێ مرۆڤ لە دەشتایی شارەزوورەوە بەرەو پێنجوین هەڵئەکشێ هەورازی سەختی پێچاو پێچی ملەکەوەی بەتەڕێ دیارە هەر لەبەر سەختی مەڵبەندەکەش بوو کە ئاشور ناصر پاڵی قەراڵی ئاشوری بەزەحمەت ئوانی بیگاتێ وەبیگرێ هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو دووبارە شێخی گەورە شێخ محمودی نەمر لە ڕاپەڕینە پیرۆزەکانیدا بۆبەرگری‌کردن یان لە کاتی تەنگاتەو پاشەکشیدا گوندی وولەژێر یا پیران سەر بە پێنجوینی بۆ خۆپاراستن هەڵئەبژارد.

ئێستاش پێچی بی مەحکمەمەی بەرملەکەوەی ساڵانی پەنجا بەڵگەی بەدیارو زەقە بۆ سەختی ناوچەکە.

ئەوەی شیاوی باسە لووتکەی ملەکەوە ئەوەندە بەرزە کە ڕێبوار ئەتوانێ لێیەوە بە ئاسانی شاهنشاهی شاخان پیرەمەگرون ببینێ، لەدەوری دوابڕاوی پاشایەتی لە ساڵەکانی سی‌دا لە گۆشەی بەرزەوەندی لە شکریەوە میری دەستی بە ڕاکێشانی ڕێگای ئوتومبیلی نێوان سلێمانی و پێنجوین کرد بەڵگەی مێژ ویمان دەربارەی کردنەوەی ڕێگای سلێمانی و پێنجوین لەو چەند ساڵانەدا چەند شیعرێکی شاعیری کورد شێخ سلام بەناونیشانی «لە دەشتی شارەزوور» کەوا لە خوارەوە ئەینوسین.

شیاوی باسە کە شاعیر لەبەر هاوبەشی کردنی لە ڕاپەڕینی

چولانەوەی نیشتمانی کوریدا بە سەرکردایەتی شێخ محمود لە ساڵی 1931 لە دوایی دا بەهەزار حاڵ لە ساڵی 1932 ئەکرێ بەمراقبی (چاودێر) ڕێگای ئەم پێنجوینە وەلەم جادەکردنەوەدا هاوبەشی ئەکا.

**وەئەمە چەند دیرێکە لە نموونەی هۆنراوەکەی**

**ڕووت و قووت و چڵکن و پیس و کزو بێپارە بووم**
**دایما مەحکومی قەهرو میحنەت و ئاوارە بووم**
**جل شڕو مل خوارو سەر کز هاودەمم دەردو ئەلەم**
**عاجزو زارو زەلیل و مات و هەم دڵ پارە بووم**
**تا لە ئەشغالا بەسەد منەت بە ڕۆژێ شەش قران**
**ئیشی جادەم پێ سپێرا مولتەجی و بێ چارە بووم**
**دەی لە (سەید سایەق) لەبەر خۆری تەموزی (شارەزوور)**
**ڕۆژ وەکو خوڵی بیابان بەشەو پەتیارە بووم**

لە ساڵەکانی چل و پەنجاشدا ڕێگەی هاتووچۆی نێوان سلێمانی پێنجوین بە ئوتومبیل ئەوەندە لەبرەو پەرەسەندندا نەبوو لە بیرم دێ لەپەنجان دا تەنها پاسە شرەکەی وەستا شەرەمی ئەرمەنی کە لەبەیانیەوە ئەکەوتە ڕێ وەبۆ ئێوارە ئەگەیشتە پێنجوین لەم ڕێگەیەدا کاری ئەکرد.

لە ساڵی 1946 ـ 1947 ئەم شارە خنجیلانە چەند جارێ کەوتە بەر هێرشی کاول کردنی بوومە لەرزە بە تایبەتی لە ساڵی 1947 ئەم کارەساتە بەرەنگێ دەستی خۆی وەشاند کەوێنەو ڕوخساری جوان قەشەنگی شاری یەکجاری ژاکان خاتوبەرەی زۆر ڕووخان دانیشتوانی شاریش ناچاربوون کە شار بەجێ بهێڵن وەبلاوبینەوە لە دێهات و شارەکانی تردا ئەم ڕووداوە جەرگ برە دڵ دەروونی شاعیری کورد مەلا عبداللە مفتی هەژاند بۆیە بەم چەند دێرەی خوارەوەە کە بەشێکە لە هۆنراوەیەکی دورودرێژ سۆزی دەروونی پر ناسۆری بەرامبەر شارەخۆشەویستەکەی دەرئەبرێ بە تایبەتی شاعیری ناوبراویش یەکێك بووە لەو کۆمەڵە خەڵکەی کە ناچاربووبوو پێنجوین بەجێ بهێڵێ وەلە سلێمانی دانیشێ. وەئەڵێت.

**پێنجوێن بەبێ تۆ نزیکە مەرگیم**
**لوبنان شکێن بووی داخت بە جەرگیم**
**تازە بوکی بووی بەسەر چیاوە**
**ئەهاتنە سەیرت لەم لاو لەو لاوە**
**پارچە ئەرزێ بووی لە پارچەی بەهەشت**
**زەردو سورو شین کەژو کێوو دەشت**
**سەیرانگای پۆلی گەنجی عیراق بووی**
**لەم سەرحەدەدا بۆن خۆش و تاق بووی**
**پێنجوین یەبێ تۆ نزیکە مەرگم**
**لوبنان شکێن بووی داخت بە جەرگم**

لە دوایدا ئەم چەند دێرە هەر بەرکولێکە لەسەر باس و خواستی چڕو پڕو سەرگوزشتەی تۆمار درێژی شاری پێنجوین وەبەس ئیتر شۆوربوونەوە بە ناخێ مێژویی شاردا دوان لەسەر باخ و باخاتی وبەخشندە سروشتییەکانی لێکۆڵینەوە لەسەر کانە ئاسنەکانی و چاڵە بەفرینەکانی مزگەوت و دیوەخانی چایخانەکان و ساغ کردنەوەی شوێنەوارە مێژوییەکانی وەپەیوەندیەکانی شار بە شارەکانی ترەوە یا بەواتەیەکی تر لێکۆڵینەوە بە دروستی و پوختەیی و تۆمارکردنی مێژویی ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری شاری پێنجوین بە تێکرا ئەکەوێتە سەر ئەستۆی جولانەوەی ڕۆشنبیری کورد کە زیاتر پێویستە ئەم ئەرکە پیرۆزەش ڕۆشنبیرانی شاری پێنجوین بیگرنە ئەستۆ ئیترکورد واتاتی ڕەنج پەیژەی سەرکەوتنە وەتا نەدەی ڕەنج ناگەیت بەگەنج.

**دەدە هیجری شاعیر بە**
**باڵای ناوچەی پەنجوین دا هەڵئە دا.**

دەربارەی (پەنجوین) هەستیاری هەرە بەرزی «کاکەیی»

«دەدە هیجری» کە یەکێکە لە کوردانی عیلی کاکەیی وەلەگەرەکی «چای» واتا «خری خاصة»ری شاری کەرکوك نیشتەجی بوە وەخۆی و «خدر لوطفی»ی کاکەیی لە شاری کەرکوك دا رۆژنامەی «نەجمەی کەرکوك»یان بە تورکی - کوردی عەرەبی دەرئەکرد وەبەهەڵبەستی فارسی یش رازاندویانەتەوە لە ساڵی 1935 سپارەیێەکی بچوکی لە هەڵبژاردەی هەڵبەستەکانی خوی لە بەغدا لە چاپخانەی سریانی بەناوی (توحفەی سلێمانی) لە چاپ داوە لەم سپارەیەدا چەند پارچە هەڵبەستی هەیە کە بریتی یە لە هەڵدان بەباڵای شاری سلێمانی وە پیاوانی مەزنی و ناوی هەندی سەیرانگاو شوینەوارە بەناوبانگەکاتی تەنانەت باسی ئەو جێگایانەش ئەکا کە دلیرانی کورد شەریان تیا کردوە وەك «پەنجوین» (مەریوان)، «تاریەر» «پیران».

«خۆش قەڵا». . کە ئێمە تەنها ئەوپارچە هەڵبەستەتان ئەخەینە بەرچاو کە دەڵی: «پەنج وین» سێ ژمارەی لی کەوتوە دەبوایە ناوەکە بە (هەشت وێن) بوایە کەوا لە خوارەوە پارچە هەڵبەستە فارسی و کوردی یەکە ئەنوسین.

## قصیدەی مناظری سلێمانی صفحەی توحفەی سلێمانی

چو «تار» زولف «یار» آن «تاریار» نو عروس آسا
بە جای «شانە» «پنجوین» پەنجە زدە پا در «حنا» دیدم
چەکوە «تاریار» از «تار» «یار» آواز میآید
بەسوی ابن جوانمردان «منادی» زدندا دیدم
بە جولان شد «دوانزە شهسوران مریوانی»
بەقصد دشنمان را نرە شیران غرّا دیدم
ز (پنجوین) س3 رقم باسهو گشت اصلش «ابهشتون) است
چە (کوثر) حوضەها یاروضەها خۆش سنبزەها دیدم
محل «کوە پیران» «کوی پیران» «قلعە پیران»
کە در دل نوجوان این «کول» ودیەوخۆش قەلا دیوم وا

**دەقی ئەم هەڵبەستە کە زاناو میژ وونوسی کورد محمد جمیل** رۆژ بەیانی کردویەتی بەکوردی لە خوارەوە ئەینوسین.

**وەکو تاڵ تاڵی (تار)ی زولفی یارە ئەو «تاریار»ە چەشنی نەوبووك**
**ألەباتی «شانە» پەنجوین پەنجەی داوە لەسەر پای پای خەناوی بووك**
**چ کێوێ! «تاریار» لە تاری یارەوە ئاوازی هەڵدەسێ، هەڵدەسێ**
**بەرەولاوی جەوانمەردان جارچی لە جارا دیتە بەرچاوم**
**لە گەزدش «دوانزدە شاسوارانی مەریوان» دیتەوە مەیدان**
**بەرەو دوژمن ئەچن وەك شێری نەر بە نەرە نەر**
**لە «پەنجوین» س3 ژمارە هەڵەبو راستی «بەهشت وینە»**
**هەواری «کوهی پیران» «کوی پیران»° «قەڵای پیران»**
**لە دل دا نەوجەوانن ئەم چیاو دیی پیران و خۆش**
**(قەڵا) ی جوان.**

تی بینی . . ئەو ناوانەی کە خراونەتە ناوکەوانەوە بریتی یە لە ناوی ئەوگوندو دیی وقەلاو شوینانەن کە دلاوەرانی کورد لە سەردەمی بابان وەشیخی گەورە شێخ محمودی نەمر دا بەرامبەر دوژمن تیایا جەنگاون ناوچەی پەنجوین بەدریژایی میژ ووی نەوەستاوی کەڵە پیاو وزاناو داناو شاعیرو ئایین پەروەری لێ هاتووی گرتوتە ئامیز، هەمیشە بە ئاووهەوای سازگاری پەروەردەی کردون بە شیری دلسوزی بۆ نیشتمان مەلاشووی هەلهنیاونەوە وەبو خزمەت کردنی کۆمەلانی خەڵك چاکەومیرخاصی دڵ و مشکی کردونەتەوە لەپێش هەلهاتنی ئەستیرەی جریوەداری مامۆستا قانع وەمەلا عبدالله مفتی وەشاعیرو زانایانی تردا مەلا عبدوالرەحمان کوری مەلا محمد شێخ ومارین کە بەناو مەلا عبدالرەحمانی پەنجوینی ناوبانگی دەرچوە بەوینەی مانگی چواردە لە ئاسمانی زانایان وئایین پەروەرانی ناوچەی پەنجوین دا ئەدرەوشایەوە. مەلا عبدوالرەحمان لە پەنجوین لە ساڵی 1250 کوچی هاتوتە دنیاوە لەپاش ئەوەی لای باوکی دەرسی سەرەتایی تەواو

کرد کەوتــە گەشت وەری بەنــاو مەلبــەنــدە ئاینیــەکــانی کوردستــان دا هاتــە سلێمــانی چوە سنــەو هەورامــان وەرەوانــدوز لە دوایی دا بە زانـایی و گەورەیی بۆ پەنجـوین گەرایەوە، لەپێش دا لای ملا ئەحمدی چاومار دوایی لای مەلا محمــد فەخــری زانــایــان، لای مەلا ئەحمــدی نودەشی، لای مەلاعمــری خیــلانی، لای مەلا حسنی چوری خویندیوەیەتی لە دوایی‌دا ئیجازەی زانایی لە مەلا عمر قزلجی وەرگرتوە.

لەو قوتابیانەی کە لەبەردەستی دا خویندویانە وەبون بە مەلاو زانا بریتی‌ین لە مەلا حسینی پیسکەنی، مەلا رشید بگ بابـان مەلا سەعید ئاغجەلەری، مەلا سەعید سهلی مفــتــی کفــری، مەلا عزیــز روح زادە، مەلا عزیــز بنــاوەســوتــە. . هتد مەلا عبدوالرەحمان پاش ئەوەی بوە بەزانــا لەنــاوچــەی خوی‌دا پەنجـوین ئەرکی خوینــدن و پی‌گــەیــانــدنی رولەکانی ولاتی گرتوتە ئەستوو تا لە سالی 1319 کوچــی‌دا دوایــی کرد. بەراستــمــان زانــی هەر سەرگــوزەشتــەی زانایەکی وا گەورە بهێنیتەوە بۆ نمونە. . . کورد واتانی مشتی نمونەی خەرواریکە.

**روشنیرانی سلیمانی بۆ لی‌قەوماوانی**
**شاری پێنجوین هەستی دلسوزی‌و**
**هاوسوزی دەر ئەبرن**

کارەساتە جەرگ برەکەی شاری پێنجوین بومەلەرزەکەی سالی 1946 لە ناخــەوە دل ودەروونی دانیشتــوانی شــاری هەلــمــەتــو قوربــانی هەژان هەستی کوردایــەتی‌و گیــانی پشت گیــری وەیــارمــەتی دانی لەنــاو نێشتمــان پەروەران دا بەرزکردەوە بویە روشنبیــران و قوتــابیــانی خوین گەرم بەو پەری دلســوزیــەوە بەدەنــگ هاوارو نالــەی لی قــەومــاوانی پێنجــوینــەوە هاتن وەبو یارمــەتیٔ دانیــان تەمسیلیکیان بەناوی (لەری‌ی نیشتمان)دا لە قوتــابخانەی گویژە لەناوجەرگەی شاردا ساز دا کە لەئەنجام دا کەنــزیکــەی هەفتــەیــەك دەوامی کرد کەوەکــو روشنبیری بەریز حیلمی علی شریف دەلیت نزیکـــەی دوو هەزار دنیــاری‌یــان کوکــردەوە کە بەم ریکــەیــە توانیــان ئەرکی نیشتمانی وهەستی برایەتی سوزی دلسوزیان بەرامبەر لی قەوماوان دەربرن.

کارەســاتی ناهــەمــواری بومــەلــەرزە کە کلولی و دامــاوی دانــیشتــوانی پێنجــوین دل و دەروونی شاعیــری کورد فایق (بــەختیــار زیــوەری) هەژان وەکــانیــاوی نشتیمــان پەروەری‌و هونــەری شیعری تەقیانەوە بۆیە نەی‌کردە نامەردی دەستی دایە خامەو هەر لە چایخانەکەی قەراغ شاری جاران خوار باغچەی گشتی لە چایخــانــەکەی سعید طە کویی هەوارگەی دانیشتنی ئێوارانی لاوانی تازە کورە ئەم پارچە هۆنراوەیەی دانا کە هەموو رۆژی هونــەرمــەنــدی لی‌هــاتــوو رەفیق چالاك پێش دەست پی‌کــردنی تەمسیلەکــە بە دەنگی زولالی بۆهاندانی بینەران بۆ یارمەتی‌دانیان ئەیخوینیدەوە کە بەم چەشنە بەختیار زیوەر ئەرکی نێشتمــانی بەرامبــەر شاری کلول بەجی‌هینــا کە لە دوایی‌دا گرنــگــی و بایــەخ داری بە تەمسیلەکــەو کوبــونــەوەکــە داو وەلاپــەریەکی تری خستە سەر سەرگوزەشتەی مێژووی شاری پێنجــوین ئەمــەش دەقی پارچــە هونراوەکەیە کە لە سلێمانی لە 19/8/1946 هۆنیوەتەوە

**بەهەشتیکی گوم بوو.**

گیانەکەم: هاوریٔ‌ی ژیانم !(نازەینن)
کوا لەکوی ؟دل بۆتە کانی ئاگرین
بیرەوە وا لەشکری دەردو خەجار
جی‌ی بەمن لێژ کردوە ئەمرۆ بەقین
بیرەوە وا کوشکی شادیم دەم بە دەم
وردە وردە رو ئەچی بۆ ژێر زەمین
بیرەوە هەرچەند ئەزانم دیدەیت
ئەم دلەم ناخاتەوە سەر پیکەنین
وازەمان ئەمرۆ بەپەنجەی نەگبەتی
جەرگی کون کردم وەکو دێوی لەعین
ئەو بەهەشتەی کیژ و کور رووی تی ئەکرد
بۆ ئەوەی هاوین بە خۆشی تیایا بژ ین
دل دەلی یادیکی رابووردووی بکەن
یادی (پینجوین) دل ئەخاتە سەرفرین

دیتەوە یادت چ خوش بوو دیمەنی
بەرزو شیرین هەروەکوا خەلدی بەرین
دیتەوە یادت هەوای چوار باخەکەی
چون دەوایەك بو بو قەلبی حەزین
دیتەو یادت چ خوش بوو ئاوەکەی
ساردوو شیرین هەروەکو ئەسکەنجە میل؟
دیتەوە یادت نزارو شیوە لیّ
پر لە مەلّ بوو پر گولاّلّەو یاسەمین؟
دیتەوە یادت بەشەو لەو خاکەدا
چون لەگەلّ شادی ئەچوینە ناو کەمین
دیتەوە یادت بەروّژ هەرکوی ئەچوین
چەپلە ریزان بوو زەماوەند هەلپەرین
چەندە خوش بوو لەوکەلانە دەنگی مەل
رووی ئەکردە سەر زەوی‌و ئاسمانی شین
ئای چی خوشمان رائەبوارد ئەو مودەتەی
شاری پینجوین مان ئەکردە جی‌نشین
هەر پەنا شاخی ئەچووین دەنگی ژیان
گوی‌ی‌دلی سەرمەست ئەکردین بە پیکەنین
هەر مروّڤیکمان ئەدی هەستیکی پاك
کورد پەرستی زیاد ئەکردین زوّر بەتین
هەر سەرئاویکی ئەچوین نەشئەی ولاّت
ئەم دلەی ئیمەی ئەخستە راچەنین
هەر گولستانیکی روومان تیّ ئەکرد
کەلکەلەی عەشقی ئەخستینە فرین
نازەنین: دەستی شکاوم داخەکەم
ئیستە «پینجوین» دلّ ئەخاتە سەرگرین
ئەوتەلارانە کە هەندی بەرزو خوش
رووچوە بوتە کەلاوە نائەمین
ئەو چ مەنزارەی هەوارگەی ئیمە بوو
وا پەپو تیایا ئەخوینی پر بە بین
ئەوسرورو شادی‌یەی لەو جی‌یە بوو
ئیستە بوتە باوکەروو هاوارو شین

ئەو مروڤانەی لەوی بوون شادمان
ئاوەکی کەوتوون بی بەخت و نگین
بەم بەرەجەژنانە مالّ ویران و هەژار
تا بەدل ناچار هەموویان دەرپەرین
بومەلەرزە وا سەرەو ژیری کردوە
بگرە قەت نابیتەوە مەلبەندی ژین
با بچین تووخوا بەرامبەر جیگەکەی
تیروپر بگرین بەجەرگی پر برین
با بچین چونکە بەهەشتی ئیمە بوو
شیوەنیکی بو بگیرین ماتەمین
با بچین بو دلّ نەوایی ئەهلەکەی
رووکەیتە کوردی پر عەزم و یەقین
بەك بە بەك بنیات بنین دلسوزەکان
ئەم برینانە بەناموس و بە دین
وا فەلەك دووچاری کردن قەت نەکەن
زوو فەراموشیان بکەن بیگانە نین
ئەم برایانە هە مو دەستی قەدەر
ناو دلّی توی کردن و جەرگی برین
بینەوە بو کومەکو باربووی ئەوان
ناو تەلارو ناو دەوارو زەنج بچین
بو هەموویان یارمەتیکی وا بدەین
جەرگیان ساریژ بکاوەك پنسلین
سا بە قوربانی هەموتان بم بە دلّ
روّژی باربوویانە با رووسوورین

**سەرچاوەکان**

| | |
|---|---|
| **میژویی شاری سلیمانی** | **ئەمین زەکی یەگە** |
| **گەشتی پینجوین** | **شاکر فتاح** |
| **گوڤاری سومەر** | **سالّی 1952** |
| **یادی مفتی** | **سالّی 1952** |
| **دیوانی شیخ سەلام** | **سالّی 1952** |
| **دیوانی بی‌کەس** | **سالّی 1952** |

# قورئان لەشیعری جزیری دا

د. أمین موتابچی
کولێجی ئەدەبیات زانکۆی بەغدا

شاعیـران و ئەدیبـانی کورد بەزۆری خوێنـدنیـان لە حوجـرەو مزگـەوت و خانـەقـاکـان دا تەواو دەکـردو ئەو زانسـتـانـەی کە دەیـان خوێنـد بریتی بوو لەزانستی ئاینی «فیقـەو شەرع و ئوصـول و قورئـان و تەفسیـرو زمـانی عەرەبیو گەلێ بابەتی تر».

کاتێ کە ئەم بابـەتـانـەیـان تەواو دەکـرد بەواتـا دەبـوونە مەلای دوانـزە عیلم شارەزاییـەکی تەواویـان پەیـدا دەکرلەو زانستانەدا. بەزۆری ئەو کتێبانەی کە دەیان خوێند لەگەڵ قورئـانی پیـرۆزدابـە عەرەبی بوون لەبـەرئەوە شارەزاییەکیء باشیـان دەبـوو لەزمـانی عەرەبیدا، ئەمـەو جگـە لەزمـانی فارسیو تورکی ئەویش بەپێی زروفی سیاسیو جوغرافیای وڵاتەکەیان و بەپێ ئەوەی کەهێندێ لەو کتێبانەی کە دەیان خوێند بەیەکێ لەدووزمانەی دراوسێیان دەبوو.

لەبـەر ئەوەی کەقـورئـانی پیـرۆز بەزمـانی عەرەبی بۆ موسڵمـانـان هاتـۆتـەخـوارێ، بوو بووبـەزمانی رۆشنبیریو زانیاری میللەتە موسڵمانەکان. جا لە بەرئەمە زانستی زمان و دەستورو هونەرەبەیانییەکان لەبۆ بەیان و رۆشن کردنەوەی قورئـان و پیشـانـدانی رەوانیو سازگاری قورئان رۆژ بەرۆژ بوێیشەوە دەرۆییشت و لە نەشو نومادابوو.

لەودەورەدا ئەندازەی قسەی رەوان و سازگار، قورئان بوو جا شاعیرو نووسەرانی میللەتە موسڵمانەکان هەوڵیان دەدا تا واژەو تەرکیبی قورئـانی لەشیعـرو نووسینـە کانیـانـدا بەکـار بهێنن. جگـە لەوەش واتـاو قسـەو حیکـایـە تەکانی قورئان وەربگرن و لەگەڵ شیعرو نووسینەکانیاندا بەپێی شوێن و بابەت بەکاری بهێنن. چونکە ئە قسەو شیعرانە کە بەقورئان دەرازایـەوەو دەهـۆنـرایـە وە لای خەلکی موسڵمـان ـ ئەو خەلکانەی کە لەسەرتای ژیانی یەوەتا ئەو رۆژەی دەمرێت لەگەڵ ئایاتی قورئانیدا راهاتووەو گوێی پێزاخاو دراوەتەوە ـ زیاتر چەشەی لێ وەردەگرت و پێی خۆش دەبوو پلەی ئەو شیعرو نووسینەی لا باڵاترو بەنرخ تردەبوو.

هەر وەکو گوتمان چونکە خوێندن و فێربوونی قورئان و شارەزایی تیـایـدا لەسـەرەتای خوێندنەوە دەستیپێ دەکرد، دەبینین شاعیرو ئەدیبەکانی کورد ـ بەتایبەتی ئەوانەی پێیان دەڵێن دەوریکـۆن ـ چونکـە لە حوجرەو مزگـەوتـەکـانـدا پەروەردە دەبوون یەکەم جار قورئان فێر دەبوون و لەبەریان دەکردو تیایدا شارەزادەبوون ئەمەجگە لە حەدیثی پێغەمبەر (ص)و زانستەکانی تر.

لە بەرئـەوە دەبنین لەبـەرهـەرمی زۆر لە شاعیـرەکـانمانا

ئیشارەت هەیە بۆ قورئانی پیرۆزو حەدیثی پیغەمبەرو پەندو قسەی نەستەق و داستان و حیکایەت و رووداوی ناو موسڵمانەکان.

ئەوەی کە ئیشارەتە بۆقورئان لە عەرەبی‌دا پێی دەڵێن «إقتباس»[1] وەئەمەش گەلێ شێوەو دەستوری هەیە.

شاعیرەکانمان ئەوانەی لە شیعرەکانیاندا ئیشارەتیان بۆ قورئان کردووە، بەچەند جۆرێك ئەم کارەیان بە ئەنجام گەیاندووە. ئەویش یایەکسەر ئایەتێك لەئایەتی قورئانی وەرگرتووەو بێ دەستکاری لەگەڵ شیعرەکەیدا داناوە، وەیا بەشێکی وەیا ووشەیەکی وەیا تەرکیبێکی، وەیا «عیبارە»تێکی بەکەمی گۆرینەوە وەیا ئیشارەیەك بۆ مەبەستێك یا بابەتێك یا حیکایەتی کەلەقورئانی پیرۆزدا باسی‌کراوە وەری گرتووە.

ئێمە لێرەدا بەبەرەکەتی مەلاجزیری یەوە دەرگای ئەم باسە دەخەینە سەرپشت تا دوابەدوای ئەمە بەم جۆرەباسانە کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەندبکرێ. مەلای جزیری شاعیرو پیری خواناس و شێخی پایە بەرزی ناوچەی جزیرەو بوتانی (سەدەی دەهەمی کۆچی)[2] بە دەنگی زولاڵی پر لە عیشق و خۆشەویستی «مجازی‌و حقیقی» دیوانی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی رازانۆتەوە.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە مەلای جزیری بە شێوەی جیاجیا سودی لە قورئان وەرگرتووەو لە شیعرەکانیا بەکاری هێناوەو ئیشارەتی بۆکردووە بەم جۆرانەی کە لەخوارەوە باسیان دەکەین.

1 ـ جاری‌وا هەیە تاکەتاکەی واژەی‌قورئانی لە ناویەتیەکانیا داناوە وەکو: طور. سبحانك. یعقوب. کنعان وعَلم...

2 ـ وەیا تەرکیبێکی قورئانی وەرگرتووە وەك:
لیطمئن قلبی. لیلة القدر.

3 ـ جاری‌دا هەیە خۆی ترکیبێکی لە قورئان دروست کردووە.
وەك:
نیم بسمل. عروەتی‌و ثقایە. یدی بیضا. نارێ خلیل الله إن مکباً باسطاً دهراً ذراعاً بالوصید. شەبێ قەدران شەبی قەدرێ.

4 ـ وەیا ئیشارەت دەکا بەناوی هێندێ سورەت وەیا بەشێك لە سورەتێك وەك.
سورەی انافتحنا، ام الکتاب. آیە الکرسی.[52]

5 ـ وە لە زۆرشوێنیشا واتاو مەبەستی ئایەتێ لە شیعرەکانیا داناوەوە ئیشارەتی بۆ حیکایەت و داستان دەربارەی پێغەمبەران کردووە.

وا لە خوارەوە ئەو شیعرانەی کە بەجۆرێك لەوانەی کەلە سەرەوە باسمان کرد، پیشان دەدەین و ناوی سورەتەکەو ژمارەی ئایەتەکە دەنوسین.

سەرنج:
بۆ ئەوەی خوێنەری خۆشەویست دووچاری دەردی‌سەرو نارەحەتی نەبێ لەکاتی خوێندنەوەی ئەم چەند لاپەرەیەدا شێوەی باسەکە بەم جۆرەیە:

یەکەم: دیوانی مەلایێ جزیری ـ صادق بهاءالدین ـ چاپی یەکێ، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد 1977 ـ بەغدا بۆ شیعرەکانی مەلا بەکار هێنراوە.

دووەم: لە هەرقەسیدەیەکم وەرگرتبێ بۆ ئەوەی هەموو قەسیدە کە نەنوسرێتەوە ژمارەی قەسیدەکەو لاپەرەکەی بەپێ ئەوشیوانەی کە لەسەرەوە ناوی هێنراوە بەکار هاتووە.

سێهەم: جاری واهەیە چەند ئایەتێك کە پەیوەندی بەئیشارەتەکەی شاعیرەوە هەیە پیشاندراوە بۆ روونکردنەوەو تێگەیشتن لە مەبەست و حیکایەتەکە.

(بەشی یەکەم)

قەسیدەی 2/ئا ل 80 ـ 82

ئەرواحی موقەددەس شەبی قەدران تەدخوازن نورا تەیە
مصباحی دقەندیلی حەرەم دا.

انا انزلنا في ليلة القدر ئایەتی (1)
وما ادراك ماليلة القدر ئایەتی (2)
ليلةُ القدر خير من الف شهر ئایەتی (3)
سورەتی (القدر)[3]

قەسیدەی 3/ئا ل 88 ـ 90

عیــدەو حەبیبێ نەزەرەلێیـان دی ب قوربـان بی مەلێ
یارەب بینم رۆژهلێ (سكين) ددەست قاصابیدا

«فلما بلغ معه السعى يابُنى إنى أرى في المنام أنى اذبحك فانظر ماذا ترى، قال ياابت افعل ماتؤمر ستجدنى إن شاء الله من الصابرين».
ئایەتی (102)
سورەتی (الصافات)[4]

قەسیدەی 8/ئا ل 99 ـ 109

شوكور بیناهی یا من هات و «یعقوب» دیدەرەو شەن بوو
ببوو یایوسفێ مصرێ ل كنعانی بەصەرپێدا.

«اذهبوُا بقَميصى هذا فَألقوُه على وجهِ ابى ياتِ بصيراً واتُونى بأهِلكمُ اجمعين. ئایەتی (92).
«ولمـا فَصلَتِ العيـرُ قالَ ابـوهُم انى لأجدُ ريحَ يُوسُفَ لولا ان تُفنِدون. ئایەتی (93).
«فَكما جاَء البشيرُ القهُ على وجههِ فارتدَ بصيراً قالَ لَم اقُل لكمُ انى اعلمُ مِن آللهِ مالاتَعملوُنَ. ئایەتی (95).
سورەتی (یوسف)[5]

ژ وادی ئەیمــە نادلبــەر نزام ئەنگـوشتـەك اظهـاركـر كو
خوەش ئەنوارو بەرقن ئەو تەجەللابوون دطوریدا.
«فَلما أتاها نودىَ من شاطىِ الوادى الايمنِ في البقعةَ المُبــاركَــهِ من آلشجــرَةِ أن يامــوسى إنى اَنـــا اُللهُ ربُ العالمين. ئایەتی (29).
سورەتی (القصص)[6]

زەهی دەردێ مەزن فرقەت جەگەر سۆت ئاتەشی دادل
جهێ صەبری نەماچەندان فەرەج من دیـد صەبریدا.
«وَآصبر وما صَبرُكَ إلا بآلله ولاتَحزَن عَليهمْ ولاَتَكُ فى ضَيْقٍ مما تَمْكرُونَ» ئایەتی (127).
سورەتی (النحل)

«فإنَ مع ألعُسْرِيُسْراً» ئایەتی «5»
«إن مع ألعُسِر يُسْراً» ئایەتی «6».
سورەتی (الانشراح»

قەسیدەی 9/ئا ل 109 ـ 111
مەددل «عروەتی وثقایە» ب دەست
ژئەنایاتە سەر ئەلقابی دوعا

« لا إكْراه في الـدينِ قد تَبينَ آلـرُشـدُ مِن ألغى ِ فمن يكْفُر بالطّاغُوتِو يُؤمِنْ بالله فَقد آستَمسْكَ بالعُروَةِ الوثْقىُ لا انِفصَامَ لهاو الله سَميعٌ عَليمُ. ئایەتی «255».
سورەتی (البقرة)

قەسیدەی 1/ب ك 11ـ 115
وەیە هودهود ژسبا بێت ویزانین چیـیەحال
لەو ل حالێ مەغەریبان نەسوئالیو نەجەواب

«فَمكثَ غير بعيدٍ فقالَ اَحطتُ بِما لَم تُحطِ بِهِ وجئْتُكَ مِن سَبَإٍ بنبإٍ يَقينٍ» ئايەتى (22).
سورەتى (النمل)[7]

قەسیدەی 4/ب ل 122 ـ 128
هود هودەك خوەش طەبعى من ئیـروو دڤێ هەر وەك
نەسیم داب بال دلبەر هنارا بانیا دیساجەواب.

«وتَفَقَّد الطَّيْرَ فقالَ مالى لا أرى الْهدهُدَ أمْ كانَ مِن الغائبين».
ئايەتى (20)

«فَمكث غيرَ بَعيدٍ فقال احَطْتُ بِما لَم يُحط به وَجئْتُكَ مِن سَبَإٍ بنبإٍ يَقينٍ».
ئايەتى (22)

«إذْ هَبْ بِكتابى هذا فَألْقِه إليهم ثمَّ تَوَلَّ عنهم فانظر ماذا يرجعون» ئايەتى (28).
سورەتى (النمل)[8]

قەسیدەی 2/ت ل 135 ـ 139
گەر ژوێ حورى سرشتێ عشویەك اظهار بت دێ ببت
نارێ خليل اللهو دوژەهـ ساربت.

«قُلنا ياناُر كُونى بَرداًوَ سَلاماً على إبراهيم». ئايەتى (69).
سورەتى (الانبياء).[9]

وەر ژ بەر پەردێ یەدى بەيضا ب موعجز بێتە دەر شەمس
و كەوكەب دێ هلين عالەم تەژى ئەنواربت.

«وآضْمُمْ يَدَكَ إلى جَناحِإ تَخرُج بيضاء من غير سوء أيةً أخرى».
ئايەتى (22)
سورەتى (طه)

«ونزع يدهُ فإذا هى بيضاءُ للناظرين» ئايەتى (108).
سورەتى (الاعراف)

«ونزع يده فإذا هى بيضاء للناظرين» ئايەتى (33).
سورەتى (الشعراء)

«وأدخل يدك في جيبك تَخرُج بَيْضَاء من غير سُوء في تسع آيات الى فرعون و قومـهِ انهم كانوا قوماً فاسقين».
ئايەتى 12.
سورة النمل[10]

«هـذا عَطـآؤنـا فامْنُنْ أو أَمسِك بَغيرِ حِسابٍ» ئايەتى

حاجەت نیە جانا یەدى یەدى بەیضا ب دەر نانین

فَالقىٰ فإذا هى ثعبان مبين (107) ونَـزَع يَدَهُ فإذا هى
هذا لساحرُ عليم (109).
«عين العيان» دڤێتن كافى هن درايەت

«وإذ قال إبراهيمُ رَب أرنى كيفَ تحُى الموتىٰ قال أوَلَم تُؤمِن قالَ بلىٰ ولكن لِيَطْمَئن قَلبى قالَ فَخُـذ أربعـةً مَن الطير فِصُرهُنَّ إليك ثُم آجْعَل علىٰ كل جَبلٍ مِنْهُنَّ جُزءاً ثُمَّ آدعُـهـنَّ يأتيـنـك سَعيٍ وَآعلم أن آلله عَزيـزٌ حكيم»
ئايەتى (260).
سورەتى (البقرة)[12]

قەسیدەی 2/ت ل156 ـ 159

رازی دەهری ژسپە هری تونزانی ب جەدەل

حکمەتێ داوەرە توژ حکمەتی داوەر مەکە بەحث

«وإن جادَلُوكَ فَقُل آللهُ أَعلَمُ بِما تَعملُونَ» ئایەتی (68).

سورەتی (الحج)

قەسیدەی 1/ج ل 165 ـ 167

زوهرە بـ قەرانی «قاب قوسین»

«والنجم إذا هوى بمدراج»

«ثُمَّ دنا فتَدلىٰ (8) فكان قَابَ قَوسَينِ أَو أَدنىٰ (9)

«والنَجمِ إذا هَوَى» ئایەتی (1).

سورەتی (النجم)[13]

قەسیدەی 2/خ ل177 ـ 180

گەر خەبەرداری ژسررا «كنت كنزا» گوهـ بدێر

داب سەدتۆری بەیان کت مەعنەیێ «لولاك» روح

لامعی سررا تەجللا سەر ل طورێ دل ددت

ضەبط ناکت وێ مەجالێ سەد هەزار ئەفلاکێ روح

«كنت كنزاً مخفياً»

حدیثی قودسیـي

«لولاك لولاك لما خلقت الافلاك»

حدیثی قودسییە[14]

2 ـ «ولَماً جاء موسىٰ لميقاتنا وكلمهُ ربُهُ قال رب أرني أنظرُ اليك قالَ لن تراني و ولكن أنظرُ الى الجبل فإن استقرَ مكانهُ فسوف تراني فلما تَجلّى ربُه للجبلِ جَعَلهُ دَكاً وخر مُوسى صعقاً فلَما أفاق قال سبحانكَ تُبتُ اليك وانا أولُ المؤمنين» ئایەتی 143

سورەتی (الاعراف)[15]

قەسیدەی 1/د ل196 ـ 198

سەری وەح دەت ژ ئەزەل گرتییە حەتتا ب ئەبەد واحدو

فەردە بزاتێ خوەوی نین چوعەدەد.

«قلْ هو الله احد (1) الله الصَمدُ (2) لم يلدِ ولم يُولَد (3) ولم يكن له كُفواً أحدٌ (4).

سورەتی (الاخلاص)

«كل يوم هو فى شأن» نەبی غافل ژێ

هەر پەیاپەی ژ شۆنان دكرت (فيض)و مەدەد

«يَسئلُهُ مَن فى السمٰواتِ وآلارضِ كُلَّ يَومٍ هُوَ في شأنٍ».

ئایەتی (29) سورەتی (الرحمن)

گەر دنادەم بديا سرری علمی بثلبيسى

«حينما أبصره كبرَ حيناً وسجد».

«وإذ قُلنـا للمـلائكـةِ آسْجُدُوا لِأدَمَ فَسجدُوا إلا إبليسَ أبى وآستكبرَ وكان من الكافرين». ئایەتی (34) سورەتی (البقرة)

«ولقد خَلقناكم ثُم صَوَّرناكُم ثم قُلنا للملائِكةِ آسْجُدُوا لأدَم فَسَجدُوا إلا ابليسَ لَم يَكُن مِن آلسَاجِدين» ئایەتی (11) سورەتی (الاعراف)

«فسجد الملائكة كُلهُم أجمعُون (73) إلا إبليس آستكبَرَ وكان من الكافرِين (74).

سورەتی (ص)

«وإذ قالَ رَبُّك للملائِكة إني جاعلٌ في الأرض خَليفة قالُوا اتجعلُ فيها مَن يُفسِده فيها وَيسِفكُ الِدمَاء ونحن نُسبحُ بحمدك ونُقدسُ لك قال إِني أعلمُ مالا تعلَمُون».
ئايەتی (30) سورەتی (البقرة)

«وعلم ادم الاسماء كُلها ثم عَرضهم على الملائِكةِ فقالَ أنبؤني بأسماء هؤلاء إنكنتم صادقين» ئايەتی (31).
سورەتی (البقرة)[16]

قەسیدەی 2/د ل198 ـ 201
دەرگەهێ لوطفا تەخانم مال مەحرومان ڤەبی
«إن كلباً باسطاً دهراً ذراعاً بالوصيد»

«وَتَحسبُهمُ أيقاظاً وهُم رُقودُ ونُقلبُهُمْ ذاتَ اليَمينِ وَذاتَ الشمالِ وكلُبهمُ بسطٌ ذِراعَيهِ بالوَصيد لو اَطُلقت عَليهم لَوَلَيْتَ مِنهم فِراراً ولملئتَ مِنهُم رُعباً» ئايەتی (18)
سورەتی (الكهف)[17]

كى خلاص أز دوزخ هجر تويابم أى جوان
«هر نفس داروصلاو نفرهو هل من مزيد».

«يَومَ نَقولُ لجهَنَم هل امتلأتِ وَتَقُولُ هَل من مزيدٍ» ئايەتی (30).

سورەتی (ق)

قەسیدەی 2/ر ل 207 ـ 209
ژ بەر دێمی نقاب ئاڤێت و دەستوورا طەوافێ دا دسەعیێ (بيت) و ئیحرامێ و من «أسود» زیارەت کر.

«إن الصَّفا والمروةِ مِن شعائر الله فمن حج اَلبيَت أو اَعتَمرَ فلا جُناحَ عَليه أن يَطوَّفَ بِهما ومن تَطَوَعَ خيراً فإنَّ الله شاكرٌ عَليمٌ» ئايەتی (158)
سورەتی (البقرة)[18]

ب دیناری دنێ زنهاردا یارێ‌خوە تو نەفرووشی
کە سێ یوسف فرووتی وی دعالەمدا خەسارەت کر

«وَشَرَوهُ بِثَمن بخَسٍ دَراهم مَعدُودَةٍ وكانُوا فيهِ مِنَ اَلزاهِدين». ئايەتی (20).
سورەتی (يُوسُف)[19]

قەسیدەی 2/ز ل 216 ـ 219
طۆرم ب دل و پەیرەوی موسایم ئەز
ئاتە شپەرەس نوری تەجللایم ئەز

«إذ قالَ مُوسى لأهلهِ إِني آنستُ ناراً سآتيكم مِنها بِخبَر أو آتيكُم بِشهابٍ قَبَس لَعَلكُم تَصطَلُون» ئايەتی (7).
سورەتی (النمل)

«فلما قَضىٰ مُوسىٰ اَلأجَلَ وَسارَ بأهلهِ آنَسَ مِنْ جانب الطُورِ ناراً قالَ لأهلهِ اَمكُثُوا إِني آنَسْتُ ناراً لَعلِّىٰ آتيكم بخَبَر او جَذوةٍ من النارِ لَلُكُمْ تَصطَلُونَ» ئايەتی (29).
سورەتی (القصص)[20]

بارێژ (وعلّم) کوخە بەرداری کرین
ئیروو تویژان ئادەمی ئەسمایم ئەز

«وَعَلّمَ آدَمَ الأسماءَ كُلها ثُم عَرضَهُم على الملائِكةِ فقالَ أنبؤني بأسماء هؤلاء ان كُنتُم صَادقِينَ» ئايەتی (31).

سورەتی (البقرة)[21]

«انشائی علوم لدنی» چونکە م زانی
زانی ب حەقیقەت کوچ ئینشایم ئەز

«فَوَجَدَا عبداً مِن عبادِنا آتيناهُ رحمةً مِن عِندنا وعَلَّمناهُ من لَدُنّا عَلماً» ئايەتى (65).

سورەتىَ (الكهف)

توژ نوسخەئى تەوحيدى مەخوون ئايەتى نەفيىَ
بىَ ئالەتى ئيثباتىَ كوئيللايم ئەز

ئيشارتە بە (كەليمەى تەوحيد)
«لا اله الا الله . . .». (كلمة الشهادة).

قەسيدەى 2/س ل230 ـ 233
حەوجە سحرى سامرى نينن كوزولفا رەش بكت
چەشمىَ بەندا دلروبايان كاگولا (عيّار) بەس

«قالَ فإنا فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنْ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ السَّامِرِيُّ» ئايەتى (85).

سورەتى (طه)

غەرقىَ دەريايىَ گوناهيَن تەشنەئى لوطفاحەقين
رەحمەتى ئامرزگارو شفقەئى (غفّار) بەس

«إلا الَّذين تابُوا مِن قَبلِ أن تَقدِرُوا عَلَيهِم فَآعلمُوا أن الله غَفُورٌ «رَحيمٌ» ئايەتى (34).

سورەتى (المائدة)

قەسيدەى 2/ش ل237 ـ 239
شەبى قەدرىَ ل مەرەشەن كە توروحى وەرەخوَش
مەژنو خوەش كەل سەرچەهڤىَ شەهيديَن خوەبمەش

«ليلةُ القدر خيرٌ من الف شهر» ئايەتى (3).

سورەتى «القدر»

قەسيدەى 1/ض ل244 ـ 245
جەبهەت و ديَم و گەردەنىَ پەردە دەما ژ بەربرەت
فەرضە «مەلا» ل حاجيان سەعى و طەواف و عومرە (فرض)

«إن الصفا والمرَوةَ مِن شعائر آلله فمن حج ألبيت أو آعتَمرَ فلا جُناحَ عَلَيهِ أن يَطوفَ بِهما ومن تَطَوَّعَ خيراً فإن الله شاكرٌ عَليمٌ». ئايەتى (58).

سورەتى (البقرة)

قەسيدەى /2/ض ل 245 ـ 247
دشەبىَ قەدرىَ تەجەللا توبكى
مەل پىَ هوم و شەمالىَ ﭺ (عَرَض).

إنا انزلناه في ليلةِ القدر (1) وما ادراك ماليلة القدر (2) ليلةُ القدر خيرُ من ألف شهرٍ (3).

سورەتى (القدر)

قەسيدەى 1/ط ك 248 ـ 251
(الله) دبەر قال و بەلىَ
دايە غمەكت قەلبىَ مەلىَ

«وإذا أخذ ربُّك مِن بنى آدم من ظهـورِهم ذُرِيَتَهُم وأشهدهُم على انفسهم ألستُ بِربِكم قالُوا بلىٰ شهِدنا ان تَقولُوا يَومَ القيٰمةِ إنا كُنا عن هذا غافلين». ئايەتى (172).

سورەتى (الاعراف)

قەسيدەى 3/ط ك 254ـ 258
مثلى موسا وىَ تەجەللا ياتەدى
ئىَ تودى كانى خەطاهانى غەلەط

«ولما جاء موسىٰ لمقاتِنا وكلمه ربُهُ قال رَبِ انظر اليك قال لن تراني و ولكن اُنظـر إلى الجَبـل فإن آستقرَّ مكـانَـهُ فسوفَ تراني فلما تجلىٰ ربه للجَبل جَعَلُه دكاً وَخرَ مُوسى صَعِيقــاً فلمــا أفـاقَ قالَ سُبحـانـكَ تِبتُ إليـكَ وأنـا أولُ المؤمنين». ئايەتی (143).

سورەتی (الاعراف)[22]

قەسیدەی 1/ف ل 261 ـ 264

سەر ددت ئابی کەوثەری
زەمزەمە ئو سەمای زولف
سایە نومای خاوەری
سەرەێ مونتەهای زولف

«إنا أعطيناك الكوثر» ئايەتی (1) سورەتی (الكوثر).
«وَلَقَـد رآهُ نُزلـةً أُخـرىٰ (13) عِنـد سدرة آلمُنتهىٰ (14) عندها جنةُ المأوىٰ (15).
إذ يغشىٰ السدرَةَ ما يَغشىٰ (16) سورەتی (النجم).

قەسیدەی 1/ق ل 268 ـ 269

مەژدەست و-پەدی بەیضاقە دەحەك صافی ڤەخوار
«شعشعانی کنجم سناه و بریق».

«ونــزع يده فإذا هي بيضــاء للنـاظـرين» ئايـەتی (108) سورەتی (الاعراف).
«ونزع يده فإذا هي بيضاء للناظرين» ئايەتی (33) سورەتی (الشعراء).

قەسیدەی 2/ق ل 270 ـ 273

جانێ مەلێ ژ «قالوا بەلێ» بەندەم وەلێ دەرکاگولێ
بەلگێن گولێ رۆ هەیکە لێ ئەومسکەلێ جارەك هلێ

«وإذ أخـذَ رَبُّـكَ مِن بَنـی آدم من ظُهـورِهم ذُريتَهمُ وَأشهَدَهُم عَلىٰ أنفُسهم
أَلَسْتُ بَرَبكمُ قالُوا بَلى شَهدِنا أن تَقوُلوُا يومَ القيامةِ إنا كُنّا عَنْ هذا غافلِين» ئايەتی (172).

سورەتی (الاعراف)

قەسیدەی 2/ل 287 ـ 289

حوسن و سورا صورەتێ کەس ددرت قودرەتێ
لەو د ئەصل دوّرە ژێ طەعنەیێ «لما أفلْ»

«فلما جن عليه الليل رأى كوكباً قال هذا ربى فَلَما أَفَلَ قال لاأحب الآفلين»
فلما رأى القمرَ بازغاً قال هذا ربى فَلمَّا أفلَ قالَ لئن لم يَهـدِنى رَبى لا كوَنَنَّ مِن القـومِ آلضـالين (77) فَلمـا رأى ألشمش بازغة قالَ هذا ربى هذا أكبَر فلما أَفَلَت قال ياقومِ إنى برىء مِما تُشرِكُون (78).

سورەتی (الانعام)[23]

قەسیدەی 3/ل ل 289 ـ 292

دل (کعبە)یە مەولایە لێ
ناری کەلیم ئیسایەلێ
بانگی (أنا الله) دایەلێ
هەم (کعبە)و هەم (طور)ە دل

«إذ رأىٰ ناراً فقال لأهله آمكُثوا إنى آنستُ ناراً لعلى آتيكم فيها بِقَبس أواجدُ على النار هُدى (10) فلما أتها نُودی یامــوُسی (11) إنی انـا رَبُـك فاخلع نَعليَـك إنـك بالوادی المقُدَسِ طوى (12).

سورەتی (طه)

## پەراوێز وسەرچاوەو کتێب

1) الاقتباس: ضرب من الصناعة البلاغية يضمن فيه الشاعر والناثر كلامه شيئاً من القرآن او الحديث.
حكمت فرج البدري - معجم آيات الاقتباس - بغداد - 1980م ل 8.

2 - شاعیرو زاناو خواناسی بەرزی کوردی ئەواخری سەدەی دەهەمی کۆچی (شێخ احمد)ی جزیری کە بە (مەلای جزیری) بەناو بانگەلەو مامۆستا شارە - زایانەبووە کە هەتاهەتایە مەلای جزیری شارەزا بێت سەیری ئەم کتێبانە بفەرموو.

أ - مشاهير الكرد وكردوستان في الدور الاسلامي - بالعربية -
ب - مێژووی ئەدەبی کوردی - علاء الدين سجادی - 1952 بەغدا 1959 قامیشلی.
ب - (ئایة الكرسی) بەشێکە لە جزئی دووەم لە سورەتی (البقرة).

3 - لە ناو موسلماناندا ئەم شەوە زۆر موبارەکەوە دەکەوێتە شەوێك لەشەوە تاکەکانی مانگی رەمزان لەدووای بیستەوە.
دەربارەی ئەم شەوە پیرۆزە حیکایەتێ هەیە - سەیری.
قصص قرآن مجيد - برگرفته از تفسير ابو بكر عتيق نيشا بوری - هەیە دکاریحی مهدوی - طهران - 1347 ك 455 - يكه.

4 - ئیشارەتە بۆ حیکایەتی - ئیبراهیم کە بەپێی ئەوەی لە خەوادپیان گرتویو - وەبەرەزا مەندی (اسماعيلی) کوری - هات کە اسماعيل بكا بە قوربانی بۆ ئەوەی زیاتر لەم حیکایەتە بگەیێت تکایە سەیری -

أ - عبدالوهاب النجار - قصص الانبياء - بيروت - ك 101 - 102.
ب - محمد احمد جادالمولی (وەهاورێکانی) - قصص القرآن - مصر - 1969 ل. 60 - 63.
ح - قصص قرآن مجيد - برگرفته از تفسير ابو بكر عتيق نيشابوری - دكتوبی مهدری طهران 1347 ك 356 - 358.

5 - ئیشارەتە بۆ حیکایەتی یوسف وبراکانیو کوێربوونی باوکیو - چاك بوونەوەی کە بۆنی کراسە کەیکرد. سەیری:
أ - عبدالوهاب النجار - قصص الانبياء - بيروت ل 120 - 144
ب - محمد احمد جادالمولی - قصص القرآن - مصر 1969 ل 82 - 122.
ح - قصص قرآن مجيد طهران 1347 - 185.

6 - ئیشارەتە بۆ حیکایەتی (موسی): کە کاتێ موسی خەریکی لەوەراندنی مەرەکانی بوو لەگەڵ ژنەکەیدا رێگای هەڵەکرد لەشەوێکی ساردا هەرچەندهەوڵی دا بەبەردو ئەستێکەی ئاگربکاتەوە سودی نەبوو، ئەوەبوو لە دوورە دەچاوی بەئاگرێ دەکەوێ...
لە دوورە چاوی بەئاگرێ دەکەوێ..
سەیری: أ - عبدالوهاب النجار قصص الانبياء - ل 173 - 177

ب ـ محمد احمد جادالمولى ـ قصص القرآن ـ ل 134.

7 ـ ئیشـارەتـە بۆحیکـایـەتی ـ سلیمان و شاژنی (سبأ) کە پەپوەسلێمانکە رابەرو (قاصد) بوو لە بەنیا. سەیری ئەمانەبکە:

1 ـ قصص الانبیاء ل 333 ـ 336

ب ـ قصص القرآن ل 197 ـ 201

ج ـ قصص قرآن کریم ل 285 ـ 290.

8 ـ سەیری سەرچاوەکانی ژمارە (7) بکە.

9 ـ ئیشارەتە بۆ حیکایەتی حەزرەتی ئیبراهیم کە بەفەرمانی (ئـەوانـەی گومـرابـوو بوون) خرایـە ئاگـرەوە بەڵام بەئـاسـانی رزگـاری بوو چونکە خوای گەورە لەپشتی بوو. بۆ ئەوەی زیاتر لەم حیکاتە بزانیت سەیری ئەمانەبکە.

أ ـ قصص الانبیاء ل 80

ب ـ قصص القرآن ل 46 ـ 47

ج ـ قصص قرآن کریم ل 190

10 ـ ئیشـــارەتـــە بۆ موعجیـزەی موسی کەدەستی باخـەڵی دەربهێنـایـەسپی دەدرەوشـایـەوە. بۆ ئەم حیکـایـەتـە سەیری ئەمانەبکە:

ا ـ قصص الانبیاء ل 187 ـ 192

ب ـ قصص القرآن ل 139 ـ 140

ح ـ قصص قرآن کریم ل 247

11 ـ سەیری ژمارە (10) بکە.

12 ـ سەیری ئەمانەبکە:

أ ـ قصص الانبیاء ل 96 ـ 97

ب ـ قصص القرآن ل 36 ـ 37

ج ـ قصص قرآن مجید ل 23.

13 ـ حیکایەتی هاتنی (جبریل)و هێنانی سروش (وەحی)و نزیك بوونەوەی لە پێغەمەرەدە (ص). سەیری ئەمانەبکە.

أ ـ قصص القرآن ل 302.

ب ـ قصص قرآن مجید ل 451.

ح ـ تفسیر الجلالین «سورة النجم».

14 ـ ئیشارەتە بۆ ئەودوو (حدیثە پیرۆزە) کە بە (حدیثی ـ قودسی) بە ناوبـانگـە ـ هەرچـەنـد ئەم باسەدا تەنها ئیشاراتی قورئانمان پیشان داوە بەڵام لەبەر پەیوەندی ئەو دووبەیتەو نازکیان باسمان کردن.

15 ـ ئیشـارەتـە بۆ ئەو حیکـایـەتـە ئەوە بوو مووسی لەسەر کێـوی طور لەسینـا گفتـوگـۆی لەگـەڵ خوادا دەکرد، داوای لە خوا کردکـە خۆی پیـشـــان بدا وەخـــودا فەرمووی نام بینی بەڵام سەیری ئەوکێوەکە، ئەوە بوو لەبەر تەجلاّی نووری خوا کێوە سووتا ـ هتد سەیری ئەمانەبکە: ـ

أ ـ قصص الانبیاء ل 213.

ب ـ قصص القرآن ل 153 ـ 154

16 ـ ئیشارەتە بۆ حیکایەتی خەڵقی ئادەم و کورنوش بردنی بۆی لەلایەن هەموو فریشتەکانەوە جگە لە (شەیتان)، چونکە شەیتان نەی دەزانی حیکمەتی خودا چی بەلەخەڵقی ئادەم دا.
سەیری ئەمانەبکە؛ :

أ ـ قصص الانبیاء ل 12 ـ 5
ب ـ قصص القرآن ل 1 ـ 4
ح ـ قصص قرآن مجید ل 4 ـ 9

17 ـ ئیشارەتە بۆ حیکایەتی «ئەصحابی کهف» کە سێصدو چەند ساڵێك نووستبون دوایی کە خەبەریان بووەوەو یەکێکیان هات بۆشار خواردن بکرێ تەماشای کرد دنیا گۆڕراوەو پارەکەی کۆنەوخەڵکەی سەریان لێی سوردەمێنێ گەرایەوەو لەگەڵ سەگەکەیان بۆ هەتاهەتایە نووستنەوە، سەیری ئەمانەبکە:
أ ـ قصص القرآن ل 274 ـ 280
ب ـ قصص قرآن مجید ل 213 ـ 219

18 ـ ئیشارەتە بۆ «مناسك و کاروبارێ کە لە کاتی حەجدا دەکرێت»
وەووشەی (سعی) و (مروه)وە (صفا) و (حجراسود) ئەمانە هەمووی واتای تایبەتی خۆیان دەبەخشن سەیری:
أ ـ قصص الانبیاء ل 103 ـ 109
ب ـ قصص القرآن ل 65 ـ 67

19 ـ سەیری پەراوێزی ژمارە (5) بکە
20 ـ سەیری پەراوێزی ژمارە (6) بکە
21 ـ سەیری پەراوێزی ژمارە (16) بکە

22 ـ ئیشارەتە بۆ حیکایەتی حەزرەتی ئیبراهیم کە بەدوای خوای یەکتادا دەگەراو ئەم وەکوقەو مەکەی بت پەرست نەبوو سەیری ئەمانەبکە.

أ ـ قصص الانبیاء ل 79 ـ 83
ب ـ قصص القرآن ل 50 ـ 53

## ب ـ سەرچاوەو کتێب


1 ـ تفسیر القرآن العظیم ـ للامام الجلیل الحافظ عمادالدین ابو الفداء اسماعیل بن کثیر القرشی الدمشقی ـ بیروت ـ 1969م.
2 ـ تفسیر الجلالین، العلامه جلال الدین محمد بن أحمد المحلی ـ بیروت.
3 ـ المعجم المفهرس لالفاظ القرآن الکریم ـ وضعه محمد فؤاد عبدالباقی ـ مطابع الشعب 1378 هـ.
4 ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ علاءالدین سجادی ـ چاپی دووەم ـ 1971 بغداد.
5 ـ دیوانا مەلایی جزیری ـ صادق بهاء الدین ـ بغداد ـ 1977.
6 ـ العقد الجوهری فی شرح اشعار الملا الجزری ـ احمد الملا محمد البهتی الزفنکی ـ قامشلی 1958 م.
7 ـ قصص الانبیاء ـ عبدالوهاب النجار ـ بیروت.
8 ـ قصص القرآن ـ محمد احمد المولی ـ محمد ابو الفضل ابراهیم ـ علی محمد البجادی السید شحاته ـ مصر ـ 1969م.
9 ـ قصص قرآن مجید ـ تفسیر ابو بکر عتیق نیشابوری ـ هەیە دکتریحی مهدوی ـ طهران 1347.

# بایەخی هەڵبەست بۆ منداڵان

● ئیبراهیم ئەمین باڵدار ●

## پێشەكی:

ئەم ووتارە بۆ مامۆستایان و ئەدیبانە.. بۆ باوك و دایك و رۆشنبیرانە.. بۆ گشت ئەوانەیە كە پەیوەندییان بە فێركردن و پەروەردەكردنی منداڵانەوە هەیە، بە تایبەتی منداڵانی پلەی سەرەتایی.. هەنگاوێكە بۆ خۆشەویست كردن و گەشەپێكردنی ئەو زمانە رەسەنە پڕ سۆزو ئاوازەمان كە لەگەڵ شیری دایكمان پێی گۆش كراوین ـ ئەو زمانە رەوانە پوختەیەی كە وا لە ناو نەریت و، ویڵ و، ئاوات و، بەسەرهاتی گەلەكەمانا خەملاوەو، هەمیشە وەك گۆرانییەكی خۆش، لە دڵ و دەروونمانا دەزرنگێتەوەو دەنگ دەداتەوە.. زمانێك كە لەگەڵ ئەوەدا گەلێك هەنگاوی ناوە، هێشتا زۆر كوسپ و تەگەرەی لە بەردەم ماوە، بۆیەكە، وا، بێووچان، بە گوڕم و گوڕو هەڵەداوان، هەر خەریكی تەكاندانە.. بەرەو ئەو مەبەستەی كە لەم چەرخە پڕ گۆڕینی خێراخێراییەدا، ببێتە هۆیەكی بەكارترو بەكەڵكتر.. بۆ پێوەرگرتن و، راگەیاندن ـ پێوەرگرتن، بە گوێگرتن و خوێندنەوە.. راگەیاندنیش بە دواندن و نووسین.

لەم ووتارەدا بێجگە لەوەی كە خەریك بووین، بە شێوازێكی روون و رەوان، ئەوانەی راست و بەجێن و، بە تێڕوانین و پشكنین، ساغ كراونەتەوە دەربارەی هەڵبەستی منداڵان بیخەینە بەرچاو، هەوڵی ئەوەشمان داوە كە ئەو راستیانە بۆ خوێنەری بەڕێز روون كەینەوەو بیبەینە دڵیەوە، هانی بدەین كە شوێنیان بكەوێت.

## هەڵبەست چی‌یە؟

به تەما مەبە هەڵبەست بەلای ئێوەوە، وەك تێ‌روانینی کەسانی‌تر وابێت: ئێمەو ئێوەو، هەموو کەسانی‌تریش. . هیچمان لە یەك ناکەین. . چونکە هەر یەکەمان بە شێوەیەکی تایبەتی هەڵکەوتووە. ئێمە هەموومان، پێك هاتووی زگماکی‌و ئەو ناوەندەین کە تیا گەورە بووین، بۆیەکە هەر یەکەمان بە جۆرێکی جیاواز بیردەکەینەوەو، تێ‌دەنوارین. لەبەر ئەوە، هەڵبەست و هەموو شتێکی‌تریش، وەك یەك نایەنە بەرچاومان. . دڵمان چون یەك بۆیان لێ‌نادات. لەگەڵ ئەوەشا بیرلێ‌کردنەوەو، تێ‌روانینەکەشمان هەمیشە هەر لە گۆراندایە.

بەم پێیە، رەنگە هەڵبەست بەلای نووسەری ئەم وتارەوە شتێکی جیاواز بێت لەگەڵ تێ‌روانینی یەکێکی‌تر. . بەڵام لێرەدا نووسەر لە بیروباوەڕو دڵ و دەروونی خۆی دەدوێ. به لای نووسەرەوە، **هەڵبەست ئاوازو گۆرانی نووسراوە. . به وتەی واتا جوانی دڵگیری رەوان دارێژراوە، کە بە رەسەنی‌و داهێنراوی، لە بیرو هەست و، خولیاو خەیاڵێکی هەڵکەوتووانەوە هەڵقوڵاوە. . وتەی کاریگەری وەها کە بە وشەی رەنگینی درەوشاوە ئارایشت کراوە، وە بە سۆزو رەزم و (rhyzhm) [1] ئاوازی دڵگیرەوە دەربڕاوە. .**

## کام هەڵبەست دەمان جووڵێنێ؟

هەموو جۆرە هەڵبەستێك ئێمە ناجووڵێنێ. . ئەو هەڵبەستانەی رامان دەوەشێنن و بە گوڕم و تەوژم دەمان بزوێنن ـ ئەوانەن کە خۆمانیان تیادا دەبینین و تیامانا دەنگ دەدەنەوە. . نەك ئەوانەی کە لە دڵ و دەروونی کەسانی‌ترا رەنگ دەدەنەوە. وتەیەك، یان وشەیەك، دەمان جووڵێنێ‌و تیامانا دەنگ دەداتەوە، کە لەگەڵ بەسەرهات و، یادگارو، خۆزگەو، باوەڕمانا پەیوەندی‌یەکی هەبێت.

## هەڵبەست بۆ منداڵان

هەڵبەست بۆ منداڵانیش هۆی گەشەو شادی‌یە. منداڵان. . گشت منداڵان، پڕ بەدڵ حەز لە ئاوازو رەزم (rhythm ـ ئیقاع) دەکەن، ئاوازو رەزمی پڕ سۆزو خرۆش. . کە لە گەڵیا بکەونە سەماو جۆوڵەی بەجۆش.

منداڵان بە دەم ئاوازو رەزمەوە دەلەنجێنەوە. . دڵشاد دەبن و دەگەشێنەوە.

هەڵبەست ئەگەر بە پێی دڵی منداڵان بدوێت، وە بە ئاوازو رەزمی پڕ خرۆشاندن و جووڵاندن رێك بخرێت، وە بە وشەی بەئاوی رەنگاو رەنگی لەگەڵ یەکا گونجاو دەربڕێت، وە بە هونەرەو چابوکی‌یەوە بخرێتە بەرگوێ، لە دڵ و دەروونی زوربەی منداڵاندا دەنگ دەداتەوە، بە قووڵی‌و فراوانی کار لە مێشك و هۆشیان دەکات، بە جۆرێك کە گەلێك تواناو خولیای وایان تێدا پەیدا دەکات کە بە روونی‌و، قووڵی‌و، گەرمی، درك بە جۆرەها چەشنە جوانی بکەن و قەدریان بزانن و چێژ یان لێ‌وەرگرن.

هەروەها هەڵبەستی شیرینی پڕ بەها، کانی جۆرەها توانای رەسەنایەتی‌و داهێنان لە منداڵاندا دەتەقێنێتەوە.

بە لای منداڵی بچووکەوە هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە لە بەینی شتی راستەقینەو خەیاڵا، هەردووکیان چون یەك ئۆخەی بە دڵی دەکەن.

**منداڵان دەتوانن شوێن خەیاڵی خۆیان بکەون و، لە سەر نووکی پەنجەی پێیان راوەستن. . بۆ ئەوەی ئەو ئەستێرانە بگرن کە لە جیهانێکی وشەدا دەردەوشێنەوە ـ وشەی رەنگاو رەنگی ئاڵ و واڵای پڕ بروسکەو گڕو**

کلّپە . . ووشەی پڕ لە خەیاڵ و ئاوات و خۆزگە . . ووشەی وا کە بە لەنجەوە، لە سەر زمان گلۆر دەبنەوەو، لە مێشك و، دڵ و دەروونی منداڵاندا ئاسمانێك بۆ خۆیان دەبیننەوە، تاکو ئەو دەمەی بە کەڵکیان دەهێنن . . بۆ ئەوەی بیرو باوەڕێکیان پێدەربخەن، یان هەستێکیان پێدەرببڕن .

جار جاریش ووشەکان بۆیان دەبن بە باڵ . . پێیان دەفرن بۆ جیهانێکی پڕ لە سەر سامیو، خەوبینین و، خەیاڵ . (2)

لەبەر ئەوانەیە کە ئێستا هەڵبەست و هۆنراوە، بە هونەرو چابوکی یەکجار وەستایانەوە، لە قوتابخانەکانی ووڵاتە پێش کەوتووەکاندا بەکار دەهێنرێن، بۆ هانینەدی جۆرەها مەبەستی فێرکردن و پێگەیاندن . . هەر وەها بۆ دڵخۆش کردن و، گەشەپێکردنی توانای قەدر زانینی جوانیو چێژلێوەرگرتنی .

بە تایبەتی چێژلێوەرگرتن، وا لە منداڵ دەکات، کە چەشە ببێت و هەوس و خولیای زۆرەها ئارەزووی بە کەڵکی تیادا گەشە بکات.

چێژ وەرگرتن لە شتێك، وەك دکتۆرستانلی جاکسون دەڵێت: ئەوەیە کە بە جۆریك درك بە نرخی ئەو شتە بکەین، وامان لێبکات کە ڕاستەوخۆ هەستی پێ بکەین . . لە هەمان کاتیشا، هەست بە پەیوەندییەکی ویژدانی بکەین لەگەڵیا، کە پاڵمان پێوەنێت بۆ ئەوەی قەدری بزانین و، خۆشمان بوێت و، بە گەرمیو پەرۆشەوە لەگەڵیا تێکەڵاو ببین .

هەرچەندە چێژلێوەرگرتن، بە زۆری سۆزو هەڵچوونە . . بەڵام پەیوەندیشی هەیە بە بیرلێکردنەوەوە . . پێویستیشی بە هەندێك تێگەیشتن هەیە .

لەبەر ئەوە، شتێك ئەگەر واتاکەی بە تەواوی تێبگەین، زیاتر کارمان تێدەکات و چێژی لێوەردەگرین . (3)

## فێرکردنی هەڵبەست لە قوتابخانەکانما

لەو یاسایانەی، کە هێشتا هەر باوە لە قوتابخانەکانما، بۆ بەکارهێنانی هەڵبەست، لە فێرکردنی وێژەی زمانەکەمانا، ئەوەیە کە زۆر لە منداڵەکانمان دەکرێت، بە ناچاریو، دڵگوشراوییەوە، هەڵبەستی ووشك و، ڕەق و، ناڵەباری شێواو وەك تووتی، لەبەر بکەن و، بە ساردوسڕیو، پەلە پەل . . بە هەناسەبڕکیو دڵەکوتێ، پچڕپچڕ، بۆ ماموستای بڵێنەوە، بێ ئەوەی هیچ لێی تێبگەن و پێی بجووڵێن - ئەو هەڵبەستانەی کە لە هەندێك قسەی نەستەق و، چەند جۆرە جوانییەکی ژاکاوی واتا ئاڵۆزاو بەولاوە، هیچ تروسکەو تەزوویەکی پڕ بە دڵی منداڵیان تیادادەرناکەوێت .

زۆر جار ڕەقیو سەختی ووشەو ووتەکانی هەڵبەستەکان، یان ووشکیو ساردی بیروباوەڕەکانیان، یان جۆری کەسایەتیو، نەشارەزایی مامۆستاو، چەوتی شێوەی دەرس ووتنەوەکەی، یان بە زۆر، پێلەبەرکردنی هەڵبەستەکە، دەبنە هۆی ئەوەی کە منداڵەکان سەرکوێرو وەڕس ببن . . هەڵبەست و گەلێك بابەتی تریشیان لەبەر چاو ڕەش ببێت و، لە هونەرەکانی زمانداو، لە تواناکانی بابەتەکانی تریشدا کوڵ ببن . کە بەو هۆیەوە، گەلێك جار، گیروگرفتی فێربوونیان ووەها لێتەشەنە دەکات، کە وایان لێدێت، قوتابخانەو مامۆستاو خوێندنیشیان لەبەرچاو دەکەوێت و، بڕوایان بە خۆیان کەم دەبێتەوە . (4)

بۆ چارەسەرکردنی ئەم هەڵانە . . بۆ ئەوەی هونەرەکانی هەڵبەست بکەین بە هۆیەکی شیرین و، بەکەڵك و، بەکار، بۆ فێربوونی زمانمان و، شارەزابوونی وێژەمان . . بۆ ئەوەی توانای جوانی ناسین و، قەدر زانین و چێژلێوەرگرتن (appreciation) لە منداڵەکانمانا پەیدا بکەین . . بۆ ئەوەی ڕێپاکەینەوە بۆ تەقینەوەی جۆرەها

بەهـرەی داهێنـانی ڕەسـەن لە ناویـانـا، لەم خاڵانـەی داهـاتـوودا دەری دەخـەین، کە چۆن بە ڕێکخستنێکی بەجێی پرۆگرامی زمان فێرکردن و، بە گۆڕینی شێوازو ڕێبازی دەرس ووتنەوە، دەتوانین ئەو مەبەستە بە نرخ و بەکەڵکانە بهێنینەدی، بە چەشنێك کە منداڵەکانمان بتوانن پڕ بەو هێزو توانایانەی تیانا خوڵقاوە، گەشە بکەن و، هەڵبدەن:

## یەکەم:

لەو کارە گرنگـانـەی کە دەبێت لە فێرکردنی هەڵبەستدا بیخەینە بەرچاو، ئەوەیە، کە بزانین منداڵان بە کام جۆرە هەڵبەست و هۆنراوە دڵخۆش دەبن، چونکە دڵخۆشکردنیان مەبەستی سەرەکیمانە.

زۆر جار مامـۆستـایـان لە باتی ئەوەی لەو منـداڵانـەوە دەست پێبکـەن کە دەرسیـان پێدەڵێن.. دەچن بۆ ئەو هەڵبـەستـانـە دەگەڕێن، کە پێیان بڵێن ـ ئەو هەڵبەستانەی کە لای خۆیان جوان و دڵگیرن.. بەو خەیاڵەی کە ئەوەی لای خۆیـان دروسـت و پەسـنـد بێـت، دەبێـت لای منـداڵـەکـانیش خۆشـەویست بێت.. وە ئەگەر ئێستاش بە کەڵکیان نەیەت لەوانەیە لە دواڕۆژدا سوودی لێوەربگرن، بێ ئـەوەی بزانن کە ئەوەی منـداڵ تێی نەگـات و حەزی لێنەکات، بێجگە لەوەی هیچی لێ فێرنابێت، لەوانەیە بە هۆیەوە سەرکوێریش ببێت.

منـداڵان ئەو هەڵبـەستـانـە فێـردەبن کە لایـان خۆشەو، هەمیشە دووبارەیان دەکەنەوە.. نەك ئەوانەی بە پێچەوانەی ویستی خۆیان، بە سەریانا دەسەپێنرێت کە بیانخوێننەوە.

وە ئەو هەڵبـەستـانـەش لەبـەر دەکـەن کە بە ڕاستی و ئارەزووی خۆیان، پڕ بە دڵ حەزیان لێدەکەن.. بۆیەکە دەبێت مامۆستا ئەو هەڵبەستانە هەڵبژێرێت کە منداڵەکان، ئێستا پێویستیانەو، پێی دڵخۆش دەبن و، دەتوانن تێیان بگـەن و ... چێـژیـان لێوەربگرن.. بێ ئەوەی، بە پێچـەوانـەی ئارەزووی خۆیـان، زۆریـان لێبکـات کە لەبەریان بکەن.

منداڵان حەز لە هەڵبەستێك بکەن، بۆ خۆیان، بە دەم خۆشی دووبـارەکـردنی خوێندنەوەیەوە لەبەری دەکەن. ئیتر پێی ناوێت بە زۆر لێکردن لەبەرچاویان بخەین.

## دووەم:

ئەو هەڵبەستانەی کە بۆ منداڵان دەشێن لەگەڵ ئەوەدا کە پێویستـە ڕوون و ڕەوان.. پڕ بزوانـدن و خەیـاڵ.. بە قوڵـپ و جۆش بن، دەبـێـت لەگـەڵ تەمـەن و پلەی خوێندیشیانا بگونجێن و هەمەڕەنگبن.

منـداڵان پێویستیـان زۆرە بەوەی کە گەلێـك جۆرە چەشنی هەڵبـەست تاقیبکـەنـەوە.. لەوانـەی کە بە پێی پلەی تەمـەن و شارەزاییـان، لەگـەڵ توانـای درك و، ئارەزووی دڵ و دەروونیان بگونجێت.. هەڵبەستی وەها کە بیانهێنێتە قاقای پێکەنین، یان لەگەڵ ئاوازو ڕەزم و دەنگیا بکـەونـە سەمـاو هەڵپـەڕین، یان لەو جۆرە هەڵبـەستـە چیرۆکانەی کە پێی سەرسام و واق وڕماو ببن.. یان بە دەمیـەوە بە خەیـاڵ و تێڕامـان، بکـەونـە خەوبینین.. یان شێگیـری ڕووداوە کوتـوپـڕەکـانیان ببن. هەروەها ئەو جۆرە هەڵبـەستـە خۆشـانـەش کە باسی هەڵسەوکەوتی خۆیان و، گیـانـداری ناسـراویـان بۆ بکـات، یان جوانی بە دڵی خۆیانیان، بە ئاوازو، سۆزو، بزواندنەوە بۆ دەربخات...

## سێهەم:

وەك لە پێشەوە دەرمان خست، هەموو کەسێك بە پێی

سروشت و جۆری هەڵکەوتنی خۆی، هەڵبەست کاری تێدەکات و دەیبزوێنێت ئەوەی یەکێك چێژی لێوەردەگرێت و، پێی گوشاد دەبێت، لەوانەیە یەکێکی تر بە لایەوە پەشم بێت و هیچ پێی نەجوولێت.

ئەوەی لە زگماکییەوە لە یەکێکا پەیدا دەبێت، لەگەڵ ئەو ناوەندەی تیادا گەورە دەبێت، وە ئەو بەسەرهات و کارەساتانەش تووشیان دەبێت، کارێکی زۆر دەکەنە سەر حەزو ئارەزووی ئەو کەسە، کە چی لە لا پەسندو جوان و خۆش بێت و، چی تریشی لە لا ناشیرین و تاڵ بێت.

## چوار هەم:

دەبێت بزانین کە هەڵبەست لە پۆلەکانی سەرەتاییدا بۆ هەست پێکردنە.. بۆ پێخۆشبوون و دڵ ئاودانە.. بۆ خۆناسین و بەرەلاکردنی بەهرەی داهێنانە، نەك بۆ شیکردنەوەو، لێکدانەوەو، فێرکردنی ڕەوانبێژیو، کێش و قافیەیە.

هەست پێکردن پەیدا دەبێت، نەك فێردەکرێت. منداڵان خۆیان لەو قوناخەدا بە دەم هەستی پێخۆشبوونەوە، فێردەبن، کە تاکو ڕادەیەك، درك بە دەنگ و، ڕەمزو، ئاوازو، ڕەزم و (rhythm) کێش بکەن.

بەڵام لە دواپلەکانی ئەو قوناخەدا، وا چاکە مامۆستا، ژم ژم، هەندێك شتی تری واشیان دەربارەی هەڵبەستەکان بۆ بهێنێتە پێشەوە، کە بە هۆیانەوە بتوانن، قووڵترو فراوانتر لە هەڵبەست تێبگەن و، لایان شیرین بێت و چێژی لێوەرگرن.

وەك ئەوەی مامۆستا هەندێك کاتی تایبەتی تەرخان بکات بۆ ڕوون کردنەوەی بیرو باوەڕەکانی هەڵبەستەکە.. بۆ دەرخستنی جوانیو بەئاوی ووشەکانی.. گەرمیو دڵگیری سۆزو ئاوازەکانی.

بۆ ئەم مەبەستە، دوای خوێندنەوەی هەڵبەستەکە داوا لە قوتابییەکان دەکات کە هەریەکەیان، چەند پرسیارێك بنووسێت دەربارەی ئەوەی هەڵبەستەکە لێی دواوە، پرسیاری وەك: (کێ، بۆچی، لەکوێ، کەی...) تاکو بە شێوەیەکی ڕەوان، بە پێی ڕادەی درك و توانایان بۆیان ڕوون بکاتەوە.[5]

## پێنجه هەم:

دەبێت بزانین چۆن بە چابوکیو کارامەیی هەڵبەست پێش کەش منداڵان بکەین و لایان شیرین بکەین.

ئاشکرایە کە منداڵان هەر لە ساواییەوە حەز لە هەڵبەست و ئاواز دەکەن، هەڵبەست گەشەیان پێدەکات ووشەیان لە لا خۆشەویست دەکات.

بەڵام هەڵبەست هەر لە خۆیەوە لای منداڵان دڵگیرو شیرین نابێت و، لە ناخی دڵ و دەروونیانا جێگیر نابێت، ئەگەر بە وەستاییانە، ڕێی بۆ پاك نەکەینەوەو بە ڕوونیو، جوانیو، چابوکی بەرگوێیان نەخەین.

هەڵبەستێك چەند بۆ منداڵان گونجاو بێت، ئەگەر نەزانین چۆن بۆیان بهێنینە پێشەوە، لەبەرچاویان دەکەوێت.

بۆ ئەوەی بتوانین بە هونەرەوە هەڵبەست پێش کەش منداڵان بکەین، دەبێت لە پێشەوە خۆمان و ئەوانی بۆ ئامادە بکەین.[6]

### أ - بۆ ئامادەکردنی خۆمان و سازکردنی شێوەی پێش کەش کردنەکەمان:

(1) دەبێت لە بیرو باوەڕی هەستیارەکە ووردبینەوەو هەست بە سۆزو، جۆش و، خولیاو، دەماخ و، خەیاڵەکانی

بکەین و، شارەزایی لەگەڵ شێوازو هونەری پێکهێنانی ووتەکانیا پەیدا بکەین و، چاك تێ بگەین، ئەو مەبەستانە چین، کە هەستیارەکە بە ووشە، سرودیان بۆ دەخوێنێت و، چرایان بۆ هەڵدەگیرسێنێت.

(2) خۆمان رابهێنین لەسەر ئەوەی کە چۆن، لەبەر، هەڵبەستەکە، چابوکانە پێش کەش بکەین، یان بە نووسراوی بیخوێنینەوە.

بۆ ئەم مەبەستە واچاکە، بە تەنیا، هەڵبەستەکە، بە دەنگی بەرز، چەند جارێك بۆ خۆمانی بخوێنینەوەو، سەرنج بدەینە خاڵبەندەکانی، کە بزانین، لە کوێدا هەناسە بدەین، یان بووەستین... لە کام جێگادا پرسیار بکەین، یان وەڵام بدەینەوە.. لە کوێ خوزگەو ئاوات، یان سەرسامی پیشان بدەین.. لە کام جێگادا ووشەکە بگوشین.. چۆن دەنگ بەرز، یان نزم بکەینەوە...

(3) لە پێش کەش کردنی هەڵبەستەکەدا دەبێت خۆمانی بۆ خاوکەینەوەو، ئەندامەکانیشمان وا لێ بکەین کە لە بارو دۆخێکی تەواوا خۆیان راگرن، بەتایبەتی، ئەو ئەندامانەی کە هەناسەیان پێ دەدەین، وەك، سنگ و سەرمان، یان ئەوانەی قسەیان پێ دەکەین، وەك: زمان و هەردوو شەویلگەمان.

(4) بە ئاسانی هەناسە هەڵمژمین و، بیدەینەوەوە بە یەك هەناسەی درێژ زیاترین ووشەی واتایەك، بەسەریەکەوە دەربڕین.

(5) جۆری دەنگمان کارێکی زۆر دەکاتە سەر ئەوەی هەڵبەستەکە جوان و دڵ راکیش بنوێنێت، یان بزرکاو شێواو بێتە بەرگوێ. ئێمە دەتوانین بە گۆڕینی هەناسەو سۆز گوڕم و چین چینەکانی دەنگی خۆمان هەڵبەستەکە شیرینتر بکەین و، وا لە منداڵەکان بکەین کە بە حەزو ئاگایەکی زیاترەوە گوێی بۆ شل بکەن. لەبەر ئەوە دەبێت:

● دەنگمان وەها رابهێنین کە بتوانین هەڵبەستەکە بە پێی واتای ووشەکان و، سۆزو هەست و نەستەکانیان، بە جۆرەها چین چینی، بەرزو نزمی دەنگ، پێش کەش بکەین.

وەکوو ئاشکرایە، دەنگ لەگەڵ هەڵچوون و دڵ گەرم بوونمانا بەرز دەبێتەوە، لەگەڵ ساردبوونەوەشمانا هێمن دەبێتەوە.

ئێمە دەبێت دەنگمان وەها تیژ نەبێت کە لە گوێ بچەقێت، وەهاش پان نەبێتەوە کە گوێ پڕنەکاتەوە. پێویستە دەنگمان پڕ سۆزو، دڵ راکێش، بە گوێ خۆشبێت.

دەنگی ناسازی وەك نەڕەو، قیژەو، زریکەو، شیرە، گوێگرەکان هەراسان و، بێزار دەکەن. ئەو دەنگەش کە بە ساردوسڕیو خاوی، لە سەر جۆرە ئاوازێکی مەنگ دووبارە دەبێتەوە، گیانی هەڵبەستەکە دەکێشێت و گەشەی لێ دەبڕێت.

● دەبێت دەنگەکەمان، بە هێزێکی واوە دەرپەڕێنین و راگەیەنین، کە لەگەڵ دوورو نزیکیو زۆرو کەمی گوێگرەکان و، فراوانی جێگاکەدا بگونجێت. وەهاش بزرنگێتەوە کە لەگەڵ دەنگی پیتەکانا رێکەوێت. وە تاکو قوڵپ و جۆشی هەستەکان زیاتر بڵێسە بسێنن، دەبێت دەنگیشمان بە هێزتر دەرچێت.

● بۆ ئەوەی بتوانین واتای ووشەکان بە تەوای بگەیەنینە گوێگرەکان، پێویستە تیپەکان و برگەکانی ووشەکان، بە بێ، لەنگەو، قووت دانەوە، بە هەناسەدانێکی تەواوە دەربڕین.

● وە دەبێت بزانین کە لە کوێدا گوشین (النبر) stress بەکار بهێنین، چونکە ئەگەر گوشین لە ووشەکانا لە جێی خۆیا نەبێت، واتای ووشەکانی پێ دەگۆڕێت.

● هەروەها پێویستە بزانین لە کوێدا بوێ بوەستین، ئەگەر راوەستانیش لە جێی دروستا نەبێت، واتاکان وەك

خۆیان دەرناکەون. پێویستە راوەستان لەوێدا بێت کە واتاکە دوایی دێت، نەك لە دوای تەواووونی بەیتەکەوە بێت.

● ئەو کەسەی هەڵبەستەکە پێش کەش دەکات، وا چاوەڕێی لێدەکرێت، کە بتوانێت هەست و سۆزو دەماخی هەستیارەکە، بە تاسەو تەزووەوە دەرخات و، لە دڵ و دەروونی گوێگرەکانی چەسپ کات.

بە چەشنێك، کە تیانا رەنگە بداتەوەو کار لە بیروباوەڕو کردارو خولیایان بکات.

ئەمەش لەسەر ئەوە وەستاوە، کە واتای تەواوی ووشەکان تێبگات و، بە روونی و، رەوانی و، هونەرمەندی یەوە رایانگەیە نێت و، لە رەزمی (ئیقاعی) بەیتەکان و، ئاوازی هەڵبەستەکە لانەدات.

هەندێك جاریش بۆ ئەوەی ووشەیەك لەوانیتر زیاتر دەرکەوێت، تاکو واتایەکی تایبەتی پێدەرخات، کە بگاتە سەر ئەو ووشەیە، بە گیریو گوشینەوە، دەری ببڕێت.

## ب ـ ئامادەکردنی گوێگرەکان، بە تایبەتی قوتابی یەکان:

بەر لەوەی مامۆستا دەست بە خوێندنەوەی هەڵبەستەکە بکات، دەبێت قوتابی یەکان بۆ گوێ لێ گرتنی ئامادە بکات، تاکو لە پێشەوە سەرنجیان رابکێشێت و، حەزیان بجوولێنێت و، ئەوەی کە پێویست بێت بۆ تێگەیشتن و چێژلێوەرگرتنی هەڵبەستەکە، بۆیان روون بکاتەوە. وەك ئەوەی پێیان بڵێت: «هەڵبەست وەك مۆسیقا وایە، لەوانەیە بەشێك لە ئێمە، هەندێکیانی لەوانیتر لەلا خۆشتر بێت.

کە ئێوە بۆ یەکەم جار، گوێتان لە هەڵبەستێك دەبێت، تاکو دوو سێ جار بەرگوێتان نەکەوێتەوە، ناتوانن بزانن لاتان خۆشە یان نا، لەبەر ئەوەشە، کە من دوو جار تاکو سێ جار، هەڵبەستەکەتان بۆ دەخوێنمەوە. ئەم هەڵبەستە نوێیەی ئەمڕۆمان هەڵبەستێکی جوان و بە نرخ و دڵگیرە. . زۆرەها کەس حەزیان لێ کردووەو دڵیان پیاچووە. . بێگومان ئێوەش بە دڵتان دەبێت. هەندێك ووشەی تیادا بەکارهێنراوە کە رەنگە پێویستان بێت لە پێشەوە واتاکانیان بزانن، ئەوانەش ئەمانەن:

. . . ، . . . ، . . . ، . . . ، . . . ، . . . ،

وە ئەگەر هەڵبەستەکە بۆ منداڵی هەراشتر پێش کەش بکرێت یان بخوێنرێتەوە، واچاکە مامۆستا، بە کورتیو ساکاری، ئەوەشیان بە گوێدا بدات، کە ئەو هەڵبەستە کێ دایناوە، کەیو بەکام بۆنەوە، بۆ چە مەبەستێك، بێ ئەوەی چاوەڕێیان لێ بکات، لە هیچ جارێکا، ئەو ووردەکاری یانەی بۆ بگێڕنەوە.

زۆر جار منداڵان گەلێك شت فێردەبن و، کاریان تێدەکات، بەڵام توانای ئەوەیان نی یە، کە بە دەربڕاندن ـ نووسین بێت یان دوواندن، دەری بخەن کە چیفێربوون. فێربوونی راست ئەوەیە کە کار بکاتە سەر بیرو باوەڕو خولیاو کرداریان، نەك وەك تووتی لەبەری بکەن و بیڵێنەوە. هەڵسەنگاندنی فێربوونیشیان دەبێت بە ناسینەوە بێت، لە جیاتی دووبارەکردنەوە.

وەك ئەوەی مامۆستا چەند بەیتی هەڵبەستێکیان پێبڵێت و داوایان لێبکات کە بیناسنەوە هی کێیە، لەجیاتی ئەوەی ناوی هەستیارێکیان بداتیو داوایان لێبکات کە هەر یەکەیان هەڵبەستێکی ئەو هەستیارەی، لەبەر، بۆ بڵێنەوە.

## پ ـ مامۆستا هەڵبەستەکە چۆن پێش کەش بکات؟

دوای روون کردنەوەی واتای ووشەکان، مامۆستا

بەوجۆرەی لە پێشەوە باسمان کرد، دەست بە خوێندنەوەی هەڵبەستەکە دەکات.

خوێندنەوەی هەڵبەستەکە زیاتر کاریگەرترو دڵگیرتر دەبێت، ئەگەر لە شوێنێکی وادا بخوێنرێتەوە کە دڵ تیابکرێتەوە، باشتریش وایە کە جۆرە بزوێنێکی مۆسیقای لەگەڵابێت.

هەندێك جار مامۆستا لە ژووری پۆلەکەیدا دووانگەیەك پێك دێنیو، بە گوڵ و وێنەو چەند کەرەستەیەکی فۆلکلوری دەبرازێنیتەوە، لەوێوە هەڵبەستەکە دەخوێنێتەوە.

دوای ئەوەی مامۆستا یەك دوو جار هەڵبەستەکە بۆ قوتابییەکان دەڵێتەوە، لەوانەیە هەندێك پرسیار لە قوتابییەکان بکات، وەك ئەوەی بپرسێت: بۆچی دانەری هەڵبەستەکە ئەم وشانەی زۆر دووبارە کردۆتەوە. . . . ؟ یان بڵێت: «هەریەکتان هەست بە چی دەکات کە گوێی لەم پارچەیەی هەڵبەستەکە دەبێت. . ؟»، ئنجا پارچەکەشیان بۆ دەخوێنێتەوە. یان داوایان لێدەکات کە ئەوەی بە دڵیانە لە هەڵبەستەکەو، بە خەیاڵ لەبەر چاویانە، خەریك بین کە لەجیاتی وشە، بە ڕەنگ و، نەخشەو، وێنە، یان بە ئیشیدەست و شێوە، وەك تابلۆیەکی ڕەنگاو ڕەنگی ڕازاوە، دەریببرن و بیخەنەڕوو.

بۆ ئەوەی هەڵبەستێك قووڵتر کار لە ناخی دڵ و دەروونی منداڵان بکات و بیان بزوێنێت و، ڕایان بوەشێنێت. . وە تاکو ڕوونترو ڕەوانتر بریسکەو جوانیو پێزی واتاو وشەکانیان بۆ دەرکەوێت، پێویستە ئەو هەڵبەستە چەند جارێك گوێی لێبگرن و، بیڵێنەوە. لەبەر ئەوە کارێکی بەجیو ڕوایە، کە جارجار، دوای ئەوەی هەڵبەستەکە لە لایەن مامۆستاوە، یان لە لایەن یەکێك لە قوتابییە زۆر باشەکانەوە، بە شێوەیەکی نموونەیی دەخوێنرێتەوە، گشت پۆلەکەش پێکەوە، یان دەستە دەستە، وە یان یەکێك بە تەنیاو، پۆلەکەش بە جیا، بە (کۆرال) بیخوێننەوە.

بەیناو بەینیش، بۆ ئەوەی مامۆستا سەرنجی قوتابییەکان ڕاکێشێت بۆ جوانی هەڵبەستێك و، لایان خۆشەویست بکات، یان بیانکات بە مایەی لێدوانێك، دەچێت، بە خەتێکی گەورەی خۆش، لەسەر کاغەزێکی ڕەنگاو ڕەنگ، یەك دوو بەیتی هەڵبژاراو دەنووسێت و لەگەڵیانا، بە جوانی، چەند جۆرە وێنەو نەخشەیەکی وەها دادەنێت کە لەگەڵ مەبەستی بەیتەکانا بگونجێت. ئەوسا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەسەر لەوحەیەکی تایبەتی بۆ پیشاندانی ئەم جۆرە بابەتانە، کە لە ناو ژووری پۆلەکەدا دەبێت هەبێت، بە هەڵواسراوی ڕێکیان دەخات.

گەلێك جاریش مامۆستا لە دەفتەرێکا جۆرەها هەڵبەستی هەڵبژاراو کۆ دەکاتەوە. . بەڵام باشتر وایە، لە جیاتی دەفتەر، هەر یەکەیان لە سەر کارتێکی جیاواز بنووسێت، کە پانیو درێژیان لە دەوری (12 × 18)سم بێت، بەو هۆیەوە بە ئاسانی دەتوانێت، هەڵبەستەکان بە پێی بابەتەکانیان، یان بە گوێرەی ناوی هەستیارەکانیان، جیاجیان بکاتەوە، تاکو کە پێویستی پێیان بوو، بتوانێت دەم و دەست، بە زوویی، بچێتە سەریان.

مامۆستا ئەم هەڵبەستە هەڵبژێراوانە هەڵدەگرێ، کە لە ساتی پێویستا، بە بۆنەی ڕێکەوتی گونجاوەوە، بۆ قوتابییەکانی بخوێنێتەوە. وەك ئەوەی: نزیك جەژنی نەوروز، مامۆستا، بە بۆنەی ئەو ڕۆژە پیرۆزەوە هەڵبەستێکی جوان، بە گەشەو گەرمییەوە، بۆ قوتابییەکان بخوێنێتەوە، یان مامۆستا سوود لە ڕێکەوتی گۆڕانی وەرزو کەش وەربگرێت بۆ ئەوەی لە ڕێی هەڵبەستەوە، جوانییەکانی هەندێك لە دیاردە گۆڕراوەکانی سروشت و، گیانەوەران و، ڕووەکییەکانی ناوەندی دەوروبەری خۆی، بۆ منداڵەکان دەرخاتاو، لایان خۆشەویست بکات، وەك، جوانییەکانی دەشت و، گردو، دۆڵ و، چەم و، چیا. یان جوانییەکانی

بەفرو، باران و، تەرزەو، درەخت و، گوڵ و، سەوزەگیا. هەروەها جوانی یەکانی، کەروێشك و، ڕێوی و، سمۆرەو، ریشـۆڵـەو کەوو، کۆتـرو، بلبل و، پەپـولـەو، زۆرەها شتی تـری وەها. بەو هۆیـەوە منـداڵـەکـان دەتوانن قووڵترو فراوانتـر ئەو جوانیـانـە بنـاسن و، هەڵیان مژن و، هۆگریان ببن و، چێژیان لێ وەرگرن.

بەنیاوێ بەینیش مامۆستا هەڵبەستی وەها هەڵدەبژێرێت کە بۆ ئەوە بشێت قوتـابی یـەکـان لە ناو پۆلـەکـەیـانـدا بە شانۆگەری پێش کەشی بکەن.

بەکـارهـێـنـانـی شانـۆگـەری لە پێش کەش کردنی هەڵبـەستـدا، جۆرە ریـبازێکی ترە بۆ ئەوەی منداڵەکانمان وا لێ بکـەین کە بتـوانن لەگـەڵ هەست و، دەماغ و، سۆزو، رازو، نیازی هەستیارەکە، قووڵتر تێکەڵاو ببن و، کاریگەرتر تیـانا دەنگ بداتـەوە. وایـان لێ بکـات، کە بێجگـە لە شادبـوون و بزوتنی جۆرەهـا ئارەزووی بە سوود تیـانـا، هەست بە گەلێـك بەهـرەو توانـای داهێنـان لە خۆیـانـا بکەن و. بە فراوانی و بالآیی لەو تواناییانەدا هەڵبدەن و هەڵکەون.(٥)

## چۆن هەڵبەست بۆ منداڵان دابنێین؟

هەڵبـەست بۆ منـداڵان وەکـو ووتمـان، بە زۆری بۆ دڵخۆشبـوون و خۆناسینە. . بۆ گەشەپێ کردن و قەدر زانینی جوانی یە. . بۆ پەرەپێدانی بەهرەوەری و هەڵقوڵاندنی توانای داهێنانە.

بۆ هانینـەدی ئەم مەبـەستـانە، دەبێت هەڵبەستەکان لەو بابەتانەبن کە منداڵان تێیان دەگەن و حەزیان لێ دەکەن، ووشـەکـانیشیان لەو جوارانەبن، کە لایان ئاسان و ئاشکراو بەئـاوین ـ ووشـەی رەنگـاو رەنگی دروشـاوی وەهـا کە بە ئاوازو، رەزم و، سۆزەوە لەگەڵ یەکا گونجابن.

ئەو هەڵبـەستـانـەی کە بۆ منـداڵانی (6 ـ 9) ساڵان دەشێن، منداڵانی هەراشتر پێی ناجووڵێن، چونکە رادەی تێ گەیشتن و، پێ زانینیان جیاوازە.

ووشـەیـەکی وەك (دڵـداری) لای منـداڵی بچـووك واتـایـەکی لێـل و پووچی هەیـە، چونکـە تێ گـەیشتنی ئەو ووشەیە لە رێزەو تەمەنی ئەوا نی یە.

بەڵام، بۆ منداڵی هەراشی هەرزەکار، پڕ لە خرۆش و خەیاڵ ئاواتە.

دیـسـان ووشـەی وەك: (رۆشـنـبـیـری، پیـاوەتی، رەسـەنـی). . بۆ منـداڵی بچـووك ووشـك و، رەق و، سەخـتـن و، لە ووزەی ئەو بەدەرن. بەڵام بۆ یەکێکی گەورەی تێ گەیشتوو بە نرخ و پڕ پێزو، کاریگەرن.

ئەگەر منداڵ هەڵبەستێك تێ نەگات و کاری تێ نەکات، بێجگە لەوەی کە هیچی لێ فێرنابێت، لەوانەشە بە هۆیەوە سەری لێ تێك بچێت. چونکە ئەوەی منداڵ تێی نەگات حەزیشی لێ نـاکـات، بۆیـەکـە زوو وەرسی دەکـات و، هەڵبەستی لەبەرچاو دەخات. . دووری یە برواشی بە خۆی لەق بکـات. ئـەو هـەڵبـەستـەش بـەلایـەوە روون و، رەوان بێـت و، حەزی لێ بکـات، بێ ئـەوەی خۆی پێـوە هیلاك بكات، زوو فێری دەبێت و، بە دەنگیەوە دەچێت.

منـداڵ، فێـربـوونـی شتێکی پێ خـۆشـە کە دڵـی راکێـشێـت و، هێـزی بەسـەرا بشکێت و، تیـا سەرکەوێت. سـەرکـەوتـن و، زاڵ بوون منداڵ چەشە دەکات و، بۆ سەرکەوتنی تری دەبات. .

بەڵام، ژێرکەوتن و بەزین، ووره بە منداڵ بەر دەدات و، بۆ کەوتنی تر ژێرپێی لێژ دەکات. بۆیەکە نابێت منداڵ لە ووزەو توانـای خۆی زیـاتـر فیربوونی بە سەرا پسەپێنرێت، یان بە گوێرەی توانای منداڵی تر چاوەڕێی پێش کەوتنی لێ بکرێت.

فێـرکـرن بۆ منـداڵ، دەبێت بە ژەم ژەمی بچـووکی

سووك و ئاسـان و، دڵ ڕاكيشى وەهـا بهێنـرێتە پێشەوە، كە منـداڵ هێـزى بە سەرا بشـكـێـت و، بتـوانـێـت تيـا سەركـەوێـت و، چەشـە ببـێـت. بەوە سەرەڕاى ئەوەى فيـربـوونـەكـەى لا شيـرين دەبێت، واشى لێدێت، كە بە هۆى هاندان و ڕێ پيشاندان ئێمەوە، بە حەزو ئارەزووى خۆى بە دوايا بگەڕێت. . نەك لە ترس و لەرزى شووڵى ئێمە.

هەندێك كەس وا دەزانن كە منداڵ هەر دەبێت لە ژێر زەبـرى دارو كوتـەكـا فێـربكرێت. . بەو بيروباوەڕەوە. . بە نيـازى چاكـەوە. . بە هەڵەداوان و سەرگەرمى يەوە، شوێنى منداڵ دەكەون، كە بە زۆرەملى ئەو فێربوونەى وەك بزمار بە سەرا داكوتن. . ئەويش لە تاوا، بە ناچارى‌و داماوى لە دەستيـان ڕادەكـات، تاكـو خۆى لەو بيـرازو ئازارە ڕزگـار بكـات. . ئەو بيـرازەى كە دەبێتـە ووشـك كردنى چاوگـەى جۆرەها تواناو بەهرەى بە نرخ لە منداڵەكانمانا.

لەو شتانەى تريش كە ووره بە منداڵ بەردەدەن و بڕواى بە خۆى لەق دەكـەن، ئەوەيـە، كە گەورەكـان زۆر لۆمـەى بكەن و، هەڵەكانى لێگەورە بكەن. يان لەگەڵ منداڵى‌ترا بەراوردى‌بكەن و، گاڵتەى پێبكەن. يان ئەگەر لە خۆيەوە شتێكى هانى‌يـە پێشـەوە بە كێـويـا ببـەن، يان ئەگـەر پێچەوانەى ئەوان شتێك بڵێت زوو دەمكوتى بكەن.

## نموونەى هەڵبەست بۆ منداڵان

ئەو بيروباوەڕانەى ئێمەى كێش كردە سەر ئەم نووسينە، واشى‌لێ‌كردين هەوڵ بدەين، كە هەنـدێـك هەڵبەستى بە دڵـى خۆمـان، بۆ منـداڵان دابـنـێين، كە بە پێى ووزەو تواناماندا، ئەوەى پێويستە بۆ منداڵان، تيا دەربخەين.

لەگـەڵ ئەوەشـا، دەبـێ بزانـيـن، كە ئەو كەسـەى نەخشەيەك، يان ڕێبازێك دەهێنێتە پێشەوە، مەرج نى‌يە كە بتـوانێت لە هەمـوو كەس باشتـر بيهێنێتـەدى، چـونـكـە ڕێ‌دانـان و، بەكـارهێنـان، دوو جۆرە كردارى جيـاوازن، هەريـەكـەيـان پێويستى بە جۆرە بەهرەو توانايەكى تايبەتى هەيە. لەوانەيە لە بەكارهێنانى بيروباوەڕێكا، يان داهێنانێكا هەڵكـەوتـووى وا هەبێت كە بتـوانێت، لە خاوەنـەكەى زۆر بەكارترو چابوكتر بەكارى بهێنێت.

هەر چۆنـێـك بێـت، نە هەڵسـەنگـانـدنـا، دەبێت حەزلێكردن و چێژلێ‌وەرگرتنى منداڵان خۆيان، بكرێن بە سەنگى ترازوو، نەك بيـروبـاوەڕو دڵ و دەروون و خوليـاى خۆمـان. چونكـە ئێمـە هەريـەكـەمـان، وەك گەورە، بە جۆرێكى جياوازى تايبەتى تێ‌دەنواڕين. . تێڕوانينێك كە لەوانەيە زۆر دووربێت لە جيهانى بيرو خەياڵ و ئارەزووى منداڵانەوە.

**هەڵبەستـەكـانمان وەها داناوە، كە هەر يەكەيان، وەك تابلۆيـەك، ڕەنگين و سەرنـج ڕاكێش بنـوێنێت، كە بە ووشـە، لە جيـاتى فڵچـە دەربـڕابێت و، بە گەشـاوەيى‌و، ڕوونى‌و، ڕازاوەيى، لە هەنـدێـك ڕووەوە، لە بابـەتێكى تايبەتى دڵ ڕاكێش دوابێت. . بە جۆرێك كە ووشەكانى سووك و، ئاسـان و، ساكـار، پڕ ڕەزم و ئاوازبـن. . ووشـەكـانيشى لەگـەڵ حەزو خوزگەو، هەڵس وكەوت و، تواناى منداڵاندا گونجابن.**

**يەكەميان: هەڵبەستى «سەيرانە» كە زياتر بۆ منداڵانى (6 - 9) ساڵانە.**[9]

## مەبەستەكانى هەڵبەستەكە:

مەبـەستمـان لەم هەڵبـەستـە ئەوەيـە كە منـداڵان، بە گوێ‌لێ‌گرتن، لەگەڵ ڕەزم و ئاوازەكەيا بلەنجێنەوەو، كەيف خۆش ببن و، بە دەم ئەو كەيف خۆشى‌يەوە، سەرنجيان بۆ گەلێـك لە جوانى‌يـەكـانى سروشت ڕابكێشين. . كە لێى

وورد بینەوەو، لایان شیرین ببێت و، ڕێزی لێبگرن و، دڵیان پێی بکرێتەوە.

بەو بۆنەیەشەوە، هانیان بدەین، بۆ گەڕان و، سەیران و، چاوکێران و، سەرنج دان.. گەڕانێك، کە چاویان بکاتەوەو.

شارەزایی یان پێی پەرە بسێنێت.. سەیرانێکیش کە کرژی یان خاوبکاتەوەو، دڵیان بگەشێنێتەوە.. بیرەوەریشیان پرکات لە یادگاری خۆش و جوان. بە دواشیا بتوانن، بە لێدوان و وێنەکێشان، بە گۆرانیو، خوێندن و، جموجۆلی تر.. ئەندیشەو، حەزو، خۆزگەو، خەیاڵیان بە داهێنانەوە، دەرببڕن و، هەست بە تواناو ووزەی خۆیان بکەن.. جۆرەها بەهرەی مات بووی ڕەسەنیشیان تیا سەر هەڵبدات و بپشکوێت.

## پێش کەش کردنی هەڵبەستەکە:

ئەمەی ئێمە باسی دەکەین، نموونەیەکی مەیوی دەق گرتوو نی یە کە هیچ لێی لا نەدرێت، بەڵکو لە مامۆستا چاوەڕێ دەکرێت، کە بە پێی پێویست، هونەرمەندانەو، چابوکانە، گۆڕین و زیادو کەمی بە کەڵکی بە داهێنانەوە تیا بکات.

وا چاکە مامۆستا لە پێشەوە، وەك سەرەتایەك بە شێوەیەکی ئاسان و بە تام، لە منداڵەکان بگەیەنێت، کە چۆن ئێمە هەموومان، پێویستیمان زۆرە بەوەی، کە لە ئیش کردنمانا، بەینابەین، بۆ حەسانەوەو گەشانەوە، سەیران بکەین.. سەیرانی شوێنێکی دوور لە دەنگی ناخۆش و دووکەڵ و تۆزو خۆڵ.. دوور لە خانووی تەنگەبەری داخراو، یان لە باڵەخانە بەرزەکانی تێکچراو.. سەیرانی دەشتێکی پڕ لە گوڵ و سەوزەگیا، یان لە سەر ئاوێکی خوڕی ناو چەم و نزیك چیا. تاکو لەوێ تێر بە دڵی خۆمان یاری بکەین و پێبکەنین.. هەوای پاکی پڕ بۆنی درەخت وگیا هەڵمژین.. گوێ لە خوێندنی باڵندەکان و، گۆرانی خۆش بگرین و، خواردنی هەمەجۆرەش پێکەوە بخۆین.

پاش ئەوەی مامۆستا منداڵەکان بەو باسانە بۆ گوێلێگرتنی هەڵبەستەکە ئامادە دەکات، دێتە سەر ئەوەی کە پێیان بڵێت: ئێستا هەڵبەستێکی خۆشتان بۆ دەخوێنمەوە، کە باسی سەیرانمان بۆ دەکات.. هەڵبەستێك کە زۆر لە منداڵان دڵیان پیاچووە، دڵنیام کە ئێوەش لاتان شیرین دەبێت.

وە ئەگەر هەڵبەستەکە، ووشەیەك یان ووتەیەکی گرانی تیا هەبێت، مامۆستا لە پێشەوە بۆیان ڕوون دەکاتەوە، بێ ئەوەی ووشەکەیان بۆ شی بکاتەوە.

پاش ئەم هەنگاوانە، مامۆستا بەو شێوەیەی لە پێشەوە باسمان کرد، بە دەنگێکی ئاوازداری پڕ سۆزەوە، بە چابوکیو هونەرو جۆشەوە، لەبەر، هەڵبەستەکەیان پێش کەش دەکات.

ئنجا دوای هەندێك لێدوان و سەرنج ڕاکێشانی منداڵەکان بۆ جوانی ئەو دیمەنانەی هەڵبەستەکە باسیان دەکات، پێیان دەڵێت:

«ئێستا جارێکی تر هەڵبەستەکەتان بۆ دەڵێمەوە، بەڵام دەمەوێت ئەم جارە کە گوێتان لێدەبێت، بیر لەوە بکەنەوە، کە ئەم هەڵبەستە کام جۆرە وێنە دەخاتە بەرچاوتان و، کام یادگار دەهێنێتەوە بیرتان.

دوای دووبارەکردنەوەی هەڵبەستەکە، مامۆستا ووردە ڕاوێژێك دەربارەی (سەیران) لەگەڵ منداڵەکانا دەکات و، هەندێك پرسیار بە دوای یەکا، لە هەموویان دەکات، وەك ئەوەی بڵێت: «کەی بەم نزیکانە چویت بۆ سەیران؟، چۆن چوویت؟، لەگەڵ کێ؟، بۆ کوێ؟، چیت دی؟».

ئنجا دوای ڕاوێژەکەو وەڵام دانەوەی هەندێك لە

پرسیاری منداڵەکان، داوایان لێ دەکات، کە ئەوەی هەڵبەستەکە بە ووشەی جوان باسیان بۆ دەکات، ئەوان خەریك بن، کە هەر یەکەیان، بە پێی خەیاڵ و بیرەوەری خۆی، لە جیاتی ووشە، بە پەڵەی رەنگاو رەنگی فلچە وێنەکانیان نەخش بکات و، جوانی‌یەکانیان بە رازاوەیی دەربخات.

بۆ ئەم مەبەستە، وا چاکە مامۆستا دوای داواکەی، هەڵبەستەکە بۆ جاری سێیەم، بە رووبەکی خۆش و، لێونکی بە بزەوە،.. بە گەرمی‌یەکی پڕ قوڵپ و جۆشەوە، بۆ قوتابی‌یەکان بڵێتەوە.

مامۆستا، بەم راگەیاندن و، دوواندن و، وێنەکیشان و، جموجۆڵانەی‌تر، وا لە منداڵەکان دەکات کە بە شێگیری‌و چەشەبوونەوە، ئالوودەی هەڵبەست ببن و، چێژی لێ وەرگرن و، سامان، دەسکەوتی ووشەیان فراوانتربێت.. جۆرەها بەهرەی شارراوەشیان تیا سەرهەڵبدات و، هەڵقوڵێت و، گەلێك لە تواناکانی داهێناشیان تیا پەرەبسێنێت.

کارێکی جوانیش دەبێت، ئەگەر مامۆستا لە پێشەوە، هەندێك وێنەی گەورەی سەیرانگاکان ئامادە بکات و، لە ژێر هەر یەکەیاندا، بە خەتێکی خۆشی رەنگاو رەنگ چەند بەیتێکی هەڵبەستەکە بنووسێت. تاکو لەملاو ئەولای سەر دیواری ژووری پۆلەکە، بە بەرزی باڵای منداڵەکان، رێك و جوان و بلاو، هەڵیان بواسێت و، بۆ چەند رۆژێکی کەم بیانهێڵێتەوە، تاکو بە کاوەخۆ لێی وورد ببنەوەو بیخوێننەوە.

بێجگە لەمانە، مامۆستا وەکو لە پێشەوە لێی دوواوین، دەتوانێت بە هۆی چەشنەها جۆرە جموجووڵ و هۆی‌ترەوە، هەڵبەستەکە بکات بە مایەی بەرهەم هێنان و پەرەپێدانی گەلێك زانیاری‌و، خولیاو، چابوکی‌و، خووی بە کەڵك لە منداڵەکانا.

ئەم شێوە ئیشەی ئێمە لێی دوواوین، بە پێی ئەو بیرو باوەڕانە پیشاندراوە، کە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی دەبێت مامۆستای پۆل بێت، نەك مامۆستای بابەت. واتا ـ دەبێت مامۆستای پلەی سەرەتایی هەموو بابەتەکانی پروگرامی پۆلەکەی بڵێتەوەو، بتوانێت ژەم ژەم، وەستایانە، پلە لە دوای پلە، رێکیان بخات و لەگەڵ یەکا تێ هەلکێشیان بکات. قوتابی‌یەکانیش لە چی‌یا کۆڵ و چەقیوبن، یان کەوتبن، دەستە دەستە، بە جیاجیا، بە پێی پێویستیان، دەستیان بگرێت و، هەڵیان بسێنێتەوەو، لە گەڵیانا، بە پێی توانای ئەوان هەنگاو بنێت، تاکو دەیانگەیەنێتەوە ریزی قوتابی‌یە پێش کەوتووەکانی‌تر.. یان بە شینەیی وەها لەگەڵیانا بێت و، دەستیان بگرێت، کە چیان لە بارابێت و، مێشکیان هەڵی‌گرێت، بە گوێرەی رەوتی خۆیان، لە گەڵیانا بروات و فێریان بکات.

لەم جۆرە قوتابخانانەدا، تەنیا هەر بۆ وەرزش و، مۆسیقاو، هونەرو، فێربوونی زمانی دووەم، لە پاش سێ سالی یەکەم بەولاوە، ئەگەر دەستکەوێت و رێکەوێت، مامۆستای تایبەتی‌یان بۆ دادەنرێت.

## ئەمانەش نموونەی هەڵبەستەکانن:
## هەڵبەستی سەیران

ئەم هەڵبەستە بۆ ئەو منداڵانەیە کە تەمەنیان لە دەوری (6 ـ 9) ساڵان دایە.

### سەیران

ئێمە دەچین بۆ سەیران،
بۆ سەیرانی ناو شاخان،

سەیران



بۆ سەیرانی ناو باخان،
بۆ سەیرانی ناو دەشتان.

دەچین بۆ ناو گوڵ و گیا،
لە گوێ ئاوو پاڵ چیا.
پێکەوە یاری دەکەین،
یارمەتی یەکتر دەدەین.

بە سەماو، بە هەڵپەڕین،
بە چاوشارکێو پێکەنین،
دڵی خۆمان خۆش دەکەین،
گەشە بە لەشمان دەدەین.

(باڵدار)

## هەڵبەستی دیمەنی کوێستان

ئەم هەڵبەستەش هەر بۆ هەمان مەبەستی هەڵبەستی پێشووەوە، هەر وەك ئەویش پێشکەش دەکرێت، بەڵام بە زۆری بۆ ئەو منداڵانە دەشێت، کە تەمەنیان لە دەوری (9 ـ 12) ساڵان دایە.

دیمەنی کوێستان



## دیمەنی کوێستان

هەستە، با بڕۆین بۆ کوێستان،
بۆ ناو بەفری جوانی شاخان،
بڕۆین، بگەڕێین، بنواڕین،
بۆ گشت جوانی، چاو بگێڕین،
لەوێ هەڵپەڕین، ڕاکشێین،
یان سەماکەین و، هەڵخلیسکێین،
بەو جوانیانە چاو بڕێژین،
تا هەر خۆشی لێ بچێژین،
جوانی وەنەوشەو، هەڵاڵە
بەردو، سەوزەگیاو، گوڵاڵە.
چەم و، چنار، جوگەو، کانیاو،
بزن و، مەڕو، بەرخی گوێ‌ئاو
مەل و، پەپوولەی هەمەڕەنگە،
سمۆرەو، کەروێشکی بێدەنگە.
گۆرانی بڵێین، پڕ بە دڵ،

زەماوەند بگێرین بە کوڵ،
گۆرانیی سۆزی دڵ و گیان،
ووشەو ئاوازی خۆش و جوان،
گۆرانی بۆ خاکی پیرۆز،
بۆ ڕۆڵەی لێهاتووی دڵسۆز،
گۆرانی بۆ کوردوستانمان،
لانەی مەردان و شاسوارمان.

(باڵدار)

## هەوری بەهار

ئەم هەڵبەستەش تابلۆیەکی سەرنج ڕاکێشەو، بۆ منداڵانی (9 ـ 12) ساڵان دانراوە.. کە بە ووشەی گەشاوەی نەشمیلانە، هەندێك لە جوانییە جۆراو جۆرەکانی هەوری بەهار، بە ئاوازو ڕەزم و، تام و، پێزەوە بهێنێتە بەرچاو.

بە هۆی ئەم هەڵبەستەوە، مامۆستا دەتوانێت وا لە منداڵەکان بکات، کە حەز بە لێووردبوونەوەی جوانییەکانی سروشت بکەن و، لە لایان پەسندو شیرین بێت و، چێژیا لێوەربگرن: واشیان لێبێت کە خۆیان بتوانن، بە داهێنانەوە، لەو جۆرە دیمەنانە بدوێن و، بە ووشە، یان بە فلچە، دەریان ببڕن.

## هەوری بەهار

بە ڕۆژەکانی بەهاران
کە دەڕوانینە ناو ئاسمان
ڕازاوە بە هەوری جوان جوان
بە هەوریَ نەخشاوو پەخشان

هەوری بەهار



هەوری پڕو، بڵاو بڵاو
ڕەش و سپی، لە یەك ئاڵاو
بەرزو نزم، لە ناو هەتاو
دێن و دەچن، خێرا بە تاو

بە گرمەگرم و، شریخە
لەگەڵ بروسکەو، تریشقە
جارجار ، گورج بڵاو دەبنەوە
یان بە یەکترا دەچنەوە

لە پڕێکا قڵپ دەبنەوە
وەك کوندە دەم دەکەنەوە
لێیان دەڕژێتە خوارەوە
بارانی زۆر بە تەرزەوە

لە ناکاو، دەرەوینەوە
بڵاو دەبن، دەکشێنەوە
ڕووی ئاسمان دەبێت بە ساماڵ
لەگەڵ پەڵە هەوری کاڵ کاڵ
ئەوسا گەڵاو، گوڵ، سەوزەگیا
سەر بەرز دەکەنەوە، جیا جیا
شۆڕاوە، ڕووگەش دەنوێنن
دڵۆپ دڵۆپ، ئاو دەتکێنن

(باڵدار)

لەو بەسەرهات و تێڕوانینانەی منداڵان حەزیان لێدەکەن و، گەلێك سوودی بەکەڵکیان لێوەردەگرن، ئەوەیە کە بۆیان ڕێبکەوێت لە دوو جۆرە شتی پێچەوانەی یەك ووردبینەوەو لە گەڵ یەکا بەراوردیان بکەن و، بزانن جیاوازییان چی یە لەگەڵ یەکا.

بۆ ئەم مەبەستە دوو هەڵبەستمان داناوە، یەکێکیان پیاهەڵدانێکە دەربارەی سازگاری و گەشەبەخشینی شنەی بای شەماڵ. ئەویتریان پیاهاتنێکە دەربارەی ناسازی و، شێواندن و، زرم وهووری ڕەشەبا.

مامۆستا دەتوانێت بەهۆی ئەم دوو هەڵبەستەوە هانی منداڵەکان بدات بۆ گەلێك جۆرە سەرنج دان و، ووردبوونەوەو، تێ ڕوانین.. بۆ هەمەچەشنە پرسیارو لێکدانەوەو دەربرین.

بە هۆی ئەم دوو هەڵبەستەوە منداڵان فێردەبن، کە چۆن لە دوو جۆرە چەشنی ناسراوی «با» ووردبینەوەو لە گەڵێك ڕووەوە بەراوردیان بکەن و، لێکیان جیا بکەنەوە... چۆن بە ووشەی ڕەوانی ڕەنگاوڕەنگی پڕ سۆزو خرۆش، بە پێی ئەندیشەو هەست و خەیاڵی خۆیان، لێیان بدوێن و، بیرەوەری خۆیان دەربارەیان بگێڕنەوە، یا بینووسنەوە.. یان بە وێنە لە جیاتی ووشە، بە نەخش و، ڕەنگە و، نیگار بیخەنە ڕوو.

هەردوو هەڵبەستەکە بە زۆری بۆ منداڵانی (9 ـ 12) ساڵان دەشێن.

## بای شەماڵ



بای شەماڵی ناوچەی کوێستان،
کە هەڵ دەکات بەرە بەیان،
لق و چڵ و گەڵای داران،
گوڵاڵەو نێرگسی دەشتان،
هەموویان دێنێتە لەنجە
دەسرێت گۆنای گۆپکەو خونچە.

لە سەرخۆ، بە شنەو وورشە،
خاوێن، پڕ بۆنی وەنەوشە،
لە شاخەوە دادەگەڕێت،
ئنجا بە سەر گردا دەکشێت،
پاشان لە چەما کپ دەبێت،
بێ دەنگە، سروەی لێ دەبڕێت.

(باڵدار)

گێژەڵووکە پەیدا دەبێت
که دار لەبن هەڵ دەکەنێت،
له پڕ خیرا دا دەمرکێت،
هەموو لایەك خامۆش دەبێت.

(باڵدار)

هەڵبەست بۆ پێکەنین.. بۆ چیرۆك گێرانەوە.. بۆ یاریکردن و، لێووردبوونەوە، لەو بابەتانەن کە بە هۆیانەوە ئێمە دەتوانین، زۆر جۆرە فێربوون لای منداڵان شیرین بکەین و، بە دەمیانەوە پەرە بە سامانی ووشەیان بدەین و، توانای نووسینی داهێنراویشیان تیا بە هێز بکەین.

منداڵان بەو جۆرە هەڵبەستانە گەشەدەگرن و، سەرگەرم دەبن.. بێ هێلاك بوون و وەڕس بوون، گوێی لێدەگرن و، بە نەشەو، لەنجەو، پێکەنینەوە، جار لە دوای جار، دەیلێنەوەو، هوگری دەبن.

ئەگەر هەڵبەستەکان، بە زمان گیاندارانەوە ووترابن، یان منداڵان لەگەڵ ئەوانا دووابن، قووڵترو فراوانتر کارییان تێدەکەن و، زیاتر پێیان دڵخۆش دەبن.

بۆ ئەم مەبەستە، چەند هەڵبەستێکمان بە نموونە داناوە، کە هەمووییان، بە زۆری، بۆ منداڵانی (6 ـ 9) ساڵان دەشێن. هەڵبەستەکانیش ئەمانەن:

یەکەم ـ مەیموونە سوورە
دووەم ـ چوار-سمۆرەی خنجیلە
سێیەم ـ پەپوولە
چوارەم ـ هەنگێك
پێنجەم ـ پشیلەکەم
شەشەم ـ بەرخۆلەکەم

### ڕەشەبا



ئەوا ڕەشەبا هاتەوە،
سەر لەم ناوە دەداتەوە
بە گڤەگڤ و، گرمەوە،
بە لوورە لوورو، زرمەوە،
ئێمەی هەراسان کردەوە،
گشت لایەکی شێواندەوە.

وا، ئاڵا دەشەکێتەوە،
پەروانە دەسووڕێتەوە،
فرفرۆکە دەخولێتەوە،
کۆلارە بەر دەبێتەوە.
ئێمە بایەکە نابینین،
بەڵام دەنگەکەی دەبیسین،
ساتێك کە لە پڕ هەڵ دەکات،
دارو پەردوو لە یەك دەدات،
دەورمان پڕ لە خۆڵ دەکات،
چی سووکە بۆ حەوای دەبات.

## مەیموونە سوورە



لە ناو باخێکی گیانداران
لە گوێ ئاوێکی بەردەڵان
مەیموونە سوورێکی سەرخڕ
کردی بە ڤیژەڤیژ لە پڕ
بە نەڕە نەڕو بوڵاندن
دەستیکرد بە سك کوتاندن

هەڵ دەبەزی‌و، دادەبەزی
ڕادەوەستاو هەڵ دەلەرزی
لە پڕ مەیموونێکی برسی
هات بە قایم کلکی گەزی
مەیموونە سوورە ڕاپەڕی
ڤیژاندی، خێرا دەرپەڕی
بە ڕاکردن و قەڵەمباز
بۆی دەرباز بوو لە ترسی گاز

(باڵدار)

## چوار سمۆرەی خنجیلە



چوار سمۆرەی جوان، سووری خنجیلە،
لە سەر دارێك بوون، زیت و وودیلە.

یەکەمیان ووتی: گوێم لە ترپەیە،

گوێم وا لە دەنگی چرپەو تەپەیە.

دووەمیان ووتی: با خیرا ڕاکەین،
تا، زووە، خۆمانی بۆ دەربازکەین.

سێیەمیان ووتی: وەرنە ئێرەوە،
با خۆمان زۆر چاك بشارینەوە.

چوارەمیان، خێرا هەڵسایە سەر پێ،
ووتی: قەت نەکەن بچن بۆ هیچ کوێ.

خۆتان بێ‌نقەو بێ‌دەنگە، مات کەن،
کلك لە لقی دارەکە، توندکەن،

ئەگەر یەکێك هات، با نەمان بینێت،
بێرەشا بڕوات، پێمان نەزانێت.

(باڵدار)

## پەپوولە



پەپوو. لەی جوان و ڕازاو،
ئێسك سووکی باڵ نەخشاو،
تۆ، کەی هاتیت بۆ لامان؟
بە خێرهاتیت سەرچاومان.
چاوەڕێت بووین زۆر بە کوڵ،
بیرمان دەکردیت بە دڵ،
لێرە زۆرە دارو گوڵ،
بفرە، لەم چڵ بۆ ئەو چڵ.

(باڵدار)

## هەنگێك



ڕۆژێکی خۆش لە ڕۆژان
دەمە دەمی ئێواران
لە ناو باخی دێ‌کەمان
دانیشتم لە بن دارێك
لە پڕ بینیم وا هەنگێکە
دەفڕێ لە دەورێ گوڵێك

گورج گورج، دەسووڕایەوە
باڵی دەجوولایەوە
لەشی دەبریقایەوە

بەرزو نزم دەبووەوە
لەنگەری دەگرتەوە
لە ناکاوا دەنیشتەوە

تێر تێر، گوڵەکەی دەمژی
کە شیلەکەی لێ‌دەبری
بەرەو کوورەکەی دەفڕی

(باڵدار)

## پشیلەکەم



پشە خرپنەی جوانم،
ئێسك سووکی نازدارم،
ئەندام تووکنی خاڵ خاڵ،
سمیڵ درێژی چاوکاڵ،
ڕاکە، وەرە باوەشم،
تێر خۆت هەڵسوو لە لەشم،
دەی، زوو وەرە، گیانەکەم،
هەتا دەست لە ملت کەم.

(باڵدار)

## بەرخۆڵەکەم

بڕوانە چەند جوانە
ئەوە بەرخی خۆمانە
خۆشەویستی گشتمانە

## بەرخۆلەکەم



وەرە، وەرە، بەرخۆڵە
خێرا، خێرا، خنجیلە
ڕاکە، ڕاکە، جوانکیلە

زوو، زوو، وەرە باوەشم
بەرخەکەی تووك ئاوریشم
نازدارەکەی چاوگەشم

(باڵدار

هەڵبەستی گەشت کردن بە سواری خەیاڵ.. یان هی ڕازی دڵ و دەروون دەربڕین و، شوێن کەوتنی سەوداو خولیای شیرین.. لەو هەڵبەستانەن کە وەك چەخماخە، ئەندیشەو خەیاڵی منداڵان دا دەگیرسێنن و، بەهرەو هونەرمەندییان تیا دەهێننە کوڵان و هەڵقوڵان.. بە جۆرێك کە بە دەمیانەوە بکەونە خەوبینین و داهێنان، بەڵی، داهێنان ـ ئەو هێزە پڕ سیحرو هونەرو، توانایەی کە، تا ڕادەیەك، لە هەموو یەکێکمانا بە مەنگیو ماتی، پەنگی

خواردوونەوەو، لە ژێرەوەو قوڵپ دەدات و، بە هەموولایەکا تەکـان دەدات. . کە بەری بۆ بەرەڵا ببـێـت و سەر دەرکـات. . تاکـو بە گوڕم و لێشـاو هەڵقوڵێت و، لە شێوەی بەرهـەمی ڕەسـەنی باڵاو بایـەخداردا خۆی بنوێنێت. . ئەو هێزەی کە هیوام وایە لە ووتاریکی‌تردا بە فراوانی لێ‌ی بدوێین.

بۆ ئەو مەبەستانەی کە وا باسمان کرد بە نموونە، دوو هەڵبەستمان داناوە، یەکەمیان بە ناوی (دەنگە خۆشەکان)ە وە، ئەویتـریـان بە ناوی (میـزڵـدانـەکـانی جوامێـر)ەوە. هەردووکیان بە زۆری بۆ منداڵانی (9 ـ 12)ساڵان دەشێن.

قاسپە قاسپی نێرەکەوان،
دەنگی بۆق بە مانگەشەوان،
باڕە باڕی مەڕ، ئێواران،
کەناچەی پۆڕ، بەرەبەیان،
جریوەی چۆلەکەی بێستان،
هاژەهاژی ئاوی چەمان،
گرمەگرمی هەور، بەهاران،
تکەتکی ئاو، دوای باران،
ناڵە ناڵی شمشاڵی شوان،
ئاوازی لاوك و حەیران.

(باڵدار)

## دەنگە خۆشەکان



گەلێك دەنگە لای من خۆشن،
کە دڵگیرو شادی بەخشن،
چریکەی خوێندنی بولبول،
لە سەر چڵی دار، ڕووەو گوڵ

## میزڵدانەکانی جوامێر



باوکی جوامێر بە دیاری،
نۆ میزڵدانی هانی،
سەوزو، سوورو، قاوەیی،
مۆرو، شین و، پەمەیی،

زەردو، نارنجی‌و، سپی،
گەورە گەورەو، گوڵ گوڵی.

جوامێر پێیان دڵخوش بوو،
خێرا بۆ لای باوکی چوو،
بە گەرمی سوپاسی‌کرد،
باوکیشی تێر ماچی‌کرد.
لە پاشان جوامێر خێرا،
نۆ میزڵدانەی هێنا،
پری کردن لە هەوا،
بەرزبوونەوە بۆ حەوا،
جوامێریش لە گەڵیانا،
خۆی هەڵواسی پیانا.

با، بردنی بە ئاسمانا،
بە سەر دەشت و شاخانا،
بە سەر گوندو شارانا،
لە بەر چاوی هەموانا.

گەورەو بچووك کۆبوونەوە،
لەم دیمەنە وورد بوونەوە،
هەموو واقیان وڕ مابوو،
ڕاماو، سەریان سوڕمابوو.
یەکێك هاواری دەکرد،
هێتر دەستی بەرز دەکرد،
منداڵێکیش لەولاوە،
بە هەڵبەزو سەماوە،
هەروا دەی ووت، کاشکایە،
لە جێی ئەو من بووایە.

(باڵدار)

## پەراوێزەکان

(1) ئێمە ووشەی «ڕەزم»مان بۆ واتای (ئیقاع) بەکار هێناوە، کە لە ئینگلیزیدا (rhythem) ی پێ دەووترێت. لای خۆشمان (بەزم و ڕەزم) کۆری شایی‌و ئاهەنگە، کە بە هەمە جۆرە ئاوازو ئیقاع گەرم بوویێت. دووریش نی‌یە کە ڕەزمەکەی خۆمان لە گەڵ ووشەکەی (rhyth.m) دا بچنەوە سەر یەك بنەچە.

(2) بڕوانە: Logan, Lillian M., Logan, Virgil G. and Patersom, Leona. Creative Commumication, New York: Mc Graw - Hill Ryerson Limited 1972 P. 203.

(3) بڕوانە: أحمد نجيب، فن الكتابه للأطفال، مصر: دار الكاتب العربي للطباعة والنشر (فرع مصر) 1968، ص (95 - 96).

(4) بڕوانە: Anderson, Paul S., Lamguage Skills im Elementary Educatiom, Secomd Edition, New York: Macmillam Publishin.g CO., 1972. PP. 130 - 143.

(5) بڕوانە: هەمان سەرچاوە .Ibid

(6) بڕوانە: هەمان سەرچاوە Ibid

(7) بڕوانە: سامي عبدالحميد نوري، و بدري حسون فريد «طرق تدريس الالقاء» بغداد: وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، 1979. ص، 125 - 128.
هەروەها بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو Anderson, LOC. Cit

(8) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو - Logan, Logan and Paterson, OP. Cit P. 424.

(9) ساڵێك لەمەوبەر کە ئەم هەڵبەستانەمان دانا، تکامان لە مامۆستا کاکەی فەلاح کرد کە لە لایەن کێش و قافیەوە، پیانا بچێتەوەو بیرو باوەری خۆی دەرخات بۆمان. ئەویش، برایانەو، وەستایانە، گەلێك سەرنج و پێش نیاری بە نرخی خۆی لەو ڕووەوە بۆ دەرخستم، زۆر بە کەڵکم هاتن.
لەم ڕۆژانەشدا، جارێکی‌تر لەگەڵ هەندێك هەڵبەستی تری

نوێـدا دامـەنـەوە بە مامـۆستـا عبـدالـرزاق بیمـار کە پێش بلاوکـردنـەوەیـان، چاوێکیـان پیـابخشێنێتەوە، ئەویش لە رووی کێش و قافیـەوە، بە دەم نرخـانـدن و هانـدانـەوە، گەڵێـك پێش نیاری جوانی بە نرخی خستە پێش چاوم، کە زۆر کەڵکم لێ بینین.

یارمەتی هەردوولایان جێی سوپاسی گەرم و، ڕێزگرتنی پڕ دڵە.

## فەرهەنگۆکی ووتارەکە

| | | |
|---|---|---|
| توانا - | المقدرة | ability |
| ووزە - | القابلیة الطاقة القصوی | capacity |
| داهێنان - | الابداع، الابتکار | creativity |
| هەلگەوتوو - | نابغ | genius |
| چێژلێوەرگرتن - | التذوق، التقدیر | appreciation |
| ڕەزم - | الایقاع | rhyThe m |
| سەرنج دان - | الملاحظة | observation |
| زانیاری - | المعرفة | knowledge |
| چابوکی - | المهارة | skill |
| خولیا - | الاتجاه | attiLude |
| جموجوڵ - | الفعالیه، النشاط | activity |
| خوو - | العادة | nabit |
| تێ هەڵکێش کردن - | الدمج، التکامل | integraTed |
| دەماغ - | المزاج | Mood |
| بابەت - | الموضوع | subject |
| بەهەرەوەر<br>بەهەرەمەند<br>لێهاتوو | موهوب | gifted |
| ناوەند | الوسط، البیئة | envirommenT - |

لە فەرهـەنگی پەروەردەی (Good) دا Dictionary of Education پیشـان دراوە کە ووشـەی emvironment زاراوەیـەکی گشتی یـە بە هەموو ئەو شتانەو، هێزانەو، حالەتانە دەووترێت کە کار دەکەنە سەر مەردووم. بۆیەکە ئێمە ووشەی (ناوەند) پڕ بە پیستی ئەم واتایە دەبینین.

| | | |
|---|---|---|
| وێل - | لیاقە، کیاسە، مجاملة | Covrtesy |
| ڕەسەت - | أصلی | origimal |

تێ ڕوانین - نظرة، دەتوانرێت بۆ نظریەش بەکار بهێنرێت Theory کە ئێستا هەندێك ووشەی (تیوری) بۆ یەکار دەهێنن.

ووشـەی (Theory) ئینـگـلیـزی وەك فەرهـەنگی «Webester's New World Dictionary» باسی دەکـات لە بنـەچـەدا یان فەرەنسی یـە، کە پێیـان ووتووە: Teorie) یان لاتینی یە کە لەگەڵ یونانی یەکانا بە Theoria) ناویـان بردووە پاشـان بە Theorein) بە واتای To look at بەکار هێنراوە، کە ئەمەش، بە واتاو ئاخـاوتنـەوە، تێڕوانینەکەی ئێمە دەگرێتەوە، لەوانەشە لەبنەچەوا بچنەوە سەریەك.

| | | |
|---|---|---|
| دەنگ دانەوە | | |
| بۆسەندنەوە | استجابة | response |
| هەڵسەنگاندن | تقویم | evaleeation |
| ڕەفتار<br>کردار | سلوك | behavior |

فەرهەنگی پەروەردەکردن کە (Good) دانیاوە، وای پیشـان دەدات کە behavior بە شێـوەیـەکی فراوان، هەمـوو ئەو شتانەیە کە گیانداریك دەریکات، وەك: کرداری بەءچاو، یان ڕەفتاری لەش و ئاو هەناو، یان تاسەی دەروون و جموجۆڵی هەڵچوون.

بۆیـەکـە «ڕەفتار»، یان «کردار»، هەردووکیان جوان گونجاون بۆ دەربڕینی ئەم واتایە.

سونێتاتێت

# رەسول حەمزاتوف

## دەنگێ ڤینێ و مرۆڤایەتیێ



● بدل رڤو مزوری ●

**کورتە ژینا هوزانڤانی:**

هوژانڤـــان رەســـول حەمــزاتـوف ل [1923/9/8]ل هەرێمــا «خــوانــزاخسکی»ل داگستـانێ چاڤێت خوێت ڤەکـرین و بۆ جیهـانێ یێ گرنـژی، ناڤبـری هوزانڤـانەکێ روسی ئەڤاری‌یە ژ هوزانڤانێت نیشتیمان پەروەرو شورشگێر دێتە دانان ژ بەر کو رەسەنا مالا وی هەمی نیشتیمان پەروەر بونە، هوزانڤان سەیدا بۆ ل ئاموژگەیا مەکسیم گورکی ل موسکـوێ فێـربـویـە، ئەو ئامـوژگـەیا کو هەتا نهو ب ناڤ دەنگە ب تورو کەلەپورێ خو.

ناڤــبــری ل سالا 1937ز دەســت ب بەلاڤـکـر نــا بەرهــەمێت خو کر، لســالا 1943 کومـەکـا هوزانێت خو بەلاڤ کر ل ژێر ناڤ نیشانێت «ئەڤینا گەرم و کەرب و کینا تویژ»، ناڤبری دستری ب چەلەنگی‌یا خەلکێ روسی‌یا د سالێت جەنگێ‌دا وئـەو چەلـەنگی‌و زیـرەکی ب بونە ستران دنــاڤ هوزانێت وی‌دا ئەوێت هاتی‌نـە بەلاڤ کرن ل سالا 1947ل ژێر ناڤ و نیشانێت «چیاییێت مە»، «ئەردێ من» یا هاتی‌یــە بەلاڤ کرن ل سالا 1948، «نیشتیمــانـەك ژ خەلـکـێ چیــا» یا هاتـی‌یــە بەلاڤ کرن ل سالا 1950، «چـەنـد پەیڤـەك ژ برایێ مەزن» ل سالا 1952، «بـوهارا داگـستــانێ» ل سالا 1955، «دلێ من ل چیــا» ل سالا

1953، ناڤبری د هەلبەستا خو «گریانکە»کو یا هاتیە بەلاف کرن ل سالا 1958، بەر چاڤ دکر ژیانا داگستانێ سوشالیست یا د هاتە کوهـژرین د سایکولوجیا خەلکێ جیادا، هەر وەسا بەر چاڤ دکر هەڤالینی‌یا میللەتێت پێشکەفتی‌و موکرم و، دیار دکر بەر هەلستانا تولازاو نەرازی بوینا وان دژی سەخلەتێت کەڤن «کەفنە پەرستیێ» و حەباتا وان ژ بۆ وەرگرتنا مافێت ڤیان و ئێك گرتنێ‌و هەڤ ژینی‌یێ بۆ هەمی مرۆڤا، هەر وەسا پەیداکرنا یەکساتی‌یێ ناڤبەرا ژنك و زەلامادا.

داخـازا حەمـزاتـوف یا هێژاو رەسەن کو یا هاتی‌یە باس کرن بابەتێ هەلبەستا وی بۆ ئەوا هاتی بەلاف کرن ل سالا 1953، ل ژێر ناڤ و نیشانێت «گفتوگویەك ل گەل بابێ».

هوزانێت حەمـزاتـوف دیارن ب سپەهی هەستانێت هوزانڤانی بۆ ژیانێ، پێ ناسی‌و وێنەگرتنا مرۆڤاو سروشتا وان، ئەو هەستـنـان د نێـزیـکـن ژ خەلـکێ‌و دلێت وان، ل سالا 1952 هوزانڤـانی دیـاری‌یـا وەلاتێ ئێکـەتی‌یـا سوڤیێت وەرگـرت ئەوا هاتی‌یـە پێشکێش کرن بۆ کومـالا هوزان و هەلبەستێت وی «سالا بونا من»و کومالا هوزانێت «ستێـرێت بلنـد»یا هاتی‌یە بەلاف کرن ل سالا 1963، خەلات یا لینین وەرگرت، هەلبەستێت وی یێت ب ناڤ و دەنگ ئەڤەنە «کومالا [زەرییمە]»و «نڤیسینەك» یێت هاتینە بەلاف کرن ل سالا 1963 «گفتوگویاد ناڤبەرا دو ستێرادا» ل سالا 1964، «مولاتکا» ل سالا 1966، چیروکا هوزانا هوشمـەنـدی‌یێ «کومـارا من داگستانێ» یا هاتی‌یە بەلاف کرن ل سالا 1968، هەر وەسـا ل ژێـر ناڤ و نیشـانێت «کـومـارا من داگستـانێ» حەمـزاتـوف چیروکەك بۆ بچویکا نڤیسی‌یە ل سالا 1967.

هوزان و هەلبـەستێت حەمـزاتـوف دیـار دبن ل گەل گوتـارێت تورێ رەخنـەگـری‌یێ یێت هاتینـە وەرگێـران بۆ ئەزمـانێ عەرەبی یێت [«پـوشکین»، «لێـرمـونتـوف»، «مـایـاکـوڤسکی»... هتـد]. هوزانێت ناڤبری بۆ گەلەك ئەزمـانـا هاتینـە وەرگێـران بۆ میللەتێت ئێکەتی‌یا سوڤیێت و گەلـەك ئەزمـانێت دی بۆ میللەتێت بیـانی، ل سالا 1962 هوزانڤـان ب بۆ ئەنـدامـەك د جڤـاتـا دەستـەکا هاوکاری‌یا میللەتێت ئاسیـاو ئەفـریقیـا، ژ سالا 1951 هوزانڤـانی سەروکـاتی‌یـا رێکخراوا «نڤیسەر» لکومارا داگستانێ کربو، گەلـەك خەلات بۆ ڤی نشـتـیـمـان پەروەری هاتـنـە پیشکەش کرن دا ب ببنە نیشانێت سەرکەفتنێ سینگێ وی د خەمـلینـن و د بنـە فەنـەرو چرا یێـت رێـکـا هوزان و هوزانڤـان و پێشکـەفتنخـازا سپـەهی وروهن دکـەن ژ بۆ پەیداکرنا روژەکا شاد بۆ هەژارێت جیهانێ.

ئەڤە بۆ کورتەك ژ ژینا هوزانڤانی ئەز دکەمە دیاری بۆ خویندەڤانێت خوشتڤی.. هیڤی دارم جهێ رازی بوینا وان بیت د گەل ئەڤـان سونێتێت هوزانڤـانی.. من پێ خوشـە بکەمە دیاری بۆ خویندەڤانێت هێژا..

(1) «سونێتات»

هەلبەست پیشەکێ هوزانی‌یە،
جهـ نینە بۆ وەکی ڤی کاری ل جیهانێ،
ئەرێ ڤێجا چ هەیە؟ چیایێت ژێك دویر،
بەفرو باران، روناهی‌و تارستان.
بێدەنگی‌و بزڤین،
گرنژین و فرمێسك بیرهاتنا سالێت بورین،
دویماهی‌و بەراهی، راستی‌و درەو،
ژیان بۆ بێهنەکێ تبنێ،
کارێکرنا پاشکەفتی بۆ دەمەکێ درێژ.
هوزانڤانێ راستەڤینە،
ئەوە یێ هوزانێ دبینیت د جیهانێ هەمی‌یێدا،
د هەستانا هەمی‌یادا،
بەلێ چەوا هەلبەست د هێتە نڤیسین؟
هێشتا ئەز یێ ل بەرسڤا ڤی پرسیارێ دگەرێم.

★ ★ ★

هندە جارا بۆ من دیار دبیت دێ دەست هەلگرم،
ژ نڤیسینا هەمی تشتا ژ دلداری‌یێ پێڤەتر،
دێ درینم هەلبەستێت خوێت دی‌و پارچە پارچە کەم.
و هاڤێژمە ناڤ کوچکێ گەرم دا.
ئەڤە دەمەکە رێکا من ژ بلنداهی‌یا چیا من سەرنشیف دکەت،
کی دزانیت بۆ من چەند رۆژ ماینە؟
نینە مە ژیانەك پێڤەتر، ئەگەر مە هەبا ئێکا دی،
دا ئەڤینا من ل ناڤ هەمی‌یادا بەلاڤ بیت،
بلا لوی جهی بم یێ بۆ من هاتی‌یە دانان وچ لمن بێت بلابێتن
بەسە ئەڤینا من بمینیت ئەڤینەك د هەلبەستێت من دا،
نە مایە لپێشی‌یا من دەمەك درێژ،
کو تشتێت بێ بها بنڤیسم.
ئەی چیایو بلەزینەو تێرکا خو یا دانی پرکە،
پاییز دێ چیت.. ژڤستان دێ هێت.

★ ★ ★

من گوتە شەڤا سپی بدەنگەکێ نزم،
دەمێ ئێك گرتنا روناهی‌و تاری‌یێ:
ئەرێ بێژە من بناڤێ خودێ.
بۆچی نابینین ل چیاێت مە یێت دی مینا ئەڤێ حێبەتی‌یێ؟
وەسا من گۆت و ئێکسەر من دێت سالێت بورین،
د بزڤین لپشت پەردێت تاری‌یێ،
رۆژێت پێکڤە دچوین مینا دۆ تولازا ل شەڤێت بوهارێ بێت سپی
روناهی‌یا بیرهاتنێت من یا سپی کەتبو،
سەر چیاێت بوتلێ‌و خونزایێ.
لۆتك ژ بەفرێ خەملی‌بون، باغ و چەما پێك ولاتك بەرزەکربون
هەمی تشت ل دورو رەخێت مە سپی بون و،
ئەزو تو کەتبوینە ناڤ مژو مورانێ‌دا،
ئەرێ ژ بەر کو لپێش چاڤێت من،
سپی بون شەڤێت داگستانێ.

رۆژ بۆ رۆژ ژیان کورت تر لێ دهێت و،
ڤەرکەرێ مە، بێ کو چاڤەکێ بنقینیت،
د تێرکا خو د هەلگریت شەڤ و رۆژاو،
ڤەرێت خو ئەوێت سەرمە ڤەد گێریتن.
ئەرێ م د نڤیسی، یان برەنگێ عەسمانی شاد دبوم،
ئەوێ د چیتن، ئەوێ هشکە
ژیان.. روبیارەکە، لسەر ڤی روبیارێ خورت،
هەمی پرا لپشت من د سوژیت.
ئەز هیڤی‌یا ژێ دکەم.. ئەی ڤەرکەرێ دژوار،
جارەکا دی ژیانێ هەمی‌یێ بکە دیاری‌و،
ئێکسەر نەبرە بەری دەمێ وێ،
دەمێ چاڤپێکەفتنا من یا ڤەمایی ل گەل یارێ،
بەلێ غەرەبانکا من دمینیت سەرنشیف ل چیاو،
ڤەر کەرێ من گوهـ نادەتە هیڤی‌یێت من یێن کوزری.

★ ★ ★

ئەڤە دەمەکە خەرییێ تشتەکی‌مە،
تشتەکێ دێ.. نە ئەڤە و نە یێ هەنێ،
تشتەکێ بەرزە.. تشتەکێ نەپەنی،
بو کەسێ لێ نەهاتی‌یە ببینیت ژ من پێڤەتر.
ئەڤ هەڤالینی‌یا کەڤن ئەز بێزار د کرم و،
بێ دەنگی‌یا ڤان دەما.
من دڤێت پەیڤێت دی.. موسیقایەکا دی،
پەیڤێن نە هاتی‌نە گۆتن تا ئەڤروکە.
بەلێ من زانی: کو ئەڤان تشتا هەمی‌یا ببینی،
نە پێتڤی‌یە چ لایەکی تو بەرێ خو بدەیێ.
حێبەتی هەمی ژ تە نێزیکن، نە ل جهەکی
بەسی تەیە بۆ ئەڤا هەنێ خوهێ نە رێژی.
مەگرتی تو گەهشتی‌یە نیڤەکا جیهانێ،
بەلێ تە نا بینم ل «تسادانا»ێ پێڤەتر.

★ ★ ★

خوناڤەك هەبو، ئێکـــەر بەرزەبو،
تەیر تەوال بۆ جهەکێ دویر فڕی بون،
چ تشت نەمان و سترانا «دەلێ لێ»،
ئاوازێ خو یێ بەرێ نەما بو.
یا کورتە ئاکنجییا لسەر عەردی،
نێ هەمی تشت دێتە گوهۆڕین لگەل سالا،
خوناڤێ گۆت: «گەرم دکەلی»
بەفر دباریت. . تەیرو تەوال دیاربون
سترانا «دەلێ لێ» بەرسڤا من داو گۆت:
ئاوازا من وەکی خو یا مای هێشتا نە هاتییە گوهۆڕین
ڤێجا کەربێ ژ من هەلنەگرە ئەڤرو.
کو تویێ هاتییە گوهۆڕین
هەولدە وەکی بەرێ تێلێت موسیقێ لێدە
یان گوهێ خو بدە من وەکی بەرێ من پەیمان دایە تە.

★ ★ ★

دا بگەڕێین پێکڤە لچیا یان لگەلییا،
لناڤ بەفرا ژوری یان لبن رۆژا زێری،
دا لفیلا سواربین یان ل عەرەبانکێت بەفرێ ئەوێن سەد کێشن،
یان دا ب پیا بچین، دەستێت مە دناڤ دەستێت ئێك دا.
ژ روبیارێت خورت دێ دەرباز بین،
دارستانا پێکڤە پشت خو دێ ئێخین،
یان پەرێت ئەڤینا خو دێ لەیزینین،
لگەل برێت قازێ قولنگا دویر دێ چین.
ژ نوی ئەڤینا مە دێ گەرم و جوان بیت،
بۆ چیاو گوندو باژێرێت جیهانێ‌و،
چێدبیتن نەحەزییا مرۆڤا ژ خوشەرم بکەت،
هەر وەسا دێ ژخو شەرم کەتن کەرب و کینا کوشندە.
یا هەی نێچیرڤان تێرا خو بهاڤێژیت بۆ لایەکێ دی،
ئەوێ دبینیت د چاڤێت هەردو پەز کویڤییێت ئەڤیندار.

ئەز قرارێ ددەم: بۆ من دیاردبیت هندە جارا،
هەر وەکی ئەم هەردوٚ،
ژ کەڤنە چیروکا هانەتی ڤەژاندن،
ئەوێت هەردوٚ قەهرەمانێت وان دکەڤنە بن دلوڤانییا ئەڤینێ
ئەڤین تورا خو ڤەددەتن،
دا عاشقی بئاگرێ بسوژیتن،
«تەیرێ تەمێ» یێ ئەڤیندار گەلەك نا ژیتن،
بەلێ قەلەرەشێ پیس سێ چەرخا دژیتن.
نە هاتییە نڤیسین «تەیرێ تەمێ» پیر بیتن،
بەلێ ژییێ وی یێ کورت ژییەکێ پڕ ئەڤینەو،
ئەو دسترانا خویا دویماهیکێ‌دا،
شادترە ژ قەلەرەشێ ژی درێژ،
چنکی ئەو د ژییێ خو یێ درێژدا،
شاد نا ییت ئەگەر دناڤ تشتێت گەنیدا نەبیت.

★ ★ ★

ئەی ڤەلەك، بوچی سەرێت مە دبری،
بێ کو تو بریارێت درێژ بدەی،
ژ مەد ستینی ژیانێ بخوشی،
گونەهبارین یان بێ گونەهبین.
بەلێ یا سایەك کەڤن یا هەی،
د بێژیت: ئەوێ سەرا دبریت بەری کو بڤری هەلگریت،
پرسیارا وان مرۆڤا بکەت ئەوێت ژێر سێدارێ،
کا هیڤییا وان یا دویماهیکێ چییە؟
چ تشت هەیە ئەز بو وی تێهنی تر ژ هەمییا؟
ژیانا خو ئەزێ ژیایم، من چ دڤێتن پشتی وێ؟
ئەڤین بمینیت ئومێدا من:
نێ ئەوە هیڤییا من یا ئێکێ‌و دویماهیکێ
ژیا بلا بخەملینیت بەهرا من دگاڤا د،ویماهیکێ‌دا،
نێ من یێ کریو یێ گوتی لدویڤ هێزو شیانێت خو.

★ ★ ★

من یێ گولێ بوی «ابن سینا»ی،
بهوزانا نەساخێت خو دەرمان دکرن،
هەر وەسا من یێ گولێ بوی «اورفیوس»ی،
نەساخێت خو ب ئاوازێت موسیقێ دەرمان دکرن.
نێ ئەز نە نوژدارم.. نەفالێ ڤەگرم،
د گەل هندێ ئەز دشێم شیرەتەکێ بۆ خەلکی پێشکێش بکەم.
ڤیانێ دناڤبەرا خودا بەلاڤ بکەن چەندی هوین دشێن،
نێ ڤیان دەرمانێ مەیە لئاستەنگا.
هەر چەندە ئەم نە د سەربەستین د هەمی تشتادا،
نە هەمی عاشق د پشت گەرمن،
بەلێ هەکو ئەڤینی کری بهێزەکا خورت،
د ڤیا بهێزتر لیبێت د ژیانا خودا.
دیارە: ئەز دێ ژیم،
چەندی من تو بڤێیو ئەڤینداری تەبم.

★ ★ ★

د هۆلێت میوزەمادا ل «لوفرو فرسای»،
دەمێ ئەز تێدا دگەرام چەند روژەکا.
مەندەهوش دبوم بڤان کچێت جوان،
ئەوێن هەمی وەکی ئێك بجوانییا خو.
من هزر دکر: چ هوشە ئەڤە،
چ پیڤانەکە ئەڤە،
یێ کو شیای بەژن و بالاً تە دیار بکەت،
بەری ژ دایك بوینا تە ڤان هەمی سالا.
دویر ژ توخیێت مە،
بۆ من هەلکەفت گەلەك کچێن جوان ببینم
بەلێ دناڤ هەمییادا جوانییا تە پتنێ ئەز دکێشام.
هندە جارا من نەدزانی،
چاوا کچێن جیهانێ شیان،
خەملا تە بۆ خو ببەن..؟

★ ★ ★

روناهییێ خو کومکربو دورو رەخێت شەماڵکا من،
هەمی نڤستینە بەس ئەز یێ هوشیارم،
من خو شوو کرە هنداڤ رویێ تەیێ گولگولی،
دا بێژمە تە بدەنگەکێ نزم «من تو دڤێی»،
روژ دبورن بشرینی یان بتەحلینی،
من هایژێ هەیە، کو ئەز بەریف کاڵیاتییێ دچم،
پێتڤییە لسەر من پەیڤێن خو دوبارەکەم و بێژمەڤە،
«من تو دڤێی» یێ راوەستیان.
ئەگەر هندە جارا درەو من لگەل تە کر،
هیڤی دکەم ژ بۆ تشتەکی بتنێ:
ئەوە کو دا نە بێژی ئەز یێ هیڤیمە ژ خو،
درەوا لگەل تە بکەم د گوتنا خودا «من تو دڤێی».
هەلبەستا من یا براستی، هەلبەستا من یا بتنێ،
ئەوە «من تو دڤێی»:

★ ★ ★

دەمێ ئەم حوکمی لخو دکەین،
بەرامبەری کارێت مە کرین بۆ ئێشاندنا خوشتڤییێت خو،
چێدبیت ئەم ژ خو دیرکەین،
حوکمێ بەندیخانێ.
هەر ئێك ژمە یاسایەك یا هەی دسینگێ خودا،
ئەز نە وێرم لهیڤییا لێ بورینەکێ ببم.
حوکمێ خو لمن بکە شرینا من،
چەوا شاهیدو یاسایێت تە دڤێتن.
حوکمێ خو لمن بکە بدلوڤانییا ئەڤینێ،
ئاشکەراکە هەمی کارێت گونەهباری،
دا دیار بکەی گونەها وی.
گازی بکە ئەلندا بوریو روژا ئاڤا بوی،
ب چی تشتەکێ مە تاما خوشییێ ژێ دیتی روژەکێو
چی تشتێ ساخ مای د هناڤێت مەدا تا ئەڤروکە.

★ ★ ★

ئەی هەڤالا گیانێ من: دلوڤانی‌یێ بمن ببەو بێژە من،
دەمێ بۆ من چێدبیت ئەز ژ ئەردەکێ دویر دبم،
ئێکسەر ئاسویێ پەر عەور دپەقیت و بابەلیسک ڤەددەن
بوچی دەمێ بۆ من دیار دبی هەمی تشت بێ دەنگە دبیت
هەر وەسا بۆ من چێدبیت ئەز د زڤرمە شینواراو،
برێڤە دچم مینا مێهڤانەکی ل رۆژەکا تاری،
کە دیار دبی.. هەمی تشت د هێتە گوهۆرین،
روژا مە د هەلێت و تەیرو تەوال دسترن،
دێ چم بۆ دەریایێ.. ئاڤ خورت دبیت ژ کەربا،
پێل خو لێك ددەن، کینا وان بۆ من ئاشکەرایە،
بەلێ تو هاتی، دەریایێ گۆت: ئەزم گونەهبار،
بمەلویلی کەتە بەر هەردوو پێت تە.
راستی لپێش چاڤێت من دیار دبیت:
جیهان شورشا خو هەلدکەت دەمێ ئەم ژێك ڤەدبوین.

★ ★ ★

نا نڤم ئەڤ شەڤە بتەناهی،
من دیت د خەوێدا ئەز شین پێت تەدا دچووم،
لسەر لێڤێت کەڤرا من خو دهاڤێت،
لەردەك دویرو بیانی بۆ مە هەردوکا.
من تو دیتی ئێکسەر رزگار دبوی ژ کەڤران،
کەتی‌یە بەر سینگێ دەریا کویرو مەزن،
لدویڤ تە هاتم، بەلێ پێلێن گران،
هاتنە د رێکا من دا مینا دیوارەکی لپێشی‌یا من راوەستیان.
جارەکادی من خو دیت لسەر چیا، لبلنداهی‌یا،
کومێت بەفرێ بدەنگە ڤەدان د هاتنە خارێ.
ئێکسەر عەردی تورەیا خو کرە دلوڤانی:
عەسمان گەش بوو بشکوژ ڤەبون.
ئەز هوشیار بوم دڤێ دەلیڤێ‌داو، دهاتی نك من،
یان دیتنا بەرێ بو د خەوێ‌دا.

★ ★ ★

تە دیت چاوا وان دار دبرین؟
نێ من گەلەك قورمێت برین دژیانا خودا و،
ن دکرنە سوتەمەنێ،
من دیت ئاڤ ژێ دباری مینا فرمێسکا.
تولاز بوم، چاڤ دێرێ شولێ خو بوم،
گەلەك جارا قورم من دبرین بدرێژاهی‌یا رۆژێ.
من دبرین بسەرکەفتن لسەر وان،
حوکم من دکر لسەر کوما دارا بێتە سوتن.
سال دبورن! ومینا برینا قورما بمشاری،
ژی‌یێت مە کورت دکرن بێ دلوڤانی،
سالێت مە ژی دهاتنە سوتن مینا کوما دارا،
گری‌یێ ئاگەهـ ژ روندکێت وان دارا نە دبو.
ئەرێ باشە ئەڤین دترسیت بێتە سوتن؟
ددانێت مشاری ئەرێ وێ د ترسینیت؟

★ ★ ★

دۆ تیرکا دهەلگرم لسەر ملێت خو،
ئەرێ سەحکێ چەند گرانن.
نێ بارێ وان پشتا من هەرشاندو،
سینگێ من و ئەو دلێت سینگێ من دا.
تیرکێ من یێ ئێکێ ئەوێ مەزن،
پرە ژ ئەڤینا راست و دلسوژ،
بەلاڤ دکەم بێ پەشێمانی بەر پێت تە،
ئەڤێ کلوسکی یێ نەهێتە هەژمارتن.
بەلێ تیرکێ من یێ دوویێ ئەوژی پرە،
ژ کەرب و کینێو دوژمنایەتی‌یێ،
هندە جارا ڤالا دکەم و،
بناگرێ وی خو بخو دلسوژم،
هندە گاڤا یێن کێم.
دەمێ گونەهبار دبم، لپێشی‌یا تە ئەی هەڤالا گیانێ من.

★ ★ ★

ئەڤەیە رۆژا دایك بوینا تە،
جارەکادی هزرو بیرێت من شێلی دبن،
ئەرێ باشە چاوا عەرد شیایە پەیدابیت،
بەری هاتنا تە بۆ جیهانێ؟
چ جوانی بۆ «پوشکین» حەلاندی،
دا هوزانێت خو بنڤیسیت، لسەر گاڤا حێبەتییێ ب چ ناڤەك
لەز و بەز، شامل شیرێ خو هەلکێشال، چو مەیدانا شەری..
شەرێ بخوین؟
واز نا هینم ئەز ژ راستی یا خو، ئەو راستییا دبێژیت:
جیهان هەمی بێ گونەه هبو رۆژا خودێ مروڤ داین و، ئەڤ
عەردە یێ ڤالابو بەری تو بێی.
ڤێجا دیروك بۆ من دەست پێ دکەت،
ژ وێ گاڤا تو ژدایکێ بوی،
نە ژ رۆژا وینا «مەسیحێ» پیروز.

★ ★ ★

کلوسکەك هاتییە خارێ بۆ مە ژ ئەسمانا،
کلوسکەك گرتییە لسەر کلوسکێت ڤیانێ،
وەرگرە ب دل نازکییا خو، نێ چ جارا هشك نابیت،
خودێ بخو بۆ مە هنارتییە سەر عەردی.
جوانییا ڤی کلوسکێ ڤەشەنگە،
ئەوە کو مینا ئاڤێیە د بیرادا،
هندی ژێ ڤەخون و ڤەخون،
دێ مینیت پرو مشەتر.
دلێ من بهەمێ چلیساڤە دمینیت،
ئەڤ مروڤە بوچی رەبەن ترن ژ هەمی رەبەنا،
نێ کلوسکی نا بینن، لێش چاڤێت وان ڤەشارتییە،
یان نزانن نیشانێت وی یێن جوان چنە.
ئەز مینا نوژدارەکێ ئەفسانیمە،
هەمی تشتا دێ کەمە دیاری بۆ تەو کلوسکێ من دێ مینیت پر.

★ ★ ★

د بیرهاتنێت من دا لسەر بوهارێ و،
هزرێت پاییزکیڤە،
دکارو شولێت ئەڤرو
رویێ تە هەمی رویا ڤەدشێریت.
نە دبایە ئەز ڤی تشتی بێژم،
بەلێ دەمێ تە سەرێ خو دانایە سەر سینگێ من،
وێ گاڤێ من زانی کو ئەز نەشێم نە بێژم:
رویێ تە هەمی رویا ڤە دشێریت.
بۆ مە هاتییە دانان ببینین گەلەك،
ژ خوشییا یان ژکول و ژانا دژیانێ دا،
بەلێ پرچا تەیا ژرەنگێ زیڤی،
دتەیستین لێش چاڤێت من نە وەك تەیسینا هەمی رۆژا.
ئێکە بۆ مە پێکڤە بین یان ژ ئێك دویر بین،
رویێ تە هەمی رویا ڤەد شێریتن.

★ ★ ★

گەمییا مە کەتە ئاڤێ ژ توخیبێت دویر،
مەد هەلگریت راست و چەپ لسەر پێلا.
مینا برینا ئەلماسی بۆ شویشا،
دبریتن «ئوقیانوسێ بێدەنگە»یێ مەزن.
لسەر رەخێت وی نێ رۆژا روهنە،
ئاڤ یاربکێت خو دکەت و،
پێل ژی یارییا دکەتن مینا زاروکا.
یان دلەیزیت مینا مێهڤانا
لسەر رەخێ دی، لبەر سیبەرێ،
ووشێنا پێلایەو ئێك دنالی،
چێدبیتن ئەو،
لهیڤییا برایێت خو بیت لرەخێ دی.
هەرو لگەل گەمییا چوییدا،
جیهانا من دا بەش دبیتە هەتاڤ و سیبەرا.

★ ★ ★

بەلاڤ دکەن دەنگە و باسێت عەسمانی،
لجهەکی لەسمانی دەنگێ بومبا ڤەددەتن،
مرۆڤەك بێ تێچویو روندکێت مرۆڤەکێ دی دبارن،
ڤێجا ترس کەتە د دلێ من دا من بکە دسینگێ خودا.
گوهبدە من، هەڤالا گیانێ من و بەرێ خو بدێ:
جارەکا دی پاپورێت ئەسمانی رێکا هەیڤێ دگرن،
لجهەکێ دی یێ دپەقینن ئەتوما سەرێ ژنوی.
ڤێجا ئەز دترسم من بکە دسینگێ خودا.
چ هەبیتن لهیڤێیا مە.
دا وەرگرین دوکارتا:
بۆ هەیڤێ یان بۆ دویماهیکا جیهانێ،
بەلێ خو نێزیك بکە ژ من.
ئەڤ جهە گەلەك سارەو نەمازە جلێت تە نەنکن.
ڤێجا ئەز دترسم من بکە د سینگێ خودا.

★ ★ ★

دا بجەنگم لگەل وی جەنگەکا گەرم،
کانێ زورداری تە یێ کەڤن یان یێ نوی؟
بەلێ ژ بەلایا ئەوە ئەز،
بەرەڤانێ تەبم و زورداری تەیێ ئێکێ بم.
ئەڤە چەند سالن د هناڤێت من دا دژین دو مروڤ،
شەرمێ دکەن ژ جیرانیا ئێك و دو،
بەلێ داتە بپارێزم ژ هەمی بەلایا
پێتڤیە بجەنگم لگەل خو تا مرنێ.
بلەزینە وێ شالی سەر ملێت خو بهاڤێژە،
مینا دەیکێت مە وەکی پیر دبن
بهاڤێژە دنیڤا مەداو نەپەیڤە،
تا لێك و دو بیورین، پشتی دوژمنایەتییێ
یان بدەستێت خو
بکوژە ئێکێ ژ مە هەردوکا.

★ ★ ★

هەمی دکەن چاکی‌و خرایێیا،
بەلێ ئەز ئێخسیرێ هزرەکا دیمە:
دەنگێ تە من گوهـ لێ ببیتن، یان ببینم جوانیءیا تە
چ تشتا بهایێ خو نینە ژوان پێڤەتر.
قەشەنگە ئەلندو جوانن ئەستێرو
تیشکا رۆژا زێرین لەسماناو،
هەمی تشتێن روناهیێیا خو لتە دکەن،
بهایێ خو نینە تشتەکی ژوان پێڤەتر.
تو گەش دکەی بجوانیێیا خو،
گوندێ مەو باژێرێت تە بڤێن و
چیایێن بترس ب بلنداهیێیا خوو،
هەر گولەك و هەر بەرەکێ بچویك.
پیروزە لبا من هەر تشتەکێ دەستێ خو بکەیێ:
چ تشتا بهایێ خو نینە ژوان پێڤەتر.

★ ★ ★

ستێرا دێ هەلکەم بورازی بوینا تە،
دێ کوژم بایێن سارو بابەلیسکێن بەفرێ،
کوچکی دێ گەرم کەم و دێ بێژمە تە: بخێر هاتی،
دا دویر بکەم ژ تە وێ سەرمایێ.
پێکڤە روینین، ژ ئێك و دو نێزیك بین،
دویر بین ژ هەمی تشتێت کرێت و،
لسەر ملێت خو،
دێ هەلگرم ئاگرێ ژان و ڤیڤانێن تە بخوشی.
شرینا من روناهیێ دێ ڤەشێرم دا تێکنەچی،
دێ راوەستم لهنداڤ تەختێ تە ببێ دەنگی‌و،
دێ بمە حەیرانوکەك بهێتە گوتن بۆ نڤستنا تەو،
نڤشتی یەك تە بپارێزیت ژ هەمی سەختا،
ژ نوی دێ باوەرکەی: کو تشتەك ژ ڤیغان و ژانا،
نینە لسەر عەردێ بزڤروك.

★ ★ ★

من دڤێت گازی بکەم وەلاتەکێ بئەڤینی،
دا بژین هەمی بشادیو ئاشتیو.
سوودا وان بڤان پەیڤا دەست پێ بکەت.
«ئەڤین لێشێ پەیدابو لسەر عەردی».
دا خەلك ژ پێرڤە بڤێ سرودا جوان بسترن،
دەنگێ سترانێ بلند ببیت بۆ ئەسمانا
داپێك بکەڤن دەستێت دۆ ئاشتیخازا،
لسەر درویشما «ئەڤەیە وەلاتێ ڤینێ».
لسەر ئالاّ وەلات بۆ خو چێدکەت،
من دڤێت کوم ببن هەمی رەنگێت لسەر عەردیو،
خوشیو شادی تێدا ببیتن،
ژێك ڤەبوین و پێك کەفتن.. هێزو لاوازی.
من دڤێت هەمی خەلکێ جیهانێ پرسیارا،
جهەکی بۆ خو بکەت لوەلاتێ ڤینێ.

★ ★ ★

دەستێ تەیێ نەرم دگەریێت لسەر سەرێ هەرسێ کچێت مە،
دێ ڤەهینی شەش کەزێن درێژ،
دێ خوبینی دخودیکا خودا ژنوی ژانێت تە دێ کەلن و،
روێت خو دێ بینی پێتیڕنە.
چ دەست سپیتر نینن ژ دەستێت کچێت مە،
دەستێ خو بکەرێ بپانیکا دەستێت خو
دێ بینی، ئێکسەر بنالینی،
پانیکا دەستێت تە بێت رەق بین.
چ چاڤ نینن زەلال تر ژ چاڤێت کچێت مە،
ئەون زڤستانا گەرمێ بۆ مە دێ هنێرن دەمێ کالێ دبین
پێنەڤێت ئەڤرو تو خو سەر نوخین بکەی،
ژ بەر کو چاڤێت تە بێت پێتی بین هندەکێ.
هەمی تشت دناڤ مەدا جوان بون،
بۆ رێکەك بۆ کچێت مەو دێ هەر مینیت.

★ ★ ★

د ژیانێ دا دێتە گوهورێن رەنگەك بۆ رەنگەکێ دێ هندە جارا،
نێ من زانی ئەڤە گەلەك جارا:
چەم لهیڤیێا روژێ بو.. باران دبارین،
چەم تێهنێ بون.. گەرم دکەلی
مێهڤان دێن بەری ژڤانا،
رازی بون و تورەبون، بێ کەس لهیڤیێا وان بیتە
ئەز لهیڤیێا تە بوم و نە دشیام،
دەمێ ویە مێهڤانێ ژینا من ئەوێ روژێ.
بلەزو بەز هەمی تشت هاتنە گوهورێن
من دەست بسترانا کرو ئەز ژیام بشێوازەکا دێ،
من باوەر نە دکر بەری بیست سالا،
ئەڤ رویدانە دێ بن دژیانێدا.
هندە جارا ڤەدەرێ ترانە بمە دکرن ترانەك کرێت،
چاوا ئەز سەڤراز بوم؟ نێ بۆ من لێ هات.

★ ★ ★

رویبارەك من دیت دەمێ دەرکەفتناوی ژ گەلی،
ئاڤا وی ئێکسەر بۆ دۆ جوکا دچو،
تەیرو تەوال بۆ من دیاربون بێ ئەگەر،
ئێکسەر ژێك ڤەدبون لبلنداهیێا ئەسمانی.
من هەڤال و هەڤالەك هەبون،
دا بێژی بۆ ئێك و دۆ بێت بوین،
نێ ژێك ڤەبون مینا رویباری، ئێکسەر بەرێ،
وان کەتە دۆ رێکا، مینا تەیرو تەوالا ئەوێن ژێك ڤەبوین.
دەمێ من هەڤالێ خو دیتیو پرسیار ژێ کری، تە چەیە؟
بەرسڤا من داو گوت: «هەچەکو ئەز بساخی
ژ جەنگێ دەرکەتی مە»!.
ئەز کەتم سەر گێژی یەکێ ژ ئەڤامەنێ:
ئەگەر ئەڤین دنیڤا خەلکیدا شەر با،
دا بێژین شەرەکێ بێ ڤەگەریانە.

★ ★ ★

کارێ خو من کر دا بچم باژێرەکێ دویر،
من دڤیا کارتا شەمەندەفرێ بکرم،
دا بزانی، ژیان ئەگەر بهەشت نەبیت لگەل من،
نێ بێی من دێیا بژان و خەمگین بیت.
کارێ خو من کر بلەزو بەز دا بچم،
دا بەرزە بم لپێش چاڤێت تە لئەردەکێ دویر
دا بچی، بچاڤێت تژی روندکێت سویر،
لڤی جیهانێ لمن بگەرییێ.
بو رەڤینێ بو جهەکێ دویر کارێ خو من کر،
دا بزانی چەند بژانە ژێك ڤەبوینا مە،
بەلێ ئێکسەر من خو دیت د دەلیڤەکێدا
ئەز یێ لمالا خو تو یا چویە جهەکێ دی،
زویکا من هەمی تشت ژ بیرکرن لجیهانێ،
من کرە غار مینا گونتەهبارەکی لتە بگەرییێت.

★ ★ ★

ئەڤە بیست سالن و ئەز ئێخسیرێ تەمە،
بو من دیار دبیت هەر وەکی تە دەستێت من گرێ داین،
هندە چارا هەڤالەك دێت، یان جیرانەك
دا من رزگار بکەت ژ بن دەستێت تە.
بەلێ د سەربەستییا خودا هەست بلاوازیو ڤیغانا دکەم،
هەمی تشت پیچن دورو رەخێت من و هەمی روی د مەلویلن.
مینا کولەیەکی رزگار بوی ژ کولەتییێ بەری دەمەکی،
نەشێم بژیم دویر ژ پاپورا خو.
ئەڤەیە حالێ سەیێ هار، هەفسارێ وی هاتییە بەردان،
تا بینیت ئەو خوشییێ چەندەکێ پێڤەتر.
زوی بزوی دێ کەتە غار دورو رەخێت دیواراو،
دێ زڤریتەڤە هەفسارێ خوییێ هەر جار.
هەر وەسا ئەژی بەرامبەری ڤێ سەربەستییێ،
رازیمە ئێخسیرییا بەردەوام.

★ ★ ★

ل شەڤێ، باران پەنجەرا دقوتن،
دلوپێت خو لسەر شویشا دهێلن،
بوچی دقوتن و ناهێلن مروڤ بو خو بنڤیت،
چەندی شرینا من ژ من دویر بیت.
بەلێ زڤروك هند نامینیت دێ چیت،
ئێکسەر باران دێ راوەستیت،
نێ زانی بێ بهایە خو بیارینیت،
سێ روندکا لسەر شویشێت پەنجەرا بهێلیت.
دلوپەکا بارانێ نەمابو، بێ دەنگی بەلاڤ دبیت،
دویر من چاڤێت خو ڤەکرن، نێ تارییێ خو کومکربو،
هاتە بیرا من، روژەکێ من ژی،
روندك باراندبون،
بو من چیبو پەنجەرا تە من دقوتا،
بەلێ نە ڤەدبو.

★ ★ ★

زێرو مەجیدی د تەیسین،
لئەسمانێ ژێری تا ئەلندێ بەلاڤ دبون،
سەرانسەری چیا ئەلند پەیدابو،
دا بکولیت و بڤەشێریت لجهەکی.
ئەلند دەرکەت ژ تارییا،
تەیرو تەوال گێلە شوکێ دکەن دەمێ روژ دهەلێت.
روژ دێ ئێت و
ئەم نزانین کا چ بو مە ڤەشارتییە.
من نینە دەم دا داخازا چاکییێ بو خو بکەم،
نە شێم چ بکەم ژ چاڤادێرییا تە پێڤەتر،
هیڤی دکەم قەدەر نەبیتە ئەگەرا.
ئێشاندنا تە.
ئەگەر کومێت تارییێ دورو رەخێت مە مشەبون،
نێ ئەزو تو دێ هەر پێکڤە مینین.

★ ★ ★

ڕێکا ژیانێ دێ کورت بیت یان درێژ بیت،
بەلێ لگەل هندێ ئەو بێ دویماهی نابیت،
شەڤ و ڕوژ ئاموژگاری‌یەکێ ددەن خەلکی،
بەلێ لسەر مەژی ئەوە بکەینە بەرهەم ل ژیانێ.
هندە تشتا ئەم دشێین بزڤرینین بێ ئاخینك و،
هندەکێت دی ژ مە ڤەنابن ئەگەر خوینێ نە ڕێژین،
پەردە هندە جارا د کەڤیت.
دەمێ بلند دبیت لسەر دەپێ شانویێ.
دبینم تولازا پاشڤە ماینە ژ مە،
سەرانسەری چیاو هەرێین دویر
ئەڤەیە کالیاتی‌یا هەڤرك،
ئامادەیە بو هەلگرتنا بارێ ژیانێ.
شرینامن وی دەمی نەشێم چ بکەم ژ تشتەکی پێڤەتر:
دویر کەم ژ تە سزایێ بروژێت ژیانا خو

★ ★ ★

نێ تو هوشمەندا هو شڤانای
تو دنیڤا کچێن جوان دا.. فریشتا جوانی‌یێ.
ڤەبرین ئەوێن ژ من بهێزتر،
نێ ئەگەر تو نەبایە ژمیژەوەرە دا ئەز تێچم.
«محمود» نە دکەت بەری چەند سالا،
ئەگەر «مریم»ێ پەیڤا خو پاراستبا،
دەزگراوی ئەگەر دلسوژبا
ئەوان «داریلاف» بژەهرێ ئاڤ نە ددا.
ئەز دزانم.. کەس نینە ژنکێ پێڤەتر،
مە بکوژیت یان مەرزگار بکەت ژ ئاستەنگێت فەلەکێ،
تو بتنێ بوی شرینامن تە رزگارکرم گەلەك جارا،
دەمێ دکەتمە داڤ و ئاستەنگا.
دلسوژ بوی بو من.. بەلێ ئەزێ نە دلسوژ بوم،
هەوارا من دلسوژی‌یا تە بو.

★ ★ ★

کەزی‌و بسکا شەدکەی بخەمگینی
تێرا دبینی هندەك می‌یێن سپی،
بوچی ڤەدشێری؟ بوچی دا دقوتی،
تورا پاییزێ ژ تاکێت کەسك؟
قەد نابیت پاییز هەر دێ ئێتن،
بێ بهایە ئەم هەول بدەین بو نەهاتنا وێ،
بلا بەلگێت دارا بوەرێن، بلا بەفر بباریت..
نێ پاییز گەلەك جوان و قەشەنگە.
ئەز نەشێم بزڤرم ژێ بێ تولازیێ،
بلا بێتن کالیاتی دا خەلکی رزگار بکەت ژ گومانا،
بلا بابەلیسکێت بەفرێ خو لێك بدەن ژ کەربێ،
نێ سینگێت مە هێشتا د گەرمن.
سال و مەهـ قەشەنگی‌یا مە مشەدکەن و،
ئەز، ئەڤە دەمەکە تە نابینم بڤێ جوانی‌یێ.

★ ★ ★

نە مایە لێنشی‌یا مە سێکا ڕێکێ پێڤەتر،
دەمەك درێژ پێکڤە ئەم ژیاین و،
ها ئەز هیڤی دکەم ژیانا من ب دویماهی بێت و بچیت
بەری تو من بهێلی.
روهن بکە گاڤا من یا دویماهیکێ
هیڤی دارم لمن ببوری‌و،
من ژ بیر بکەی پشتی لمن دبوری
نێ چ نا هێلم ل پاش خو.. چ میراتا
لگەل گوتنێت وان کو ئەز دەولەمەندم
بەلێ براستی نە دەولەمەندەکی مەزنم
پاداشت و دیاری بێت من، چ بو تە ژوان دهێن؟
دێ هێلم ل باتە کچاو
هەلبەستێت خوێن دبێژن من نە نڤیسی نە
بەلێ وەرگێری بێت نڤیسین.

★ ★ ★

سحمه تەك كەڤن مە يا هەی ل چیا

سی کچ دگەهیتە میری خوو خاترا خو ژمالا خو دخازیت

زمسەناتییا وێ بەردەوام ببیت

رەکی ددەنە دەستی ژ «قارەێ دا ئاگری هەلبکەت

کوچك گەرم د بن لژێر بانێ من،

رێ تە د سوژیت،

ی ئەو شرین و جوانترە،

همی سامانێت تە لگەل خو ئینایین

کوچك هەلدبیت و گەرم دبیت،

د تەبیستین دناڤ پرچا مەدا. . ئەو مە یێن سپی‌و،

د بیت رێکا مە نە یا دویر بیت،

حو ئەو روژێت شادو خەمگین،

نعمێ خاترا خو کچێن خو دخازین و

د کەینە دەستێت وان دارێت سوتنێ.

★ ★ ★

ن بوهارێ مە گولێ دبیتن، هنداڤ سەرێت مە،

دەنگێ لەیزینا بەلگێت دارا لسەر گرا،

مە هەر دوکا وی دەمی هزر نەدکر،

کو دار بری بفرێ خو یێ تویژ کری.

ئەڤ ئەڤینە مینا ڤێ دارێیە،

د گولگولێت و بەرێ خو ددەتە هەمی تشتا لجیهانێ بچاڤەکێ کێم.

ئەرێ لاوازە ئەوژی؟

مینا قورمێ دارێ لبن بفری.

چەندی ئەم بدارا خو ڤە مژوێل دبوین.

بلەرزین ژ ترسا بچوێکێ مە یێ ساڤا،

ئەرێ باشە بهێلین بمریت،

بدەستێت خو دان کەرب و کین و درەوینا؟

ئەرێ باشە بگومان و زورا خو،

دێ هێلین ببیتە کومەکا سوتەمەنیێ؟

بو من دیارە ئەز تاژیم روژەکێ بتنێ

بەری خودێ تە بدەتن و بهێیە سەر ڤێ جیهانێ

ئەو کیە دا ببیتە ئەگەرا ژارییا من،

ئەو کیە دا ببیتە ئەگەرا ڤەژینا خوشییا من؟

بو کێ دا فرم ژ جهێت دویر؟

بو کێدا هزرو بیرێت خەمگین و پوسیدە کەم و،

مالکت خودا بو کیژ ژنکێ پێشکێشکەم؟

ئەو هوزانێن بو تە من کرینە دیاری.

باشە ئەگەر چاڤێت تە من نە دیتبانە،

تەیرو تەوال دا سترانا بێژن؟

باغ و چەم دا شوین بن؟

یان ستێر دا گەش بن د ئەسمانێ خودا؟

ئەگەر خودێ تو نە دابای، تیشکا روژێ دا ڤەمرییێت؟

ئەرێ داشێم بژیم بشادی وەکی نوکە؟

★ ★ ★

جارەکێ ستران بێژ «داریلاڤ»ی،

خانمەك خاستبو ژ گوندەکێ بیانی،

بەلێ دەیك و بابێت وێدا بو مروڤەکێ دیو،

پێ ل ئەڤینا وی دانا بو.

لگوڤەندا بشادی

ژەهر کر بو دناڤ جاما وی داو دانا بو بەر.

لگەل زانینا هوزانڤانی بڤێلا وان،

نێ ڤەخار هەتا مەست و سەرخوش بوی مینا زوزانییا.

ها وەسا بون سالوقەتێن وی، وەکی سەخلەتا ڤیایو،

وەکی مەزن فەرمانێ ددەن بجهـ ئینانا وان،

دبێژن کەتییە بەر دەرازوینکێو،

رانا بیت ئەو چ جارا.

دیارە بو من ئەزێ ڤەدخوم ژ چەرخەکی.

لگەل زانینا من کو ژەهر کرییە.

★ ★ ★

بابێ من هوزانڤانەکێ چیایی بوو،
سەرانسەری ژیێ ویێ درێژ هوزانێن خو نڤیسی بون،
لسەر خەلکی، لسەر جیرانا، لسەر چیاییێن خونزایێ هەمییا
لسەر گوندەهـ و شولێن وان یێن بەرکەفتی.
کالەمێر هاتن دەف جارەکێ،
گوتن: «تێ نا گەهین ئەم چاوا هاتییە رویدان،
دناڤ مالکێت هوزانێت تەدا مالکەك نەهاتییە نڤیسین
لسەر وێ مروڤێ ئەوا ژ هەمییا شرین ونازك تر؟
بەلێ بابێ من گوت:
چێ بکەت مەدحێ ژنا... ئەو بێ روییە،
چێ خەبەرا بێژیت ژنا... ئەوی پیچە.
بەلێ من بدرێژاهییا ژییێ خو هەلبەست نڤیسینە،
لسەر خێزانا خو، بەلێ دویماهیکێ بۆ من دیاربو،
کو بابێ من لسەر راستییێ بو.
★ ★ ★
چێ دبو ئەڤین ئاموژگایەك با،
هەمی کەس نە دشیان لێ بخوینن،
لوێرێ خوشیو فیغان، بدرێژاهییا شەڤاو روژا،
شاگرد فێر دکرن.
من ژی پەرتوکێن بها خاندنە،
براستی من خو دیت،
ئەم نە دعەژنە، فێری هەمی تشتا ببین،
ژ زانین و فێربوینا بیانییا کێم.
ئەز فێربوم، بەلێ زانینا من خارو خێچ بو،
هێشتا من کێماسی دکرن،
گەلەك کارێن چەپەل من کرینە،
وانێت خو من نە دخانن و، رێکا داخازیێت خو من نەدگرت،
کێم [illegible] دکەفتم لگەل کو ئەز براستی،
شاگردەك بەردەوام بوم د ئاموژگاییێدا.
★ ★ ★

رویدانەك دویر ژ هوشێ من کەتە بەر چاڤێت من،
لسەر گورێ «محمود»ێ راوەستیابوم،
من دیت ستران بێژێ ڤینێ دەرکەت و رابو ژ گورێ وی.
من گوتەوی: من فێرکە چاوا دێ شێم،
خەمێت خو د مالکێت هوزانێت راست و دروست دا نڤیسم؟
سەیدایێ من: هیڤی من هەیە ژ تە،
کلیلێن ئەوی کلوسکی بدەیە من دەمەکی،
چنکی هەمی زانین و پیشێت تێگەهشتنێ،
دناڤ کلوسکی دانە.
گوهـ دا من ستران بێژێ ڤینێ،
بەرسڤا من داو گوت:
ئەو کلوسکێ ڤەشارتی؟!!
ڤەبوینا وی نینە ئەگەر تە کلیلا خویا تایبەتی نە بیت.
بگەرێ دێ بینی کلیلێ لدویماهییێو سترانا تە بێ‌بها نابیت
★ ★ ★
هاتن و چونا سەربازاو چەکا نە نیشانا شەرییە هەمی دەما،
زریپوش دبورن لسەر ئەردێت لەرزی،
هەر وەسا تە گوول پەڤینا ئاگرا نینە،
بەلێ دەنگە ڤەدانا بریسییا دیار دکەت،
هەر وەکی پەڤینا ئاگرا راستە.
هندەك ژ مە دبینن،
کوڤیان یارییەکە دویماهییا وێ نە کول و کوڤانن،
تو دشێی ب بریسییا پەیڤێ بتنێ کەلا دلی دەستە سەرکەی
ئەڤیندارم ئەز لەوما لدویڤ ئاگرا دچم و،
دزانم تاما رەڤینێ،
ئەز نە دگێلە شوکێت سەربازیدامە، ئەزێ دجەنگێدا،
نە ئانەهدانەو، نە دەرکەفتنە دشەریدا،
سەربازم ئەز من پاداشتا خویا هەی،
مینا هەمی سەربازا، بەلێ کێم تر ژ بارا بریندارێ.
★ ★ ★

وەلات پاداشت و دیاری‌یا ددەت کورو کچێت خو،
حەرامبەری کارو نیشانێت وان.
ی ناڤێت پیروز زورن.
جێ دبیت نەبینین جهی بو ڤان ناڤا دروژنامادا.
من دڤێت خەلکێ وەلاتێ من قەدرێ خو هەبیتن.
بەرامبەری ڤیان و دلسوزی یاوان
نیشانێت سەرکەفتنێ،
بنەیسن لسەر سینگێت ئەڤینداریت وەلاتی:
بەلێ تو نابینی، مخابن چ نیشانا د ئەڤینێ داو
زانیارێت یاسا درازی‌نە بڤی تشتی.
بەلێ چێدبا من نیشانا دلسوزی‌ێ وەرگرتبا.
نوژی دا بنیشانا سەرکەفتنێ ئێ‌یە نەخشاندن.
بەلێ ئەڤینێ چ پێویستی ب دیاری‌و پاداشتا هەیە؟!
نێ ڤیان.. پاداشتە.. جوانترین دیاری‌یە.

★ ★ ★

دەمێ بویکێ دبەن بو زاڤایی،
دا رازی بکەن سەخلەتەك کەڤن،
لیێشی‌یا وێ بەرا تێ وەردکەن.
لدویڤدا کەفچکەکێ هنگڤینی پێشکێش دەکەن بو مێهڤانی‌یا وێ.
هاوسا هاوولاتی‌یێت وەلاتێ من یێ هەولێ ددەن،
بو بیرکرنا بویك و زاڤا،
بنە خوشی‌یێت ژیانێ لسەر کەلەخێت مە،
بەلێ لیهڤی‌یا ژیانێ‌نە بکەیف و شادی.
هەتا ئەڤرو ئەڤ سەخلەتە یا بەلاڤە،
د ئینمە بیرا خو سالێ لدویف سالێ،
هزر دکەم ئەی خێزانامن، ژیان،
چلیسی‌یێ لگەل مە ناکەت ب بەرو هنگڤینێ خو،
وەسا هنگڤین شرین دبیت هندە جاراو،
هەرچەندە ژیان بەرا دمە وەردکەت، بەلێ شرین ترە ژهنگڤین

ئەز دگەل ئێش و ئەلەمێت دل و گیانێ خو،
یا درێژە چیروکا نەساخی‌یا من.
ئەی نوژدارێ من: بنڤیسە ژ مرا دەرمانەکێ،
دەرمانەکێ بهاتر ژ هەمی دەرمانا.
بێژە من بەرێ خو بدە ئەو جوانا نازك تر هەمی شریناو
بێژە من ڤەخو تێر ژ دوو کانی‌یا لژێر هەردو،
بری‌یێت وێ یێن قەلەم کری.
ئەی نوژدارێ من دەرمان بکە من بڤی دەرمانی.
بێژە من هەڤالینی‌یا گەرم و روناهی‌ێ بکە
نێ چێ دبیتن بێژم نەساخی‌یا من گرانە،
مرادا من ئەوە ئەز بزانم،
ل کیرێ ڤەشارتی نە ئەگەرو ئەنجامێت ئێشا من،
ئەگەر مرم ئەز پشتی هنگێ، لوگە لسەر تە نامینیت،
دێ بێژین پزیشکی ئەڤرو نەکاری دەرمانەکی ژئێشا مەرا ببینیت،

★ ★ ★

ئەو گولێت تە بو من هەلگرتین،
نێ ئەڤرو سەر نوخین ی‌نە د نەخوشخانێ ڤە،
جهێ وان لبلنداهی‌یا نەماو،
ئاخ و رەهێت وانا هاتنە گوهورین
ئەو گول مینا هندەك نەساخانە،
ئەوێن ئاکنجی لژێر شیرەتێن نوژدارا،
ئاڤا کانیکێن زەلال نا ڤەخون،
لەوما لاواز دبن روژ بو روژێ.
دەمێ ئەم نەساخ بەرێ مە دکەڤیت گول و بشکوژو تاکێت دارا،
بەرێ مە دکەڤیت نەپەنی‌یا جوانی‌یا پیروز،
ئەم هەست دکەین چاوا یاساێن گشتی،
شیای‌نە یەکێتی‌ێ دابنن ل ناڤبەرا
نەساخا ژ مروڤان و گولێن چرمعی.

تو دبێژی پێتڤی‌یە لسەر من چاڤێ خو بدەم خو چاوا بیتن

★ ★ ★

ها وەسا ئەز گەلەك سالا ژیام،
لگەل هندێ من چاڤێ خونەددا خو،
چەند دەڤال من هەبون!
بەلێ نە دشیام بهێلم بۆ خو وان هەڤالا.
گەلەك ژوان چو بون درۆژێت بچویکاتی‌ێدا،
بەری ئەز تە ببینم..
چاوا دێ شێین خو بپارێزین ژ کول و،
ئێش و ژان و خەما،
ژ فەلەکا بلەزو بەز درێڤەچونا خودا
یا رۆژو کارێت مە هەژمێریت؟
بلا ئەز نەبێ نوبەداربم برەنگێ خو،
بەلێ مانا تە لگەل من دپارێزیت من ژ بەلا،
دەم هەژمێرا هەلاویستی‌یە بدیواری‌ڤەو، ئاگەدارە،
دهەژمێریت گونەهێت من یێن ئازاکری بتوندو تویژی.

★ ★ ★

ل گوهێت من دا تك تکا وێ دهات و دگوت:
راوەستە، نەچە.. هێشتا یا مای!
چەند پێ خوش دبوم برێڤە چونا وێ،
شرین تر بو ژهەمی تشتا لبا من سترانا وێ:
«تك تك» هێشتا یامای، خەلەکە بدویماهی نە هاتی‌یە،
دێ گەهی‌یە خانما خو یا داخازکری!
دەم هەژمێرا من درێڤەچونا خو دابێ چاڤا بنقینیت،
لدویف یاساو زانینێت خو دچیت.
سترانا وێ یاشرین «تك تك تك» یا خەمگینە ئەڤرو،
لێدانێت وێ یێن پوسیدە د ئیننە بیرا من ژێك ڤەبوینا تەحل،
د بێژیت و دگێریت «بوهارا ژینا تە چو وبەرزەبو»!
مالا تە لسەرێ رێکێ بو، مالا من ژی لبەرامبەری بو،
ئەز دەرکەفتم و، راوەستیام، نێ بایەك دهات،
لپێش و پاشی‌یا من ددا.

★ ★ ★

نێزیك بوم ژ دەرگەهێ تە،
بەلێ گرتی بو لگەل پەنجەرا،
بیرهاتنا دەست درێژی‌یا من لگەل تە،
نە هێلا لپەنجەرێ بدەم.
گەریا مەڤە مال و، لدویف خو را دکێشم،
پێنگاڤێت خو یێت گران بە دلەکی نە خوش،
گەهشتم و، دەستێت من دلەرزین،
لکلیلێ دگەریام د بەریکێت خودا.
نێ نیشان بۆ کلیلێ نینن لچ جها،
دێ مینم راوەستای چاڤێن من لتەبن بهێزەکا هەرفتی
ئەڤ روندکا دباریت لسەر رویێ تە،
ئەگەر شیابا بپەیڤیت بێهنەکێ،
دامن کوژیتن بێ دلوڤانی،
نێ ئەز بوم ئەگەرا بارینا وێ.

★ ★ ★

ئەو می‌یێ سپی یێ دناڤ کەزی‌یا تەیا ڤەهاندی‌دا،
نە شێت و نەڤێت چ گازندا بڤەشێریت،
تا بهێلیت بزانم کو ئەز بوم، ئەگەرا،
سپی بوینا کەزی‌یا تە بەری دەمێ وێ.
ئەی هەڤالا گیانێ من، راتەڤی‌نە مژا روندکێت چاڤێت خو،
ئێشاندن نە هەمی تشتە دژیانێدا،
من هیڤی هەیە ژ تە بەرێ خو بدەی پاش خو،
تا ببینی چەند رۆژێت روهن یێ لوێرێ!
بنالێ رۆژێت مەیێت بورین، بنالێ هەر تشتەکێ پیروز،
گەردەنا من ئازاکە.. ئەز دزانم گونەهبارم.
نێ من گەردەنا گەلەکا دژیانا خودا یا ئازاکری‌و،
ئەوان چ کەرب و کین ژ من نەڤەشارینە
باغێت من ل پاییزا پێ لبەلگێت وان دانابن،

چعر ئەوان بەلگێت خو جارەکادی بوٚ من کرنە دیاری.

★ ★ ★

گەر هندێ کو من بهایێ پاداشتێت بوهارێ نە دزانی
ی بوهار لگەل من یا دل رەق نە بوٚ
ـلا دی، هەمی تشت من ژبیر کرن،
حرەکا دی بوهار بقەشەنگی‌یا خوڤە پێش من ڤەهات.
حی تو گونەهێت من ئێك ئێکە دهەژمێری‌و،
یریت ئێشاندنا من دکەی دویێ گاڤێدا،
ـ تو نازك ترو بەرێزتر ژ بوهارێ.
گوهنادەی پەشێمانی‌و هیڤی‌یێت من.
ی تو گونەهەکا مەزن دکەی:
چەندی تو پاش گوهێ خو نە هاڤێژی چ شێلی یێت من،
جومر نەکە ژ ئاخا خو یاپیس.
نعمێ هەرێی د من وەردکەت.
ـری تو، ئەڤەیە کەربێت وێ ڤەدکەت، پەیویکە ئەو،
ێ ئەو ژی یا بوی جوان

★ ★ ★

گوهـ نەدە جیرانا خویا مەزن،
بو وێ دیارە گونەهبارم ئەز دهەمی تشتا دا.
تولازی‌یا تە وێ د حەلی‌نیت،
نێ تو یاری، ئەو نە یارە:
بلا بمینیت جیرانا تە یا بچویك د گێلە شوکا خودا،
خەبەرا بلا بێژی‌تە من،
من هیڤی‌یە باوەر ژێ نەکەی، نێ ترسا وێ ئەوە،
وەکی تە خوشتڤی نە بیت.
ژ کەڤن دا دوٚ ئەزمانی‌و کەرب کین،
پارا ژنا بێ دهەمەنن،
تە پرسیارا خو ژ من کر،
من بەرسڤا تەداو گوٚت: نە لەنگی‌یا منە،
گەلەك ژن لسەر عەردی هەنە،
نێ دنیڤا هزاران دابی بوٚ من هەرا دیاری.

★ ★ ★

هاتو راوەستیای ب دلێ خو،
هەر پێنچ قولپکێت کراسێ خویێ شوین باش گرێ ددەی،
ئەو خالاّ رەشا لسەر هەردوٚ لێڤێت تە،
مینال قولپکەکا شەشێ یا شکەستی‌یە.
دوٚبارە پرسیارا خو ژ من دکەی،
بێکو گوهێ خو بدەی پەیڤێت من،
لەنگی‌یا کێ‌یە؟ نێ گەلەك میللەت لسەر عەردی هەنەو
گەلەك باژێرو گوند،
گەلەك ژنك ژی هەنە.
بەلێ تەنا گوهوٚرم بژنکێت جیهانێ هەمی‌یا،
چەندی بزانم باوەری بپەیڤێ،
کێم ترە ژ کاغەزێ ژ مێژەدا،
ڤێجا راستی‌یێ دێ نڤیسم:
کو من تو دڤێی ڤیانەکا گەرم و بێ دویماهی.

★ ★ ★

هەتا روژا من یا دویماهی‌یێ،
دڤێت خزمەتا یارا خو بکەم بێ دل مان و
دێ مینیت ئومێدا من یا بهێزو نەبەز،
گەش تر روٚژ بروٚژا!
بڤی ناڤێ شاهناز «ئەڤینداری‌تە»
هەلبەستێت خو دێ ئیمزاکەم و دێ مینم خوشتڤی بوٚتە،
د بیتە جهێ گومانا لنك خەلکی،
ژ کەڤنە روٚژادا وە
دێ ئینمە دەف تەدا بپارێزی هەتا هەتایێ،
ئەوێن ئیمزاکری بئیمزا من یا بەردەوام،
د ژیانا مەدا د بوریت دەمەکی وەسا،
دەمێ بێ دەنگە دبین بێی کو لێڤا ب لڤلڤینین و،
دەستێت خو دانینە بن ئەرزوینکێت خو،

هڕوینین بەر ئاگری یان هنداڤ دەریایێ.

★ ★ ★

ب روینین و بێ کو بپەیڤین،
لسەر جوانیێیا جیهانێ یان جوانیێیا کاری.
مینا، ترسینا مە.. نێزیك بوینا مە،
هوشیار بکەت ئەوان بجویکێت نڤستی دلاندکادا.
ها نوکەژی پێکڤە دێ روینین،
بەلێ جیهان هەمی دناڤ،
بێ دەنگیێیا مەدا دژیت
هەردوٚ دلێت سینگێ مەدا
ڤینن لسەر عەردی روبیار دناڤ چیادا،
بمینن پڕ بێ راوەستیان،
گەلەکن رێك لڤێ جیهانێ،
هەژمار نینە بوٚ رێکێت پڕ ژ ترس و ئاستەنگە،
بەلێ من زانی بو ژ مێژە: رێکا ئەڤینێ،
ژ هەمی رێکا ب ترس و لەرزترە.

★ ★ ★

هەرچەندە رێکا ئەڤینێ،
درێژترە ژهەمی رێکا،
بەلێ ئەم نە شێین بژین،
دویر ژوێ رێکێو،
هەرچەندە ژ هەمیێیا ب ترس و لەرزترە،
نێ‌ژهەمی رێکا نێزیك ترە بوٚ دلێت مە.
بوٚ من دیارە کو ئەز تولازم،
ئەز لوێ رێکێ دێ چم
ئەز کەتبوم و دێ کەڤم و کەڤمەتە،
بەلێ دێ رابم،
پێنگاڤێت خو جارەکادی دێ هاڤێژم.
ئەز نا ترسم رێکێ بەرزەکەم:
نێ چریسکا روناهیێیا تە
ل پێشیێیا منە کویڤە بچم

★ ★ ★

ئەرێ ئەز هندێ پیچم دا هێرشا بهیننە سەر من وئەزێ بتنێ
ئەی کەرب و کین و درەو ونەخوشیێو
دەم ودوژمنێت مروٚڤایەتیێێ هەمیێیا
بوٚچیێیە؟ هوین د شێن ب سەرکەڤن و
من بکوژن مینا کوشتنا وە خەلکێ دی.
بەلێ نەشێن بکوژن ئەڤینا من،
نێ من ژی چ هێز نینە بەرامبەری وێ.
ئەڤین دێ ژیت و هەر دێ ژیت
چ دوژمن نینن بلنداهیێیا وی ب رەڤینن
ئەڤینا من دێ گەهیێتە کورێت نەڤیێت من
مینا مەتەلوکا یان گوٚتنێت مەزنا
پەی کەرەك دێ بوٚ من ئێتە چێ کرن
نە کارێ دەستان بیت و دێ ئێتە دانا
ل وەلاتێ باب و باپیرا.

★ ★ ★

ژێدەر:
1 ـ گوٚڤارا «الثقافة الاجنبية» هەژمارا «4» لسالا 1984.
2 ـ «کورتە ژینا هوزانڤانی» ژ.

تێبینی

ئەم سونێتانە (حسب الشیخ جعفر) لەزمانی رووسیوەوەری گێراوەتە سەر زمانی عەرەبیو (بدل رفو مزوری)یش لە زمانی عەرەبیوە وەر گێراوە سەر زمانی کوردی، بروانە ژێدەری ژمارە (1)

جخێ وەرزێ بهارێ کارێ خو دکەت وژناف مە بار دکەت،
ـتێ دیمەنێن جوان ورند وسپەهی ل دورێن مە بەلاف دەکەت ـت دل نوی دبن ل ئەڤ سالـەکـا پر ژ شادی وکـامـرانی، ـ وـنـەکێ نوی، ل رێبـازەکـا نوی بەرڤ ژینی دبیتن دبـزڤیت ـحەبێت بو ژینەکا گەشتر و خوشتر. ددویف را وەرزەکێ دن ل ـە دبیت مێهڤان، ومروڤ لتم یێ بەردەوامە ل سەر خەبتین و ـ ڤ خو، وب تایبـەتی ل گونـدێن کوردسـتـانێ جوتیـار، دەمێ ـڤین تێت ول مەها تیرمەهێ یێ مژویلە، ب کارە کێ نوی ـە. چاخێ دبیتە گها ئادەکرنا برنجی، ژ بەری کو برنج، گولی ـی خو بدەت، رێـزا ژن و مێـرا دێ خو کێشنـە ناڤـا کەرتێت ـجی، ملا ب هەڤ ڤەنن، و دەست هاڤێنە، گیایێت بیانی ژ ـڤ مشارێن برنجی ئادەکەن وهەلکێشن، چاخی چاڤی مروڤ ـ دیمەنێ ئادەکردنی دکەڤیت، ئەو دیمەنێ وسا یێ سپەهی و ـنگین، گشت ژن ومێـرا، زەنـد وبـاسکێت خو هەلـدانـە، ـحـەبتن ژ بو قورتـال کرنـا برنجی ژ گیـایێن بیـانی مروڤ دل حوش و فرەهـ دبیت. ژ بو وێ کەدا پاگژ وقورس.
ـو جورێت وان گیایێن بیانی ئەوێن ئێنە ئادەکرن ئەڤەنە:

**ـ - دەرزیلوك:-**

سەرێ وی مینـا دەرزییـایـە، یێ تیـژە، ژ بـەر هنـدێ ئەم دکارین بێژین کو ناڤ کرییە (دەرزیلوك).

**2 - رحانوك:-**

جورەکێ گیایە، لێ گەلەکێ تەر ونازکە.

**3 - سوتك (چرانك):-**

جورەکێ گیایە ل دور ورەخێن برنجی شین دبیت، بەهرا پتر ل سەر کەرتکا شین دبیت، لێ ئەڤ جورێ گیای گەلەکێ جوان سیەهییە، ب کار دهێت پو خوارنا جانەوەرا.

**4 - برێما:-**

جورەکێ گیـایـە ل ناڤ برنجی شین دبیت، ئو ئەڤ گیـایـە وەکی برنجییە دەمێ برنج بەر ڤ چێون دبیت ورەنگێ وی زەر دبیت، برێما هەر وەکی خو دمینیت، گیایەکێ شین، ب تنێ گولیا وی دگەهێت، وئەڤ گیایە ل گەلّ برنجی رادبیت ودبیتە رپـن وگـەلــە تا ژ خوە ددەت ورهـێن وی د ناڤ رهێن برنجی دکەڤن وبێ هێز دکەت.

پشتی قورتال کرنا برنجی ژ گیایێت بیانی، ئاڤێ ژ مشارێت برنجی دبرن، ئو نێزیکی دو سێ روژەکا دێ هێلنە دێم، پشتی هینگێ بەرێ ئاڤێ دێ دەنەڤە ناڤ برنجی جارەکا دی، وهەر وسـا دو سێ دێمـەکـا دێ دەنێ ژ بەر هنـدێ دا ب هێـزتـر ب کەڤیت و چێتر لێ بهێت.

ئو سـتــرانـێـن ئادا ژی د بەلاڤـن، چاخـێ ل ناڤ برنجی، ئادەی دکەن، رێزێن ژن ومێرا ڤێر دکەنە سترانا، باکێ چیا ل

## سترانێت ئادا

بسك وکەزیێن زەرییا ددەتن، تاکێت برنجی ژی خو دگەل وان د هەژینیت، یێ پێ خوشە ئەو زەری یێن رند وشرین د ناڤا ویدا تێن ودچن ڤێر دکەنە سترانا وگیاییێن بیانی ژ ناڤ دهەلکێشن..!

ب راستی سێ ستران ب تنێ ب دەست من کەتن و هندەك ژ وان دگەل داوەتا و هندەك ژی دگەل شەڤەروکا ژی دهێنە ڤەگێران.. و نهو دگەل ڤان هەر سێ سترانێن ئادا..

## عەیشوکە[1]

عەیشوکێ ستێر لئەسمانا دهوو هونە
مارینێ ستێر لئەسمانا دهوو هونە
عەیشوکێ لەیل ومەجرویم تێك چونە
مارینێ لەیل ومەجرویم تێك چونە
عەیشوکێ یێ د لاوکا سینگە بە کونە
مارینێ یێ د لاوکا سینگە بە کونە
عەیشوکێ ستێر لئەسمانا د بەلاڤن
مارینێ ستێر لئەسمانا د بەلاڤن
عەیشوکێ لەیل ومەجرویم لهنداڤن
مارینێ لەیل ومەجرویم لهنداڤن
عەیشوکێ یێو لاوکا بەلەك چاڤن
مارینێ یێ د لاوکا بەلەك چاڤن
عەیشوکێ ستێر لئەسمانا د هندکن
مارینێ ستێر لئەسمانا د هندکن
عەیشوکێ لەیل ومەجرویم بهەڤرکن
مارینێ لەیل ومەجرویم بهەڤرکن
عەیشوکێ یێ د لاوکا سەر مەمکن
مارینێ یێ د لاوکا سەر مەمکن

★ ★ ★ ★

- 2 -

## های کەپروکێ[2]

های چیکر ،چیکر کەپروکەك چێ کر
هەلاشێ کەپرێ ژ بەلگێت گولێ کر
سەر سینگێ یارێ خەوکا شەڤێ کر

★ ★ ★

کەپروکەك چێکر لە دانگێ مالا
هەلاشێ کەپرێ ژ بەلگێت هەلالا
سەر سینگێ یارێ خەوکا عەبدالا

★ ★ ★

کەپروکەك چێکر لە دانگێ گوندی
هەلاشێ کەپرێ ژ بەلگێت کولندی
سەر سینگێ یارێ خەوکا ئەفەندی

- 3 -

## سێلوانێ[3]

سێلوانێ تو سێلوانی
سێلوانا من

سێلوانێ تو سێلوانی
سێلوانا من
ترێ مێوکا سادانی
سێلوانا من
ترێ مێوکا سادانی
سێلوانا من

● زیاد نقیب برواری ●



بەر تیلا براکێ خومە

سێلوانا من

سێلوانێ تو سێلوانی

سێلوانا من

لاوکو خارۆ نەزانی

سێلوانا من

لاوکو خارۆ نەزانی

سێلوانا من

فەرشێ کانیێ مەرمەرە

سێلوانا من

فەرشێ کانیێ مەرمەرە

سێلوانا من

سێلوان ژ مالێت عەمەرە

سێلوانا من

سێلوان ژ مالێت عەمەرە

سێلوانا من

فەرشێ کانیێ یێ سپی‌یە

سێلوانا من

فەرشێ کانیێ یێ سپی‌یە

سێلوانا من

سێلوان ژ مالێت عەلی‌یە

سێلوانا من

سێلوان ژ مالێت عەلی‌یە

سێلوانا من

★ ★ ★

تێبینی: -

1 ـ ئەڤ سترانە ل شەڤە روکا ژی تێتە گوتن.

2 ـ ئەڤ سترانە بۆ داوەتا ژی تێتە گوتن.

3 ـ ئەڤ سترانە ژی بۆ داوەتا تێتە گوتن.

4 ـ ئەڤ سترانێن هەنێ من ژ زار دەڤێ دەیکا خونڤیسی نە،زور سوپاسی یا وێ دکەم، داخازا ژی‌یەکێ درێژ ژ وێ دکەم.

ئادا: بژارکردنی رووەکە لە گژوگیا

قورتال کرن: رزگار کردن

سێلوان: نێوی ئافرەتە

بەشی پێنجەم

# وێژەی شوراتەکان و ئەوپایەیەی کە لەبیر موسوڵمانان‌دا هەیەتی

■ مصلح جەلالی ■

ئەوەی لە لێکۆڵینەوەی وێژەی شوراتەکاندا رێگەی یەکلاکردنەوەمان پێ‌بگرێ ئەوەیە، کەبەشی زۆری چ شیعر بێ‌یان پەخشان لەدەست چوون و ئەمەش شتێکی سروشتی‌یە. کەواتە دوورنیە وێژەی کۆمەڵێکی وابەتایبەتی شیعرەکانیان لەناو بچێ کەدەربڕو پەیوەندیداری ئەوپەری ئاین و باوەڕ زاستیانە، کەبەڵگەی سەرکەوتووی رێبازەکەیانە، لەبەرئەوە ئەم جۆرە وێژەیە لەلایەن دوژمنانی ئەوکۆمەڵەوە، یان لەناوبراوە، یاخود دەسکاری کراوە بۆ ئەوەی لایەنی بانگەوازی ئەم کۆمەڵە بشارنەوە کە لەم جۆرە وێژەیەدا هەیە.[1]

لەم ڕێبازە شیعری یەی شوراتەکاندا، کە بەربەرەکانی ڕایەکانی تری موسولمانێتی‌یەو لایەن گرتنی ڕای خۆیانە تواناو سەرکەوتنی وێژەوان درووست ئەبن و ڕێگە ڕووناك ئەکاتەوە بۆ ئەوەی لایەنە هونەری‌یەکەی بۆدەست بەسەرا گرتنیاندا بکات تاوەکو بتوانێ لە ڕێگەی وێژەوە بە ڕەوانترین و کورتترین ڕێگە خزمەتی باوەڕەکەی خۆی بکات و بە خەڵکی بگەیەنێ‌و ئەم کارەش وای کرد کە وێژەیەکی بیروباوە ڕی درروست بێ‌و دێرو ناوەڕۆکی دەربڕی ڕاستە قینەی باوەڕەکەیان بێ‌و لێرە شەوە شێوازی ئەووێژەیە سەر هەڵئەدا، کەمێژ وو ناتوانێ دەری بخات و ئەمەشە کەوامان لێ‌ئەکات بڵێین وێژەی شوراتەکان بەشی زۆری لەناوبراون یاخود دەسکاری کراون.

ئەم وێژەیەش بزوتنەوەیەکی ڕاستەقینەی فراوان بووکەلە سەرەتای بانگەوازی موسوڵمانێتی‌یەوە دەستی پێ‌کردو پاشان وردە وردە پەرەی سەندو جیاواز بوو لەوێژەی سەردەمی خۆی چونکە وێژەوان خواستێ و مەبەستی خۆی واتە بیروباوەڕەکەی تیادەر ئەبڕی ڕووداوەکانیان ئەگێڕایەوەو ئەم کاروانەش لەشوێنێکابۆی نەوەستابگرە هەرلەڕەوتدابوو وێژەکەش لایەنگیرانی بیروباوەڕەکانیان پشتاوپشت لەمێشك و لە سەرزمانیان بوو کەهەندێ جار شیعرەکانیان لەگەرمەی هەندێ ڕووداوە سیاسەتیشیان تێکەڵاو ئەبوو. کەواتە ئەم لایەنەوێژەی یە تەنیارێبازی وێژەیی نەگرتبوو بگرەوەك لایەنی باوەرەکەیانی گرتبۆوە نرکەی سیاسی‌و گێڕانەوە ڕووداوو کارەساتەکانیانی تێدابوو عەرەب و موسوڵمانانیش لەم ڕووەوە واتە لەم بۆ چوونەوە سەرکەوتووبوون و توانیان بەرهەمی ئەوباوەڕە بدەن بەدەستەوە کە ئەو سەردەمە باوبووە. کە ئەمەش شان بەشانی ئەو بەرهەمەدا دانەئەڕوا کە ئەنجامی زۆرانبازی باوەڕەکە پەیدا بوو کە ناکۆکی‌ی زۆر بەهێزی لەنێوانیاندا پەیداکردبوو.(2)

شوراتەکان وەك لەوەوبەر لێی‌دواین تەنانەت دوژمنەکانیشیان باسی دلێری وخۆبەخت کردنیان کردوون کە لەڕێی باوەڕەکەیاندا لە شەڕەکانیاندا نواندو یانەو سەریشمان لەوەش سورنامێنێ کە شاعیرەکەی مەهلەبی کوڕی ئەبی صفرە ـ کەگەورەترین دوژمنی شوراتەکان بووە وچەندان جارشەڕی لەگەڵدا کردوون و خوێنیان لەنێواندا لە سەردەمی ئەمەوێکاندا زۆر ڕژاوەوکە ناوی (کەعبی کوڕی مەعدانی ئەشقەری)بوو باسی سیفاتی شوراتەکان لەوڕوانەوە ئەکات کەباسمان کردو لەم دێڕانەی خوارەوەدا دەریان ئەبڕێ.(3)

*تأبى علينا حزازات النفوس لما*
*تبقى عليهم وما يبقون ان تدروا*
*ولا يقبلوننا في الحرب اعدائنا*
*ولا نقبلهم يوماً اذا عثروا*
*لاعذر يقبل منادون انفسنا*
*ولا بهم عندنا عذر لواعتذروا*
*صفات بالقطاع كالطوربن بينهما*
*كالبرق يلمع حتى يشخص البصر*
*على كل بصائر كل غير تاركها*
*كلا الفريقين قتلى فيهم السور*
*يمشون في البيض والأبدان اذا وردوا*
*مشى الزوامل تهدى صفهم زمر*

شاعر کە ئەم قسانە بەشیعر ئەگێڕێتەوە ئەو بۆچوونەیەتی کەوا سەبارەت بە شوراتەکان گوتویەتی: ئەو کۆمەڵەن کە شەر لەگەڵ کۆمەڵەکانی تر دائەکەن و. لەڕێی وێژەو باوەڕی سنور دانراویان بۆچارە سەرکردنی کارو ئەوپەیوەندی‌یە بێ سنورو ئەو ڕاست گوییەیانەوە هەڵقوڵاوەکە بێ‌هاوتایەو ئەوەش دەرکەوتوترین شتی شوراتەکان بوو.

بۆروون کردنەوەی لایەنی شورات و ئەو باوەڕەی کەئەمانە لە زانستی ئاینی‌و سیاسیدا بوویانە ئەبێ لەوێژەکەیان بکۆڵینەوە. چونکە کاتێ کە کۆمەڵی ئەزارقە لەسەر شانۆی سیاسەتی عەرەبی سەردەمی ئەمەوی کەدەوری تەواوی خۆی گێڕا. . لەبزوتنەوەکانیاندا جۆشی تیرەگەری‌و جۆشی ئایینان کۆ کردبۆوە ئەوە بوو دیلەکانیان ئەکوشت کە بەخوێن و تیرە لێیانەوە دوور بوو

بەلام ئەوانەی کە بەخوێن و بەتیرە پەیوەندی پیانەوە هەبوون و دیلیان بوون بەرەلایان ئەکردن و ئەوەی تەنیا هەر لەباوەردا لەگەلیان نەبوایەو بەخوێن و تیرەلییان دوور بوایە ئەیانکوشت.[٩]

کۆمەلی نەجدات کە یەکێکە لەوکۆمەلانەی شورات. . کاتێ کە نەجدەی کوری عامری حنفی‌یان لەئیمامەتی خۆیان لابرد. لەبەرئەوە نەبوو کە ئەم ئیمامە هەلەی کردووە. . بگرە لەبەرئەوە بوو کە نەجدە عەرەب نەبوو. . هاتن ئیمامێکی عەرەبیان هەلبژاردو ئەمەش گە ورەترین بەلگەیە بۆ ئەوەی (ئەوان لەگەل ئەوەی لەئایندا جیاوازی لەنێو یەکێك و یەکێکی‌تر داناکەن) کە لایەنی پشت گرتنی هۆزایەتیان زۆر بەهێز بووەو ئەمانەش وێژەیەکی بەپێزیان هەبووە بەلام بەشی زۆری لەناو چووە.

**چۆنیەتی وێژەی ئەزارقە: -**

ئەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە لێی بدوێین:

1 - باوەری زۆریان بەقورئانی پیرۆز بووە، لە پەخشان لەشیعرەکانیاندا باسیان کردووەو گەراونەتەوە سەری. . جالەبەر ئەوەی کە بەرامبەر بە دوژمنەکانیان ئەدوێن و ئەیانەوێ رایەکانیان لێك بدەنەوە لەقورئان بەهێزتریان نەبوو کە بگەرێنەوە سەری. بەم جۆرە هەموشتێکی ئەزارقەکان لەوتارو شیعریاندا پریتی لەئایاتی قورئان و نموونەشمان بۆ ئەمە نامەکەی نافعی کوری ئەزرەقە کە بۆ نەجدەی کوری عامری ئەنێری‌و باسی ئەوە ئەکات کە نیشانەی وای بۆ دەرکەوتووەو باوەرێکی پێ‌پەیدا کردووە کە گۆشە گیرێتی‌و کوشتنی مال و موفت کردنی بارمتە بەکفردا بنێ.

ئەم شوراتانە ئەوانە نەبوون کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (د. خ) لە مەکە خەفەتبارو گیر خواردو بوون رێگەی دەرباز بوونیان نەبوو، یان نەبوو کە پەیوەندی بەموسولمانەکانەوە بکەن. بگرە ئەمانە ئەوانە بوون، کە قورئانیان بەباشی خوێندو زانای زۆر گەورەی ئایینیان تێدا پەیدا بوو رێگەی ئاین بەلایانەوە رێگەیەکی ئاشکرا بووو ئەوەش زانیان کە خوای گەورە بەرامبەر بە هی وەك ئەوان ئەفەرمۆی چی ووتیان (إنا مستضعفون في الأرض) پێیان وتن (الم تكن أرض الله واسعة فهاجروا فيها) وتی فَرِحَ المخلفون بمقعدهم خلاف رسول الله) (سورة التوبة أية 82): وتی (وجاء المعذرون من الاعراب ليؤذن لهم (سورة التوبة آية 91). بە وانەیان راگەیاند کە وا پەسەندی پاکانەیان کرد کە ئەوانە درۆیان لەگەل خواو پێغەمبەردا کردووەو وتی ئەوانەی کەتیایاندا کفریان کردووە هەقە ئازارێکی چاك بدرێن و لەم رووەوە قەطەری فجائە وتویە.

*فانك لو سألت بقاء يوم*
*على الأجل الذي لك لم تطاع*

لێرەدا پەنجەبۆ ئەوئایەتە راکێشراوە: (إذا جاء أجلهم لايستأخرون ساعة ولا يستقدمون)و قەطەری هەمدیسان ئەلێ:

*رايت فتية باعوا الإله نفوسهم*
*بجنات عدن عنده ونعيم*

ئەم دوو دێرەش دووبارە ئەچێتەوە سەر فەرمودەکەی خوا: (ان الله اشترى من المؤمنين انفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة).

2 - بە زۆری چاکە کردنی تازەیان بەتایبەتی یەکدگیربوونیان ئەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کەئەزارقەکان بانگی دوژمنەکانیان ئەکردو راکانیان لێك ئەدانەوە لەبەر ئەوە ناچار بوون کە راوباوەری خۆیان لەگەل راوباوەری تری موسولمانانداا بەراورد بکەن و بکێشن و ئەم کارەشیان تەواو رێی بە پەرچدانەوەی راوباوەری دوژمنەکانیان و لەمانەش واتەکەی زبیری کوری علی ماحوزە کە قسە بۆ ئەزارقەکان ئەکات و ئەلێ: (بەلابۆ باوەرهێنەران. . پاداشت و چاکەیەو بۆکافرانیش سزادان و ناشیرینیە).

قەطەریش لە قسەیەکیدا کە سەرزەنشتی دوژمنەکانی ئەکات بە شانازی‌یەوە ئەگەر هاتو کەسێك هەر بەسەرسامی مایەوە. . . ئەوا تووشی خەفەت ئەبێ، ئەگەر شکیشی بەیەکێ لایەق نەبرد پاداشت لە ئەنجامدا پشتێکی ئەداتی خەفەت دوای ئەوە پەخەی پێ‌بگرێ‌و لەو ناخۆشی‌یەشی پێ‌لایەق نەبینی کە ئەنجام

بەئاشکرایی بەخشی و خۆشی ئەوەندەی نەخایان کە بەڵای بەسەردادابارێ. یەزیدی کوڕی جهناء ئەڵێ :

**ماشقوة المرء بالأفكار يقتره**
**ولا سعادته يوما بإكثار**

3 ـ سەرکردەکانی ئەزارقە لەوەڵامدانەوەی دوژمنەکانیاندا بەزمان زوڵاڵی یەکی ئەوتۆ ناسراون کە لە ریزی هەڵکەوتووی گەورە دابن و ئەمەشیان لەو نووسین و شیعرو نامەیەدا دەرئەکەوت کە لەم لاو لەولا بڵاویان ئەکردەوەو لەو وتارانەیاندا دیار بوو، کە ئەیانداو والەپشکنکار ئەکەن نەتوانێ نەپرسێ کەئەمانە چۆن توانیویانە ئازایەتی و هەڵکەوتوویی و بڕوای پتەو بەئاینەکەیان و زمان زوڵاڵی یەکی وانایاب هەموو بەیەکەوە کۆ بکەنەوە. ئەمەشیان زوڵاڵی یە نایابەکەی زمانی (قەطەری یە) یە کەئەڵێ :

**حتى متى تخطئني الشهادة**
**والموت في اعناقنا قلادة**

عبیدە کوڕی هلال ئەڵێ:

**وحوم للموت يركب روعه**
**بين القواضب والقنا الخطار**
**يدنو وترفعه الرماح كأنه**
**شلو تنشب في مخالب ضار**
**فترى صريعا والرماح تنوشه**
**ان الشراة قصيرة الأعمار**

**4 ـ ڕاستگۆیی و ویژدان:**

ئەزارقەکان لەوێژەکەیاندا ڕاستگۆیی ڕێرەویانەو ڕووداوەکان چۆنن وایان ئەگێڕنەوە ئەگەرچی ئەوکارە بەسەر خۆشیاندا هاتبێ و خراپە لەوەدا نابینن کە دان بەچاکەی دوژمنەکانیاندا بنێن. . تەماشا ئەکەین لێرە عبیدەی کوڕی هلال باسی مەهلەبی دوژمنیان ئەکات وئەڵێ :

**فلو غيرنا يلقى لقال لنا اذهبوا**
**ولو غيره نلقى لقلنا له اذهب**

دیسانەوە قەطەری بەڕاستگۆیی و ویژدان داری یەوە توانای سەرکردایەتی و شکاندنی خۆی لەوشەرانەدا باس ئەکات کە لەگەڵ مەهەلەبدا کردوونی :

**لعمري لئن كنا أصبنا بنافع**
**وامسى ابن ماحوز قتيلا ملحبا**
**لقد عظمت تلك المصيبة فيهما**
**واعظم من هاتين خوفي المهلبا**
**رمينا بشيخ يخلق الصخر رايه**
**يراه رجال حول رايته أبا**
**نفاكم عن الجسر المهلب عنوة**
**وعن صحيح الأهواز نفيا مشذبا**
**وانحى عليكم يوم امسك نابه**
**وكان من الأيام يوم عصبصبا**
**فلن تهزموه بالمنى فاصبروا له**
**وقولوا لامر الله أهلا ومرحبا**

5 ـ دەرکەوتنی بڕوای دەمەتەقێی بەجێ لەوێژەکەیاندا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ناچار ئەبوون دەمەتەقێ لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە لەگەڵیاندا نین و وەڵامیان بدەنەوە بەبەڵگەو دەرخستن و دەستنیشان کردنی بەجێ رای پاکژی خۆیان نیشان بدەن. . رەنگە ئەمانەش لەو نامانەی نافع کوڕی ئەزرەقدا هەبن کە بۆ نەجدەی کوڕی عامرو عبداللهی کوڕی زبیرو بۆ خەڵکی بصرەی ناردوون و لەووتارانە دەرکەون کە نافع لە ئەهوازو زوبیر کوڕی علی لەئەرجان دایان.

هەروەها لە شیعرە کانیشیاندا ئەو باوەڕی دەمەتەقێ یە لەقسە کانی قەتەریدا دەرئەکەوێ، کە لەگەڵ ئەبا خالدی

سەربەخۆیانی دانیشتوویانی ئەکات و ئەڵێ:

ابـا خالـد یانـفـر فلسـت بخـالـد
ومـا جعـل الـرحـمـن علراً لـقـاعـد
أتـزعـم ان الـخـارجـی علی الـهـوی
وانـت مقـیـم بیـن لص وجـاحـد

6 ـ گیانی خواپەرستی لە وێژەکەیاندا روونە. . لەبەر ئەوە ئەبینین یەکێکیان لە خوای خۆی ئەپارێتەوە کە رێگەی باشتری بداتێ و ئیمانی بە هێزتر بکات و وەك موسوڵمانێکی تەواو خوا ناسێکی باش دەست بداتە باڵی. . لەمەش نامەو وتارەکەی قەتەری بۆ نموونە ئەهێنینەوە کە ئەڵێ:

(اما بعد فانی احذركم الدنیا فانها حلوة خضرة، حفت بالشهوات وراقت بالقلیل وتحجبت بالعاجلة ومنیت بالآمال، وتزینت بالغرور لاتدوم جدتها ولا تؤمن مجمعتها، غرارة ضراره، خوانه قذاره، حائله زائله، نافذة بائدة، الحالة قواله، بدله تقاله، لایعدو اذا تناهت الی امنیة أهل الرغبة والرضا عنها، أن تكون كما قال الله تعالی (كماء انزلناه من السماء فاختلط بەنبات الأرض فاصبح هشیما تذروه الریاح وكان الله علی كل شیء مقتدراً. سورة الكهف آیة 46). هەروەها لە شعرێکیدا ئەڵێ:

یارب زدنـی فـی الـتـقـی عبـادة
وفـی الـحـیـاة بعـدهـا زهـارة

دیسان ئەڵێ:

یانـفـس لا یلهـیـنـك الأمـل
لرب اكـلـب الـمـنـسـی الأجـل

پاشان ئەڵێ:

ولا خیـر فی الـدنـیـا لمـن لم یكـن له
من الله فی دار الـقـرار نصـیـب

فحـسـبـی من الـدنـیـا ولامـن حصـینـة
واجـر خوار الـمـنـان نجـیـب
اجـاهـد اعـدائـی اذا ماتـتـابـعـوا
وادعـی باسـمـی للهـدی فاجـیـب
معـی كل آراه یری الـصـوم جسـمـه
ففـی الـجـسـم منه نهـكـة وشـحـوب.

شاعیرێکی تریان ئەڵێ:

یاطـالـب الـحـق لاتـسـتـهـو بالأمـل
فان من دون تهـوی مدی الأجـل
واعـمـل لربـك واسأل مثـوبـتـه
فان تقـواه، فاعـلم، أفـضـل الـعـمـل

7 ـ پشکنکـار بە ئاسـانی ئەتـوانێ لە وێژەی ئەزارقەکـانـدا خاسیەتی ئاشکراو زیاتر بدۆزێتەوە بە جۆرێك شتەکە درێژە نەکێشێ و لەمەسەلە سەرەکی یەکەش دوور نەکەوێتەوە، لەوانەش لانەدانیانە بەلای هیچ و پووچیو جنێودان و دەست بۆ ناموس درێژکردن و حەزیان لە شیعردا لەبەحری درێژ وو (جزل) وکارتێکردنی تەوا وبووەو ئەمەش لەبەر ئەوە بووە کە پیاوانی جەنگە و خاوەنی بیروباوەڕ بوون و بەڵام ئەوە هەیە کە ئەبێ ئەوە بڵێین ئەم توند دەست گرتنەیان بەئاینەکەیانەوە کارێکی کردووە کە وێژەکەیان لەئاسۆی چەند مەسەلەیەکدا تەسك بێتەوە کەلە دەوری ئەوەدا بسوورێتەوە کە ئاین رێگەی داوە. . لێرەدا ئەبێ دەربارەی ئەزارقەکـان بدوێین و گیرۆدەشیان بین چونکە توانیان کاری نایاب بکەن و ئەم کارانەشیان لەمەیدانێکدا کۆبکەنەوەو ئەویش ئەوە بووکە بۆیان نووسرا کە لەرێگەی خۆیان لانەدەن و لێی دوورنەکەونەوەو ئەم کارەش لە مێژووی وێژەی عەرەبدا نموونەی کەمە.

بۆ ئەوەی وێنەیەکی تەواوی وێژەی ئەزارقەکـان دەرخەین نموونەی نووسینەکانیان باس ئەکەین تاکو بزانین ئەو وێژەیەیان چۆنە کە لە شیعرو پەخشانیاندا دایان رشتووە.

بێگومان وێژەی مێژووی ئەزارقەکان ئەوەی پێمان گەیشتووە زۆر زۆر لەوە کەمترە کەهەبووە. . ئەبینین کە یەزیدی کوڕی حەمدی ئەزرەقی و تاریخی ئەزارقەکان بووەو بەلای (جاحظ)ەوە گەورەترین و تاریخی عەرەب بووەو بەڵام هیچ لەوتارانەمان پێ نەگەیشتووەو عیسای کوڕی فاتکی جنطی. . هەروەك بەلازەری دەڵی ئەکات ئەمیشیان شیعری زۆربووەو کەچی چەند دێڕێکی کەمێ ئەوانی تری دیارنین.

وتارەکانیان: ـ

نافعی کوڕی ئەزرەق وتـاربـۆ عبـداللەی کوڕی زوبێـر ئەداو دەنگی ئەکات بێتە سەر ڕێگەیان و بەرامبەر بەخەلافەتی عثمانی کوڕی عفان رای خۆی بگۆڕێو بێتە سەررای ئەزارقەکان و ئەڵێ:

«ئەی کوڕی زوبیر لە خوای خۆت بترسە، رقت لە ناپاکی خۆپەرست، بێ، بەپێی دەسـەڵاتی قورئـان دوژمنکـاری ئەوکـەسـە بکـە یەکـەم جار ڕێ خراپـەی داو گیـروگـرفتی درووست کردووەو بەرێوە نەچووە. ئەگەروا بکەیت خوا لە خۆت قایل ئەکەیت و خۆت لە ئازارێکی گەورە دەرباز ئەکەیت و خۆ ئەگەر هات و نەشیکەیت واتە تۆمەستی ئەو جیاوازیانەیانی کە هەیانەو خۆشیان لە ژیانی دنیادا لە خۆیان تێکداوە». ئەکاتەوەو. . لە خوای خۆت بترسەو لەگەڵ زۆرداراندا مەبە. . خوا ئەفـەرمـوێ: «لایتخـذ المؤمنـون الكـافرين اولياء من دون المؤمنين، ومن يفعل ذلك فليس من الله في شيء».

ئەو ڕۆژەی عثمان کوژرا من لەوێ بووم. . ئەگەر لەسەر ناله باری نە کوژرابێ واتە کفریان کردووەو ئەوا جێی پەشیمانیە. . ئەگەر بەناوی ئاینیشەوە کوشتبێتیان ئەوانە موسوڵمانن و ـ ئەوەش کافرە کەلایەنی گرتووەو زانیم کە باوکت و طلحەو علی لەهەموو کەسێ زیاتر بۆی پەرێشان بوون و ئەمانەش بەکارەکەیاندا وەك بەشـداری کوشتنیـان کردبێ و یاخـود پشتیان تێ کردبێ وابوون و تۆش شوێن باوکت و طلحەو عثمان کە وتوویت. . چۆن لایەنی پیـاو کوژێکی بە ئەنقـەست و کوژراوێکی قەرزاربـاری یەکێ ئەگـری کە دوای ئەو علی ڕێگـەی گومـان لێکـراوی گرت و سنـووری دانـاو لەپشت ئەم سنـوورەوە کاری بەرێـوە ئەبـردو کارەکـەی بەراستی و بۆخـۆی نەئـەکـردو باوکت و طلحـە پشتیـان گرت و دواییش نارە واییان کردو وازیان لێ هێنا.

قەتـەری کوڕی فجـائـە وەڵامی ئەو نامـەیـە ئەداتـەوە کە لە حجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیەوە هاتبوو:

(لـە قەتـەری کوڕی فجـائـەوە بۆ حجاجی کوڕی یوسف. . سلاو لەو کەسانە بێ کەشتە پیرۆزەکانی خوا ئەپارێزن و لە سزای ئەتـرسن. . سوپـاس بۆ ئەو خوایـەی کەبـۆ کە سانی ساوێلکـە (سفـالـە) ئەوشتـانـەی لە ئاینـەکەیدا هێناوە کە لە خراپە دووری خستـۆتـەوەو ئەخـاتـەوەو سەری خستووە لەوەداکە رقی بەرامبەرت کەم بووە. نووسیبووت، کە گوایە منی قەتەری نەخوێندەوارێکی برسـی و دەست کورتم و نانـە رەقیشم دەست ناکـەوێ. . ئەی کوڕی دایکی حجـاج. . لەبـەر ئەوەی پیسی تاتـەرقی سەرت هاتووەو خوا ناناسیو لەخراپەش دوور ناکەویتەوەو چاکە نازانی و هاوڕێی ئەهریمەنی و پیلانەکانیشت سەر ناگرن. . سووپاس بۆ خوا کەبیـەوی لاپـەڕەی خۆتم نیشـان ئەدات و نیـازی سەرە رووتـاوەکـەتم بۆ روون ئەکـاتەوە. ئەوەش بزانە لێدانی پاڵەوانان نووسینەوەی کاغەزنیە. . لەگەڵ ئەوەشدا تکام لەخوا ئەوەیە کە ئاواتت نەیەتە دیو کۆتاییشت بەدەستی منبێ.

2 ـ نامەکانیان: ـ

نافعی کوڕی ئەزرەق بۆ عبداللەی کوڕی زوبیر ئەنووسێ کە بێتـە سەر ڕێگـەیـان. . ئەم نامـەیـە ڕای ئەزارقـەکـان بەرامبـەر عثمـان و علی و طلحـەو زوبیـرو عائشـة دەرئـەبـڕێ و بەم جۆرە دەست پێ ئەکات:

«پاشان من بۆ خوا پێت ئەڵێم (هەرچی چاکەیەکت کردبێ و خراپـەیـەکت هەمـوویـانت پێ ئەگاتەوە. . ئەمانەش واتە ئەم پێ گەینـەوەیـەش هەرچـەنـدە دوور بکێشێ خوا خۆی ئاگـادارتـان

## هەڵکەو توانیوێژەی شورات: -

ڕووداوەکانی شەڕی نەهرەوان و ئەو ڕووداوانەی دوای ئەویش کە لەو ئەچن. کاریکیان کرد لە (وێژەو هەڵبژاردندا توندیو تۆڵیو باوەڕنیشان بدەن و دوورنیە شەڕی نەهرەوان بۆچوونیانی بەرامبەر بە علی پێ گۆڕیبن. چونکە علی پێش مردنی بەماوەیەك وتی:

دوای من شەر لەگەڵ شورات مەکەن (ئەمانە کەسێکن کە داوای ڕاستیان کردبێو هەڵەیان کردبێ یاخود ئەوانە نین کە داوای هیچ و پووچیان کردبێو هەستیان پێ‌کردبێ). هەروەها حسن[5] کاتێ کە معاویە بانگی کرد بۆ ئەوەی شەڕیان لەگەڵ بکات ئەویش وتی. شەر لەگەڵ ئەوکۆمەڵە ناکەم کەتۆ ڕاستپارد شەڕیان لەگەڵ بکرێ. ئەگەر نزیکەی سێ هەزار کەسیان لە نەهرەوان لەناوچوویێ زۆر لەوەزیاتر خەڵك چەند جارێ شوێن باوەڕەکەیان کەوتوون و، ئەگەر بەزیادەوە باسی ئەوانە بکەین کە لەکاتی شەڕدا مەیدانیان بەجێ هێشتووەو ئەوانەشی کە مەیدانی شەڕیان هەرنەدیبو تەنیا هەر لەکوفە دوو هەزارکەس بوون.[6]

مێژوو نووسان بۆ ژمارە کەم بوونەوەی شورات دوای شەڕەکە بەهەڵە چون و ئەمەشمان لەبەشەکانی پێشودا ڕوون کردەوە.

وێژەی شورات مل کەچی دووکار بووە. ئەم کارەش یەکەمیان لایەنی هۆزگەریو دووەمیان ئاین بوو. ئەوەشی کە شاعیرەکانی شورات بەباشی هەیانبوویێ زمان زوڵاڵیو شێوازی بەهێز بووەو تەنانەت لەسەردەمی خۆشیاندا ئەمەیان لێ‌زانیون. (کوری زیاد) دەربارەیان ئەڵێ:

(قسەی ئەوانە خێراتر ئەبیسترێ لەوئاگرەی کە لەپووش بەرئەبێ). عبدالملك کوری مەروان سەبارەت بە یەکێ لەشوراتەکان کە بروای شوراتی بۆشی ئەکاتەوە (عبدالملك یەکێك بووە لەوانەی کە قسەی بەخۆرایی نەکردووە) ئەڵێت بیگرن و بیخەنە زیندانەوە 1 - ئەگەر لەوە نەترسانەمایە بەم قسانەی خەڵکەکەم لێ‌هەلبگێڕێتەوەو ئەگەر ڕای نەکێشامایە بۆلای ڕاکەی خۆی بەندم نەئەکرد.[7]

شوراتەکان وەك شێوازێکی بەهێزیان بووە. واتای وێژەکەشیان دووبارە هەر بەهێز بووەو ئەمەشیان پڕبووە لەبرواکەیان کە ڕووناکیو درەوشەو مەزنی پێوە دیار بووەو. وەك وتیشمان بەشی زۆری شوراتەکان زمانیان زوڵاڵ بووەو هونەری قسەکردنیان زانیووە لەمانەش (ابو بلال مرداس. عبداللە کوری وهب. حرقوس کوری زهیر. مستورد. نافع کوری ئەزرەق. قطری. شبیب، ابو حمزة).

تەماشاتەکەین هۆزێکی وەك «شیبان» بەشی زۆری بە وتار بێژ و زوبان زوڵاڵ و چەند جارێ لەگەڵ شوراتەکاندا سەریان هەڵداوەو گەلێ سەرکردەی شوراتیان تێدا هەڵکەوتووەو ئەم وتاربێژ و سەرکردانەش وەکو نافعی کوری ئەزرەق. لەگەڵ نەجدی کوری عامرو هەندێ لەبصرای یەکاندا نامەیان بۆیەکتر ناردووەو لەگەڵ کوری عەباسدا سەبارەت واتاکانی قورئان و گەلێ شتی تر دەمە تەقێ‌ی کردووەو. سەرگوزەشتە بەناوبانگەکەی کوری عباس کە کاتێ گوێ لە عمری کوری ربیعە دەگرێ، دەرئەکەوێ کە نافع لە دەمەتەقیدا زۆرپایەدار بووە. ابو غیدا کە ئەو سەردەمە ژیاوە بەم جۆرەپەنجە بۆجەنگاوەرانی شورات ڕائەکێشێ.

فثوى صريعاً والرماح تنوشه
ان الشراة قصيرة الأعمار

سەربارى ئەمانەش (وەك لەسەرەتای بەشەکانی‌تردا باسمان کرد شوراتەکان بە زۆر نوێژکردن و دەموچاو نورانی ناوبانگیان دەرکردبوو) بەبەڵێن بردنە سەر ناویان ڕۆشتبووو هەستە ئاینی‌یەکەشیان لە وێژەکەیاندا هەستی زەلامێکی دەوارنشین بووەو فەلسەفەو لێکۆڵینەوەو بەڵگەو شیکاری نەبووە وئەمەشیان ئەگەڕێتەوە بۆلایەنە دەمارگیری یەکەو بەرامبەربەباوەڕەکەیان پاك بوون و لەم بارەیەوە حبیب کوری حورە کەهاوڕێی ضحاکە ئەڵێ:

یارب انهم عصوك وحكموا

*فی الدین کل ملعن جبار*
*یدعوا الی سبل الضلالة والردی*
*والحق ابلج مثل ضوء نهار*

شوراتەکان سەردەمی خۆیان لە شتێکدا زۆر دوور بوون لە خەڵکی ئەوسەردەمەوە، کە ئەویش لەسەر بیروباوەڕ ڕێکەوتن بوونەك وەك ئەوەی کەکاتێ (کوری خباب) بکوژن پێی ئەڵێن تۆرێکەی باوەڕت نەگرت و شوێن ناوی زل و ناودارکەوتیو[9] بە علی‌یشیان کاتی خۆی هەروت بەوە کە کۆشش بۆ خەلافەت ئەکات و ناڕوانێتە ئەوەی کە خەلافەت مافی خۆیەتی. . ئەم هەستەش بوو کە لە سەرەتادا پاش ماوەیەك هێزی سیاسیو هەڵکەوتنی پێ‌پەیداکردن و تێکەڵی وێژەکەشیان بوون.

ئەمەش ئەمانباتەوە بۆئەوەی کە لەوێژەی شوراتەکاندا ستایشی خەلیفەیەك نابینین کە وەك شاعیری سیاسی ئەو سەردەمە (کمیت و وعبداللهی کوری قەیس) لە ترساو بۆ قازانجی خۆیان بەشانو باڵی خەلیفەکانیاندا هەڵئەدا. . تەما شائەکەین عبدالملك کوری مەڕوان فرمانی کوشتنی عمرانی‌دا. . کەچی عمران بەو پیری‌یە دەربەدەری‌و خۆ شاردنەوەی خۆی بەوە نە گۆڕیەوە ستایشی عبدالملك بکات یاخود خۆی بکوتێتە بەردەگای جەورو ستەمکاری‌کۆشکی خەلافەتەوە. کەچی پارتەکانی بەرهەڵستکاری خەلافەت لە دەوری خەلافەت ئەخولانەوەو دەسەلاتی‌یان بەخۆ بردنە پێشەوە بەهێزئەبوو هی تریان لاواز ئەکرد. . بەڵام شوراتەکان کە پارتێکی سیاسی ئەوسەردەمە بوون دوور بوون لەدەوروپشتی خەلافەت و داوای خەلافەتیان نەئەکردو ئاواتیان جێ‌بەجێ کردنی زانستی ئاینی بووو. . هەرکەسێك جێ‌بەجێ بکات مەرج نیەو ئەوەی کەمەبەست بێ بەکەڵکی ئەو کارەبێ کە ئەوان مەبەستیانەو بەلایانەوە وەك کافرهەبوو باوەرهێنەریش هەبوو. . وەك مجاهد هەبوو دانیشتو هەبوو. . باوەڕیان بەشیعەو بەزوبەیری‌و ئەمەوی نەبوو ئەمانەش بوون دووبارە وای لێ‌کردن وێژەکەیان ڕەنگدانەوە یەکی جیاوازی هەموو وێژەیەکی سەردەمی خۆیانیان هەبێ. . پاشان شیعرەکانی شورات ستایشی شەهیدو سەرکردەو سزای ئەو هەڵانەیان تێدایە.

ئەزارقەو صەفەری‌یەکان کە لە هەموو دەستەکانێ تر زیاتر شۆڕشیان دژی خەلافەت بەرپاکردووەو گوڕج و گۆڵ بوون وێژەی شوراتیان پێ‌ناسین.

هەروەها ئەباضیەکانیش کە بەناوبانگترین کۆمەڵی شوراتن لە زانستی ئاین و زویان زولاڵیدا. سەردەمی ئەمەوی‌یەکان تەنیا هەر ابوحمزەی شاریان هەبوو گەرچی لەهەموو مەیدانەکاندا ئەباضیەکانیش ئارەزووی پاکی خۆیان هێنابێتە دی. . بەڵام هەر وەکووتراوە لەعمان ساڵی 1938 چاو گێڕراوە بەچاپەمەنی‌یەکی زۆری وێژەی ئەباضیەکاندا کەهیچیان لەسەدەی دووی کۆچی‌واتە سەردەمی ئەمەوی‌یەکان تێپەڕناکەن و زۆری بەوێژەوان ناسراویان سەرکردەی شەڕەکانیان بوون وەك قەتەری‌و ابی‌حمزەو پایەبڵندی زۆری تر.

## سیفەتەکانی شیعری شورات: -

هەروەها هەندێ بۆ شیعرەکانی شورات چوون کردوونی بەسێ یەکێتی‌یەوە. . یەکێتی مەبەست. . یەکێتی سیفەت. . یەکێتی شەپۆلی دە ڕوونی. یەکێتی مەبەست بریتی‌یە لەوەی کەئەگاتە ئەو حاڵەی‌کە ئەندێشەی شوراتەکان درووستی ئەکات و ئەیگەیەنێتە ئەوەی کە ئەگەر لەرێی خزمەتی خوادا بکوژ رێ‌و لەناویچێ شەهید بوونە یاخود هەروەکو بەهلول ئەڵێ داوای مردن کردن بەم جۆرەیە.

*من کان یکره ان یلقی منیته*
*فالموت اشهی الی قلبی من العسل*
*فلا التقدم فی الهوجاء یعجلنی*
*ولا الحذار ینجونی من الأجل*

بەڵام یەکێتی سیفەتەکان کەکۆمەڵی سیفەتی بەرزە ڕەنگە بتوانرێ بڵێن لەهەموو شوراتێکی باوەڕ پاکدابووە. . لەبەر ئەوە

بۆچوونی ئەوانە بوونە گشتییە هەرە گەورە کە لەستایشدا لە لایەن شوراتەکانەوە بۆتە شیعرێکی گونجاوو هی هیچیان بەم پێیە لەوی تریان بەرزو نزمتر نابێ. . چونکە ئەو سیفەتەی لە شیعری ئەبی بلال و قەتەریو صالحی کوری مەرداس و داود کوری نەعمان و خەتاردابووە هەریەك نیازبووە لەبەر ئەوە هەر کامیان پێش بخرێ ئەبێ ئەوانیکەش شان بە شانی راوەستن.

متأهبـون لكـل صالحـه
ناهـون من لاقـوا عن المنكـر

بەم جۆرە لەم شیعرە ناسك و بەرزەدا رای شوراتەکانمان بۆ روون ئەبێتەوەو ئەوە دەرئەبڕێ کە ئەدەبەکەیان یەك پارچە رەنگدانەوەی بیرو باوەڕەکەیانەو. . بیرو باوەڕەکەیان ئەوەندە بەخۆشەویستی و دڵسۆزییەوە گرتووە کە ئەوپەری قوربانی لە رێگە بدەن و بەو پەری شانازیو بەختیارییەوە بەرەو مردن بچن.

ئەمە بێجگە لەوەی کە هونەری شیعرو ناوە رۆکەکەی کە زۆر وەستایانەو زانایانە لە چەند دێرێکدا ئەو هەموو واتانە کۆکراونەتەوە.

دیسانەوە شوراتەکان وەك دەسەلات و توانایەکی باشیان لە شیعرەکانیاندا بووە. . هەرواش لە رووەکانی تری وێژەدا ئەم بەهرە هونەرییەو زانایی وپتەوییەیان لە پەخشاندا دەرکەوتووە هەر وەکو ابوحمزة لە وتارێکیدا ئەڵێت:

شباب والله مكتهلون في شبابهم، عفيفة عن الشر أعينهم، ثقيلة عن الباطل أرجلهم، انضاء عبارة واطلاح سهر، فنظر الله اليهم في جوف الليل، منحنية أصلابهم على أجزاء القرآن كل مامر أحدهم بآية في ذكر الجنة بكى شوقاً اليها، وإذا مر بآية من ذكر النار شهق شهقة خوفاً منها كان زفير جهنم بين اذنيه موصول كلامهم بكلامهم، كلال الليل بكلال النهار، قد أكلت الأرض ركبهم وأيديهم وأنوفهم واستغلوا ذلك في حب الله. (١٥)

ئەم وردەکارییەی ابوحمزة دووبارەی رەنگدانەوەی باوەڕەکەیانەو بەم جۆرە ئەیەوێ لە هەموو کەسێکی بگەیەنێ کە شوراتەکان چی ئەکەن و چۆن هەمیشە بێگەرد خەریکی خواپەرستین کەروونی ئەکاتەوە کە خوا شەو درەنگە تەماشای کردن بینی سەریان بەسەر قورئاندا شۆرکردۆتەوەو هەریەکەیان کەباسی بەهەشتی لە ئایەتێکدا ئەخوێندەوە لەبەر ئەوەی کەزۆر حەزی لە بەهەشت ئەکرد لە خۆشیاندا دەستی بە گریان ئەکرد. . خۆ ئەگەر ئایەتێکیشی بخوێندایەوە باسی دۆزەخ و ئاگری تیابوایە هەروەکو بڵێسەی ئاگری دۆزەخ لە بن گوێچکەیاندابێ هەناسەیەکی دوورو درێژی هەڵئەکێشاو وەك گەیشتنی شەو بەرۆژ واتە رۆژ بوونەوە ئەوانیش قسەکانیان وا بە یەکتر ئەگەیان.

زەوی ئەژنۆو هەردوو بەریدەست و لوتیانی لەبەر زۆری نوێژکردن بردبووکارەکەش لەبەر خۆشەویستی خوا بووە.

یەکێتی شەپۆلە دەروونیەکەشیان ئەگەڕێتەوە بۆئەو مەبەستەیان کەپەسەند نەکردنی کەم و کوڕییە لەنیازە کەیانداو شاعیرێکیان لەم رووەوە ئەڵێت.

ولقـد مضـوا وانـا الحـبيـب اليـهـم
وهـم لدى احبـة ابـرار
قد يخلفنـي ويمضـي بهـم
بالهفـة كيف يفوتنـي المقـدار

لەم شیعرەشدا هەمدیسان رەنگدانەوەی بیروباوەڕی شوراتەکانمان بۆدەر ئەکەوێ کە خۆشەویستەکانی چۆن رۆشتوون و شەهید بوون و بەجێیان هێشتووەو ئەمیش چەندە پەرۆشیانە کە بیانگاتێو لێیان دوورنەبێ.

شاعیرێکی تریان ئەڵێ:

اخـوان صدق أرجيـهـم وأخـذلـهـم
اشكـو الـى الله خذلانـي لأنـصـاري

پارانەوەی شاعیرو تکا کردنی لە خوای گەورە تەماشا ئەکەین بۆ خۆیو بۆماڵی دنیاو قازانجی تایبەتی نیە بگرە بۆ ئەو هاورێیانەیەتی کە ئەم شەرمەزارە لایان.

ئەم یەك بوونـانــە ئەگـەر بارێكی راستـەقینـەی قوڵی‌یـان لە شیعـری شوراتـەكـانـدا بەجێ هێشتبێ. . لە یەكچوون دووبارە كردنـەوەشی‌یـان پەیـدا كردووەو كارەكەش دەسكردنیەو بگرە ئەمە بیروباوەڕی خۆیانە كەمەسەلەكە خوا پەرستیەو زیاتر هانی داون دژی دوژمنەكانیان بجەنگن. . عطیەی كوری ئەمەری لیثی ئەڵێ:

*وحــسـبـی من الــدنـیـا دلاص حصینـة*

*ومـغـفـرهـا یومـاً وصـدر قنـاة*

*واجـرد، محـبـوك الـسـراة مقـلص*

*شدیـد أصـالـیـة وعـشـر شراة*

ئەم شیعرە سەرلەنوێ كە باوەڕی شوراتەكانی تیاد یارە باسی پەیـەو شوێنی شوراتـەكـانیش ئەكـات و وەك ئەو شیعـرانەوان كە لەمومبەر لێیان دواین.

وەك ئەو شیعرەی سەرەوە عمروالقنا ئەڵێ:

*فحـسـبی من الـدنـیـا دلاص من حصینـة*

*واجـرد خیـار الـعـنـان تجـیـف*

*معـی كل اراه یری الـصـوم جسـمـه*

*ففـی الـجـسـم منـه تبـكـیـة وشحـوب*

ئەگەر بەوردی سەرنجێكی دارشتن و ناوەڕۆكی ئەم دوو شیعرە بدەیـن تەنیـا جیـاوازی‌یـەكی كەم لەنێـوان خواستی هـەردوو شاعیرەكـەدا هەیـە هیـچ شتێكی سەرەكی جیـاوازنیـەو خواستـە كەبەرامبەر دنیایە.(11)

لای شاعیـرەكـانی شورات یەك وێنـە زۆر روون و ئاشكـرا بەدی ئەكرێ كە ئەویش ئەوەیە ئەم ژیانی دنیای‌یەی كەهەیەتی نەیـەوی بیكـاتـە خزمەتی ئاین و قوربانی ئەوەو دنیاو لەم رووەوە یەكێكیان ئەڵێ:

*حتـی ابـیـع الـذی یفـنـی بآخـره*

*تبـقـی علی دیـن مرداس وطـراف*

تەماشـا ئەكـەین و وەك ئەم شیعـرەی لە سەرەوە نووسراوە ابو بلال ئەڵێ:

*انـی وزنـت الـذی یبـقـی بعـاجـلە*

*تفـنـی وشیـكـا فلاوالله ما اتـزنـا*

دیسان هەر لەوجۆرە شیعرو باوەڕو توانایەوە كە هەن و زۆر لە یەك ئەچن یان بڵێین لە یەك نزیكن رهین مرادیش ئەڵێ:

*انـی لبـائـع مایـفـنـی لبـاقـیـە*

*ان لم یقض رجـاء الـعـیش تربـیـعـا*

تەماشا ئەكەین شیعرەكان ئەگەر لە دارشتن و كێش و سەر وادا لە یەك نەچن بەڵام دووبـارە بوونـەوەیـان تێـدایـە ئەم دووبـارە بوونەوە یەش كە هێنامانەوە لە شیعری شوراتدا هەموو ئەگەڕێتەوە بۆمەسـەلـە هاوكـوێ‌یەكەیان بێ ئەوەی لە پلەی هونەری شیعرو ناوەرۆك و راستگۆییان كەم كاتەوە.

**زۆرانبازی لەگەڵ رۆژگارداو نمونەی كوڵ نەدانیان: ـ**

مەسـەلـەی ئاین لەم شیعـرانـەدا مەسـەلـەیـەكی سەرەكی‌یەو پایـەبـەرزیـانـەو ئەیانەوێ ئەو كۆششە روون بكەنەوە كەمرۆڤ لە خوای خۆی نزیـك ئەكـاتـەوەو وەك روونمـان كردەوە قوربـانی بەژیانی دنیایان بۆ ژیانی ئەوەو دنیایان ئەدەن وبەمەش دوونیشان ئەپێكن. . یەكـەمیـان بە خوا گەیشتنـەو دووەم چوونـە لای ئەو دۆست و برادەرانـەیـانـە كە شەهیـد كراون و ئەم گیـانـەشیان لە گەرمەی شەرەكانیاندا دەرئەكەوێ كە كردوویانەو دەربەست ئەوە نەبوون ئەكوژرێن یاخود ناكوژرێن. بەڵام ئەگەر لەگەڵ باوەڕی كۆمـەڵی موسـوڵمـانـانی تردا ئەم باوەڕەیـان بەراورد بكـەین. . ئەبینین كە ئەم كۆمـەڵانــەی تر بروایـان بەدان بەخـۆدا ئُرتن و درەنگـە بەرەو پیـری مردن چوون هەیـە كە رێگـە بۆسـەركـەوتن خۆش ئەكـات. . , بەڵام شوراتـەكـان بەپێچـەوانـەوە ئەیـانەوێ ئەومـاوەیـە كەم كەنـەوە كە لەنێـوان ژیـانی ئەم دنیاو ئەوەو دنیادا هەیـەو ئەمـەش بە جەژن ئەزانی. . تەمـاشـا ئەكـەین حویـرثی

راسبی ئەڵێ:

*اقـول لنفـسـي في الـخـلاء الـومـهـا*
*هبلت دعـوتـي قد مللت من الـعـمـر*
*ومـن عيشـة لاخيـر فيـهـا دنـيـئـة*
*ملمـمـة عنـد الـكـرام ذوي الـصـبـر*
*سأركـب حربـاء الأمـور لعـلـنـي*
*الاقـي الـذي لاق الـمحـرق من الـقـصـر*

بێ گومـان ئەم پارچـە شیعـرەش هەرئـە گەڕێتـەوە بۆشتـە سەرەکی‌یەکە، کە ئەویش ئەوباوەرە پتەوەیەکە بەخواو ئەوەو دنیا هەیانەو خۆزگەو ئاوات خواستنە بەوەی کە زووبگەنە هاوڕێکانی ئەوەودنیاو لەوێ لەبەردەمی خوادا بەدیداری یەکتری شادبین.

لەم هەڵوێستـەدا تاسـەیـەکی گەرم دیـارە بۆکۆچ کردن بەرەو ئەوەو دنیاو چاوی بەبرادەرە شەهیدەکانی بکەوێ.. لێرەدا مەزنی، باوەڕی شوراتــەکـانمـان بۆ دەرئـەکـەوێ کە چەنـدە پتـەوبـووەو نەیـانـویستـووە بەهیـچ جۆرێـك درۆ لەگـەڵ خۆیـان و خەڵکیدا بکەن.. تەماشا ئەکەین زیاد الأعسم ئەڵێ:

*أقيـم على الـدنـيـا كانـي لا اري*
*زوالا لهـاو أحـب الـعـيـش باقـيـا*

ئەمـە شیعـرەکـەی زیـاد الأعسم بوو کەبـەو جۆرە لەسـەرەوە چاومان پـێـی کەوت تەماشا ئەکەین هەر لەو بابەتە قەتەری ئەڵێ:

*الـى كم تغـاريـنـي الـسـيـوف ولا اري*
*مفـاراتـهـا تدعـو الـى حـمـامـيـا*

لە دووای ئەم شیعـرە لەم شیعـرەی خوارەوەدا کەپـوپـەی هونەری شیعری وزانایی‌و پەرستنی باوەڕەکەیانە دیسان عمران ئەڵێ:

*أفـي كل عام مرضـة ثم نقـهـة*
*ويـنـعـى ولا ينعى حتى ذا الى متى!!*

لەم رووەوە هەر بۆ ئەو خواستەی کە لە بیروباوەڕو وێژەکەیاندا شوراتەکان ئەگەیەنێتە یەك مەبەست ئافرەتێکی شورات ئەڵێ:

*احـمـل راسـاقـد بـئـمـت حمـلـه*
*وقـد سئـمـت دهـنـه وغـسـلـه*
*الا فتى يحمل عني ثقله؟*

کەواتـە بەخێـرایی (بـەرەو مردن چوون) لای شوراتـەکـان مەبـەستێکی گەورە بووەو هەر ئەمـەشـە بەگشتی وێـژەخـوازان بەتـایبـەتی‌و شوراتـەکـان بەگشتی هان ئەدات کە لە شەڕدا سڵ نەکـەن.. گەلـێ کۆمـەڵ لەم رێـگـەیـەیـانـدا دژ وەستـان.. جارێ بەبـۆنـە کێشانی جوانی ژیـان و جاری بەگـۆشـە گیـری گرتن وشـەر نەکـردن. بەڵام لای شوراتـەکـان بیـروبـاوەڕێکی نەلـەقیـو بوو... تەنـانـەت کە یەکی لەمەرجی باوەرەکـەیـان ئەوەیـە کە لەگـەڵ کوری ئەو میـرانە نابێ دابنیشن کەستـەمکـارن.. ئەوە بوو کاتێ کە سمیـرەی کوری جعـد لە کۆرەکەی حجاجدا دانیشت قەتەری ئەمەی بۆ نووسی:[12]

*فراجـع ابـاجـعـد ولا تك مغـاضـبـا*
*على ظلمـة اعـشـت جمـيـع الـنـواظـر*
*وتـب توبـة تهـدي الـيـك شهـادة*
*فانـك ذو ذنـب و لسـت بكـافـر*

لەم شیعـرە پتـەو وسـاکـار وچـاك دارێـژ راوەداکە ناوەڕۆکێکی ئاشکـراو بەهێـزی هەیـەو رای‌باوەڕی شورات دەرئەبڕێ بەرامبەر بەیەکێ کەهەڵەی هەیەو کافر نیەو هەڵەی گەورەی نەکردوە.

روونترین وێنەی یارمەتی نەدان ئەم بەراوردەی خوارەوە یەکە ئافرەتێکی شوراتی لە نێوان چێژی جنسی‌و ناخۆشی شەردا ئەیکات:

*مروا بـنـا نـرجـع الـى ديـنـنـا*
*فكـل ديـن غيـره بـاطـل*
*وملة الـضـحـاك متـروكـة*
*لا يجـتـبـيـهـا أحـد عاقـل*

هەندێکی تریان سەبارەت بەگۆشە گیریوەك ئەمەی خوارەوەیان وتووە!

*الالـيـت شعـرى هل ابـيـتـن ليـلة*
*بعـيـدا من اسـم الله والـبـركـات*

هاورێیانی ئەم شاعیرەواتە شوراتەکان هەرکە ویستبێتیان لە شوێنێکەوە بچنە شوێنێکی تر ئەمەقسەیان بووە. . لەسەر خواو گەورەیی خوا کۆچی خۆتان بکەن. . پاکانەی مانەوەی ئەم شاعیرەش دوورنیە کە نەخۆش بووبێ و نەیتوانیبێ لە گەڵیان بچێ یاخود ئەم شیعرەی لە کاتێکدا وتبێ کە بەرەو رووی جەنگێکی گەرم چووبێ لە بەرئەوە قسەکەی بە گۆشەگیری ویستن لە قەڵەم نادرێ.

تەماشائەکەین رادەی خواپەرستیان گە یشتۆتە سنوورێك هەمیشە خۆشەویستی و گەورەیی خوایان لەمێشکدا بووەو بیریان لێ کردۆتەوەو شەرمەزاری ئەوە دەرئەخەن کە هەناسەیەك ناوی خوای گەورەنەبەن.

وەك لێی دواین بێگومان گەورەترین شت واتە گۆشەگیری بەلایانەوە دوورکەوتنەوەیە لە بیرو باوەڕەکەیان و. . حصین ی کوڕی حفصەی سعدی ئەم کارەی کرد. . ئەویش ئەوکاتەبوو کە قەتەری کوڕی فجائەی بەجێ هێشت و ئەچێتەوە لای مەهلەب و ستایشی مەهەلەب و سەرزەنشتی قەتەری ئەکات و ئەڵێ:

*فلما ابـى الا الـلجـاج يقـتـلـنا*
*نظـرت وكـان الـمسـتـجـار الـمهـلب*
*عفـو عن الـذنـب العظـيـم كـانـه*
*لمن يرجـو الـعـفـو عن ذنـبـه أب*

ئەم هەڵوێستە لە هەڵوێستی هەندێ لە وشوراتانە ئەچێ کە حجاج بۆشەر ئەیانبات. . ئەوانیش بە شیعر ستایشی ئەکەن و ئەیانەوێ تۆبەو پەشیمانی خۆیان لەو باوەڕەدا دەرخەن کە بوویانە.

هات وچۆی قەتەری لەبەردەمی سوپاکەی مەهلەبدا جۆرە دوورکەوتنەوەیە لە ناوشوراتەکاندا پەیدائەکات و ئەم .هات وچۆو وئەم لاو ئەولاکردنە بەوە ناو ئەبەن کە گوایە خۆشاردنەوەیەو لەسەر ئەمە یەکێکیان بەم جۆرە سەرزەنشتی قەتەری ئەکات:

*هربـنـا مزيـد انـخـصّى من غيـر علة*
*ولـلحـرب نارا لاتـفـل ومـخـلب*
*فقـولا لأصـحـاب الـقـرآن نصـيـحـة*
*دعـوا الظـن ان الظـن بالـنـاس يكـذب*

ئەبینین کە سەرزەنشتێکی خۆکردن هەیە بێ ئەوەی کە لەو سەر زەنشتە بترسێ و نەیلێ و ئەبێ بیلێ چونکە راست گۆیەو درۆ نازانێ و بەم جۆرە تەنانەت لەگەڵ سەردارەکانیان یەکێکی کەیان ئەڵێ:

*أيـا قطـرى الـخـيـر ان كنـت هاربـاً*
*سـتلحـقـنـا عاراً وانـت مهـاجـر*
*فحـتـى متـى هذا الـفـرار مخـافـة؟*
*وانـت ولـى والـمـهـلب كافـر*

ئێمە کە لێرەدا ئەم کارە ناو ئەنێین (گرێی مەهلەب) لەدڵی شوراتەکاندا ئەبێ تۆزێ بۆی راوەستین چونکە پێش هەموو شتێ ناتوانین بەرپەرچی ئەوە بدەینەوە کە شوراتەکان گەلێ کارەسات و نووشوستیان بەدەست مەهلەبەوە تووش هات و مەهلەب بەلایانەوە شتێکی سامناك بوو. . ئەگەر ئەم شیعرانە راست بن کە وادراوەتە پاڵیان. . ئەوەمان بۆ دەرئەخەن کە نەیانتوانیوە ئەم ترسەیان دەرنەخەن. . لەم رووەوە عبیدە کوڕی هلال ئەڵێ:

*ليس لنـا في الأرض منـه مهـرب*
*ولا اسـمـاء ايـن ايـن الـمـذهـب*

دیسانەوە لێرەشدا کە شاعیرەکە وتوویەتی ئەو راستییەیە کە زۆر جوان و رەوان دەری خستووەو نەیتوانیوە بیشارێتەوە. . چونکە شاردنەوەی ئەم کارەی بەلاوە خۆخەڵاتاندن بووە.

هەروەهــا قەتــەریش خۆی ئەم ترســەی بەرامبــەر مەهلەب دەرئەخات و ئەڵێ:

*ولـكـن منيـنـا بالـمـهـلب انـه شجي*
*قاتـل في داخـل الـحـلق منـشـب*

ئەم راستی دەربڕینە ترس نەبووە بگرە بەلایەوە پیرۆز بووەکە دەری بڕێ.
لە شوێنێکا ئەڵێ:

*الـم ترنـا والله بالـغ أمـره*
*ومـن غالـب الأقـدار لاشـك يغـلب*
*رجـعـنـا الـى الأهـواز والـخيـل عكـف*
*على الـخـيـر مالـم ترمـنـا بالـمـهـلب*

دیسان ئەڵێ:

*ان شجانا من الوغى المهلب*(13)

بەم جۆرە سوارچاکی و تواناو ئازایەتی و لیهاتوویی دەرئەبڕن و قەتەری وەك ئەم راستیانە دەرئەخات دووبارە باسی پاڵەوانێتی و ئازایەتی مغیرەی کوری مەهلەب ئەکات و ستایشی ئەکات..
بەڵام ئەوپرسیارەی کە دێتە پێشێ ئەوەیە ئایا بەمێشکا ئەچێ کە ئەم هەموو شیعرانەی کە لەبەردەمی مەهلەبدا راکردن دەرئەبڕن لەلایەن شاعیرانی شوراتەوەوتـرابن؟ بەلای ئێمەوە ئەم شیعرو سەرگـوزەشتـانـەی داستـانی ئەزدییەیـان پێدروست کراوە
دەست کردبن ئەوراکردنانەیان هەموو بۆ دروست کردوون..
چونکە وشـەی خارجی هەنـدێ جار بەوکـەسـانـەش وتـراوە کە شورات نەبـوون و وشـەکـەش واتە بەرهەڵستکاری دەسەڵاتدارو لەوە ئەچێ کە ئەوشتانەی دەربارەی هەندێ خارجی گێڕاونەتەوە کە لە بەردەمی حجـاجـدا بوون.. شورات نەبـوون.. ئەو خارجیـانـە بووین کەبـاوەڕی خارجیـان بووەو ئەگـەر ئەم دووشتە بەراورد بکـەین باوەڕ بەو شیعـرانـە ناکـەین کە دراونـەتـە پاڵ شوراتەکان و پڕن لە بێ دەسەڵاتی هی شوراتەکان خۆیان بن.

ئەمەش ئەوەناگەیەنێ کە مرۆڤ ترس لەدڵیانە.. بەڵام شتەکە ئەوەیە کە شوراتەکان بۆ ئەوە چوونەتە جەنگەوە کە زوو شەهید بکرین..

**شیعری شورات و رەخنە لەژیان: -**

ئەبێ باسی یەکدگیری نێوان باوەڕی شورات و شیعرەکانیان و لایەنی باش و خراپی شیعرەکانیان بکرێ کە لەو یەکدگیرییەوە سەریـان هەڵـداوەو باشتـریش وایـە دەربـارەی ئەو شیعرانەی کە رەخنەگرتنن لە ژیان و دەرخستنی خەوشەکانی دەوڵەتە بڵێین ئەو جۆرە رەخنانە شۆڕشێکە دژی تالان و برۆو کۆکردنەوەی دارایی لەم شیعرەی طرماح دا دیارە.(14)

*عجبـا ما عجبـت للجامع الـمـال يبـاهي به ويـرتفـده*
*ويـضيـع الـذي يصيـره الله اليـه فليس يعتقـده*
*يوم لاينفـع المخـول ذا الثـروة خلاتـه ولا ولـده*
*يوم يؤتى به وخصمـاه وسط الجن والأنس رجلهويده*

شوراتـەکـان هەروەك لێیدوواین کە شیعـرەکـانیـان رەنگـدانـەوەی بیـروبـاوەڕەکـەیـانـەو گەش و روونی ئاینـەکەیانەو هەرچیەك لە مێشکیاندا بووبێ بەرامبەر بە خەلافەت و خەڵك و دارایی دنیا بێ درۆکردن دەریان بڕیوە ئەمەش رای خۆیانە.
عمران کوری حطان ئەڵێ:

*حتـى متـى تسـقـى الـنـفـوس بكأسـهـا؟*
*ريـب الـمـنـون وانـت لاو ترتـع*
*فتـزورت لـيـوم فـعـرك راتـبـا*
*واجـمـع لـنـفـس لايـغـيـرك تجـمـع*

تەمـاشـا ئەکـەین لێـرەدا رەخنـەیە.. ئەدەبی شوراتیش لەبەر ئەوەی هەمووی لەومێشکەوە هەڵقوڵاوە کە تەرخانی باوەڕەکەیانە کە ئەویش رایـانــە بەرامبــەر بە خەلافـەت و بەهــەڵـەی گەورەو بچوك و بەرامبەر بە ژیانی ئەم دنیایە لەبەر ئەوە رەخنە بەرامبەر

دەوڵەمەندەکان لە شیعرەکانی شوراتدا کەمەو رەنگە ئەمە سروشتی شوراتەکان خۆیان بێو شیعرەکان لە دەست نەچووبن.

ئەمەش لەوەوە هاتبێ گومان لە جیاوازی هەژارو دەوڵەمەند نەکەن و یەکتر خۆشویستنیان وایان لێ بکات زیاتر لەوە نزیکیان بکاتەوە کە بیر لەوە نەکەنەوە دژی دەوڵەمەند شۆڕش بەرپا بکەن و شاعیرێکی شورات ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| متزاحمین ذوو یسارهم | یتعطفون علی ذوی الفقر |
| وذوو خصاصتهم کأنهم | من صدق نعتهم ذوو وفر |
| متجملین بطیب جثمهم | لایعلمون لبنوة الدهر |
| فکذلك مثریهم ومقترهم | اکرم بمقترهم وبالمثری |

وەك دەرئەکەوێ کردەوەی دەوڵەمەندەکانیش ئەو کردەوانەی ناپەسەندبوون شوراتەکان نەیانتوانیوە لە ئاستی بێ دەنگە بن و فەرامۆشی بکەن و ئەمەشیان بەلایەنێك لە پێویستێ سەرشانی هەموو مرۆڤێکی موسوڵمان زانیوە کە پێی هەڵسێو لێی دوور نەکەوێتەوە چونکە کارێکی ناپەسەندەو کاری ناپەسندیش ئەبێ باسکرێ جا ئەگەر شیعری شورات ئەگەڕێت و باسی دەوڵەمەند نەکات و رەخنەیان لێ نەگرێ ئەوالەبازنەی شوراتی ئەباتە دەرێ.. بەڵام زۆربەتوندی دژی خەوشەکانی تری کۆمەڵایەتی وەك دوو زمانیو فیزو مەرایی کردن رائەوەستێ چونکە لەناو ئەو کۆمەڵەدا کە لەدەوریان بووە ئەو ناکۆکیانەیان زانیوە کە بوون و باوەڕی پتەویشیان بەباوەڕەکەیان وای لێ کردوون کە دیاربن لە خەڵکی کە جیان.. چونکە تەماشا ئەکات سەربازێکی خارجێ بۆنان پەیداکردن ئەمڕۆ شان بەشانی کوڕی زوبێر شەر ئەکات و ئەشزانێ کەوائەمری باوە رهێنەرانەو ئەگەر داوای لێ بکرایە باسی عبدالملك بکات سەرزەنشتی ئەکردو قسەی پێئەوت کەچی دوای کوشتنی کوڕی زوبێر بەرۆژێ ئەچووەوە پەنا عبدالملك.

شوراتەکان ئەم سەربازانەیان ئەوکاتە تاقی‌کردەوە کە بەناوی کوڕی زوبێرەوە خۆیان ئامادە کردبوو بێ ئەوەی ئاگاداری کوشتنی بن پرسیاریان دەربارەی کوڕی زوبیرو عبدالملك لێ کردن ستایشی یەکەم وسەرزەنشتی دووەمیان کردوبۆ بەیانی کە زانیان کوڕی زوبێر کوژراوە یەکسەر بوونە لایەنگری عبدالملك وشوراتەکان گاڵتەیان پێئەکردن و هەواڵی خەلیفەی تازەیان لێئەپرسین ئەوانیش نەیان ئەزانی چ وەڵامێك بدەنەوە.

ئەم ژیانە بەلای ئەوانەوە کەبەجۆشەوە لە رێی باوەڕدا خۆیان بەکوشت ئەداو بەهەلیان ئەزانی واتە بەلای شوراتەکانەوە سەیربوو کەلە کۆمەڵگەی دوژمنەکانیاندا بەرچاویان ئەکەوت و ئەوەشی کەوای لە عمران کرد رەخنە لەم لایەنە بگرێ ئەوە بوو گوێی لێبوو هەندێ سەربازی خارجی ئەڵێن:

لەبەرچی شەڕ لەگەڵ شوراتەکاندا نەکەین؟ ئایا مووچەکەمان هەروەك جاران نیە؟ تامووچەمان بدەنێ شەڕ ئەکەین.. عمران بەگاڵتە پێکردنەوە لەم رووەوە ئەڵێ:

*فلو بعث بعض الیهود علیهم*
*یؤمهم او بعض من قد تنصروا*
*لقالوا رضینا ان اقمت عطاءنا*
*واجریت ذلك العرض من برکمو ا*

عمران وەکو زانایەك گاڵتەی بەو نەزانانە دێ کە هەر بۆ ئەوە ئەژین و تاوان ئەکەن کە پارە وەرگرن.. ئەوانەی کە هەرهیچ لە باوەڕی شورات و ئاینی موسوڵمانەتی تێنە گەیشتوون.

دووبارە عمران دژی ئەو مەراییکردنە وەستاوە کە بۆ پارە وەرگرتن لەناو شاعیرانی ئەو سەردەمەدا بڵاو بووبووەو ئەڵێ:

*ایها المادح العباد لیعطی*
*ان لله ما بایدی العباد*
*فاسال الله ما طلبت الیهم*
*وارج فضل المقسم المراد*
*لاتقل في الجواد مالیس فیه*
*وتسمی البخیل باسم الجواد*

ئەم شیعرانە سەرزەنشتێکی تەواوی ئەوانەیە کە بێ ئەوەی بیر لە بەخششی ئەوخوایە بکەن کە بەلای شوراتەکانەوە زۆر

*مەزن و پیـرۆزە. . دێن ستـایشی ئەم وتـەو ئەکـەن درۆکـان و خەوشەکانیان بۆ پارە یاخود پایە ئەشارنەوە.*

لە رەخنەی سیاسیشدا عمران دیسان ئەڵێ:

*حتـى متـى لانـرى عدلاً نعـيش بە*
*ولا نرى مدعـاة الـحـق اعـدانـا*

رەخنەکەی عمران تەنیا بەرامبەر ئەو شوراتانە نیە کە هەبوون بگرە بەرامبەر هەموو مرۆڤێکدا کە دادوەری بەچاونابینێ.

ئەبی بلال مەرداسی کوڕی ئەدیە ئەڵێ:

*وقـد اظـهـر الـجـور للولاة واجـمـعـوا*
*على ظلم أهـل الـحق بالـغـدر والـكـفـر*

لێرەشـدا تەمـاشا ئەکەین رەخنە گرێکی زانایانە سەرزەنشتی کاربـەدەستـانی ئەو سەردەمـەی کردووە کە چۆن ستـەمیـان لەکەسانی باش کردووە.

ئەبێ دان بەوە دابـنـێـیـن کە شیـعـری شورات لە هەمـوو دەستـەکـانی تری ئاینی موسـوڵمـان رەخنـەی کۆمـەڵایـەتی بەوە خرۆشـان کە گیـانی دەمـەتـەقێی کۆمەڵایەتی زیاترتێدا بووە کە پێویستێ بەلێکۆڵینەوە هەیەو ناوە رۆکی شیعرەکان هەرلایەنە لە خاڵێکدا بەیەك ئەگەنەوە.

ستایشیان بەزۆری بۆ ئەو هاورێ‌و برادەرانە بوون کە لە رێی باوەرەکـەیـاندا شەهید بوون و سەرزەنشت و رەخنەشیان بەرامبەر گیانی پشت بەردان و دوودڵی‌یەو سەرزەنشت و رەخنەیەکی زۆر هەڵـکـەو توون و ئارەزووی شەهیـد بوونـەو لە چوار چێـوەی باوەرەکەیان نەچۆتە دەرێ.

ئەگـەر رێمـان هەبێ بتـوانین بڵێین کە ئەو شاعیـرانـە بەشی زۆریـان شیعـریـان نەکـردۆتە پیشە. . ئەمەش هۆکەی ئەوەیە کە دیوانی شیعریان دەست ـ ناکەوێ وئەوەشی کە دیوانی دەست بکـەوێ عمـران کوڕی حطـان و طرمـاح کوڕی حکیم و. . دیـوانـەکـەی طرمـاح مان دەست کەوت بەڵام چەنـد شیعرێکی عمـرانمـان دەسکـەوت. . دووریش نیـە قەتـەری کوڕی فجائە شیعـری زۆری وتبێ‌و رەنگـە دیـوانێـك پێکبهێنێ. . ئەوە هەیـە نازانین ئایا هەن کە شیعرو سەرگوزەشتەکانی ژیانی کۆ کردبنەوە.

شیعـری شورات چاوپـۆشی لە کەس نەکـردووە. . وەك لە ناوەرۆك و دارشـتـنـدا توانـای هەیـە بریتی‌یـە لە راست گۆی دڵسـۆزی‌و ئەمـانـەش بوون کارێکی ئەو تۆیان کردووە دۆستان و لایەنگیرانی ئەم جۆرە شیعرە دەماودەم بیگێرنەوەو بەدڵ بیپارێزن و ئەمـەش دوولایـەنی بووە. . واتە شیعرەکە دەست بەردارنەبوونی تەواو ـ یان نیمچـە تەواوی نێـوان هونـەرو باوەر. لەیـەکتـری‌و دەست بەردارنەبوونی تەواوی نێوان شیعرو ژیان لەدەست دان و شیعـری شوراتـەکـان لەم دوولایـەنەوە بەگشتی لە خۆیا خەڵاتی ئەوشتە ئەکات کە تەقەلای لە رێگەدا ئەودرێ‌و ئەمەشە کە نهێنی هێزداری شیعری شوراتە.(15)

تەماشا ئەکەین لێرەدا لەناوچوونی ئەبو بلال مەرداسی کوڕی ئەدیە شوێنەوارێکی گەورەی لەدڵی شوراتەکاندا کردۆتەوەو کە ـ ئەدیە دایکی بووەو (وتراوە کە باپیری نەخوێندەوار بووە) باوکیشی کوڕی عمـرو کوڕی عبـیـدی کوڕی کعـبی تەمیمی بووە لە صفین دا لەگەڵ علی بوونە حکیمی پەسەند نەکردوو لەشەری نەهـرەوانـدا شەهیـد کراو لای شوراتەکان نوشوستی‌یەکی گەورە بوو چونکـە دوای صەحـابـەکانی نەهرەوان و نەخلە بە (نیشانەی پیـاو چاکـانیـان)دا ئەنـاو ئەیـانوت نموونەی پیاو چاکانی لە خوا ترسـەو دووربین و ئەوەنـدە هەستی ناسـك بوو یەکێ پیرۆزبایی شتێکی جوانی حوشتـرەکـەی لێ بکـردایـە وای لێ ئەهـات لە هۆش خۆی بچێ چونکـە بەم پیـرۆزبـایی لێکـردنـە ئاگـری دۆزەخی ئەهاتە بەرچاو. ئەو کوشتنە. . واتە شەهید بوونی ئەبا بلال کە بەو جۆرە کاری تێکردن دوو هۆبوو:(16)

یەکـەمیـان: ئەبـا بلال وەك شوراتـەکـانی تر نەئـەچـووە ناوخەڵکی‌و حەزی بەوچوونە نەئەکردو گۆشەگیر ئەژیاو بەرەولادی بەخـۆی‌و ئاینـەکـەیـەوە بێ ئەوەی لە رێگـە بتـرسێ‌و یان ئازاری موسـوڵمـانێك بدات بصرەی بەجێ هێشت و گۆشەگیریەکەشی‌و بەجێ هێشتنی بصرەی بە یەکێ لە شوراتەکان بەراورد ئەکەن کە

هەردوو پەل و هەردووولاقیان بڕیو لەبازاردا فڕێیاندا. . ئەبو بلال ئەیوت: خوازەوی بۆموسوڵمانان داناوە کە خواپەرستی نەگەلدابێ.

دووەم: ئەوشێوازەی کە ئەبو بلالی لەسەرکوژرا تاڵ و ئازاراوی بوو. . ئەمەش نامەردییەك بوو کە ئەمەویەکان کردنیان. . چونکە کاتی کە ئەبا بلال بەدەستەیەکی کەمی شوراتەوە شەری لەگەڵ سوپایەکی گەورەی ئەمەویدا ئەکرد. . هەردوولا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە بۆ نوێژی نیوەڕۆ واز لەشەر بهێنن و نوێژەکانیان بکەن و کە لێبوونەوە شەربکەنەوە. . بەڵام ناپاکی سوپای ئەمەوی ئەوە بوو لە کاتی نوێژکردندا هێرشیان بردنە سەروو هەموویان کوشتن و سەرکردەی سوپای ئەمەوویەکان کە ئەودەستە بچکۆلەیەی شوراتی کوشت عیادەی کوڕی عەلقەمە بوو بە (ابن اخضر المازنی) ناسرابوو.

شاعیرەکان بۆ ئەم دەستە شەهیدکراوە کە دوایی لێی ئەدوێین زۆر ئەلاوێننەوەو تەنانەت هەندێ کۆمەڵی موسوڵمان وەك موعتەزەلەو شیعە بەهی خۆیانی ئەزانن و شوراتەکانیش لەو شەهیدانەیان زیاتر کە لەنەهرەوان شەهید کران کەسیان نەبوو شان لە شانی ئەبا بلال بدات.[17]

مەرداسی شورات ئەڵێ:

*ابعد ابن وهب ذی النزاهة والتقی*
*ومن خاض فی تلك الحروب المهالکا*
*احب بقاء أو أرجي سلامة*
*وقد قتلوا زید بن حصن و مالکا*

عبیدی کوڕی هلال بۆ محرزی کوڕی ئەلاوێنێتەوە:

*اذا ذکرت نفسی مع اللیل محرزا*
*تأوهت من حزن علیه الی العجز*
*ثوی محرز والله أکرم محرزا*
*بمنزل اصحاب النخیلة والنهر.*

شاعیرەکان ئەو شوێنانەی وەك نەهرەوان و نخیلە کە شەریان تێدا کردووە لە شیعرەکانیاندا باسی ئەکەن و لە بیر خۆیان نەبردۆتەوە ئەمەش وادیارە بۆ ئەوە بووە کە هەمیشە ئەو خوێنە ڕژاوەی لایەنگیرەکانیان لە بیر نەکەن و پشتاوپشت بۆنەوە تازەکان ئاشکرا بێ کە باوباپیران و کەس وکاریان لەپێناوی ئەو باوەڕەیاندا لە ناو چوون کە ئەمڕۆنەوەکان لە سەری ئەڕۆن و خوێیانی لە ڕێدا بەخت ئەکەن. . هەروەها هەندێ ناوی خۆشەویست و سەردارانیان زیندو هێشتۆتەوە.

عیسی کوڕی فاتك دەربارەی شوراتەکان وتویە:

*فلما اصبحوا صلوا وقاموا*
*الی الجرد العتاق مسومینا*
*ألفا مؤمن فیما زعمتم*
*ویهزمهم بآسك أربعونا*
*کذبتم لیس ذاك کمازعمتم*
*ولکن الخوارج مؤمنونا*
*هم الفئة القلیلة غیر شك*
*علی الفئة الکثیرة ینصرونا*

شیعرەکە ڕەخنەیەکە لەوانەی گرتووە، کە دوژمنی شوراتەکان بوون و دان بەوە دائەنێ کە شوراتەکان نوێژکەر بوون و باوەڕیان بەخوا زۆر پتەوەو ئەوەشی ئێوەئەی دوژمنانی شوراتەکان و ووتانە کە ژمارەی شوراتەکان لەمەیدانی جەنگدا زۆرتر بووە لە دوژمنەکانیان درۆتان کردوو لە باسك ئەوان (واتە شوراتەکان) دوو هەزار کەس بوون و ئێوە چوار هەزار چەکداربوون کەچی ئێوە شکان و خۆتان پێڕاگیر نەکراو ئەو بەشەکەمە لەبەر ئەوەی بەباوەڕەوە ئەجەنگان توانیان بەسەر بەشێکی زۆردا سەرکەون. . ئەمەش ڕاستیەکە لەو ڕاستیانەی کە لەشۆڕشەکانی شوراتدا دیار بووە.

بەم جۆرە شیعری شورات شوێنی وەك نەهرەوان و نەخیلەو باسك باس ئەکات و هۆی ئەم کارەش ئەوەیە کە شاعیرەکانیان وەك جەنگاوەرەکانیان بۆ دوژمنەکانیان چوونەتە مەیدانەوەو چەکیان بووەو قەتەریو ئەباحەمزەو شبیب و نافعی کوڕی ئەزرەق

وەك جەنگــاوە ربــوون شاعیــریش بوون و قەتــەری خۆی زۆر بەروونی سوار چاکیو سڵ نەکردنی شوراتەکان باس ئەکات.

بێجگــە لەم لایــەنــە کە تێکـەڵی شیعـرەکـانی شوراتـە. . ئافـرەتیش دوویـارە تێکـەڵی ئەو شیعـرانە بووەو قسەکانی عمران کوری حطـان کەبـاسی غەزالـەو کچەکانی ئەکات و قەتەری کە باسی دایکی حەکیم و طرمــاح کە باسی مسلمــە ئەکــات ئەم لایەنە روون بۆتەوە چونکە ئافرەتیش هەروەك پیاو چۆتە مەیدانی جەنــگ و تووشـی زەبــروزەنــگ و کوشـتن و برین و ئەو تالان برۆیـانـەی کە لەلایـەن والیـەکـانـەوە ئەکـراو لەوەوبەر موسوڵمان بەخـۆیـەوە نەدیبـوون و. . یەکـەم ئافـرەتیش لە شوراتـەکـان کە شەهید کرا.

(ئەگەر یەکەم ئافرەت بووبێ) دایکی عمارەی کوری یاسربوو.[18]

ئەم کاری هاتنە مەیدانی ئافرەتی شورات دژی دوژمنەکانیان زۆربـەهێـزبـوو وسـەردەمی پەیدابوونی بیروباوەرەکەیان پەیدابوو لەوەوبەر سەرەتای بڵاو بوونەوەی ئاینی ئیسلام ئەمە زۆردەگمەن بوو. . . ئەوەشی کە ئەم راستییە دەربخات سەر گوزەشتەکانی شەهید بوونی غەزالەو دایکی حەکیم و ئەوانەن کەنە ناسراون کە یەکێکیان ئەو ئافرەتەیە تۆڵەی کوشتنی نافعی کوری ئەزرەقی لە جەنگا وەرگرت و ئافرەتانی وەك بلجاءو قطام و کحیلە.

شوراتەکان دەستیان نەئەرۆیو بەزۆری ئەو دەوارنشینانە بوون کە ناکۆکی هەمیشە هۆزایەتی بەتوندی سەردەمی خۆیان راپێچی ئەکــردن و خۆشیــان دەمــارگیـری هۆزایـەتیـان هەبـوو. . ئەم هەستــەشیــان دیســانـەوە لە زۆر شیعـری طرمـاح دا پچـڕ پچـڕ گێـرراونـەتـەوەو دیـارن. ئەمەش قسـەی مقصلەی کوری عوتبەی شەیبانییەکە دەرکەوتوویەکی شوراتەکانە ئەڵێ:

*وبــلغ امــیـر الــمؤمـنــیــن رســالــة*
*وذو الــنــصــح ان لم یرع منــك قریــب*
*فانــك ان لم ترض بکــربــن وائــل*
*یکــن لك یوم بالــعــراق عصــیــب*
*ولا صلح مادامــت منــابــر أرضــنــا*
*یقــوم علیــهــا من ثقــیــف خطــیــب*

قسەکانی دەربارەی خۆیو هۆزەکەیو گەورەکانی. . دەربری ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییە کە تیا ژیاوەو بەلای دەمار گیرێتی هۆزدا چوونە.[19]

شوراتــەکــان لەلایــەن کاربـەدەستـانی دەوڵـەتی ئەمـەویو شیعەکانەوە چەوسێنراوەو چارەنەویست بوون. . تەنانەت یەکێکی وەکو ئەبا ایوب الأنصاری کە لە رێگەی خزمەتی ئاینی ئیسلامدا هەرگیــز شەری نەکــردووە شەری لەگــەڵـدا کردون و لەلایـەن شیعـەکـانیشـەوە بەکافردا ئەنران و قسەیان پێ ئەوتن وەك «دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە ئەودەرگایەی کە زۆرتر ئاگری تێدایە دەرگای شوراتەکانە. . لەگەڵ ئەوەشدا ئەم لایەنانەی سەرەوە لە شیعری شوراتـەکـانـدا دیارنین و شیوەن و شەپۆریان درووست نەکردووەو بەپێچەوانەوە هێزی خۆراگرتنیان پێ پەیدا ـ کردوون بەرامبەر بەو دۆخەی کە تیایدا ئەژین.

بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە هۆی لە ناو چوونی بەشی زۆری شیــعــرو ئەدەبیــات و گۆریـن و دەسـکــاری کردنـی قســەو نووسینـەکـانیـان ئەگـەرێتەوە بۆ ئەم چەوساندنەوەیە کە شیعەکان دەستێکی زۆریان لەمەدا هەبووە وەك ئەبا فرجی شیعە کە زۆری بەوجـۆرە نووسیـوەتـەوەو دەسکـاری کردووەو هەرئـەمـەشـە هۆی لەناوچوونی شاعیرو شیعرە بەناوبانگەکانیان.

تەمـاشـائـە کەین ئەبـا فرجی ئەسفـەهـانی (عمـر الغناء) ئەهێنێتـە رێــزی عمــران و لەیـەك پایـەدا دایـان ئەنێ ـ بەڵام شەهــرستــانی عمــران بزرئــەکــات و ناوی ئەم جۆرە کەســە ناهێنێ. . جا ئەگەر ئەم عمرەمان دەست کەوت و زانیمان چۆن شایــەنی ئەوەیـە بخـرێتـە ریـزی عمـران ئەوا شتی ترمـان زۆر بۆرزوون ئەبێتـەوە بەڵام رەنگـە لەنـاوەکـەی زیاتر هیچی تری لێ دەست نەکەوێ.[20]

پیاوی وەك عمرالغناء زۆر بوون وبەناوبانگترینیان ابوحمزەی ئەباضیەی شورات و پاڵەوانی رووداوی (قدید)ەبوو لەگەڵ طالب الحق لە کۆتایی دەوڵەتی ئەمەویدا دژی مروانی کوری محمد

راپـەڕیو ئەم ابـوحـمـزە یەزمـانـیـكی زولاڵ و پاراوی بووەو وتارەكانیشی هەندێكی دەماودەم ماونەتەوە كە بەگۆرانی وتراون.

ابـوحـمـزە خۆی لە بصـرە لای زانایانی شورات خوێندویەتی بەڵام لایـەنـگـیـرانی عیـراقیو دانیشتـوانی خواروودورگـەی عەرەب وتەتەرو حیجازی بوون و مەیدانی جەنگیشی لە حیجاز بوو. لە یەكێ لەوتـارەكـانـیـدا ئەو وتارەیە كە بۆخەڵكی مەدینەی ئەدات و لەسەرئەوە رەزیلیان ئەكات كە شوێن هەموو حاكمێك ئەكـەون و لەبیـروبـاوەڕەكـەی خۆیـان لائـەدەن وەڵامی ئەوەیـان ئەداتــەوە كە پێیـان ئەوت لایـەنگیـرەكـانت لاون و بەرگـری لەلایەنگیرانی خۆی ئەكات و ئەڵێ ئەوانەی كە لەگەڵ (پێغەمبەر) (د. ح) بوون لاوبوون و مەبەست ئەوەیە كە ئەمانە هەموو ئەو باوەڕەی هەیانە توندەدەستیان پێوەگرتووەو خۆیانی لە رێدا شەهید ئەكـەن بەم جۆرە بەرگـریـان لێ ئـەكـات تائـەگاتە بەشێكی زۆر دەوڵــەمــەنــدو تێــرو یەكـەم ئەدیبی شوراتـە یەكـەم كەسـە كە بەدووروودرێــژی باسی كارەكــانی كردوون و بەتـونـدیو بەهێـز رەخنەی لێ گرتوون.

مامۆستا هانی علوی لە لێكۆڵینەوەیەكیدا دەربارەی ابو حمزە دەمـەتـەقێ لەگـەڵ رۆژهـەڵاتنـاسـەكان ئەكات كە هاوچەرخن و نموونەیان بۆ ئەهێنێتەوەو ئەدەبی شوراتەكان بەتێگەینی ئێستەمان بەئەدەبی پێشكەوتوو شۆرشێك لە قەڵەم ئەدات بەسەر ئەو واقیعە كۆمـەڵایـەتیـیـە جیـاوازەی كە بووەو ئەڵێ: بەڵام لێكـۆڵینـەوەی ئەدەبی ابـوحـمـزە ئەم كارە تازەیـەمـان ئەداتە دەست. گەرچی وتارەكانیشی لە دوان سیانێك زیاتر نەماون و ئەڵێ:

ئەی خەڵكی مەدینە بیستومە سەرزەنشتی ئەوەی منتان كردووە كە هاوبیـروبـاوەڕەكـانم لاوی منـداڵ و دەوارنـشـیـنـی پێـیـەتین. كورە. ها. پێتـان ئەڵێم ئایـا سەحابەكانی كە لەگەڵ پێغەمبەردا بوون «د. خ» لاوی منداڵ نەبـوون؟ ئەولاوانـەی هەر لەلاویـانـدا پیـربـوون و خراپـەچاوی لێـڵ كردبـوون و هیــچ ویـووچی لاقـەكــانی گران كردوون ئەوكـەســانــەیـان فرۆشتــووە كەسیـەینێ بەوكـەســانــەی كە هەرگیز نامرن. قسەكانیان تێكەڵی ماندوو بوونیان و شەویان بەسـەر شۆر كردنـەوە بەسـەر قورئـاندا تێكەڵی رۆژ ووی رۆژیان كردووە، هەركە ئایە تێكیان بخوێندایەوە ترس و لەرزی تێدا بوایە لە ترسی ئاگـری دۆزەخ هەنـاسـەی خەفـەتبـاریـان هەڵئـەكێشاو ئایـەتێكشیـان بخـوێنـدایـەتەوە كە باسی خۆشیو بەهەشتی تێدا بوایـە هەنـاسـەی ئارامیـان هەڵئـەكێشاو كە تەماشای شمشێریان ئەكرد هەڵكێشراوەو رمەكان ئامادە كراون و تیرەكان لە كەواندان و مردن نزیكیان ئەبێتەوە گاڵتەیان بەمردن كرد. هەر ئەوە ئەڵێم كە خوا لە كەم و كورتیمان بمانبەخشێ. (21)

شان بەشـانی جۆشی ئاینیـان كە چووبووە ناخی مێشكیانەوەو بەرچـاویـانی روونـاك ئەكـردەوە شوراتەكان لە هەندێ هەڵوێستا ئەنجـامی ستـەمكاری كاربەدەستان دژ ی ستەمكاری ئابووریش وێستـاون وئێمـەش چەنـد برگەیەك لە وتارەكەی ابی‌حمزە لێرەدا بڵاو ئەكـەینـەوە كاتێ كە لە كۆتـایی دەسـەڵاتی ئەمـەوییەكاندا مەدینەی داگیر كرد بۆخەڵكی مەدینەیدا ووتی:

ئەی خەڵكی مەدینـە ـ ئەوانـە دەربـارەی دڵسـۆزیتـان لێـیـان پرسین ئایا بە گومان كەس ئەكوژن. وتتان بەڵێ. وتیان ئایا ماڵی ناموفت و شتی ناموفت موفت ئەكەن؟ وتتان بەڵێ.

ئەی خەڵكی مەدینە ـ ئەو هەشت بەشەم پێ بڵێن كە خوای خۆشەویست لە قورئاندا بەسەر هێزدارو بێ‌هێزدا سەپاندوویەتیو باشە نۆیەم هەیە كە لەگەڵ هەشتەكەدانیەو تەنانەت بەشداریەكی كەمیش نیە لەوو ئەم هەشت بەشە هەڵی گرتووە بۆخۆی؟!.

لێرەدا رەخنەكە بەرامبەر بێ‌دەنگی خەڵكی مەدینەیە بەرامبەر بەو سیاسەتەی كاربەدەستانیان هەیانبووە وبەم جۆرە رەخنەیان لێ ئەگرێ:

1 ـ سیاسەتی تاڵان كردن و دەست بو ناموس بردن.

2 ـ دەسەڵاتداریتی چینی دەوڵەمەندەكان و؛ ئەمەش لەكاتی باج وباج كاریدارەنگ ئەداتەوەو سەركردەی شوراتەكان ابوحمزە وتی: بەخشین لە باج بەلایەن دەوڵەمەندەكانەوە شتێكی ساكارەو كەچی خۆشیان خاوەنی زەویو زارن و هەژارەكان هیچ كەڵكیان لەو باج و باج كارییە نەبینیو نەبەخشران. بەم جۆرە ابوحمزە كارەكــەی روون كردەوە كە باجـی كشت وكــاڵ باجێ نیــە كە

یەکسەر بچێتە ئەستۆی ئەوەی کارەکە ئەکات و خۆی مەسەلەیەکی ئابوورییە.

ئیبن خلدون لەم رووەوە شتێکی وتووەو کارەکەش بەجۆری زانیارانە لەلایەن ئابوری زانەهاوچەرخەکانەوە نەبێ نازانرێ.[23]

3 ـ مەسەلەی زەکات: ـ ئەمە خاڵی ناکۆکی بوو لەنێوان بەرهەڵستکاراندا وەك شیعەو شورات و قەدریەو زانایانی ئاینیی و لە نێوان هەردوو خەلافەتی ئەمەوی عەباسیداو بەرهەڵستکاران بۆ ئەوە ئەچن کە جێ بەجێ کردنی بیروباوەڕی زەکات کە لەسەردەمی پێغەمبەرو (د. خ) خولەفای راشدیندا هەبوو. بەوپێیە ئەبوحەمزە خەلیفەی ئەمەوی ئەدوێنێ کە دەستی بەسەر هەموو زەکاتاگرتوو بردی بۆخۆی لە کاتێکدا کەدەقی قورئان ئەڵێ ئەبێ بەسەر هەشت بەشدا دابەش بکرێو بەشی خەلیفەی تیانیە.

ئەو رەخنانەی ئەبو حەمزە گرتوونی بەلای شوراتەکانەوە شتێکی بێگانە نیەو پشکنکار ئەگەر خۆدەقی ئەم رەخنانەی دەسکەوێت یان کەمێکی چنگە بکەوێ بەئاسانی رووداوەکانیان و گورج و گۆڵی یەکانیان و دەسکەوتەکانیان و بیروباوەڕەکانیان ئەزانین، ئەوەی کە لەوەوبەر شورات و شیعەکان بوویانە دڵ گرانیانە بەرامبەر ئەو سەر دەمە ئابوورییەی توشیان هاتووە کە ئەنجامی سیاسەتی خەلیفەکانی سەردەمی ئەمەویو عەباسی هاتۆتە کایەوەو هەروەهاش رێگەی ئەوەش ئەدات کە بەدۆخێکی سروشتیی و کۆمەلایەتی وئابوری دابنرێ کە بیروباوەڕ ـ داربوون لە چوار ئەوبەرنامەیەدا کە بۆیان کراوە. بەم پێیە لەکاتی تەرخان کردنی ناوەڕۆکی مێژوویدا ئەبێ سەرنجی ئەم خاسیەتانە بدرێ.[24]

سەرنجێ لە شیعری شوراتەکان: ـ

شیعری شوراتەکان بەوەدا جیائەکرێتەوە کە ئاینیی و شۆرشگێرو سەرکێشانەیەو مرۆڤی شورات ئەگەیەنێتە پایەیەکی زۆربەرز، چونکە هەرمرۆڤێکیان لە سەرڕێی بیروباوەڕەکەیان لە ناوچووبێ بەشەهید دائەنرێو بەلای هاوباوەڕەکانیەوە دوای ئەوەی کە شەهید ئەبێ بەنموونەی بەرز دائەنرێو شایەنی ستایشە کەواتە پێویستیبە ستایش و لاواندنەوە هەیەو دیسانەوە شیعرەکە خۆی مرۆڤایەتیی و دیاردەی مرۆڤی شوراتی بەتەواوی پێوە دیارەو ئەوەشی کە لە ناویا قوڵپ بدات ئەوپەری لایەنی ئاین گرتنە لەبەر ئەوە وێژەیەکی بەهێزەو ئەوەشی کە زیاتر بەهێزی بکات یەکگرتنی بیروباوەڕی ئەدەبیی و کردارەو مەسەلەی مردن تیایدارەنگێکی خەفەتبارانەی هەیە بەڵام بەرەوبێزاری نەیبردووە، چونکە خۆی ئەو مردنە جۆرە ئاواتێکی دانەری ئەو شیعرانە بووو چونکە مردنەکە چوونە ناوبەهەشت و بینینەوەی براودۆستە ئاینداراکان بوو ئەوانەی کە لە رێگەی بیروباوەڕەکەیاندا شەهید بوون.[25]

**وێژەوانانی شورات:**

وێژەوانانی شورات ئەوانەی کە نایانناسین ئەگەر بەرهەمەکانیان دەست بکەوتایە وێژەی شوراتەکان روویەکی روناکتری ئەبوو.

«مبرد» سەبارەت بە رهینی مرادی ئەڵێ: (رهین پیاوێك بووە لە مراد، . لە شەرداحەوانەوەی بۆنەبوو شارەزاییو زانایەکی چاکی شیعر بوو. زانا ئاینییەکان ئەڵێن عمران کوری حطان شاعیرێك بووە لەگەڵ صەفەری شورات و سەرکردەو زانا ئاینییەکانیدا بووەو[26] ئەوەشی کە توانیبێتمان باوەڕی پێ بکەین ئەوەیە کە (رهین) هیچ کەسێ نیەو (مبردیش تەنیا هەرناوی ئەبات و هیچیتر.

هەروەها زیدی کوری جندبیش کە بەهۆی قەتەرییەوە سەردەمی خەلافەتی ئەزارقە چەند شیعرێ وەك ئەمانەی خوارەوە خراونەتە پاڵی.

*قل للمحبين قد قرت عيونكم*
*بفرقة القوم والبغضاء والهرب*

كنا اناساً على دين ففرقنا
قرع الكلام وخلط الجد باللعب
ماكان اغنى رجالاً ضل سعيهم
عن الجدال وأخاهم عن الخطب
انى لاهونكم في الأرض مضطرباً
مالي سوى فرسي والرحم من نشب

تەنیا «مبرد» ئەم شیعرانە ئەداتە پاڵ (صلت ی کوری مرە)و هەروەك بۆمان ئەگێڕێتەوە زید وتاربێژ ی ئەزارقەکان بووەو حافظ ئەم قسەیەی اشل ی بکری‌مان بۆ باس ئەکات کە ئەڵێ:

ويلمه اذا ارتجل
ثم اطال واحتفل

هەروەها وتراویشەکە زیدی کوری جنشب دانەکانی ریچ وبەدەرەوە بوون و زەرد بوون ئەگەر وانەبوایە وتاری بۆهەموو عەرەب ئەدا.[27]

بەڵام بەچاوپۆشین لەم شتانەی کە باسی کراون.. ئەم قسانە هەموو ناوبانگ و پلەی وتاربێژ ی زەید دەرئەخەن و بەڵام هێشتا هەڵکەوتوویی ئەم وتاربێژ و شاعیرەمان دەست نەکەوتووە.

هەروەها شیعرێکی ترمان بۆ باس ئەکرێ کە دەدێرەو بەناوی پیاوێکەوە ناوی معاذ کوری جوین ە سەردەمی‌و لایەتی مغیرەی کوری شعبە وتویە:

الا ايها الشارون قد حان لأمرئ
شرى نفسه لله ان يترحلا
انتم بدار الجاهلين جهالة
وكل أمرئ منكم يصاد ليقتلا
فشدوا على القوم العداة فانما
أقامنكم رأيا متسلسلا
الا فاقصدوا ياقوم للغاية التي
اذا ذكرت كانت ابر واعدلا
فياليتني فيكم اعادي عدوكم
فيسقونني كأس المنية أولا
يعز على ان تخافوا وتطردوا
ولما أجرد في المحلين منصلا
ولما يفرق جمعهم كل ماجد
يرى الصبر في بعض المواضع امثلا
ولو انني فيكم وقد قصدوا لكم
اثرت اذا بين الطرفين قسطلا

ئەگەر وێژە وانانی شورات ئەوانەی لەبیر چوونەتەوەوکە بەرهەمەکانیان بڵاوبوونەتەوە ئەبینین کە باشترین دەربرین باوەرەکەی خۆیان دەرئەبرن. جاحظ لە بەیان و تبیین دا باسی دەستەیەك لە وێژەوانان و شورات ئەکات.. ئەشبینین کە ستەمێکی گەورە کراوە بەرامبەر وێژەو نووسەرە کۆنەکانی شورات لە شیعری عەرەبدا بۆ نموونە کوری قوتەیبە ئەهێنینەوە لە نووسینەکەیدا شیعرو شاعیرەکان پەنجەی بۆیەکێکیان رانەکێشاوەو ئەویش طرماح ەو طرماحیش شیعری لەخەڵکی‌کەیان زۆرترە بەڵام کوری سەلام لە نووسینەکەیدا (طبقات الشعراء) پەنجەی بۆهیچیان رانەکێشاوەو تەنیا باسی پیاوێکی کردووە کە (لەسەر بازگەی قەتەری» بوو.

**زانایانی وێژەی شوراتەکان:**

دەربارەی زانایانی وێژەی شورات پشتمان بەنووسینەکەی دوکتۆرە سهیر القلماوی کردکەناوی «ادب الخوارج في العصر الأموي».

**قەتەری کوری فجائەی مازنی:**

قەتەری لە مازنی یەکانەو تەمیمیەو تەمیمیەکان سەرەتالەکەنارەکانی کەنداوی عەرەب لە دەوڵەتی موسوڵمانەتی - بصرەو بەحرەین و دەورو پشتەکانیان دائەنیشتن و قەتەریش وەك دەرئەکەوێ هەرخۆی لەو ناوچەیە دانیشتووەو ئەوەشی کە ئەم

راستیە بچەسپێنێ ئەوەیە کە کوڕی خەلەکان ئەڵێ کە قەتەری ناوی راستی خۆی نەبووەو ئەم ناوەش ئەگەڕێتەوە بۆ شوێنی لە نێوان بەحرەین و عەماندا واتە «قطر» وئەمەش ناوولاتێکە باوکی لەوێ بووە.[28]

بەڵام ناوی خۆی جعــردەی کوڕی مازنــی کوڕی یەزیــدی کەنائی تەمیمی یە کە بەسەرکردەیەکی ناسراوی ئەزارقەی شورات ناسراوە.[29]

هەروەها تەمیمیش دەسەڵاتی لە بصرەو دەوروبەرەکەیدا بووە کە ئەزد لەگـەڵیـانـدا ناکـۆك بوون و قەتـەریش لەو دەسـەڵات و توانـایـەدا یەکێ بووە لەنـاودارەکـانی و ئەم ناکـۆکی یـەشی دیوە. عەرەبی چاك لە هەمــوو کەسێکی تــر زیــاتـر هەست بیـرەتیـرە گەرێتیو شوێنەواری ئەم هەستە ئەکات. ، کە وابوو سەیرنیە ئەگــەر ئەم بیـری تیـرە گەرێتی یـەمـان بینی سەردەمی قەتـەری شان بەشــانی ئەوتــونــد دەست گرتنـەوە بروات کە بەئیمـان و تەقەللادانیەوە هەیەتی کە ئەویش نەك هەر ئەوپەری ئیمان گرتنە بگرە لە هەموو باوەڕەکانی تری شوراتەکان دەستی هەڵئەکێشا. شتێکی سروشتی بــوو کەتـەمیم بەژمـارەو بەسـەرکـردە یارمـەتی شۆرشی شوراتـەکـان بدات و بەنـاوبانگترینی ئەو سەرکردانەش قەتەری فجائە بوو.

دایکی قەتـەری شیبـانیـەو لەم رووەوەوتـراوە[30] کە دایکی لە شیبــان مو شیبــانیش دووبـارە شورات بوون و شۆرشیـان دژی دەوڵەت کردووەو بەزمان زوڵاڵیو وتاردان ناوبانگیان دەرکردووەو رەنگە بەشێك لە زمان زوڵاڵی قەتەری بگەڕێتەوە بۆ ئەم لایەنەو هەر لەو دۆخــە شەراوییــە بەهێــزەشــدا بوو کە قەتــەری ئەو لاوێتی یەی خۆی بەسەر بردکە کەمیلێ ئەزانین.

ســاڵی 68ی کۆچـی یــان بڵێین ساڵی 69یك کە جیــاوازن لەیەکتری ئەزارقەکانی شورات لەشەرێکی دڵ رەقانەدا کەلەلایەن دوو سوپــای وەك سوپــای عقــابی کوڕی ورقــاو سولتــانی ئەمـەوییـە وەکـە لە عیـراق بوو دەورە درابوون تووشی مردنێکی زۆر هاتن و لەم شەرەشیاندا بەرامبەر بە عقاب قەتەری سوارچاك سەرکـردایـەتی ئەزارقـەکان ئەکات چونکە سەرکردەی ئەزارقەکان

کە ئەزرەقــی دووەمــی کوڕی ماحــوز بوو کوژراو ئەوەبــوو لەونـاخـۆشیو سەرسـامیـەدا کە بە قۆناغێکی ناخۆشداتێدەپەڕین بەدوای سەرکـردەیـەکـدا ئەگـەڕان کەسـەرکـردایـەتیـان بکـات و جڵەویان بەدەستەوە بگرێو لەقەتەریشیان باشترنە دۆزیەوە کە بەم کارە هەستێو ببێتە میری باوەڕهێنەرانیان و ئەوانیش دڵسۆزبن بۆی.

بێگومان پایەی سوپایيو تەقەللادانی لە ڕێی ئاییندا لەلای قەتەری یەکەم هۆبوون بۆ ئەوەی ئەم پایەیەوەر گرێت.

قەتـەری بووە میـری باوەڕهێنـەران و سەرکردەی بە جۆشترین دەستـەی ئاینی موسـوڵمـانـانی شەرکـەر. ئەوەی کەروونـە ئەم سەرکردەیە ماوەیەك لە ناوچەی فارسی بەتایبەتی لەکرمان ژیاوەو شارەزاییشی لەم زەوی پتـەو بەتـوانـایـەدا پەیداکرد کە سرووشتی بوو کە دەوڵەتی موسوڵمانێتی هەشت ساڵ زیاتر پەیتاپەیتا لێی تووشی مەترسی هات.

کاتێ کە کاری کوڕی زوبێر تەواو بوو مەهلەب بۆ حسابی مەصعــەب لە شوراتــەکـانی ئەداو لە کاروبـاری کوڕی زوبێـر هیچی نەئەزانی. کاتێ کە هەواڵی مردنی کوڕی زوبێری زانی بۆ قازانـجی عبــدالـملك کەوتــە لێـدانی شوراتــەکــان.. چونکـە هەر خەلیفـەیـەك نەمـایـەویەکێکی تر بهاتایە هەڵوێستی مەهلەب بەرامبـەر شوراتـەکان نەئەگۆڕرا.. لایەنگرانی قەتەری ئەم کارەیان بەهەل زانیو سەریان لە مەهلەب ولایەنگیرانی ئەداو لێیان ئەپرسی کەرای بەرامبەر عبدالملك چیە ئەمەیش ئەوە بوو کە بزانێ کوڕی زوبێر مردووە.. گاڵتەی بە عبدالملك ئەکردوو سەرزەنـشـتـی ئەکـرد.. بۆ بەیــانــی کەزانــی کە عبــدالملك سەرکەوتووە مەهلەب و لایەنگیرەکانی کاریان درایە هات بایدایە سەرقـەتـەریو لایـەنگیـرەکـانی کە ئەمـانـە بەرامبـەر عبدالملك ناپــاکـن و.. شوراتــەکــان ئەم کارەی مەهلەبی دوژمنیــان بۆ دەرکەوت کەچەند ناپاکەو هەرکەسێ خەلیفە بێ ئەم خزمەتکاری ئەوەو ئەمــەش وای لە شوراتــەکــان کرد کە توونــدتــر دەســت بەبیروباوەڕەکەیانەوە بگرن و پاڵیان پێوە ئەنێ کە شەڕێکی ئاشکرا لەگەڵ دەوڵەتدا بکەن.[31]

مەهلەب لەلایەن قەتەری‌یەوە تەنگاو ئەبیٚ‌و حەجاج ئاگای لە مەهلەب ئەبیٚ‌و دەستــە دەستــە رابــەری خوٚی ئەنێـرێتـە لای، مەهلەب نوێنەرەکانی حەجاج ئەبات لای شەرەکە رایان ئەگریٚ کە بوٚ ئەوەی بەچاوی خوٚیان ببینن کە مەهلەب لەلایەن سوپای قەتەری‌یەوە چی‌ی پیٚ ئەکریٚ ولای حەجاج بیگێڕنەوە. . بەڵام مەهلەب دوای ئەم کارانە کەوتە فروفێڵ و لێرەوە کوێرەوەری ئەم شاعیـرە سوارچـاکـە دەست پیٚ ئەکـات کە هیـچ سەرکـردەیـەك تووشی نەهاتووە.

لە سووپــاکــەی قەتــەریــدا پەنـا بەروعـەجـەم زوٚر بوون. . مەهلەب کاری خوٚی لەناوئەمانە داکرد کەبیٚ ئەوەی بیروباوەڕی شوراتیــان لا مەبــەست بیٚ لای شوراتــەکـان بوون کاروگـوٚران زووکـاریـان تیٚ ئەکـردن و پەشێوی خستە ناوسووپای قەتەریەوەو هات لەسـووپـای قەتـەری عبـدرەبـەی بەرهـەڵستکاری قەتەری راست کردەوە ئەویش هات وتـاری بوٚ ئەوانــەدا کەلایـەنگیـری بوون و بەبیـروبـاوەڕەوە نەهـاتبـوونـە ناو شوراتـەکانەوەو سووپای قەتــەری زوٚرکــەمی مایــەوەو سەر لەنــویٚ شەر کرایــەوەو ئەم دوودەستەیە واتە هێزی قەتەری‌و هێزی عبدرەبە دایان بە یەکداو مەهلەبیش لە دوورەوە راوەستابوو چاوەڕوانی ئەکرد چی ئەبیٚ‌و ئەمەش مەسەلەکە ئەوە نەبوو کەلە سەر بیروباوەڕکەیان جیاوازبن بگرە لە سەر ئاین بوو وهاتن قەتەریان بەکافر دایەقەڵەم.

ساڵی 77ی‌ك ئەوقــەتــەری‌یــەی کە روونــاکتــرین دێـری لەلاپەرەکانی تێکوٚشانی شورات نەخش کرد لەناو ئەو سووپایەیدا کە لە ناوچــەی تەبــەرستــــان بوو. (دوای ئەوەی کە ئەو لایــەنگیـرانـەی لیٚی جیـا بوونـەوە کەچـوونـە لای عـبـدرەبـە) سەرکـردەی سووپـای خەلیفـەکـە ناوی موغیان کوڕی ئەبردەدی کەلبی بوو بەدوایەوە بووو شەرەکەش ئەنجام بووە هوٚی کوشتنی قەتەری. . ئەویش ئەوە بوو ئەسپەکەی گلاو کەوتە خواریٚ‌و مردو بوٚ ئەم مردنــەشــی بەســی چوارجــوٚر باس ئەکــریٚ‌و ئەوی لە هەمــوویــان دەنگی‌دا بێتــەوە ئەوەیــە کە لە لایــەن سورەی کوڕی جبــری دارمــی‌یــەوە کوژراوەو سەری برراوەو نێــرراوە بوٚلای حەجاج و ئەویش ناردویەتی بوٚ لای عبدالملك.[32]

ئەمــە کوٚتــایی ژیـانی شاعیـری سوارچـاك قەتـەری بوو کە بەخوێنی خوٚی‌و بەتێکوٚشانی پاکترین پەرەی سەرکردایەتی نەك شوراتی درووست کرد بگـــرە پاکتـــرین پەرەی بەرهـەڵستکـاری سوپایی‌و سیاسی لە سەردەمی ئەمەوی‌یەکاندا تومارکرد.

قەتــەری هەشت یان نوٚ یان دەســاڵ ژیـانی سەرکـردایـەتی ژیـابیٚ مێـژووی مردنـەکـەی لە سەری جیاوازن و ئەگەڕێتەوە بوٚ نێوان ساڵی 77 و 79ی‌ك کە ئەم ماوەیە هەمیشە هەر خەریکی شەرکـردن بووەو ئارامی نەزانیـوە بەڵام ئەو ژیـانـە کە پڕیەتی لە شەیدای بیروباوەڕ شتێکی سروشتی بووە کەوای لێهاتووە شاعیرو وتــار بێــژ بێت بەڵام ئەبیٚ ئەوە بزانین کە ئەوەی لەم کارانــەدا یارمـەتی دابیٚ سروشتـە شیبـانی‌یـە تەمیمی یەکـەیـەتی کە وای لیٚبکات ئەوپایانەی هەبێت و زبان زوڵاڵێکی باش بێت.

قەتـەری شیعـری کەمـەو ئەبوتمام لەو جوٚشەیداکە بەرامبەری بوویـەتی سیٚ پارچـەی ئەگێـڕێتـەوە کە لە چواردە دێـر زیـاترنیەو مەسعودیش لە مروج الذهب دا شیعرێکی باس ئەکات کە یازدە دێرەو بەحتـەری تەنیـا دێـرێکی باس ئەکـات و مبـردو ابوالفرج شیعرێکی دەربارەی (ام حکیم) جوٚراو جوٚر ئەگێڕنەوە.

قەتەری ئەودێرە شیعریانەی هەیە کە وتوونی یاخود ناردوونی بوٚ سیرەی کوڕی جعدو سمیر حەجاج.[33] ئەم سیرەیە پیاوێکی هەڵکەوتووی ساکاری بەهەستە.

سیرە لە مزگەوت دانیشتبوو، حەجاج لەوێدا تێپەری بەدوای کەسێکدا ئەگەڕا بوٚ ئەوەی دارایی لە مزگەوتەکەدا دابەش بکات.

سیـرە دەرکـەوت و شتێکی وەرگـرت و حەجـاج سوٚبارەی لیٚ کردەوە. هەرسێکی وڵام دایــەوەو پاشـان حەجـاج پیٚ‌ی‌وت من حەجـاجم. ئینجـا دارایـیـەکـەی وەرگرت و حەجاج بردیە ماڵەوەو گفت وگوٚیان کرد کە نیشانەی ئەوەدەر ئەخات ئەم سیرەیە شیبانی یەکی ئایینداری پتەوی دەوارنشین بیٚ.

ساکـارو روٚشنبیـرێکی تەواو بیٚ‌گـەردبوو. حەجاج کردی بە برادەری خوٚی. . پاش ماوەیەك کە هەر لەگەڵ حەجاج دا بوو چەنـد دێـرێکی لە قەتـەری‌یـەوە پیٚ ئەگـات سەرزەنشتی ئەوەی ئەکات و مێشکی‌وا [illegible] بنی‌و حەریردایەو

براكانيشى كه باوەر هێنەرن شەر ئەكەن و تاڵی و ناخۆشی جەنگ بەشیانە.. دێرەكان كار ئەكاتە سیرە بە جۆرێك ئەیهێننە گریان و بێ ئاگاداری حەجاج.. دەست ئەداتە چەكەكەی و ئەم دێرانەی خوارەوە بۆ حەجاج بەجێ ئەهێڵێ.

رأى الناس الا رأى مثل رايه
ملاعين تراكين قصد المخارج
فاقبلت نحو الله بالله واثقاً
وما كربتى غير الآله بفارج
الى عصبة اما انهار فأنهم
هم الأسد اسد الفيل عند التهايج
واما اذا ما الليل جن فأنهم
قيام بأنواح النساء النواشج
ينادون للتحكيم تا لله انهم
راوا حكم عمرو كالرياح الهوائج
وحكم ابن قيس مثل ذلك فاعصموا
يحمل شديد المتن ليس بمناهج

شیعرەكە پێكهاتوویەكی سووكی سەرزبان و واتایەكی بەهێزی هەیەو واتا كەی لە چواردەوری ستایشی دۆخی شوراتە تێكۆشەرەكان و چاكەیان لەو تێكۆشانەدا ئەسوورێتەوەو مەسعودی لەم رووەوە ئەڵێ:

«ئەم سیرەیە شیعری زۆرە» هەندێ جار چەند دێرێكی باس ئەكات كە هی سیرەو شاعیری ترن و ئەڵێ: كە سیرە شاعیرێكی باشی شوراتەكانەو ئەگەر بەرهەمەكانی بمانایە هەموویمان بڵاو ئەكردەوە.[34]

شیعرەكانی قەتەریش كە ئەم شوێنەوارەیان هەیە ئەمانەن:

لشتان مابين ابن جعد وبيننا
اذا نحن رحنا في الحديد المظاهر
نجاهد فرسان المهلب كلنا
صبور على وقع السيوف البواتر
وراح يجر الخز عند اميره
امير بتقوى ربه غير آمر
ابا الجعد اين العلم والحلم والنهى
وميراث اباء كرام العناصر
الم تر أنّ الموت لاشك نازل
ولابد من بعث اللالئ من المقابر
حفاة عراة والتراب لديهم
فمن بين ذي ربح وآخر خاسر
فان الذى قد نلت يغنى وانما
حياتك في الدنيا كوقعة طائر
فراجع ابا الجعد ولاتك مغضبا
على ظلمة اعشت جميع النواظر
وتب توبة تهدى اليك شهادة
فانك ذو ذنب ولست بكافر
وفوزنا تلقى الجهاد غنيمة
تفدك ابتياعا رابحاً غير خاسر
هى الغاية القصوى الرغب ثوابها
اذا نال في الدنيا الغنى كل تاجر

بەراوردكردنی سەرەتاكانی ئەم شیعرە، لە نێوان ژیانی كوری جەعدو ژیانی قەتەریدا خواستەكەی قەتەریمان بەچاكی بۆ دەرئەكەوێ ئەویش ئەوەیە كە ژیانی هەر دووكیان كە باوەڕهێنەرن روون بكاتەوەو كە چۆن باوەر ئەركی تێكۆشانیان پێ ئەخاتە ئەستۆو ئەم روون كردنەوەیەش كار ئەكاتە ناخی سیرەو ویژدان و هەستی بەرامبەر بە باوەرەكەی وریا ئەكاتەوە. قەتەری لەم رێگەیەوە ئەكەوێتە سەرزەنشتێكی توندی سیرەو بیری ئەخاتەوە كەدارایی ئەم دنیا كەوا ئەو چاوی تێ بریوە.. چێژێكە نامێنێ و ژیانی ئەم جیهانەش وەك كەوتنی باڵدارێكی تیژتێپەر وایە كە ئەویش كوت وپڕ ئەمرێ و ئەوە ئەمێنێتەوە كە كاتی خۆی لێی ئەپرسنەوە چایان قازانجەیان زیان.. بەزمانێكی ئاشكراو بانگەوازێكی بە هێزەوە قەتەری كۆتایی بە شیعرەكەی ئەهێنێ كە

ئەویش هانــدانــی سیــرەیــە بەوەی کە واز لەو ژیــانــە بێنــێ کەتێیدایەتی و لەمەیدانی شەردابیگاتێ و شوین و پایەی سیرەو ئەوانەی بیر ئەخاتەوە کە وەك ئەووان و بۆ ئەوەی بگەنە مەبەستی خواستراوو نیازی گەورەیء ژیان کە ئەویش تێکۆشان و شەهید بوونە لە ڕێگەی باوەردا .

دێرەکانی قەتەری بەرامبەر بەشەر مەزنن و مەزنیشیان هەروا بەتواناوە لە مەسەلەکەوەر گرتووە . . ئەمەش لەوە دادەرئەکەوێ کە برادەرەکەی تەمێ ئەکات و ستەمیشی لێ ناکات و بە هەستێکی نەرمەوە لەگەڵیاـە دوێ و وگومانیش لەوە دانیە کە قەتەری ئەم هەستەی برادەرەکەی زانیوە . چونکە ئەگەر باسەکە بەهێزبێ ئەوە هەڵناگرێ کە تەمێ کردنە کە پربێ لە بەزەیی پیاهاتنەوە . . ئەم دوو رایەڵـە دێرەکانی قەتەریدا کاری خۆیان کردووەو دێرەکانی توندیو نەرمیان پێوەدیارە .

ئەمــەش بوو کاری لەبــرادە رەکــەی کرد کە دەست بداتــە چەکەکەیو بێ ئەوەی حەجاج ئاگادار بکات بە لاواندنەوەی بیروباوەرەوە کەوتەرێ بۆ ئەوەی بگاتە برادەرانی .

قەتەری دواتەمەنی چەند دێرێکی هەیە کە بوونەتە هۆی ناوبانگ دەرکردنی و لە کاتی جەنگدوتراون کە خۆی سەرکردایەتی لایەنگیرانی باوەرەکەی کردووە لە مانەش سێ دەسختەت هەن کە ئەبوتەمام بەجۆشەوە لێیان ئەدوێو هەرپارچەیەك لەم شیعرانە لایەنێکی ئەو سوارچاکەدەر ئەخات و یەکەمیان لە نێوان خۆیو دەروونیدایە کە لە کاتی تووش هاتنی مەترسی مردن و کاتی ئەوەدا پەسەندی ئەکات و فرێی ئەدات کە سەرچڵی بەژیانی ئەکات و دووەمیان دەربڕی دۆخی شەرکە ڕێکە لە مەیدانــاو سێیــەمیــان بۆ چوونیــەتی کاتێ کە لایەنگیرەکانی ئەدۆنێو ئەمەش بەشی یەکەمە .(35)

اقــول لهــا وقــد طارت شعــاعــاً
من الأبطــال ويــحــك لن تراعــي
فانــك لو سألــت بقــاء يوم
على الأجــل الــذي لك لن تطــاعــي
فصــبــرا في مجــال الــمــوت صبــرا
فما نيل الخلود بستطاع
ولا ثوب البقاء بثوب عز
فيطوى عن أخي الخنع اليراع
سبيل الموت غاية كل حي
فداعية لأهل الأرض داعي
ومن لا يعتبط يسأم ويهرم
وتسلمه المنون الى انقطاع
وما للمرء خير في حياة
اذا ماعد من سقط المتاع .(36)

قەتەری لەم دێرانەدا قسە لەگەڵ خۆی ئەکات و ئەمەش وێنەیەکی چاکی ئەوەمان بۆدەر ئەخات کەوەك هەیە لە نێوان دەرونی مرۆڤانەداو لە نێوان ئەوئەو بەرزیەدا کە برادەرەکەی لە ناکۆکیو خزمەتی ئایندا داوای ئەکات . . . ئەو دەرونە ترسانێکی سروشتی ئەترسێ و لەسەر ژیانیش وەکو هەموو کەسێ . . پاڵەوانانی بەهێز لەمەیدانی شەردا سوورە لەسەر ئەوەی کە بژی . بەڵام خاوەنی ئەو دەروونە بەو ترسە قایل نابێ تەماشا ئەکەی بەڵگە دوای بەڵگە ئەهێنێتەوە کە ئەوجۆرە هەست کردنە باش نیەو بەم جۆرە ئەڵێ :

سبيل الموت غايه كل حي
فداعيه لأهل الأرض داعي

ئەو ژیانە هەرئەبێ دوایی بێت و لەم وشانەشدا (وقد طارت شعاعا) بۆ دەربرینی قسەرێیەکی باشی هەڵبژاردووە کە ترس بە لە هێزترین واتادا دەرئەبرێ وپاشان کە ئەڵێ (لن تطاعی) هەروەك ئەو دەرونە ترساوە ئەگەر داوای کارێکی کرد وەك دەرونەکانی تر داوای ناکات بگرە بۆ ئەوەیە کە ئەمەدەرونی خۆیەتیو بەشێوەیەك داوای لێ ئەکات کە ئەبێ بەگوێی بکەیت . ئەمەش ئەگونجێ لەگەڵ ئەوەدا ئەوگیانەی قەتەری بزانین کە خۆی ومەزنیو گەورەییو توانای خۆی گەورە ئەکات تەنانەت ئەگەر ئەو گیانە زۆریش سڵ بکات . . هەروا کە ئەڵێت

(فـداعيـة لأهـل الأرض داعي) . . ابن خەلـەكان سەبارەت بەم دێـرانـە ئەڵێ . (ئـەم دێـرانـە هاندان و ئەم جۆرە شتانەیە ەکە لە خوابترسن و ئەمانەش لە دەرونێکی بەرزو لیهاتوویەکی عەرەبەوە پەیدابوون. [37]

ئەمەش دێرەکانی بەشی دووەمن:

*لايـركـن احـد الـى الأحـجـام*
*يوم الـوغـى متـخـوفـاً لحـمـام*
*فلقـد ارانـي للرمـاح دريـة*
*من عن يمـيـنـي مرة وامـامـي*
*حتـى خضـبـت بمـا تحـدر من دمـي*
*اكـنـاف سرجـي او عنـان لجـامـي*
*ثم انـصـرفـت وقـد اصبت ولـم اصب*
*جذع البـصـيـرة قارح الأقـدام*

دێـرەکـان دەربـڕی گیانی سوارچاك و جەنگاوەری قەتەرین . . سوار چاکی لەناو دانی رمەکاندا ئەیەوێ بژیو ناترسێ . . کە خەریکـە تووشی کوشتن دێت و هەروەك بۆسـەرخـوان بانگیـان بکات داوا لە دلێران ئەکات بەشداری شەری بن وە بەرویێشیان بەرم و شمشێـر گیـراوە داوایـان لێ ئەکـات شەر بکەن و نەترسن خوێنی رژاو سەرجـەکـەی و جلەوی ئەسپـەکـەی خلتـانی خوێن بوون . . . بەم جۆرە قەتـەری بەپێـشـەکی یەکی پتـەو باسی ئەکـات و پاشـان بە سەربـەرزی و گیـانێکی روونـەوە دەست هەڵئـەگـرێ کە دەستیشی وە شانـدووە بەڵام خۆی هیچی لێ نەهاتووە . . ئەمەش دێرەکانی ترە:

*الا ايـهـا البـاغـي البـراز تقـربـن*
*اسائـلـك بالـمـوت الـزعـاف المـقـشـبـا*
*فمـا هي تسـاقي المـوت في الحـرب سـبـة*
*على شاربـيـه فاسـتـقـني منـه واشـربـا*

دەربـڕینی «التسـاقي لەم دۆخـەدا خۆشی و ئارامـە کەئـەم سوارچـاکـە لە جەنگـدا باسیـان ئەکـات و ئەمانەش وەرزشێکی خۆشن بۆ رابـواردن . . بەم جۆرە قەتـەری هانی لایـەنگیـرانی ئەدات و سیمای خۆی بۆیان دەر ئەخات هەروەها قەتەری دێری تریشی هەن لە مانەش کەوا بانگی ئەبا خالد ئەکات:

*ابـا خالـد يـانـفـر فلسـت بخـالـد*
*ومـا ترك الـرحـمـن عذراً لقـاعـد*
*اتـزعـم الـخـارجـي على الـتـقـى*
*وانـت مقـيـم بيـن لص وجـاحـد.* [38]

ئەم دێرانە باوەڕی شوراتەکانە ئیمانێکە کە بەخزمەت کردنی نەبێ پتـەو نابێـت و باوەڕی خزمـەتی ئاینیش نەبێ هەمـوو باوەڕێکی تر بەتاڵەو کە ئەڵێ «یانفر» ئەمە شێوازێکە لە قورئاندا بە کارهێنراوە جوانی یەکی تایبەتی خۆی هەیەو ئەوەشی باوە «یا» ئەچێتە سەر ناونەك سەر کار. [39]

قەتەری لە شیعرەکانیدا دەربڕی دەستەیەکی شوراتەکانە لەو شاعیـرانـەی کە لێـیـان ئەدوێین نوێنـەری ئەو دەستـە شوراتـەی قەتەری نەبوون و هەریەکەیان دەستەیەکی تایبەتی خۆیان بووە.

عمـران دەربـڕی دەستـەیەکی باوە ڕهێنەری توندی شورات بووە کە بە شیعـرو زانیـاری خۆی خزمـەتی کردوون بەڵام ئەم دەستەیە بە هۆی کارەسات و دەربەدەری و دەرکردن لە سەرکارەوە جەنگیان نەکرد.

طرماح یش دەربڕی ئەو دەوارنشینە عەرەبانە بوو کە شورات بوون و باوەڕیان هێنا بەڵام باوەڕەکەیان ئەوەی لە بیر نەبردنەوە کە دەروونیان بۆ دەسەڵات وەرگرتن داوایان لێ ئەکردن و باوەڕەکەیان لە ناو ئەم ڕێگـەیـەیـانـدا تەواو رەنگی گۆڕرا . بەڵام قەتـەری دەربڕی رای ئەو شوراتانە بوو کەژیانیان لە مەیدانەکانی شەردا بەسەر ئەبردو بەراستی لە پێناوی بیروباوەڕدا تێدەکۆشان و ژیانە تاڵـە کەیـان لە شیعـرو وێـژەیـاندا جەنگاوەرانە رەنگی دا بووەوە بایـەخـدار ترین شت لە مێـژ وو ئادەمیـزادا هەبـوویێ ئەوان قوربـانـیـان پێـداوە کە ئەویش خوێـن و گیـان و ژیـانـی باوەڕهێنەرانیان بوو.

ئەوەی کە سەبارەت بە قەتەری هەبێ ئەو نامەیەیە کە بۆ حەجاجی ناردووەو لە کات و شوێنی خۆیدا باس کرا. حەجاج هەندێ لەوانەی دەورویشتی ئامۆژگاری ئەکەن و ئەڵێ: بۆ قەطەری بنووسەو پێی بڵێ کە هەندێ زەوی لە ژێردەستیا ئەبێت. حەجاج نووسی «سلاوت لێ بێ. پاشان تۆیەکێك بووی لەو عەرەبەدەوارنشین و لادێیانەی کە قەراغەنانت ئەخواردو میوەی وشك بووەی رزیوت ئەخوارد دوای ئەوە هاتوویت ئەتەوێ شتی بکەیت کە مافی تۆی پێوە نیە..» لەم بابەتە بۆی ناردووە. قەطەری وەڵامی ئەداتەوە (سلاو لەوە بێ کە رێی چاکە ئەگرێ لە نامەکەتدا باسی ئەوەت کردوون کە من لادێیەك بووم کە قەراغە نان و میوەی وشك بووی رزیوم ئەخوارد خوا ئاگاداره درۆت کرد، بگرە خواڵەو ئاینەیدا ئەمپارێزێ کە چاوتی تیا کوێرکردووە.

کەواتە تۆ بۆ ئەو خراپەیە ئەگەرێی کەزەلکاوێکی تەواوە، ئەوەشت وتووە پێویستی منی هێشتۆتەوە باشە هیچ لێدانێکم لاتەوە بۆ دەرکەوتووە کەتێرم بکات و پاڵی لێ بدەمەوە. پاشان بەخوا تۆی بۆ دەرخستم و سەرە کەچەڵەکەتی پیشاندام بۆ ئەوەی نکوڵی لە رێگەکەت بکەن و فێری ئەوە بن کە بەرەنگاربوونەوەی پاڵەوانان و وەك قسەی زل کردن نیە.[45]

نامەکە هێزی دەوارنشینێکی لادێو ئەوپەری شانازیبە سوارچاکیەوە دەرئەبرێ کە بەراستی رێگەی باوەری گرتووە.. ئەمە ئەودەستەیە بوون کە بەجۆرێکی توند نەخشەی ئەمریو بوونی رامیاری شوراتیان درووست کردووەو شیعرو حیکمەیان بۆنیازی لاوەکی نەوتووەو ئەوپەری قوربانیان داوە.

وەك وتمان هەندێ لە وانەی دەورویشتی حەجاج ئامۆژگاری حەجاج ئەکەن بۆ قەطەری بنووسێ کە هەندێ زەوی بدرێتێ وپێی بژی.

وەڵامەکەی قەتەری وەك شانازی بەدەوارنشینیو لادێیەتیو سوارچاکیو شارەزایی خۆی لەجەنگدا ئەکات داخی دڵی خۆشی بە حەجاج رژاندووەو هەرچی ویستووە پێی وتووە چونکە حەجاج بەلایەوە کافر بووە.

نووسینەکە لە رووی هونەرییەوە زمان رەوانی قەطەریمان پێ ئەڵێ کە قسەی بەهێزدارو خاوەن واتان لە چەند دێرێکی کورت و بەهێزدان کە دەنگ و هێزی قەطەری دەرئەخەن کە ویستوویەتی لە نووسینەکەیدا سەبارەت بەگۆرانی حەجاج دەریان بخات.

قەتەری بێجگە لەمە وتەی کورتیشی هەیە وەك ئەوەی کە بەعبیدەی کوری هیلال یەشکری ئەڵێ کە لایەنگرانی قەتەری بەتاوانێکی گەورە تاوانباریان کردبوو کە بردییە بەردەستی لایەنگیرانی کە بەرگری لە خۆی بکات و وتی (من لە نێوان تۆو ئەواندام وەك مل کەچییە تاوانبارییەکەیان مل کەچ مەکەو وەك درێژەپێدانی بێ تاوانێکی درێژداردر درێژەی پێ مەدە) هەروا قسەی تریشی هەیە سەبارەت ستایشی سەرکردەکانی ئەودوو جەنگەی کە هاتنە سەری وبەلایەنگیرانی ئەڵێ ئەگەر ئەمەتان پێ گەیی (چاوەرێی سەرکردەیەك بوون دەوڵەت بینێری) ئەمە وایەووایە.

**عمران کوری حطان: -**

عمران لە بصرە پێ گەیشتووەو مێژووی لە دایك بوونی نازانین و بە شوێن مێژووی کەیدا ئەگەینە ئەوەی کە حەجاج بووبە والی عیراق ئەوپیر بووەو حەجاج چۆتە سەریو ئەشگێرنەوە بەبۆنەی شبیب و غزالەی خێزانەوە کە ئەچنە کوفە بە حەجاج ئەڵێ.

*اسد علي وفي الحروب نعامة*
*وبذاء تصفر من صفير الصافر*
*هلا برزت الى غزالة في الوغى*
*بل كان قلبك في جناحي طائر*

خراپەکاری حجاج پێش چوونی شبیب بۆ کوفە دەرئەخات و شبیب ساڵی 76ك چۆتە کوفەو حەجاج ساڵی 75 یاخود 73ی والی عیراق بوو.

عمـران له بصـره ژیـاو لەوەوبـەر ناوبانگی بەزانایی و حەدیث وتنــەوە دەرکـرد بوو له عایشـەو ابی موسـای ئەشعـەری و کوری عبــاس و کوری عمــر باس کراوەو نازانین کەی بصـرەی بەجیٚ هیٚشتــوو پاشــان له گیٚرانـەوەدا سەبـارەت بە حەدیث وتـەوەی ئەوەبـــوەوە سوور بووە له سەر راســـت گوٚیـی لەگـەلٚ ئەوەدا کە شورات بووە ئەوەی لیٚی ئەگیٚرنەوە لامان وایە کە چوٚتە حجاز.

وەك دەرئەکەویٚ هەروەك خاوەن «الأغاني» ئەیگیٚریٚتەوە بەوە ناســراوە کە زانستی و حەدیث خوازبــووەو عبــدالملك کوری مەروان کە گومــانی لیٚ پەیــداکــرد کە روٚح کوری زنبـاغ ئەوە کەلیٚی ئەدوێن، روح وتی (ئـەتبینم زمـانی نەزاریـەو نویٚژ باس ئەکــەیت) لەم گیٚـرانـەوەو ئەوەشی لەبـر وتـرابیٚ ئەو خاسیـەتی بووە. . پاش ئەوە میٚـــژووی لای صەفـــەری یـــەکـــان ئەوەبـووە پایەیەکی ئەوتوٚی بووە کە ئەگەر ماوەیەکی زوٚر بەشویٚن زانستی خوازید نەسورابیٚتەوە پیٚی نەگەیشتووە.

تەنـانـەت کاتیٚ کە باوەری شوراتیشی پەیـداکـرد سەرکردەی دەستـەیـەك بوو کە ناویـان بەئایینداری پەیداکردووە. . جا ئەگەر شاعیـرو وتـاربیٚـژی دەستـەیـەك بوو بیٚ ئەوالایـەنی باشی دژی دوژمنـــەکـــانی ئەگیـــریٚ. . رەنگــە ئەو گیٚـراوانـەی سەبـارەت دەربـەدەربـوونی ئەیگیٚـرنـەوە ئەوەبـوەوە کە بەرگری له باوەرەکەی کردووەو پیشانمان ئەدات کە چوٚن ئەم پیرەمیٚردەی کە باوەریٚکی پتــەوی بە زانست هەیــە ئەیـەویٚ خەلٚکی بخـاتـەوە سەرریٚی چاکــەو رەنگــە ئەوەشمــان پیشــان بدات کە عمــران بەپیٚی هەلٚکــەوتــووی و روٚشنبیـــری زەلامیٚکی ساکــار نەبـووە. بگرە دەمەتەقیٚی له سەرئاین کردووەو لیٚی کوٚلیوەتەوەو سەبارەتی وتراوە.(41)

(عمران کوری حطان کاتی خوٚی شاعیرو سەرکردەو زانای صەفـەری یـەکـان بوو لای رهینی مرادی و لای عمـران ی کوری حطـان لەرووی زانیـاری یـەوە دەربـارەی قورئـان و شویٚنـەوار له (السیر والسنن والقریب والحدیث دا هەیە.

چاوەروان نەئـەکـرا عمـران باوەری شوراتـەکان وەرگریٚ هەر وەك ئەو دوو گیٚـــرانـــەوەیـــە ئەگیٚـرنـەوە کە پیٚمـان گەیشتـووە. . گیٚرانەوەیەك ئەلیٚ کچەکەی حەمزەی مامی هیٚناوە کەوا شورات بووەو بوٚ ئەوەش خواستـوویەتی کە لەبـــاوەری شورات لایـدات و پەشیمـــانی بکـاتـەوە کە ئەورایکیٚشـایـە سەربـاوەری شورات. . گیٚرانەوەیەکی تر ئەلیٚ دەمەتەقیٚ له دانیشتندا لەگەلٚ حروریەك گراوەو ئەویش له دانیـشتنـــەکـــەدا بووەو بیـــرو باوەری شوراتی وەرگرتووەو ئەم دوو گیٚرانەوەیە هیچیان ئەوی تریان بەدروٚناخەنەوە.

ئەوەی کە راست بیٚ ئەوەیە کە خیٚزانەکەی دەستیٚکی دریٚژی له وگوٚرانەدا هەیەو وەك بوٚی چوون دوو هوٚ هەن. . یەکەمیان ئەوەیە عمران ناکریٚ کە کوتوپر له باوەرەکەی لابدات و ئەبیٚ کە لیٚکـوٚلٚینـەوەو گەران و پشکنکـاری یـەکی دوورودریٚژ و بیرکردنەوەی بەســـەر داهـــاتیٚ چونکـە هەروەك ژنـەکـەی دەستیدا بوٚ کەس دەست نادات کە پشکنکاری بکات کاتیٚ کە عمران دوور له گشتی و قسە بوٚ هەلٚبەستن و چاودیٚری کردن له دەشتەکانیدا بەناو مەسـەلـەی سەرزەنشت کردنـدا ئەسـورایـەوە. هوٚی دووەمیشی ئەوەیە کە له عمراندا هەستیٚکی تازە هەست پیٚ ئەکەین کە چوٚن ریٚزی ئافرەتی گرتووەو هەستی بەجوٚریٚ بەرامبەری باش بووە لەو سەردەم و ئەو دوٚخەدا کە ئەوانی تیاژیاون سەرنجیان راکیٚشاوە. . له شیعرەکەیدا ئەلیٚ:

*لقـد زاد الحـيـاة أليّ جدا*
*بنـاتـي انهـن من الضعـاف*(42)
*مخـافـة ان يلقـين الـذل بعـدي*
*وان يشـربـن رنـقـا بعـد صاف*

ئایـاجیٚی سەرسـورمـان نیە عەرەبیٚکی عیـراق و یەکیٚ بیٚ لەوشـوراتـانـەی بەدلیٚـری و بەخشش ناویـان دەرکـردبیٚ و قەدەغە نەکــریٚ صەفـــەری بیٚ. صەفـەری یـەکـان گەلیٚ جار بانگیـان راهیٚشت و شوٚرشیان کرد ئایا ئەمەریٚگە گرتن نی یە له پیاویٚکی واکە ئەوژیان و لاوازی کیژەکانیتی و ئەترسیٚ لەوەی کەپاش خوٚی بەسەریان دیٚ خوٚ ئەگەر شویٚن ئەو ویٚنانە بکەوین کە لەو چەند

دێرەدا کێشاونی هەست بەونازکی‌یە روونـاکە ئەکەین کە لە شیعرەکانیدا هەن باسی لاوازی کچەکانی ئەکات و دڵی پێیان ئەسووتێ . [43]

ژیانی عمـران و هەوڵـەکانی لەو کاتەوەیە کە سەرزەنشتی کردووەو ئەڵێن کە حەجاج سزاوئازاری زۆری داوەو لەو دێرانەیدا کەبـۆ حەجـاجی دەرئـەبرێ لە کاتی چوونی غەزالـەبـۆ کوفە ئەودڵ رەقی‌یـەمـان بۆ دەرئـەکـەوێ کە تووشی ئەبێ . . حەجاج دووربین بوو لە بوونی شاعیرو وتاربێژ وو خاوەن باوەڕێکی وەکو عمـرانـدا کە باوەری والی نـەبوو مەترسی‌یەکی هەمیشەیی ئەدیو دوور نەبووە کەکارێکی گەورەی کردبێ . .

ئەمـانـەگشت دڵ رەقی حەجـاجمان بەرامبەر بەعمران پیشان ئەدەن و ئەمـانـەش هەمـوو وامان لێ ئەکەن کە ئەم ناپەسندیەی حەجاج بەرامبەر بە عمران هۆی خۆی بووەو حەجاج برادەریشی بووە ناسیـوێتی لەبـەر ئەوە نابێ سزادانـەکە هەر واسـەرپێی‌ی بووبێ‌و ئەنجـام ئەوە بوو حەجـاج عیـراقی بەعمـران چۆل کردو ناردی بۆلای عبـدالملك کە خوێنی حەڵاڵ بکـات و بەفـرمـانی خەلیفەکەوتنە ئەوەی بەدوایابگەڕێن .

ئیتـر عمـران لەبـەر ئەوەی لە لایـەن خەلیفەوە خوێنی حەڵاڵ کرابوو سەرگەردان ئەسوڕایەوە . . کەمێ لە عیراق مایەوەو پاشان چوو بۆشام لەلای روح کوری زنباغ مایەوە کە برادەربوون . . عبـدالملك کەوتـە ئەوەی کە گومـان لەوە بکـات کە عمـران برادەری ئەوڕۆحـە بێ کەقـسـەی عمـرانـی بۆ ئەبـات و ئەیـانگێـڕێتـەوەو عمـران سوورە لەسـەر خۆشـاردنـەوە . پاشـان عبدالملك شیعرێکی بۆ ئەنێرێ‌و سەبارەت دێرە بەناوبانگەکانی لێ‌ی ئەپرسێ‌وبێ‌ی ئەڵێ تەواویان کات (ئەویش ئەو دێرانەن کە بۆ کوشتنی علی کوری ابی طالب وتـوونی) قسـە بە عمـران و بەوەش ئەڵێ کە علی کوشتووەو ئەترسێ لەوەی کە برادەرەکەی بەوە . زانێ‌و بەلام عبدالملك شیعرێکی بۆ ئەنێری بۆ ئەوەی بزانی ئەوە وعمران بەروح ئەڵێ ئەوەی داواکردووەو کەواتە دێرەکان لە لایەك بن و دوا برادەرو برادەرێتی‌بن مابنەوە . . دێرەکان ناسکن و کاری‌پـەسـەنـدی تێـدایـەو وێنـە کێشـانێکـە کە جوانی خۆی بەرامبـەربـە وژیـانـە پەشێـوەو ئەوبـرادەرایەتی‌یە هەیە کە کوت و پرپچـرا چونکـە خاوەنـەکـەی بەشـوێنیـائـە گەڕێن و خوێنی حەڵاڵە . [44]

***یاروح کم من أخـی مثـوی نزلـت بە***
***قد ظن من نجـم وغسـان***
***حتـی اذا خفـتـە فارقـت منـزلـە***
***من بعـد ماقـیـل عمـران بن حطـان***
***قد کنـت ضیـفـك حولا لاتـروعـنـی***
***فیـە الطـوارق من انـسـی زلاجـان***
***حتـی اردت بی الـعظـمـی فأوحشـنـی***
***ما اوحش الـنـاس من خوف ابـن مروان***
***فاعـذر أخـاك ابـن زنـبـاغ فأن لە***
***فـی الـحـادثـات هنـات ذات***
***یومـا یمـان اذا لاقـیـت ذایـمـن***
***وان لقـیـت معـدیـا فعـدنـانـی***
***لو کنـت مسـتـغـفـراً یومـاً لطـاغـیـة***
***کنـت الـمـقـدم فی سری واعـلانـی***
***ولـکـن ابـت ذلـك ابیات مطـهـرة***
***عنـد الـتـلاوة فی صەو عمـران***

وێنـەی ئەم دێـرانـە کە لەشـوێنێکـدا بە جێ‌ی هێشتـوون و شێوەی بەجێ هێشتنی هەر چیەك دەوری دابێ نیشانەی ژیانی عمـرانـە تا ئەوڕۆژەی مرد. وێنـەیـەکـە کە هەموودەم و کاتێ لە دورگـەی عەرەب لای زفـرکـوری حارثی کلابی سەرەکی بەنی عامرو سەرکردەی قەیسیە دووبارە ئەبێتەوەو عمران ئەگەر لای زفر ناسـرا ئەوا تووشی خراپـەدێت و زەفـر بەتـورەیی‌یـەوە دەربـارەی شتێك لێ‌ی ئەپرسێ‌و کەللەرەقیش یەکەم پیشەی بوو (ازدی مرةو مرة اوزامی) ان کنت مائـلا اغنیـاك وان کنت خائفـا أمناك) وعمـران ئەڵێ (ان الله هو المغنی) دێتـە دەرێ ئەکـەوێتـە دێـر خوێندنەوەو رقی لە پرسیارەکەی زفرکە سەبارەت بەنەژادی لێ‌ی

ئەکات ئەبێتەوەو ئەکەوێتەوە گەڕان و لەعەمان ئەم کارە هەربەسەر دێتــەوەو لەوێــوە ئەچێت بۆ یەمــامــەوەو دوایی ئەچێتـە دێیـەك لەدێیەکانی کوفە.

بەم پێیـە عمــران پیـرولاوازو دەربـەدەر نزیکـەی نۆسـاڵی بەسـەرئـەبـات ژیـانێکی گێـژاوو بێ ئارام بەسەر ئەبات تاساڵی 84ك لە دێیەك لەدێیەکانی کوفە ئەمرێ.[46]

عمــران.. راســت گۆیــی و قســە لەرویی و ساکــاری لە شیعرەکانیدا هەن و ئەختەل لەم رووەوە ئەڵێ.. کۆمەڵێ شاعیر لای عبدالملك دانیشتبوون عبدالملك لێی پرسین کەس ماوە لەهەمووتان شاعیرتربێ و وتیان خێر. ئەختەل وتی (درۆیان کرد ماوە ئەوەی کە لەوانــە شاعیـر تربێ) عمـران کوری حتـان... چونکە ئەوی نەوتراوەوتی و راست گۆیەو درۆیێ کردنی وەك ئەم درۆیەوایە کەئەمانە کردیان).[46]

ئەمـەش گێـرانـەوەیـەکی سەبارەت بەراست گۆیی عمران کە چۆن درۆکردنی لێ ناکەن.. ئەوە خێزانەکەیەتی لە بارەی ماڵی خواوە لێ ئەپرسێ:.

*وکـــلـــك مجــزأة بن نور*
*كان اشــجــع من اســامــة*

باشــە چۆن ئەم درۆیــەی کردو باســی پیــاوێــکی کرد کە درۆناکات و لە شێریش ئازاترە بەژنەکەی وت

پیاوەکە مەدینەی گرت شێر ناتوانێ ئەوە بکات.[47]

عمران لەشوراتەکاندا یەکەم کەس نیە کە بیری مەترسیدار لە شیعـرەکـانیـدا هەبێ بگـرە شەیـدای بیـرێکی تـرە کە ئەویشـیـان مەترسیدارە.. ئەویش ئەوەیە کە موسوڵمانان دەری ئەبرن و لە قورئــانـدا هەیـە (ان اکـرمکم عنـد الله اتقـاکم) جێگـە بەبن و بنـەچـەنیـە بگـرە پایە بەپاراستنی ئاینە.. ئەم بیرە لامان شتێکی سادەو دارێـژ راوە بەڵام سەردەمی ئەمـەویـەکان مەترسیدارترین رابـوو، چونکـە دەمـارگیـری تیرەگەرێتی کە موسوڵمانەتی کەمێ ساردی کردەوە سەردەمی ئەمەوییەکان زۆر بەهێزبوو بۆسیاسەتی خۆیان بە کاریان هێناو ئاگری ئەم دەمارگیرییەیان خۆش کردوو بەبنـەوبنـەچـە خۆیـان جیاکردەوەو شانازیان بەئاین و دەسەڵاتیان ئەکـردو بۆیتـەوکردنی دەوڵەتەکەیان کەڵکیان لێ وەرگرت. عمران لە بارەی ئەزدەکانەوە کە دواجار هاتووە بۆلایان ئەڵێ:

*واصــبــحــت فيــهــم آمنـا لاكــمــعشــر*
*بلـونـي فقــالــوا من ربــيــعـة أو مضــر*
*او الــحــي قحطــان فتــلكــم سفــاهــة*
*كمــا قال لي روح وصــاحــبــه زفــر*
*نحــن بنــو الأســلام والله واحــد*
*واولــى عبــاد الله بالله من شكــر*

ئەمـە ئازایـەتی و توانایەکە شاعیرێك سـەردەمی ئەمەوییەکان بلێ گەرانــەوە بۆچــوونــەوە سەرشــارو قەحتــان شتــێکـی هیچ وپووچە.. ئەوەی کە سەر سامماں بکات لەو شیعرانەدا قسەکەی عمرانە کە ئەڵێ: ئێمە هەموو نەوەی موسوڵمانانین، بەسووپاس کردنی خوا نەبێ موسوڵمانێ لە موسوڵمانێکی تری برای گەورەتـرنیـەوە یاخـودکـە ئەڵێ پیاوێك هەرچیەك بنەچەی بێ و ئەگەریەکێ بێ کەکەس وکاری خۆی بێ و خۆی زۆرپێوە هەڵکێشێ.. دوای ئەوە روونیئـەکـاتـەوە کە خۆهـەڵهکێشــان بەئاینەوەیە نەك بەبن وبنەچەو کاربەدەستایەتی و سامان.[48]

قورئـان و شوێنـە وارەکـانی بلال مرداس زۆرکاریان کردۆتە عمران و بلالی زۆر خۆش ئەویست و دوورنیە کە ئەبی بلال کاری تێکـردبێ.. چونکـە سەرزەنشتـەکـانی نزیك سـەردەمی کۆرودانیشتنــەکـانی ئەبی بلال بوون و عمـران بەم جۆرە ئەبی بلال ئەلاوێنێتەوە:

*لقــد زاد الــحــيــاة الــتــي بغــضــا*
*وحــبــاً للخــروج ابــو بلال*
*ولــو انــي علمــت بأن حتــفــي*
*كحــتــف ابــي بلال لم ابــالــي*

ئەمە نیشانەیەکی روونەکە ئەبی بلال کاری چەند بەهاداری

کردوّتـە ژیـانی عمـران و جا ئەگـەر ژیانی ئەبی بلالمان و ئاین پەروەریمـان زانی کە دەستـە ئاینی موسـولّمـانـەکـان هەریـەکـە بەکـەسێ لەخـوّیـان داناوە. . ئەوکـاتـە نالّێین ئەم کارتێکردنەی لەعمران نایەکـەربووە. ئەوە بو ئەبی بلال کوری زیاد گرتیو بەلاّم بەپـاســەوانی بەنـدیخـانـەکـەی وت کەرێگـەی بدات سەرلـەکـەس و کارەکەی بدات و پاش چەندروّژێ ئەشگەرێتەوە بەنـدیخـانـەکـەی لەگـەلّ ئەوەی کە ئەبی بلال ئەوەی زوّرچـاك ئەزانی کە کوری زیاد هەرکەسێ بەندبکات ئەیکوژێ. . بەلاّم ئەبی بلال لەبـەر ئەوەی راست گوّیـوو گەرایـەوە بەنـدیخـانە. . هەروەها ئەبی بلال لە پێناوی باوەرەکەیدا شەری کرد تابەفروفیل کوشتیـان ئەویش لەو کاتـەدابـوو کە رێکـەوتن شەربـووەستێنن و نوێژی هەینیبکەن. . لەکاتێکدا کە ئەبی بلال و لایەنگیرەکانی لە کاتی کرنوّشدا بوو لەشکری دوژمن هێرشی کردە سەریان و هەمـوویـانی کوشت، ئەگـەر ئەمـانـەمـان زانی کە باسمان کردو ئاورمان لەخوّشەویستی عمران دایەوە کە بەرامبەر بە ئەبی بلال هەیەتیو خواستی ئەوە بووە کە وەك ئەو لەناو بچێ. . . ئەوەمان بوّ ئاشکرائەبێت کە عمران تاچ رادەیەك گیروّدەی ئەبی بلال بووە.[49]

ئەو دێرانەی کە عمران سەبارەت ئەبی بلال پێمان گەیشتووە.

*یاعیـن ابکـي مـرداس ومـصـرعـه*
*یارب مرداس اجـعـلـنـی کـمـرداس*
*ترکـتـنـي هائـمـاً ابـکـي لمـرزئـتـي*
*في منـزل موحش من بعـد ایـنـاس*
*انـکـرت بعـدك من قد کنـت اعـرفـه*
*ما الـنـاس بعـدك یامـرداس بالـنـاس*
*امـا شربـت بکأس دار أولـهـا*
*علی الـقـرون فذاقـوا جرعـة الـکأس*
*فکـل من لم یذقـهـا شارب عجـلا*
*منـهـا بأنـفـاس ورد بعـد انـفـاس.*

پاش ئەوەی کە بەدلّێکی پەست و خەفەتێکی زوّرەوە باشترین وێنـەی لە دەست چوونی خوّشـەویستـەکـەیمـان بوّ ئەکـات. . بەتـایـبـەتی لە بانگکـردنی چاوو باسی شەرەکـە. . یاخـود کوشتنـەکـەدا ئازاروێشـە. . . لەم گواستنـەوەیـەدا بوّ ئاسمـان و زەویو قسە لەگەلّ خوا کردن و باسی ئەوەی کە روویداوەو ئەم چەنـدبـارەکـردنـەوەی ناوی مرداس. . پەشێـوی خوێمـان بوّ دەرئـەخـات و خواستی خوێمـان بوّ مـرثـەبـرێ کە ئەویش وەك مەرداسی لێبێ. . چونکـە مەرداس سوارچـاك و نەتـرس و ئاین پەروەرو راست گوّ بووە هەروەهـا لە ریـزی سێـیـەمـدا کە ئەلّێ «انکـرت بعـدك. . تاد» ئەوەروە راستـە دەر ئەبـرێ کە مروّف دوای لە دەستـدانـی کەسـێـکـی خوّشـەویـسـت هەستی پێ ئەکـات. . هەروەك جیهـان هەمـوو گوّررابێ هەمـووشتی نرخی خوّی لە دەست دابێ وایە.

لەم چەنـد بارەبـوونەوەیەشد لە شیعری عمراندا موّسیقایەکی ئەوتـوّ خوّش بەگـوێی خوێـنـەردا ئەدا زوّر کەم نەبـێ لای شاعیرەکانی سەردەمی ئەمەوی دەستمان ناکەوێو دووبارە لای شاعیری سەردەمی عەباسییەکان و دوای ئەوانیش هەرکەمە. . عمـران لە شیعـرەکـانیـدا هەست ناسـك و ئازا بووەو قسـەی لەروویـووە کە ئەمـەش شێـوە شیـرینیـیـەکیان پێوەدیارەو ئاسانن.[50]

ئەبێ باسی ئەوەش بکەین کە قورئان بەردی بناغەی شیعرو روّشنبیـری ئەو سەردەمـانـە بووەو عمرانیش دووبارە هەروا بووەو بگـرەژیـانیشی گرتـوّتـەوەو هەمیشـە خەریکی نوێـژکـردن بووەو ئەمەش ئەودێرانەیەکە بوّ زفری وتووە:

*امـا الـصـلاة فأنـی غیـر تارکـهـا*
*کل امـرئٍ للذی یعـنـی بـه ساع.*

کاتێ کە عمـران بووە شورات، دەستـەیـەك هەبوو ناوبانگی بەنوێژکردنی زوّرو لێکوّلّینەوەو خوێندنەوەی زوّری ئەحکامەکانی ئاین و دەرهێـنـانی ئەحکـامی تازەوە خەریـك بوو وعمـران پیرەمێردێك بوو کە ئاین لە دلّداریو مەیوجەنگە و ستایش کردن

دووری خستبۆوه چونکه ئەیزانی کەستایشی کی‌ئەکات، رۆژێ بەلای فەرزدەقدا ئەرواو ئەڵێ:

*ایــهـا الـمــادح الـعـبــاد لتـصـلـی*
*ان لله ما بأیـدی الـعـبـاد.*

ئەم پیرە نەئەکرا کەلایەنی زانیاری ئاینی لاوازبێ تەنانەت هەندێکیان دادەنێن کە ماتەزرینەری زانیاری صەفەری شوراتەکان هەموویانە. زانیاری ئاینی شوراتەکان، ئەگەر بازنەکەشی‌ون کردبێ نرخی خۆی پێ بەخشیوە، کە شیعرەکانی قورئان کارێکی تەواوو جیاواز لە شاعیرکە کاری تێ نەکات هەروەك لە شیعری شاعیرەکانی کەداهەیە، بگرە هەندێ‌جار پەنجە بۆ دەقی ئایەتەکە خۆی رادەکێشێ، پەنجە کێشانێك وەك یەکی بۆ ئەوەی کاتێ گوێی لە شیعرەکە ئەبێت هەمووئایاتی قورئانی تێدان و هەروەها لەو دێرانەدا بۆ (روح) کەبەجێی هێشتوون پێش ئەوەی (روح) بەجێ‌بێڵێ. قسەیەکی بەجێ نەهێشتووە کە باسی خۆی بکات یاخود چێی تووش دەبێ هەر باسی مردن و نوێژ وو هیچ و پووچی جیهان و راستی خوداو ئەوشتانەدەکان کە ئاین پێ دەبەخشێ بەتایبەتی قورئان.

دەبێ لێرەدا پەنجە بۆ گێرانەوەکەی جاحظ بکێشین لە (البیان والتبیین) داکەپەیوەندی بەوەوە هەیە کە مەبەستمانە ـ عمران کوڕی حطان وتی زیاد وتارێکی‌دا وتارێك بوو وام هەست کرد کە لە وتارەکەدا هیچ مەبەستێکم نیەو هیچم بۆ سەرزەنشتی کەسی نەکردو بەهەندێك کوڕدا گەڕام گوێم لە پیرێك بوو دەڵێ ئەو کوڕە وتارەکەی هەندێك ئایەتی قورئانی تێدابوویە باشترین وتار بێژی عەرەب ئەبوو.

ئەم گێرانەوە ئەوەمان نیشان دەدات وتاردانی عمران بە لایەنی‌کەوە پێش ئەوەی ببێتە شورات، بەشێوەیەکی کە دوای ئەوەی کە بوو بەشورات لەگەڵ شیعرەکەیدا جیاوازە، لەم وتارانەشی هیچ هیچمان پێ نەگەیشتووە خۆ ئەگەر بهاتایە بگەیشتایە دەمانتوانی ئەو گۆڕان و گواستنەوەیە لەبەر هەمی وێژەی عمراندا بەدی بکەیس دوای ئەوەی کە مل کەچی کاریگەرێتی رێڕەوو باوەڕی شورات بوو. هەروەها لەو گێرانەوە ئەوەمان دەست ئەکەوێ رای عمران سەبارەت بەو تاربێژی یاخود بەرهەمی وێژەی قسەی ئەوقسە کارەکارییان تێ‌کردووە.

عمران قورئان لە شیعرەکانیدا لە واتەو دواندا بەتەواوی کاری تێ کردووەو ئەم کارە کردنەش هەروەك لای شاعیرەکانی کە هەبوو لای وانەبوو کە ئەبوایە وابوایە دوای ئەوەی کە ژیانیمان زانی.

پێش ئەوەی قسەکەمان سەبارەت بەعمران کۆتایی پێ بهێنین ئەبێ پەنجە بۆ ئەوخاسیەتە بکێشین کە لە شیعرەکانیدا درەوشەی پێدەدات ئەویش خاسیەتی ئەوچاکەیە کە بە دڵ گەورەیەوە بەرەوپیری هەموشتی دەچێ کە دێتەرێی. ئەو دێرانەی کە حەجاجیان تیا باس دەکات و ئەو دێرانەشی وتوونی لەچوونەکەیدا بووە بۆیەمامە:

*طرونـی من الـبـلاد وقـالـوا*
*مالـك الـنـصـف من بنـی حکـام*
*سیـری قد جد خضـابـنـأ الـحـ*
*یر وکـونـی جوالـة قوی الـزمـام*
*لمتـی تلقـنـي ید الـمـلك الا*
*سود وتـسـتـنـبـقـیـنـی بأن لاتـضـامی*
*قد أرانـی ولـی من الـحـاکـم الـنـصـر*
*من مجـد الـسـنـان او بالـحـسـام*

ئەمانە هەموو سەرزەنشت کردنی دۆخەکەیەتی کاتێ کە سێیەم جا گەمارۆدراوو راکردوو بووەو خۆی شاردۆتەوە ئاگاداری ئەوە بووە نەگیری چونکە بەگرتنی سەریشی تێدا دەچوو، هەروەها لەم قسەیە داکە بە (روح) دەڵێ شتێ لە گیانە باشەکەیمان دێتە بەرچاو.[51]

*حتـی أردت بی الـعظـمـی فأوحـشـنـی*
*ما أوحش الـنـاس من خوف ابـن مروان*

ئەم گەمارۆ دراوە سەیرە، ئەو دەستەیەی کە توند دەستیان بە

ئاینەوە گرتبوو ئاین هەموو شتێکی لە بیر بردبوونەوە، ئەوتیرە گەرێتیەش کە عەرەبەکان لە بیریان چووەوە، لەژیانیدا هیچ دەمار گیری‌یەك نادۆزینەوەو پێچەوانەی ئەمە ئەوەی کە هەیەتی چارە نەویستنی تیرە گەرێتی‌یەو شیعرەکانی ئەم لایەنەی ناپاکی لە عاست راستیدا وێنە گرتووەو خۆشی نوێنە رایەتی ئەو دەستەیەی کردووە کە جەنگیان نەکردووە بەلاّم لە کاتی ئاسایشی‌و ئارامیاندا کوشتن وبڕین و دەربەدەری‌و دوور خستنەوویان چەشتووە.

بەرەوپیری نارەحەتی بە قایل بوون و سەرنجدا لە راستی چووە، عمران شیعری لیشاو بووەو جا ئەگەرئەو لە قسەکانیدا ئاسان بیّ‌و وێنەی هەستێکی ئاڵۆزکاوی نەکردبیّ‌و ئەگەر بە هێزوخوربیّ، ئاینێکی بە هێزو ئازایانە نەخش دەکات کە هێزکەی دەرون دەجولێنیّ‌و خاوەنەکەی والیّ دەکات خەڵکی پیّ‌ی سەرسام بن. ناسکی عمران رەنگی لە شیعرەکەیدا داوەتەوە بەتایبەتی کە وشەی مۆسیقاداری ئەوتۆ بە کارهێناوە کە لەگەڵ مۆسیقادا بگونجیّ بەتایبەتی چەند بارەی وشەو قسە ئەکاتەوەو لەم چەند جارە بونەوەیەشی موسیقایەکی لە سەرخۆ هەڵدەستی.

عمران وەکو قەتەری باوەری بە هێز نەبووەو جۆشی بۆ لایەن گیران و ئاینەکەی نەبووەو جەنگاوەریش نەبووە، هەروەها وەك طرماح دەمار گیری هۆزگەریی نەبووە بگرە باوەرە شوراتیەکەی بووە هەروەها نوێنەرایەتی باوەری شوراتەو نموونەی زۆری رەوشتە گشتی‌یەکانیانە، لەسەر کاری رەوا ئازا بووەو قسە لەرویی بووەو کە هیچ کەسیّ بەوجۆرە نەبووە، هەروەها نموونەی زمان رەوانی‌یان بووەو زمان رەوانی‌یەکی ئەوتۆ کەوێنەی نە بووەو کۆڵەکەی ئەم زمان رەوانی‌یەش قسەی راست و ئاسان و پێچاو پێچ و واتایەکی سەیروساکار بووە، ئەم شاعیرە بە هەڵکەو تووبی خۆی جیا بووەو هەڵکەو توویەکی رێگا ناسك و چاك بووەو بەرگەی هەموو ناخۆشی‌یەکی گرتووە، کە تووشی هاتووە.

## طرماحی کوری حەکیمی طائی: -

طرماح خۆی شوراتەو ئەمەش یەکەم شتە لە کۆڵینەوەی ئەم شاعیرەدا بێگەینیّ، طرماح وەکو قەتەری‌و عمران نەبووە، گومان لەوە دانیەکە شورات بووە، طرماح وەك قەتەری سەردارێکی سووپای شورات نەبووەو شیعرەکانیشی هەمووی لەگەڵ بیروباوەرەکانی شوراتدا وەك شیعرەکانی عمران یەك ناگرنەوە، بەلاّم ئێمە لە شیعری طرماحدا مەسەلەی کەدەبینین دوورە لە ئاین و باوەرەوەو بەشێکی زۆر شیعرەکانی گرتوونەوەو بەلاّم بەشی شیعری کەمەو هەروەها لە رەوشتی طرماحدا ئەوبیرە دەبینین کە دووری دەخاتەوە لەوەی پیاوێکی زۆر ئاینداریکی تەواو بێت، ئەگەر طرماح شوراتی نەبوایە ئەم لێکۆڵینەوە کورتەمان نە دەکردو دەهاتین لە وێژەی شوراتمان دەکۆڵییەوە.

ئیبن قوتەیبە لە نووسینەکەیدا (الشعر والشعراء في صدر الكلام عن الطرماح) كان صفرياً[52] ئەبو فەرەج لە (الأغانى)دا بۆمان دەگێرێتەوە طرماح سەری لە باوەری شورات و ئەزارقەکان داوەو ئەوپەریش باوەرێکی ئاشکرای پیّ‌ی بووەتاوەکو مرد، لە شوێنێکی کە دابۆمان دەگێرێتەوە ئەڵیّ:

طرماح رای شوراتەکانی دەبینی‌و لە شوێنی سیّیەمدا کە باسی دەکات دەڵیّ: طرماح صەفەری بوو، مەدائنی گێراویەتەوە دەڵیّ: طرماح لە ئەزارقەکان بووە[53] وجاحظ لە (البيان دا دەڵیّ: طرماح شوراتێکی صەفەری‌بوو.

ژیانی طرماح لە ژیانی شوراتەکانی کە باشترنەبوو، زۆرکەمیّ نەبیّ لەرووداوەکانی نازانین، تەنانەت لە دایك بوون وکەی مردوو پیّ گەیشتنی جیاوازی هەیە، ئیبن قوتەیبەو (شعبەی کوری حەجاج دەڵێن کە لە خوارووی عیراقدا گەور بووە، ئەصمەعی دەڵێت ئەگەر ئەوە راست بیّ کە طرماح باسی نەهرەوانی کردبیّ، بەلاّم ئەبوفەرەج دەڵیّ کە لە شام گەورە بووەو دوای ئەوە لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵ سوپای شامداهاتن چۆتە کوفە، باوەر کردن بەم دوو واتەیە شتێکی گرانە ئەگەر ئاور لە تەمومژی مێژووی طرماح بدەینەوە، کە طائی‌یەو نزیك شام دانیشتووە،

ئەمــە نەشتێـك پێش دەخـات ونـە دوادەخـات، مەرج نیـە هەر کەسێ لە ناو هۆزێکدا دانیشت واتە لەو هۆزە لە دایك بووبێ، طەبــەری دەڵێ مامی طرمــاح قەعقــاعی کوڕی قەیسی طائی خەڵکی کوفە بووەو دەڵێ: ویستوویەتی لەگەڵ یەکێ لەخەڵکی کوفە بڕوات و بەشوراتەکان بگات، داینان و لە گەڵیاندا ژیاوەو ئەمەش لەوەی کە ئێمە دەمانەوێ هیچمان دەستگیر ناکات، کە ماڵی مامی لە کوفە بووبێ لەدایك بوون و گەورە بوونی خۆشی لەشام بوو بێ، خاوەنی وتارەکەی دایەرەی مەعاریفی ئیسلامی دەڵێ: گومانی تێدانیە کە لە شام پێ گەیشتووە.(54)

طرماح لە هۆزی (طی)و لە خێزانە ناسراوەکانی ئەم هۆزەیە حاتەمی طائی کە ناوبانگی بەبەخشندەیی دەرکردووە خزمێتی و باپیریشی ناوی قیس بووە پیاوێکی بە ناوبانگ بووە، دەگێـڕنـەوە نەعمـان و شاکـانیکەی حیرە یاخود شام خێزانێکی جاهلیەتن و حاتم یارمەتی دان بەڵام ئەم چیرۆکە تەم ومژاوییەو نازانین ئەو مەلیکــەکی بووە کە گرتــوویــەتی هۆی گرتنـەکـەش نازانین قەیس ئەم طرماحەی ناردووە لەگەڵ نوێنەرەکانی طیدا بۆلای پێغەمبەر (د. خ) وموسوڵمان بووە.

ئەمە هەموو ئەوشتەیە کە لە سەرەتای دەزانین ئەمەش کەمەو لەکۆڵینەوەی ژیانیدا کەڵکی لێ وەرناگرین، ئەگەر مێژووی لە دایکبــوونیمــان بزانیـایـە دەمـانتـوانی ئەو دۆخـە گشتییـە باری سیـاسیو کۆمـەڵایـەتی هەڵسـەنگێنین، ئەمـەش یارمـەتییـەکی باشمان نادات بۆ ئەوەی لە طرماح و شیعرەکانی بگەین.

بەگوێرەی گێڕانەوەکەی ئەبی فەرەج طرماح لەگەڵ سووپایەك لە سووپــاکـانی شام چۆتـە کوفـە، ئەو کارەشی نازانین کە لەم چوونـەیـدا چی بووە، ئایـا جەنگـاوەرێکی سووپا بووبێ یاخود یەکێك بووبێ وەك خەڵکی کەو لەگەڵ سووپا رۆشتبێ، ئەگەر ژیانی گشتی طرماح پەیوەندی لەگەڵ سووپا دانە بووبێ ئەمە نیشانەیەکی تەواوی ئەم دوو رایە نیە.

(ئەبو فرج) دەڵێ (لە کوفە لای رئیم لاتی کوڕی ئەعەلەب) کە یەکێکە لەهۆزی رەبیعە دابەزیوە) رتیم لات یەکێکن لەو هۆزە یارمـەتی دەرانـەی دژی تەمیم لە شـەرەکـانی جاهلیدا شەریـان لەگەڵ تەمیم.

ولتلك حقیقة قمتها ـ ئەمە ئەگاتە پۆپەی راستی ئەگەرهاتوو زانیمـان کە بەشێکی زۆربـایـە خداری شیعـرەکـانی طرمـاح بۆ سەرزەنشتی تەمیم تەرخـان کراوە لەو ماوەیـە دالـە گێـڕانەوەکەی ئەبی فەرەجــدا دەڵێ: طرمــاح گوێی لەپیــرێ لە پیـرەکـانی تەمیــمی لاتی شورات دەگــرت هەر وەك ئەبــوفــەرەج دەڵێ، بەبــاشی ناوی دەر کردبـوو، قسـەی ئەم پیـرەکـاریتێ کردووەو باوەڕی ئەم پیرەی وەرگرت و تامردن هەربەو باوەڕەوە مایەوە.(55)

ئەوەکێ بووبێ کە طرمــاح گوێی لێ گرتبێ؟ شتـێکی ئەوتۆمان بەدەستەوە نیە بیناسین، ئەوەی دەیزانین (صالح کوڕی مســرح) بە درێــژایـی ساڵــی 75 کوچــێ خەڵــکـی لە موسڵ و جزیرە بانگە دەکرد بۆ باوەڕەکەی، ئایا ئەم صالحە لایە نگیریا خود نموونەی وەك خۆی لە کوفە بووە، ئایا طرماح ئەوەی لە صالح خۆیەوە یاخود لە یەکێ لە لایەنگیرە کانیەوە بیستووە. یاخـود لە یەکێ لەوانـەی بیسـتووە کە پەیـوەنـدیان پێوە کردووە، ئەمەش بەلای ئێمە وە بۆ دەست نیشان کردنی ئەو دەستە شوراتە بایەخی هەیە کە طرماح چووە سەر بیروباوەڕیان. . وەك بینیمان هەنـدێـك وتیـان لە ئەزارقـەکـان بووەو هەنـدێکی کەیـان وتیـان صەفــەری بووە، بەڵام راســتــد ئەوەی لای ئێــمــە کە لە صەفـەرییـەکـان بوو بێ، ئەمـەش لە بەرئـەوەی ئەزارقـەکان لە ناوچــەی بەصـرە جێگیـر بووبـوون و طرمـاحیش باوەڕەکـەی لە دەستـەیـەکـەوە وەرگرتووە کە لە کوفەدا بوون، ئەزارقەکان یاخی بوون نەك هەربــەپێـویست دەزانن بگـرە بەفـەرزیشیدا دەنێن، بەڵام طرماح یاخی نەبوو جا ئایا باوەڕەکەی دوای لە ناو چوونی دەســەڵاتـە جەنگییـەکـەیان وەرگرتبێ، ئەودەمە شتێکی ناخۆش دەبێ ئەگــەر دژیـان یاخی نەبێ. یاخـود ئەو باوەڕە بگـرێ کەوا دەسەڵاتی شکۆداری جەنگیان ئەگەرێنێتەوە.

ئەوەی ئەم راستیە بخوێنێتەوە، شیعری ساڵی مردنی وتووەو ئەوەی خواستووە چۆن شوراتەکان یاخی بوون ئەمیش یاخیبێت.

*فوارس من شيبان الف بينهم*
*نقا الله نزالون عند التزاحف*
*هم منعوا النعمان يوم رؤيته*
*من السماء في نجم من القيظ جارف*

شيبان لەگەڵ شوراتە صەفەری‌یەکاندا یاخی بوون و سەردارانی شیبانی‌یەکانیش صەفەری بوون، ئەبوفەرەج دەیگێڕێتەوە کە طرماح بە هەرزەکاری باوەڕەکەی هێناوە، دەڵێ: لە شام پێ‌گەیی‌و دوایی چووە کوفەو باوەڕکەی هێنا.

یەکەم شت کە بۆمان دەربکەوێت لەگەڵ گیانی شوراتدا جیاوازی لای طرماح هەبێ ئەودەمارگیری‌و سەرزەنشتەیەتی دژی هۆزی تەمیم، نهێنی ئەم دەمارگیری‌یە ئەبێ چی بێ کە ئەو شورات بێ‌و شوراتەکانیش بەوە ناوبانگیان دەرکردووە کە ئاین بە لایانەوە پێش هەموو شتێکەو ئاین هەموو موسوڵمانێك بە یەك چاوەوە تەماشا دەکات، باشە ئەو ستایشەی کە هی یە زیدی کوری مەهلەبی دەکات چیەکە لەگەڵ مەهلەبی باوکیدا شەڕی لەگەڵ شوراتەکان دەکردو مەهلەبی باوکی یەزید بوو کە سامی ئەو ئەزارقانەی شکاند کە بە هێز ترین و ئازاترین ئەو دەمە دەستەی شورات بوون.

رەگەزی دەمارگیری کە دەمارگیری هۆزگە رێتی بێ لە مێژووی شوراتەکاندا رەگەزێکی بایەخدارو زۆر کاریگەر بووە. هۆ کەش ئاشکراو روونە ئەویش ئەوەیە کە ئەم حزبە، لەگەڵ ئەوەی کە دەربارەی رێکەوتنی موسوڵمانەکان زۆر دەدوێ بەڵام بریتی‌یە لە دوورەگەزی بایەخداری عەرەب، رەگەزی زانا دەوار نشینە خاوێنە عەرەبەکان ئەوانەی لە بیروباوەڕدا توانەوەو ئاین نەبێ دەمارگیری‌و هەموو شتێکیان، لە بیر چووەوە، ئەوی کەشیان رەگەزی ئەو حوشتر سوارانە بوو کە ئاینیان بە هێز بوو بەڵام ئەوەیان لەبیر نەچووەوە کە ئەوانە سەر بەهۆزێکن و دەمارگیرن بۆی، ئەم کۆمەڵەی دوایی ئەوەی لە باوەڕی شورات دەست گیریان بوو لە هیچ باوەڕێکی کەدا دەستیان نەکەوت، ئەویش تیر بوون بوو لە ژیانیاندا لە دوو بڕوای مەترسیدار، بڕوای ئاینی‌و بڕوای چاوبڕینە دەسەڵات وەرگرتن بوو، بەڵام کۆمەڵی یەکەمیان بازنەی شیعری عمرانن وکۆمەڵی دووەمیان بازنەی تەواوی شیعرەکانی طرماحن.[56]

بەڵام شوێنە واری باوەر لە ژیانی طرماحدا جیهادوو بەلاشوراتیەکەیەتی راستی‌یەکەشی ئەوەیە کە لە مێژووی جەنگەکانی شورات هەندێ دوور بووەو دوای سی ساڵی یاخود زیاتر مردووە. بایەخدارترین شۆرشی صەفەری‌یەکان نزیکەی (106) کۆچی بوو لەزاڵ بوندا بەسەر ئەزارقەکان و نەجەداتدا طرماح مرد پیرێکی پەك کەوتە نە بوو شیعری پێش مردنی وتووە کە نیشانەی هێزوو توانایەتی‌و بەڵام لەبەر ئەوەی شەڕی نەویستووە لە شیعرەکانیدا بەشێکی بریتیە لە ئاین و بەشەکەی کەی بریتیە لە مەسەلەی شوراتەکان و ئەوە دەردەخەن کە لەگەڵیان بووە.

طرماح وتاربێژێکی باش بووە، بەڵام شتێك لەم وتارانەمان هیچ پێ نەگەیوەو گێرانەوە یەك هەیە کە تۆزێك لایەنی وتاربێژی یەکەی رووناك دەکاتەوەو ئەویش ئەو گێرانەوەیە کە عبد الأعلى باسی طرماح دەکات لە (رەی بەرەو شتدار) بینیویتی لەم گۆشەیەوە باسی سیفاتی‌و تاربێژی طرماح لە بەشی زانیاری‌دانی زیاتر دەکات.

لەو سەردەمەدا چوونە ناوەوەی زانیاری‌و قوڵ بوونەوە نەبووە، ئەم برادەرەی دە توانی کە لە رێی گوێ لێ بوونەوە چێژ وەرگرێ بێ‌ئەوەی خاسیەتی وتاربێژی بوو بێت.

بەڵام شیعرەکانی طرماح ئەو بایەخەی هەیە کە هیچ شیعرێکی شوراتەکان ئەو بایەخەی نە بووەو یەکەم کەسە کە دیوانێکی چاپکراوی هەیەو طرماحی شوزات دوو پارچەی تیا هەیەو پارچەی دووەمیان لە شوێنێکی کەی ئەم باسەدا نیشان دەدەین وئەمەشیان پارچەی یەکەمیەتی.

*لله در الشراة انهم*
*اذا الكرى مال بالطلا أرقوا*
*خوفاً تبيت القلوب واصفة*

تكـاد عنهـا الـصـدور تنـفـلق
كيـف ارجـى الـحـيـاة بعـدهـم
وقـد مضـى مؤنـسـى فانطـلقـوا
قوم شجـاع على اعـتـقـادهـم
بالـفـوز ممـا يخـاف قد وثـقـوا

لەم دێـرانـەدا باسێكی دۆخی شەوی شوراتـەكان دەبینین كە (احیا) كان لە دێـری دووەم و سێـیەمـدا ستـایشێكی چاكیـان هەیە. دوایی بریاری ئەوە ئەدات كە ژیان دوای شەهیدەكانیان و ئەوانەی لێیان مردووە ژیان هیچ تكایەكی تێدانیەو شیعرەكە بەوە تەواو دەكـات بەوەی كە ئەوانـە خاوەنـی باوەڕن و ئاگـادا.ی باوەڕەكـەیـان بە تەواوی دەكـەن و تەواو بڕوایـان بەسـەر كەوتنی ئاینەكەیان هەیەو ئەمەش پارچەی دووەمی شیعرەكەیەتی.(57)

لقـد شقـيـت شقـاء لا انـقطـاع له
ان لم أقـر فوزه تنـجـى من الـنـار
والـنـار لم ينـجـح من روعـاتـهـا احـد
الا الـمـنـيـب بقلب الـمخلص الشـارى
او الـذي سبـقـت من قبـل مولـده
له الـسـعـادة من خلاقـهـا الـبـارى

شاعـر لەو شیعـرانـەدا بڕیـاری ئەوە ئەدات كە لە ئاگـر ڕزگار بوون لە سەر شوراتەكان بەندەو بەڵام ئەوەی لە بیر ناچێت كە خودا بۆ ئەوەی چی‌ی دەوێ. كە واتە لە بیری چووە هۆزەكان هەموویان ڕووی وخۆی لە بیر چۆوەو سەبارەت بە ئاینیش قسە دەكات و بەهەشتیشی هەربەوانە داوەكە خاوەنی ئەو تەنیا باوەڕەن كە باوەڕی شوراتەكانە، بەڵام ئەو سەركەوتنەی چیەكە لە ئاگر ڕزگـاری دەكـات، ئایـا وەر گرتنی باوەڕە كەیـە، كە لە ووپێش باوەڕی پێ هێناوە؟ ساڵی مردنی ئەو سەكەوتنە دەر دەبڕێ و دەڵێ:

وانـی لـمـقـتـاد جوادی وقـاذف
بە وبـنـفس الـعـام احـدی الـمـقـاذف(58)
لأكـسـب مالا أو أؤول الـى غنـى
من الله يكـفـيـنـى عداو الـخـلائـف
ولـكـن اصـن يومـى سعـيـدا بعـصـبـة
يصـابـون فى فج من الأرض خائـف
عصـائـب من شتـى يؤلـف بينـهـم
تقـا الله نزالـون عنـد الـتـزاحـف
هم صنعوا الـنـعـمـان يوم رؤيـته
من الـمـاء في نجـم من الـقـيـظ...
اذا فارقـوا دنـيـاهـم فارقـوا الأذى
وصـاروا الـى موعـود في الـمـصـاحـف

ئەم یاخی بوونـەی كە دەیـەوێ ئەویـارمـەتی‌یە یە كە لە ئاگر ڕزگـاری دەكـات و طرمـاح شۆڕشگێـڕێكی بێـزارەو هانی یاخی بوون لە شوێنێكی شیعرە كەیدا ئەدات.

گیانی وەك گیانی شوراتیك نموونەی چوونە پێشەوەی باوەڕی ئاینداری و لایەنگیرێتی:

فأقـذف بنـفـس في الـبـلاد فأيـنـمـا
يقـضـى ويـقـصـر همـه الـمـتـلبـد

ئەو یاخی بوونەی كە لەم دێرانەدا باسی دەكات یاخی بوونی شوراتـە، یاخی بوونی بەشێكی كەمی لادەرەكـە نارەحـەتی لە ڕێی بیروباوەڕدا تووش دەبێ و كۆكەرەوەی شێوەی خواستی ئەم دنیایەو تایبەتێتی‌یەو داوای مافی خۆی لە خەلافەتەتدا دەكات، بگرە خو داپەرستیش كۆ دەكاتەوە (خۆی) لەو دێڕەدا دەبێتە یەكێ لەو دەستـەیـە واتـە (سـوارەكـانی شیبـان) ئێمـە ئەوەمـان زانی شیبـانیـەكـان لە سەركـردەیـەك زیـاتـریان یاخی بووەو شەبیب و شۆڕشەكەی لە ژیانی طرماحداو زوحاكی كوڕی قەیس و وەلیدی كوڕی طریف و هی كە لەوانـەی كە شۆڕشـەكـانیـان زۆر تونـد نەبوون ئەمانەش وەك بەهلولی كوڕی بشر، طرماح لەو دێرانەدا سوار چاكی ئاینی و خۆخستنـەوەی مەتـرسی شوراتـەكـان باس دەكـات و بە سۆزێكی زۆر بەهێـزەوە لە شیعـرەكـانیـدا لێ‌یـان دەدوێ. ئەو سوار چاكـی‌یـەی كە لای قەتـەری زۆر بەهێـز بینیمان. هەروەها ئەو دێرانە وەسفێكی جوانی ژیانی طرماحە كە دەیـەوێ خۆی لە جێ‌ی ئەو كوژ راوبـێ. لە دوو دێـری دوایی دەڵێ: دەیـەوێ بكـوژ ڕێ و ئێسكـەكـانی كانی فڕێ بدرێن و بلاوبنەوەو تێكـەڵی پیسی ببێ تاوەكـو بابـلاوی بكاتەوە نیشانەی

نەمێنێ، بەڵام گۆشتەکەی دارزێ و باڵندە لێی کۆبنەوەو گۆشتەکەی ئەوەندە بەرزکەنەوە تاوە کوتەواو لە ئاسمان نزیك دەبێتەوەو لام وایە ئەگەر هاوسانیەك لە نێوان ئەم نزیك بوونەوەیە لە ئاسمان و لە نێوان ئەوەدا کە لە رێی بیرو باوەڕو ئایندا بکۆڕ رێ بکەین.

لەم دوو پارچەیەدا دەبینین طرماح لە کۆمەڵی شوێندا پەنجە بۆ شوراتەکان رادەکێشێ و دێرەکانی کەی دوایی بۆ نموونە ئەگەر ناوی نەبردنایە، تەنیا هەرباسی ئەوان دەکات، پەنجەیان بۆ رادەکێشێ و دەڵێ:

*عمی الذي اصبح الحلائب غدوة*
*من نهروان بجحفل مطنان* (59)

مامەکەی دەبێ کێ بێ؟ ئایا ئەوەیە کە لەگەڵ کوفەی‌یەکاندا ویستی یاخی‌بێ و دایان نان وجێ نشینیان کردن؟ مێژوو نووسەکان ئەم هەواڵی قسەیەیان دەربارەی شەڕی نەهرەوان باس کردووەو شان بەشانی ئەم دێرانە شوراتەکان لە دێری ئاینیدا دەبینین، کە ئەمانەش ئاینی طرماح و سەرنجی دەربارەی مردن و ژیان و ئەوەو دنیاو ئەم دنیایەو ئیستا دەردەخەن و ئەم دێرانەش لە شیعری پێنجەمی دیوانەکەیدایەو دەڵێ:

*ترك الدهر اهله شعبا*
*فاستمرت من دونه عقده*
*وكذلك الزمان يطرد بالنا*
*س الى اليوم فيومه وغده*
*لايلبثان باختلافهما العمر*
*و وان طال فيهما أمده*
*كل حي مستكمل عدة العمر ومرد اذا انقضى عدده*
*عجباً ما عجبت للجامع الما*
*ل يباهي به ويرتفده*
*ويضيع الذى يسيره الله*
*اليه فليس يعتقده*
*يوم لا ينفع المخول ذا الثر*
*وة خلانه ولا ولده*
*يوم يؤتى به خصماه وسط الجن والأنس رجله ويده*

*قل بتللي الأموات لاتبك للنا*
*س ولا يستنفع به فنده*
*انما الناس مثل نابقة الزر*
*ع متى بان يات محتصده* (60)

دەبینین باسی دۆخی خەڵك لەوەو دنیا دەکات کە چۆن سورە لە سەری کەڵکی‌نیەو کە زۆر جار لە ژیاندا دەبینێ و لە ناوە راستی ئادەمیزادوو جنۆکەدا دەبێ و گوێی لەدەنگەکە دەبێ و نەهێزو نەدارایی و نەکەس و نەکورونە هیوای هەیەو ئەمەش رێگەی خودایەو رۆژگار زەلام رۆژ بەرۆژ دەباتە پێشێ و تاکاتی مردنی دێ و کاتێ کە سەرەی هات چۆن دروێنەیەك دەکرێ مردنیش هەروا دروێنەی مرۆڤ دەکات و ئەمەش نموونەیەکی راستی ژیانە، هەست بەراست گوێی و باوەڕی شاعیرەکە دەکەین کە ئەم لەشیعرەکەیدا کۆ دەکاتەوەو دووهێزیان تێدا پەیدا دەکات کە زیاتر روونا کیان دەکاتەوەو جوانیان دەکات و دێرەکان مۆسیقایەکی لەسەر خۆو لەگەڵ واتەکانیاندا دەگونجێ. مۆسیقایەك کە ئەم لەسەر خۆیەی لەو دەریا تەنکەوەوە گرتووە کە پەیوەندی بە سنگ و بێ دەسەڵاتیەوە هەیە، هەروەك ئەمە دەنگ دانەوەی پەیوەندی ئەوبیرە جوانە بێ، لەو قافیەی بێ دەنگە دەنگ نەرمە، قافیەیەك کەوا لە خوێنەر دەکات کە بەتەواوی هێمن بێت و هەموو دێرێك وەك هێمن کردنەوەیەکی ئاواتدارو بیرکەرەوەی واتەیی بێ و وەك هێمنت کردنەوەی ئەوکاریگەری یەیەتی کە پەیوەندی بەواتای مۆسیقاوە ئەو باشیەی دەیگوێزێتەوە، بەکارێکەوە کە هەستێکی هێمن و ئامادە بووی جوان نەبێ هیچی کەی تێدانیە.

دێرە ئاینی‌یەکان و ئەوانەی پەیوەندیان لە شیعری طرماحدا پێوەی هەیە زۆر کەم نین کەواتە شیعرەکەی چیە؟ پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکە بدەینەوە پەنجە بۆ راکەی رادەکێشین کە شیعرەکەیەتی. دەڵێ کاتێ کە مخلد کوڕی یەزید فرمانی دەداتێ کە بەپێوە ستایشێکی بکات، بەخودا ناتوانم ئەو شیعرە بڵێم چونکە لە پلەم کەم دەکاتەوەو لەوەش کەمتر وریا بوونەوەمەکە ئەمەش بربرەی شانازی و جێی باسکردنە بۆ شتە

کاریەگەریەکانی عەرەبە) ئەوەی کە مەبەستمانە ئەو هێزو گەورەیی یە کە لە شیعرو شاعرەکەدا هەن، ئەوەشی بمانەوی باس کردنی شیعرە بە جۆرێك کە شایەنی شیعرەکەبێ ئەمە ئەوەیە کە عەرەبی یەك ماوەیەکی دوورو درێژ پێش سەردەمی طرماح و دوایی ئەو عەرەب تێ ی دەگەی بەلاَم طرماح ئەمەی لەبەر هەمەکانیدا جێ بەجێ کردوو بە شێکی گەورەی شیعرەکانی شانازی کردنە بەخۆیو نەتەوەکەیو سەرزەنشتی دوژمنەکانێتیو لەم بوارەدا گەورەترین پایەی هەیەو دەڵێ:

***اذات قبضت نفس الطرماح اخلقت***

***عرى المجد واسترخى عنان القصائد***

ئەم دێرە بەرامبەر بە برادەرەکەی دەرونی شاعیرەکە دەردەخات و ئەمەش ناونیشانی ئەم شاعیرە مەزنەیەکە هەستی بەرامبەر گەورەیی لەسەر رژێمی دنیاکەی روون کردۆتەوە وای لێ کردووەو خەڵکی حەسودی پێ بەرن نەك لە بە رشتی بگرە لەبەر ئەوەی کە ئەو گەورەیەو ئەوان بنەوبنەچە هیچ و بووچن طرماح بۆ باس کردنی ئەو مەزنایەتی یەی هاو چاخەکانی لە دیوانەکەیدا جێ نەکردۆتەوە، وشەیەکی بەم هێزو دلسۆزی‌یە لە شوێنێکی کەدا هەیەو دەڵێ: (61)

***يولف بين الناس بغضي ومالهم***

***سوى فرط اجماع على جمع***

***وما بيَ من شكوى لنفسي منهم***

***ولا جزع انى اذا لجزوع***

خەڵکەکە وایان لێ هات هیچ ئیشیان نەمابوو تەنیا گەورەیی طرماح و رق لێ بوونەوەی نەبێ، هەر لەم رێگەیەوە یەکیان دەگرت لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گازندەی لەم رق لێ‌بوونەوەیەو ئەو کەڵەکە بوونە لە سەری نەدەکردوو کە کامەیان سووکە وکامەیان سووکترە، ئەمانەی هەموو لەو دڵی‌خۆیدا حەشاردان هەر وەك گازندەی لەم دوو لایەنەوە نەبێ:

طرماح بەم هەستی رق لێ بوونەوەیە تەنیانەبوو، بگرە دۆخی شوراتەکان لەو دەمەدا، تەنانەت دوا ئەو دەمەش هەروەك مێژوو بۆمان د رگێڕێتەوە وابوو. ئەوە بەسەکە هەر ئەو قسە ناشیرینانە باس بکەین کە بە عمران دەدران. خەڵکی وەك دەستەیەکی دژ ی ئاین تەماشایان دەکردن کە نە دەوڵەتیان هەیەو نە دارایی کە ئەم دەستە دژ بەئاینە برازێننەوەو توندو تیژ یان کەم بکەنەوە، شوراتەکان تەنیا ئەوانە نەبێ لەسەر باوەریان بوون نەیانتوانی دڵی کەسێکی کە بۆخۆیان راکێشن، ئەوانەشی کە لەگەڵ باوەرەکەیاندا بوون لەم شوراتانەدا نموونەی بەرزی ئایینداریو کێتیان بێ دەستە دەستەییو جیاوازی تێدا دەبنین و ئەمانەشیان تیابەدی نەکردنایە دوور دەکەوتنەوە لەخراپەو دەست بۆ درێژکردن نە بێ هیچ شتێکی کەیان بە دواوە نە بوو، ئەگەر جەنگیان بکردایە ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکوژراو ئەگە بشمانایەوە بەنارەحەتی ئەژیان ئەویش یان لەبەندیخانەدا ئازار دەدران یاخود دەر بەدەر بوون بوو، بەلاَم لە خۆیاندا هەستیان بە قایل بوونێك دەکردو ئەمەشیان لەو ئازارا نەدا مەبەست بوو کە توشیان دەهات، سەرچاوەی ئەم قایل بوونەش ئەوە بوو کە ئەوانە پێویستی یەکی ئاینی جێ‌بەجێ دەکەن و لە خۆ قایل بوون بوو ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك کە لەیەك جیاوازن بەلاَم لە ئاییندا زۆر هەڵناکەن، طرماح لەو دەستەیە بوو کە هەستی بەوشکی هاوچاخەکانی بەرامبەری ئەکردوو بەلاَم کە هەستی بەگەورە بوونی خۆی دەکرد هەستی بە برینداربوونێك دەکردو لە شیعرەکانیدا نوێنەرایەتی ئەودەستەیە بەچاکی دەکات.

لەکۆڵینەوەی طرماح و شیعرەکانیدا ئەوەمان بینی کە نوێنەری دەستەیەك شوراتەو نوسینەو وێژەیی‌یەکانیش شتی ئەوتۆی تەواویان دەست نە خستوین چونکە ئەو نموونەی بەرزی یە نەبوو کە لە تینی چاودا تێبەری بوو. ئەگەر عمران شاعیری دەستەیەکی ئایینداری ئاشتی خواز بێت، قەتەریش شاعری دەستەیەك بێ کە ئیمانی بەجەنگ هەبێ، طرماح نموونەی ئەو دەستە ئیمانداره بەهێزە یەکەهیچ شتێکیان لە ئاینەکەدا لە بیر ناچێو ئەو دەستەیەشە کە بەشی زۆری شوراتەکانی درووست کردوو طرماح لە مەدا بۆمان دەردەخات کە چۆن شیعری شورات تەنیا پەیوەندی بەهێزی باوەرەکەیانەوە نیە.

بگرە ئەشگەرێتەوە بۆ سروشتە بەهێزە تایبەتی‌یەکەی دەوارنشینی یاخود نیمچە دەوارنشینی، ئەم طرماحە لە دەوارنشینێکی سەربەست زیاتر لە سروشتەکەیدا دەوارنشینی‌یە، بۆ هەندێ مەسەلەی شانازی سەرزەنشت چووەکە پەیوەندیان بەئاین و باوەرەوە نیەو بەلاَم خۆی بەهێزەو راست گوێە وهێزی تەماشاکردن و راست گوێو رامان دەکەشێن بۆ ئایینداری. (62)

# گەشتی ژیانم

● مەسعوود محەمەد ●

## ئالقەی سێیەم
## «ساواییم»

لە لایەن تەنسازییەوە، ساواییم بە سەلامەتی تێپەڕیوە. جگە لە سووریژە (کۆیی پێی دەڵێن سۆرکە) دەردی ئەوتۆم نەدیتووە مەترسی لێ بکرێ. سووریژەش بە مل هەموو کەسیکەوە هەیە.

ووردە نەساغی وەکوو تاو چاوکولی بۆ ئەو دەمانەی بەر لە 60 ساڵ پتر دەفتەری بۆ ناگیرێتەوە، بەڵام من لەو کەسانەم کە دەردو ئازار زۆریان تین بۆ دەهێنن. جاران حەکیمان دەیانگوت ئەوەی میزاجی (بەڵغەمی Phlegmatic) بێ هەستی بە ئازار کەمترە لەوەی میزاجی (هەوایی) بێ. وابزانم هەوایی لە زاراوەی ئەم ڕۆژانەدا پێی دەڵێن (Sympathetic) ئەگەر وەهاش نەبێ و زاراوەی دیکەی بۆ داندرابێ فەرق بە باری تەنسازی من ناکات: وشەیەکە منی تێدا بەسەهوو چووم، لەشم سەهووی پێوە ناکات، بەهەمە حاڵ چەندی شوێنێکم بریندار بوو بێ درێژی کێشاوە لەچاو برینی هاوڕێکانم. تا ئێستاکەش شوێنی ئاودز بوونی پشت نینۆکی پەنجەی ناوەنجی‌ی دەستی ڕاستەم بە چاو فەرقی پێ دەکرێ، ئاو دزیەکەش بە برینێکی زیدە بچووکی دڕۆیك بوو بە حاڵ فەرقی پێ دەکرا لەبن پێستی پشت ئەو نینۆکەم بەڵام خۆ نەپاراستنم لە ئاوی حەوزی بن سوولی پاشا لە چنارۆك تەشەنەی بە برینەکەم کرد، خەلقی دیکەش وەکوو من برینیان تێ دەکەوت و بەئاوی سوولی پاشا تەڕیان دەکردو چشیان لێ بەسەر نەدەهات. ئەو ئاوە مەشوورە بۆ خراپە، بەڵام با چاکەشی باس بکەم: لە هەموو ئاوەکانی هۆبەی مەلازادان لە چنارۆك سازگار ترە بۆ چێشتی برنج. دیارە مادەیەکی تێدایە ئەو کارەی پێوە بێ.

لەلایەن هەست و هۆشەوە، وەك بۆیان دەگێڕامەوەو خۆیشم بە بیرم دەهاتەوە، بە پێش تەمەنی خۆم دەکەوتمەوە. باوکم لە ڕادەبەدەر دڵی پێم خۆش بوو، چاوەنۆڕی‌ی کرداری لە باری لێ دەکردم. بۆ باوکێکی کوڕەکەی خۆش بوێت و بەتەمای زەکاوەتی

بێت، جێگـەی دڵ ئارامییـە بۆی کە ڕۆڵـەکـەی بەبەریەوە هەبی ئەوەی لێوە بگوترێ کە باوکم لەم بەیتەدا بۆ منی ڕەوا دیتووە:

**به ئومێدم له لطفی (لم یزلی)**
**بیبه نائب منابی کاکی جەلی**

وەهـا بووە لە مەجلیسی خۆی، کە جارێ تەمـەنم 4 ـ 5 ساڵی بوو، قسـەی مەیلەو کامـڵامـەی لێ گێـرامـەتـەوە. لەسەر شکێن کردنی ئەو کەسـانـەی بە خورافـات هەڵـدەخـەڵـەتێن قسـەیـەکی منی باس کردبـوو بۆ ئاپـۆرەی گوێ گرانی وەعـزی ئێـوارەیـەك لە ئێـوارانی ڕەمـەزانی ئەو تەمـەنـەم: گوێ بیست بوویووم، گۆیا کەری دەجاڵ جێگەی حەفتا هەزار جوولەکەی لە سێبەری یەك گوێچکەیدا دەبێتەوە:

منیش گوتبـووم کوڵانـەی کوێی تەسکن ئەو کەرەیـان پێـدا نایـەت لێی مەتـرسن، باوکیشم قسـەکـەی لە وەعـزدا کردبوو بە شایـەد بۆ زێـدە گومـڕایی و گەمـژەڵیی کەسێکی دروێـەك بسەلمێنێ کە هۆشی ساوایەك پێی ڕازی نەبێ.

لەو تەمەنەی منداڵیمدا وەکوو هەموو منداڵێك، یەکجار حەزم دەکرد شەوانە گوێ لە سەرگورشتەی جۆرا جۆر بگرم، بەڵام لە زۆر زووەوە دەمـزانی هەمـووی درۆن هەرچـەند حەزیشم دەکرد ڕاست بانایە. پاڵەوانەکانی ناو ئەفسانانم خۆش دەویستن بەڵام خەفەتم لەوەدا دەخوارد کە هەڵبەستراون. بە نموونە جارێ لە تەمەنی پێش چوونە مەکتەبم بووم سبەینەیەکی زستان، بەر لە ڕۆژهـەڵات، لە نزیـك موغـەیری ژوورەکەی باوکم دانیشتبووم وفکـرم لە حیکـایـەتێکی شەوی ڕابووردوو دەکردەوەو دەمگوت: من هەر خۆمـم، پشیلەکـەم هەر پشیلەیـە، موغـەیـری هەر موغەیرییە... باوکم دوای نوێژی سبەینە چووبۆوە ناو نوێنەکەی وگـوێی لەو گروگـاڵـەم بوو، لە دایکمی پرسی بەسعـوود بۆچی وەها دەدوێ؟

دایکم بزەیەکی هاتێ و گوتی، شەوێ لە حیکایەتی سیحرباز گوێی لێ بوو کە جارێکیان بوو بە هەنارو خۆی بە دیواردا داو دەنکەکانی پەرت بوون ئافرەتە دڵ پاکەکەش بوو بە مریشك و دەنکەکانی هەڵگرتنەوەو خواردنێ.. ئەویان بوو بە ئاگر ئەمیان بوو بە ئاو بی‌کـوژێنێتـەوە، دیـارە حیکـایەتەکەی بە بیر هاتۆتەوەو باوەڕی پێ نەهێناوە.. باوکم وەها گەشایەوە باس ناکرێ.

لەو بابـەتـەی باوەڕ نەهێنـانم بە قسـەی نادروست، نەجیبەی خوشکە گەورەم تا ئێستاش لە موناسەبەدا دەگێڕێتەوە چۆن کە منداڵ بووین، بەشەو پاش ماوەی جەژنانەیان لە باغەڵەکانمان دەردەهێناو خەڵووزیان لە شوێندا دادەنا، سبەینێ پێیان دەگوتین پارەکە بۆتە خەڵووز، تەنها من بەو قسەیە ڕازی نەدەبووم.

بە بیـرم دێتـەوە، یەکجـار منـداڵ بووم، جارێکیـان حەفت ڕووپیەی جەژنانەم لە کونی کلیلەوە خستە ناو کێلوونی دەرگەی ژوورێکی نابـەرچـاوی ماڵـەکـەمـان [ڕووپیـەی ئەوسا پتر بوو لە ڕۆژانەی دەر ڕۆژی کرێکارێك]. چەندێکی گەڕان بە دوا ئەو پارەیەدا نەیاندۆزیەوە منیش پێم نەگوتن چیم لێ کردووە. وابزانم ئەو کارەم تاکتیکێکی سافیلکـانـەی هۆشی منـداڵیم بوو بەرانبەر فروفێڵی (پارەکەت بوو بە خەڵووز). چەند مانگێکی پێ چوو، جارێکیـان بە ڕێکـەوت لە کردنـەوەی دەرگـەی ئەو ژوورەدا کە کلیلیـان لە کێلوونـەکـەی بادا زرینگـەی ڕووپیـەکـان هات، ئیتر بزماری کەیان کێلوونەکەیان کێشاوەو پارەکەیان لێ دەرهێناوە.

چاك بوو پارەکە هەر بە پاشماوەی جەژنانە حیساب کراو بوو بەهی یا عصمەتی دایانم.

لە نمـوونـەی (بـەپێش تەمـەن کەوتنەوە) ڕووداوی تەمەنێکی ساواتری خۆمم بە بیر دێتەوە، بەڵام ئەگەر دواتر بە گێڕانەوە لە مێشکم چەسپ نەبـوویـایـە لەوانـە نەبـوو فکـرم بۆی بچێتەوە: شەوێکیان لە شەوانی زستان مەجلیسی باوکم قەڵەباڵغ بوو بە ئەهلی گەرەك و بە دەستەو دایەرەی جەمیل ئاغای حەوێزی کە ئەوسا قایمقامی کۆیەو لە پیاوە هەرە بەرچاوەکانی بوو. یەکێك لە وانـەی خزمـەتی باوکمیـان دەکـرد منی لە باوەش کردو بردمی بۆ مەجلیسـەکـە: ئەوسـا من پێ‌ڕەوکـە بووم. کە کابـرا بردمیـە ژوورەوە، هەر لە دەرگـە ئاودیـوی مەجلیسـەکـە بووم دەستی ڕاستـم بۆلای لاجـانگم بردو بەزمـانی ساوایـانەم سەلامم کردو

گوتم (سەلا عەکوم). ئەو خەڵقە تێکرایان بۆم بەرز بوونەوەو جەوابی سەلامیان داوە. باوکم وەری گرتم و لە تەنیشت خۆیەوە بەلای جەمیل ئاغاوەی دانام، لەوە بەولاوە چی‌دیکەی ئەو شەوەم بە بیردا نایەتەوە. دواتر کە هۆشم بە شتان شکا فکرم لەوە دەکردەوە، چۆناوچۆنی ڕاست بوونەوەی ئەو هەموو خەڵقە بەو دەنگە بوورە هەنگییەی یەك نەوای سەلام دانەوەیانەوە نەی شڵەژاندم:

لەبەر چاو ساوای ئەو دەمەدا قەڵەباڵغی‌ی ژوورەکە وەك دارستانی چڕ بوو. بەڵێ دەزانم ماڵمان هەمیشە قەڵەباڵغی‌و هاموشۆکەری پێوە دیار بوو، ئەمەیش تا ڕادەیەك ڕای هێنابووم بە دیتنی ئاپۆرەی خەلق، بەلام باری ئەو دەمەی کە سەلامەکەم کردو بۆم ڕاست بوونەوە وەك باری کەسێك دێتە بەر چاوم کە یەکەم جار لە سەرشانۆ بەرامبەر ئاپۆرەو جەماوەر ڕادەوەستێ لەگەڵ تێ‌بینی ئەوەدا کە من پێشتر بەتەما نەبووم بچمە سەر شانۆ، ئەو تەمەنەشم نەبوو لە هەڵکەوتی ناکاودا وەکازی ئیرادەو خۆگیریم ڕاست ڕابگرێ.

لە بەراوورد دا هەڵکەوتێکی دیکە باس دەکەم مەبەستی پتر بێ ڕوون دەبێتەوە لە نەشڵەژانی ئەو دەمە گشتەی ساواییمدا: سێ چوار ساڵێك دواتر کە چووبوومە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتایی، ڕۆژێکیان ڕیزیان بە هەموو قوتابیان بەست لە هەیوانە دوورو درێژەکەی نهۆمی خوارەوەی قوتابخانەکە بێ ئەوەی بزاندرێ مەبەست لەو ڕیز بەستنەدا چییە. لە نکاو مدیری مەکتەب کە لەگەڵ مامۆستاکان لە شوێنێکی دیارو بەرچاو وەستابوون، بەدەنگی بڵند ناوی منی هێنا کە بچم بۆ لای. زۆر باش لە بیرمە، ئاوازی ئەو بانگ هێشتنە لەبەر گوێم شیرن نەبوو هەرچەند نەشم دەزانی لەبەرچی، چونکە لەو دەمەدا بەرواڵەت هیچم شك نە دەبرد لێی بسڵەمێمەوە. لە هەوەڵەوە نەبزووتم هەتا جاری دووەم مدیر بە دەنگێکی نەرم و خۆشەویستانەو بە دەستیش بانگ هێشتنی کردم بچمە لای. شوێنی ڕاوەستانی مدیر لێمەوە نزیك بوو منیش لەو قەڵەباڵغیەدا کە هەموو چاوێك تەماشای منی دەکرد بە دوو دڵیەوە هەنگاوی نارەزامەندیم بەرەو مدیر هەڵێنا تا گەییشتمە بەر دەمی، ئەوسا کارتێکی چاپ کراوی (ئافەرین) لێ نووسراوی بەرز کردەوەو لەگەڵ هەڵدانەوەیەکی دڵسۆزانەی ڕەووشت و زەکاو نازانم چیم کارتەکەی دامێ‌و خۆی مامۆستاکان، لەگەڵ ئەواندا هەموو قوتابی وفەراش و ئەوەی ڕاوەستابوون کەوتنە چەپڵە ڕێزانێکی گەرم و گوڕ تا گەرامەوە شوێنی خۆم.

زۆر چاك لە بیرمە ئەو چەپڵە ڕێزانە گەلێك پتر بەرەو شکۆ لێ‌نیشتن و نائارامییەوەی بردم لەچاو دەمی جەواب دانەوەکەی (سەلاعەکوم)ی ساواییم، تەنانەت نەچوومەوە باری ئاساییم هەتا بە پەلە گەییشتمەوە شوێنی خۆم لە لایزی قوتابیانی پۆلەکەم و لە زەقوزۆیی‌ی هەڵوەستە مەسرەحیەکەم ڕزگار بووم.

ئەو ئافەرینە هەر وا دەزانم بە من درا، نەبیستوومە پێشتر بەکەس درابێ، دواتریش کەسی دیکە وەری نەگرت، بێ‌گومان لەوەدا حورمەتی باوکم دەخلی هەبوو بەلام دەبێ خۆیشم شتێکم بۆ ڕەچاو کرابێ دەنا ئەگەر هەر خاترانەی باوکیان لەو پاداشەدا تێ‌خوێندبایەوە دەبوو پاداش بە کوڕی جەمیل ئاغای قایمقامیش بدرێ. بەهەمە حاڵ ئەو ڕۆژە من لە تەمەندا بچووکترینی قوتابی مەکتەب بووم و بەو ئافەرینەش بەرچاوترینیان بووم.

لەو ڕووداوانەی دەیانگێڕایەوە، کە جارێ لە هەموو شتێکدا من تەمەنی بیرهاتنەوەم نەبووە، جارێکیان لە هاویندا کەریمی فەتاح بەگ بەخۆی‌و نەوە دسواری چەکدارەوە دێتە چنارۆك. ماڵی ئێمەو ماڵی مامم لەگەڵ خزمانی خاوەن ڕەزو باغ بەخێریان دەهێنن خزمەتێکی باشیان دەکەن. باوکم و مامم و (مەلا عزت کوڕی مەلا حەبیب)یش کە پیاوێکی بەرچاوی جەلیزادان بوو هیچ کامێکیان لە چنارۆك نابن. کەریم بەگ لە حکومەت قاچاغ بووە هەر ڕۆژە لە جێگایەك و هەر شەوە لە نوایەك بەسەری بردووە، تەیارەی ئینگلیزیش بە دوای دا دەگەڕا.

ترسی تەیارە وەهای دەکرد کە دەبوو کەریم بەگ سبەینان بەر لە بەخۆکەوتنی تەیارە بۆ سۆراغ کردنی بگاتە حەشارگە، ئێوارانیش دوای بەسەرچوونی وەختی فڕینی تەیارە بەرێ

بکەوێ. ئەو ڕۆژە لە چناروك بەر لەهەموو شتێك ولاغەکانیان لە نێو چۆم و نغوردی درەختدا شاردنەوە نەکا تەیارە بیانبینێ، لەوەشدا بەسەهوو نەچووبوون چونکە لەو ڕۆژەدا چەند جارێك تەیارە بەسەر ئەو ناوەدا تێپەڕی بوو دیارە لە کەریم بەگ و سوارەکانی دەگەڕا. وەك دەیانگێڕایەوە کەریم بەگ ڕەفتاری مەردانەو حەیاکارانە بووە. نەیهێشتووە بەردەستەکانی پرکێشی لە کەس بکەن، هەرکە دەگاتە شوێنی لێ حەسانەوەی بن سوولی پاشاو ولاغەکان حەشار دەدەن بە خەڵقەکە دەڵێ، من کوڕە مریدی شێخ کەریمی[1] بەرزنجیم (کە تەکیەی لە کۆیە بوو، بەر لە 20 ساڵێك وەفاتی کردبوو). خەڵقەکە پێی دەڵێن فاتمەخانی خێزانی شێخ نووری نەوەی شێخ کەریمەو ئیستا مێواندارێت دەکا لەم چناروکە. فەتاح بەگ کە ئەمە دەزانێ پتر دەکەوێتە حورمەتکاریو سلاو بۆ فاتمە خان (ماموژنم) دەنێرێ. وەك دەگێڕنەوە منیان بە باوەش بۆ لای برد بوو، گویا لە جیاتی باوکم بەخێرهاتنی دەکەم (هیچم لەوە بەبیر نایەت) بەلام کاك مەجیدی مامە نوورەددین کە ئەوسا مێرد منداڵە بووە لای دادەنیشێت وهەموو حورمەتێکی لێ دەبینێت. وەها ڕێك دەکەوێ لە شوێنێکەوە چەند ولاغێکی دۆست و ناسیاوان بە بارەوە دەگەنە ماڵی مامم. چەند پیاوێکی کەریم بەگ ئەو ولاغانە دەردەست دەکەن بە نیازی ئەوەی کاتێك بەرێ بکەون کەلوپەلی خۆیانیان بار بکەن. کەریم بەگ بەمە نازانێ.

پاش عەصر کە خەریکی ڕۆیشتن دەبن ماڵاوایی لە ماموژنم دەکات و تەوازوعی بۆ دەنوێنێ، ئەویش پێی دەڵێتەوە کە جەنابت وەها ڕادەنوێنی مریدی باپیرم بیت ئەدی بۆچی پیاوەکانت جەردەییمان لێ دەکەن؟ ئنجا کەریم بەگ حیکایەتی ئەو ولاغانە دەبیسێت و بەتوندی لەو کەسانە قەڵس دەبێ کە دەستدرێژییان کردبوو.

دوای عوزر خوازییەکی پیاوانە ولاغەکان دەگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئیتر ملی ڕێگە دەگرن لە بناری شاخەوە بەرەو لای هەیبەت سوڵتان کە لەوێوە بۆ دیوی دەشتی کۆیێ ئاوا ببن و بچن لە قەیاغی دوکان بۆ بەری سلێمانی بپەڕنەوە. ئەم ڕووداوە لە هاوینی 1923 بووە.

لە نێو تەمومژی بیری منداڵیم، وێنەی کەسان و شتان و شوێنان زۆلا جودا خۆیان دەنوێنن لە وێنەی دواتریان کە دەهاتە بەر هۆشی تەمەنی هەڵکشاوترم. هەروەی دیمەنی چەشمەندازی چناروك کە لە تەختەی فامـدا نەخش بەستوو بووە وەهام دەهێنێتەوە یاد کە ئەو شوێنانەی لە ماڵمانەوە نزیکن ئەوسا دوورتر خۆیان نواندووە، شاخە دوورەکانیش چ حیسابێکی تایبەتیی دووری ونزیکیم بۆ نەکردوون. وا پێ دەچێ لەو تەمەنەدا دووریو نزیکی هەر لەو مەودایانەدا حیسابیان بۆ کرابێ کە بەلای فکری ساوایمیەوە خەڵقیان دەگاتێ و لێی دێنەوە. ڕەنگە هەروەك ئاسمان بەولای عەیارەی دووریو نزیکییەوەیەو شتێکە بەر پێوانەو کێشانە ناکەوێ، هەروەهاش شاخەکانی پژدەرو قەندیل و هۆویو هۆوێندەرێ لەبەر چاوی تەمەنی 3 ـ 4 ساڵیمدا نە دوور بوو بن نە نزیك. نەك هەر ئەمەندەو بەس: بە چاکی دێتەوە یادم، دیمەنی گشتیی ئەو دنیایە لەبەریەکری کێشرایەوەی بێ سنوور کە دەهاتە بەر چەشمەندازی چناروك بۆم نەدەبوو دیمەنێکی سەرانسەری بەسەریەکەوەی یەك پارچەی بێ بڕگەی بێ جمگە، بە پێچەوانەوە تا ڕادەیەك لە تابلۆی سوریالیستی دەکرد کەوا هەر شوێنەی وجودێکی سەربە خۆی هەیە، تا لەهەموو تابلۆکە نەگەیت لە تاك تاکی وێنەی ئێرەو ئەوێی ناگەیت بایی ئەوەی مەفهومێکی گشتیی تابلۆکەت بۆ ڕوون بکاتەوە.

لەمەش پتر بینینی ئەنتیکەی تەمەنی ساوایی خۆمم دێتەوە یاد: دیمەنی هەندێ شوێنی ئەوتۆ کە بەزۆری لە دەوروبەری نزیکمدا بە سەریاندا دەکەوتم خۆی دەسەپاند بەسەر ئەو شوێنانەی کە لە نەدیودان وەیا نەدەهاتە بەر زەینم، ئیتر کە دواتر بیرم بۆیان دەچوو وام دەزانی گەلێك شوێنی ئەم جیهانە بریتین لە درێژەکێشانی شوێنە بەرچاوو ئاشناکان. ئەم (چاو ئاڵۆزی ـ یان زەین ئاڵۆزی) یەم لە چناروك بۆ دەرەخسا کە چەشمەندازی بەرەو پێشەوە بەرەو ڕاستەو بەرەو چەپە دووری دەخوێندەوەو، هەرچی دیمەنی شار بو خێرا بە خێرا دەخزایە ناو قەپێلکو

بەرتەسکی چوار دیواری حەوشەو سەربان و کۆڵانە، مەتەڵی دووری‌و نزیکی لێ پەیدا نە دەبوو. من نازانم منداڵی دیکەی وەکوو خۆم چ خەیاڵی وەهایان بە دڵدا هاتووە لە نموونەی ئەوەی ئێرەدا باسی دەکەم یان، چونکە هەرگیز پرسیاری ئەوتۆیم لە هیچ هاورێیەکم نەکردووە، رەنگە بوو ئەگەر پرسیش بکەم وەڵام وەرنەگرمەوە، یەکەم جاریشەوا لەم نووسینەدا باسی ورێنەی (چاو سوورکێ؟)ی منداڵیم دەکەم، پێشتر ئەم گرێیانەم بۆ کەس نەکردوێتەوە.

هەر لە بیرمە ساڵێکیان، کە جارێ زۆر منداڵ بووم، دوای بەسەر چوونی کژی هاوین ماڵمان لە چنارۆکەوە گەڕایەوە بۆ کۆیێ، وێنەی پچڕ پچڕم لە چنارۆك یاد دەکردەوە.

وام دەهاتەوە بیر کە خۆڵەپۆتەی لاپاڵی رۆژاوای ئەو گردەی کە پیرەکانی هۆبەی گەڕەکە ماڵی مەلازادانی بەسەرەوە بوو، تا ئەو خۆڵەپۆتەیە بەهەموو لایەکی گردەکەدا تا دامەنی دەکشاو کەسێکی بیەوێ دەتوانێ بە ئارەزوی خۆی (خۆڵە خلیسکێ - خشخشۆکێ)ی لێ بکات. کە هاوینی دواتر چووینەوە چنارۆك خۆڵە پۆتەکەم نەدیت تومەز جارێ خاکەکە رین هاتوچۆو پێ‌خوستی لێ نەکرابوو. بەرە بەرە خۆڵەپۆت پەیدا بوو بەڵام لە رووپێوێکی بەرتەسکدا کە سەدیەکی ئەو مەودایەشی تێ نەدەبوو من بە تەمای بووم. ئەو هاوینەیان لەوەندە وەستام کە خۆڵەپۆتی ساڵی پێشوو دەرنەکەوت بەڵام ساڵەو ساڵ بەهۆی دەرنەکەوتنەوەی خۆڵەپۆتە ئیقلیمگیرەکە بۆم روون بۆوە کە من کاتی خۆی لەبەر منداڵیم وکەم فامیم بە سەهوودا چوو بووم، زۆریشی برد تا سەهووی منداڵی لەو تەرزە بارانەدا بۆم ببێتە ئەنجامێکی ئاسایی نەك رێکەوت لە زەینی ساوادا لەو رووەوە کە خەریك بوونی مێشکی ساوا بە دیمەنی نزیکەوە بەبەریەوە هەیە لە دیمەنەکە زیادْ بکات وبەسەریەوە بنێ تومەز عەیارەی پێوانەی زەینەکە بچووکە، وەك ئەوەی کە قوماش بە میلیمەتر بپێویت درەنگ لێی دەبێتەوەو لە قیاسدا قوماشەکە درێژ تر خۆ دەنوێنێ لە حەقیقەتی خۆی.

بەداخەوە لە سەدی نەوەدی خەیاڵ و خوولیاو لێکدانەوەی منداڵی دەسڕێتەوەو لە بیر دەچێتەوە چونکە ئیمکان نییە تۆمار بکرێ. کە مرۆڤ دەشگاتە تەمەنی هۆش کرانەوەو دەسەڵاتی نووسین لە سەد هەزاری یەکێکی ئەرکی تۆمار کردنی خەیاڵاتی کۆن و هی دەمی نووسینەکەی بە ئەستۆوە ناگرێ هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە بایەخی پێ نادات و بەماندووبوونێکی بێ سوودی دادەنێت کەچی بەعەکسەوە، نەقش بەستوو کردنی خوولیای هەر تەمەنێك بێ وەك تاشینی پەیکەرە کە بوونەوەرێك نەمر دەکات.

ئێمە بە تێکرایی کوڕی دوێنێ‌و پارو ئەوەندە ساڵەی رابوردووین نەك لەبەر ئەوەی کە بە عەزم و ئیرادەی خۆ بەبیر هاتنەوە رچەی رەوتمان لە رۆژگار بەستووەو بە ئاوڕدانەوە وێنە خۆمان لەهەموو قۆناغە بە سەرچووەکانماندا دەبینین، تەنانەت من خۆم ئەوەندە فۆتۆغرافەشم نەکێشاوە بە شێوەیەکی رێك دەساڵ دەساڵی تەمەنم بنوێنن: ئێمە لە رابوردوومان ئەو دیمەنانەمان بە بیردا دێتەوە کە بەخێری خۆیان و رێکەوت نەسڕاونەتەوە. چەند حەزم دەکرد لەم تابلۆیەی بیرەوەری ساواییمدا، وەکوو وێنەگر هەموو تابلۆکەم بە بیرهاتنەوەی سەر لەبەر رەنگاوی بکردایە نەك وەکوو تاك تاکە رایەڵی جاڵجاڵۆکە وێنەی پچڕ پچڕ ژیانم بە خستنە بەر تیشکی لێوردبوونەوە نەختێك گەش بێتەوە. بەهەمە حاڵ خوێنەر دەبێ لەگەڵمدا باڵ قوڵ بێت و ئەرکی لێ‌بیستنم هەڵبگرێت، خۆ ئەوەی راستی بێ کردنەوەی رووپەرەی ژیانی هەر کەسێك بێت بەرو بەرهەمی لەوە تێپەر ناکات کە بخوێندرێتەوەو ببیسترێت: نە خۆراك نەپۆشاك نەنوای حەوانەوە نە سامان و دارایی نە زانینی زانستی‌و ئەدەبی‌و هونەری، هیچیان لەو سەرگورشتەیەی گەشتی ژیانەوە بەسەر کەسدا نابارێ تەنانەت بە تەمانیم، هەتا بۆم بکرێ، پەندو ئامۆژگاریش لە پەنا بیرەوەریدا بە خوێنەر بفرۆشم. بەڵام ئا لێرەدا خەبەرێکی میراتی خانەوادەیی خوی رەپێش دەکات پێوەندی بە بیرهاتنەوەی تەمەنی ساوایی‌یەوە هەیە، نەختێکیش پەندا مێژە:

باپیری باپیرم، مەلا عەبدوڵڵای (واثق بالله) کوڕی مەلا عەبدوررەحمانی کاکی جەلی سێ حاڵەتی شیرەخۆری خوی

بیرهاتۆتەوە کە پێوەیانەوە ناڕاحەت بووە: یەکێکیان ئەوە بووە، لە کاتی پاشەڵ شوشتنی ساوادا سەری ساواکە دەکەوێتە تەنگژەی نێوان بن هەنگڵ و ڕان و قەپرغەی دایکیو تێیدا هەناسە سوارو خەفەخـان دەبێ. دووەمیان ئەوە بووە کە بەسەر ئاگرەوە ئەم دەست و ئەو دەستیان پێکردووە زۆر ترساوە. سێیەمیان ئەوە بووە متومۆریو نوشتەیان لە پاشەسەری کۆچکەی درووەو لەسەر پشتی لانك ئەو زەق ورەقانەی لەسەری چەقیوون، چەندێکی گریاوە لەبەر ئێشی سەری دایکی مەمکی لە زاری ناوەو لایە لایەی بۆ کردووەو ژێر نەبۆتەوە.. ئامۆژگاری دایکان دەکات کە منداڵەکانیان لە ئازارو ترسی ئەولۆیی بپارێزن.

لە ڕێی گێڕانەوەوە دەزانم کاتێك ویستبوویان لە شیرم بکەنەوە بەپێی عادەت دەرمانی تاڵ و سوێریان هێنا بوو لە گۆمەمکی دایانم یاعصمت بدەن تاکو مەمکەکەم لەبەر چاو بکەوێت. وابێ دەچێ ئۆگرم بە دایانمەوە وەهابووە پاش تەمەنی دوو ساڵیش هەر مەمکیم مشتووە هەر چەند شیریشی زۆر کەم بوو بوو بۆیە بووە تەمەنی ئەوەم هەبوە مەبەستیان تێ بگەم ئیتر پێم گوتبوون دەرمانی تێ مەدەن مەمکی نامژم ئەمما لێم گەڕێن هەر لای ئەو بنووم. بەمە مەسلەتیمان کردبوو.

ئەو دیمەنە پچڕپچڕانەی بیرەوەری منداڵیم کە دێنەوە بەر هۆش و گۆشی ئێستاکەم هێندیکیان چشتی ئەوتۆن لە کژی خۆیاندا ساڵانە روویان دەدا وەك: گوێزەی ماڵ بۆ چنارۆك، مشتاغ ڕاکردن، کار دروستایی ڕەمەزان، خرپو جۆیانی قاوورمە وگیپەی دابەستە، چەڵتووك کوتان، ئامادەکردنی ماڵەوە بۆ ژیانی زستانە، کاروانە داری دۆستی لادێیی لە کژی پاییزدا، هەنار تریێ جەلیو نازەنین و سناوە لە کژی خۆیدا.. هتد.. هتد.

کە فیلمی ئەو دیمەنانە لە زەینی خۆمدا دەدەمە بەر یاد کردنەوەوە بە ڕوونی دەبینم وێنەیان لە تەمەنی منداڵیمەوە بۆ تەمەنی هۆش کرانەوەم لەیەکدی جودان. بە نموونە، لەبەر تیشکی کزی فامی منداڵیمدا ئەو کوتکانەی کە ئالقەی پیاوان بەنزکەی سینگیانەوە لە کۆمەڵی چەڵتووکیان ڕادەکێشا کارێکی مەتەڵاوی تەماوی بوو بەند بوو بەو دەمەی هەڵسوکەوتەکەی تێدا دەکراو گەپ و گۆبەندی تێ دەخزا وچاپەی بە دمەوە دەخورایەوەو لە مێشکمدا نە دەچوەوە بۆ برنج سپی کردن و چێشت لێنان وەیا برنج فرۆشتن و بەدیاری هەناردن. دەمزانی کوتەك لە چەڵتووك دەدەن بەڵام پێم سەیر نەبوو ئەگەر لە جیاتی چەڵتووك لەگڵ و بەردیان ڕاکێشایایە.. دەمدیت یەکێك بە سیکار دەوەدێت (دواتر زانیم پێی دەڵێن قەساب) دابەستەکان سەر دەبڕێت و کێشەی گیپەو قاوورمەی بەدوادا دێت بەڵام ئەگەر لە جیاتی سەربڕینیان بەپێش خۆی دابان و برد بانی بۆ هەر کوێیەك بێت فەرقێکی ئەو تۆی نە دەکرد بەلامەوە. دەمزانی دابەستەکان پێوەندی بەماڵمانەوە هەیە بەڵام خاوەنایەتی ئێمە پێیانەوە هێندەی خاوەنایەتی خۆم بە پەپەجانەکەمەوە نەبوو[پەپەجانە: جۆرێکە لە پێڵاوی ساوایان]. هەروەها کە لە چنارۆك دەمدیت ئەو خەڵقە کتوپڕ ڕۆژێکیان دەکەونە خۆیان و شوێنی مشتاغ ڕۆنان پاك و هەموار دەکەن، بەکەرو قەڵتارە ترێ ڕەش لە ڕەزەکانەوە دەهێنن و هێشوو هێشوو ڕای دەخەن، دەمزانی ئەو ترێیە دەبێتە مێوژ بەڵام ئەگەر لە جیاتی ڕۆنانی پێشێلیانت بکردایە وەیا بەم لاو لا دا فڕێیان دابایە کارێك دەبوو، بۆبەر زەمینی منداڵیم، برای ڕۆنانەکە بێت: هەستم نە دەکرد بە (حتمیة)ی هاتوباتی مشتاغ ڕۆنان و مێوژ هەڵگرتنەوە. ئەمما ئەگەر شەوێکیان یەکێك لە ئەهلی ماڵەوە شوێنی نووستنی گۆڕیبایە ئەو جێ گۆڕکێیە قاڵبی هەمواری لە قەناعەتمدا پەیدا نە دەکرد.

بەشێکی دیکەی ئەو دیمەنانە هی هەڵکەوت و ڕێکەوتە کە کژ و جەم و دەمی بۆ نییەیان هی شتی بەردەوامە کە نەکژ نە هەڵکەوتی تێدا نییە ـ لە نموونەی هەڵکەوت: سەفەر، سەیران، شایی، شین، شەرە چەپەڵۆك، برووسکەو ڕەهێڵ، داوەت.. هتد.

نموونەی شتی بەردەوام کە لە خەیاڵی منداڵیمدا شوێنی هەبێ: کەسانی بەرچاو، هاو تەمەنەکانم، شوێنی گەمە لێکردن، ماڵ و دەربوونەو گەڕەك، ولاغی جوان، پشیلەی دەستەمۆ، درەختی ڕێك، خانووی بەرز..

تێکرای ئەو دیمەنانە کە هەر بایی فامی منداڵ واتای دیاریان

له مێشكمدا زره ڕەنگی دەدایەوە، تەختەیەكی (وشەی پێكدا تێپەڕیو ـ كلمات متقاطعة) له بیری منداڵیمدا دروست دەكەن، هێندێ وشەی زۆر شیرن و هێندێكیشی زۆرو كەم، تاڵن، شیرنایی‌و تاڵاییشیان چەندێكی هەبوو‌بێت له عەیارەی فامی منداڵیمداكه له ڕێژ بیان دەكرد، واته پتر لەوەی هەبوون دەهاتنه بەر هەستی ساواییم، نەك لەبەر ئەوەی هەڵكەوتەكان زل بوون بەڵكوو لەبەر بچووكی‌ی پۆرگی دەروونی ساوام.

له ووشه خۆشەكانی ئەو تەختەیە، بۆ تەمەنی هەرە زووی بیركردنەوەوم، (سەیران) بوو ئنجا چ له بەهاراندا بەر له پشكووتنی درەخت و چ له سەرەتای هاویندا كه دەبوە كژی پێگەیشتنی فەریكه سێوو تووی هەمه جۆر. كەساوا بووم سەیرانم بەند بوو به ئەهلی ماڵەوە چونكه لەو تەمەنەدا من و هاوڕێكانم توانای سەیرانی تایبەتی خۆمانمان نەبوو. ماڵی ئێمەو ماڵی مامه نوورەددینم له بەهاردا یەك دوو جاران دەچوون بۆ سەر چاك یان دەرماناو، وەهاش دەبوو لەگەڵ خزمی دیكەدا به كۆمەڵی گەورەترەوە ئەو سەیرانانەیان دەكرد به تاقمی ڕابواردنی ڕۆژێكی سەر لەبەرەوە: ولاغ بۆ سواری‌و بار لێ‌نان بەهی خۆمان و هی خوازرایەوە بایی پێویست، بگرە له پێویستیش پتر، ئاماده دەكران و دوای بەرچایەیەكی بەپەلەو زوو له سبەینەدا تێكرامان، جگه له باوكم و مامم و یا فەخرەی پووری گەورەم و یەك دوو بەردەست، بەرەو شوێنی سەیرانەكە دەچووین، ژن و منداڵ و پیاوی لێ‌هاتوو بەسواری‌و هێندێكیش بەپێیان.. ئەو ڕێگایە، بایی ڕۆییشتنی سەعاتێك و دوو سەعات بوایه به چەپڵه ڕێزان ونوكتەو پلارتێك گرتن و تریق و هۆرو گەشانەوە دەپێچرایەوە بۆ سەر ژوانی مەبەست. من به پێی بڕیاری ساواییم له كۆشی دایانم بەسەر ولاغەوە یان به باوەشی پیاوێكەوە وەكوو قەپووچكەی ئاو لەگەڵ شەپۆلی ئەو كەیف و زەوقه سەراو دەبووم. هەندێكیان كه جارێ له تەمەنی پێش مەكتەبمدا بووم، بەر لەوەی بچین بۆ چنارۆك، به قەڵەباڵغی‌و هاتوباتەوە سەردانێكی چاكی (پەڵكانه)مان كرد. ماڵی ئێمەو ماڵی مامم و ماڵی (خاڵه صدر)ی كوڕی شێخ كەریم (خاڵی مامم بوو) لەگەڵ چەند ئافرەتێكی به ساڵدا چووی كه به عادەت دەكەونه بەر حیسابی دڵ ڕاگرتن و خاترانه، دوای بەرچایی‌یەكی زوو، لێ سوار بووین و به دوو سەعات ونیو گەییشتینه سەر چاكەكەو، له ژێر دار توویەكی بەسەر كانیاوێكەوە ڕوا بوو بنگەمان دانا. وەها ڕۆییشتبوو كه ئەو كانیه، به اصطلاح، بێ بنه واته كەسێكی بچێته ناویەوه پێی ناگاته زەوی‌و ئەگەر مەله نەزانێ دەخنكێت. منداڵێكی له ئێمه باڵخۆشتر، حوێزناو،[2] كوڕی ئافرەتێكی سەر به ماڵی خاڵه صدرمان لەگەڵدا بوو ئازایی خۆی تاقی كردەوە بەوەدا جۆلانه بەسەر كانیەكەدا بكات و ترسی خنكان نەیوەستێنێ. دەستی گەیانده لكه ووێك و خۆی بۆ شل كردو به دەنگی بەرز تێی هەڵكرد: حێلانێ جۆلانێ.. جارێ به تەواوی سەرێكیان بەسەر كانیەكەوە جۆلانەی نه كردبوو لكه تووی هەرام قرچەی كردو شكاو حەوێز شلپەی له ئاوی كانیەكه هێنا. دایكی زیراندی‌و خەڵقەكەش سەغڵەت بوون له ترسی ژێراو بوونی لەو كانیه بێ بنەدا، كەچی حەوێز به سەلامەتی له كانیەكەدا چەقی‌و هەر هەتا هەوراز كەمەری له ئاودا بوو. تومەز كانی فێڵباز بەهیچه ئەو ناوبانگەی بۆ خۆی داسەپاند بوو. ترسی خنكانەكه بوو به پێكەنینێك و تویقو هۆرێك ئەو سەری دیار نەبێ. ئەو حەوێزه باوكی نەمابوو، له جیرانەتی ماڵی خاڵه صدر بەخۆی‌و دایكیەوە، لەچاو وەزعی بێ باوكی، ژیانێكی خۆشكەڵەی ڕادەبواردو بەزۆریش له هاموشۆی خزمانەدا هاوبەشی دەبوو له گەمەو گەپی هاوتەمەنەكانی خۆی له بەرەی ئێمەو ماڵی خاڵه صدر. ئەو ڕۆژه لەو جۆلانه مەترسی لێ‌كراوەدا مەبەسی خۆ هەڵدانەوە بوو بەسەر فەتحی (شیربرام)و فاتیحی خاڵه صدر كه هاو تەمەنی بوون.

پەڵكانه بریتییه لەو كانیاوەو قەبرستانێكی لێوەی نزیكه. وەها ڕۆییشتووە كه پیاو چاكێك لەو قەبرستانه نێژراوە، گۆیا ئاوی كانیەكەش دەرماناوە. له ماوەیەكی كەمدا دێی (ناصر اغا) هەیه كه هی ماڵی شێخ كەریم بوو، ئەوسا بەشێكی هی خاڵه صدر بوو، دواتر به كڕینەوە هەمووی بوو بەهی ئەو. لەو جۆره

سەیرانانەدا ئەو دێیە لێمانەوە نزیك بایە یارمەتی دەداین لەهەر شتێکی پێویست بایە، لەماست و دۆ دریغییان نە دەکرد، دەهاتن دەبوو گیسك دەیا بەرخیان بە دیاری بۆ دەهێنایین هەرچەند لەلایەن خواردنەوە بەکاردروستایی تەواوەوە دەچووینە ئەو شوێنانە. خەڵقانەکەش ئەو ڕۆژە پێمانەوە دەگەشانەوە هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە هەلێك دەبوو دەقی ژیانی یەکنەوایانی تێدا بشکێنن و لەنزیکەوە سەر بەجۆری ژیانی شارستاندا بگرن. هەمیشە ئافرەتی لادێ حەزی کردووە خشڵ و پۆشاکی ئافرەتی شارستان ببینێت بە بەژن و باڵای ئافرەتەکەوە. زۆر بە سەیری منداڵەکانیان نامۆیی‌یان لێ دەکردین: هەر دەتگوت ئێمەیان بە دانیشتووی جیهانێکی نائاشنا بەوان حیساب دەکرد، تەنانەت کەم گەپی منداڵی لادێ هەیە بەهی منداڵی شارستان بچێ، لەوەشدا جوداوازی شارستان و لادێ کاریگەر بوو نەك هی چینایەتی چونکە بۆ منداڵی لادێ هەموو منداڵی شارستان بێگانە بوون بە دەوڵەمەندو هەژاریەوە، لە شاریشدا منداڵ هەژار بایە یان دەوڵەمەند بەیەکەوە یارییان دەکرد.

لە کۆیەوە کە بتڕوانیە پەلکانەو ناصر اغا ڕووت دەکەوتە ڕووکاری دەربەندی بازیان واتە لە نێوان باشوورو ڕۆژهەڵاتی کۆیێ کەوتوون.

جاری وەها دەبوو لە سەرەتای هاویندا لە کۆیەوە، یان لە مانگی ئاب لە چنارۆکەوە دەچووین بۆ کانیە گەرمەکەی مەشوور بە (حەمام جەلی). بۆ خەڵقی ناوچەی کۆیێ بە ئاهەنگی ئەو ناوەوە دەگوترا حەمام عەلی‌و حەمام جەلی. مەبەس لە حەمام عەلی کانیە گەرمەکەی (حمام العليل)ی نزیك مووسڵە، کەم کەسیش دەیزانی حەمام عەلی قوت کراوی (حمام العليل)ە. کانیاوی (حەمام جەلی) لە دوو کیلۆمەتری‌ی دێی جەلی بەسەر ڕووباری (باسەڵم)و لە دامەنی کلکەی جیای ئاوەگرد بەلای چنارۆکەوە هەڵکەوتووە.

جێگەی هەڵقوڵینی کانیە گەرمەکە بە ڕۆخی ڕووبارەکەوە بوو، هەر ساڵە کەڵەکی مەحکەمی ئاو نەدەلاندوویان بە دەوری کانیەکەوە هەڵدەنا تاکوو ئاوی ڕووباری تێکەڵ نەبێ‌و ساردی نەکاتەوە. هەڵبەت کەڵەك لە خۆوە هەڵنانرێ‌و ئاوی سا... گەرم بە خۆڕایی لێکدی جودا ناکرێتەوە.

دەبوو یەکێك ئەم کارە بە ئەستۆی خۆیەوە بگرێ. ... دەمانەدا کە من بۆ بیرەوەرییان دەچمەوە خزمێکی جەلیەتی... حاجی کوڕی مەلا عارف، سەروبەری کانی هەڵنا... ڕێك خستنی شوێنی ژنان و پیاوانی ئەنجام دەدا لە پاد... مزەیەکی بێ ئەرکی بۆ دەچوو لەو کەسانەی دەهاتنە... گەراوان و ئاوی گەرمی حەمام جەلی (نەختێکی دیکە ب... گەڕاوان دێت). من ئەو مامە حاجییەی مەلا عارفم چاك ب... دێت. چ لەو سەفەرانەی جەلی‌و حەمام جەلی ئێمە بێت و چ... سەردانی ئەو بۆ چنارۆك و کۆیە بێت گەلێك جاران دیتو... گوێم لێی بووە. مەلا عارفی باوکی، کە ئەوسا پیرترین کەس... جەلی زادان بوو، بە حاڵ و وێنەیەکی تارمایی ڕەنگی لێ... دەکەمەوە ئەویش لە ڕێی بیستنەوە بەینێکی مەودا درێژی لە... باپیرم، بە دوا ئەویشدا لەگەڵ باوکم ڕابواردووەو هەر لە م... ئەوانیش وەك ئەندامێکی خێزان بەسەری بردووە. خەبەراتی... مەلا عارفە لەگەڵێك باردا باس دەکرا تەنانەت باوکم گەلێك... تیفەی لێ دەگێڕایەوە، یەکێك لەوان ئەوە بوو دەیگ... ڕەمەزانێکیان کەوا تازە دەهات بکەوێتە گەرمای هاوین، م... عارف، دەمەو عەسرێك لای باوکم لە قووڵایی دڵ... هەناسەیەکی حەسرەتەو مەندی هەڵدەکێشێت. باوکم ل... دەپرسێ ئەو هەموو حەسرەتەی بۆچی بوو؟ دیسان بەدەم هەن... هەڵکێشانەوە دەڵێ خۆزی نە دەمردم هەتا فتارێکی بە ئارەزو... دڵی خۆمم کردیایەوە.

باوکم پێی دەڵێ، مەلا عارف تۆ ئارەزووەکەت بڵێ، مە... بێ مادەم لە توانامدا بێ فتارەت بۆ ساز دەدەم دا بزانم ح... لەچی دەکەیت. ئەویش پڕ بە دڵ و بێ مەبەستی گەپ... پێکەنین دەڵێ: تەرۆزیەکی پیر پیر، دۆیەکی ترش ترش... نانێکی ڕشاوی بوو بێتەوە هەویر. ئەمەی گوتو وسکت بو... باوکم بە دیار ژماردنی خواردەمەنی دیکەوە گوێ رادەگرێ بەڵا... هیچی دیکەی بە دوادا نایەت. دەزانێ ئەمەیە ئارەزووەکەی

ئەویش پێی دەڵێتــەوە: مەلا سبــەنیێ دوای عصـر دەنێـرم لای بەقاڵەکان کام تەرۆزی لەبەر زێدە پیری حەیوانیش نای خوات ئەوت بۆ بهێنن. هەر لە دوا ڕۆژ هەلاَتیشـــەوە دۆی ماڵــەکــەی خۆمـانت بۆ لەبـەر هەتـاو دادەنێین هەتـا وەکوو زەهری هەلاهیل ترش هەڵــدەگــەڕێ، نانیـشــت بۆ لە ئاوی گەرم هەڵکێشن بە ئارەزۆی خۆت نەرم بێتــەوە، ئەممـا ئەگـەر لە نەوسـان وەزگیش بدەی نابێ لەوە بەو لاوە هیچت بچێتە هەناو، خۆتۆ منت تۆقاند بەو هەناسە دووکەڵاوییەت، لام وابوو داوای زلابیەی بەغدام لێ دەکەیت. . ئێوارەی ڕۆژی دووەم مەلا عارف فتاری بە تەرۆزی پیــرو دۆی ترشــاوو نانــی هەویــراوی کردەوە بەو جۆرەی کە تامەزرۆی خۆراکی بەهەشت لێی تێر نابێ. کە گەدی لەو فتارە پڕ کرد شایەدیەکی بە دڵی هێنابووو گوتبووی ئنجا مردن حەقەو ناحەق نییە.

نەوەی مەلا عارف، کوڕی حاجــی، مەحـــمـــوود ناو دوای مەرگی باوکی بە زۆری لای ئێمــە، بەتــایبــەتیش لای مامم لە کۆیەو چنارۆك بەسەری دەبرد. دواتر بوو بە خاوەن ژ ن و ماڵ. وابزانم ئێستا لە هەولێر نیشتەجێ بووە منداڵیشی پێ گەیاندوون. لە دەست خۆمدا نییە چەندێکی بە (جەلی) یەوە خەریك بم لێ تێر نابم.

لەلایـەکـەوە ڕیشـەی وجـودم لە کۆنـەوە بەوێوە بەستراوەتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە پێوەندیم پێیەوە لە ساوایی و منداڵیمدا بەهێز بوو، لێــرەشـــدا بە سەرهـــاتی ئەو ڕۆژگـارانـەم دەگێـرمـەوە کە بەشێکیان بەجەلی و حەمام جەلی و (گەڕاوان)و خزمانی جەلییەوە بەستراوەتەوە.

ئەو ناوە ئاوی مەعدەنیی زۆر هەبوو. جگە لە ئاوە گەرمەکە کە ناوی (حەمام جەلی) لێ وەرگیراوە ئاوی دیکەی هەبوو پێیان دەگوت عەنکفریت.

دیــارە مەبــەست (عین کبـریت)ە کە دەمــاودەم زاراوەکـە لە عەرەبییـەوە گۆڕانی بەسـەردا هاتـووە. ئەو ئاوەیان یەکجار زۆرتر بوو لە ئاوە گەرمـەکـە وەك لە بیـرمـە ئاشگێـر دەبـوو، ئەویش بە ڕۆخی ڕووبارەکەوە، بەڵام لە بەری لای چنارۆك نەك جەلی،

بەر لەوەی لە زاری گەڵیــەکــەوە بەرەو دیــری جەلی دەربێت، بەرەنگێکی شینی سپـات و بەکـەفـوکوڵەوە هەڵدەقوڵی و خەڵق بە نیازی چاك بوونەوە لە دەردی باداری تێیدا دەمانەوە. . نەختێك لە رووبـــارەکــەو بنــاری شاخــەکـە ترازابـایت بەرەو چنـارۆك دەگـەیشتیتـە شوێنێـك پێیان دەگوت (گەڕاوان)و لە دوورایی نیو کیلۆمەترێکەوە، بەڵکوو زیاتریش بێنی دەهات. ئاوی ئەو شوێنە بۆ دەردی پیسکی و گولی چاك بوو. وشەی (گەڕ) وەك بزانم لە فارسیدا بە واتای کەچەڵ دێت بەو پێیە (گەڕاو) دەبێ بە ئاوێك بگوترێ بۆ کەچەڵی دەرمان بێت.

مناسبی جێگـەیـە بڵێم وشـەی (پیسـك)یش لە کوردیـدا بۆ ڕیشەیەك دەچێتەوە لە بنەڕەتدا پێوەندی بە (پیسی)یەوە نییە. وەك لە لاپەڕە 113ی کتێبی (فرهنگ ایران باستان) لە نووسینی بوو داود باس دەکــات، وشـــەی (پــەییس) لە ئاڤێستــادا بە واتـای نەخشـــانـــدن هاتـــووە. پێشگــری (نی ni) بەواتـای (دا ـ وەك داهاتن، داگرتن)ی هاتۆتە سەرو لە دەورانی هەخامەنشییان بۆتە (نیشتن) بەواتـای (نـووسین) کە ئەگـەر بە وردی لێـك بدرێتەوە (دانـەخشین) دەگـرێتەوە، نەخشەکەش کەبۆ نووسین بردراوەتەوە لەوەوەیە کە نووسین خۆی بریتییە لە پنۆکی ڕەش و سپی، ئیتر بۆ (بەڵەك)یش بردراوەتەوە.

بەو پێیە وشەی (پیسك) لە ئەسڵدا بەواتای (بەڵەك) هاتووە. بە هەمــە حاڵ ئەو ئاوەی گەڕاوان حەقی بەســەر زمـــانــەوانی و مێژووەوە نەماوە ئیستاکە بۆ گولی و پیسکی خۆی لەبار کردووە، ئەو قوڕەی لەو گەڕاوە پەیـدا دەبـێ وەکــوو خمـی شیــن خۆ دەنـوێنێ. بەلای چنـارۆکـەوە بێیت دەگەیتە محاڵێك پێی دەڵێن (شینکـان) سەرلـەبـەری بریتییـە لە گردی شینکـاڵ، هەر دەڵێی کومـەڵی خۆڵـەمێشی داری سووتـەمەنین. بێگومان مادەیەك لەو خاکــەدا هەیـە وەهـای شین دەکـات و لەولاتـریش ئاو دەکـاتـە (گەڕاو). حەیفە شوێنی وەها نایاب دەستی شارستانەتی و پیشە سازی و ئاوەدان کردنەوەی نەگاتێ.

دیمەنی ئەو گەلیەی ئاوی ڕووباری باسەڵمی پێدا دێت بەرەو حەمـــام جەلی وڕووەو بیتـوێن و دوکـان، بۆ ئەو تەمـەنی نێـوان

ساوایی و منداڵیم، زۆر سەرنجڕاکێش بوو. بەر لەوەی چەکی ئاگردار زۆر بڵاو بێ شاخەکە پڵینگی هەبوو. هەر لە بیرمە لەو سەفەرانەی کە تەمەنم گەیشتبووە پلەی هۆش کرانەوە، ترسێکی پڵینگ لەگەڵمدا دەژیا تاکوو بەرەو ماڵ لێی دوور دەکەوتینەوە، ترسەکەش بە ئەساس لەوەوە دەهات کە دەنگوباسی ڕاوە پڵینگی ئەو شاخە بەسەر زارانەوە بوو، کەسانیش هەبوون لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ناویان لە ڕاوە پڵینگ دەرکرد بوو. ئەوەی ڕاستی بێ، شاخەکەش لەم بەرەو بەری ڕووبارەکەی باسەڵم، بۆ بەر زەینی ئەوسای منداڵیم، دەهشەتێکی دەخستە لێکدانەوەی خوتخوتە تێگەڕاوم چونکە تا ئەو دەمە هیچ شاخێکی وەها چڕو نغوردو سەخت و بەتەڕاش و تاوێڵە بەردم نەدیتبوو: بە چاکی دێتەوە بیرم، کە لە دیمەنەکە ڕادەمام دەتگوت ئەم بەرەو گەڵیەکە ڕازو نیازێکی نێوان خۆیان بە خامۆشی لە یەکدی دەگەیەنن، تارمایی پڵینگیش لەناو توێژدا وەکوو تەڵەنراوەتەوە بۆ ئەو کەسەی بێ باکانە لە ئاوەدانی دوور بکەوێتەوە.

چەندی لە حەمام جەلی مابایەوە هەمیشە خزمانی جەلی بە دەورمانەوە دەبوون و لە خزمەت و بەفریاکەوتن درێغیان نە دەکرد. بەر لە چوونمان کەپرو ساباتمان لە حەمام جەلی بۆ ساز دەدرا، شەوانە پیاوی ئێشکچییان لامان دەمانەوە لەگەڵ جەماعەتی خۆمان هەتا سبەینە ئاگادارمان دەبوون، چەند جارانیش سەرمان لە گوندی جەلی دەداو خزمانمان بەسەر دەکردەوە بەتایبەتی ئێمەی منداڵ کە حەزمان بەگەڕان پتر دەکرد تا خۆ لەناو هەڵکێشان. ئەو دەمە لەنێو خزمانی جەلی ڕیش سپیەتی بە (ئامۆزا محمد)ی خواڵێخۆش بووی ڕەوا دیتا بوو.

ئەم پیاوە لە چاو هاو مەسەلەکانی خۆی زێدە بەرچاوو زۆریش ڕێز لێگیراو بوو. لکن جەلی زادەی کوێەو ئەو لکەی ئامۆزا محمدی برا گەورە بوو لە مەلا عەبدوڵلای کاکی جەلی (باوکی مەلا عەبدوڕڕەحمانی[3] کاکی جەلی) دەگەنەوە یەك باوکم تا بڵێی ئامۆزا محمدی خۆش دەویست و ڕێزی لێ دەناو دڵی بۆی دەکرایەوە، منیش لەو منداڵییەمدا دڵم بۆی دەچوو. دەمدیت لەو خزمانەی جەلی و کەسانی ئەو ناوەی دەهاتنە لای باوکم تەنها ئامۆزا محمد یەکسەر دادەنیشت ئەوانی دیکە خۆگیریان دەکرد هەتا باوکم تەکلیفی دانیشتنی دەکردن. ئەم دابەش شتێك نەبوو باوکم بەسەر خەڵقەکەی دا سەپاندبێ: لە خۆوە خەڵقەکە وەهایان لێخۆش دەهات دوای ئیزنی ئەو لای دانیشن.

لە نموونەی ئەو ڕێزو شکۆیە، نەمدیت لە هیچ کوێەك کاکە حسێن و کاکە حەمە لە مەجلیسی سەید ئەحمەدی خانەقای باوکیان دابنیشن: هەمیشە لە حزوور باوکیان وەك درەخت بەسەر پێیانەوە دەچەقین.

ئەو ساڵەی کە باوکم چوو بۆ لای جەلی، پێوەندی بەسەفەرە عادەتیەکانی ساڵانەی ماڵی ئێمەو ماڵی مامەوە نەبوو: چشتێك ڕووی دابوو، کە ئێستاکە نازانم چی بووە، هەلی ڕێك خست بۆ باوکم کە سەردانێکی ئەو ناوە بکات، زۆر لە مێژیش بوو حەزی دەکرد زیارەتی گۆڕی باپیرە گەورەمان کاکی جەلی وبیدەنی خزمانیش بکات. هاتوباتی ئەو سەردانە چ خزمایەتی نەبوو لەگەڵ سەفەری ئێمە: لەو چەند ڕۆژانەدا کە باوکم لەو ناوە مایەوە خەڵقی ناوچەکە تێکرایان هاتنە بەخێر هێنانی، خوا هەڵناگرێ خزمانی جەلیش بەگەورەو کچکەیانەوە، کوردی گوتەنی، خۆیان شەهید کرد لە خزمەتی مێوانان. لە بیرمە، ئەو هاوینە مێگەلی کۆمەڵێك لە مەڕدارانی دزەیی هاتبوون بۆ پاوانەکانی ناوچەی جەلی و سناوەو ئەو دەورو بەرە. خاوەن مێگەلەکان کە لە ئاغاکانی دزەیی بوون، ئەوانیش هاتنە سەردانی باوکم، دەستو دیارییەکی باشیشیان پێ بوو بۆ ئەو بنەگەیەی کە خۆراکی بۆ مێوانەکانی باوکم دروست دەکرد. ڕەنگە ئەو ساڵە من لە پۆلی دووەم یا یەکەمی سەرەتایی بووبێتم، چ بەر هەڵستیشم نییە لەوەدا بگێڕنەوە بۆ ئەو تەمەنەو ئەو چرگەنەی بناری ئاوە گردو دوو قەراغی ئەم بەرو ئەو بەری ڕووبارەکەی باسەڵم.

لە یادی ترسی پڵینگ ئەو شتانەم بەبیردا دێنەوە کە لە ساوایم ولە منداڵیمدا ترسم لێیان هەبوو، مەبەسیش شتی ئەوتۆن لە عادەت بەدەر بن.

له سیْ شت دەترسام هیچیان پێوەندییان بەوی دیکەوە نییە. یەکەمیان ترسی سەگ. نازانم له کوێوە ئەو ترسەم بۆ هاتبوو بەلاّم لە بیرمە بە هەموو دڵ و گیان لێی دەتۆقیم، تەنانەت لێشم دووربایە ترسەکەم ڕێ دەنیشت. کە گەورە بووم بەخۆدا شکانەوە نەی دەهێشت ترسەکەم پێوە دیار بێ بەلاّم ئەوساش تا پێم کرابایە خۆم لە شالاّوی سەگ دوور دەخستەوە، واتە خۆمم نە دەخستە ئەزموونی ترس و نەترسانەوە.

دووەمیان ترسی بەپەیژەدا هاتنە خوارەوە: نەم دەزانی چوونە سەری پەیژە هێزە جودایە لە پێدا هاتنە خواری-تاکوو جارێکیان بە پەیژە سەر کۆشکێکی تازە دروست کراوی ماڵی مامم کەوتم کە ویستم وەکوو خەڵقەکەبە پەیژەکەدا بێمەوە خوارێ لە سەرەتاوە ترسێکم سواری شانان بوو، ئنجا ترسەکەم لێ بوو بەسەر سوورکێ. لەو سەربانە عەوقام و بەهیچ جۆرێك جور ئەتم نەکرد لە پەیژەکە نزیك بکەومەوە. پیاوێکی لەوانەی خزمەتی باوکمیان دەکرد (صمد) ناو هات و لە کۆڵی خۆی کردم و پێشی گوتم چاوەکانت بچووقێنەو دەستەکانت لە ملم توند بکەو ترست نەبێ. ئامۆژگاریەکەم لە سەدی سەد جێبەجێ کرد، بەلاّم لە دڵدا ئومێدم کەم بوو کە بەسەلامەتی دەگەمەوە سەر بانەکەی ژێرەوە. دیار بوو (صمد) چ پەروای نەبوو چونکە هێندی بڵێی یەکو دوو لە بانی ژێرەوەی دانام.

(صمد کوڕە خاڵی کافیەی مەلایان بوو کە ئەوسا چەند ساڵێك بوو هاتبووە ماڵمان، خۆیشی پتر لە دەساڵ خزمەتی باوکمی کرد تاکوو بۆی ڕێك کەوت لە کۆتایی سییەکان کاك مەجیدی ئامۆزام بوو بە مودیری قوتابخانەی ڕانیەو صمدی کرد بە فراش. لەوەوە بوو بەڕانیەیی بەلاّم هەتا مرد هەر خزم و ناسیاو دڵسۆزمان بوو. مردنەکەشی جۆرێك بوو بە زەینی کەیدا نە دەهات: ئاوی کوێرەکانی لەڕانیە حەوزێکی گەورەی بە دیوار بۆ هەڵنرابوو تاکوو ئەوانەي لە مزگەوتەکەی نزیکیەوە نوێژ دەکەن دەسنوێژی لێ بشۆن. جارێکیان لەو دەمەدا کە صمد حەنەفییەکی حەوزەکەی کردبۆوەو دەسنوێژی لەبەر دەشووشت لە پڕ دیواری حەوزەکەی بە سەردا ڕما، ئاسنی لوولەو حەنەفییەکە لە سینگی چەقی بوو، یەك دوو ڕۆژ دواتر گیانی سپارد. هەزار ڕەحمەتی لێ بێ. وەی کە بۆی بە پەرۆش بووین.

ترسی سێیەم ئەگەر لە خۆم نەقەومابایە ڕەنگە بوو باوەڕ بە هەبوونی ئەو جۆرە ترسە نەکەم. چەند ساڵێکی تەمەنی ساواییم لە چاوی دوو کەس دەترسام کە پێویست نابینم ناویان بهێنم: هەر دووکیان دەمێکە مردوون، چ ئاگاداریش نەبوون لەو ترسەی چاوی ئەوان بۆ منی دەڕسکاند، هەر دووشیان پێوەندییان پێمانەوە بەتین بوو، خۆشیان بەبچووکی باوکم لەقەڵەم دەدا، هەر ئەمەیش بوو موشکیلەی بۆ من دەنایەوە چونکە ئەو پێوەندییە وەهای دەکرد زۆریان ببینم. تا منداڵ بووم کەس لێی نەبیستم حاڵی من چۆنە بەدەست ئەم دوو جووتە چاوەوە. بێگومان چاوی خاتوو زین ئەو کارەی لە کاکە مەم نەکردووە. کە گەورە بووم و لەڕێگا تووشیان دەبووم و بۆم ڕادەوەستان تا سلاّویان لێ دەکەم بەبیرمدا دەهاتەوە ئەو چاوانەی وەها پڕ لە خۆشەویستییان دەبینم کاتی خۆی چ باجێکی سەختی گیانی‌یان لێ سەندووم، خۆشیان لەوەهم و لە خەیاڵیشدا هەستیان بەو کاریگەرییەی چاوەکانی خۆیان نە دەکرد. جیهان پڕە لەو جۆرە هەستی دەرنەبڕاوو تەئسیری بێشوێن و کاریگەرایەتی نەزۆك.. بەلاّم کێ دەڵێ حاڵ و باری ئەوتۆ نەبووە تەئسیری ئەوتۆیی بە زەقیو لە ڕووداودا خۆی نواند بێ؟ بەچ مەعلووم هەندێ نەساغی نەفسی لەمن و تۆدا ناچێتەوە بۆ سەرچاوەی وەها خەیاڵ لێ نەکراو کە بە بیردا نایەتەوە؟ بە چ مەعلووم؟

لەو دیمەنانەی کە دێنەوە بەر خەیاڵی ساواییم و پەردەی زەینم بە تەواوی پڕ دەکەنەوە دیمەنێکە، ئەویش تێم دەگەیەنێ کەوا ڕەنگە بچووکی‌ی پۆرگی تەحەمولی منداڵ بکێشێتەوە بۆ بەگەورە نواندی ئەو شتانەی دێنە بەر هەستی: نیوەڕۆ بوو، بە بۆنەی هاتنی خاڵە شێخ مارفی هەڵەجە، کەخۆی براگەورەی بنەماڵەی بەزرنجییەکانی کۆییو خاڵە گەورەی مامم بوو، قاوەڵتی لە ماڵی مامم دەکرا.

من منداڵ بووم جارێ نەچوویوومە قوتابخانە. بە دەوری

سینییەکی گەورەی سەرووی ریزە سینییەکانەوە باوکم و خاڵە شێخ مارف و دوو برای دیەی کە خاڵە شێخ محیی الدین (نهانی)و خاڵە شێخ نجم الدین بوون، منیش لە خزمەتیاندا، نانمان دەخوارد. وام دەزانی ریشی ئەو سێ خاڵانە لە هاتوچۆی پاروو جووینداا هێندەی باوەشێن دێن و دەچن. . راستەکەی لەو دەمەدا، وەختە بڵێم، دنیام لێ بوو بوە باوەشێنستان. هەر ئەو جارەش بە خزمەت خاڵە شێخ مارف گەیشتبووم، ئەویش بەم شێوەیەی نەفامی و نیگا شێوان. دواتر زانیم خاڵە شێخ مارف ریشی وەها نەبوو وەك دەهاتەوە بەر زەینی ساوایم تومەز لە پەنا سێەری ریشی دوو خاڵەکەی دیکەدا، بەتایبەتی هی خاڵە یحیی الدین، ریش لە خۆوە زیادیان کردبوو.

دیمەنێکی دیکەی بەر زەینی ساوایم کە لەو تەمەنەدا هەزاران هێندەی خۆی نرخ و بایەخی لام هەبوو، ئەمەیان بوو:

کەم پاییز دادەهات و لە ژووران دەنووستین من و نەجیبەی خوشکم و فەتحی لەگەڵ یاعصمتی دایانم لە کۆنە ناو ماڵی قەدیمی سەر دەمی باپیرم دەبووین. . لە پاییز وزستاندا سبەینان تیشکی رۆژ لە سێ کولانەی نزیك بن میچی ناو ماڵەکە دەهاتە ژوورەوە. یەکەم کولانەی کە تیشکی لێوە دەهاتە ژووری ئەوەیان بوو کە لەو سەری ناو ماڵەکە، دووری دەرگاو بە تەنیشت دیواری نێوان ئێمەو ماڵی مامەوە بوو. من چاوەنۆری ئەو دەمەم دەکرد، ئیتر لە هەوەڵەوە بەقەد پنۆکێك تیشك لە دیواری پشت کۆنە ئەستێرکەوە گەش دەبوو. بە پێی هەڵکشان و سووڕانی رۆژ ئەو پنۆکە تیشکەی کە هێندەی درهەمێك بوو وردە وردە پانتر دەبوو، جێ گۆرکێشی دەکرد بەرەژێری دیواری پشت ئەستێرکەکە. زۆری نەدەبرد پنۆکێکی نوێ لە تیشکی رۆژ، لە کولانەی ناوەراستەوە وەکوو شیشەی سپی، دووکەڵ و گەردە تۆزی ناو ماڵەکەی دەسمی تا لە شوێنێکی دیواری بەرانبەری چەسپ دەبوو. ئەویش لەکولانەی سێیەمەوە گەردو دووکەڵی دەسمی و. منیش بەو هەست و هۆشەی ساوایمەوە لەناو نوێنی خۆمەوە بەخەیاڵ وخوولیا لەگەڵیاندا دەژیام هەتا دەمی بەرچایی، ئەوسا تیشکەکانیش لە دیوارەکانە بەردەبوونەوە سەر زەوی وتێوەرامانیان وەزەحمەت دەکەوت جگە لەوەی کە نشینگەیان بەسەر کەلوپەل و پێ لاوو شتومەکی ناو ماڵەکەوە ئەو لە بارییەیان نە دەما وەك کە بە دیواری بێ گرنجەوە ریگوپێك و لوسولێك خۆیان دەنواند. رۆژێکی ئەگەر هەوروباران بایە زەوقی سبەییانم دەگۆرا بۆ خوولیلیەکی دیکە کەوا رەنگە لەویشدا هەر من بەتەنها بەشتی وەهاوە خەریکابێتم: لە تەمەنێکی زۆر زووەوە حەزم دەکرد سەرنج رێژەوی پلووسکی بانەکان بگرم. ئەو پلووسکەی ئاوەڕۆی بانی پانی بەرێ کردبایە ئاوەکەی زۆرترو پەلامیزەی دوورت دەرۆیی پترە لێ رازی دەبووم.

ئەگەر بانێکی پان پلووسکی نالەباری پێوەبایە ناراحەت دەبووم چونکە ئاوەکەی بەپرژاوی و لە نزیك بەردەمی خۆیەوە دەکەوتە سەر زەوی. حەوشەی دیوەخانەش دوو پلووسك. هەتا زۆر منداڵ بووم بەو حەفت پلووسکە تامەزرۆی خۆمم لە مەراقەکەم دەشکاند. فێڵێکی دیکەشم دەخستە گەر بۆ دڵنیایی تەواوی خۆم: دەهاتە لە حەوشەی ژوورەوە خانیچکۆڵەی وەهام دەکرد بانەکەی بایی ئەوە بکا کە بارانی مەیلەو غوردەم ببارێ پلووسکی هەڵستێ هەرچەند بەکزیش بێ. لە هەڵنانی خانیچکۆڵەی فەتحی یارمەتی دەدام و یارمەتیەکەم بە هەوڵی خۆم حیساب دەکرد، ئەگەر یەکێکی گەورە دەستی لەو کارەدابایە لەسەر خۆمم بە نوقسانی حیساب دەکردو تامی نە دەماو خانیچکۆڵەکەم بە فێڵێك دەرمانند. کە نەختێك فەراقە بووم (مەراقی پلووسك)م لە سنووری ماڵەوە رۆیی بۆ گەرەکی خۆمان، دواتر بۆ گەرەکی دیکە تاکوو گەیشتمە تەمەنێك پەراوێزی مەراقەکەم بە پانایی شارەکە پان بۆوە ئیتر دەمزانی لە هەر گەرەکە کام پلووسك قارەمانەو مێزادی دوور دەروات و دەوامەی ئاوەکەی پترە لە پلووسکی دیکە. لەو وردە حیسابەی بین برکێی نێوان پلووسکەکان چەند پلووسکێکم هەڵاوارد بوو کە ئاوەکەیان هێندە زۆر بوو لە بارانی غوردەمدا دەبوونە تاڤگە: یەکەمیان پلووسکی بازاری عەناران، دووەمیان پلووسکی بانی قەیسەری نوێ، سێیەم پلووسکێکی مزگەوتی گەورە. بەکورتی لە رۆژێ بارانەدا ئەو مەراقەم منی دەگێرا، بەخۆم و چەتری بان سەرمەوە، لە تەفتیشی حاڵ و هەواڵی کەڵە پلووسکەکان و چەندو چۆنی رێژەویان و ئەو قورتەی

لە خاك هەڵی دەكەنن.

سەیر لەوەدا بوو، حەزم نە دەكرد پاتەو پات پێمەوە دیار بێ ئەو مەراقە دڵم دەبزێوێ، خەڵقەكەی ماڵەوەش لەگەڵ ئەوەدا كە شارەزام بوون لە ڕوویان نەدەدام نەكا دڵشكستەم بكەن، بەڵام هەمیشــە یا عصمت بە بەهـانـەیـەك دەی بردمـەوە بن نوا هەتـا وشكی دەكـردمــەوەو گەرمی ڕادەهێنــامـەوە بێ ئەوەی پێم بڵێ ئاگاداری مەراقەكەمە وەیا چوونە بەربارانم بۆ خاتری پلووسكی ساردو سڕو بێ ئاگا لە منداڵی ژێر ناوەشێتەوە. هەر لە بیرمە كە دەمـدیت یەكێـك تەمـاشـام دەكـات لە كاتی سەرنـج كشانم بۆ ڕێــرەوی پلووسكێــك، گورج چاوم لە پلووسكــەكــە هەڵـدە ئەنگاوت بۆ لایەكی دیكە. وەها دەبوو بۆ تاقی كردنەوەی زۆری وكــەمــی ئاوی دوو پلووســك دەهــاتــم دوو عەیــارەی

چۆن یەكم لە یەك كاتدا دەخستە بەر ئاوی ئەو دوو پلووسكەوە: هەر كامێكی زووتر عەیارەی پركردبایە ئەویان پاڵەوان دەردەچوو بە زۆری لەوەدا هاوزایــەكـم بە هانــام ڕادەگــەیــشــت بۆ ئەوەی بە هەردووكمان بتوانین لە یەك كاتدا عەیارەكان بخەینە شوێنی مەبەست

بیـرەوەریـەكی بەهــاتـوبات و سەرو صەدای تەمەنی سەرەتای منداڵیم ئاهەنگی (سونەتانە) بوو. لەكۆنەوە وەها ڕۆییشتووە كە سونـەت كردنی نێـرینـە لە حەوش ونـاو ماڵی ئێـمـەدا بەدیوومە، لەبەر ئەمە هەر چەند ئاهەنگەكەش بۆ حیسابی ماڵی ئێمە، بێت پێـویستـە لە ماڵێكی دراوسێ و ناسیـاودا بگـەرێ. داوەت و پلاو لۆغان وكەیفو شادی ئەو ڕۆژە لە زەینمدا نەقش بەستوو بووە: من و صلاحـی ئامــۆزام و چەنــد هاوزای دیكــەمــان لە ماڵی جیـرانێكـمـان (حـاجی فەقێ محمـد) كە یەكێك بوو لەوانەی بە درێژایی عومر شەوانە دەهاتنە لای باوكم، دراینە دەست وەستاو حەكیمی ئەو دەمـە، لەنێـو هەراو هەڵـلاهەڵلاو قیژەقیژی ئەوتۆدا كە بیـری منـداڵ بەخـۆیـەوە خەریـك بكـات لە ساوایی یـەوە بۆ منداڵی بەرێ كراین. هەندێك لەو منداڵانە بێ ئەوەی بكەونە ناو نوێنەوە یەكسەر لەبەر دەستی و وەستاوە ڕوویان كردە كۆڕی گەمەو گەپی عادەتیی ڕۆژێكیان. حەوێزی مەلا سبوح (مەلا سبوح ئامــۆزای باوكم بوو، ئەوسـا بەرحـەیـات نەمابوو) نەك هەر بۆی نەكەوت، كە گەڕایەوە، ماڵەوە كەوتە نێو حەوزەكەشیانەوە كە هەر خوا دەزانێ چ جۆرە میكرۆبی تێدا دەژیا.

صلاح و حەوێــزو ئیسمـاعیلی مەلا نووری (ئـەویش كوڕی ئامــوزای باوكـم بوو) لە من هەراشتــر بوون. صدیـقـی كاك طاهــرو، وابــزانم، ڕەفیقی حاجی كەریم (حــاجی كەریم لە دایكرا برا گەورەی كاك طاهر بوو) كمێك لە من بچووكتر بوون.

لە نێو هەموویاندا من كە ئاهەنگەكە بە ئەساس بۆ من بوو، ئازارێكی زۆرم لەو سونەت كردنە دیت 40 شەوی بۆ كەوتم. لەو بەینـە ماڵـەكـەمـان هەمیشە وەك كارێزە بازار یان خەستەخانە بوو. برادەرە سونـەتكـراوەكـانیشم وەكـوو خەڵقی دیكە دەهاتنەوە ئەحــواڵ پرسیم. خەفـەتێكی ئەو ڕۆژانـەی لە جێگـەدا كەوتم گەلێـك پتــر لە ئازاری چل ڕۆژیم بەردەوام بوو: گرامــۆفـۆنی دۆستێكیـان هێنـابـوو بۆ خافـلاندنم، لە دەمی نیشتنەوەی ئازارم حەزم دەكرد گوێ لە قەوانەكانی بژاردەم ڕابگرم. ئەوسا (منیرە مهـدیـە) بەنـاوبـوو، منیش لەو تەمـەنـەدا ئاشقی دەنگی بووم. مەراقم لە گرامۆفۆن داگرت و داوام كرد یەكێكم بۆ بكرن.

هەتا لە جێگەدا بووم گرامۆفۆنی خوازرایەوە تەسكینی دەدام، دوای هەڵستــانـەوەم بۆ خاوەنی هەنـاردراوە، ئیتـر كەلێن كەوتـە ئارەزۆمــەوەو بە تونـدی داوای گرامـۆفـۆنێكی مڵكی خۆم كرد. كاك طاهر لێم بووە دركی مەمو زینان و هەزار بەڵگە ئەو خەڵقەی ئیقنــاع كرد كە كڕینی (صنــدوق) كارێكی نابــەجێـەو پارە بە فیرۆدانە. لالە مەسەلەی پارە خەرج كردن كاك طاهر لە ماڵی ئێـمــە قســەی دەڕۆیشت چونكــە وەكیلی باوكم بوو. سەری خوێنەر نەیەشێنم لەو شەڕە گەرەكێیەی كڕین و نەكڕینی (صندوق ـ گرامـۆفـۆن) كاك طاهـر سەركەوت منیش وەها دڵشكستە بووم كاری لە گیانم كردبێ. ئەو كاك طاهرە لە باری دیكەدا وەها جانفیــدا بوو بۆم سێ و دووی نەدەكــرد لەوەدا گیــانی خۆی لە پێنــاومـدا بخاتــە مەتـرسییەوە، كەچی لە ئاست 100 ڕوپیەی نرخی صندوق لێم بووە دوژمنی بابە كوشتە، مەسرەفەكەش لە

کیس ئەو نەدەچوو. گەردەنی ئازاد بێ، هەرچەند لەحەد بەدەر خەفەتم خواردو ساڵەهای دواتریش باس دەکرایەوەو خەفەتی نوێم لێ دەخواردەوە، ئیستاکەش لەو خەفەتە ڕەها نەبووم.

جارێکیان لەو تەمەنەی ساواییمدا وەختابوو لە ئاودا بخنکێم.

من و صلاحی ئامۆزام و حەوێزی مەلا سبوح لەسەر ڕۆخی حەوزەکەی ماڵی حەوێز بەریز هەڵتووتەکا بووین. صلاح لە نێوانماندا بوو. لە پڕ بێ ئەوەی پێشتر خەبەر دارییەك لە صلاحەوە مەعلووم کرابێ من و حەوێزی خستە ناو حەوزەکەوە. ئەوەندە وردو ساوا بووم نەتوانم لەو ئاوەدا پێ لە زەوی گیر بکەم و پەلەکوتکەی هاتە دەرەوە بکەم. صلاح دوای کەتنەکە هەڵاتبوو بێ ئەوەی کەس ئاگادار بکاتەوە لەوەی کردوویەتی. لە بیرمە، کە ژێر ئاو بووم وەهام دەزانی ئاو دەمسوڕێنێ و سەروینم دەکات بەڵام سەغڵەتیەکی وەهام بە بیردا نایەتەوە خەیاڵی مردنی پێوە بێ. خواو ڕاستان یەکێك بەرێکەوت دەبینێ لچکی جلکی منداڵ لە ئاودا دیارە. بە ڕاکێشانی ئەو لچکە دەزانێ مەسەلە چییەو من و حەوێزی لە ئاوەکە دەرکێشا، ئیتر بوو بە هەراو گریان و قەڵەبالغی. لە بیرمە سەرەو ژێریان کردمەوە بۆ ئەوەی ئاوی هەناوم دەردەمەوە. ئەوەشم لە بیرە کە یاعصمت لە باوەشی کردم گوتم کلی چاوم بەئاو شۆرا، دیارە تازە چاویان بەکل ڕشتبووم.

سەیری نێوانی مردن و ژین چەند تەنکە! چەند دەقیقەیەکی دیکە پێمان ڕانەگەیشتبان من و حەوێز بۆ دەرچووبووین. ئەم حەوێزە برایەکی لە خۆگەورەتری ناوی مەلا نافیعە، ئیستاکە دووەم تەمەند دریژە لە جەلی زادەکانی کۆیە: لە هەموان بە تەمەنتر حسام الدینی مەلا رەفعەتی مەلا حەبیبە. بە بۆنەی ناو هێنانی حیسامودینەوە دیمەنێکی زۆر کۆنی بیرەوەری منداڵیم دێتەوە یاد:

مەلا رەفعەت، ئامۆزای باوکم، بە جەجێڵی کۆچی دوایی دەکات و دوو کوڕی لە پاش بەجێ دەمێنێ (حسام الدین وعمر). لە تەمەندا ئەم دوو برایە لێك نزیك بوون. دیارە بێ باوکی دەبێتە هۆی نەمانی چاوسوورکەرەوە لە بەیندا، ئیتر تۆران سەربە شەرە چەپەڵۆك دەگەیەنێ. ناوناوە، بە زۆریش لە دەمی جەمی سبەینەدا، یەکێك لەو دوو برایە بە چاوی فرمێسکاوییەوە لە پڕ بە ژوور دەکەوت وشکاتی لە براکەی دیکەی دەکرد لای باوکم. من ئەوسا زۆر منداڵ بووم ئەو دیمەنەم وەکوو ڕووداوێکی عادەتیی گەرماو سەرماو باو باران دەهاتە بەر چاو کە هەر دەبێ بقەومێ. باوکم هەر جارە ساردی دەکردنەوەو شکاتی دەپرسینەوەو بەسەر دەسدرێژ کەردا دەچۆوە.

حسام الدین زوو ژنی هێنا: لەگەڵ ماڵی شێخ ڕەسوڵ، کە خاوەن تەکیەو ڕێو جێن لە کۆیێ، خزمایەتی بەست. لە ژن هێنانی خزمەکانم دووانم بە بیردا دێت کە جارێ زۆر منداڵ بووم، یەکیان ئەمەی کاك حسام الدین، ئەوی دیکەیان هی مەلا فەتاحی مەلا عیزەت کە ئامۆزای کاك حسام الدین بوو. لە بیرمە گرامۆفۆنیان لە ماڵی خاڵە عیززەت لێ دەدا (مەلا عیززەت ئامۆزای باوکم و خاڵی عبدالمقتدری برام بوو). لەو قەوانانەی دەنگیان لەبەر گوێم دەزرینگێتەوەو هەستی ئەو ساکەمم لە لە دڵی ئیستاکەمدا دەبزێوێ گۆرانیی (انا راضي وابوها راضي)ی صالح عبدالحي و (رسول السلم الی مصر) کە دەیان گوت هی کەلسوومە، یەکێکی دیکەی میسریش بوو کە ئاهەنگەکەیم لە بیرە بەڵام هیچ وشەیەکی شیعرەکەیم لە بیر نەماوە. لەگەڵ ئەم قەوانانەدا قەوانی مەلا ئەهای کەرکووکی و سەید ئەحمەدو سەید ئەمینی مووسڵیش دەنگیان دەهات. نایەتەوە بەر یادم، ئەو دەمە، قەوانی کوردیم لە بەزمەکەدا بیستبێ.

دیمەنێکی دیکەی بیرەوەری منداڵیم، کە ئەویش وەکوو باو بارانی حەتمی هەر دەبێ ڕوو بدات، ئەوە بوو کە لە چەند مانگێکدا جارێکیان (سۆفی تۆفیق) ـ لە مریدەکانی بنەماڵەی شەدەڵە ـ بەخۆیو عەسای دەستیو ریشی درێژیەوە بە حاڵ و سەمای جەزبە گرتنەوە خۆی بە حەوشی دیوی حەرەمدا دەکردو چەرخە بە دەورەی ئەو دارو دیوارانەی دەکردو کەفی هەڵدەداو، یەك نەفەس و بەردەوام: (بە قوربانت بم مام مەلا، سەگی دەرگەتم مام مەلا، ئاگرم تێبەر بوو مام مەلا...)ی بە

دەنگی هەرە بەرزی دەگوتەوەو دەگریاو دەگەڕاو نازانم بڵێم چی دەکرد، باوکیشم بەسەر پێیانەوە سەبری لێ دەگرت هەتا سارد دەبۆوەو دەهاتەوە سەر باری ئاسایی، ئەوسا بەپێی عادەتی هەموو جارانی (مـووفـەرك)ێکی لە پۆشـاك، وەك سەرکـەوا سەڵتـە، کورتـەك، لێ وەردەگـرت و بەدەستـەکـانی‌دا دەنـووسـاو بەدەم هەنیسکەوە بۆی دەر دەچوو. ئەم حاڵ و جەزبەی سۆفی تۆفیق یەکجـار کاری تێ دەکـردم و ماوەیـەکی درێـژ لە گەڵمدا دەژیا، دواتـریش کە هۆشم کرایـەوە ئاواتم دەخـواست کەوا کاشکی وەزعەکەم نەدیتایە چونکە لە دەروونمدا دەی هەژاندم و زامداری دەکردم.

ئەگەر بوێرم دەڵێم دیمەنی جەزبەی سۆفی تۆفیق ناوناوە لە خەومـدا لێم دەبـوو بە جۆرە کامـوسێـك چەنـد سانییـەیـەکی دەخـایـانـدو زۆری پێـوە سەغڵەت دەبـووم. ئەم شێوە کامووسە جودایە لە کامووسی عادەتی کە دەشێ دووچاری هەموو کەسێك ببێت، خۆیشم لێی بەڵـەدەم. کامـووسی عادەتی لە وڕێنـەی تاداری دەکـات، هەرچی ئەمـەیـانـە بێ‌وێنـەیـەو وەسف ناکرێ مەگـەر ئەوەنـدەی کە بڵێم کەف و لەرزو هەڵسـووڕانی سۆفی تۆفیق تێـك بکـەوەو بیکـە بە شڵەژانێکی چەنـد سانییـەو بە مێشکتیدا تێ‌پەڕێنە پێ بە پێی هەڵکشانم لە تەمەندا ئەم جۆرە کامووسە بەرەو کەم بوونەوەوە رۆیی تا ئە ئەوەی بڵێم لە چەند ساڵێکدا جارێك دەیبینم یا نایبینم.

هەر لە بیرمە، زۆر بەڕوونیش بیری دەکەمەوە، یەکەمجاری کامووسی عادەتیم تووش بوو: ڕەمەزان لە زستاندا بوو، یەکەم ساڵیش بوو دەستم کردبـوو بە ڕۆژوو گرتن، شەوێکیـان دوای پاڕشێـو کردن نووستمـەوە لە شێـوەی خەونی ئاڵـۆزدا دووچـاری حاڵەتێك بووم لە هەناسە سواری‌و مشە وەشی‌و شڵەژان و ترس و تەنگـەتـاوی کەوا هەرگیـز پێشتـر دووچـاری نەبـوو بووم. کە حاڵـەتـەکـە بەسـەر چوو خەبـەرم بۆوەو دڵـەکـوتکەی تەنگەتاوی خەوەکـەم هەر پێـوە بوو. ئەوسـا هیـچ ناوێکم بۆ ئەو حاڵـەتـە نەبیستبـوو، فکـریشم نەکـردبۆوە لە هەبوونی حاڵەتی ئەوتۆیی. وەهام زانی خەونێکی زێدە ناخۆشم دیتووە، بەڵام نەمتوانی وەیا نەموێرا بخەومەوە لە ترسی هاتنەوەی خەونە ناخۆشەکە. دواتر کە خەڵق خەبـەریـان بۆوە خەونـەکـەم بۆ گێـڕانـەوە پێیان گوتم ئەوە کامووس بووە. دوای ئەم تەجرەبەیە بە زۆری کە ڕادەکشام بۆ نووستن ترسێکی کامووس لەگەڵمدا دەبوو بەڵام بەینێکی درێژی خایـانـد تا کامـووس دووەمم دیتـەوە. وردە وردە لە کامـووس ڕاهـاتم تاکـو وەهـا دەبـوو لە گەڵی بەخـەبەر دەهاتم و ئاگاداری هەمـو شتێـك دەبـووم وقسـەی خەڵق تێ دەگـەیشتم بێ ئەوەی بتوانم لە ژێری هەڵستمەوە. بۆ ئەوەی خەڵقەکە ئاگادار بن لێم و ڕزگارم بکەن ناڵەناڵم دەکرد. ئەگەر بە ناڵەناڵ سەرنجی کەسم بۆ نەکشابایە بە دەنگی بەرز ترەوە دەمناڵاند...

لە بیـرەوەری هاتـوبـاتی فتـارەکانی ڕەمەزان کەوا جارێ ساوا بووم و ڕۆژووم پێ نەدەگیـرا بە چاکیم لە یادە کە ئێـوارەیـەکیـان ڕۆژ لە زەردەپەڕ بوو، دنیاش سارد، زلۆبیەکم بردە سەربان بە دوو پەنجەی دەستی ڕاستمەوە بەرەو هەتاوم ڕاگرت، گۆیا سارد نەبێتەوە هەتا دەمی مەلا بانگـ دانی ئێوارە بەڵام زۆرم خۆ پێ نەگیراو زلۆبیەکەم خوارد...

صلاحی ئامـۆزاشم، زۆر لە ئێـوارەکـان، دەهـاتە ناو زارکی دەرگەی نێوان ماڵی مامم و ئێمە: لەو دەمەدا کە لەگەڵ باوکم خەریکی فتـار دەبـووین صلاح وەکـوو مەلای موئـەززین بانگی دەدا بەڵام چۆن بانگێـك؟ دەیگـوت «ئـەڵـڵاهـو نەشەد ئەڵڵاهو نەشـەد). وشـەی (نـەشـەد)ی لە جێی (أشهـد) بەکـار دەهێنا، وشـەکـەشی لە ناوی (مـەلا نەشئـەت و صۆفی نەشئـەت)ەوە دەخـواستـەوە کە یەکـەمیـان خزمێکی خوالێ خۆشبـوومـان بوو دووەمیشیـان ناسیـاوێکی گەڕەکـەکـەمـان بوو خەڵقیش بە (مەلا نەشەد، صۆفی نەشەد) ناویان دەبردن. بەهەمە حاڵ بانگەکەی هەمـوو ئێـوارەیـەك پاداشی لەگـەڵدادەبوو: باوکم لە فتاری سەر سینی تێشووی بۆ دەنارد لەو خۆراکەی کە بەلای منداڵەوە خۆش بێت و بانگی بۆ بدات، صلاحیش هەر ئەمەی بە ئامانج دەگرت لەو بانگـ دانەی.

لە مونـاسـەبـەی یادی ڕەمـەزانی منداڵیم شتم بە بیر دێنەوە، بەڵام هەمووی شتی ئەوتۆن بەلای ساواوە سەرنج (ڕاکێش بێ:

ئێواران ئەگەر ساماڵ بایە باوکم بەر لە ڕۆژاوا بە دە دەقیقەیەك دەچوە سەربانی ژوورەکەی خۆی ئەو ماوەیەی پێش بانگ دانی ئێوارەی بە پیاسە ڕادەبوارد.

لەو بانەوە گونبەدی مزگەوتی گەورە دیار بوو. موئەززینی مزگەوت ناوی مەلا حەبیب بوو، لە شوێنێك ڕادەوەستا کە باوکمی لێوە دیار بێ. کاتێك (سواد) بڵند دەبوو باوکم دەستێکی لێ هەڵدەتەکاند، ئەویش لە جێگەی خۆیەوە جبەکەی هەڵدەتەکاند بۆ ئەو تۆپچییەی لەبەر دەمی قشڵە بەسەر تۆپی ڕەمەزانەوە چاوە نۆڕی دەکرد ئیتر تۆپەکەی ئاگر دەداو فەرەحنایی دەکرایەوە.

ئەوسا تۆپچی (عەزە بەغدایی)یان پێ دەگوت. جگە لە تۆپی فتارو ڕۆژی جەژنەکان شەوی ڕەمەزانانیش لە دەمی پارشێودا خۆیو هاوڕێیەکی (ئاغڵەب حەمە عەبۆ هاوڕێیی دەکرد) بە شاردا دەگەڕان و بە جووتە تەپڵییان لێ دەدا، هەر یەکەیان لە نەوایەك. عەزە بەغدایی تەپڵییەکی بچووکی بەبەر سینگییەوە دەگرت و بەهەر دو دەست، ئەمی بە ئوستادی، دەیکوتا. حەمە عەبۆ دەهۆڵێکی زلی بەلاشان و کەمەریدا دەکردو بە دەستێك لەنگەری ئاهەنگی بۆ عەزە ڕادەگرت.

لە تەمەنی نێوان ساوایی و منداڵیمەوە، بە زۆری، لە دەمی تەپڵی پارشێودا خەبەرم دەبۆوە، کە دەنگی تەپڵی و دەهۆڵ لە گەڕەکەکەی ئێمە نزیك دەبۆوە یەکێکم بە چراوە لەگەڵدا دەهات و درەگەی دەرەوەیان بۆ دەکردەوەو عەزەو حەمە عەبۆ دەگەیشتنە بەر دەرگەمان: تاوێکی باش تەپڵی و دەهۆڵیان بۆ دەکوتام تا لێی تێر دەبووم، ئنجا قامتە جگەرەیەکی کوردی بۆن خۆشم دەدانێ و دوعاخوازیمان لە یەکدی دەکرد. ئەو پێوەندییەکی دەمی پارشێو لە بەینماندا هەتا هەر دوویان بەڕەحمەتی خوا چوون.

هەرگیز لە بیر ناکەم، شەوی وەها دەبوو زوو بەخەبەر نەدەهاتم، کاتێك خەبەرم دەبۆوە گوێم لێ دەبوو تەپڵی و دەهۆڵ بە عادەتی شەوانی پێشوو لەبەر دەرگەمان دەنگیان دێت وەك کە خۆم لەوێ بم. بە پەلە بۆیان دەچووم و (تعارف)مان بەجێ دەهێنا، وەهاش دەبوو بەخەبەر نەدەهاتم ئەوان فەرمانی خۆیان هەر بەجێ دەهێنا ئنجا سووری تەپڵی لێدانیان تەواو دەکرد. شەوێکی باران و ڕەهێڵ بوایە تەپڵی لێدان بەکۆڵاناندا نەدەشیا بە تایبەتی لەبەر ئاوی پلووسکان کە خۆ لێ پاراستن و دەهۆڵ لێ شاردنەوەی وەزەحمەت دەکەوێ. لەو تەرزە شەوەدا عەزە لە کەمەری دەوری گونبەدی مزگەوتی گەورە دەگەڕاو دەیکوتا، منیش ئەگەر بەخەبەر بامایە خەیاڵم بۆی دەکشاو بەیادی شەوەکانی دیکە گوێم لێی دەگرت.

عەزە بەغدایی وەك بەناوەکەیدا دیارە، عارەب و بەغدایی بوو. ڕەنگی ڕەشتاڵەو باڵای کورت بوو، وتووێژیشی پێوەی دیار بوو کە فێری کوردی بووە. لە زۆر وردە کەسب و کاردا شارەزا بوو، وەك کە دیتمان تۆپچی و تەپڵێ زەن بوو. ڕۆژی کە بووك بۆ کاکە زیادی حەماغا گوێزرایەوە، عەزە بەغدایی دەست ڕەنگینییەکی جوانی نواند: ئەوسا من لەسەرەتاکانی خوێندنمدا بووم و بە چاوی منداڵیم سەیری مەهارەتەکەی عەزەم دەکرد. ناتوانم بە تەواوی وەسفی چۆنیەتی ئەو مەهارەتە بکەم بەڵام ئەوەندەم لە بیرە کە عەزە لە پێش ولاغی بووکەوە لە ژێر تارایەکی تاڵ و سووریان و بەریندا بەسەر ئەسکەلەیەکی دارینەوە کە لە ژێر پەردەدا بەچاو نەدەیترا مەقەسەی دەکرد هەر دەتگوت سواری جانەوەرێکی ئەفسانەیی بووە، مچەی حەبە تۆزەش (خەڵقی سلێمانی بوو لەکۆێ پێیان دەگوت مچە ژنانی) جلکی ئافرەتانی لەبەر کردبوو، بە ڕەقس و چەغانە لە پێشاپێشەوە بەرەو ماڵی زاوا دەهات ئاپۆرەی بینەرانیش لەم بەرو ئەو بەری ڕێگەی دەستەی بووك گوێستینە هەر لە ماڵی کەریم اغای مەلا وحید اغای حەوێزی هەتا ماڵی حەماغای غەفووری وەك بیشەلانی تێك هاویشتوو کەڵەکەیان بەسەر یەکەیدا دەکرد. بەزم و ئاهەنگی ئەو شاییە دە ڕۆژەکی خایاندو گەلێك لە سوارو پیادەی عەشایرو دەشتو دەری کۆیەو ڕانیەو خۆشناوەتیش تێیدا بەشدار بوون وئێواران ڕمبازێ و جلیتبازی لە مرواری بەر (دەرکی گەروو سۆرك) دەکرا. لەبیرمە ئێوارەیەکیان بە دیار غارێنێ و ڕمبازی سوارانەوە لەگەڵ چەند

کەسێکی خۆمان راوستابووم، دیتم سوارێکی عەشیرەتی جلیت بەدەست وڵاغی تاو دابۆ لای شەفیقی عەوڵاغای حەوێزی کە ئەوسا لە سوارە هەرە ماهیرو شیرینەکانی دەوری خۆی حیساب دەکرا گەنجێکی زێدە بەرچاوو قۆزیش بوو. شەفیقاغا بە پێی دەستـووری جلیتبـازی وڵاغـەکـەی خۆی خستـە غارو رووشی وەرگێڕا بۆ لای کابرای جلیت بەدەست. کابرا جلیتی حەواڵەی لای شەفیقاغا کرد، ئەویش هەوڵی دا جلیتەکە بقوزێتەوە بەڵام دەست و قامی کابـرای جلیت هاوێـژ راستی نەهێنـاو جلیتـەکـە مەترو نیوێك لە شەفیقاغا دوور ڕەت بوو. شەفیقاغا بۆی هەبوو باداتەوە سەر غەریمی خۆی بەڵام وابزانم تێبینی لەوەدا کرد کە کابرا مێوانەو خاڵە بەخشی کرد. من ئەم دیمەنەم بە چاکی لە بیرە، واش دەزانم لەو شایی‌یە بوو کە بۆ ئاهەنگی ژن هێنانی کاکـە زیـاد دەگـەڕا، ئنجـا ئەگـەر لە بیـرکـردنـەوەدا بە سەهـوو چوویێتم نازانم بڵێم لە چ ئاهەنگێکی دیکەدا بووە چونکە لەو تەمەنەمدا بەزمێکی دیکەی وەها بە هاتوبات نایەتەوە بەر یادم.

بەهـەمـوو حاڵ ئەم دیمـەنـانـە هی سەرەتـای قۆنـاغی دوای ساوایمیـە، لەووشـدا عەزە غدایی پشکێکی بەرچـاوی هەیـە، مچەی حەبە تۆزەش یەکێکە لەو کەسانەی وێنەیان لە ئاوێنەی هەستی ساوایمیدا نەقش بەستوو بووە چونکە بەزۆری سەردانی کۆیەی دەکردو بەپێی مەیلی ژنانەی هەمیشە لە مەجلیسی ژنە خاوەن ماڵ و حاڵەکانی ئەوسادا خزمەتگوزاری‌ی بەجێ دەگیاندو هەر جارەش خەبـەراتی ژنـە ناودارەکـانی سلێمـانی‌و کەرکوك و هەڵـەبجـەی. وەك نەشـرەی ئەخبـار، بەو مەجلیسـا نەدا بڵاو دەکردەوە. هاتو چۆی بۆ ماڵی ئێمەو ماڵی مامم بەر دەوام بوو، تەنانەت جارێکیان لەگەڵماندا هات بۆ سەردانی حەمام جەلی، لە گەڕانەوەشدا بە درێژایی ڕێگا گۆرانی بۆ گوتین و چەغانەی لێدا. بەسەر پشتی وڵاغەوە. ئەو جارەیان مامم و خاڵە عیززەت لەگـەڵـدا بوون، منیش لە پاشکـۆی کاك طاهـری حەمـە لاڵ سواریماینە بۆرە بووم کە لە خاڵانمەوە بەدیاری بۆم هاتبوو، مەبـەستیش خاڵـوانی پژدەرە. لە هەوڵـەوە ئەسپێکی گوڵـڕەنگی قەشـەنگم لە شێـخ حەسـەنی جاجی سەیـد گوڵ، ئامـۆزای دایـکـم و زاوامـان، بۆ هات. . دواتـر باوکم ئەسپـەکـەی بۆ هەناردنەوە بە نیازی ئەوەی لە شوێنی ئەودا ماینێکم بۆ بنێرن، ئیتـر ماینـە بۆرە، کەدەتگـوت شیـری سپییـەو وەك پەیکـەری وەستـایـەکی هونـەرکـار خڕو خۆڵ و قەشـەنگ ڕەوت و غاری دەکـرد، لەجێی ئەسپـە شێ بۆم بوو دیـاری. ئەو ڕۆژە کە لە حەمام جەلی دەگەڕاینەوەو مچەی حەبە تۆزە گۆرانی‌و چەغانەی لە کاردا بوون کاك طاهیـر جڵەوی بۆ ماینـە بۆرە بەرەڵـڵا کردو بەمەودا پێش قافڵەی حەمام چییان کەوتەو، بەڵام لەڕێگەیەکی هەڵەوە ڕۆیی. . چەندێکی جەماعت لە دواوە بە پلارو دەنگی بەرزەوە گۆرانی (هـۆی خاڵی ڕێبـوار، ڕێم لێ گۆڕاوە)یـان بە دوادا ناردین کاك طاهیر لێی نەبیستن ئەوانیش گۆرانیەکەیان بە (ڕێت لێ گۆڕاوە). دوای هەڵـەبـوونێکی مزرۆکـە ئنجا هاتینەوە سەر ڕاستە ڕێگای چنارۆك.

## ساوایيم و حەمەدی ڕەش

دەنگـوبـاسی حەمـەدی ڕەش داستـانێکـە بۆ خۆی. ڕاسییـەکـەی بەسـەرهـاتی ئەم کەڵـە دزە بێباکـە نەتـرساوە شیاوی سەرە باسێکی سەرەخۆیی درێژە داری بەوردەیە. من لێرەدا تارماییەکی ڕووداوی شەقاوەتەکەی حەمەدی برایم ڕەش باس دەکەم کە لەگەڵ بیرەوەری‌ی تەمەنی شلکی ئەوسامدا بگونجێ، دەرفەتیشم نییە لە بەغداوە بۆی بچمەوە کۆیێ بە پرسی‌و تۆژینەوە ڕەگوڕیشەی ژیانی بۆ بەر ڕووناکی دەربکێشمەوە.

حەمـەدی ڕەش فەقێ بوو. لە ساوایيمـدا بەینێـك لە مزگـەوتی حاجی مەلا ئەسـعـەدی خوێنـدوومو زۆر جاران ئیش و کاری بەر دەستی پووری گەورەم یا فەخرەی کردووە. دەیانگوت وەکوو خۆیی هاتـوچـۆی ماڵ و مزگـەوتی دەکـرد. من بە بیـرمـدا نایەت بە زیندو ووەتی دیتبێتم، باشتـریش لەوەیـە بڵێم وێنـەیم لە یاد نەمـاوە. بە ڕواڵەت فەقێیەکی شەرم بەخۆو چالاك بووە، دواتر دەرکەوت گورگـ بوو لە پێستی مەردا.

شەوێکی هاوین، ماڵمان لە چنارۆك بوو، بەڵام من بەرێکەوت لە کۆیێ لای باوکم بووم. لەبەر منداڵیم هێشتان مەجلیسی باوکم قەڵەباڵغ بوو من نووستم. کاتێك خەبەرم بۆوە شەو وەکوو ڕۆژی لێ

هاتبوو لەبەر زۆری چراو هاموشۆکەرو دەنگوبەنگی قەوغای ماڵ و کووچەو کۆڵانەی دەورمان. ئەو دەمە جۆرێك سەیرهاتنەوەو رامان و شڵەژانێکم هەست پێکرد، دواتر بۆیان باس کردم چ رووی داوە.

پاش هەڵستانی مەجلیس مەلا عیززەتی ئامۆزای باوکم و مامەی وەستا بە نۆرەی شەوانەی خۆی لای باوکم دەمێنەوە، یاریدەرەکانی دیکە چوبوونەوە بۆ ماڵەکانیان. دوای داخستنی دەرگەی دەرەوە، لەسەر بانەوە مامەی وەستا برایم رووناکییەکی دێتە بەر چاو لە ژوورێکی نزیك دەرگای دەرەوە بۆ ماوەی تروکەیەکی چاوگەش دەبیێتەوەو نامێنێت. بە باوکم و خاڵە عیززەت دەڵێ ئەگەر چاوم رەشکەو پێشکەی نەکردبێ زەلامێك لەو ژوورە خۆیو حەشار داوە.. خولاسە بۆی دەچنە ژوورەکەوە، کابرایەك هەر دەپەڕێ بە خۆیو دیواربڕێکی گەورەی ئاسنەوە. مامە لە دواوە باوەشی پێدا دەگرێ، بۆی زەوت ناکرێ. کابرا کە دیتی دەرگا پێوە دراوە خۆهەڵەکوتێ بۆ سەربان، مامەی بەسەر پشت وکۆڵەوە. چەند پێچکەیەك لە قادرمەکان سەر دەکەوێ باوکم هەر دو قاچی رادە کێشێو دەیهێنێتەوە بۆ حەوشە. مەلا عیززەت دیوار بڕەکەی دەکەوێتە بەر دەست تا تینی هەبوو لە پشتی مامەی راکێشا بوو. مامە هاوار دەکات و کابرای لە دەستان بەر دەبێ.. سەری خوێنەر نەیەشێنم خەڵق بەدەنگەوە هاتن و کابرایان دەردەست کرد، ئەویش هەر خەریك بوو رووی خۆی بشارێتەوە تاکوو مۆنی نەشئەت دەیناسێتەوە دەڵێ: کاکی رەش ئەوە تۆی؟ ئیتر عالەم رژانە ناوە، حکومەتیش خەبەری بۆوەو حەمەدی رەشیان بردبوو بۆ سەرا. لە رێگەی بەرەو سەرا مەلا فەتاحی مەلا عیززەت لەو دەمەدا کە حەمەدی رەش بە دەست خەڵق و پۆلیسەوە شەق و زللەدایە نوکتەی بۆ دێت و دەڵێ: فەقێ حەمەد ئەرێ (ضَرَبَ زیدٌ عمراً) تەرکیبی چییە؟

دەیانگوت حەمەدی رەش لەو شەوەدا رقی هەڵگرت لەو کە سانەی بە لێ دان و شکاندنەوە زۆریان دەسدرێژی لێ کردبوو، لە ساڵانی دواتردا ئەو رقەی خۆی هەڵرشت وەك کە بە کورتی لە بارەیەوە دەدوێم.

کە ژوورەکەی دەگەڕێن چەند چشتێکی دزراوی تێدا دەدۆزنەوە کەواتا ئەو دەمە نەزاندارا بوو کێ دزیونی، یەکێك لەو شتانە سەعاتی مفتشی معارف بوو کە لە قوتابخانەی سەرەتایی بەشەو دوای خەوتن لێی دزرابوو.. حەمەدی رەش تەنها دانی بەوەدا هێنابو کە بە نیازی دزی بۆ ماڵی ئێمە هاتبوو، شتەکانی دیکەی ئینکار کردبوو کەوا بەدزین دەر دەستی کردین: گوتبووی لە کۆڵانەو نازانم کوێ دۆزیمنەتەوە. باوکم لە حەقی شەخسی خۆی خۆش بوو، لە ئاکامدا بە چەند مانگێك حوکم کۆتایی بە موحاکەمەی هات..

چەند ساڵێك بەسەر ئەم رووداوە دا تێپەری، حیکایەتی حەمەدی رەش کۆن بوو. من گەیشتبوومە تەمەنی خوێندن: دەمەو هاوین باسی دزرانی ماڵی فلان و فلان بە شاردا بلاو بۆوە. چەند شەوێکان خەڵقەکە پێ باك بوون بە خەیاڵی ئەوە کە دزین هەر هەبووە هەر دەبێ.

بەلام مەسەلەکە لە حیسابی عادەتی تێپەری کرد: شەوانە چەند ماڵێك دەدزران بێ ئەوەی کەس هەست بەدز بکات. حکومەت دەوورییەی دەنگە دان، خەڵقیش بە هەستەوە گورگە خەوەیان دەکرد. لەگەڵ ئەمەشدا بۆ سبەینە دەزاندرا کە 4 ـ 5 ماڵ یان دزراون. بە درێژایی شەو فیفرەی پاسەوانان لە کۆڵانە دەنگی دەهات خەڵقیش لەسەر بانان ئاو دەنگی یەکدییان دەکرد کەچی بۆ سبەینە 6 ـ 7 ماڵ مەعلووم دەکرا کە دزراون. دەڵێن لێ هەڵگیرابوو، منیش لەو تەمەنە دا وام بە بیردا دێت گوێ بیستی ئەو هاتوباتە دەبووم، بەلام ترسم رێ نەدەنیشت چونکە ماڵمان لە چناروك بوو من هەمیسان بە رێکەوت ئەو هاوینەش لە کۆیێ لەگەڵ باوکم بە سەرم دەبردو بەشەو دەو وبەرمان قەڵەبالغ بوو لەوانە نەبووین دز تەماعمان لێ بکات.

ئەوسا جەمیل ئاغای حاجی ئەسعەد اغای حەوێزی قائمقام بووە یەکێك لەوانەی ناحەزی بوون نامەی نووسی بوو بۆ رۆژ نامەیەکی بەغدا و ئەو بارە ناله بارەی کۆیەی تێدا باس کردبوو تاوانەکەشی لە مل کەمتەر خەمیو بێ باکیی ئیدارەی قەزا پێچا بوو. کە ئەم خەبەرە لە رۆژنامە بلاو بۆوە ئیدارەی هەولێر و کۆیێ پێی سەغڵەت تر بوون: پاسەوان و دەوورییەی شەویان زیاد کرد، هەستیش بەوە دەکرا کە ئەم دزە، یان ئەم دزانە، بەر لەبیانی شار جێ دەهێڵن بۆ دەرەوە، ئیتر لە پاش عیشاوە دەستەیەك لە

تفەنگچی لە زارکی هەر کۆلانەیەکی بۆ دەرەوەی شار دەر بکات خۆیان دادە نووساند، پاسەوان و دەورییەی عادەتیش لە گەڕان و سووڕاندا دەبوون هەتا سبەینە. شەوێکیان لەگەڵ تەقەی دەسرێژی تفەنگ خەبەرم بۆوە، هەستیشم کرد خەڵقی سەربانەکان کەوتنە پرس و گفتوگۆ لەگەڵ یەکدیدا، پاسەوانیش وەکوو تەتەر بەکۆلاناندا دەیانچرپاندو فیفرەیان بە دەنگ دەهێنا. من خەوم لێ کەوتەوە. سەبینە بەر لە ڕۆژ هەڵات هەڵستام وگوێم لێ بوو خەڵق بە تێکرایی لە باس کردنەوەی تەقەکانی شەو بوون. هەر لو قسانەیاندا بیستم کە حەمەدی ڕەش بەر ئەو تەقەیە کەوتووەو مەیتەکەی لە حەوشی سەرا فڕێ دراوە. یەکسەر چووم بۆ حەوشی سەرا: یەکەم جار بوو چاوم بە سەرو سیمای مردووی بێ هەناسەی حەمەدی ڕەش بکەوێ. قەوارەی بڕینی گوللە لە دەندەڵەی سینگی دیار بوو، چاکەتێکی پۆلیسیانی لەبەر بوو، پڕی باغەڵەکەی سەر سینگی تۆچایە بوو، لای دامەنی چەرچە فێکی پێدا درابوو چونکە لە کەمەری بە ڕەژێرەوەی ڕووت بوو، قەیتانی فیفرەشی بە فیفرەوە لە ملدا بوو تومەز هەموو شەوێك بە جلکی پولیسان دەگەڕاو کە پاسەوان و دەورییەی لێ نزیك دەبوونەوە فیفرەی بۆ لێ دەدان وەك کە خۆی پاسەوان بێ، تفەنگیش بەشانەوە دەبوو وەکوو پۆلیس وپاسەوانەکان.

ئەو شەوە چەند ماڵیکی بڕی بوو. بەر لە فەجر لەگەڵ هاوڕێکانی بەرەو دەرەوەی شار دەڕوات. بەڕێکەوت ئەو شەوە لەو ڕێگایەوە بەرەو دەرەوە دەڕوات کە دەکەوێتە لای دەباخانان و حەمامی پیسکان بۆ سەر پردی ناو ڕەزەکان شۆڕ دەبێتەوە: تاقمێك لە پاسەوانی تفەنگچی کە لە ناویان پیاوی تایبەتی جەمیل ئاغای هەبوون، بەتەنیشت حەمامەکەوە خۆیان پەنهان دەکەن و بێ سەداو دەنگ چاوە نۆڕی ڕێکەوت دەبن. کاتێك حەمەی ڕەش و جەماعەتەکەی دەگەنە بەر لوولە تفەنگی ئەو ئیشکچییانە دەنگیان دەدەن، حەمەد تفەنگێکیان لە باڵ دەکات؛ ئەوانیش دەسرێژی لێ دەکەن تەقە دەبڕێتەوە بێ ئەوەی بزانن کەس بەرکەوتووە یان نا. پاش بەیان ئیشکچییەکان دەگەڕێنەوە بۆ ناو شار. ئەوساش مەعلووم ناکرێ چی ڕووی داوە، هەتا ڕێبوارێك لە ڕانیەوە دەگاتە ئەو شوێنەی تەقەی لێ کراوە دەبینێ کوژ راوێك کەوتوتەوە ناو جۆگای بەر ڕێگەکەوە ئیتر خەبەر بە حکومەت رادەگەیەنیو مەیتەکە دەبەنەوە بۆ سەراو دەزاندرێ حەمەدی ڕەش کوژراوە. هاوڕێیەکی حەمەدی ڕەش ناویم لە بیر نییە بریندار دەبێو بە خوێنەکەیدا دەچنەوە تا مەیتەکەی لە بناری شاخی چنارۆك بە دیوی کۆیەدا دەدۆزنەوە. ئەمیان سەر بە جەماعەتێ کۆیخا خدری هۆرمزیار بوو کە بەخۆیو چەند ماڵێکی خزمیەوە لە (کانی کەند)ی سەربە چنارۆك ئێمە دەژیان. لە تەحقیقاتدا دەرکەوت حەمەدی ڕەش لەگەڵ ئەم تاقمە ماڵەی کانی کەند ڕێك دەکەوێت و مەکۆیان لە گردێکی بناری چیای چنارۆك بەسەر کانیەکەوە دەبێت. ئەو گردە ئێستا پێی دەگوترێ گردی حەمەدی ڕەش، کانیەکەش هەر بەوەوە ناو دەبرێ. ماڵێکی بە دزین دەستیان کەوتبایە لەو نامەدا دەیانشاردەوە. کە لێیان قەوماو مەکۆیان دۆزرایەوە کەمتاکورتێکی ئەو ماڵە گەیشتەوە دەست خاوەنە کانیان. کوێخا خدر بە خۆیو حەسەنی کوڕیو کەسانی دیکەشی گیران و حوکم دران بەڵام نازانم چەندو چۆن: هێندەم لە بیرە هاوینێکی دواتر ماڵمان لە چنارۆك بوو کە کوێخا خدر ماوەی حوکمەکەی بەسەر بردو گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی لە کانی کەند: کە بەلاماندا تێپەڕی دیتم ڕەنگی لە چاو هی پێش حەبس بوونی وەکووو شەعرەی زەردە لێ هاتبوو تومەز لەو ماوەیە دا کەمتر لە جاران کەوتبوە بەر هەتاو. زۆریشی نەبرد بەسەر دا مرد. حەسەنی کوێخا خدر دوای باوکی گویستیەوە بۆ بیتوێن. لە کوژ ڕانی کەمالی جەلال صائب. قائمقامی ڕانیە، تۆمەتی بۆ چووو نەختێکیش گیرا بەڵام حوکم نەدرا. ئەویش زوو مرد، کچێکی (ئەستی) ناوی لە دوا بەجێ ما لای زر نەنکی لە کانی کەند، مایەوە:

هەتا دنیا دنیابێ دەنگە نییەو نەبوە وەکوو دەنگی ئەستی بالۆرەی گوتبێ: جۆرە زەنگوڵەو هێنان و بردنێکی دەکەن و تایبەتی لەو دەنگەدا هەبوو بالۆرەی بەرەو بەرزاییەوە دەبرد. ئەویش بە جحێلی مرد.

حەمەدی ڕەش جگە لە سوود وەرگرتن لە جلك و فقیرەی پۆلیسان بۆ شوێن بزری، لە نوێنەکانی شاریش بە مرادی وزویەتی دەگەیشت: بەشێکی زۆری ئەو نوێنانە زەلامیان تێرا دەرۆیشت، لەوە دەیتوانی لە دەمی سەغڵەتیدا خۆی تێدا بشارێتەوە. وەها دەبوو لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی دراوسێی بە نوێندار هاتوچۆی دەکرد: لە هەر کامێکیان لێی بەدەنگە هاتبانایە بەو نوێنەدا دەچوە ماڵەکەی دیکە ویان بەولاوەتریش، بە ئاسانیش دەیتوانی لەو تەرزە ماڵانە دا بە یەك شەو چەند ماڵێك بدزێ.

لە لایەن تۆڵەستاندنەوە لەو کەسانەی کە لە شەوی دەردەست بوونی ئازاریاندابوو ویا سووکایەتییان پێ کردبوو، وابزانم تۆڵەی خۆی لە هەموان ستاندەوە و یەك یەك ماڵەکانیانی بە تالان برد، لەگەڵ هەندێکیان هەڕەشەو تۆقاندن و سووك کردنیش بەکار هێنابوو بێ ئەوەی خۆیان لێ ئاشکرا بکات.

هاتوباتی حەمەدی ڕەش دەوری 40 شەوێکی ئەفسانەیی خایاند: لەو ماوەیە دا وەکوو مۆتەکە لە پەردەی مێشکی هەموو هۆشدارێك لە شاری کۆیێ بە نامۆیی و نەناسراوی چەسپ بوو. لە پاش ماوەی دوای مەرگی دوو شت بەجێ مان، یەکێکیان بێوەژنەکەی بوو کە من لە دەمی کوژرانی دا جاری نەمدەزانی ژنی هێناوە، دواتر بیستم بێوەژنی حەمەدی ڕەش شووی کردۆتەوە بە (ئاغا کۆر) کە بۆرە پیاوێکی چاو کزی کۆیی بوو. جگە لەوەی کە ئاغا کۆر بەو ژنەوە ناوی دەناسرا مەهارەتێکیش هەبوو هەر لەوەم دیتەوە: لەگەر هەناری بە دەستێکەوە دەگرت و بە ددان و زار خەریکی خواردنی دەبوو بێ ئەوەی یەك دەنگی لێ برژێ.

من چەندین جار ئەمەم لێ دیتەوو هەرگیز دەنگی بەرنەبۆوە.

پاش ماوەی دووەمی ئەو مەکۆ و گرد و کانیە بوو کە لە دەمی دزینەدا کردبوونی بە حەشارگە. من و برادەران زۆر جار بۆی دەچووین و لێرەو لەوێ ژێر ئیستیکان وکەچکە چایە و شتی ئەوتۆییمان لێ دەدیتەوە. لە سەرووی گردەکە دار مازوێك هەبوو، لەژێریەوە دانەشاخی زل سەریان تێك نابوو، لە کەلێنێکەوە بەناویاندا سەرەژێر دەچووین بۆ وێنە ئەشکەفتێە بچووك کە دانە شاخەکان بۆی ببون بە سەربان و بنمیچ. لە ڕووکاری بەرەو ژێری گردەکەوە بایی ئەوەی تفەنگچی نیشانە بگرێ کونێکی بچووك ساو درا بوو بەسەر سێ لای گردەکەدا زاڵ بوو بە جۆرێك کەس نەتوانێ لێی نزیك ببێتەوە. ئەو قایمە کارییەش شتێك بوو لە مەهارەتی دزانەی حەمەدی ڕەش دەوەشایەوە.

یادی حەمەدی ڕەش دەبێتەوە کۆتایی ئاڵقەی سێیەمی ئەم زنجیرەیە.

دەڵێن: عند ذكر الصالحين تنزل الرحمة. خوایە تۆش بە گەورەیی خۆت ڕووڕەشیی حەمەدی ڕەشمان لێ بکەیت بە شەبەقی کازیوە کە مۆژدەی ڕۆشنایی و هێنانی ڕادەگەیەنێ.

(1) دواتر لە ئاڵقەکانی ئایندەدا باسی بنەماڵەی شێخ کەریم دێت.

(2) حوێز کوری نجم الدين و نەوەی وەستا محيي الدينە. ئەو وەستا محيي الدينە لە گرانیەکەی 1917 پاسەوانی قەیسەری کۆن بووە. شەوێکیان دەستەیەك لە مرۆی بێ ئینساف بە نامەی پێداویستی کفن بۆ مردوو دەرگای قەیسەریەکەی پێ دەکەنەوەو سەری دەبڕن، مێرد منداڵەیەکیشی لەگەڵدا دەبێ چەندێکی لە بەریان هەڵێت و لێیان دەپارێتەوە دادی نادات، ئەویش سەر دەبڕن. چەند دوکانێك لە قەیسەری تالان دەکەن. هەر لێرە هەتا برانەوەی دنیا لە عنەت لە ڕۆحی زۆردار و خوێنڕێژ بێت.

(3) مەلا عەبدوررەحمانی کاکی جەلی 4 برای لە خوگچکەتری هەبوو. لەمانە برای سێیەم (مەلا مەحموود) باپیرە گەورەی تیرەی ئامۆزا محمد بووە. برایەکان چووە بۆ شام و بوتە مریدی مەولانا خالد و کچە برای دەخوازێت و لەقەبی (داماد) وەردەگرێ.

تێ بینی: لە ئاڵقەیەکی پێشوو تردا باسی حەسەنی مام فەتاحی (پێ بازۆك) هاتبوو. دواتر زانیم لە 1985/1/13ز. کەچی دوایی کردووە.

حەسەن بەناوی فەتاحی مامیەوە هەڵدەدراوە، باوکی ناوی عبداللە بووە. دوو کوری دیکەی کەوتنە دەشتی دزییان. حەسەن وەچەی وزۆری لە کچ و کور لە پاش بەجێماوە. من سەرە خۆشیم لە کورە گەورەی، عبداللە، کرد.

# جیۆپۆلیتیکی چیایەکانی کوردستان



● فؤاد حمه خورشید ●

پێشەکی : -

جیۆپۆلیتیکا Geopolitics زاراوەیەکە پسپۆڕانی جوغرافیای سیاسی لە لێکۆڵینەوە تیوری‌بابەتەکانیاندا دەربارەی ئەو ستراتیجییانەی پێوەندی بەرانبەریی نێوان سیاسەت و جوغرافیا تێك دەبەستن بەکاری‌دەهێنن. (1)

بۆیە (تایلور) بە جوغرافیای سیاسی ی ناودەبا. جیۆپۆلیتیکاش لە بنچینەوە بریتی‌یە لەو تیورییانەی بایەخ بە لێکۆڵینەوەی جوغرافیای سیاسی دەدەن و بۆ خزمەتی ئاواتە نەتەوەییەکانیان بەکاردەبەن. (2)

تیوری‌زانەکانی جیۆپۆلیتکا لە شیکردنەوەو ئەنجام دەرهێنان و خستنە کاریدا پشت بە چەند تیوری‌یەکی گشتی‌ی ستراتیجیەتی جیهانی دەبەستن کە ئەمانەن : -

1 - تیوری‌ی هێزەکانی دەریا.
2 - تیوری‌ی هێزەکانی ووشکانی.
3 - تیوری‌ی لایەکان (رم لاند).
4 - تیوری‌ی هێزەکانی ئاسمانی.
5 - تیوری‌ی ئەتۆمی.
6 - تیوری‌ی چەکی بۆشاییەکان.

ئەم گشت تیوریيانەش، تیوری‌ی ئەتۆمی و چەکەکانی بۆشایی لێ‌دەرچێ لە هیچەوە پەیدانەبوون، بەڵکوو خاوەنەکانیان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو بەڵگەو نموونەی زۆری مێژووی مرۆڤایەتی‌دا گەڵاڵەیان کردوون.

ئێمەش بەش بەحاڵی ووتارەکەمان حەزدەکەین سێ تیوری‌یەکەی پێشەوە بە کورتی باس بکەین چونکە لەسەریکەوە گرنگن وولەسەریکی تریشەوە پێوەندی‌یەکی راستەوخۆیان بەبابەتەکانەوە هەیە.

**تیوریی هێزەکانی دەریا:** [3]

خاوەنی ئەم تیوریی‌یە ئەلفرید میهن (1840 ـ 1914) ئەمیرالێکی دەریاوانی ئەمریکایی‌یە، کە پوختەکەی لە کتێبی «هێزی دەریاو کاری لە مێژوودا»ی خۆیدا بلاوکردۆتەوە، میهن لای وابوو ئەو دەوڵەتانەی مەزنترین هێزی دەرییایان هەبێ دەبنە ئاغای جیهان و لە دواییشدا دەستی بەسەردا دەگرن. ئەمەش چونکە لە سەردەمێکدا دەژیا کە سەردەمی دەسەڵاتداریی بێ‌سنووری دەریاوانی بوو. لەسەر ئەم بناغەیە داوای لە ئەمریکای دەوڵەتی خۆی کرد هێزێکی دەریاوانی‌ی وا گەورە پێکەوە بنێ کە لەگەڵ بنکەی سەر ووشکانی‌و زەریا گەورەکانی بەروپشتی‌دا هاوشان بێت. داوای لێدانی جۆگای پەنەماشی کرد بۆکورت کردنەوەی ڕێگەی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژاوای وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەها داوای‌کرد لەگەڵ بریتانیادا پەیمان ببەسترێ‌و دەست بەسەر دورگەکانی زەریای هێمن دا بگیرێت. پوختەی تیوریی‌یەکەی ئەوە بوو «هەرچی بەسەر شەپۆلان ڕابگا بەسەر جیهان ڕادەگا».

**تیوریی هێزەکانی ووشکانی:** [4]

پاش ئەوەی میهن کتێبەکەی دەرکرد دوو کاری تازە لەسەر شانۆی جیهان پەیدابوون و نرخی تیورییە دەریاییەکەیان شکاند، یەکەمیان پێشکەوتنی فرۆکەوانی بوو پاش سەرکەوتنی تاقیکردنەوەی رایتی جووتە برا لە ساڵی 1903دا، دووەمیان باسێك بوو سێر هالفورد ماکندر ساڵی 1904 بەناوی (تەوەرەی جوغرافیای مێژوو) بلاوی کردەوە کە لە مەولا بە تیوریی هێزەکانی ووشکانی ناسرا.

ماکندر بە چاوێك سەیری جیهانی کۆنی کرد کە وەك یەك ئیشکانی (قارە)ی مەزن وایەو لە سێ بارستایی یان کەرتی (ئاسیاو ئەوروپاو ئەفریقا) پێك هاتووە، ئەمانە پێکەوە نووساون و دەریای ناوەراستیان لە ناوەند دایەو ناوی نا دورگەی جیهان (World Island) ماکندر ناوجەرگەیەکی ستراتیجی بۆ ئەم دورگە گەورەیە دانا کە کردی بە بنکە یان تەوەرەی لەنگەرگرتن و ناووکی جیهانی کۆن ویەکەمجار ناوی‌نا ناوچەی لەنگەرگرتن و «Pivot area» پاشان ڕێکی کردو ناوی نا «دڵی زەوی یان جیهان Heart Lamd» ئەم دڵی زەوییەش لە ئاوەڕێژی ڕووباری ڤۆلگا لە ڕۆژئاواوە تا سایبریا لە ڕۆژهەلات، لەبیابانەکانی ناوەراستی ئاسیا لە باشوورەوە تا جەمسەری (قوتبی) باکووری زەوی درێژ دەبێتەوە، تیزماڵە (کەوانە) کەنارێك دەوری ئەو دڵە دەدات بە کەوانەی ناوەوە «Inner Crescent» ناو دەبرێ‌و بریتیە لە ئەڵمانیاو دەوڵەتەکانی تری ڕۆژئاواو باشووری ئەورووپاو تورکیاو هیندستان وچین و دورگەی عەرەب و ئێران و کوردستان. ئەمەش بەشێکی تیزماڵە ووشکانی‌و بەشێکیشی زەریایی‌یە، جوغرافیازانەکان لەلایەن مەبەستی ستراتیجی جیهانیی‌یەوە بە ناوچەی خۆلێکدان «Crush Zone» ناوی دەبەن، تیزماڵەکەی دووەمیش (کەوانەی دەرەوەیە «Outer Crescent» کە بە دەوری ناوچەکەی ناوەندا هاتووە بریتیە لە بریتانیاو کەنەداو وولاتە یەکگرتووەکان و ئەفریقیای باشووری بیابان و ئوستەرالیاو ژاپۆن، ئەمەش ناوجەرگەی هێزی دەریایی‌یەو بەفرەوانی لە دەریاو زەریاکانی جیهاندا دەبزوێت و سەربەستی‌ی دەریاوانی‌ی لەدەستدایە، پوختەی ئەم تیوریی‌یەش ئەوەیە:

1 ـ هەرچی بەسەر ڕۆژهەلاتی ئەورووپادا فەرمانرەوا بێت دڵی جیهان دەکەوێتە بەردەستی.

2 ـ هەرچی دڵی جیهانی بەدەستەوە بێت دورگەی جیهانی دەکەوێتە دەست.

3 ـ هەرچی دورگەی جیهانی بەدەستەوە بێت دەست بە سەر جیهاندا دەگرێت.




*Mackinder's heartland.*

**تیوریی لایەکان (رم لاند):** [٥]

سپایکمن کە مامۆستایەکی ئەمریکایی بە خەریکی کۆڵینەوە بوو لە گرفتەکانی هێزو کاریان بەسەر پێوەندی نێو دەوڵەتانەوە، تا رادەیەکیش بە تیووریەکەی ماکندر چەش بوو، بەڵام هەندێ ئەنجامی وەدەست هێنا کە لە بۆچوونەکانی ماکندر جیاواز بوون ئەگەرچی هەر دابەش کردنە تیوریانەکەی ئەویشی بەکارهێنا.

دەرئەنجامەکانیشی ئەمانە بوون:

1 ـ هەرچی دەسەلاتی بەسەر (رم لاند)دا هەبێت ووشکانیی ئۆراسیای دەکەوێتە بەردەست.

2 ـ هەرچیش ووشکانی ئۆراسیای بەدەستەوە بێت چارەنووسی جیهانی دەکەوێتە بەر دەست.

سپایکمن جوغزی رم لاندی «Rim Land» وەکو ناوانێك و ناوچەیەکی دابرگە داناوە کە هێزە دژە ووشکانییەکان لە هێزە دژە دەریاییەکان جیا دەکاتەوە، بۆیە دەبێ (دەوڵەتەکانی ئەم نێوانە بە درێژای بەرەی ووشکانی (دڵی جیهان) و بەرەی دەریا (کەوانەی دەرەوە) هەوڵی خۆ پاراستنیان هەبێت). [٦]

ئەم تیوریانەش هێشتا کاریگەرییان بەسەر بوارەکانی سیاسەتی نێو دەوڵەتان و ستراتیجیەتی جیهانییەوە ماوە سەرەرای پێگەیشتنی چەکی ئاسمانیی و ئەتۆمی لەکن لایەنە سەرەکییە سوود وەرگرەکان لە بەکاربردنەکانی ئەو تیوریانەش.

لەتێکەڵ و پوختەکردنی ئەو سێ تیوریانەش پێکەوەو لە هەوڵدانی بەکاربردنیان لەباری ئێستای نێو دەوڵەتاندا دەتوانین بگەینە ئەم ئەنجامە:

جیهان بە پێی تیوریەکانی ستراتیجییەتی جیهانی بە سێ هەرێم بەش دەبێت:

یەکەم: بریتییە لە دڵی جیهانی ئیشکانیی و قەڵای هێزە ووشکانییەکان. ئەمرۆش بەپێی تیوریەکەی ماکندر یەکێتیی سوقیەت و دەوڵەتانی پەیمانی وارشۆ و چینی مللی. واتا ناوچەی یان جوغزی سوشیالیستی) دەنوێنێ.

دووەم: ناوچەی ناوەوە، ناوچەی خۆلێکدان، ناوچەی نێوان کەر، بریتییە لە هێزەکانی جیهانی سێیەمی ئاسیایی و باکووری ئەفریقاو دەوڵەتانی ئەمریکای لاتین و هەندێ وورده دەوڵەتی ئەورووپاو بە جوغزی «جیهانی سێیەم» ناو دەبرێت.

سێیەم: جوغزی دەرەوە کەوا هێزە سەرەکییەکانی دەریایی، واتا هێزە سەرمایەدارەکان داگیری دەکەن وەکو وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بریتانیاو ژاپۆن و دەوڵەتانی پەیمانی ئەتلەسی (ناتۆ) و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا (سیاتۆ) وەدەوڵەتانی پەیمانی پاسفیك و دەوڵەتانی هاوپەیمانییان.




لێرەدا دەتوانین بە «جوغزی سەرمایەداری» ناوی ببەین.

**جیوستراتیجی‌ی چیاکانی کوردستان :**

ئەگەرلە گۆشەی ئەوجوغزانەوە بنۆڕینە چیاکانی کوردستان دەبینین لە جوغزی دووەمی ناوەوەدا کەوا لە نێوان جوغزی سۆشسیالیستی و سەرمایەداری لە جوغزی دەرەوەدا جێگەی‌یەکی دیاری بۆخۆی کردۆتەوە. لەنێوان ئەو دوو ناوچانەدا کە دووبەردی دەستاڕ دەنوێنن کێشەو ململانێ لەسەر رامکردن و دووخستن یان داگیرکردنی (ناوچەی ناوەند) یان بەستنەوەی بە پەیمانێك لە هەر جورە رەنگیکدا بی بۆ دۆزینەوەی ناوچەی لەنگەرگرتن و لێیەوە بازدان بۆناو ناوچەکەی دوای ئەو لە پێناوی ناوچەی فراوانتروگشتی تری دەسەلاتدا لە نێوانیاندا بەردەوامە، سەرەڕای جیاوازی‌ی شێوەو رێگەی هێنانەدی‌ی ئەو مرازانە بە جیاوازی ئەیدیولوجیەتیشەوە.

چیاکانی کوردستان لە رۆژانی نووکەدا گرنگی‌ی زۆر گەورەی ستراتیجیان هەیەو وەکو جاران لە سەردەمە کۆن وناوەندی‌یەکاندا ئەو بایەخەیان هەر هەبووەو نەڕیووەتەوە هەروەکو لەمەودوا باسی دەکەین. چونکە ئەم گرنگی‌ی ستراتیجییەی لە گرنگی‌ی جێگەو سروشتی ڕاکشان و بەرزایی‌یەکانیان هەڵقوڵیوە، سەرباری توانستی ئابووری‌و مرۆڤانەو سوپایانەیان، لەبارەی سەختی‌ی هاتوچۆوکەم ڕێگاوبانی‌وکەم گەروو زینوو (ممر) ئەمانە گشتی مەودایەکی جیوپولیتیکی‌ی درێژەمانی‌و هەمیشەییان پێداون، ئەم هۆیانە وایان لێکردوون ببنە ئامانجی بەرچاوی داچەقیوی دوو هێزە گەورەکان، بۆیە لەنێوان هەر دوو بەردی دەستارەکەدا بەگیرهاتووە.

چیاکانی کوردستان کە بەشە ناوەندی‌یە گرنگەکانی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و تورۆس پێکدەهێنن لەرۆژاوای ئێران و باکوورو باکووری رۆژهەلاتی عیراق و باشووری رۆژهەلاتی تورکیا رادەکشێن و سەردەردەکەن لە باکوورەوە تا دەگەنە ئارارات و ئنجا سنوورەکانی یەکێتی سۆڤیەت. لە باشوویشدا (چیایەکانی زاگرۆس) دەنوارنە سەر کەنداوەکانی رۆژهەلاتی کەنداوی عەرەبی. لایەکانی رۆژاواشیان (توروس) لە قوڕنەی باکووری

ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست نزیك دەبنەوە. ئەم زنجیرە چیایانە بە گشتی بڵندو سەختن و بووینەتە دابڕێك دوو مەڵبەندی جوغرافیایی هاوسێ لێك جوودا دەکەنەوە، یەکەمیان لە دەستی ڕۆژاوایەوەو لە دەشت و بیابانی میزۆپۆتامیاو بانی ئەنەدۆڵ پێکهاتووە، دووەمیان لە بانی ئێران و بیابانە ناوخۆیەکانی تا ڕۆژهەڵات ڕاکشاوی ئێران پێکهاتووە، هەروەکو پرۆفیسۆر (رایت) دەڵێ «ئەمانە ڕۆژاوای ئاسیا لەلایەن جیۆلۆجی و فیزیۆگرافی وئاوو هەواو شارستانییەوە دادەبڕن» [7].

بۆیە لە کۆنەوە ئەم چیایانە بەناوچەیەکی دابڕگە بەناوبانگ بوون و بە درێژایی مێژوو کاریان بەرەنگاربوون بووەو بۆ دانیشتووەکان بوونە تەقوڵلەو قەڵا.

ئەم چیایانەش لەو ڕۆژەوە کە گوتییەکان پێیان لێ داناوە تا ئەمڕۆ لەلایەن ڕەگی مێژووییەوە، بووەتە نیشتمانی گەلی کوردو پەناو سەنگەرێکی قایم بۆپارێزگارییان. لەبەر ئەوە بەگشتی بایەخێکی ستراتیجیی گەورەیان هەیە، واتا گرنگییە جوغرافیاییەکەیان لە ڕۆژانی ئێستاشدا کارێکی گەورە دەکاتە سەر پایەی سیاسی لە سیاسەت وپێوەندییە نێو دەوڵەتییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

**شیکردنەوەی جیۆپۆلیتیکی:**

ئەگەر بەسەر گرنگییە جیۆپۆلیتیکیەکەی ئەم چیایانە لەسەردەمی گوتیی و میدییەکاندا ڕەت بین، ئەوەندە بیردەخەینەوە کە کێشەکەی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی سۆمەری و ئاشووری یەك لەدوای یەك بەچی گەیشت، دەوا زۆرانبازیی نێوان گوتی و ئەکەدییەکان ئەوە بوو گوتییەکان توانییان ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی لەناو ببەن و نزیکەی سەدەیەك (2230 ـ 2120 پ. ز) لە هەواری ئەوان دا فەرمانڕەوایی بکەن، هەروەها کێشەی نێوان میدیاو ئاشووووورییەکان بە ڕووخانی دەوڵەتی ئاشووری لە ساڵی 612پ. ز دا دوایی هات [8].

بایەخی جیۆپۆلیتیکیی ئەم چیایانە نەك هەر بۆ کورد بەڵکو بۆ دەوڵەتانی دەوروبەر و هاوسێش چەرخاوچەرخ بەردەوام بووە، هەر بۆیە هەموو حکومەتەکانی ناوچەکە لە پێش زایینەوە بە چاوی ستراتیجی زانی سەیری ئەم چیایانەیان کردووە، چونکە وەکو کلیلێك وابووە بە دەست ئەوەی توانیبێتی بیانگرێت وبیان خاتە سەر وڵاتی خۆی. بەڵکو لاپەڕەکانی مێژوو پیشانمان دەدەن کەوا کێشەو ململانێ لە سەر ئەم چیایانە زۆربەی جار بۆ مەیدانێکی فراوانتر پەلی دەهاویشت و بۆ ئاسۆگەلی هەرێمی فراوان دەتەنییەوەو سنووری پەل هاویشتنی هەرێمانەی سەر ووشکانی دەبەزاند ڕووەو هێزە دەریاکان ملی دەنا، ئەمانەش تووشیان دەبوو بەتووشی هێزی گەورە گەورەی بنکە چەسپیوی ووشکانی، بەڵکو ئەنجامی ئەو ململانێ ستراتیجیانەو ئەو کێشە توندوتـ لـە ـیژوویەی نێوان ئیمپراتـ ڕ ـەکانی چەرخە کۆنەکان و چەرخە ـی ناوەڕاست بە شێوەیەك کە زاڵ بوونی یەکێکیان بەسەر ئەوی دیدا دەبووە هۆی گۆڕینی نەخشەی ناوچەکە تا ماوەیەکی زۆر، زۆربەی جاریش هێزی بەزیو بە تەواوی لەناو دەچوو.

جا لە کاتی بەباڵاگرتنی تیۆریی ستراتیجییەتی جیهانیی هاوچەرخ بەش بە حاڵی هێزە گەورەکانی جیهانی کۆن دەبینین هاوکێشەکە وەهای لێ دێ:ـ

1ـ هێزەکانی ووشکانی: لە چەرخی کلاسیکیدا خۆیان لە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی و هێزە شەرکەروتییە سوارە دەستدرێژ و چەپاوکەرەکانی دەنواند.

2 ـ هێزەکانی دەریا: کە ئەوسا بریتی بوون لە ئەتینا پاشان مەکەدۆنیا (336ـ 323 پ ز) کە لە ڕۆژاوای هێزەکانی یەکەمدا بوون.

ئەم دوو هێزە دوو بەرداشی کێشەکە بوون و چیاکانی کوردستانیش لە نێوانیاندا بوون، کێشەکە لەسەر ناسکیی شوێنی جیوستراتیجیی چیاکان بوو، هێزی یەکەم دەیویست هەر لەدەست خۆیدا بێت بیکا بە

چەپەرو زریپۆشی پاریزگاری مولّك و ماڵی ناوەوەو رۆژاوای لەکاتیکدا هێزی دووەم چاوی لەوەبوو ئەو قەڵغاون زریپوشە لە دەست ئەخمینیەکان دەربهێنێ و لەلای رۆژهەڵاتەوە خۆی بێ پاریزیێ و بەڵکو بیکا بە پێگەی هەڵمەت بردنە سەر قووڵایی ئاسیا لە رۆژهەڵاتدا.

کێشەی نێوان ئەو دوو هێزە چەند سەدەیەکی خایاند تا هێزەکانی کزرکیسی ئەخمینی Xerxes) ی کوری داریوسی یەکەم کەلەساڵی (485 - 465 پ. ز) حوکمی کردووە پاش پەلاماریکی دری وولاتی میزوپوتامیاو ئاسیای بچووك کاتێك کە چیاکانی کوردستان قەڵای رۆژاوای دەوڵەتەکەیان بوو لە (بەژ)ەوە تا سنووری مەکەدۆنیا چوون.

بەڵام دوای ئەوەی مەکەدۆنی یەکان توانییان لە شەری دواپێهێنەری ئیسوس (333پ. ز)دا ئەخمینی یەکان بشکێنن، لەوە گەیشتن کە پێویستە تا پاش چیاکانی کوردستان راویان بنێن بەو پێ یە کە لەلایەنی ستراتیجی یەوە بایەخێکی گەورەی بۆ دەوڵەتەکەیان هەیە، پاشان هێرشە گەورەکەی ئەسکەندەری مەکدونی «ذو القرنین» (356 - 323 پ. ز) دەستی پێ کردو لە شەری ئەربیلا (هەولێر) لەساڵی 330 پ. ز)دا داریوس شکاو لەبەر هێزە سەرکەوتووەکاندا رەوی.[9]

بەم جۆرە دەبینین دوای ئەوەی ئەسکەندەر توانی زریپۆشەکەی ئەخمینیان کە چیاکانی کوردستان بوو تێك بشکێنێ جاریکی دی ئەم چیایانە بۆ ئەو بوونە سەنگەری قایم بەرامبەر بە هێرشەکانی رۆژهەڵات، وە هەر لەو قەڵا قایمەوە لەشکرەکانی بە ئاسانی بەرەو رۆژهەڵات شانی کوتا تا گەیشتە هیندستان و توانی یەکەم ئیمپراتۆری لەو رادەیە نیمچە ووشکانی یە لە مێژوودا دابمەزرێنێ[10]. جا ئەگەر لەباری جیوپۆلیتیکیەوە سەیری هێزی دوولایەنە شەرکەرەکە بکەین دەبینین هەردووکیان بەر لەوەی ببن بە هێزێکی گەورەی مێژوویی یەکەمجار لە پەلهاویشتنەکانیاندا دەستیان بەسەر چیاکانی کوردستاندا گرتبوو. هەر ئەو هاوکێشەیەش لە ململانێی رۆما، میراتگری ئەتینا لەگەڵ پارثیەکانی میراتگری ئەخمینی یەکان دەربارەی ئەو چیایانە دووبارە بووەوە.

پاش ئەوەی کورد موسڵمان بوو رۆڵەکانی خۆیان کردە ئیزنگی ئاگرەکەی لەشکرانی ئیسلام لە چیایەکانیانەوە بەرەو رۆژهەڵات سەرگەرمانە کەوتنەرێ، ئەوەبوو چیایەکانی کوردستان بوونە پێگەی پتەوو قەڵای قایمی ئەم لەشکرانە، ئیتر بە پشت قایمی یەوە لە رۆژهەڵاتدا لە قووڵایی ئاسیادا چونە ژوور تا تخووبی چین. وە هەر لە گۆشەنیگای جیوپولیتیکیەوە دەنۆرین چۆن چیایەکانی کوردستان بوونە لانەی پتەوی لەشکرانی ئیسلام دوور لە دورگەی عەرەب کە لەوێوە بەرەو رۆژهەڵات هێرشیان برد، هەر چۆنێك بێت سەرلەشکرانی ئیسلام بێ گومان حیسابێکی تایبەتیان بۆ گرنگی ی ستراتیجیانەی ئەو چیایانە کردووە. بەم جۆرە چیایەکان لە سەردەمی ئیسلامیشدا بایەخی جیوپۆلیتیکای خۆیان هەتاسەر هەر ما.

پاش ئەوەی مەغولەکان لە ناوەراستی ئاسیاوە لە وێنەی هێزێکی ووشکانی ی شاڵاوبەری بەترس دا راست بوونەوەو دەرگاکانی جیهانی ئیسلامییان لە رۆژهەڵات کوتایەوە، وورده دەوڵەتە موسڵمانەکانی وولاتی (ماوراء النهر)و خوارەزمیان بەر چەپۆك دا، قۆشەنیان کە گەیشتە چیاکانی کوردستان تووشی بە زەبرترین بەربەرەکانێ بوو، ئەم چیایانە بە دانیشتوانییانەوە بوونە گەورەترین تەگەرەی بەردەم بەرەوپێش چوونی خێرای مەغولەکان رووەو رۆژاوای ئاسیا. ئەوەبوو مانگۆخانی ئیمپراتۆریان دوای ئەوەی دەربارەی سەختی ی ئەو ناوچانەو دری ی خەڵکەکەی دەنگوباسی پێگەیشت، کە هۆلاکوی برای کردە سەر لەشکری هێزی داگیرکردنی بەشەکانی تری جیهانی ئیسلامی کە پاش چیاکانی کوردستانن بە بەغدای پایتەختی خەلیفایەتی ی عەباسییەوە راسپارد:

«تا دەتوانی تەنگ بە کوردولور هەڵچنە، هەر کردەوەیەکیان بە مەبەستی ڕێ لێ گرتنمان و دواخستنی یارمەتیمان لە تێپەرگەی بەرزاییەکانیان دا بهارەو تۆڵەیان لێ بکەوە». (11)

بەڵام پاش ئەوەی هۆلاکۆ توانی ئەم چیایانە بگریت دوای گەلێ گیروکێشەو شەڕی خوێنین ڕێگەی گرتنی بەغدا (ساڵی 1258ز)وولاتی شامی بۆ خۆش بوو. هەر بەو جۆرەش کارەساتەکە لە سەردەمی تەیموری لەنگدا لەمەوپاش دووبارە بووەوە.

پاش سەرهەڵدانی دوو هێزی گەورەی نیشتەجێ لەم لاو ئەولای چیایەکانی کوردستان واتا دەوڵەتی سەفەوی لە ڕۆژهەڵات و ئیمپراتۆریی عوسمانی لە ڕۆژاوادا چیایەکان بوونە تەوەرەی سەرەکیی بەربەرەکانێی تاڵی نێوان هەردوو دەوڵەت، هەروەها بوونە مەیدانی شەڕی نێوانیان و جارێکی تر کەوتنەوە نێوان دوو بەرداشی ململانێ و زۆرانبازیی دوو دەوڵەتی گەورەوە.

ئەم ململانێیە بە شێوەیەکی سامدار گرنگیی شوێنی ستراتیجیی ناوبەینی چیایەکانی خستەڕوو. ئەگەرچی هیچێکیشیان نەیتوانی هەموو ئەم چیایانە بخاتە سەر موڵکی خۆی بەڵام جاروبار هەوڵی‌دەدا ستراتیجیەتی (فاقە) بەکاربهێنێ بۆ چنگ گرتن بەسەر ناوچەکەدا یان زوربەی ناوچەکەدا بە گەلێ ڕێگای جۆراوجۆر، وەکو لەرێی پەیمان بەستن و دڵدانەوەی میرنشین یان سەرۆك هۆزو شێخ و مەلا کوردەکانەوە.

دەرئەنجامیش وا گەڕا کە هەر یەکێك لە دوولایەنەکە جەنگ لە چەند بەشێکی گرنگ وشوێنی ستراتیجیی ئەم چیاپانە گیربکات پاش ئەوەی شەڕوشۆری زۆر زنجیرە چیاکانیان کردە دوو توێژاڵی درێژکۆڵە کە درێژییەکەی لە چیای ئەراراتەوە تا کەنداوی عەرەب نزیکەی 1180 میل دەبێت، ئەنجامی ئەوزنجیرە شەڕە دوورو درێژ و پەك خەرانەش زوربەی جار بە بەستنی پەیمانێك یان مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەك دواییان دەهات لەوانە: پەیمانی زەهاوی ساڵی 1639، پەیمانی هەمەدانی ساڵی 1727، پەیمانی قوستەنتەنییە ساڵی 1736، پەیمانی مغان ساڵی 1746، پەیمانی یەکەمی ئەرزەرۆم ساڵی 1823.

سەبارەت بە گرنگیی ناوچەکە لەلایەن جیۆپۆلیتیکیەوە لەلایەك، دەرکەوتنی تەماعکاریی دەوڵەتانی گەورەو دەست خستنە ناوکاروباری ناوچەکە لەزووێکەوە لەلایەکی ترەوە. بەتایبەتی تەماعکاریی بریتانیا کە گورج تەشەنەی کردو دەستی خستە ناو کاروباری ڕۆژهەڵات، هەروەها رووسیای قەیسەریو ئاواتی ستراتیجییانەی پەلهاویشتن و گەیشتن بە ئاوی گەرموکی باشوور. جا لەو مێژووەوە ئەم دوو هێزە مەزنە کەوتنەخۆ بۆ دانانی قشوون و دەسەڵاتی سیاسییان لەپێناو خزمەتی ئامانجە ستراتیجی‌یە مەودا دوورەکانیان لە ناوچەکەدا، ئەمەش ج بە بەشداربوون لە دابەش کردنی ئەو چیایانەدا یان لە کارکردنە سەر سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی دوو دەوڵەتە بەرەنگار بوەکان. (12)

دابەش بوون و لەتکردنی ئەم چیایانە بە دەوڵەتەوەو کێشانی سنووری سیاسی دابڕکەری نێوان بە ناوبژیکەریی روسیای قەیسەری‌و بریتانیا قایل بوون بەڵکو چارەیەکی هەرای چەکداری بکەن یان هێوری بکەنەوە لەمەشەوە پەیمانی دووەمی ئەرزەرۆم لە ساڵی 1843دا هاتەدێ. (13)

لەبەر ئەوەش کە ئەم چیایانە لە سێ‌ڕیانی سنووری دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێران و ئیمپراتۆرێتی رووسیادا شوێنێکی گرنگی ستراتیجی هەڵکەوتوو دەنوێنن بۆیە لە نەخشەدانانی کاربەدەستانی ئەم دەوڵەتانە لە چوارچیوەی سوپایی و سیاسی‌و بازرگانی‌یەوە جیگەیەکی دیاری وەرگرت. تەنانەت بریتانیای (ئەوسا مەزنیش) هەر بەچاوی جیۆستراتیجی نەخشەکانی خۆی

پوختەدەکرد بەتایبەتی بۆکردنەوەی ڕێیەکی کورت وئاوەدان بۆگەیشتنە هیندستانی گەوهەری تاجی بریتانیا.

ئیتر دەوڵەتانی ئەورووپا بەتایبەتی ئینگلتەرە دوای ئەویش ئەڵمانیاو رووسیا کەوتنە دەست خستنە ناو کاروباری کوردستان بە گەلێ شێوازو رێگە لە بەرایياندا :

1 ـ هەناردەی دیپلۆماسی

2 ـ گەشتوگوزار

3 ـ مەشق و پرچەك کردنی سوپا.

4 ـ موژدەدانی ئایینی

5 ـ لە شوێنەوارو کۆنینە پشکنینەوە

بەهۆی ئەو رێگایانەوە توانرا زانیارییەکی زۆری جوغرافیایی و مرۆڤانەوئابووری‌وسوپایی‌ی ئەم ناوچەیە کۆبکرێتەوە. بۆیە بریتانیا بەتاو خۆی کوتایە ناو ناوچەکە، بەتایبەتی پاش دامەزراندنی (شەریکەی هندی شرقی)و کردنەوەی بارەگاکەی لە ساڵی 1806دا لە بەغدا، لەکاتێکدا ئیمپراتۆریەتی رووسیش لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمینەوە بەتایبەتی دوای شەری رووس و ئێران لە ساڵانی 1804 ـ 1813 و 1826 ـ 1828دا هەروەها لە شەری..

رووس و تورك لەساڵی 1828 ـ 1829دا.[14]

لەبەرئەوە باری جیوپۆلیتیکی ئێستای ئەوچیایانە هێشتاش لە ریبازی سیاسی و نەخشەی کۆمەڵێکی گەورەی دەوڵەتاندا لەوساوە دەورێکی گرنگ ـەگێرێ، بەڵکو لە سەرجەمی ستراتیجیەکانیاندا بە ریبازی سیاسی و پیوەندی دەوڵەتانیشیانەوە تا ئەمرۆش حسابێکی وردی بۆدەکەن.[15]

## پەراوێز و سەرچاوە : ـ

1 ـ بۆ زیادە ئاگاداری بنوارە :

فایفیلد، رسل و واتزل بيرس. ، الجيوبولتيكا، زنجيرەی الالف كتاب،دوو بەرگ، قاهيرە[وەرگێرانی يوسف مجلي]

2 ـ تیلور، حريفت. ، الجغرافية في القرن العشرين، بەرگی دووەم، قاهيرە، 1975، ل 458، [وەرگێرانی د. محمد

3 ـ بو زیادە ئاگاداری بنوارە :

Mahan, A. T. The Influence of Sea Power on History New York, 1890.

4. Mackinder, H., The Geographical Pivot of History, Geographical Journal, Vol. XXIII, No. 4, 1904, P. 23.

5. Spykman, N. J., The Geography of The Peace, New York, 1944, P. 43.

6 ـ الديب، د. محمد محمود، الجغرافية السياسية، القاهرة، 1978، ل 374.

7. Wright, H. E., Late Quaternary Climates and Early Man in The Mountains of Kurdistan, Report of the VI International Congress on Quaternary Warsaw, 1961 (Lodz 1964), P. 124.

8. Roux, Georges., Ancient Iraq, London 1964, PP. 184 - 149 and 341.

9. Stevens, Roger., The Land of The Great Sophy, London. 1971, PP. 14 - 15.

10 ـ حمدان، د. جمال، استراتيجية الاستعمار والتحرر، دار الهلال، قاهيرە، 1968 ل. 26.

11. Curzon, George N., Persia and Persian question, Vol. 2, London, 1892,

12 ـ بۆ فراوانی زانیاری، بنوارە.

خالفين، د. ن. أ. ، الصراع على كردستان، بەغدا، 1969، ل 57 ـ 73. [وەرگێرانی د. احمد عثمان ابوبكر].

13. Edmonds, C. J., The Iraqi - Persian Frontier: 1639 - 1938. Asian Affairs Journal, Vol. 62., June, 1975, P - 147.

14 ـ خالفين، د. ن. أ. ، هەمان سەرچاوە، ل 27، 33، 49.

15 ـ بۆ زیادە ئاگاداری بنوارە :

باڤيچ ، كردستان والمسألة الكردية، چاپی یەکەم، 1978.

# لەگەڵ نۆبەرەی ڕۆژنامەگەری کوردی دا

● د. کوردستانی موکریانی ●

لەیادی تێپەربوونی (87) ساڵ، بەسەر دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیدا، وام بەباش زانی ئەم یادکردنەوەیە هەر لە سەرەتای کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردیەوەی دەست پێبکەم و بابەتەکەم لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆبێت، دەربارەی نۆبەرەی ڕۆژنامەگەریمان، کە ڕۆژنامەی (کوردستان)ە.

## چی دەربارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) نووسراوە

مێژووی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لەلایەن ڕۆژهەڵات ناسان و کوردخۆیەوە بایەخێکی زۆری پێدراوە، لەو ڕۆژهەڵات ناسانە؛ ڤ. ف. مینورسکی لەساڵی (1915)دا، گوردلێفسکی لەساڵی (1917) لازەریێف (1972) باسیان کردووە، لەنێو نووسەرانی عیراقیش دکتۆر شاکرخصباك لە ساڵی 1959دا ڕۆڵی ئەم ڕۆژنامەیەی ڕوون کردۆتەوە[1].

وەنەبێ دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە هەر لەلایەن ڕۆژهەڵات ناسانەوە باس کرابێ‌و باسەکەشی چەند دێریکی گرتبێتەوە بەڵکو ڕۆشنبیرانی کورد پازدە ساڵ لەمەوبەر هەوڵی خۆخ پێدانی زێتریان بەم ڕۆژنامەیە دا، ئەوە بوو لە ڕۆژی (22)ی نەیسانی ساڵی 1968دا لەبرایی‌دا زەنگوگرافی لاپەرەیەکی لێ‌بڵاوکرایەوەو لەگەڵ باسێکی ئەم ڕۆژنامەیە، کە لەلایەن دکتۆر مارف خەزنەدارەوە نووسرابوو چاپ کرا، هەروا پێشنیازکرا کە ڕۆژی (22)ی نەیسانی هەموو ساڵێك بکرێ بە جێژنی ڕۆژنامەگەری کوردی.[2]

عبدالجبار محمد جەباری لە (مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی)دا، کە لە سلێمانی لە ساڵی (1970)دا چاپی‌کردووە لە لاپەرە (55)ی دا بەم جۆرە باسی ڕۆژنامەی (کوردستان) دەکات (وە یەکەم ڕۆژنامەی کوردی ناوی (کوردستان) بووە وە ئەم ڕۆژنامەیە لە سەرەتادا لەلایەن نەوەی (بەدرخان پاشا)و (مقدادبگ) و (مدحت بگ) وە لە قاهیرە دەرئەکرا بە کوردی (زاراوەی کرمانجی شێوەی بۆتان) بە دوو هەفتە جارێك لە چوار لاپەرەدا دەرئەچوو، ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە وتاری کۆمەڵایەتی ومێژوویی‌و ڕامیاری‌و هەڵبەست و دەنگوباس.

لە ئەنجامی بەربەرەکانی‌کردنی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی ڕۆژنامەکە هەمیشە لە شوێنەکەوە گوێزراوەتەوە بۆ شوێنێکی تر...)

گەران بەدوای ئەم ڕۆژنامەیەدا بۆ زانینی ئەو بابەتانەی، کە تێیدا بڵاوکراونەتەوە خولیاو ئارەزووی ڕووناکبیرانی کوردبوو، کە لەئەنجام دا دکتور کەمال فوئاد توانی ئەم ئاواتە بهێنێتە دی بەدەست خستنی زۆربەی ژمارەکانی ڕۆژنامەکەو ڕوونووس کردنی بەچاپ[4]، کە ئەویش لەساڵی 1972دا بوو، دکتۆر کەمال پێشەکی‌یەکی یەك لاپەرەیی بۆ ئەم ڕۆژنامە کۆکراوانەی نووسی کە باسی چۆنیەتی وەدەست خستنی ئەم ژمارانەی ڕۆژنامەکە دەکا، شوێنی‌و ساڵی لەچاپ دانیان لەگەڵ خاوەن و سەر نووسەرەکانی ڕوون دەکاتەوە، هەروا بەچەند دێریك باسی بابەتەکانی نێو ئەم ڕۆژنامەیە گرنگە دەکات و لە سەرەتای پێشەکیەکەی‌دا وا دەنووسێ (تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، کوردی تەنیا زمانی گفت وگۆو شیعربوو نەك نووسین. لەبەر ئەوە دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان) لەساڵی 1898دا بایەخێکی تایبەتی هەیە لە مێژووی زمان و ئەدەبی نەتەوەکەمان دا).

سەرلەنوێ چاپ کردنی ڕۆژنامەی (کوردستان) بۆ هۆی زێتر بایەخ دان نەك هەر بە کاتی دەرچوونی‌و شوێنی لە دایك بوونی بەڵکو بە نێوەڕۆکەکەی ئەوەبوو دکتۆر عزالدین مستەفا ڕەسول لە ساڵی 1973دا بە بۆنەی تێپەربوونی (75) ساڵ دا بەسەر

بڵاوبوونەوەی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیدا لێکۆڵینەوەیەکی بەناوی (حول الصحافة الكردية)[5] چاپ کرد. دکتور عزالدين (17) لاپەرەی بۆ باس کردنی ئەم ڕۆژنامەیە تەرخان کردووە لە پێشەکی باسەکەیدا باسی ووتارە دووردرێژەکەی دکتۆر مارف دەکا ، هەروا ئەو پێشەکییەی، کە لەلایەن دکتور کەمالەوە لە کوردستان دا بڵاوکراوەتەوە وەردەگێرێتە سەر زمانی عەرەبی ، بۆ ئەوەی ئەو بابەتانەی پێشەکییەکە گرتووینەتەوە خۆی دووبارە نەکاتەوە جا دێ خۆی زانیاری نوێ دەخاتە سەر زانیارێکانی پێشوو و دلسۆزانەو بابەتانە و زانستانە دەوری خاوەن و بنەماڵەکەی دەرهێنەری ئەم ڕۆژنامەیە باس دەکا، باسی زمانی چاپ کردن و گەیشتن بە ناوچەی کوردەواریو بەرهەمی هونراوەیی و پەخشانی پۆستەی خوێنەران و بابەتی مێژوویی و سیاسی ڕۆڵی ئەم ڕۆژنامەیە بەسەر خوێنەرانیەوە لەداوایکردن و هان دانیان بۆ خوێندن و فێربوون و کارکردن لەپێناوی نیشتمانیان دا روون دەکاتەوە بەواتا دکتۆر عیزەدین بابەتەکانی ئەم ڕۆژنامەیەی هەموو خوێندۆتەوەو پوختەیو سەرنێوی بابەتەکانی بەخوێنەر داوە.

هەر بەبۆنەی تێپەربوونی (75) ساڵ بەسەربڵاو بوونەوەی ڕۆژنامەی نێوبراودا کاك جەمال خەزنەدار بەرهەمێکی بەنرخی ڕۆژنامەگەری بەنێوی (رابەری ڕۆژنامە گەریی کوردی)[6] بە سێ زمان بەچاپ گەیاند ،دەربارەی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لەلاپەرە 17)دا دەنووسێ (ڕۆژنامەی (کوردستان)، ڕۆژنامەیەکی نیوە مانگی بووە، خاوەن و سەرنووسەری میقداد مەدحەت و عەبدولرەحمان بەگ بەدرخان بوون (31) ژمارەی لێ دەرچووە، ژمارە (1) هەتا (5) لە شاری قاهیرەو لە 6 ـ 19 لەجنێف و لە (20 ـ 23) لەقاهیرەو ژمارە (24) لە لەندەن و ژمارەکانی (25 ـ 29) لە فۆلکستۆن و ژمارە 30و 31 لە جنێف دەرچووە ،ژمارە (31)ی لە (14)ی نیسانی ساڵی 1902ی لەدایك بوون دەرچووە)

دکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد لە بەرهەمە بەنرخەکەیدا (تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردی)[7] دا باسێکی دووردرێژ و زانستانەو بابەتانەی دەربارەی ڕۆژنامەگەری بەگشتیو تێگەیشتنی ڕاستی بەتایبەتی کردووە. دکتۆر کەمال لەم کتێبەیدا بایەخ بەیەکەمین ڕۆژنامەی کوردی دەدات و لاپەرە (59 ـ 72)ی بۆ باسکردنی ئەم ڕۆژنامەیە تەرخان کردووە کە باسی سەر نووسەرو خاوەنی ڕۆژنامەکەو ساڵی دەرچوون و شوێنی چاپ کردن و ئەوانەی پێش خۆی ناوی ئەم ڕۆژنامەیان بردووە دلسۆزانە باس دەکات لەپاڵ ئەوانەش دا چاوی بە بابەتەکانی ئەم گۆڤارە کەوتووە بۆیە ئەویش وەکو دکتۆر عیزەدین ناوو باسی ئەو بابەتانەدەکا کە ڕۆژنامەکە بڵاوی کردوونەتەوە.

بە بۆنەی یادی هەشتاویەك ساڵەی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا کۆڕێك لە تەلەفزیونی پارێزگەی کەرکوکەوە لەشەوی 1979/4/22 پێشکێش کرا، حەمە سەعید حەمەکەریم فەرەج گفت وگۆکەی ئەم کۆڕەی کۆکردۆتەوەو لەنامیلکەیەك دا لە ساڵی 1979 دا چاپ کردووە سەبارەت بە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییەوە لە لاپەرە (16)دا بەم جۆرە یادی دەکاتەوە (بەرێزان لەدایك بوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی ڕووداوێکی گەورەو پر نرخی مێژووی گەلی کوردمانەو ڕۆژنامەی کوردستان و 22 نەیسانی ساڵی 1898 لە قاهیرە بیرەوەرییەکی پیرۆزە بۆ هەموو ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامەو گۆڤارێکی کوردیو وشەی کوردی . . .)

ئەوەی شایەنی باسە دەزگەی ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی هەموو ساڵێك لەسەر لاپەرەکانی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیدا یادی ڕۆژی لەدایك بوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی کردۆتەوە، جا ئەم یادکردنە لەپاڵ نووسیین، لەبواری ڕۆژنامەگەریدا پێشانگەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی سازدا وەیا کۆڕێکی ڕۆشنبیری بەسوودی دەربارەی ڕۆژی ڕۆژنامەگەری ڕێك خستووەو بۆ یەکەمین جار لەژیانی ڕۆژنامەگەریمان دا ئەم دەزگایە پێشانگەیەکی ڕۆژنامەگەری لە 22ی نەیسانی ساڵی 1982دا کردۆتەوەو لە 22ی نەیسانی 1983دا لەسەر لاپەرەکانی ڕۆژنامەی عیراق دا[9] بەبۆنەی ڕۆژی ڕۆژنامەگەرییەوە ووتارێك سەبارەت بەم ڕۆژنامەیە چاپکراوە هەروا بۆ یەکەمین جار وێنەی میقداد مەدحەت بەگ سەرنووسەری ڕۆژنامەکە لە عیراق دا بڵاوکراوەتەوە

بێجگەلەمانە مامۆستا عەلائەدین سوجادی لە مێژووی ئەدەبی کوردی، محمد ئەمین زەکی لە خلاصة تاريخ الكردو كردستان

باسی ساڵی دەرچوونی ئەم رۆژنامەیەیان کردووە.

چۆنیەتی دەرچوونی رۆژنامەکە

لە (22) نەیسانی ئەم ساڵەمان دا (87) ساڵ بەسەر بیرەوەری لەدایك بوونی یەکەمین رۆژنامەی کوردی کە ناوی کوردستان بوو تێ دەپەرێت.

رۆژنامەی (کوردستان)لە ژمارە 1 ـ 5 لەلایەن میقداد مەدحەت بەگ بەدرخان پاشاوە ،ژمارە 6 ـ 31 لەلایەن عبدالرحمن بەگی برایەوە دەرچووە.

یەکەمین ژمارەی رۆژنامەکە لە رۆژی پێنج شەمە (30)ی ذوالقعدة سالی 1315ی کۆچی بەرامبەر بە (9)ی نەیسانی ساڵی 1314 رۆمی رێکەوتی (22)ی نەیسانی ساڵی 1898ی زایینی لە قاهیرە بڵاوکراوەتەوە لەبەرئەوەی خاوەن و سەرنووسەرەکەی ئەم رۆژنامەیە ئاوارەو دەربەدەرو بێ لانەو نەوابووە لەپاڵ ئەوانەش دا لەلایەن فەرمان ڕەوایانی عوسمانی یەوە بەرهەلستی کراوە دەبینین هەرچەند ژمارەیەکی لەووڵاتیك و لە چاپخانەیەك دا چاپ کراوە.

هۆی گواستنەوەی چاپ کردنی ئەم رۆژنامەیە لە قاهیرەی میسرەوە بۆ ئەورووپا بۆتە هۆی درەنگ دەرچوونی ئەو ژمارانەی، کە لە چاپخانەکانی ئەورووپادا چاپ دەکران، ئەو پێنج ژمارانەی لە سەرەتادا لەقاهیرە چاپ کراون هەردوو هەفتەی جارێك بەرێك وپێك دەرچوون، بەڵام ئەوانەی لە ئەورووپا دەردەچوون نێزیکی دوو مانگێك وەیا مانگ و نیوێکی پێ دەچوو.

هۆی هەرە گرنگی گۆرینی شوێنی چاپ کردن بۆ ئەو ئازارو بەرهەڵست کردن و بەدرەفتاری فەرمان رەوایانی عوسمانی دەگەرێتەوە، کە بەرامبەر بەسەرنووسەری رۆژنامەکە وخوێنەرانی رۆژنامەکە نواندوویانە، لەبەر ئەم هۆیانە سەرنووسەرو خاوەنی رۆژنامەکە میقداد مەدحەت بەگ دوو نامەی ئاوەلەی ئاراستەی سولتان عەبدولحەمید کردووە بۆئەوەی لێپرسراوانی دەست لەم هەڵویستە ناراستەیان هەڵگرن، سکاڵانامەکان بەزمانی تورکی چاپ کراون وا من لێرەدا پوختەی هەردوونامەکان بەکوردی دەنووسمەوە:

(رۆژنامەکەم لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە قەدەغەی بڵاوکردنەوەی بۆ دەرچووە، بۆیەش ئەم سکاڵانامەیە دەنووسم لەبەر ئەوتەنگ و چەڵەمەو ئەو بارە ئاژاوەیی یە کە بەرەنگارم بوون وا بەئاوەڵەییش پێشکەشتانی دەکەم هەتاوەکو بگاتە بەر گوێی جەنابی هەمایونتان ،چونکە ئەو شتانەی، کە من بۆ ئێوەی بەرێزی دەنووسم هێندیك لە دەسەلات دارانی ئاژاوەچی لەبەر سەرگرتنی پیلانەکانی خۆیان ناهێڵن بگاتە دەستتان.

کورد نەتەوەیەکە لەو نەتەوانەی راژەو خزمەتی عوسمانیان کردووە، کەچی ئێوە بە هیچ جۆرێك لاتان لێ نەکردوونەتەوە بۆ ئەوەی باری ناهەمواریان چاك بکەن.

لەژێر دروشمی (کلکم راعي وکلکم مسؤول عن رعيته) وام بە باش زانی ئەم رۆژنامەیەم بە زمانی کوردی بنووسم بۆ ئەوەی میللەتی کورد هانی خوێندن و زانست و هونەر بدەم.

ئەو ئامۆژگاریە بەکەلکانەی، کە لەلایەن بەندەوە بە زمانی کوردی پێشکێش دەکرێ کاریگەرێکی زۆر بە سوودی هەیە بۆ کورد، ئەگەر هاتبا رۆژنامەیەك بەم جۆرە لە کوردستان دا هەبوویا، هەرگیز بیانی نەی‌دەتوانی کێشە لە ناوچەی کوردەواری‌دا پەیدابکاو بەڵکو بەپێچەوانە پێشکەوتنێکی تەواو لە کوردستان پەیدا دەبوو.

پاشام:ـ

لەلایەکی دی‌یەوە ئەم رۆژنامەیە، کە بە کوردی دەردەچێ رێگە خۆش دەکات بۆ زووتر پێشکەوتنی چی‌کرنەکانی دەوڵەت و هەروا رێگە لەو لێپرسراوانە دەگرێ کە زوڵم و ستەم وزۆرداری لەم ناوچەیەدا دەکەن.

جا لەبەر ئەوەی ئەم رۆژنامەیە ئەم سوودانەی هەیە، تکا لە بابول عالی دەکەم ،رێگە بدەن رۆژنامەکە بچێتە ناوچەی کوردەوارێوە ژمارە ـ 4.

دوو هەفتە لەسەر بڵاوکردنەوەی یەکەم سکاڵانامە ئاوەڵەکەی تێپەر دەبێ ،دیسانەوە میقداد مەدحەت بەگ سکاڵانامەکەی دووەمی لە ژمارە پێنجی رۆژنامە بەنرخەکەی‌دا لەچواری حوزەیرانی 1314 رۆمی‌دا بەزمانی تورکی پێشکێش سولتان عەبدولحەمیدی دەکا، ئەمەش هێندیك لە ناوەرۆکەکەیەتی بە زمانی کوردی:ـ

من یەکێکم لەو کوردانەی، کە بەدڵ و بەگیان وەکو هەمە چەشنی میللەتانی دی بەشداری پێکهێنانی دەولەتی عوسمانی

دەکەم.

ئەو جورە زانست و فێربوون و چێکرنانەی ،کە پێویستە بەرامبەر بە کوردستان ئیلتیزامی پێبکرێت و بەپێی دروشمی (كلكم راعي وكلكم مسؤول عن رعيته) هێندێك لەو پێویستیانە کەوتوونەتە سەرشانی من سوپاس بۆ خوا ،کە لایەکی ئەم ئەرکە بە چاپکردنی ئەم رۆژنامەیە دەبینم.

ئەم قەدەغەیەی ،کە لە لایەن بابولعالیەوە بەرامبەر رۆژنامەکەی من بەپێی کتێبی ژمارە چواری رێکەوتی 21/مایسی /1314 دا دەرچووەو رۆژنامەکەمی بەوە لە قەڵەم داوە ،کە گوایە دژی (مەمالیکی مەحروسەیە) و لە هەموو وولایەتێکی ئەم دەولەتە قەدەغە بکرێت تکای لابردنی دەکەم.

× × ×

من لەکاتی خۆیدا بەواتا لە 9/ نەیسانی 1314 رۆمیدا بەرێگەی فایق بەگەوە یەکەمین ژمارەی رۆژنامەکەم بۆ ناردن داوای ئیسترحامم لەگەڵ کردبوو، کەچی لە لایەن ئێوەوە هیچ بایەخێك بە بەندە نەدرا.

من لەلایەن چەند کەسێکەوە بیستم، کەوا هێندێك بەڵێن و پەیمان دراوە بۆ جێبەجێکردن و چارەسەرکردنی هێندێك گیروگرفت، کەچی ئەم بەڵێنانە نەهاتنەدی.
من وەکو کوردێك ،کە پێویستە خزمەتی نەتەوەکەی خۆم بکەم و دڵسۆزیم رەفتار دەکەم وهیچ نیەتیو مەبەستی خراپەم نییە، سوێندیش بۆ ئەم گفتەم دەخۆم.

وا ماوەی دوو مانگە بەسەر بلاوبوونەوەی رۆژنامەکەم بەسەرچووە، بەهیچ جورێك لە بیرورا و یاسای سولتان دەرنەچووم ،بەڵکو رۆژنامەکەم لەگەڵ رێبازەکەی رێك دەکەوێ ،بەلام دەبێ رۆژنامەکە ئەو کێشەیە بخاتە روو کە کۆسپێکە لە رێگەی دەرچوونی، هەروا بارو دۆخی کوردیش ئاشکرابکات، کە چۆن ئازار دەدرێن و ئەم رەفتارەی لەگەڵیان دەکرێ هەرگیز لەگەڵ دادپەروەریتی و دڵسۆزیتی و چاکێتی شاهانەی جەنابتان ناگونجێت و رێك ناکەوێت، بۆیە داوای ئیسترحام دەکەم) ، (ژمارە - 5)

سەرنووسەر دەربارەی ئەم سکالانامەی دوایی چەند دێرێکی بۆ خوێنەری کورد نوسیوە، کە تێیدا دەلێت:-

(ئەم نووسراوەی ژووروو دیسانەوە بۆ سولتان عەبدولحەمید خانە. هیڤی دەکەم، کەوا رێگە بدا بە ئاشکرایی رۆژنامەکەم بنێرمە کوردستانێ. ئەرمەن و رۆم ئەوەندەی نیوەی کورد نابن ،بۆ ئەوان بە زمانی خویان رۆژنامەیان هەیەو کوردیش هیچی نییەو لەباری جیهان بێخەبەرە ئەی زانایانی کورد، میرو ئاغایان ئێوەش رێك بکەون وتەلەگرافەك بۆ پاشا بەرێبکەن و تێیدا هیڤی رێگەدانی ئەم رۆژنامەیە بکەن بۆ ئەوەی بۆتانی بنێرم، تاوەکو ئێوەش بزانن لەم جیهانەدا چ دەبێ و چ نابێ لەم دوو سکالانامەیەدا رادەی رۆشنبیریو باوەر بەخۆیی میقداد مەدحەت بەگمان بۆروون دەبێتەوە ،کە چۆن بابەتانەو زیرەکانە ویستوویەتی بیری خۆی ،ووشەی پیرۆزی کوردی بگەیەنێتە گەلی خۆی ،ئەم دوو نامەیە لایەنێکی پر لە ئازاری چۆنیەتی دەرکردنی ئەم رۆژنامە روون دەکاتەو ئەو کێشە ناهەموارانە پێشان دەدات کەوا روو بەرووی بوون، بەلام ئایا ئەم دوو نامەیە هیچ دەورێکی هەبوو؟ ئایا قەدەغەکردنی لەسەر هەڵگیرا؟ نەخێرو بەڵکو نەك هەر ئەوەندەش چونکە خوێنەری کورد هەوارگەکەی بێهاوار مایەوە لانەی رۆژنامەکە لە قاهیرەی میسرەوە بۆ ئەوروپا گوازرایەوە جا لەوێوە عەبدولرەحمانی برای نامەی ئاوەڵەی دی بۆ سولتان عەبدولحەمید ناردووە، کە شێوازی دەربرینی، ووشەکانی، داخوازێکانی، جۆری دارشتنی جیاوازێکی زۆری لەگەڵ ئەم دوونامانەدا هەن دەبا هەردوولا بەهۆی ئەو ووتارە بەنرخەی عەبدولرەحمان بەگ کە لە لاپەرە دووو سێی ژمارە شەش دا بلاو کردۆتەوە بزانین، دەبا بزانین کاروانی رۆژنامەکە بەرەوکوێ گەیشتووەو لە کامە وێستگە پشووی داوەو لەکوێوە زەنگی سەرقافلەچی دێ.

نێوبراو دەڵێ (ئەم رۆژنامەیە هەتا میقداد بەگی برام دەریدەکرد، بەلام لەبەرئەوەی خنکار نەیهێشت برام لە میسر بژیت، ناچار گەرایەوە ئیستانبول لەویش نەیتوانی رۆژنامەکەی بلاوبکاتەوە، چونکە ئەوانەی لە دەوروبەری خنکارن هەموویان خاینن و بێئەسلن نەیارو ناحەزی جوانمەردانن بەتایبەتی یەکێك لەوان ناوی (ابو الهدایە)یە ،کە ئەسل و خانەوادەی نزمە، چونکە ئەو لە هەمووان بێئەسلترەو لەهەمووان زێتر دژی خانەوادەی ئێمەیەوە ئەو نەیاری هەموو کوردێکە بەراستی ئەو

(ابــوالهــدايــه) نييــه ئه‌و (ابـو الضـلالـه‌و فسق و حه‌ديـده. جا له‌به‌رئه‌وه‌ی ناهێڵن خانه‌واده‌كه‌مان رۆژنامه‌كه‌ له‌لای وان ده‌ركه‌ن بۆيه‌ ،كه‌ من كوری به‌درخان به‌گم له‌ وولاتی خنكار ده‌ركه‌وتم و هاتمــه‌ ديـاری ئاواره‌يی و غه‌ريبی ،بـۆ ئه‌وه‌ی لێـره‌دا خزمـه‌تی نيشتيمـــان و ميلله‌تم خۆم بكـه‌م و له‌ خوای كه‌ريم هيڤی‌دارم، كه‌وا كورديش به‌هـۆی ئه‌م رۆژنـامـه‌يـه‌ له‌ خه‌وی‌گـرانی چه‌نـد ساڵيان هۆشيار ببنه‌وه‌. . . .)

ئه‌مـه‌ بوون ئه‌و كوسپ و ته‌گـه‌ره‌و ته‌نـگه‌ وچه‌ڵه‌مه‌و كێشانه‌ی روو به‌ رووی سه‌رنـووسـه‌رانی رۆژنـامه‌كه‌ بوون. ئه‌گه‌رچی ئه‌و رێگه‌ی كاروانه‌كه‌يان پێيدا ده‌رۆيشت له‌ شه‌وی يه‌ڵدا درێژترو تاريكتــربــوو، به‌ڵام سه‌رنـووسـه‌ران له‌بـه‌ر باوه‌ر به‌خـۆيـيـان له‌ ئاسمـــانی ژيـــانی رۆژنــامـــه‌گـه‌ريـان دا نه‌يـان ده‌ويست هه‌ر تاريكێكه‌ی شه‌و ببينن، به‌ڵكو زێتر هه‌ستيان به‌تريفه‌ی مانگ و دره‌وشانه‌وه‌ی ئه‌ستێره‌كانی ده‌كردو له‌به‌ر رۆشنايی ستێرانی شه‌ودا رۆژنــامـه‌ تاقـانـه‌كـه‌يـان ده‌رده‌چـوانـد بۆ ئه‌وه‌ی خۆشی‌يـه‌ك و رووناكی‌يه‌ك بخه‌نه‌ نێودڵی تاريكی خوێنه‌رانيانه‌وه‌.

ده‌نگ دانه‌وه‌ی بڵاوبوونه‌وه‌ی يه‌كه‌مين رۆژنامه‌ی كوردی

له‌دايــك بوونی يه‌كــه‌مين رۆژنـــامـــه‌ی كوردی له‌ ده‌ره‌وه‌ی ده‌وڵـه‌تی عوسمـانی‌دا به‌ خه‌بـاتێكی شۆرشگێـرانـه‌ ده‌ژمێردرێت ،وه‌نــه‌بێت هه‌ر كورد هۆی ده‌ربـرينی بيـروڕای خۆی‌و ناره‌زايی خۆی له‌ ده‌ره‌وه‌ی سنـووری ده‌وڵـه‌تی عوسمـانی‌دا بڵاوكردبێته‌وه‌ به‌ڵكـو هه‌مـوو ئه‌و گه‌لانـه‌ی كه‌وتبـوونـه‌ ژێـر چه‌پۆكی زۆرداری بابـولعـالی به‌هـۆی‌رۆژنـامه‌كانيانه‌وه‌ خوێنه‌رانيان ئۆخه‌ی ده‌كرد، چونكـه‌ رۆژنـامـه‌كـان له‌بـرێتی چه‌وساوه‌كان ده‌نگی راسته‌قينه‌ی وانی‌يان هه‌ڵ ده‌بری‌و به‌م جۆره‌ توانيان كۆمه‌ڵێكی زۆر له‌خۆيان كۆبكـه‌نــه‌وه‌ له‌ هه‌مـان كات دا كاريـان كرده‌ سه‌ر نووسـه‌رانی رۆژنـامـه‌ گۆڤـاره‌كـانی نێـو ده‌وڵـه‌تی عوسمـانی كه‌وا ئه‌وانيش ده‌نگی دلێـری خۆيـان به‌رزكـه‌نه‌وه‌و كه‌م و كوری فه‌رمانڕه‌وايانی ئيستـامبـول بخـه‌نـه‌روو ،ئـه‌مه‌ بۆهۆی ئه‌وه‌ی كه‌وا برياری نوێ ده‌ربـاره‌ی رۆژنـامـه‌گـه‌ری ده‌ربچێت ئه‌گه‌رچی يه‌كه‌مين ياسای عوسمـانی بۆ رێكخستنی كاروبـاری رۆژنـامـه‌گه‌ری له‌ (19)ی كانــوونـــی يه‌كــه‌مـــی ساڵ 1863دا به‌واتـــا شه‌ش ساڵ پێش له‌دايك بوونی يه‌كه‌مين رۆژنامه‌ی عيراقی (الزوراء)و (35) ساڵ به‌ر له‌هـاتنـه‌ دنيـاوه‌ی رۆژنامه‌ی كوردستان ده‌رچووه‌. به‌ڵام ئه‌م هه‌ڵوێستانه‌ی له‌مه‌وبه‌ر باسم كردن وای له‌ بابولعالی كرد كه‌وا له‌ ‹وای ساڵـی 1908 په‌يـتـــا په‌يتـــا له‌نێـــوان هه‌ر ساڵێــك و دوو ساڵێك دا پێنج ياسای تايبه‌ت به‌رۆژنامه‌نووسی‌يه‌وه‌ ده‌ربچوێنێت بۆئه‌وه‌ی ئه‌و رۆژنامانه‌ی سه‌ر به‌ياسای عوسمانين پێره‌وی بكه‌ن، وا هێنديك له‌و بريارانه‌ ده‌خه‌مه‌ به‌رچاو:ـ

1 ـ به‌ر له‌ هه‌موو شتێك ده‌بی باره‌وه‌خ و ته‌ندروستی خاوه‌ن شكۆی مه‌زن به‌گـه‌ل رابگـه‌يـه‌نـدرێت، جا باسی به‌روبـوومی كشت وكاڵ و پێشكه‌وتنی بازرگانی‌و پيشه‌سازی وولات بكرێ.

2 ـ هه‌ر بابه‌تێكی ره‌زامه‌ندی وه‌زيری زانياری له‌سه‌ر نه‌بێ قه‌ده‌غه‌ی بڵاوكردنه‌وه‌ی له‌سه‌ره‌.

3 ـ بڵاوكردنه‌وه‌ی ووتاری دووردرێژ قه‌ده‌غه‌يه‌، جا بابه‌تی ووتاره‌كه‌ وێژه‌يی ،هونه‌ری وه‌يا هه‌رچی‌بێ، چونكه‌ رۆژنامه‌ وه‌يا گۆڤـار ناتـوانێ به‌يـه‌ك جار بڵاوی بكـاته‌وه‌و هه‌رگيز نابێ ووشه‌ی (ماويه‌تی)يش وه‌يا هه‌ر ووشه‌يه‌كی دی، كه‌ ئه‌و مانايه‌ ببه‌خشێت له‌ كۆتايی ووتاردا بنووسرێت.

4 ـ نابێ بۆشـــايی وه‌يـــا چه‌نـــد خاڵێـــك له‌ ووتـاردا به‌جێ بهێڵدرێت، چونكه‌ ده‌بێته‌ هۆی جيڤانۆك و قسه‌و قسه‌ڵۆك.

5 ـ نابێ به‌هيـــچ جۆرێـك لۆمـه‌و تانـه‌ی ئه‌و لێ‌پـرسـراوانـه‌ بكرێن، كه‌ والين و به‌دزی‌و به‌رتيل خواردن و كوشتن تاوان بارن به‌ڵكـو پێتڤيـه‌ باسيـان نه‌كـرێ ئه‌مـه‌ش له‌بـه‌ر نه‌توانين بۆ زانينی راستی‌و دروستی ئه‌م تاوانانه‌.

6 ـ نابێ له‌نێو رۆژنامه‌كان دا ووشه‌ی (ئه‌رمه‌نستان)و ووشه‌ی دی جوگرافی‌و مێژوويی بێت.

7 ـ نابێ ئه‌و گه‌لـه‌ راست و ده‌ست پاكـه‌مان هيچ ده‌نگ و باسێك ده‌ربـاره‌ی ئه‌و رووداوانـه‌ی بۆلـه‌نێـوبـردنی پاشـايان له‌ وولاتانی بيانی‌دا، ده‌كرێن بزانن بۆيه‌ بڵاوكردنه‌وه‌يان قه‌ده‌غه‌يه‌.

هۆی ده‌رچـــوونی ئه‌م بريـــاره‌ سه‌يـــرانـه‌، كه‌ له‌م خاڵانـه‌ی پێشـــوودا باسكـــران بۆ ترسی رژێمی ناڵـه‌بـاری عوسمـانی له‌ ووشـه‌ی نيشتمـان په‌روه‌رانی ده‌گـه‌رێته‌وه‌، كه‌ نووسه‌ره‌كانيان له‌ عه‌ره‌ب و ئه‌رمـــه‌ن و كوردو لاوی توركی دژ فه‌رمـــان ره‌وايـــانی عوسمـانی له‌نێـو رۆژنـامـه‌كـانيان دا ده‌ريان بريوه‌. هه‌روا بۆ ئه‌و هانـدانـه‌ ده‌گـه‌رێتـه‌وه‌ ،كـه‌ خوێنه‌رانی دانيشتووی نێو سنووری

عوسمانیان بۆ زێتر پێشکەوتن و دەرچوونی ئەم جۆرە رۆژنامەو گۆڤارانە دەیان داو لە ئەنجام دا ئەم چاپەمەنیانە کاریکی زۆریان کردە سەر جۆری بیر کردنەوەو تێروانینی گەلانی زۆرلێکراو.

فەرمانداری‌یەك تا ئەم پلەیە لە رۆژنامەگەری بترسێت چۆن دێڵێ ووشەی راستەقینەی کوردی ،عەرەبی‌و ئەرمەنی لەنێو گەلانی ژێردەستی‌دا بلاوبێتەوە.

بلاوبوونەوەی یەکەمین رۆژنامەی کوردی لەنێو کورددا ئەستێرەیەکی درووسکەدارو درەوشەداری کاریگەربوو ،کە خوێندەوارێکی زۆری بەرەو تیشکی خۆی لەنێو تاری شەودا کۆکردەوەو لەبەر ئەوەی خاوەن و سەر نووسەرانی ئەم رۆژنامەیە دەیان زانی کورد تینووی ووشەی پیرۆزی کوردیە بۆیە لەگەڵ دەرچوونی هەر ژمارەیەك دا دوو هەزار دانەیان بە دیاری‌و بێ‌پارە دەنارده کوردستان و ئەم ووتەیەش بەم جۆرە لەسەر رووپەری یەکەمین رۆژنامەکە دەنووسرا (هر جار دوهزار جریدەیا بی پره ازێ ریکم کردستانێ ده بدن خلکی ،پازده روژا جارکی تیت نفیساندن).

خوێنەرێك لە شامەوە ،کە ناوی راستەقینەی خۆی نەنوسیوە تەنیا دوو پیتی (ن.ح.)ی نوسیوە کاتێ رۆژنامەی کوردستانی بەدەست کەوتووە بەم ووشە ئاگرینانە لە لاپەرە (3)ی ژمارە (3) رۆژنامەکەدا هەستی خۆشی‌و شادی خۆی بەبوونەی لەدایك بوونی کوردستان دەردەبرێ:ـ

(اڤ جریدەیا میر مە دریخستن هات شامێ، من یك پیداکر، چقا کردی نیریك هنن من جڤاندن وکی اڤ جریده دیتن ناڤی وی کردستانە خوی وی میر مەیە حەمیا عۆلی ماچ کرن دانین سر سرخوە گلك شابین، پاشی من ژ وانرە خوندو قا دلێ وان خوش بو حچکوته دنی دایە وان اڤ نصیحت وخبرین تە نفیسین قنج کتن گە وان زانین اڤ تشتك قنجە لناڤ خوەرە خبر دان...)

هەر لە هەمان ژمارەدا لاوی شیخ أ. فتاح بەم پارچە هۆنراوەیە پێشوازی دەرچوونی رۆژنامەکەی کردووە:

پیروز ژ تە رە هزار جارا
اڤ دنگە نهو لناڤ یارا
مزگینیا ڤی جریدەیا قنج
شاباش دبتن چڤاهیت گنج
اڤ شفل مظن تە کریە بدعت
جارا عوَلی تە کریە همت
اڤ رهبرا قنج تە دانی بنیاد
کرمانج حمی تە کرنە ارشاد
روحانیا باب و کال و اجداد
بی‌ڤی هنری تە کر نهو شاد

لە ژمارە هەشتی رۆژنامەی (کوردستان)دا (علی عبدالحسین الآمدی) نامەیەکی بەعەرەبی بۆ رۆژنامەکە ناردووەو بەناوی زانایانی ئینداری کورد دەڵێ:ـ

(حضرت مدیر جریده الکردستان

لقد طلعت علی جریدتکم الغراء المسماة (کردستان) التي بذلتم قصاری جهدکم في انشائها باللغة الکردية في محروسة الجنـوره وتصفحت صحائفها فاذا هي موشحة بالمواعظ الشديدة و المقالات المفيدة حثا للامم الکردية علی العلوم والمعارف وايقاظاً لهم من سنة الغفلة والعطالة وتنويراً لافکارهم التي تتوقف الفطنه والذکاء وتنشيطاً للهمم التي ذلت لها الصعاب وحصلت لها الرقاب ولعمري انها لمأثرة تذکر وتشکر اذ لايخفی ان الامم الکردية وقد يتجاوز عدد نفوسها الملايين هی موصوفة بالنجدة والشجاعة والفطنة والبراعة ...)

وەنەبێ ئارەزووی خوێندنەوەو وەدەست خستنی رۆژنامەی نێوبراو خواست و ئارەزووی ئێمە بوویێ بەس، بەڵکو بیانیش هەوڵی پەیداکردن و خوێندنەوەی ئەم رۆژنامەیەی داوە ئەمەش لەم سەرنجەدا دیارە، کە لە لاپەرە چواری ژمارە (13)ی رۆژنامەکەدا بلاوکراوەتەوە:

(گلی علمایین کردا هنکی من اڤ جریدا کردستانێ نشرکری گلك مرۆڤن اجنبی زالمان ز نمجه و ز انکليزا جريدا من اشترادکن دخونن علی الخصوصی یك المان هیە ناڤێ وی موسیو (مارتن هارتمان)ە اکثر لسانن شرقی دزانە حتی لسانی کردازی تعلم دکە. از امید دکم اڤ غیرتا اجنبیا کرداره موجب انتباه بت.)

## هونەری رۆژنامەگەری لە رۆژنامەکەدا

هونەری رۆژنامەگەری جۆرە بیرکردنەوەو تێروانینێکی تایبەتیە بۆ ژیان، رۆژنامەگەر هەمیشە چاوی لە جەماوەرانە، چونکە بۆ ئەوان دەنووسێ و ئەوان بریار لەسەر ئەو بابەتانەی دەدەن ، کە رۆژنامەنووس دەینووسێ، هونەری رۆژنامەگەری هەوڵ دەدات رووداوو زانیاری و رۆشنبیری و هەتا فەلسەفەو زانست بە ئیسلوبێکی روون و رەوان پێشکێش خوێنەری بکات.

هەنەری رۆژنامەگەری دەربرینێکی بابەتانەی دوور لەو کەسیەتیەیە، کە لەخودی رۆژنامەنووس دا هەیە و بەڵکو بە بەرژەوەندی کۆمەڵێکەوە پەیوەستە ودەچێتە نێو دەروونی مرۆڤایەتیەوە لە نهێنیەکانی قوول دەبێتەوە جا لایەنی چاکەو خراپەی دەخاتە روو.

چاپخانە لە ناوەراستی سەدەی پازدەم دا داهێنرا بەڵام رۆژنامەگەری لە دوای تێپەربوونی دوو سەدە بەسەر ئەم داهێنانەدا سەری هەڵداو هونەری رۆژنامەگەریش کە بە جەماوەرانەوە پێوەندەو کاریگەرێکی تەواوی هەیە بەسەریانەوە لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەم دا پەیدابوو، بۆیە پێویست بوو شێوەیەکی هونەری تازە وپەرەسەندنی زمانەکەی و رازاندنەوەی بەوێنەو ناونیشان و رەنگ و وێنەو کاریکاتۆر هەبێ ، ئەگەر ئەدەب هونەری راستی بێ ئەوە رۆژنامەگەری هونەری واقیعە.

دەرهێنانی رۆژنامە بۆتە هونەرێك بنکەو دەستوری تایبەتی هەیەو لەسەر چەند بناخەیەکی زانستانە بەندەو دەرهێنانیشی ئەم چوار مەبەستانەی هەیە:ـ

1 ـ بابەتی رۆژنامەنووسی دەبێ بەشێوەیەکی وا ئاسان نوسرابێ، کەوا لەماوەیەکی کورت دا بخوێندرێتەوە.

2 ـ چاپ کردنی دەنگ وباس و زانیاری بەپێی گرنگی چونکە خوێنەر ئارەزووی بایەخ دان بە بابەتی گرنگ دەدات چ لەرووی شوێنی بڵاوکردنەوەو چ لە رووی تیپۆگرافیوەی بێت.

3 ـ هەوڵ بدرێت لاپەرەکانی رۆژنامەکە بەشێوەیەکی سەرنج راکێشانە، کە چاوماندوونەکاو شێوەکەشی بەبابەت و رەنگی جۆراوجۆر بێت

4 ـ پێوەندی خۆشەویستی و هۆگری لە یەکترناسینی خوێنەرو رۆژنامەدا هەبێ.

ئایا دەبێ رۆژنامەکەی ئێمە لە هونەری دەرهێنان دا چۆن بووبێ ؟ ئەم جۆرە هونەری دەرهێنانە لە بەشی دووەمی سەدەکەی ئێمەدا بۆتە زانستێکی هونەری و لەسەر لاپەرە رۆژنامەو گۆڤارەکان دا پێرەوی دەکرێ ، ئەو سەردەمەی ، کە رۆژنامەی کوردستان دەردەچوو تاکە کەسێك دەری دەچواند، بگرە هەتا ئەم ساڵانەی دواییش دا رۆژنامەو گۆڤاری تاکە کەسیمان هەبوو.

رۆژنامەی (کوردستان) لەرووی دەرچوونەوە پێرەوی ئەو دەرهێنانەی کردووە، کە ئەوسا باویبووە. لاپەرەی ئەو ژمارانەی دەست کەوتوون بۆ هەر ژمارەیەی چوار لاپەرە تەرخان کراوە، بەشی سەرەوەی هەر ژمارەیەکی دا بەگەورەیی ناوی رۆژنامەکەو لەلای راستیەوە ناونیشانی رۆژنامەکەو لەژێر ئەودا نووسیویەتی لەهەر ژمارەیەی دووهەزاری بەبێ پارە بۆ کوردستان دەنێرم لەلای چەپی ناوی رۆژنامەکەدا ئەم زانیاریانە وەرگێراونەتە سەر زمانی تورکی لەگەڵ نووسینی نرخی رۆژنامەکە، کە ئەمەیان لە بەشە کوردیەکەی نییە، هەر لەسەرەوە لەژێرناوەکەی بە کوردی نووسراوە (پازدە روژا جارکی تیت نفیساندن، جریدەیا کردییە)و لەژێر ئەم دێرەدا هەر ئەم زانیاریەو هێندێك زانیاری دی کە دەربارەی ناوەرۆکەکەیەتی بە زمانی تورکی نووسراون.

لە یەکەمین لاپەرەی هەر ژمارەیەکی دا سەر ووتار هەبووە. ئەو سەر ووتارانەی کە برێتی بوون لەو نامانەی، کە سەرنووسەران بۆ سولتان عەبدولحەمیدیان ناردووە بەزمانی تورکی نووسراون و زۆر جاریش هەوڵیان داوە بەچەند دێرێك بە زمانی کوردی کرۆکی نامەکانیان بنووسن ، بەڵام سەر ووتارەکانی دی بە زمانی کوردی بوون. بابەتەکانی دی رۆژنامەکە بریتی بوون لە هۆنراوەکانی ئەحمەدی خانی و تاکەو تەراش هۆنراوەی هی ئەوسا بەرچاودەکەوێت لەگەڵ چەند باسێکی مێژوویی و لەدوا ژمارەکان دا ئاگاداری و رووداوی ناوخۆو دەروە بەناوی (حوادث)، کە بەگشتی بە زمانی تورکی نووسرابوون بڵاودەکردەوە. نامەی خوێنەرانیش شوێنێکی دیاری هەیە لەنێو رۆژنامەکان دا . لەنێو ئەو ژمارانەی ، کە لەبەردەستن هیچ وێنەیەك، نەخشەیەك بەرچاوناکەوێت وا بزانم رۆژنامەیەك هەمیشە هەرەشەو گورەشەی لێ کرابێ و هەرچەند ژمارەیەکی لە هەندرانێك دا چاپ کرابێ، توانای دەرهێنانی هەر ئەوەندە دەبێ.

## زمانی کوردی له رۆژنامەی کوردستان دا

رۆژنامەی (کوردستان) بەدیالێکتی کرمانجی ژووروو بەشە دیالێکتی بۆتان نوسراوە، نووسینەکەی رەوان و سادەو بێ گرێ وگۆڵە، کە هەموو خوێنەرێکی نەك هەر سەردەمی خۆی بەڵکو هی ئەمرۆش تێی دەگات. لەنێولیکسیکۆلۆژی ئەم رۆژنامەیەدا ژمارەیەکی زۆر لەووشەی عەرەبی بەکارهاتووە، کە ئێستە لەبەرامبەرەکەی ووشەی کوردی بەکاردێت ،ئەمەش بیگومان بەزۆری لەنێو ئەو ووتارە ئاینی یانەدا بەرچاودەکەوێت ،کە لەسەر لاپەرەکانی دا بڵاوکراوەتەوە و مەبەستیشی لەبڵاوکردنەوەی ئەم پەندە دینی یانە بۆ هاندانی خوێنەرانی بوو بۆ خوێندن و کارکردن و هونەر.

لەو ووشانەی، کە بەزۆری بەرچاومان دەکەون و دووپات دەبنەوە ئەمانەن: (معرفت، صنعت، سبب، حفظ، علم، عالم، بعلمن، وفات ،جریدە، شجاعة، سخاوت، ثمره، عابد، فضل، محیط، میلاد، فکر، مدح، حریة تصریح، تصدیق، حدود. . أمل، اول، مؤتمر، اجتماع. . .

ئەو پیتانەی لە چاپ کردن دا بەکارهاتوون هەر ئەلف و بێی عەرەبین لەگەل دەسکارێکی کەم بەدی دەکرێن بۆوێنە لە هێندێك شوێن دا بۆ دەنگی ژێ پیتی ژێی ئەمرۆ بەرچاودەکەوێت، ئەگەرچی زۆر جار نەك هەر لە هەمان لاپەرەدا ،بەڵکو لە هەمان رستەش دا بەکارهاتن و نەهاتنی ژێ بەدی دەکرێت، وەك ئەم رستە سادە فرەیە؛

من بری چند روژکی کاغدك ز خلقی دیاربکری ستاندە

ژمارە 13، لاپەرە 3

هەروا بۆ دەنگی (ڤ)یش هەر ئەو (ڤێ)یە بەکارهاتووە، کە ئەمرۆ بەکاری‌دێنین، بەلام ئەم پیتەش زۆرجار هەر بە (ف)ی چاپ کراوە، وەك لە ووشەی:

اف، افە، درکفن، ژمارە ـ 11، لاپەرە ـ 2 بەرچاو دەکەوێ بۆ دەنگی (گ) هەر ئەو نیشانەیە بەرچاودەکەوێ ،کە ئێستە بەکاری‌دێنین، بەلام ئەم پیتەش فرەجار هەر بە (ك)ی نوسراوە ،وەك؛

کلك، ژمارە 16، 26، 27، لاپەرە 3، 4، 1 کل ،ژمارە 16، 27، 3، 1

ئەوەی زۆر سەرنج راکێشە هێندێك ووشەی وەك زارۆ، زانین، مەزن (ز)بە (ظ) نووسراوە، ؛بەم شێوەیە ظارو ،دظانن، مظن بینە، ژمارە 1، 2، 2، 2، بەلام لەژمارە پازدەدا زارۆ هەر بە (زێ) نووسراوە نەك بە (ظ)ێ. دوورنییە نووسینی (ز)ێ لەم چەند ووشانەدا بە (ظ)ی خوشکی (ط)ی لەبەر ئەوەبێ ،کەوا لە کاتی گۆکردن دا هێندێك لە (زێنی) ئاسایی گرانتر بێتە سەر زار.

هەروا هیچ جیاوازی‌یەك بۆ (و)ێ کراوەو نەکراوەو بزوێن و نیمچە بزوێن دانەندراوە ،هەمووی هەر بەیەك جۆرە(و)ی لەچاپ دراوە، بەشی (ل(پێ سووك و (ل)ی گران و (ێ)ی کراوەو (ی)نەکراوە هەروەکو (وێ)یە لەپاڵ ئەوانەش دا هیچ بیرێك بۆ دانانی سەروبۆرو ژێرنەکراوە، ئەم کەم و کورتی‌یانە وا لە خوێنەری ئەمرۆ دەکا ،کەوا لە کاتی خوێندنەوەدا بییر لەو هەموو نەبوونانە بکاتەوە، جا لە ناوەرۆکەکەی بگات و لێکی بداتەوە.

نووسەرانی رۆژنامەکە بۆ زێتر راکێشانی خەلك بۆ نێو مەیدانی کارکردن و هونەرو خوێندن هەمیشە ووتارەکانیان بەچەند وێنەیەك لە قورئانی پیرۆز ویا فەرمایشتە بەنرخەکانی پەیامبەر بەندکردووەو رازاندۆتەوە ،چونکە زانیویانە باری ئاینی ئەوسا ئەم جۆرە دارشتنانەی پێویستە بۆ وێنە لەسەرووی ووتاریکی سەرەکی رۆژنامەکە (بسم الله الرحمن الرحیم) نووسراوە ،لەو فەرمایشتە بەنرخانەی بە پالپشتی خۆیان داناوە هێندێکیان ئەمانەن:

العلماء ورثة الانبیاء ،ژمارە ـ 1، لاپەرە ـ 1

الکاسب حبیب الله ، = ، 1، = ـ 2

جاهدوا في سبیل الله، = ـ 1، = ـ 2 (قورئانی‌پیرۆز)

حب الوطن من الایمان، = ـ 2، = ـ 1

اطلبوا لعلم من المهد الی اللحد، = ـ 2، = ـ 1

اسع لدنیاك كأنك تعیش أبداً واسع لاخرتك

كأانك تموت غداً = ـ 2، ـ 2

اطلبوا العلم ولو بالصین = ـ 2، ـ 3

کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعیته، ژمارە ـ3 ،لاپەرە ـ 1

طلب العلم فریضة علیٰ کل مسلم ومسلمة،= ـ 3، = ـ 1

فاسئلو اهل الذکر ان کنتم لاتعلمون، = ـ 5، = ـ 1

لیس للانسان الا ما سعیٰ، = ـ 7، = ـ 2

المؤمنون إخوة، = ـ 7، = ـ 3

هل يستوى الذين يعلمون والذين لايعلمون، = ـ 8، = ـ 1 (قورئانی‌پیرۆز)

ومن لم يحكم بما انزل الله فأولئك هم الفاسقون، = ـ 8، = ـ 2 (=)

علو الهمة من الايمان، = ـ 14، = ـ 1 . . . . هتد

لەنێو لاپەرەکانی رۆژنامەی نێوبراودا هیچ بابەتێکی زمانەوانی بەرچاو ناکەوێت، تەنیا باسی کتێبێك نەبێت کە دەربارەی زمانی کوردی‌یەو لەم باسەی‌دا دەڵێ شیخ یوسف ضیاءالدین پاشا شەش ساڵ لەمەوبەر کتێبیکی داناوە بەناوی (الهدية الحميديه في اللغة الكردية).

کە باسی رێزمانی کرمانجی دەکاو هیڤی دەکا، کەوا زاناو میرو پاشایانی کورد ئەو کتێبە پەیدا بکەن، چونکە کتێبیکی رێك و پێکەو ئەوانیش باوەکو ئەو شتێك دەربارەی زمانەکەیان بنووسن، ژمارە ـ 3، لاپەرە ـ 3

## وێژەی کوردی لە رۆژنامەی (کوردستان)دا

وێـژەی کوردی لە رۆژنـامـەی کوردستـان دا بایـەخێکی زۆری پێدراوە لەچاو بابـەتی زمـانـەوانی کوردی‌دا، بەواتا وێژە بەشی زمـانـەکـەشی بۆ خۆی بردووە. ئەمـەش لە ژمـارەی دووی ئەم رۆژنـامـەیـەدا بەرچاودەکـەوێ ، کـە سەرنـووسـەرو خاوەنەکەی جێگەیەکی دیاری‌کراو بۆ داستانە نێودارەکەی ئەحمەدی خانی ـ مەم و زین تەرخان کردووە، سەرنووسەر دەربارەی ئەم داستانە، ئەمەی خوارەوەی نوسیوە:

(رحمتا خدی لی بە خدی گنەوی بغفرینە سالا هزارو صدو پنجیدة جزیری احمدی خانی کتیبك منظوم نفیس یە ناف ڤی کتیبی کریـە مەم (مم وزین) اڤ کتێب حمی بیت و شعـرن اشکـارە حکـاتـا عشقـا دو جوانـایـە باطن گلك مقصدو حصەو حکمت ژێ تین فهم کرن لوما دڤێ مرۆڤ بدقت بخونتن هر جریدە کیدە ازی ژ وی کتیبی هنی بنڤیسم حتی خلاص ببە. . .)

هەروا دەربـارەی ئەم کتێبـە نووسیـویـەتی ، کـەوا ئەم بەرهـەمـا دووسـەدو دە ساڵ لەمـەوبـەر نووسـراوە وهێنـدێـك شوێن ناخـوێنـدرێتـەوە، ئەگـەر ئەم کتێبـە لای یەکـێـکی دی دەست دەکەوێ ، تکایە بۆمی بنێرێ، تاوەکو ئەوەی خۆمی لەسەر ساخ کەمەوەو دیسانەوە بۆی بنێرمەوە.

سەرنـووسـەری رۆژنـامـەکـە لەسـەرەتای باسەکەی‌دا دەڵێ:
هێنـدیـك لەمیـرو ئاغایانی کورد نامەیان بۆناردم لەنێوی‌دا داوای بڵاوکـردنـەوەی هۆنـراوەی کوردی‌و بابـەتی ئەدەبیاتی دی دەکەن هەروا داوای باس کردنی بارو دۆخی ئەم سەردەمەش دەکەن، بە یارمـەتی خوا لەمـەو دوا هەرجـارەی هێنـدێـك بەیت و هۆنراوەی چیرۆکی باش دەنووسم و بڵاودەکەمەوە.

جا بۆ هێنانە دی خواست و ئارەزووی خوێنەران سەرنووسەر پێشی هەموو شتێك دەستی بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمە بەنرخەکەی ئەحمەدی خانی کردو زۆر جاریش بەچەند دێرێك گرنگی ئەم بەرهەمەو مەبەستی بڵاو کردنەوەی روون دەکردەوە و لە پێشەکی یەکـێـك لەو بڵاو کراوانـەدا دەڵێ من ئەم کتێبـەی مەم وزینم هێنـدێـك جار بۆ زانـایـانی تورك و عەرەب خوێنـدۆتـەوەو وەرم گێراوەتە سەر ئەم دووزمانەو گوتوویانە ئەم بەرهەمە بێ‌هاوتایە.

داستـانـەکـەی مەم وزین لە ژمـارە 2، 3، 4، 6، 7، 8، 9، 11، 15، 20، 22، 3—، 24، 25، 26، 28، 29 و 30دا بڵاوکراوەتەوە لەرۆژنامەکەدا

لە ژمـارەی سێ‌و لاپـەرە سێ رۆژنـامـەی کوردستـان دا پارچـەیـەك هۆنـراوەی حاجی قادری کۆیی بڵاوکـراوەتـەوە کە دەربـارەی مەم و زینی ئەحمـەدی خانی‌یـە، سەرنـووسـەر لە پێشـەکی ئەم هۆنـراوەیـەدا ئەم دەنگە و باسەی دەربارەی حاجی روون کردۆتەوەو دەڵێ

زانایەك هەبوو ساڵی پار کۆچی دوایی‌کرد، رەحمەتی خوای لێ بێ وخوا لە گوناهەکانی خۆش بێت، ناوی ئەم زانایە حاجی عبـدالقـادر بوو، کە لە سەردەمی ژیـانی خۆی‌دا گەلێـك کارو خزمـەتی زانست و زانیـاری‌کـردو هۆنـراوەیـەکی زۆریشی بە کرمـانجی نووسی‌و لەبـەرئـەوەی هەمـوو کورد زمـانی سۆرانیـان نەدەزانی ، نێـوبـراو هۆنـراوەکـانی بەرێی وڵاتی خۆی دەکـرد. حاجـی بە دەسـتـی خۆی لەسـەر بەرگـی دواوەی کتێبـی

مەم وزینی‌دا هێندێك دیرە هۆنراوەی نووسیوە، وا من لەبەر پیرۆزی لەنێو ئەم رۆژنامەیەدا بلاوی دەکەمەوەو ئەگەر هاتوو بەووردی خوێندرایەوە مانای وان باش تێ دەگەین:

زمانە رسم جارانی نماوە
چراغ ناظم و منشی کژاوە
لەدور ایمە رومان و جریدە
اگر چە مقصدە زانین باوە
امان قدری بزانە ئەم کتیبە *
لە دنیا استەکی همتای نماوە
لە ایام حیات شیخ خانی
لەسر نسخە خط او نوسراوە
لەلای ارباب خوی بو قدرو قیمت
خزینە گوهرە کیسە دراوە
لە مجموع دول سوران و بوتان
لە سایە ام کتیبە ناسراوە
لە کردان غیر حاجی وشیخ خانی
اساس نظم کردی داناوە

وەنەبێ لەنێو رۆژنامەکەدا هەر هۆنراوە بلاو بوویێتەوە، بەڵکو پەخشانیش لەپاڵ ئەودا بەرچاودەکەوێ، بەڵام پارچە پەخشانەکان بەشێوەیەکی گشتی بە فەرمایشتێکی پەیامبەر (د.خ.) دەست پێ دەکاو مەبەستیشی هاندانی خەلك بووە بۆ رووکردنە جیهانی خوێندن و زانست و زانیاریو هونەرو کارکردن

بەپێی ئەو بابەتانەی، کە بە پەخشان بلاوکراونەتەوە دەتوانین باسەکان دابەش کەینە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە:

1 - بابەتی ئایینی
2- مێژووی
3 - رامیاری
4 - دەنگە و باسی ناو خۆوگێتی
5 - نامەی خوێنەرانی رۆژنامەکە

وا لەژێرەوە چەند نموونەیەکتان لەم بابەتانە پێشکێش دەکەم: (المؤمنون اخوە).

اف حدیث پغمبر علیە الصلات والسلام امر کریە انکو چقاس مسلمان هنە حمی برانە.

حجی مسلمانە دڤێ کوە بدە امرێ خدێو پیغمبر دا دنیو اخرتی رو سپی بە دڤی اون نیاریا هو دو بردن وك برا خۆ هو دو بکن حمیا ژ دست وە تیت اری حمی مسلمانا بکن حجی ژمە نساغ کت ژاربی ربن بی ام لناف خوەدە دراڤا جلاخوارانی بجڤینن بدن وان هگر أمری اخری پیغمبر ادا نکن امژی یك ویك ژار بین محتاج نیارا بین روژا قیامتی پیغمبر ژی ژمەرە شفاعتی ناکت.

وکی ام بی شفاعت مان امی پوشمان بین لی او پوشمانی تو جا فیدەیی ئادەت..، ژمارە - 7، لاپەرە - 3) پارچەیەکی دی

(از جریدەیین اجنبیادە دخونم کو حکومتا ایتالیایی دڤی طرابلس غربی ژخوەرە بستینە سرڤی خبری اولا مراجعت حکومتا فرانسەیی کر. چونکە فرانسز دڤی طرابلس بستینە لکن چکو ایتالیا زیدەتر مناسبت هیە فرانسز دستی خوەژی کشاند. ایتالیایێ عسکری خوەیی ناپۆلیی ریکر سر ویدەری دو واپوری خوە ریکر. قط تو سؤال ژ حکومتا نکر چونکە عالم حمی زانە کو عبدالحمید ملت و وطنی ملتی محافظە ناکە تومهابتا حکومتا مە لسر اجنبیا نمایە بناء علیە او مسلمانن طرابلس حمی حجکو بیکس و بیصاحبن پاش مدتکی ایتالیا وێدەری بدە برطوب و تفنکا خنکاریمە کلك خلقین جاهل وی خلیفە امام مسلمین ظل اللە في الارض تصور دکن وی وان ربنن طرابلس بن طوبین ایتالیایی بهیلە، ژمارە - 14، لاپەرە - 4)

## مێژووی کورد لە رۆژنامەی کوردستان دا

رۆژنامەی نێوبراو لە ژمارە هەشتێوەی بایەخێکی باشی بە مێژووی کوردی داوەو لاپەرەیەك وەیا نیو لاپەرەکەی لە ژمارە 8، 9، 11، 13، 15ی بۆ مێژووی کۆنتر لەسەردەمی خۆی تەرخان کردووەو لاپەرەکانی ژمارەکانی دوای ئەمانەی بۆ باسکردنی باری ناهەمواری ئەوسای کورد لەژێر سێبەری تاری عوسمانی باس دەکات.

لە لاپەرە سێی ژمارە هەشتت دا، لەو بەشەی، کە بۆ مێژوو داندراوە، سەرنووسەر بەم ووشانە دەست بە ناساندنی

فەرمان ڕەوایانی جەزیرەی ئیبن عومەر بەخوێنەرانی دەکات:

(از زانم کرد ژ تاریخا کردستانی توتشتی نزانن لوما ازی هر جریدا خوەده کورت تاریخا کردستانی اویا اجدادین عزیزان بنڤیسم)

سەرنووسەر وەکو زۆربەی مێژوونووسانی سەردەمی خۆی لە باسکردنی مێژووی کورددا هەر باسی میرەکان دەکاو ئەوانەی لە ژمارەی نێوبراودا ناوی بردوون:

(میـر سلیمـان بن خالـد، میـر عبدالعزیز، امیر سیف الدین امیر عیسیٰ، امیربدرالدین، امیرابدال و امیرعزالدین)ن

و لە ژمارە (9)دا باسی (امیر ابراهیم، امیر شرف ابن امیر بدر الدین و شاه علی بك و بدر بك بن شاه علی‌بك) کردووە.

لە ژمارە (11)دا ناوی میر محمد بن میر محمد، امیرعزیز ابن امیر بك محمدو میر محمد بن میر ابدال)ی بردووە لە ژمارە (13) و(14) نزیکەی سێ لاپەڕە باسی بەدرخان بەگ دەکات.

لە ژمـارە (15)دا باسی (صـلاح الـدین ایـوبی) دەکـات و وێنەیەك لەباسکردنەی پێشکێشی ئێوەی بەرێزی دەکەم (صلاح الــدین ایــوبی کو نامی وی دی یوسف بی سالا پنــج صەد و سەودو دە تکریتێ هات سر دنێ.

بعلبکی‌و شامی لنـك بابی خوە تربیــەبی ووقتـا کو چقـاس فرنـك هنـە حمی بالاتفـاق رابین لسـر مسلمـانا سلطان یوسف صلاح الدین ایوبی نە کلك، هندك قوتا دست خوەدە محضا بهمت و غیـرتـا خوە لەحمیـارە مقابلەو شان و شوفا مسلمانی‌یی محافظەکر، ژمارە ـ 15، لاپەرە ـ 3) ئەمە ئەم باسانەن، کە سەرنـووسـەرانی ڕۆژنـامـەکـە بەمێـژوویان لە قەڵەم داوە ،بەڵام ڕۆژنـامـەکـە خۆی بەبڵاوکردنەوەی دەنگ و باسی ئەو سەردەمەی کە تێیدا بڵاوبۆتەوە بە بەنرخترین و چاکترین سەرچاوەی مێژووی نوێی گەلی کورد دەژمێردرێت. زۆربەی بابەتەکانی ڕۆژنامەکە، لەو نامـانـەی، کە بۆ سولتـان عەبـدولحەمیدی ناردووەو ئەو وێنە دەنگدارانەی، کە بۆ باری نالەباری ناوچەی کوردەواری ئەوسای لە ژمارە (29 و30)ی گۆڤارەکەدا کێشراوە ،لە ڕوون کردنەوەی هەڵویستی مەدحەت پاشاو پشتگیری‌کردنی، کە لە ژمارە 23 و 24دا هاتـوون، هەروا ئەو دەنـگ و باسـانەی دەربارەی سوارەی حەمــیــدی، کە لە ژمــارە 28 و 29 دا بڵاوکــراوانــەتــەوەو ئامـۆژگـاری‌کـردنی کوردان بۆ نەوەستانین و بەکارنەهێنانیان دژی ئەرمەن و ئەو نامەکراوانەی ،کە لە کوردستانەوە بۆی هاتوون. .

ئەم باسـانـە هەمـوویـان بەسـەرچاوەیەکی ڕاستەقینەی مێژوویی دەژمێـردرێن و بەمـەوە ڕۆژنـامـەی کوردستـان بە گەنجینـەیەکی مێژوویی دەولەمەندی مێژووی نوێمان دەژمێردرێت.

## سەرچاوەو پەراوێز


1 ـ بروانە د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ،تێگەیشتنی ڕاستی وشوێنی لە ڕۆژنامەنووسی ،بەغدا، 1978، 59 ـ 62

2 ـ برایەتی، ووتارەکەی دکتۆر مارف خەزانەدار، 22 نەیسانی ، 1968

3 ـ میقداد مەدحەت بەگ کوری بەدرخان پاشا بووە ،نەك نەوەی ،بەڵگەش بۆئەمە ئەو نامەیە ئاوڵەیەیە ،کە عبدالرحمن بەگی برای بۆ سولتــان عەبــدولحــەمیـدی ناردووەو دەڵێ من، کە کوری بەدرخـان پاشــام، وولاتی خنکـارم بەجێ‌هێشت و وا من لە برێتی براکـەم ئەم ڕۆژنامەیە لە وولاتی بیانی دەردەکەم، کەواتە میقداد مەدحەت ناوی یەك کەسەو لێکدراوە، ،ئێستەش لە ناوچەی سلێمانی‌دا ئەم دارشتنە لێکدراوە هەیە، حەمەشوان حەمە سدیق، حەمە سەعید وحەمە لاو

4 ـ د. کەمال فوئاد، کوردستان ،بەغدا، 1972

5 ـ د. عیزەدین مستەفا ڕەسول ،حول الصحافة الکردیة، بغداد ، 1973

6 ـ جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، بەغدا، 1973

7 ـ د. کەمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو.

8 ـ حەمەسەعید حەمە کەریم، یادی ڕۆژنامەگەری،

9 ـ جریدة العراق، العدد 1979 ،2199 فی 1983/4/23

10 ـ فائق بطي، الموسوعة الصحفیة العراقیة، بغداد، 1976

11 ـ د. خلیل صابات، الصحافة، دار المعارف بمصر 1959

12 ـ قیس عبـدالحسین الیـاسـری، الصحـافـة العراقیة والحرکه الوطنیة، 1978

13 ـ ابراهیم امام، دراسات في الفن الصحفي ،القاهرة، 1972

# کورته‌یه‌کی
# هونه‌ری رۆژنامه‌نووسی‌ی
# به‌شی یه‌که‌م

شێرزاد عبدالرحمن




## هه‌واڵی ڕۆژنامه نووسی‌ی

هه‌واڵ، بڕبڕه‌ی پشتی کاری ڕۆژنامه نووسی‌یه، خوێنه‌ر به‌تاسه‌و خولیاوه لاپه‌ڕه‌ی ڕۆژنامه‌کان هه‌ڵ ئه‌داته‌وه بۆ ئاگاداربوون و به‌سه‌رکردنه‌وه‌ی ڕووداوه‌کانی ژیان. گه‌لێك ڕۆژنامه له دنیادا هه‌ن، تایبه‌تن به‌هه‌واڵ، هه‌واڵیش هه‌موو کارێکی کۆمه‌ڵایه‌تی‌و ئابووری‌و رامیاری‌و بزوتنه‌وه‌کانی‌تر ئه‌خاته ئامێز.

مرۆڤ لە دێر زەمانەوە خولیای لێتوژینەوەو بەسەرکردنەوە بووە، تەنانەت ـ هەواڵی شوێنە دوورەکانیان لە کەشتیەوانەکانەوە وەرگرتووەو بابلی‌و ئاشوریەکانیش نووسەری تایبەتی خۆیان هەبووە بۆ تۆمار کردنی هەواڵ و رووداوەکان ـ.

لە سەردەمی ئەمڕۆشمان دا، کە پڕە لە کێشەی جیاجیا، ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵ سپێدەی هەموو بەیانیەك، ڕۆژنامەکان هەگبەی هەواڵی تازە ئەگەیێننە خوێنەران. لەگەڵ پێشکەوتن و باری ژیان بایەخی هەواڵ فرەوانتر بووە بەتایبەتی، دووای زۆر بوونی دام و دەزگای ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەنووسی‌ی لە دنیادا کە بوون بە هۆیەکی دیار لە ئامادەکردنی تازەترین هەواڵ، ئیتر ئەو هەواڵە لەهەر لایەکی ژیان بدوێ، بەلای خوێنەرانەوە گرنگە واتە بەلای ئەو خوێنەرەی کە لەیەکێ لەو چەشنە هەواڵانە ئەگەڕێت، ئەگەر هەواڵ رامیاری بێ، یان ناوخۆیی، یاخود هەر باتەتێکی‌تر بە یەکێك لەلایەنە

بنەرەتی‌یەکانی کاری ڕۆژنامەنووسی دائەندرێت ـ بێ‌گومان لێرەدا مەبەستمان لەهەموو چەشنە هەواڵێك نی‌یە، بەڵکو ـ ئەو هەواڵە گەرم و تازانەی پەیوەندی تەواویان بە باری گشتی‌و کۆمەڵایەتیەوە هەیە ـ بەتایبەتی ئەگەر کارێکی تازە بێت، یان کاریکاتە سەر لایەنێکی زیندووی ژیان.

## هەواڵ چی‌یە؟

گەلێك بۆچوونی ڕۆژنامەنووسی هەیە دەربارەی ساغ کردنەوەی هەواڵ، بەڵام بەشێوەیەکی تێکرا دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستی‌یە کە هەواڵ ئەو شتەیە رووی‌داوەو بنچینەیەکی ڕاستەقینەی هەیەو بە شێوەیەکی هونەری تۆمار دەکرێت کەسەرنجی خوێنەر بەلای خۆیدا ڕائەکێشی‌و چەندان لق و پۆپی هەیە کە ڕۆژنامەنووس دەتوانێ ئەمانە بکاتە سەرچاوەیەك بۆ دەسگیر بوونی نوێترین هەواڵ.

ـ ستانلی جونسون ـ کەمامۆستاو پسپۆڕی‌کاری ڕۆژنامەنووسی‌یە چەشنی هەواڵ بەم شێوەیەی خوارەوە دەست نیشان ئەکات و ئەم چەند خاڵە دەکاتە سەرچاوەی هەواڵ.

1 ـ کورتە هەواڵ و هەواڵی تایبەتی.
2 ـ هەواڵی نەخۆشی‌و مردن و شاردنەوە.
3 ـ کارەسات و ئاگر نانەوە.
4 ـ تاوان کاری.
5 ـ وەرزو باری‌کەش.
6 ـ لێ‌دوانی ڕۆژنامەنووسی.
7 ـ کۆبوونەوەو دووانی تایبەتی.
8 ـ دادوەری‌و کاروباری دادوەری.
9 ـ پارەو کاروباری دارایی‌تر.
10 ـ میری‌و رامیاری.
11 ـ هەواڵی زانستی‌و رەخنەو پێشکەوتن.
12 ـ هەواڵی ئەو بابەتانەی کە لایەنەکانی تری ژیانی مرۆڤ چارەسەر ئەکەن و لێی ئەدوێن.
13 ـ کۆمەڵایەتی.
14 ـ وەرزش.

دەسگیربوونی ئەم چەشنە هەواڵانە بەپلەی یەکەم ئەرکی پەیامنێرەکانە کە هەموو ڕۆژێ لەشارو گوندو ناوچەو کون و کەلەبەری دوورو نزیك دا بەدوای دەسگیربوونی تازەترین هەواڵ ئەگەڕێن کە ڕۆژنامەکەیان پێ برازێتەوە. . بەڵام لەکوێ؟

ڕۆژنامەنووس لە نووسینگەکانی میری‌و بەڕێوە بەرایەتی‌و دانشتگاو مەڵبەندو دەزگاکانی تری کۆمەڵایەتی‌و رامیاری‌و ئابووری‌و شوێنی‌تر ئەو هەواڵانەی چەنگ ئەکەوێت کەلەرێگەی ئاخاوتن و گەڕان و بەدووادا چوونی رووداوەکان دا ئەیان دۆزێتەوە، بە تەلەفۆن و هۆیەکانی‌تری ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی بەپەلە ئەیگەیەنێتە دەزگای ڕۆژنامەنووسی.

هەندێ جاریش چەند هەواڵێك بەیەکەوە چەنگی ڕۆژنامەنووس ئەکەون، لێرەدا هونەر لە چەنگ کەوتنی هەواڵەکەیە، لەوەش هونەرتر، ڕۆژنامەنووس چۆن بتوانێ لەهەواڵی زیندوو، دەستی داهێنانی خۆی بەکاربێنێ‌و بەپێی گرنگی، هەواڵەکە ڕێك بخات، بۆ نموونە ـ دۆزینەوەی دەرمانێ گەورەترە لەوەی فلانەکەس لەناو ماڵەکەدا خۆی کوشتووە ـ لەبەر ئەوە پێویستە لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی ڕۆژنامەنووسی‌دا هەندێ لایەنی بنەڕەتی رەچاو بکرێ‌و کە دیارترین ئەو لایەنە زیندووانەش ئەمانەن:

1 ـ هەواڵەکە تازەبێت.

2 ـ پەیوەندی بەباری کۆمەڵایەتیەوە هەبێت.

3 ـ جیاوازی هەبێ لەگەڵ هەواڵەکانی تردا.

4 ـ سەر سوڕهێنەر بێ.

5 ـ هەواڵی چەشەدار بێ.

6 ـ هەستی مرۆڤایەتی بجولێنێ.

7 ـ ئامانج و ئەنجامێکی دیاری هەبێت.

8 ـ چاوەڕوانیو بەدووا داچونی تێدا بێتەکایەوە.

بێ گومان لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا مەرج نی یە هێشتا هەواڵەکە جێگەی بایەخ دان بێو ڕاستەوخۆو کت ومت بگاتە دەستی خوێنەر، بەڵکو پێویستی بەدەستی وردەکاری ڕۆژنامە نووس هەیە، مەبەستیش لێرەدا شێوەی نووسینەوەی هەواڵەکەیە، واتە داڕشتنەکەی، کە ئەمە مەرجێکی گرنگە لە هەڵ قۆزینەوەی هەواڵەکە لەلای خوێنەرانەوە ـ هەواڵ هەندێ ڕووی جموجوڵی مرۆڤایەتی ئەنوێنێ کەگرنگە بەلای بیروڕای گشتی یەوە.

گۆڤاری ـ کۆلیر ـ ی ئەمەریکی، کۆبوونەوەیەکی فرەوانی ڕۆژنامەنووسی سازدا، بۆدەرخستنی تازەترین پێناسێك بۆ ـ هەواڵ ـ لەو کۆبوونەوە گەورەدا گەلێ بۆچوونی جیاواز هاتە پێشەوە بەتێکڕاش لێکۆڵینەوەکە ئەم ئەنجامەی دایە دەستەوە:

1 ـ هەواڵ هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کەپێویستە خوێنەر شتێکیان لێ بزانێ.

2 ـ هەواڵ ئەوەیە کە خەڵك بەتاسەوەبن بۆی.

3 ـ هەواڵ ڕووداوەکانی ژیانە.

4 ـ هەواڵ پەیوەندی خەڵکە.

5 ـ هەواڵ کۆکردنەوەی سەراپای جموجۆڵەکانە، باشترین هەواڵیش ئەوەیە کەکۆمەڵانێکی زۆر لێی کۆ ئەبنەوە.

6 ـ هەواڵ ئەوەیە کە لە بەرژەوەندی گشتی یەوە جیا نابێتەوە.

سەر نورسەری ڕۆژنامەی ـ نیۆرۆك ـ کە تشارلز.

ئەلف ری ناوە لەو بڕوایە دابوو کە هەواڵ ئەو شتانەیە کە مرۆڤ ئەخاتە سەر سورمانەوە.. بەڵام دوای چەند ساڵێ لە دەربڕینی ئەو رایە وتی: هەواڵ ئەم مەسەلەیەیە کە پێشتر خەڵکی دەرکی پێ نەکردەوەو نەیزانیوە. ستانلی، کر .نویەتی: (هەواڵ ئافرەت و پارەو تاوانە) کەچی دەزگای ڕۆژنامەنووسی ی لە وولاتە یەکگرتووەکاندا لە نامیلکەیەکی تایبەتی دا کە دابەشی سەر پەیامنێرەکان کراوە، دەڵێ: (هەواڵ هەموو ئەو شتانەیە کە لەژ یانەوە هەڵدەقوڵێن) ئاشکرایە کە ڕۆژنامەنووس تەنیاکاری بە تۆمارکردنی ئەو هەواڵە کۆتایی نایێ؛ بەڵکو لەکاتی نووسینەوەدا هونەرێکی تایبەتی دەوێو پێویستی بەشارەزایی هەیە لە ریزکردنی هەواڵ گەیاندنەکە.

هەندێ هەواڵ هەیە واپێویستە بە زووترین کات بگاتە دەستی خوێنەران (ئەگەر ئەو هەواڵە بەچەند چرکەیەك پێش چاپ کردن بگاتە ڕۆژنامەو کاریگەر بێ، پێویستی بە بڵاوکردنەوەیە) لێرەدا چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە واتە نووسینەوەی هونەری، لەلایەن ڕۆژنامە نووسەکەوە بە خەیاڵێکی زەق دائەنرێ. چونکە گەلێك جار، هەرچەندە ئەم هەواڵە بەلای کارگێرانی ڕۆژنامەکەوە گرینگە، بەڵام بەلای خوێنەرەوە هیچ چەشەیەکی تێدانیە.

(هەموو ئەو شتانەی کە شایانی بڵاوکردنەوەبن، مانای ئەوە ناگەیەنێ کەجێی سەرنجی خوێنەرانە) هەروەکو گەلێك جاریش هەواڵەکە گرینگە بەلایەنی هەردوو لاوە، واتە بەلای دەستەی نورسەرانی ڕۆژنامەکەو بەلای خوێنەرانی ڕۆژنامە، هەندێ جاریش تادەگاتە ڕۆژنامە کۆن دەبێو ئەو بەهایەی نامێنێ (زۆرجار هەواڵ گرینگە، بەڵام کۆن بووە) کەوابێ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە دوای تێپەڕبوونی زیاترنیە لە نوکتەیەکی ساردو سڕ ـ خوێنەری ئەم سەردەمە زیاتر بایەخ دەداتە هەواڵە تازەکان، بەڵام ئەگەر ئەو هەواڵە کۆن بوون، ئاشکرایە سەرنجی هیچ لایەك بەلای خۆیدا ڕاناکێشێ، هەتا ئەگەر ئە خوێنەرە لەو هەواڵە بێ ئاگاش بێ».

**چۆن ئەتوانین لە ڕووداوێك، هەواڵ دروست کەین؟**

بێ گومان هەموو ڕووداوێك شایەنی دروست کردنی هەواڵ نیە، هەروەها رەنگە بڵاوکردنەوەی هەواڵی ساردوسڕ لە ڕۆژنامەیەك دا کارێکی تەواو بکاتە سەر ئاستی ڕۆژنامە.. بەڵام ووردبینی لە نووسینەوەی ڕووداوی زیندوودا کارێکی یارمەتی دەرە بۆ ڕاگرتنی ئەو ئاستە ڕۆژنامە نووسی یە.

(ستانلی جۆنسۆن) نموونەیەك دەهێنێتەوە بۆ نووسینەوەی هەر

ڕووداوێك كە ڕۆژنامەنووس لەكاری ڕۆژانەیدا دەتوانێ كەڵكی لێ وەرگرێ.

ستانلی ـ لە نموونەكەدا كارەساتێك وەرئەگرێ، لەبەر درێژی كارەساتەكە، ئێمە تەنیا پرسیارەكانی ـ ستانلی جۆنسون ـ لە نموونەكەدا دێنینەوە كە لەهەموو هەواڵێك دا دەكرێ ڕەچاو بكرێ. . .

| پرسیار | وەڵام |
|---|---|
| چی ڕوویداو | كارەساتی ڕێگری. . |
| كێ بوە قوربانی؟ | لیوناردو جرۆنز. |
| كەی ڕوویدا؟ | لەدووا ساتەكانی شەو. |
| لەكوێ ڕوویدا؟ | لە بەرامبەر كۆشكی ژمارە(700). |
| چۆن ڕوویدا؟ | كارەساتەكە بەزۆر دارەكی چەك ڕوویدا (بەكورتی). |
| هۆی كارە ساتەكە؟ | لەپێناو پارە. |

هەواڵی سەركەوتوو، تەنیا بەوەندە ناوەستێ، بەڵكو پێویست بە لە بەرچاو خستنی كۆمەڵێ مەرجی بنەڕەتی هەیە كەلایەنی هونەریو پیرۆزی پیشەی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسی ڕوون دەكاتەوە، لەوانەش:

1 ـ **ڕاستگۆیی:** بۆ ئەوەی ڕۆژنامە لەپەیامی خۆی دوورە پەرێز نەبێتەوە، پێویستی بەوە هەیە كەوا لە بلاوكردنەوەی هەر هەواڵێك دا ڕاستگۆبێ.

2 ـ **وورد بینی:** Accuracy: زۆرجار ڕۆژنامەنووس هەواڵی نوێی ڕاستی چەنگ ئەكەوێ، بەڵام لەئەنجامی ووردنەبینی ئەو هەواڵە دەشێوێ.

3 ـ **دەست و بردی:** ئەگەر بێت و ڕۆژنامە دەست و برد هەواڵەكە بلاو نەكاتەوە، بلاونەكردنەوەی چاكترە.

4 ـ **بەهەرەو لێهاتوویی:** acceptupility - گەلێك جاریش ڕۆژنامەنووسی ناشارەزا بێ‌تامترین هەواڵ بەگرینگ ئەزانێو دەرك بەبێ بایەخی ناكاو خوێنەر بۆنی بێزاری لەو هەواڵە بەدیئەكات.

5 ـ **شوێنی بلاوكردنەوە:** زۆرجار هەواڵەكە گرینگە، بەڵام شوێنی بلاوكردنەوەی لە ڕۆژنامەكەدا گونجاو نیە، یان بە شێوەیەكی‌تر، هەواڵ هەیە تەنیا بۆشار دەست دەداو هەواڵ هەیە تەنیا بۆگوند، یان كاتێ دەچێتەگوند پێویست بە گۆرینی شێوەو زمانەكەی هەیە.

6 ـ **كاریگەریەتی دەربڕین:** هەرچەندە هەواڵەكە گرینگ بێ، بەڵام لەوانەیە لەئەنجامی بێدەسەڵاتی هونەرییان توانای داهێنانی ڕۆژنامەنووسەكە.

7 ـ **لایەنی ڕامیاری ڕۆژنامە:** لەگەڵ هەموو ئەوانە دەبێ هەواڵەكە لەگەڵ ڕێرەوی ڕۆژنامەكەدا بسازێ. هەڵبەتە لەگەڵ بوونی ئەم مەرجانەدا ڕۆژنامە نووس خۆشی ڕۆڵی دیار لەكاری ڕۆژنامەنووسیدا دەبینێ، واتە كەسایەتی ڕۆژنامەنووس كاریگەریەكی فرەوانی لە مەسەلەكەدا هەیە ـ تۆماس بیری ـ مەسەلەی دەسگیر بوونی هەواڵ و هەر لایەنێكی سەركەوتوو لەكاری ڕۆژنامە نووسیی، بەوە لێك ئەداتەوە كە ڕۆژنامەنووس سەرباری بەهرەی داهێنانی پێویستی تەواوی بە چوونە ناوخەڵك هەیە، لەنێوان خەڵكدا بەدوای هەواڵی زیندوو بابەتی نوێدا بگەڕێو پەیامی ڕۆژنامەنووسیی بەدی بێنێ. . .

**سەرچاوە:**


1 ـ الدكتور عبداللطیف حمزة ـ نشأة-الخبر ـ المدخل الى التحریر الصحفي.
2 ـ فاروق خورشید ـ بین الادب والصحافة.
3 ـ الدكتور محمود فهمي، ـ الفن الصحفي في العالم ـ.
4 ـ استفتاء الانباء فن ـ ستانلي جونسون ـ ترجمة وديع فلسطين.
5 ـ المندوب الصحفي ـ جلال الدين الحماصي.
6 ـ في فريد بوند ـ ترجمة راجي صحوني مدخل الى الصحافة.
7 ـ الدكتور عبداللطيف حمزة، ازمة الضمير الصحفي.
8 ـ ب. رينواريه ترجمة عبداللطيف جلال. الصحافة في العالم.

# تری و بەرهەمەكانی لە کوردستاندا

نووسینی: مولود قادر بێخاڵی

● تریّ بەرهەمێكی ئابووریو بە كەڵكە.
● كاری بەردەوام لە پێناوی بەرهەمێكی چاك دا.
● ڕەزەوان.
● بەرهەمی ڕەزەكان كەی پێدەگات و چۆن ساغ دەكرێتەوە.
● خۆ ئامادەكردن بۆ هێنانە بەرهەمی مێووژو دۆشاو.
● جورەكانی تریّ.. ڕنینی تریّو مێووژ دروست كردن.
● هەڵگرتن و پاراستنی مێووژ، دروست كردنی دۆشاو..
● ئەرك و ماندووبوونێكی زۆر لەپێناوی ژیان و گوزەرانێكی چاكتردا..

## ● تریّ بەرهەمێكی ئابووریو بە كەڵكە ●

گومان لەوەدا نیە «تریّ» مێوەیەكی زۆر كۆنەو تەمەنێكی هێجگار دوورو درێژی لە مێژووی ژیانی ئادەمیزاددا هەیە بۆ پێ سەلماندنی ئەم ڕایەش دەڵێین «تەورات» باشترین بەڵگەیەو زۆر بە ڕوونی ئەو ڕاستی یە دەردەخات و بە ئاشكرا ناوی ئەو مێوەیە دەهێنێ هەردیسان لە زۆر ئەفسانەی كۆنیشدا باسی لێوە كراوە ئیتر لەوەوە بەچاكی بۆمان ساغ دەبێتەوە كە تریّ میوەیەكی كۆنەو مرۆڤ هەر لە زووەوە ناسیویەتی و وەكو بەرهەمێكی ئابووریو بەكەڵك بە كاری هێناوەو سوودی لیّ وەرگرتووە..

بەلام ئەوەی زیاتر جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە تا ئێستا نەزانراوە ئەم میوەیە لە چ وولاتێکدا بۆ یەکەم جار پەیدابووە، ئەگەرچی هەندێ جار وا باس دەکرێ کە لە سەرووی وولاتی چین و دەوروبەری هیندوستان سەری هەڵداوەو بلاوبۆتەوە، داری مێویش یەکێکە لەو دارە جوانانەی لە سروشتدا بەرچاومان دەکەون و سەرەرای جوانی‌یەکەیشی گەلێ سوودی ئابووری‌و پزیشکیشی هەیە، ئەوەتا گەلا مێو لە زوربەی ناوچەکانی وولاتدا وەکو کەرەستەیەکی سەرەکی بۆ چێشت لێنان بە کاردێ وەبەتایبەتی بۆ «یاپراغ» کە لە کوردەواریدا زۆر باوە، هەر ئەو کەڵك و سوودەیشە زیاتر وای لێکردووە کەلە زوربەی باخچەی ماڵەکاندا شوێنێکی تایبەتی هەبێت و کەپری جوان و رێکوپێکی بۆ دروست بکرێ..

ئەوەی ناوچە شاخاویەکان گەرا بێ، گەلێ باخ و باخچەی بەراوو دێمەکاری دێتەوە بیر، بۆ نموونە ئەو رەزە دێمەکارانەی لە سەر گردۆلکەو داوێنی چیاکان دەبینران ،جوانترین تابلۆی سروشتی بوون و رەنگی سەوزی گەلا مێوو هێشوە ترێی گەورەو دەنك رەش و زەرد سیحرێکی خوایی بوون ئەو ناوەیان دەرازاندەوە..

دەیەها بەڵکو سەدەها خێزانی کوردەواری لە ناوچە شاخاویەکاندا بۆ دابین کردنی ژیان و گوزەران و بەرێوەچوونیان پەنایان وەبەر ئەو مێوەیە دەبردو لە ناوچەکانی خۆیاندا رەزیان دادەچاندو تارادەیەکی چاك باری ژیانی سالانەی خۆیانیان پێ مسوگەر دەکرد، بەڵکو لەوەیش زیاتر بە درێژایی تەمەنیان ئەم کارە دەبووە پیشەیەکی سەرەکی ئەوان و لە باوکەوە دەمایەوە بۆ کورو کورەزاو ئیتر درێژەی پێدەدرا، تەنانەت هەندێ لەو خێزانانە تاوەکو ئیمرۆش هەر لە سەر ئەم پیشەیە ماون و پەرەیان پێ‌ی داوە..

هەروەکو گوتمان زوربەی ئەو خێزانانەی لە ناوچە شاخاوی‌یەکاندا دەژیان ،باری گوزەرانیان بەو بەرهەمەوە بەسترابووەوە کە لە رەزکانیانەوە وەدەستیان دەکەوت، هەربۆیەش بە شێوەیەکی فراوان بایەخێکی زۆریان بە دانانی رەزی دێمەکاری دەدا بە پێچەوانەی ئەم سەردەمەی ئێستامان ئەگەرچی ئەو ئامێرو کەل و پەلانەی ئیمرۆ هاتوونەتە کایەوەو ئەو پەرەسەندنەی لە بواری تەکنۆلۆژیادا وەدەست هاتووە ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ رابردوودا جیاوازی‌یەکەیان ئاسمان و رێسمانە، کەچی بە پێچەوانەوە دەبینین رۆژ لە دوای رۆژ ئەو بەرهەمە زۆرەی جاران لە رەزەکان وەگیر دەکەوت ئیمرۆ خەریکە نەوەك هەر کەم دەبێتەوە، بەڵکو رەزەکانیش بەرەو نەمان و کۆربوونەوە دەچن و ئەو خێزانانەی کە لە سەر ئەو رەزە دێمەکارانە دەژیان، کۆمەڵ کۆمەڵ روو لە شارەکان دەکەن و دەبنە بارێکی گران بە سەر شانی کرێکاری نێو شارەکان و کار دەکەنە سەر باری ژیان و گوزەرانیان.

ئەوە لە کاتێکدا روودەدات کە ـ وەکو گوتمان ـ ئامێرو کەلو پەلی تازە بابەت کە لە کشتوکاڵدا بە کاردێ زۆر لە جاران پشکەوتووترەو کارکردن لەو بوارەدا زۆر هاسانتر بووەو هۆی گواستنەوەی بەرهەم لە سەرچاوەی بەرهەمەکەوە بۆ بنکەی فرۆشتن لە شارەکاندا زۆر زۆر پەرەی سەندووەو خێراتربووە، ئەمە جگە لەوەی کە لە رووی نرخیشەوە گۆرانێکی زۆر گەورە رویداوەو سوودی فرۆشتنی بەرهەمەکە دەیەها جار لە جاران زیاتر بووە..

## ● کاری بەردەوام لە پێناوی بەرهەمێکی چاکدا ●

هەڵبەتە زۆر لە ئێمە ئەو دیمەنە جوان و دڵخوش کەرەی بینیوە کە لە ئاخە لیوەی رەشەمێ «مانگی شوبات»و، لە نەورۆزدا ناوچە شاخاویەکانی دەگرێتەوە، یەکێ گەر بە وردی سەرنجی ئەو ناوچانەی بدایە زۆر بە چاکی ئەو ماڵ و منداڵ و رەزەوانانەیان دەدی کە وەکو پوورەی هەنگ ویزەیان دەهات و بە نێو رەزەکانیاندا دەهاتن و دەچوون و دەجوولانەوە، لەو وەرزەی سالاکۆمەڵ کۆمەڵ دەچوونە نێو رەزو دەکەوتنە پاك کردنەوەی داری مێوو برینی ئەو لقە کۆن و ووشکانەی بە قاشۆکانەوە دەبوون، چونکە ئەگەر دار

مێـوكـان لە كاتی خۆیـداو پێش پشكـوتنی لەو لقـانـە پاك بكـرێتـەوە ئەوە بەرهـەمـەكـەی گەلێ چاك دەبێ و «بـۆڵی» دەنكی هیشوەكانی تەواو خڕو گەورەو بە گۆشت تر دەبن، بە پێچەوانەیش خاوێن نەكردنەوەی دار مێوەكان و نەبرینی لق و پۆپی كۆن و بێ كەڵك لە كاتی خۆیدا، لە تەك پاك نەكـردنـەوەی كرش و كاڵ و پووش و پەڵاش دەورێـكـی سەلبی دەبـوو بۆ بەرهـەمـەكـەو هیشـوەو ترێیـەكـان زۆر نارێك و ناتەواو دەبوون و لە جیاتی زیادبوونی بەرهەم لق و پۆپی ووشك و بێ كەڵك پەرەی دەسەندو زێدە دەبوو تا وای لێدەهات دوای چەند ساڵێك ڕەزەكە كۆر دەبووەو نەدەما. .

## ● ڕەزەوان ●

هەروەكـو لە پێشـەوە گوتمـان لە ئاخـە لێوەی ڕەشەمێ - «شوبات» -ولە نەورۆزدا دەبێ قاشۆ بگیرێ بۆ چاندن، ئیتر ڕەزەوانـەكـان لەو وەرزەدا زەوییـەكـانیـان خۆش دەكـەن و شوێـنـی تایـبـەتـی «واتـە قۆرتـی بچـووك بچـووك» دیاری دەكەن و لە نێوان هەر قۆرتێك و یەكێكی تردا چەند هەنگاوێك ماوە بە جێ دەهێڵن و هەر دوو «قاشۆ» لە نێو قۆرتێكدا دەنێژرێ، ئەوەی بشیەوێ ڕەزەكەی باش بێت، لە كاتی قاشـۆ چانـدنـا نەختێـك ئاوی لە ژێـر دەكـات و، ئەگـەر زەوییـەكـەش تەربێـت ئەوەی ناوی لە دوای تەواوبـوونی نچانـدنی قاشـۆكـان بە یەك گاسنی جووت دەكرێت و لە ساڵی دووهەمیش دا گاسنێكی تر دەكرێت و لە ساڵی سێهـەمیش ژێـرەوەی مێـوەكـان «قاشۆكان» دەدرێتەوە ورەگی هەر قاشۆیەكی لە سەرەوە بێت - واتە بە دەرەوە بێت دەبڕن تاوەكو قاشۆكە زووتر هەڵچێت و بەهێزتربێت، زۆر جار وا دەبێت لە ساڵی سێـهـەمـدا كە ڕەز دەبـڕنــەوە گەر «بـەیـارەكـە» چاك و بەهێـز بێت ئەوا تاك تاك قاشـۆكـان بەردەگـرن و دێنـە بەرهـەم ،لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بۆ جاری سێهـەم جووت بكـرێتـەوەو لە مانگی نیسـانـدا «پێمـەرە» دەكـرێت و دوا بە دوای ئەوەیش وەرد دەدرێتـەوە. . بەڵام لەبـەر ئەوەی ڕەزەوانـەكـانی ئێستـا لە ڕابـردوو پسپـۆرترن و شارەزاییەكی چاكیان لە بارەی ئیشوكاری ڕەزەوە وەدەست هێنـاوە، لە كاتی چانـدنی قاشـۆكـان هەڵـدەستن هەر لە سەرەتاوە قاشۆكان بەرامبەر یەكتری دەچێنن بۆ ئەوەی بتوانن لە كاتی خۆیدا ڕاست و چەپ جووتی بكەن، بەم شێوەیە لە پێمـەرەكـردن ڕزگـاریـان بووە .گەلێ جاریش لە مانگی تشـرینی یەكـەمــدا كە دەكـاتــە ڕێكـەوتی گەڵا ڕێـزان ڕەزەوانـەكـان مشـووری ئەوە دەخـۆن كە زەوی تازە ئامادەبكەن و ڕەزی نوێ دابنێن بۆ ئەوەی زستانی بە سەردا بێت و سەرماو سرو بەفر بچێتە ژێر قاشۆمێوەكان و سوودی لێوەربگـرن و باش ڕەگ دابكـوتن، هەر ڕەزێكیش لەو كاتـەدا دابـنـرێ ئەوە پێی دەڵـێـن دوو كژیو ئەو جۆرە ڕەزەیش زۆر بە چاك و پەسند لە قەڵەم دەدرێ. .

## ● داری مێو ●

لە ڕاستیـدا داری مێـو لەگـەڵێ داری تری بەبـەر بە توانـاتـرەو زیـاتر بەرگەی بەفرو باران و ساردو سری زستان و گەرمـای هاوین دەگـرێت، گەلێ ساڵی وا دەبێ لە پێنج مانگ زیاتر لە زۆر ناوچەی سەرووی وولات لە ژێر بەفردا دەمێنێتەوەو، دوای بەفر ڕەش بوونەوەیش دارەكە لە جاران زیاتر دەرسكێت و بەرهەمەكەیشی زیاد دەكا ت، ئەمە جگە لەوەی داری مێو توانایەكی تەواوی هەیە بۆ ژیان لە زەوی ووشكاندا واتە - زەوی دێمی -. .

مسـتـر «أی، إیـم، هـمـلـتـون» لە پەرتـووكـە بە ناوبانگەكەیدا «طریق الی كردستان» كە وەرگێردراوەتە سەر زمـانی عەرەبی لەلاپـەرە «54»ی كتێبـەكـەدا باسیجوانی شاری شەقڵاوەی كردووە، دەڵێ:

«ئەو شارە تا بڵێی دیمەنێكی جوان و دڵ ڕفێنی هەیەو داری مێو بناری چیایی سەفینی داپۆشیوە، ئەو دارە جوانەی كە بەرگـەی گرەی گەرمـای هاوین دەگـرێت و بە بێ ئاو

دەژیێت و لەگەڵ سەرمای زستانیشدا راهاتووەو هیچ باکی بە گۆرانـی وەرزەکـان نیـەو بەرهـەمێکی چاك و بە سوود پێشکەش بە مرۆڤ دەکات».

ڕەزەوانـەکـان بۆ پاراستنی داری مێـو لە ئاژەڵ و گیـان لەبـەرانی دیکـە لەگـەڵ هاتنی مانگی نەورۆزدا دەکـەونـە خۆیـان مشـووری ئەوە دەخـۆن کە پەرژین و چیلەو تانۆکی ڕەزەکـانیـان تازەبکـەنـەوە، وەکو باویشە تانۆك یا پەرژین لە شوورکـی دار دروسـت دەکـرێـت، وە بە زۆری لە داری بەڕوو مازوو، دەبێ ئەوەش بزانین کە زۆر جار لە ئەنجامی تازەکـردنـەوەی «پـەرژین»ی ڕەزەکاندا ناکۆکی لە نێوان دوو بنـەمـاڵـەدا لە دێـیـەك ڕووی دەدا لە سەر بەزاندنی سنوور «تخـوب»، چونکـە دەبـوایـە ئەو لایـەنـە زۆر بە ووردی ڕەچـاوبکـرایـەو کۆڵانی نێـوان دوو ڕەز بهێڵرایەتەوە، ئیتر بۆ ئەوەی خۆیـان لەو ناکۆکیو دەمـەقـاڵێـە دوور بخـەنەوە، خاوەن ڕەزەکـان هەڵ دەسـتـان بە درێـژایی پەرژیـنی ڕەزەکـانیـان جۆرەهـا داری بەرداریـان دەچـانـد وەك: «هـەرمێو بلوی ـ بادام ـ وگـوێـز و داریتـر، بەم جۆرە هەریـەکـەی سنـووری ڕەزەکـەی خۆی دەچـەسپاندو کەس بۆی نەدەکـرا لە سنـووری خۆی ڕەت بێت، ئەو هەمـوو ئیش و کارانـە دەبـوایـە لە مانگی ڕەشـەمێو ئاداردا کۆتایی پێبهاتایە، چونکە لەو دوو مانگەدا ووردە ووردە داری ترێ دەستی دەکـرد بە «ڕشـانـەوە» لەگـەڵ ئەو هەمـوو هەوڵ و کۆشش و جمـوجـۆڵـەی لە سەرەتـای ڕەزدانانـدا دەدرا، هەر دیسـان خاوەن ڕەزو ڕەزەوان بە گەرمی دەکـەوتنـە گەڕان بە دوای ـ دەماری ـ تەرایەتی ئاو لە نێو ڕەزەکەدا، چونکە وەکو باوە ئاو، ئاوەدانی بە دواوەیـە، ئیتـر کە گومـانی ئەوەیـان بکردایە کە لە نێو ڕەزەکەدا ئاو هەیە، ئەوە چوار دەوری ئەو شوێنـەیـان دەکـۆڵی تاوەکـو ئاوی تێـدا کۆبێتـەوەو سوودی لێوەربگرن لە ئیشوکاری خۆیانداو ئەو شوێنەیش ناودەنرا بە «ئەستێرە»، هەر لە نزیك ئەو شوێنەشدا پارچە زەویەك خۆش دەکرا بۆ کەپرو سابات کە لە سەر چوار ئەستوندەکی ڕێك و راست و پاکراوو چەند ]قیسپیکی» بە هەمان شێوە، بە زۆریش ئەو دارانـەی بۆ کەپـر بە کار دەهـاتـن لە دارە سرووشـتـیـیـەکـان بوون وەك داری بەڕو بۆ سێبـەریش سوودیان لە گەڵای داری بەڕوو مازوو «چڕوو» وەردەگرت و دەیـانخستـە سەر کەپـرەکـە چونکـە سێبەرەکەی زۆر فێنکەو خەوتن و رابواردنیش چ لە سەر وەچ لە ژێر ئەو کەپرانە زۆر لەو شـرێنـانـە. خۆشتـرە کە تازەتـرین کەرەستـەو ئامێـری ئەلەکترونیو کارەبایی تیادا بە کاردێت..

## ● بەرهـەمـی ڕەزەکـان کەی پێدەگـات و چۆن ساغ دەکرێتەوە ●

لە ڕاستیـدا ئاوو هەوای ئەو ناوچـانـەی کە ڕەزیـان تێدا هەیە کارێکی گەورە دەکاتە سەر پەلەکردن لە درەنگ و زوو پێگەیشتنی ترێ لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر. ئەوەتا لە هەنـدێ ناوچـە لە مانگی شەش و حەوتـدا کە دەکـاتـە ڕێکـەوتی مانگی ڕەزبـەری کوردی ترێ بەرەو پێگـەیشتن دەچێت وبەرە بەرە ترێ کە خۆش دەبێت و تاوەکو لە مانگی ئابدا بە تەواوەتی بەرهەمی ترێ کە پێدەگات و دەگاتە شارو لادێکان.. لە سەردەمی پێشوودا خاوەن ڕەزو ڕەزەوانەکان لەو مانگـدا تووشی ئاڵـۆزی دەبـوون و خەم دای دەگرتن و نەیان دەزانی چۆن بەرهەمەکە ساغ بکەنەوە بیگەیێنە بازار، چونکـە بە زۆری بەرهـەمی ڕەزەکـانیـان لە لایـەن ورچ و زەردەواڵـەو گیـان لەبـەری ترەوە دەفـەوتـاو دەخورا، بۆیە بە هەموو توانایەکیان هەوڵی ئەوەیان دەدا زوو بیرنن و بیفرۆشن جا لە شار بوایە یا لە دیهاتەکان، هەڵبەتە زوربەیشمان لەوە ئاگـادارین کە لەو سەردەمـدا هۆی گواستنـەوەی سەرەکی گوێدرێـژ و وولاخی بەرزەبـوو، بۆیـە دەبـوایـە سەوی ـ سەبەتە ـ وقەرتاڵەو دەست قەرتاڵە ئامادە بکرانایە بۆ ئەوەی تیدا دابگرن ـ واتە ترێی تێبکەن ـ وبە وولاخ بیبەن بۆ فرۆشتن ئەم تێکەو لێکەیە بۆ ماوەیەکی کەم ماندووبوونێکی زۆری گەرەك بووو سوودو قازانێکی ئەوتـۆشی بە دەستـەوە نەدەدا کە بەرامبەر ماندووبوونەکە بوەستێتەوە، بەڵکو ترێکە

هێندە دەکەوت ورەزیل دەبوو تەنانەت بۆ فرۆشتنیش هێندە بایەخی پێ نەدەدرا، جاری وا هەبوو بەرهەمی ڕەزەکە ماندووبوون و ئەرك و ئازاری خاوەن ڕەزەکەیشی پڕ نەدەکردەوە، لەبەر ئەو باجانەی لێیان وەردەگیرا ،وەکو باجی «بارانە»و «استهلاك»و «گومرگە»و «دەلالی»و کرێی زەوی. .

زۆرجاریوا دەبوو ترێ فرۆشەکە پارەی نان و کەبابێکی بۆ نەدەمایەوە هەر بۆیەش گەلێ کەڕەتی وابووە چەند نوردووە نانێکی لە ماڵەوە دەخستە نێو تورەگەیەك و دەست قەرتاڵە ترێیەکی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ ئەوەی لەو سەرەوە بە برسیەتی نەگەڕێتەوە. .

جاری وایش دەبوو بەرهەمی ترێ یەکجار زۆر دەبوو، ڕەزەوانەکە ناچار دەبوو بەرهەمەکە برنێ بە زووترین کات بیبات بۆ ئەو ناوچانەی کە ترێیان لێ نییە بۆ ئەوەی ئاڵو گۆڕی پێبکات. . ئیتر وەکو پێشتر گوتمان ترێکەی دەخستە نێو (سەوی) ـ سەبەتە)یا قەرتاڵەو ـ کە لە شوورکی دار بە ڕوویا دار مازوو یا داری «بی»و «هەنار» دروست دەکرا ـ و، دەیخستە سەر پشتی وولاخێك بۆ ئەو شوێنەی دەبرد کە مەبەستی بوو، جا ئەگەر وولاخەکەی وولاخێکی چاك و بەهێزبوایە ئەوە سێ سەبەتەی گەورەی لێبار دەکرد لەگەڵ قەرتاڵەیەکی بچوك و دەیخستە سەر بارەکەو بۆ ئەو خانە خوێیەی دەبرد کە لێی میوان دەبوو، ئیتر هەرکە دەگەیشتە ئەو دێیەی کە مەبەستی بوو، گورج بە بێ ئەوەی پشوو بدات و بحەسێتەوە سەردەکەوتە سەربانێکی بەرزو بە زۆریش سەربانی ماڵی خانە خوێکەی هەڵ دەبژاردو بە هەموو دەنگیەوە هاواری دەکرد «های ترێ های ترێ، وەرنە ترێ وەرنە ترێ» بەم جۆرە لەو سەر تا ئەو سەری دێیەکەی وریادەکردەوە کە ترێ هاتووەو بە دانەوێڵەی دەگۆڕێتەوەو لە فلانە ماڵیشە ـ بە زۆریش دانەوێڵەکە گەنم دەبوو وشێوەی گۆڕینەوەکەیشی بەم جۆرە دەبوو «سەر بە سەر بە گەنم، یەك و دوو بە جۆ، یەك و نیویش بەمزاش»، پەلە کردنەکەیشی لە فرۆشتن و ساغکردنەوەی ترێکە بۆ ئەوە بوو نەوەك بۆ ڕۆژی دووهەم بمێنتەوەو بترشێت و خراپ بێت و کەس لێی نەکڕێت، چونکە زۆر جاری وا دەبوو یەك دوو ڕۆژ پێشتر بەرهەمەکە دەڕناو لە نێو سەبەتە دەکرا ئیتر گەر دوا بکەوتایە ئەوە زۆر بە هاسانی تێك دەچوو، جا هەر دووا بە دووای بانگکردنەکەی ترێ فرۆشەکە لە هەموو ماڵێکەوە ڕوویان لەو ماڵە دەکرد کە ترێی لێبووو بەو جۆرەی پێشتر بریاری بۆ درابوو دەفرۆشراو ئاڵ و گۆڕ دەکرا ،وەئەگەر بهاتایەو ئەو ساڵە دەغڵ و دانەوێڵە بەرهەمەکەی چاك بووایە «واتە هات بوایە» تا بڵێی یەك و دوو ترێ کە ساغ دەبووەوەو زوربەی زۆری بە گەنم دەگۆڕرایەوە، ئەو ساڵانەی هات بوایەو دەغڵ و دان زۆر بوایە ترێ فرۆشەکە خۆی دەخستە سەرپشت و بە گەنم نەبوایە نەیدەگۆڕیەوە، ئەویش لەبەر بێ نرخی دانەوێڵەکانی تر وەك جۆو مزاش. .

بە پێچەوانەیش گەر ساڵەکە قات و قڕی بوایە ئەوە زۆر بە کزی خەڵکی ئارەزووی ترێ کڕینی دەکرد ئەگەر چی هەوەستیشیان بۆی بچووایە، بۆیە ئاڵ و گۆڕکردنی ترێکە دوو سێ ڕۆژی پێ دەچوو جگە لەوەی کە دووسێ دێیشی پێدەکرد تاوەکو ساغی دەکردەوە، لەو لایشەوە بەرهەمی ترێ لە نێو ڕەزەکاندا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیادی دەکردو پێدەگەیشت، ئیتر ڕەزەوانەکان ناچار دەبوون بۆ ئەوەی ترێکەیان بە خەسار نەچێت ڕوویان دەکردە دروست کردنی مێوژ و دۆشاو، کە لە کاتێکی تری ساڵدا دەیانفرۆشت و ئاڵ و گۆڕیان پێدەکردو ساغیان دەکردەوە، جا بە پارە بووایە یا بە دەغڵ ودان.

**● خۆئامادەکردن. بۆ بەرهەم هێنانی مێووژو دۆشاو ●**

---

دوای ئەوەی کە گەلاوێژ دەردەکەوت و ترێ بە تەواوەتی پێدەگەیشت، کاتی ئەوە نزیك دەبووەوە کە ڕەزەوانەکان مشووری ئەوە بخۆن بۆ دیاری کردنی شوێنی تایبەتی

بەرهەم هێنانی مێووژ و دۆشاو، ئیتر ڕەزەوانەکان خۆیان ئامادە دەکردو «مشتاغ» یان دادەناو ناوەناوەیش بە نێو ڕەزەکانیاندا دەگەڕان و ئەو هێشووە ترێیانەی کە دەنکەکانیان بەرەو ووشك بوون دەچوون دەیانخستنە لایەك بۆ مێووژ و، ئەوانەیش کە دەنکەکانی تەڕو تازەو جوان بووایەو ڕزیوی تیابوایە بۆ دۆشاویان دادەنا، هەر دوا بە دوای ئەم کارەیش لە نێو ڕەزەکانیاندا شوێنێکیان دەستنیشان دەکردو لە دارو بەرد پاکیان دەکردەوەو مشتاغی ترێو دۆشاویان لێدادەنا.. ئەوسا ئەو هێشووە ترێیانەی کە لە سەرەوە باسمان کرد، بە سەبەتەی بچووك بچووك بۆ شوێنە پاك کراوەکە دەگوێزرایەوەو هێشووەکان بەریز ڕێك دەخران، بە جۆرێك کە لاسکی هێشووەکان هەمووی بەرەو ژوور بوایەو دەنکەکانیش بە پاڵ یەکەوە بوونایەو بەڵام زۆر نەکەوتنایەتە سەر یەك تاوەکو نەڕزێن .. هەروەها دەبووایە «مشتاغی» ترێو کوگای دۆشاو لە نێوڕەزەکەو لە نزیك کەپرەکە یا ساباتەکەی ڕەزەوان بوونایە تا بە چاکی پارێزگاری لێبکردنایەو مەڕوماڵاتی لێدوور بخستایەتەوە، بە ڕۆژ ماڵ و منداڵەکانی ڕەزەوانەکە لەنێو ڕەزەکەدا بە دیاریەوە دەبوون، شەوانیش ڕەزەوانەکە هەر خۆی دەمایەوەو پاسەوانی ڕەزەکەی دەکردو چاوێکیش لە مشتاغی ترێو کوگای دۆشاوەکە دەبوو.. بەم شێوەیە تاوەکو دەست دەکرا بە مێووژ دانان و دۆشاو دەرهێنان ئەمە حاڵی زوربەی ڕەزەوانەکانی ناوچەی ووڵات دەبوو..

## ● جۆرەکانی ترێ ●

لە پارێزگای هەولێرو ناوچەکانیدا زۆر جۆرە ترێ هەن، وە لەوانەی کە زۆر بە ناوبانگن ئەمانەن:

تایەفی، سپی، میرانی، ناسکە ترێ، زەرتك - ئەم جۆرەیان هێشووەکانی لە میرانی پڕترن -، ڕەوگە - ترێیەکی ڕەش و زۆر ناسکەو بە کەڵکی مێووژنایەت، سوراو، پیسکە - زۆر ووردو ناسکە لە کشمیش دەچێ بەڵام بە پێچەوانەی ئەو ئەمەیان دەنکی هەیە، ڕەش میری - ترێیەکی زۆر نایابەو بۆ مێووژ و دۆشاو بە کار دێو لە هەموو ترێیەکی تر چاکترە، گزرەیی - هێشووەکەی زۆر پڕەو بە جۆرێ کە پێی دەڵێن. بزمار کوت..

## ● ڕنینی ترێو مێووژ دروست کردن ●

وەکو باوبوو کە کاتی ترێ ڕنین دەهات چەند ئافرەتێك بە کرێ دەگیران بە ڕۆژانە، ڕۆژانەکەیش بریتی دەبوو لە مێووژ، خاوەنی زەوی بۆی برابووەوە هەر کە بەرهەمی تازەی مێووژەکە پێ دەگەیشت دوو بێژنگی دەدرایە، بەڵام ئافرەتە ترێ ڕنەکان لەبەر ئەوەی ژیانیان لە سەر ئەو کرێیە بوو کە لە ئەنجامی کارەکەیاندا وەدەستیان دەکەوت، بۆیە هەر دوای کارەکەیان کرێی خۆیانیان وەردەگرت و پێویستی بەوە نەدەکرد چاوەڕوانی ووشك بوونەوەی مێووژی تازە بکەن، جا ترێ ڕنەکان کە هیشووە ترێکانیان لێدەکردەوە هەموویان بەریز دادەناو دوای ئەوەی ووشك دەبووەوە لە سەر بەرەیەك دەستیان دەکرد بە هەڵپشاوتنی هیشووە ووشك بووەکان بۆ ئەوەی دان - واتە دەنکەکان ـو دارکەکان لە یەکتری جیا ببێتەوە، دوای ئەوەی بە بێژنگ بەبایان دەکرد، ئەو وەبەر بادانی مێووژەیش پاش بیست تاوەکو بیست و پێنج ڕۆژ دەبوو دوای ووشك کردنەوەی ترێو ڕاکردنی لەبەر ڕۆژدا..

لە ڕاستیدا ترێ بە دوو قۆناغ دەکرێتە مێووژ، یەکەمیان ئەوەبوو کە لە سەرەوە باسمان کردو کە پێی دەڵێن مێووژی هەرەمە، جۆری دووەمیشیان جیاوازییەکی کەمی لەگەڵ هی پێشوودا هەیە، چونکە هەموو هەڵگێرو وەرگێری وەکو جۆری یەکەمیانە، تەنها ئەوە نەبێ کە ئەم جۆرە مێووژە دەبێ هێشووەکانی ئەو ترێیەی لێی دروست دەکرێت دەستبژێر بن و دەنکەکانیشی قەڵەوتربن، ئینجا

هیشـووەکـان دەخـرێنـە نێو مەنجەڵێکی گەورەی زنجیردارو دەخرێتە سەر ئاگر ، هەرکە ئاوەکە کوڵاکەمێك «خوڵەمیشی» داربەرووی تێدەکەن لەگەڵ یەکەم بڵقدا هیشووە ترێیەکان لە ئاوەکـە هەڵـدەهێنن و لە پاشـدان لەسـەر شتێکی پاکـدا «ڕای دەکەن» واتە دای دەنێن بۆ ئەوەی ووشك بێتەوە ، ئەم جۆرە مێـــوژەیش پێی دەڵـێـن «مێـــووژە مەڵـــە» ، کـە خۆشتـــرین و بە ناوبـانگترین جۆری مێـووژە ، بـەڵام کەم دەست دەکەوێ ئەویش لەبەر ئەو ئەرکە گرانەی کە هەیەتی بۆ پاك کردن و چاك کردنی، هەروەهـــا دەبـوایـە هێشـووی ترێی ئەو مێـووژە دەنکـەکـانی گەورە بووایـەو رزیوی تێدا نەبووایە بۆ ئەوەی لە نێو ئاوی کوڵاودا نەچرووسێ و بچووك نەبێتەوە . .

## ● هەڵگرتن و پاراستنی مێوژ ●

وەکـو هەمـومـان دەزانین زوربەی زۆری خێزانەکان لە کوردستـانـدا مێـووژ هەڵدەگرن، بۆ هەڵگرتنیشی بۆ وەرزی زستان ، ماڵە خاوەن رەزەکان «خرار»و هەمبانەو کەندوویان هەبـــووو مێـــووژەکـــەیـان تێـدەکـردو بۆ کاتی دیـاریکـراو هەڵـدەگیـرا ، چاکتـرین کەرەستەی پاراستنی دەغڵ و دان و زەخیـرەو گەلێ شتی تری پێـویستی ماڵ لە مێـوەجـــاتی ووشك کراوە کەندوو هەمبانەو خراربوون، زوربەی زۆری ماڵـەکـان گەلێ هەمبـانەی گەورەو بچووکیان هەبوو هی وا هەبــوو چوار هەنـگـڵی هەبـوو، هەنـدێکیـان رەنگـاو رەنـگ بوون، زور جاری وا هەبـوو هەمبـانـەی تایبەتیان بۆ مێــووژ دروســت دەکــردو هەر جورە مێـــووژێکـیـــان لە هەمبانەیەکی تایبەتی دەکرد، وەکو مێووژی رەش و سوورو زەرد، کە بۆ شەوچـەرەی شەوانی زستـانیـان دادەنـا لە تەك کاکلە گوێزو باوی - بادام - بیخۆن . .

## ●دروست کردنی دۆشاو ●

دوای ئەوەی باسـی دروستکـردنی مێـووژمـان کرد بە هەردوو جۆرەکـەیـەوە ئێستاش کورتە باسێکی دروستکردنی دۆشاوی ترێ دەکەین:

بۆ دروسـت کردنـی دۆشـــاو خاوەن رەزو رەزەوانـــەکـــان دەهاتن ئەو هێشووە ترێیە زۆر پێ گەیشتووانەیان دەهێناو بە هۆی سەبەتەو قەرتاڵە دەیان گوێزایەوە بۆ سەر کۆڵی دۆشاو، پێشترو بەر لەوەی دەست بکەن بە کوڵاندنی ترێ کانیان لە «راوەك» دەکـــرد لە سەر کۆڵـی دۆشـــاو - کە بریـــتـیـــە لە قەدەدارێکی گەورە نیـــوەی لێ لادەبـــرێو نیـــوەکـــەی تری دەکـوڵـدرێ تاوەکـو تەواو قووڵ دەبێو بە درێژایی دارەکە، ئەوســـا ئەو «راوەکـانـەی» کە تریـان تێـدایـە دەکـوڵـەکـە، دەهاوێشترێن و زەلامێك بە پێ دەکەوێتە سەریان بۆ ئەوەی شیـــلاوی ترێیـــەکـــە بە تەواوەتی دەرچێت و لە رێگـــەی کوڵـەکـەوە دەرژێتـە نێو ئەو مەنجەڵە تایبەتییەی کە لە سەر «کوگاکە» بۆ دۆشاو کوڵاندن ئامادەکراوە . . ئیتر دوای ئەوەی کرداری ترێ گوشینەکە تەواو دەبوو مەنجەڵەکەیان دەخستە سەر ئاگرو شیلاوە کەیان دەکوڵاند تاوەکو تەواو چڕ دەبووو پاشـــان دەبـوو بە دۆشـــاو ، ئینجـا سارد دەکـرایـەوەو لە نێـو کوپـەڵـەی تایبـەتی دەکـراو هەڵـدەگیـرا بۆ وەرزی زستـان، ترێی سپیش هەر دیسان بەم شێوەیە دۆشاوی لێ دروست دەکراو، دۆشاوەکەی وەکو هەنگوینی لێ دەهات، بەڵام ئەم جۆرە دۆشـــاوە لە هی ترێی ڕەش کەمتـرە، ئەویش لەبـەر ئەوەی ترێی سپی خۆی لە خۆیدا لە هی ڕەش کەمترە .

جگـــە لەم دوو جۆرەی کە لە پێشـــەوە باسـمـان کردن، جۆرە دۆشـــاوێکی تریش هەیـــە کە پێی دەڵێن دۆشـــاوی «چـــك چکـــە» کە بریتییـە لە دۆشـاوی باسکـراو، بەڵام جارێکی دیکە دەپاڵێورێو تنوك تنوك لە ئامێری پاڵاوتندا دەتکێتـــە خوارەو لە قاپێکـدا کۆدەکـرێتـەوە بەڵام ئەم جۆرە دۆشـاوە زۆر کەمـە، چونکـە مانـدووبـوونی زۆری دەوێ، رەنگی ئەم دۆشـــاوە زۆر زەردوخـــەست و جوانـــە، ئەگـەر یەکـێـــك چاك لە جۆری دۆشـــاو شارەزا نەبـێـت ئەوە بە هەنگوینی لە قەڵەم دەدا . .

لە کوردستـــانـــدا گەلێ ماڵی وا هەبـــوون و ئێستـایش هەن، هەمـــوو ساڵی کوپـەڵـە دۆشـاوێکی تایبـەتییـان بۆ

خواردنی خۆیان ئامادە دەکردو دەیان کردە نێو کوپەڵەیەکی جوان پاشان کولەکەیەکی جۆری «کودیحاجی» دەهێنن و ناوەکەی دەردەهێنن و ئەوەی تریشی کوز کوز دەکەن و دەیخەنە نێو کوپەڵەی دۆشاوەکەو پێی دەڵێن «بەلەچەك» کە شتێکی زۆر خۆش و بەلەزەتەو مرۆڤ هەرگیز لە خواردنی بێزار نابێت..

**● ئەرك و ماندووبوونێکی زۆر لە پێناوی ژیان و گوزەرانێکی چاکتردا ●**

خاوەن رەزو رەزەوانەکان لەگەڵ ئەوەشدا کەزۆر ماندوو دەبوون و باری ژیانیشیان هەر دیسان بێکەم و کورتی نەدەبوو، بەڵام ئەمانە هەمووی نەدەبوونە کۆسپ لە بەردەم پەروەردەکردنی رەزو، باغ و بێستانەکانیان و ئەنجامدانی کاروباری رۆژانەیان و، ئێشکگرتنیان بە دیار رەزەکانیانەوە بۆ ئەوەی بەرهەمی چاکتر وەدەست بێنن، بەڵکو زیاتر هانی دەدان بۆ ئەوەی زیاتر بایەخ بە دانانی رەزی تازە بدەن و شێوەیەکی باشتر خزمەتی بکەن لە تەك رەزە کۆنەکانیان کە بە درێژایی ساڵ لە چاوەدێری کردنی ساردنەدە بوونەوە، بەردەوام لەگەڵ پاك کردنەوەو تازەکردنەوەی پەرژین و چیلەو تانۆکەکانیاندا خەریك دەبوون و هەر کە لە بەرێکی هەبوایە بە پەلە چارەسەریان دەکرد، بۆ ئەوەی رەزەکەیان کۆر نەبێتەوەو نەمرێو لە دەستیان نەچێ..

سەرەڕای ئەو هەموو ماندووبوون و ئەرك و ئازارەی کە دەهاتە رێی کاسبکارو کرێکارو جووتیارەکان، کەچی لە ئەنجامی کارەکەیاندا سوودو دەست مایەیەکی ئەوتۆیان وەدەست نەدەکەوت بۆ دابین کردنی ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵەکانیان، بەڵکو بە ژیانێکی نەمرو نەژین رازی دەبوون و دەنگیان نەدەکرد...

گەر نەختێ بۆ دواوە بگەڕێینەوەو سەرنجێکی خێرای ژیان و گوزەرانی ئەوسای ئەو هەژارانە بدەین، بە ئاشکرا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە چ ژیانێکی ناخۆش و پڕ مەرگە ساتی دەژیان، ئەو جل و بەرگەی دەیان پۆشی زیاتر لە تابلۆیەکی رەنگاو رەنگاو رەنگی دەکرد چونکە لە هەموو لایەکەوە بە پینەو پەڕۆ رازێنرابۆوە، دەست کورتیو هەژاری وای لێکردبوون کە شەوو رۆژ کاربکەن و نەوەستن، کە چی هەر دیسان پێ رانەدەگەیشتن و رۆژێ تێرو دە رۆژ برسی دەبوون، تەنانەت فرۆشتن و ئاڵ و گۆڕکردنی بەرهەمی ترێو دۆشاوو مێوژیش کارێکی هێجگار بە ئەزیەت و ئازارو سەخت بوو، ئەمانەی باسمان کردن هەمووی بارێکی گران بوون بە سەر شانی ئەو هەژارو چەوساوانەی ژیانیان بەسترابووەوە بە رەزوباخ و بە زەویو کرێکاریی لای ئەم و ئەو.. بە پێچەوانەی سەردەمی تازەمان کە ژیان و باری گوزەران تارادەیەکی چاك گۆڕانکاریەکی بە خۆیەوە دیووەو، زۆر ئەرك و فرمانێ کە ئەوسا زۆر بە ئەزیەت و بە قورسی ئەنجام دەدرا ئیمرۆ ئەنجامدانی لە چەند دەقیقەیەك رەت ناکات، ئەو بەرهەم و کەلوپەلەی جاران رەزەوانەکان بە رۆژو دوو رۆژ دەیانگەیاندە بازارو دیهاتەکان بۆ فروشتن و ساغ کردنەوە ئێستا بە چەند سەعاتێك دەگاتە ئەو شوێنانەی ئەوساو بە پارەیەکی چاکتر دەفرۆشرێت و زووتر ساغ دەبێتەوە ئەمە سەرەڕای کردنەوەی چەندین کارگەی پیشەسازی لە ناوچەکانی وولاتدا، لە پێشەوەی هەموویشیان بە نیسبەت رەزەوانەکان، کارگەی لە قوتوکردنی میوەجات.

هەر ئەوەیش وای کردووە کە ئیمرۆ ترێ بایەخێکی زۆری پێبدرێ نەك هەر لە وولاتی خۆماندا بەڵکو لە هەموو جهاندا.

ئێستا رەزەوان وەکو رابردوو بە دەست فرۆشتن و گەیاندنە بازاری «ترێ»وە ماندوو نابێت، بەڵکو گەلێ جاری وا هەیە بەرهەمەکەی خۆی هەر لە نێو رەزەکەیدا دەفرۆشێتەوەو سوودێکی باشی وەدەست دەکەوێ..

هەڵبەتە هەموومان ئەوە دەزانین کە ترێ سامانێکی بە نرخە و وا پێویست دەکا زیاتر بایەخی پێبدرێو ئەو رەزو

باخـانـەی کە لە زۆر ناوچـەی وولاتـدا بڵاوبـوونەتەوە زیاتر دەست بە باڵی خاوەنـەکـانیـانـەوە بگیرێت، بۆ ئەوەی ڕێو شوێنی تازەیان فێربکرێت و لە ڕووی بەرەوپێشەوە چوونی کرداری پەروەردەو ناشتنـەوە ئاگـادار بکـرێنـەوەو فێـری ئەوە بکـرێـن کە ڕەزی دەسـت چێـن زۆر لە ڕەزی خۆرســك چاکترەو بە سوودترەو بەرهەمەکەیشی باشتر دەبێت..

هەوڵ بدرێ زیاتر لە تاقیکردنەوەی وولاتانی پێشکەوتوو لە بواری پەروەردەکـردنـی ترێو مێـوەجـاتــدا ئاگـــادار بکـرێنـــەوە.. ئیمـــرۆ ترێ جگـــە لەوەی کە قازانجێکی ئابـووری هەیـە بۆ وولات لە هەمـان کاتیشـدا خەریکـە لە مەیــدانی چارەســەری نەخـۆشی و تەنـدروستیشـدا سوودی لێوەردەگیـرێت، ئەوەتـا ئەم دوو شارەزایـە «دکتـۆر کارلیەو دکتۆر ماکفان» بە دوورو درێژی لە کتێبی «خواردن نەوەك دەرمـان ـ الغـذاء لا الـدواء» کە دکتـۆر «صبـری القبانی» دایناوە لە لاپەرە «68 ـ 72» لە ووتارێکیاندا پەنجە بۆ ئەو دەورە گرینگەی ترێ ڕادەکێشن لە بواری چارەسەرکردنی نەخۆشیدا..

ئەمـــەی لە سەرەوە لە بارەی ترێوە روونـــم کردەوە کورتەیەکی زۆر کورتی بایەخ و گرینگی ئەو مێوەیەیە کەلە زوربـەی ناوچـەکـانی کوردستـانـدا هەبووەو هەیە هیوادارم توانیبێتم بەشێکی زۆری ئەو کارو کردارە کەلـەپـووریـانـە روون بکـەمـەوە کە لە کوردەواریـداو لە مەیـدانی وەبەرهەم هێنـانی ترێو بەرهـەمەکانی ترێدا باوبوون و ڕەزەوانەکانی ئەوسا زۆر بە تەنگییەوە بوون وئیمڕۆ بەرەو نەمان دەچن و لە بیر دەچنەوە..

● فەرهەنگۆك ●

● بۆڵی: دەنکی هێشووە ترێ، بۆڵ.

● قۆرت: چاڵی بچووك.

● چیلە، تانۆك: پەرژینێکە بۆ سنوور دیاریکردنی ڕەزو باخ دادەنرێت..

● شوورك: لقە داری شلك و باریکە.

● تخووب: سنوور ـ زیاتر بۆ سنووری زەویو ڕەزبەکاردێت.

● باوی: بادام

● پەسیرە: بەرسیلە.

●ئەستوون یائەستوندەك دارێکی ئەستووری دوو-گوێیە، چەڵمە.

● قیسپ: دارێکی ڕێکو باریکە..

● سەوی، قەرتاڵە: دوو ئامێری گوێزانەوەی ترێو مێوەجاتن لە شوورکە دار دروست دەکرێت..

● کەنــدوو: لە شێـوەی بەرمیلێکی گەورەیــەو لە قوڕی سوور دروست دەکـرێت و دانـەوێڵەو میـوەجاتی ووشکراوەی تێدەکرێ ..لـەقـامیشی تەڵـزم تەڵـەزم کراویش دروست دەکـرێو بە قوڕ سواغ دەدرێ.

● هەمبانە: پێستی بزن و مەڕی کوژراوەیە، بەڵام پێستەکە بە ساغی ماوەتەوە واتە هەڵ نەبراوە، بەڵکو دوای کوشتنەوەی بزنەکە یان.مەڕەکە، پێستەکە غاراوەو گۆشتەکەی لێ دەرهێنراوە.

● هیزە: ئەمیشیان هەر لە پێستی مەڕو بزن دروست دەکرێت بەڵام لە هەمبانە نەرمترە ،ڕۆن و پەنیرو دۆشاوی تێدەکرێ..

● خرار: گونیەیەکە لە مووی بزن دروست دەکرێت.

● ڕاوەك: کیسەیەکە لە شاڵی ڕانکوچۆغە دروست دەکرێت..

● سەرچاوەکان ●

1 ـ کۆمەڵ زانیارییەکی تایبەتی خۆم لە بارەی ئەم باسە،

لە ئەنجامی ژیانم لە ناوچانەی کە بەم مێوەیە ناساراون و سەرەرای سوود وەرگرتن لەو کە سانەی کە لەم بوارەدا شارەزان..

2 ـ تەورات و چەند ئەفسانەیەکی کۆن کە لە بارەی ترێوە دەوێن.

3 ـ پیرەمێردی نەمر ـ محمد رسول ـ هاوار ـ لاپەرە «274».

4 ـ هەمان سەرچاوە لاپەرە «276».

5 ـ الغذاء لا الدواء ـ صبري القباني ـ ص 68 ـ 72

# هونەری شێوەکارو

# کوردەواری

نووسینی

● حسام حەکیم ●

## ١- هونەری شێوەکاری ئاینی

بێ گومان دواکەوتن لە هەر بوارێکدا، دەگەرێتەوە بۆ چەند هۆیەك، لێرەدا دەمانەوێ ئاورێك لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم بدەینەوەو بە کورتی هۆکانی دواکەوتنی چەند لایەنێکی هونەری شێوەکار[1] لە ناو کوردەواریدا دەست نیشان بکەین. . دەروانین هونەری خانووکاری (المعمار) نەخش سازی: (الزخرفة)، گۆزەکاری (الفخار، السیرامیك) وەکو نیگارکێشان و پەیکەرسازی پشت گوێ نەخرابوون. . . (ئەگەر ئاور بدەینەوە بۆ سەدەی رابوردوو یاخود سەرەتای ئەم سەدەیە. . لەو بڕوایەدام کە تابلۆیەك یان پەیکەرێکی ئەو سەردەمەمان بەرچاو ناکەوێت - هیچ دووریش نی یە کە هەبوووبێت. . هەر چەندە درێغیم نەکردووە لە گەڕان و وردبوونەوە بە دوای شوێنەوارێك لەو بابەتە - بۆ نموونە لە سەر دیوارەکانی شوێنی خەڵوەت کێشان لە ناو تەکیەی تەوێڵەدا[2]. نیگاری کۆمەڵێ بولبول دروست کراوە، کە وردەکاریەکی زۆری پێوە دیارە، ئەوەش کارامەیی و دەست رەنگینی ئەو هونەرمەندە دەسەلمێنێ کە دروستی کردوون. . لە لایەکی ترەوەو جێگای سەرسوورمانە، لە سەر دیواری جێگایەکی ئاینی دروست کراوون، بەڵام بە داخەوە لە پاشان زۆربەی بەشەکانی نیگارەکان شێوێندراون بە بڕینی ملی بولبولەکانی، بە بیانووی ئەوەی کە نیگارکێشان لە ئیسلامدا قەدەغەیە[3]. . . هەروەها دەتوانین نموونەیەکی زۆر بهێنینەوە لە سەر هونەری خانوکاری و نەخش سازی لە کوردستاندا، کە بایەخ و جیاکەرەوەی و (مۆرکی) تایبەتی کوردەواری پێوەدیارە.

بە ڕاستی تا ئێستا شتێکی ئەوتۆ لە بارەی هونەری شێوەکارەوە لە نێو کوردەواریدا نەنوسراوە. . جاروبار ووتاری وەرگێراومان بەرچاوو دەکەوێت دەربارەی هونەرمەندانی جیهان وەکو ڤان کوخ و مایکل ئەنجیلۆو دیلاکرواو. . . هتد. . بەڵام ئەوەی دەربارەی واقیعی ئێستاو رابوردووی هونەری شێوەکار نوسرابێت ژمارەیان لە پەنجەی دەست تێ ناپەڕێت. . ئەوەی شایانی باسە کاك (عبدالرقیب یوسف) هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری داوە بۆ ڕۆشنایی خستنە سەر هونەری خانووکاری و نەخش سازی لە کوردستاندا[4] هەروەها لە توێی گۆڤاری بەیان و ڕۆشنبیری نوێ و کاروان و هونەرە جوانەکاندا، چەند گووتارو کورتەباس و ریپۆرتاژێك لە بارەی هونەری شێوەکارەوە بڵاوکراوەتەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمانە دەتوانین بڵێین ئەو لایەنەی هونەر پشت گوێ خراوەو هیچی



ئەوتۆی لە بارەوە نەنوسراوە . .

لێرەدا ئەوەی مەبەستمانە . . هۆکانی دواکەوتنی هونەری نیگارکێشان و پەیکەرسازییە لە رابووردودا . . ئەمە ئەگەر وەکو پرسیارێك ئاراستەی هەر کەسێك بکرێت دوور نی یە وەڵاممان بداتەوەو ئەو لایەنەمان بەرچاو بخات کە ئایینی ئیسلام رێگای نەداوە بە دروست کردنی شێوەی ئادەمیزاد، یاخود هەڵواسینی تابلۆیا وێنە لە ناوماڵاندا . . ڕاستە تا ئێستاش کەسانێك بڕوایان وەهایە کە ئایینی ئیسلام بە هیچ شێوەیەك رێگای نەداوە بە تابلۆکێشان و پەیکەرسازی . . دیارە لە رابووردودا ئەم بۆچوونە زۆر بە خەستی پەیڕەو دەکرا، بەڵام ئایا تا چ رادەیەك، ڕاستە کە ئایینی ئیسلام بواری پێ نەداوە؟ . . . هەروەها هۆی ئەو قەدەغەکردنە چی بووە؟ . . . (پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە، با لە خۆمان بپرسین ئایا پێویست بە لێکۆڵینەوەو خۆماندووکردن دەکا؟ . . یاخود ئایا بابەتەکە شایانی ئەوەیە کەشتێکی لە بارەوە بنوسرێت؟ لە کاتێکدا ئەم



بۆچوون و ڕایانە رۆڵیان بە سەر چووەو . . ماڵیش نی یە وێنەیەکی تیادا هەڵنەواسرابێت و، هەروەها وێنەکێشان وەدو وانەیەك لە قوتابخانەکاندا دەوترێتەوەو جگەلەوە پەیمانگاو ئەکادیمیای تایبەتیش هەیە بۆ ئەو مەبەستەو کەسانێکی زۆریش رێگای هونەریان گرتۆتەبەر . . بەڵام ئەوەی مەبەستمانە ئەو کۆسپ و تەگەرانەیە کە لە رابوردوودا بواریان نەداوە بە هونەر تاوەکو سەرهەڵ بداو پەرەبسێنێت، لە کاتێکدا هونەر لە وڵاتانی ئەوروپادا وپێش ئەوروپاش بە چەند هەزار ساڵێك لە: میسۆپۆتامیاو میسرو گرێك وچین دا . . . ئەو پەڕی پێشکەوتنی وەدەست هێنابوو . . . ڕاستە چەند کاریگەرو هۆیەك زەمینەیان بۆ خۆش دەکردو دەبوون بە پاڵنەرو هاندەر . . وەکو فەلسەفەی ئایینی ئەوساو ئەفسانەو میثۆلۆژ یا لەپاڵ کڵێساو . . هەڵوێستی ئایینی عیسایی بەرانبەر هونەر بە گشتی و هونەری شێوەکار بە تایبەتی، هەروەها پێشکەوتنی زانست و فەلسەفەو ئەدەب و داهێنانی جۆراو جۆرو گۆڕانە

کۆمەڵایەتیەکان.. ئەمانە تێکرا کاریان کردە سەر واقیعی هونەر.. جا گەڕان بە دوای هۆیەکانی دواکەوتنمان خۆماندووکردنێکی بێ هودە نی یە.. بەڵکو زۆر پێویستە ئەو هۆیانە دەست نیشان بکرێن کە بووبوون بە بەربەست لە رێگای پێشکەوتنی گەلەمان، ئەمەش مانای ئەوە نابەخشێت کە بە هیچ شێوەیەك باسی ئەو هۆیانە نەکراوە)..

بۆ ئەوەی پتر رۆشنایی بخەینە سەر ئەولایەنە، دەگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی کێشەکە..

لە هەندێ کتێب وگۆڤاردا، پەنجە بۆ ئەو کێشەیە راکێشراوەو زۆربەی بۆچوونەکانیش لە چەند خاڵێکدا یەك دەگرنەوە.. لەوانە (د. زکی محمد حسین) لەو بارەیەوە نووسیویەتی: (لە قورئاندا شتێکی نەوتۆ نەهاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی وێنەکێشانی زیندەوەر، هەرچەندە ئەو قەدەغەکردنە پەیوەندی بە هەندێ ئایەتەوە هەیە کە وێنەکێشان، دەگێڕنەوە بۆ خوا)[5] هەروەها (دیارە بنچینەی رێگانەدان بە وێنەکێشان، لە ئیسلامدا، ترس بووە، لە گەڕانەوە بەرەو بت پەرستی یاخود لاسایی کردنەوەی خوا)[6]

هەر لەو بارەیەوە (نعمت اسماعیل علام) نووسیویەتی: (رایەکی چەسپاو هەبوو، کە گوایە قورئان وێنەکێشانی ئادەمیزاد و زیندەوەری قەدەغە کردبێت، بەڵام بە لێکۆڵینەوە سەلمێنرا کە قورئان قەدەغەی نەکردووە، بەڵکو دوور نی یە تەنیا لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا هاتبێت. برێ لەو فەرموودانە کە دەیان گێڕنەوە بۆ پێغەمبەر، رێگا نادەن بە وێنەکێشان یاخود پەیکەر دروست کردن بۆ گیانەوەر، وا دیارە ئەم بیروباوەڕانە لە لای ئەو پیاوە ئایینیانەوە وەدەرکەوت کە فەرموودەکانیان کۆکردەوە لە سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچی، ئەو قەدەغەکردنەش لە لایەن پێغەمبەرەوە.. بۆپاراستنی موسڵمانان بووە لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا تاوەکو نەگەڕێنەوە بۆ بت پەرستی)[7].. جگە لەمانە دەروانین (ریتشارد ئیتنگهاوزن) زۆر بە ووردی ئەم کێشەیەی روون کردۆتەوەو نووسیویەتی: (لە قورئاندا ئەم قەدەغەکردنە راستەوخۆ دەست نیشان نەکراوە، تەنانەت لە زۆربەی ئاراستەکردنەکانیدا دژی هەندێ رەفتاری بت پەرستی دەدوێ لەوانە بە کارهێنانی وێنە.. وەها دەردەکەوێ کە ئەو وێنانە ئاکارێکی ئاینیان هەبووبێت، بۆیە وەکو بت، باس کراون لە ـ سوورەتی پێنج، ئایەتی 92دا،[8] هەرچۆنێك بێت ئەم بۆچوونە دژانەیە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا دەردەکەوێت)[9]...

ناتوانین بڵێین، ئەو سەردەمانەی، کە ئەو بیروڕایەی تیادا باوبووە، بە هیچ شێوەیەك ئەو هونەرە بواری بۆ نەڕەخساوە کەم یان زۆر دیاربکەوێت، سەرەڕای ئەو هەموو تەقەلایەی، کە لە لایەن پیاوانی ئایینیەوە دەدرا بۆ ئەوەی هونەری قەدەغەکراو سەرهەڵنەدات.. ئیتر هەریەکەیان لە ئاستی خۆیەوە، چ ئاکارێکی ناپەسندی بە خیاڵدا بهاتایە دەیاندایە پاڵ نیگارکێش و پەیکەرتاشی بەستەزمان، بە رادەیەك وەهایان لە موسڵمان کردبوو کە بە هیچ کلۆجێك رێگا نەدەن بە وێنەیەك یاخود پەیکەرێك (خوانە خواستە) لە ماڵەکانیاندا ببینرێت!!!

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیان توانیوە بە تەواوی دەست بخەنە بنەقاقای هونەری ناوبراو بە یەکجاری بیخنکێنن.. بەڵکو جارو بار پەل وپۆیەکی کردووەو.. لە سەر دیواری گەرماوێك[10] یاخود لە توێی دەستنووسێکدا (مخطوطة) بینراوە، لەو بارەیەوە (ئیتنگهاوزن) نووسیویەتی: (هۆشمەندیەکی سەربەخۆترو بایەخ دان دەربارەی وێنە دەرنەکەوت، تا دوو سەد ساڵ پاش پێغەمبەر)..[11]

بگەڕێینەوە سەر باسی هونەری ناوبراو لە ناو کوردەواریدا، بێگومان هەمان بیروباوەڕ رەگی خۆی داکوتابوو.. هونەرمەندانی کوردیش وەکو هەموو گەلانی موسڵمان پەنایان دەبردە بەر نەخش سازی وجوانیی داماڵێنراو (المجرّد)، بە واتایەکی تر خۆیان لە نیگارکێشانی ئادەمیزادو ئاژەڵ دوور دەخستەوە (دیارە کە باری یاسایی، بواری نەدەدا بە نیگارکێش، لە بەر ئەوە توانای هونەری بە شێوەیەکی گشتی رووەو جوان نووسی و نەخش سازی رووەکی و ئەندازەیی

ئاراستە دەکرد، کە ئەوەش لە واقیعدا ئاکارێکی جیاکەرەوەی هونەری ئیسلامی یە)[12] . . ئەگەر چاوبگێڕین بە ناو کەلەپووری نەخش سازیو خانووکاری گەلەکەماندا، زۆر پارچە نەخشی جوان و رەنگین و ئاوێنەبەندی رازاوەمان بەرچاو دەکەوێت، لە کۆشك و تەلارو مزگەوتی شارەکانی کوردستاندا[13] . . دەڕوانین (تۆمابوا)ش سەرپێی ی لەو بارەیەوە دواوەو دەڵێ : ـ (لەم مەیدانەدا شاری ـ بوندقیە ـ ئاوەدان بوو بووەوە بە کارگەی تایبەتی کە پارچە زەخرەفەی زۆریان تیا ئەکێشان، ئەمەیش لە سەدەی پانزەهەمدا بووە کە لە سەر هەندێ پارچە، ئیمزای کوردێکیان دۆزیوەتەوە کە ناوی مەحموود بووە)[14] . . هەروەها دەڵێ : کوردەکان (زۆر شارەزابوون لە هونەری نیگارکێشی سەر مشتووی خەنجەرو بازن و پاوانەی زیودا)[15] . . . هەر لە بارەی هونەری ناوبراوەوە لە نێو کوردەواریدا (ئیتنگهاوزن) باسی چەند دەستنوسێك (مخطوطة)[16] دەکات، کە لە نێوان سەدەی یانزەم و دوانزەم دا وەبەرهەم هێنراوون، یەکێکیان لە دیاربەکرو[17] ئەوی تریان لە شاری ماردین[18] هەروەها کوردستانی خوارەوو، دەست نیشان دەکاو دەڵێ : (تا ئێستا چوار مەڵبەندمان بۆڕوون بوتەوە کە وێنەی تویێ ئەو دەستنووسانەیان تیادا کێشراوە، وەکو سورياو باکووری عێراق ناوەڕاست و خوارووی عێراق، هەروەها ئیسپانیاو مەراکیش)[19] . . .

## پەراوێزەکان : ـ

(1) ـ زۆر جار ووشەی (پلاستیك)بە کارهێنراوە، یاخود ووشەی (التشكيلي)، بەڵام ووشەی شێوەکاریش تا ڕادەیەك نزیکە لە مەبەستەوەو لە یەك دوو نوسیندا بەرچاووم کەوتووە . . .

(2) ـ تەکیەی . ناوبراو لە ساڵی 1867ـ1868ـز ـ دروست کراوەو لە ڕووی نەخش سازیو خانووکاریو نیگارەوە توانایەکی هونەری بەرزی تیادا بەکارهێنراوە بروانە پەراوێزی ژمارە ـ 3 ـ

(3) ـ گۆڤاری کاروان ـ ژمارە (7) ـ نیسانی 1983 ـ لاپەرە 125/126

(4) ـ دوو کورتە باسی لەو بارەیەوە بڵاوکردوتەوە ، یەکەمیان لە ژێر ناونیشانی (شێوەی کەلەگی لە هونەری ئاوەدان کردنەوەی کوردیدا ) ـ گۆڤاری کاروان ژمارە (2)ـ 1982 ـ لاپەرە / 16 ، دووەمیان (شێوازی خانووکاریو نەخش سازی لە تەوێڵە ـ بە عەرەبی ـ ) گۆڤاری کاروان ـ ژمارە (7) / 1983 لاپەرە / 123 .

(5) مجلة (الرواق)، العدد (15) / 1984 ـ وزارة الثقافة والاعلام ـ بغداد/ ص4

(6) هەمان سەرچاوە

(7) كتاب (فنون الشرق الاوسط الاسلامية ) ـ تاليف / نعمت اسماعيل علام ـ دار المعارف بمصر سنة 1974

(8) سوورەتی پێنج لە قورئاندا (الانعام )ەو ئایەتی 92 لەو سوورەتەدا دەڵێ : ـ
(ومن اظلم ممن افترى على الله كذباً ، وقال اوحي ولم يوح اليه بشئ، ومن قال سانزل مثل ماانزل الله )

(9) ـ كتاب (فن التصوير عند العرب )ـ تاليف ـ ريتشارد اتنغهاوزن ـ ترجمة / الدكتور عيسىٰ سلمان وسليم طه ـ وزارة الاعلام ـ بغداد / 1974

(10) ـ لە سەردەمی ئەمەویەکاندا نیگاری مرۆڤ یاخود ئاژەڵیان لە سەر دیواری گەرماوەکاندا دروست کردووە [بروانە پەراوێزی ژمارە (7)].

(11) ـ بروانە پەراوێزی ژمارە ـ 9 ـ

(12) ـ هەمان سەرچاوە.

(13) ـ بروانە پەراوێزی ژمارە ـ 4 ـ



(14) ـ كتێبی (ژیانی كوردەواری) ـ دانـانی (تۆمابوا) ـ وەرگێـرانی ـ حەمـە سەعیـد حەمـە كەریم / دەزگـای ڕوشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی 1980 .

(15) هەمان سەرچاوە .

(16) ـ لە توێی هەر یەكێ لەو دەستنـووسـانـە، چەنـد نیگـارێـك كێشـراوەو، هەندێكیان بۆ ڕوون كردنەوەیە ـ بڕوانـە پەراوێـزی ژمارە (9) ـ كە بە عەرەبی پێی دەڵێن (منمنمــە) یاخــود وشــەیـەكی لاتینی كە لە ئاستێكی جیهانی ناسراوە واتە (مینیاتور) .

(17) ـ دەربـارەی فێڵەمیكـانیكیـەكـانی (الجـزری) ـ هەمان سەرچاوە لاپەرە / 162 .

(18) ـ كتێبێكی ئایینی‌یـە بە ناونیشانی (ئینجیلی مناڵی‌ی عیسا) كە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1299 ـ ز ـ لە كتێبخانەی (لــورنسیـان)ی شاری (فلورەنس) پارێزراوە ـ هەمـان سەرچاوە لاپەڕە ـ 162 ـ

(19) ـ هەمان سەرچاوە لاپەرە / 161 .

# مۆسیقاو پێوەندی بە شانۆوە



ڕزگار کریم

ئەکادیمیای هونەرە
جوانەکان ـ بەغدا

★ پێشەکی:

1 ـ کورتەیەکی مێژوویی پەیوەندی مۆسیقاو شانۆ.
2 ـ مۆسیقاو گرنگی مەوداو بەهاکانی لە شانۆدا.
3 ـ جۆرەکانی شانۆی مۆسیقی‌و چەند دەقێکی کوردی.

«لە دەرهێنانی شانۆیی‌یەکی مۆسیقی‌دا
چێژێکی زیاتر وەردەگرم وەك لە
دەرهێنانی شێوەکانی تردا».
«پیتەر برۆك»

## پێشەکی: -

کە دەڵێین شانۆی مۆسیقی مەبەست لە پەیوەندی مۆسیقاو شانۆیە بە هەموو جۆرەکانی لە بەکارهێنانی ئەکادیمیەوە لە ئۆپێراو شانۆی بەگۆرانی و ئۆپەرێت و شانۆی ئیستیعرازی و شانۆی گۆرانی میللی و مۆسیقای بەرجەستەیی «تصویری» لە شانۆی درامی رووت دا. مۆسیقا لەرەوتی مێژوودا گیانی شانۆ بووە ئەم دوو لایەنە «لای هێندێك دەرهێنەرو قوتابخانە نەبێت» یەکتریان لە ئامێز گرتووە.

چۆن نووسەرێکی درامی کاراکتەرەکانی نەخش دەکات، ئاواش دەبێت دەرهێنەر مۆسیقای دیالۆژەکان و باری دەروونی گشتی بۆ بینەرەکەی بەووریاییەوە لەگەڵ هەڵچوونەکانی کاراکتەرەکاندا بنەخشێنێ، لە ئەنجامی ژیانەوەی هەست و سۆزو بیری ئەو ئەکتەرو بینەرەدا. چونکە «کاریگەری مۆسیقا بۆ مێشك وەك کاری ئەو دەرمانە چاکانەیە بۆ لەش».

سترو کۆفسکی وتەنی: - «مۆسیقا زمانێکی بەر بلاوی هەموو مرۆڤێکە چ پیاو بێ یا ژن یا منالْ...» لەبەر ئەوەی زمانێکی یەکگرتووە وەك هەست و سۆز ئەمە هۆنراوە نیە تاکو لە زمانی گەلانی تر نەگەین بەڵکو وەك نۆتەو خوێندنی ئەکادیمی زمانێکی جیهانی وەرگیراوە، (داروین) دەڵێت: - «مۆسیقا پەیوەستی نێوان بەهێزترین مەشاعیرو خۆشەویستییە».

کەواتە پێویستە لە شانۆییەکاندا رێچکەی هەڵچوون ی دەروونی و فیکری بینەرو ئەکتەر بگرن و لێی جیانەبنەوە.

(بیتهۆڤن) وتەنی: - «زنجیرەیەکی پەیوەستی نێوان ژیانی هەستە بە ژیانی رۆحەوە». واتە پەیوەندی ژیانی ناوەوەیە بەژیانی دەرەوە، جا لەبارو شوێنی پێویستدا بەکارهێنانی لە دیمەنەکانی شانۆدا کارێکی پێویستە بەمەرجێك مۆنتاژێکی پچر پچری چەند جۆرێك مۆسیقا نەبێت، بە نەزانیەوەو بەکارهێنانی بۆ شوێنە ناپێویستەکان، کە دەرهێنەرێك دێت بەگوێرەی هەستی خۆی پارچە مۆسیقا لەم سیمفۆنیەو لەو گۆرانی ئاینی و عاطفی و لەو ئۆپەرێتەوە دەبڕێت و لەکاسێتێکدا مۆنتاژی دەکات. (شۆبنهادەر) دەڵێت: - (مۆسیقا زمانی هەستەو وشەکانیش زمانیٔ هۆشن) واتە: دیالۆژەکانی کاراکتەرە دراماییەکان کە زادەی بیری نووسەرەکەن یا مۆسیقایەکی وەهای بۆ بەکار بهێنرێت لەلایەن دەرهێنەرەوە کە بەهای هەست و سۆزو هۆشی لای بینەر وون نەکات!!

بەڵام بەداخەوە لەبری ئەوەی نەخشە کێشی مۆسیقاو کاریگەرییە دەنگییەکان هونەرمەندێکی مۆسیقی ئامادەی بکات، هەروەك چۆن لە شانۆی گەلانی ئەورووپادا مۆسیقای نوێی بۆ دائەنرێت، دەبینین زۆربەی هونەرمەندەکان خۆیان پارچە مۆسیقای نامۆ لەگەڵ دیمەنەکاندا هەڵئەبژێرن، بەهەمان شێوە برا مۆسیقییە کانیشمان ئەوانەی ئارەزووی ئامادەکردنی مۆسیقا لە شانۆی کوردیدا دەکەن، دەبێت و پێویستە ژمارەیەکی زۆر لە دراماو ئەدەبی شانۆیی بخوێنێتەوەو چێژی لێ وەربگرن!!

هەروەك چۆن دەرهێنەرێك چەشەی مۆسیقی نەبێت و پارچە مۆسیقایەك مۆنتاژ بکات بەتاوان دەدرێتە قەڵەم ئاواش تاوانە مۆسیقییەکی کەم شارەزا بە شانۆو دراما پارچە مۆسیقییەکان ئامادە بکات. جا بۆیە ئەو شانۆیە ئەکادیمی و داهێنەر دەبێت کە، نەخشەکێشی مۆسیقاو سەماو جل و بەرگ و ماکێری خۆی هەبێت بەیارمەتی لێکۆڵینەوەکانی دەرهێنەر!!

★ ★ ★

### 1 - کورتەیەکی مێژوویی پەیوەندی مۆسیقاو شانۆ: -

بەر لە چەند هەزار ساڵێك شانۆ مۆسیقای لەئامێز گرتووەو شارستانی کۆنیش شاهێدی ئەوەیە، کە نواندن و گۆرانی لەگەڵ چەند ئامێرێکی فۆلکلۆری ئەو گەلانەدا پێکەوە، جۆرێك لە شانۆییان دەهێنایە بەرهەم، لەرۆژهەڵاتی دوورداو لە چینی کۆنداو لای هیندۆسەکان لەگەڵ چیرۆك و ئەفسانەکان و داستان و نواندنی نێو لادێ و مەڵبەندە (ئاینییەکانی بوذا)دا ئامێری مۆسیقا لەگەڵ طقوسەکان دا بەکار هاتووە. پاشان «یۆنانی» بەر لە «500 - 600 پ. ز»یش دەبینین ئەو شانۆییە تەراژیدی و کۆمیکی و طقوسە ئاینییە [وەسەنیانە] بە زمانی هۆنراوە

نووسراون لەلایەن هۆمیرۆس و هزیودو ئەسخیلۆس و سۆفۆکل و یوریپدس و ئەرستوفانیس و میناندەرو. . . هتد

پاشان لەگەڵ ئامێری مۆسیقیدا شانۆ یۆنانی یەکان کۆرسێکی بەکار دەهێنا، تەنانەت هەندێك کاراکتەر بەشێوەی گۆرانی تەمسیل دەکرا کە ئامێرێکی مۆسیقی لەگەڵیدا دەڕۆشت، بۆ وێنە شانۆی گریکی بە سەرەتای پەرەسەندنی هونەرو مۆسیقای تایبەت بە گەشەی مێژوویی «ئۆپێرا» دادەندرێت پاشان زۆر سەرچاوە دەڵێن کە: ـ

ئەسکیلۆس نەخشەکێشی سەمابووەو سوفوکلیس مۆسیقاژەن و سەماکەر بووەو مناڵ بووە کە لە کۆرسی سوپای یۆناندا مۆسیقای بۆ شەرەکەی تەروادە لێداوە، یۆرپیدسیش گۆرانی بێژ بووە، تەنانەت جۆری ئیداکردن و ووتنی دیالۆژەکانی فێری ئەکتەرەکان دەکرد. لەگەڵ ئەوەش دا گەلێ فەیلەسوفی یۆنانی بیردۆزو باری سەرنجیان دەربارەی مۆسیقا هەبووە لەوانە «فیثاغورس» و «ئەفلاطون» ئەگەر بروانینە سەدەکانی ناوەراست، شانۆ رووی لە یاریگاکان و مەیخانەکانی رۆمان کردو کەوتە ناو کڵێشەکانەوەو مۆسیقاش وەك هاوەڵێکی گرنگی شانۆ لەگەڵ شانۆیی و ئیستعرازە پاڵەوانبازی‌یەکانی دیلارتەو جەژنە ئایینی‌یەکان دا هات تا لەسەر دەمی بوژانەوەدا جۆرێکی گرنگی لە شانۆی موسیقی لەئیتالیادا بەناوی «هونەری ئۆپێرا» وە هێنایەکایەوە.

بەڵام لەهەمان کات دا ناوی ئۆپێرا دەگەرێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی حەڤدە هەم کە بەجۆرێکی هونەری موسیقی ئەوترا کە سیستەمێکی لە ئامێز گرتبوو وەك بناغە مۆسیقی‌یەکان و نواندنی درامی و رێچکەو ئوسلوبی پێشکەشکردن و رێکخستنی شانۆو رووناکی و گەلێ ئیشی هونەری تر.

کە لەمیشەوە «میلۆدراما»و «ئیستیعرازی میللی»و «شانۆی بە گۆرانی میللی»و «ئۆپەرێت» بە شێوە شیعری بەیاریدەی مۆسیقا هاتنە کایەوە.

یەکەم ئۆپێرا لە ماڵەکەی «میرباردی»دا لەساڵی 1597 لە شاری «فلۆرەنسە» پێشکەش کرا.

ئەم ئۆپێرایە لە ئەفسانەیەکی یۆنانی‌یەوە، ئامادەکرا بوو بە ناوی «دانتە»، وە «چاکوب»ی موسیقی ئاوازەکەی داناو دەقەکەش «ئۆتا فیو رینوسینی» نووسیبوی.

ئۆپێرای دووەم لەساڵی 1600دا پێشکەش کرا، کە ئەم دەقەش لە ئەفسانەیەکی یونانی‌یەوە بە ناوی «ئۆریدیسا»وە ئامادە کرا، دەقە شیعری‌یەکەش «رینوسینی» نووسی‌و «یردی»و «گالیو کاسینی» پێکەوە ئاوازە کەیان دانابوو.

بێ‌گومان ئەم ئۆپێرایانە بۆ چینی ئەرستوکرات پێشکە شکران و بەشێوەیەکی ئاسان وەر نەدە گیران لە گۆرانی کۆراڵ و رەمزدا جا بۆیە پەنایان بردە بەر ئاوازی درامی دیالۆژی وەك «ئیلقای بەگۆرانی»و «دیالۆژە گۆرانی» کە پێك هاتوویەکی مۆسیقی زۆر بەرز بوون لە «کۆنترا پونیت» پێش داهێنانی «هارمۆنیا». پاش ئەم گۆرانکاری‌یە لە ئیستاتیکای ئاوازو نواندنی دەنگی‌دا، چەند ناوێك بەسەر ئۆپێرادا، دابرا وەك «ئۆپێرای چەشنی وەسپ»و «مۆنۆدیا»و «میلۆ دراما»و «دیالۆژە مۆسیقی» هەروەك چۆن دراما بە تەراژیدیاو کۆمیدیا لە شانۆدا هاتنەکایەوە، بەم هەموو جۆرانەش «ئۆپێرا» لە دایك بوو.

نامانەوێت لێرەدا بچینە ناخی مێژووی گەشەی ئۆپێرادا تەنیا شتێکی گرنگ هەیە کە ئۆپێرا دوو گیانی لە ئامێز گرتووە ئەویش «نواندن و ئاوازە»، «جوڵاندنەو دەربرینی دەنگە» واتە هارمۆنیەکی بەتینی نێوان «شانۆ» و «مۆسیقایە» بە هەموو بنەماو بەها ئیستاتیکی یەکانیانەوە چونکە ئەم مێژووە پەیوەستە وای کردووە کە چەندە های وەك «ستانسلافسکی»و «گۆردن گریك»و «فاگنەر»و «ئادۆلن ئاپیا»و «برتۆلد برێخت»و «پیتەر فایس»و «بیسکاتۆر» بەچاوی رێزەوە بروانـنە مۆسیقاو بەکارهێنانی لەجێگەی پێویست و بەهانەی خۆیدا!!

## 2 ـ مۆسیقاو گرنگی مەوداو بەهاکانی لە شانۆدا: ـ

ئەو مەبەستەی کە دەمانەوێت بیپێکین، بەکارهێنانی راستی موسیقایە لە شانۆیی‌یەکانمادا بەهەموو جۆرەکانی‌یەوە لەگەڵ گرنگی مەوداو بەهاکانی ئەم هونەرە

ناسکە بۆ سەرکەوتنی بەرهەمەکان. . جاگەر بێینەئاکامی سەرکەوتنی دەرهێنەرە مەزنەکانی شانۆ دەبینین دەرهێنەرێکی وەك «فاگنەر» زۆر بەووریایی‌یەوە ئاگاداری ئەکادیمی ئۆپێراکان بووەو شانۆکەی مۆسیقایی بووە بەهەموو ماناکانیەوە بەڵام «ئادۆلف ئاپیا» یەکگرتنی بەهای ووشەو موسیقاو تەشکیلات لای هارمۆنیایەکی ئەفسوناوی لەدەرهێنانداپێك دەهێنا بەیارمەتی ئەکتەری بەتوانا مەودای سەرەکی ئاپیا موسیقا بووە. .

کە هەڵگری ووشە*بووە. «بۆیەکە زۆربەی هەوڵ و کۆششەکانی «ئاپیا» خۆیان لە دەرهێنانی کارەکانی «فاگنەر»دا دەبینیەوە بەمانایەکی تر پێی دەوترا «درامای ووشەو مۆسیقا» بەتایبەت لە یەکەم لێکۆڵینەوەیدا بەناوی «دەرهێنانی درامای فاگنەری» یەوە بڵاوی کردنەوە».

ئاپیا دەیویست ئەکتەر موسیقی بێت بەهەموو بەهاکانی‌یەوە بەتایبەت ئەکتەری سەماو پانتۆمایم ئەبێ «بالێ» بزانێ، «جوڵاندنەوەی ئەکتەر پێویستە لەژێر رکێفی یاسا موسیقی‌یەکاندا بێت» بۆیەکە گەیشتە ئەو بروایەی کەبڵێت: - «رووناکی‌و مۆسیقا تەنها، دەتوانن تەعبیر لەهەموو روخسارەکانی تربکەن بۆ ئەکتەر» سعد ئەردەش ووتەنی «دەرهێنەر ئەو کەسە شارەزایەیە کە زۆر لە کاراکتەری مایسترۆی ئۆرکسترایەك نێزیك دەبێت و بەم پێیەش کاریگەری بە شێوەیەکی موگناتیسی‌و ئەفسوناوی دەبێت».

مۆسیقا لای «ئاپیا» فۆرمێکی هونەری بەرز بوو، گرنگی لە ئەکتەرو دیکۆری تەجریدی‌و رەمزی‌و رووناکی کەمتر نەبووە، (شوبنهاوەر) ووتەنی: - «رێچکەی دۆزینەوەی بناغەو موتڵەقە». ئەکتەر لای ئاپیا دەبێت دەنگی هاوسەنگی دەنگی گۆرانی بێژە ئۆپێراکان بێت لە مەسەلەی «سۆلفێج، Voice» دا. «ئەکتەر دەبێت نۆتەی مۆسیقایی بخوێنێتەوە بەهەموو رەمزە ئەکادیمی‌یەکانیەوە.

چونکە ئیداتی دەنگی پەیوەندی بە ئیقاع و چینەکانی مۆسیقاو چۆنیەتی‌یەوە هەیە، پاشان پەیوەندی هارمۆنی لەنێوان دەنگەکان و وێنە جوڵاوەکانی سەر شانۆوە هەیە» [لورنس ئولیڤیە] ئەکتەری بەناوبانگی ئینگلیزی کاتێ کاراکتەری «ئۆتێللۆ»ی نواند بۆ ماوەی «6» مانگ سۆلفێجی خوێند لەسەر رستەیەکی شانۆیی‌یەکە تا ئەو دەنگی «باصە» «Pass» ی دەرهێنا کە سیمای کاراکتەری ئۆتیللۆی مەغریبی بوو.

دەبینین لە شانۆی بێ‌دەنگ «مایم»دا لەبەر ئەوەی زمانی جوڵاندنەوەی لەش و دەست و قاچەکان دەدوێن، مۆسیقا تەنها لە میانە بێ‌دەنگی‌یەکاندا بەکار دەهێنرێت، نەك لەهەموو بارەکانی پانتومایمەکەدا!!

ئەگەر بروانینە «برتۆلد برێخت» دەبینین چەند شانۆیی‌یەکی بەناوی (شانۆی داستانی موسیقایی)یەوە دەرهێنا لە ناوەندی کارکردنیدا، لە شانۆیی «تەپڵ لێدان لە شەوودا» و «ژیانی قاڵ»و و «ژیانی ئەدواردی دووەم»و «ماها گونی»و «ئۆپێرای سێ قروشەکە»و «دایکە ئازا»یا «دایکە دلاوەر»دا برێخت دەڵێت: [لەیەکەم شانۆییم دا، موسیقام بەشێوە میللی یەکان و گۆرانی ئیقاعی مارش و فولکلۆر بەکار هێنا. .

مۆسیقای بۆ دراماکان سەرکەوتنێکی مەزنی بە دەست هێنا. کە پێشکە شکردنەکان لە شانۆی بەگۆرانی نزیك بوونەوە] پاشان باسی گرنگی و بەنرخی مۆسیقیەیەکان لە دەرهێناندا دەکات و دەڵێت: «موسیقا رێچکەی دەربرینی هێنایە ناو دراماوە، کە درامای کردە شتێکی جۆراو جۆرو شانۆی شیعریشی بوژاندەوەو گورری پێدا» پاشان دەستنیشانی ئەوەشی کرد کە بەکار هێنانی موسیقای هاوچەرخ لە گۆرانی دا سەرکەوتنێکی چاوەڕێ نەکراوی بۆ بەرهەمەکان بەدەست دەهێنا، کەلە رووی پیرەوەوە موسیقا یارمەتی ئەکتەرەکانی ئەدا تا مانای ناخی کۆمەڵایەتی‌و رامیاری ناو داستانەکان یەکالا بکاتەوە. . دەیووت: - (ئەو مۆسیقایەی لە شانۆی «دایکە دلاوەر» دا بەکارم هێنا لەووشیاری‌یەوە بوو، بۆیەکە سەرکەوتنێکی چاکی بەسەر هەموو شانۆیی‌یەکانی تری داستاندا بەدەست هێنا، چونکە وای لەبینەر کرد کە هەست بەو شتانە بکەن لەسەر شانۆ روو دەدات).

پاشان بەکار هێنانی تیپی ئۆرکستراو موسیقای رووت لە

شانۆی «ئۆپێرای سێ قرووشەکە» دا هەمان سەرکەوتنی لەساڵی 1928 دا بۆ داستان بەدەست هێنا، کە برێخت زۆر بەبەڵگەوە پەنجەی ئەخاتە سەر لە یاداشتەکانی دا.

بەهەمان شێوە لای [پیتەر بروکو بیسکاتۆرو پیتەر فایس و شانۆی تەشکیلی]و جۆرەکانی تر موسیقا رۆڵێکی گرنگی هەبووە چ لە ئامادە کردنی ئەکتەردا یا لەپێشکەشکردندا. پێش ئەوەی بێینە سەر بەکار هێنانی موسیقای بەرجەستەیی و رەچاو کردنی لەلایەن هەندێ لەدەر هێنەرانی کوردەوە لەبزووتنەوەی شانۆی کوردیدا، دەبێت شێوەکانی مۆسیقاو گۆرانی شانۆو بەکار هێنانی لە دراما دا دەست نیشان بکەین، (مایسترۆ یوسف سیسی) دەڵێت پێنج بەکارهێنان بەکار هێنانی گرنگ ی مۆسیقا لە شانۆیی یە کاندا هەیە: -

### 1 - شانۆی درامای بێ لایەن: -

مۆسیقای بەرجەستەیی بۆ قوڵ کردن و یاریدەی گرێ و کاکڵ و باری رەوانی گشتی و کاراکتەر و ئیقاعی دیالۆژەکان بەکاردێت، بەشێوەیەکی راستەو خۆ لەمیانەکانی دیمەنەکان و ناراستەوخۆش لەگەل دیالۆژدا بەشێوەی «باگراوند».

### 2 - شانۆی درامی رووت: -

کەدەنگی کۆراڵی تێدا بەکاردێت، بۆ چەند دیمەنێکی تایبەت بە ئاواتی رەنگ و چۆنیەتی بزواندنی رۆح و هەستی بینەر.

### 3 - رۆمانە شانۆییە مۆسیقییەکان: -

چەند پارچە گۆرانییەکی تاکی و کۆ تێکەڵی رووداوە کان لەگەل میانەی موسیقی بەجۆشدا و چەند سەمایەکی کەمیش دەکات. لە شانۆی کوردیدا وەك شانۆی «پردی ئارتا» و «کەللە سەر» و «گەرانەوەیەکی کوتوپر»و «مناڵە بچکۆلانەکە و گەشتی چارە نووس و «بەلەمی ئەفسوناوی»و «دووا گۆرانی»و «پۆنتیلا». . . هتد کە ئاوازی تایبەتی و گۆرانی خۆماڵی یان بۆ دانرابوون وەك هەوڵدانێکی نوێ لە شانۆی کوردیدا.

### 4- درامای موسیقای بەگۆرانی ئۆپێرا: -

درامایەکی بەگۆرانی شیعری بەئاوازە کە بەهیچ شێوەیەك دیالۆژی رووت ی بێ ئاواز تێدا نییە، بەکۆمەڵ و بەتاك گۆرانی دەڵێن، کە پاڵەوانی سەرەکی ئۆپێراکە پێی دەوترێت «پریمادۆ تۆ»و گۆرانی بێژی یەکەم کە ئەم کاراکتەرە یاری دەکات پێی ئەڵێن «پریمادۆنا» کە بەرامبەر یەکەم سەماکەری «باڵێ» بەناوی «بالەرنیا»دێت.

### 5 - ئۆپەرێت: -

ئەم جۆرە لەشانۆی کوردیدا بەر کەماڵە و زۆر شانۆیی رەنگینی منالانەو گەورەمان هەن، دەقێکی درامی و شانۆییە گۆرانی و مۆسیقاو سەمای تێدایە، کەسەکان مەغزایەکەی تەعبیری بیرۆکەو ئاواتی نووسەر، دەرهێنەر بە جولاندنەوەو سۆزی دەنگ بەبینەر ئەگەیەنن، هەردەم ئۆپەرێت نەرم ونیان و بەجۆشەو چەند پارچە ئیلقایەکی دیالۆژ ی خۆی دەخاتە ناو دەقەکان بەمەبەستی رێکخستنی ئیقاعی سەرەکەی و کاکڵ و گۆرینی کات و شوێن لەلایەن کاراکتەرێکەوە بۆ نمونە: «حیکایەت خوان» یان «لیبۆك».

لەم جۆرە لە شانۆیی موسیقی کوردی «کەژاوەی مێژوو» و رووبار و چراوگ و. . . هتد.

پێش ئەوەی لەهەندێ دەقی کوردی بکۆڵینەوە پێویستیە بەکار هێنانی موسیقای بەرجەستەیی لە شانۆی درامی بێ لایەنی کوردیدا روون بکەینەوە. لەو هەڵە گەورانەی، کە هەندێك لە دەرهێنەرەکانمان دەیکەن، بەکارهێنانی و پچر پچر کردنی موسیقای کلاسیکی ئەوروپی و گۆرانجییە رۆمانسی یەکانەو مۆنتاژ کردنێکی بۆ شانۆییەکان، بێ ئەوەی سەیری بیری ئەو

پارچەیە بکەن، بەڵکو بەچاوێکی ڕووتەوە دەڕواننە ئەو موسیقا مەزنانە لەوانە گوێمان لە پارچە کردنی ئەمانە بووەو بەردەوام دەبێت، سمفۆنیەی «قەدەر»ی «بیتهۆفن»و. «شەهرەزاد»ی «رمسکی گۆرساکوف»و گۆرانی مۆ نامۆر»ی فەرەنسی و موسیقای ئۆپێرای تریستان و ئیزۆڵدەی فاگنەرو بیلیاس و میلیزجاندی دیبسی و «سپجارتاکۆسی» خاچا دۆریان و موسیقای ئایینی کڵێسایج هاندڵ و بیتهۆفن و مۆزارت و گۆرانی یە بەجۆشەکنی شۆبرت و . . ج. هتد، کە ئەگەر تەفسیری ئەدەبی ئەو بەرهەمانەو ئۆپەرێتانە هەر بەکەلەپوورو بەشی خۆیدا بکەین، دەبینین بیرێکی گەورە یان هەڵگرتووە (مجرد) نین لە بیرتا پچر پچر بکرێن بە شێوەیەکی نا هەموار هونەرمەندی بەزەوقی دەوێ مامەڵیان لەگەڵ بکات، ئەگینا بۆچی لەئەکادیمیاو پەیمانگا جیهانی یەکاندا نیگار کێش و ئەکتەرو دەرهێنەر وانەی مۆسیقاو بەکارهێنانی لەوانەی (بەکار هێنانی موسیقای شانۆیی ) دا دەخوێنن. پاشان دەبینن شتێکی سەیر باڵی بەسەر شانۆیی یە کوردی‌یەکاندا گرتووە بۆ نموونە سمفۆنیەی «قەدەرو شەهرەزاد»و گەلێکی تر بەتایبەتی چەند دێرێکی مۆسیقی خۆشیان لەبەر هەمەکاندا دووبارە ودەبارە دەبنەوە، وەك پارچە موسیقا لەجیهاندا نەمابێت، مەسەلەکە لێرە تەنها گەڕان و چێژلێ وەرگرتنی موسیقاو ڕووناکی و تەشکیلی گەرەکە.

بۆ نموونە ئۆپێرای «ترسیتان و ئیزۆڵدە»، ی فاگنەر دەبینن کەلە «6» ئاوازی سەرکەی پێك هاتووەو تێکرا لەسێ بەشی سەرەکی‌دا کۆدەبنەوە باسی دڵداری‌یەکی مەزنی نێوان تریستان و ئیزۆڵدەیە ئەم شەش ئاوازە بریتین لە: - «بیرکردنی تریستان بۆ خاك و وڵات»و پێ گەیشتنی عاشق و تەقینەوەی ناخی هەردووکیان و ڕاو لەدارستانداو پاشان شینی ئیزۆڵدە دێت ئەم مۆسیقایە ئەگەر لەئۆپێراکەی جیابکەینەوە دەبێت بۆ شانۆیی‌یەکی کوردی وەها بەکار بێت کە باسی هەمان دڵداری دەکات بۆ نموونە «شیرین و فەرهادو «مەم و زین»و دڵداری و «پەیمان پەروەری»و «لاس و خەزاڵ»و «خەزیم»و «شەفی و شیرین»و. . . هتد وەك مۆسیقای بەرجەستەیی پارچەی لێ بەکاربێت شتێکی چاکە، یان «بیلیاس و میلیزاند»ی «کلودیو دیبوسی» کەلە 4 ئاواز پێك هاتووە بەناوی: - (ئاوو هەوا)و (گۆلۆ)و (قەدەر)و (میلیزاند) ئەگەر بەپێی پێناس و تەفسیری پارچە ئاوازەکان بۆ شانۆیی‌یەك مۆنتاژ بکرێت بەمەرجێك لەگەڵ باری ڕەوانی گشتی و سایکۆلۆژی کاراکتەرو بینەرو بیری دیمەنە شانۆیی یەکەش دا بگونجێت چاکە. . . بەڵام گریمان بێین پارچە مۆسیقای ئاوو هەوا بۆ شەڕەکەی لابرتس و هاملت بەکار بهێنین ئەمە ناگونجێت چونکە موسیقاکە باسی دڵداری ئەکات.

بۆ نموونە موسیقای ئایینی (کەنائیسی) ئەوروپی بنەماو نرخی خۆی هەیەکە بارو زروفی مێژوویی دروستی کردووە، دەبێت بزانین لە کوێدا بەکاری دەهێنین لەوانە شانۆیی یە کلاسیکی و مێژوویی یەکان کەدیمەنی کڵێساو نوێژی مەسیحی یان تێدایە نموونە (شانۆیی پردی ئارتای «تیوتوکا» هملت و دووا گۆرانی چیخوف و ئەکرۆ پولس و. . . هتدیان بەتایبەت لە شانۆیی‌یەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دا وەك شانۆی (ئەسرارو ڕەوشت و ئاینی) بەکاری‌یان دەهێنین بەڵام بێین مۆسیقا مەزنەکەی (مەسیح)ی (هاندل) بهێنین و لە شانۆیی یەکی خۆماڵی دا بەکاری‌بهێنین وەك (نانزاد) یان (شەفی و شیرین) زۆر شتێکی ناهەموارو نەشاز دەر ئەچێت!

یاراست نیە ئاوازەکانی مەسیحی (باخ) بەو مەزنیەلەشانۆیی‌یەکی خۆماڵی‌دا بەکار بهێنم، کە پێوەندی پێوە نەبێت، بەڵام ئەگەر لە (ماڵئاوا ئەی شاعیرانی) «جەلیل قەیسی» دا بەکار هێنرا شتێکی زۆر جوان و لەبار ئەبێت چونکە پاڵەوان «ڤان کوخ» پێی سەرسام بووەو لەو بارو دۆخەدا ژیاوە وەك لەدەرهێنانی «بکر رشید» داسەرکەو توو بووەیا شۆبرت لە گۆرانی سیرینا دا باسی عاشقێك دەکات کە چۆن داوای سۆزو خۆشەویستی لەبەرامبەرەکەی دەکات کەچۆن باسی داستانێکی کش ومات لە شەوێکی تاریکی گەرداودا پەیوەست دەکاتەوە بەژیانی ڕۆمانسی یانەی پاڵەوانەوە بەبێ گەردی و هیوای پێ ئەداتەوە، یان لە گۆرانی شۆخە ئاشەوانە کەدا باسی دڵداری و جوانی سروشت تێکەڵ دەکات لە (20) گۆرانی دا کە

هەریەکەی لەمەبەستێکی جوانی دەدوێت بەڵام پێکەوە بەستراون وەك گۆرانی گەڵاوو شکەکان و فرمێسکی باران و گوڵی ئاش و سڵاوی بەیانیان دا، ئەگەر ئەم گۆرانییە بیست پارچەیەی شۆبرت بهێنین بۆ هەموو شانۆیی‌یەکی رۆمانسی بەکاردێت بەمەرجێك نابێت لەبیرمان بچێت کە تەنها تەفسیری ئەدەبی نابێ بخەینە بەرچاو بەڵکوو لەگەڵ گونجانی بیریو دەروونی دیمەن و سۆزو گوێی دەرهێنەر بۆ حاڵەتەکاندا بگونجێت کە پرۆڤەی تەواوی لەسەر بکرێت نەك دوو سێ رۆژ پێش ئەوەی بینەر بێتە هۆڵەکەوە ئێمە تەواو کەرەکانی تر وەك موسیقاو رووناکیو ماکێژ و جل و بەرگ دەست پێ بکەین بەڵکوو بەر لە ماوەیەك لەگەڵ موسیقاکاندا ئەکتەر رابهێنرێت. بۆیەکە دەڵێین، موسیقا سنوری نیەو پێویستە وەك شانۆیی ئاگاداری بیری نوسەرو ئاوازەکەو مەغزای فیکری موسیقاکان و ئیستاتیکای پێشکە شکردن بە سیمفۆنیەی گوێو چاوەوە وامان لێ بکات کە بەهوو شیارییەوە بەکاری یان بهێنین لەجێگای پێویست دا.

### 3 ـ جۆرەکانی شانۆی مۆسیقاو چەند دەقێکی کوردی: ـ

شانۆی موسیقی بەچەند جۆرێك پۆل کراوە کە هەریەکەیان لە دایك بووی بارو دۆخێکی مێژوویو کۆمەڵایەتیو رامیاری هونەری دروستی کردون ئەوانەش: ـ

#### 1 ـ شانۆی سۆزی خەیاڵ: ـ

کۆمیدیایەکی هێمنەو موسیقاو گۆرانی تێکەڵ دەبن بۆ خۆشی وکات بەسەربردن ی بینەران، موسیقای بەرجەستەیی لەگەڵ رووداوە درامی‌یەکاندا بەکار دەهێنرێت کە گەلێ ئیستیعرازو سەمای تێدا بۆ باری جوانی هونەری کارەکان بەکاردێت.

#### 2 ـ شانۆی ئیستیعیرازی: ـ

تەمەنێکی کورتی هەیەو جوڵاندنەوەی بەکار هێنانی سەماکانی زۆر خێرایەو دەبێتە هۆی بزواندن و هەژاندنی هەست و رۆح، کەسەماکان و جۆرەکانیان لەگەڵ دەقە شانۆیی‌یەکەدا لێك جوێ نابنەوەو بۆیەك مەبەست دەنوسرێت یا نەخشە دەکێشرێن ئەم شانۆیە تایبەتە بە خستنەروی کێشە کۆمەڵایەتی‌یەکانی گەلێکی تایبەت لەگەڵ تێکهەڵکێش کردنی فۆلکوری ئەو گەلانە.

#### 3 ـ شانۆی بە گۆرانی میللی: ـ

تایبەتە بە فولکلۆری میللەتانەوەو سیماو بۆنی رەگەزێکی مرۆڤایەتی‌یە باس لەسەماو هەڵس و کەوتی گەلان دەکات بەجیا، رەگەزێکی فۆلکلۆری میللی هەڵگرتووە لەگۆرانیو سەمای میللی‌دا.

#### 4 ـ ئۆپەرێتی نوێ: ـ

بیری سەرەکی لە ریالیزمەوە دەر ئەهێنرێت و پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر لە دەوری گۆرانی بێژو سەما کەر هەیە.

#### 5 ـ شانۆی بەگۆرانی: ـ

هەموو دراما موسیقی‌یەکان دەگرێتەوە ئامێزدا، پەیوەندی یەکی بەتینی بەمۆسیقای فولکلۆری گەلانەوە هەیە، زۆر گرنگی بەدەقی درامی ئەدات وەك دەقی موسیقیو هۆنراوەی بە ئاواز، بە دەگمەن بەخۆشیو شادی کۆتایی دێت، واتە بارێکی تەراژیدی لە زۆر بەی کارەکاندا باڵ بەسەر کۆتایی‌یەکەیدا دەگرێت پاشان کە باسی ئەو جۆرانەمان لە شانۆی مۆسیقی خستە روو تیشك دەخەینە سەر چەند دەقێکی کوردیو جیا کردنەوە یان بۆ هەر بەشێك کە لەلایەن خۆمانەوە هەڵبژێرراون، کە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دەقی کوردی ترمان نیە! گەر بروانینە سەرەتای گەشەی شانۆ بەگشتی مامۆستا «عبدالرزاق بیمار» لە «شانۆی کوردستان»ەکەیدا گەلێ بەرهەمی رەنگینی پێشکەش ئەدەبی شانۆی شیعریو موسیقی کوردی کردووە لەوانەش دوو ئۆپەرێتی

تێـدایـه، ئۆپـەرێتی «شـەفیو شیـرین» که لەمێـژ ووی ئەدەبی کوردی مامۆستا «علاء الدین سجادی»یەوە، ئامادەی کردووه به ئۆپـەرێت که بریتییـه لەچـوار بەنـد، یەکـەم بەنـاوی «چرپەی دڵـداری»یـەوه کەلـەم پێشـەکی یەدا پێنـاسێکی نایـاب و جوانی کاراکتـەرەکـان و شوێن و کات و رووداوەکـات دەخـاته روو، لەبـەنـدی دووەمـدا بەنـاوی «جـەنگانی دڵ» باسی شەڕو شۆڕو ئازایەتی ئافرەت لەتەلاری باوکی شیرین دێته گۆڕێو لەبەندی سێیـەمـدا «شـایی بەهـار» کچ لەگـەڵ کوڕ گەلی ئاوایی باسی شیرین و عەشقی پیرۆزی دەکەن و پاشان بەندی چوارەم بەناوی «ژوانی رەنجه رۆیی» له نزارێك لەچیایەکه بریتییه لەژووانی شەفیو شیرین و بچراندنی پەیوەندی نێوانیان کۆتایی دێت.

ئەم ئۆپەرێته دەتوانین بخەینه.ریزی «ئۆپەرێتی به گۆرانی»یه وەکـه بیـری.سەرەکی شانـۆیی‌یەکه له ریالیستەوە وەر دەگیرێت و پێـویستی بەژمـارەیـەکی چاك لەگـۆرانی بێژ هەیه واته: ـ باری گۆرانیو مۆسیقـای بەجـۆش باڵ بەسـەر شانۆیی‌یه ئۆپەرێتەکەدا دەگـرێت پاشـان شانـۆی «سـەرکەوتنی بەهار دێت کەبۆ منالآنی نوسیـوەو ئەمیش دەتـوانین بخـەینـه ریـزی ئۆپـەرێتـەوە که کاراکتەرەکانی به زمانی هۆنراوەو گۆرانی دەدوێت.

بەلآم ئەگـەر باسی «خـەونـەکـانی گەنجـۆ» بکـەین هەروەك نووسـەر ووتـویه [پێشکەشی تیپی «بالێ»و «ئۆپێرای»دووا رۆژی کوردستـان بێت]. دەتـوانین بەشـانـۆی ئیستیعـرازی شانـۆی بەگۆرانیش بیدەینه قەڵەم چونکه بواری ئەوەی تێدایەکه به سەماو گۆرانیو ئاواز دەربهێنرێت، واته لەدوو جۆر شانۆی موسیقیدا خۆی دەبینێتـەوە بەلآم ئاواتی «ئـۆمـەر» یان (مـردنی ئاوات)، بەهۆی کۆتاییه تەراژیدی یەکەیو پەیوەندی بەتینی فولکلۆری کوردییەوەو گرنگیدانی نووسەر به دەقی درامی، که هەر پێنج بەهـاکـانی درامـای له [کـاکـڵ و کاراکتەر و دیالۆژ و گرێو باری دەروونی گشتی]تێـدا دەبینـرێتـەوە دەبێت به «شانۆی بەگۆرانی» بدەینه قەڵەم، چونکه بەهاو ئیستاتێکی وفیکری یەکانی شانۆی بەگۆرانی لەئامێز گرتووە.

شانـۆی کوردی لەئـۆپـەرێتـدا هەژار نیـه هەر لەبـاخچـەی ساوایـانـەوە تا شانـۆی چالاکی قوتـابخـانـەکان و میهرەجانەکان لەوانەش «ڕووبار» وپیاوانی پاشەرۆژ و داپیرەی داناو گورگی پێشه وەهەردەو سەرکەوتنی بەهارو کورە عاقڵەکەو خۆشەویستی زەویو شادیو ئۆپـەرێتی فەلـەستین و ئۆپـەرێتی بوکـەبەبارانیو «دایکی گەورەمان» و «قوتابخانه چاومانه» که ئەمانەی دووایی لەنووسینی (عـومـەر عەلی ئەمین)بـوون کەچـەنـد ئۆپەرێتێکی تری شانۆی بچکـۆلانـەی بۆ چالاکی قوتـابخـانـەکـان و باخچـەی ساوایـان نووسیوه لەوانه (ئەسپی پاك)و (گوڵه پەلکه زێرینه).

ئەوی گرنگ بێت دەقێکی شانۆی بەگۆرانیم بەرچاو کەوت بەنـاوی «خـەزێم» که لەئـامـادەکردن و نوسینی «حسێن عارف»ە لەکاروانی ژمارە «9»ی سالی 1983دا بلآو کراوەتەوە. شانۆیی بەگۆرانی «خەزێم» دەتوانم بڵێم که ئەو لاوك و حەیران و هۆنراوە کوردییانه لای مامۆستا «حسێن عارف» زۆر زیرەکانه هاتونەته ناو شانـۆیی‌یـه بەگـۆرانییەکەوەو ئەگەر بشگەڕێینەوە بۆ پۆلەکەی ناتـوانین بەتـەنهـا بڵێین «خـەزێم» شانـۆی بەگـۆرانییه بەڵکوو دەبێت بڵێین «خەزێم» شانۆی بەگۆرانی میللییه کەسیماو بۆنی فۆلکلۆری کوردی تیـا بەدی ئەکـرێت. بەلآم هەنـدێـك شتی بچکـۆلانـه سەر هەڵئـەدەن بۆ نمـوونـه: ـ بەهـا درامییەکان له [کـاکڵی ئەو بیـرەی نووسـەر ئەیـەوێت بیلێت و کاراکتەرو گرێو باری دەروونی گشتیو دیالۆژ] دەتوانم بڵێم که بەپێی پێویست بەرجەسته نەبووه بۆ نموونه له کاراکتەرەکان لەهەندێ بارو کات دا زۆر دانسقـەیـه واتـه بەدەگمـەنـه لەوانـه هاتنی «ئافتاو» دەبوو بەهـانـایـەکی وای بـوایـه بۆناو گرێی دراماکه. . دەبینین باری هۆنـراوەو حەیـرانـۆکـەکـان مامۆستای نوسەریان پاڵ پێوه ناوە، بۆ ئەوەی ئەم کاراکتەره بێته سەر شانۆو بەهانەکەشی بەهێز نییه!! یان کوڕانـی «وەستـا شالی یا لەسـەر زمـانی ئەمـانـەوە، به دیـالـۆژێکی تر بانگـەوازی یا هەواڵی هاتنی ئافتـاو یان بدایـه بەپالەوان که گوایا لەسەر کانی یا لەناو دێ بینوویانەو رووەو ئێره هاتووە یان به یەکێ له کورەکانی وەستا شالی ڕاگەیاندووە که لەگەڵ کیژانی دێ لەچیایەو دەگەڕێتەو سەر لەو شوێنه ئەدات که

پاڵەوان دانیشتووە حەیران دەڵێت. بەڵام هاتنەکەی دووەم جارکە «خەزێم» بزرە بۆ ئافتاو زۆر جوان و بەبەهانەیە چونکە شتێکی ئاسایی‌یەو رووداوێك وای کردووە کەپێك گەیشتنی هەردوو دڵدار زۆر لەجێگای خۆیدا بێت.

دەبێت لەبەشدار بوونی کاراکتەرێك دا بۆ ناو شانۆ کردارێکی درامی بنووێنێت واتە: بۆ بەرجەستە کردنی کرداری درامی نووسەر (تجسید الفعل الدرامی) هەر کاراکتەرەی چەند کردارێکی گرنگی هەبێت پێویستە بیکات نەك هاتنەکەی وابێت کە هۆنراوە یەك یا حەیرانێکی فولکلۆری کوردی بیسەپێنێ بەسەر نووسەردا لەم بارەدا حەیرانەکە ئامادەکردنی ئەوێت تا شانۆیی‌یەکی سەرکەوتوی بەگۆرانی یائیستیعرازی لێ ئامادە بکرێت.

بەهەر حاڵ شانۆیی یە بەگۆرانی‌یە فولکلۆری یەکەی «خەزێم» هەوڵێکی زیرەکانە بووە لەلایەن مامۆستاوە بۆسەر فۆلکلۆری کوردی وسود وەرگرتن لێ‌ی بۆیێك هێنانی جۆرێکی نوێ‌ی سەردەم لەشانۆ لای ئێمەکە شانۆی گۆرانی‌میللی بەئەمەش کارێکی پیرۆزە. ئەگەر دەرهێنەر شارەزایی لە جیهانی گۆرانی‌و مۆسیقای کوردی‌و مۆسیقای جیهانی‌دا هەبێت ئەم شانۆیی‌یە بگەیەنێتە سەر شانۆ بەهۆی ئەکتەری دەنگ خۆشەوە، ئێمە زۆر شانۆیی شیعر پشمان هەن کە نوسەرە کانیان وەك شانۆی شیعری مەبەستیان بووە کە هەندێکیان دەچنە ناو جیهانی شانۆی بەگۆرانی‌یەوە.

ئەمرۆ لە زۆربەی وولاتاندا چەند جۆرێکی شانۆی مۆسیقا بەیارمەتی هونەری تەشکیلی هاتونەتە کایەوە کە بەتایبەت باسی فولکلۆری گەلان دەکەن لە سلافی‌و جەرمانی‌و یۆنانی‌و رەگەزەکانی تر کە لەسەر شەقام و باخچەکان و گەراجەکان و هۆڵی ئۆپێراکانی ئەوروپا شانۆی مۆسیقای بەجۆش پێشکەش دەکەن. کە زۆر هاو چەرخانە مامەڵەیەکی زیرەکانە لەگەڵ جیهانی موسیقاو فولکلۆر دەکەن و شانۆیان لە ناودا تواندوتەوە.


سەرچاوەکان: -

1 ـ روح الموسیقی / سمیر الحاج یاسین.
المؤسسة العربیة للدراسات
بیروت / ابریل، 1980
الطبعة الأولی.

2 ـ دعوة الی الموسیقی / یوسف السیسی.
عالم المعرفة
سلسلة، 46، 1981م
الکویت / / مطابع الانباء

3 ـ نظریة المسرح الملحمی / برتولد برشت.
ترجمة: د. جمیل نصیف جاسم
عالم المعرفة بیروت ـ لبنان

4 ـ الموسیقی وعلم النفس / د. ضیاء الدین ابو الحب
مطبعة التضامن ـ بغداد ـ
1970

5 ـ تذوق الموسیقی / د. طارق حسون فرید.
1981 ـ 1982 أکادیمیة الفنون الجمیلة.

6 ـ کاروان / ژمارە 9 حوزەیران 1983.
7 ـ شانۆی کوردستان / عبدالرزاق بیمار
بەغدا ـ چاپخانەی صلاح الدین 1961

# ئەحمەد شایەر

## کەلەپووری میللی

صدرالدین خوشناو

زۆرجاران هەست بە لەنێوچوونی شیعری شاعیرانی میللی دەکەین. . ئەویش لە ناوچوونی شیعری شاعیرە میللی یەکانە. هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، نەبوونی کەسانی وەها بایەخ بە لایەنی کەلەپوور بدەن. ئەگینا چۆن پاش سەدەیەك وەیان زیاتر جا گەلەکەمان شاعیرێك دەناسی و شیعرەکانی کۆدەکرێنەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت. . کە چی لەم ڕۆژگارەدا بایەخ دان بە فۆلکلۆر و کەلەپووری میللی مان شتەکی دڵخۆشکەرەیە بۆمان.

زۆرجاران وا ڕێك دەکەوێت ئەو شاعیرە نادیارە هۆنراوەکانی بە گەڵ فۆلکلۆر دەکەوێت یان خەڵکی دەیردەنە پاڵ شاعیرێکی دی. با بێنیە سەر شاعیری ئەم جارەمان. . (ئەحمەد شایەر. . وەیان ئەحمەد کاموسەکی) پێش ئەوەی دەست بە سەرەتای سەرهەڵدانی بوون بە شاعیریەتی بکەم، دەبێ ئەوە بڵێم بۆیەکەم جار مامۆستا (عبدالرقيب يوسف) باسی ئەو شاعیرەی کردووە بە ناوی (ئەحمەد کاموسەکی شایەرێکی کوردی سەدەی نۆزدەمە)[1] . . زۆر شت لەوانەی مامۆستا تۆماری کردووە، هەمان شت منیش بیستوومە لە پیاوە پیرەکانی هەردوو گوندی (کاموسەك و کۆلکەڕەش)[2] . . ئەویش (بەهنەسایە) کەوا دەیان گوت مەلا سەعید بۆی دەکردە کوردی و ئەحمەد شایەریش بە شیعر و گۆرانی دەیگوت. . بەڵام مامۆستای ناوبراو دەستێبشخەریەکی مەردانەی کردووەو، کارەکەی جێگای ڕێزە بە ناساندنی ئەم شایەرە نادیارە.

ئەوەی لێرەدا دەمەوێت بیڵێم و ڕوونی بکەمەوە ئەوەیە: ـ چۆن بووەتە شایەر! جولانەوەی هەڵسووکەوتی لەگەڵ ئەجنەکان و بەیتی کەریەیە. هەر لە منداڵی یەوە بە سەرهاتی بوون بە شایەری ئەحمەدم بیستووەو، پاش ئەوەی لە وەزیفەی مامۆستایی گواسترامەوە گوندی کاموسەك. یەکسەر بیرم

لەوەکردەوە کەوا لە سەرەتای سەرهەڵدانی یەوە دەست پێ بکەم و لەگەڵ کۆکردنەوەی شیعرەکانی . پێش ئەوەی بێت بە شایەر ئەم کورتە باسەی لە سەر خۆی گوتوەو بۆ دانیشتوانی گوندەکەی گێراوەتـەوە، ئەم بە سەرهـاتـەش نەك لە گوندی (کاموسەك) بەڵکو لە دەوروبەری گوندەکانی تری خۆشناوەتی زۆر باوە بوە .

شەوێ لە شەوان ئەحمەدی شایەر خەون دەبینێ، لەم خەونەدا وا دەزانێ کونە مێروستانێك لە قورگی (گەرووی) دێتە دەرەوەو دەربوویەتەوە .

دوای ئەوەی لە خەوهەڵدەستێ زۆر پێی سەرسام دەبێت، بۆیە دەچێتە لای (مەلای گونرو)[3] بۆی دەگێڕێتەوە . مەلای گونریش پێی دەڵێت : ـ

خەونەکەت زۆر باشەو لە جێی خۆیەتی . . گەر بهاتایە تەمەنت گەورە نەبوایەو خوێندەواریشت هەبوایە، دەبوویت بە عالیم . . بەڵام تۆ دەبیـە شایەرو . . شایەرێکی زۆر بە نرخ و ناوت دەنگ دەداتەوە .

دەبێت ئەوەش بزانین کەوا (ئەحمەد شایەر) خۆی بەهرەیەکی شاعیرایەتی هەبووە . . ئەگینا چۆن لە هیکەوەو کت وپڕی دەبێت بە شاعیر یان شایەر. وەسەرچۆپی بۆ هەموو شایی و هەڵپەرکێیەکان بکات . . بەڵام بە ڕای منەوە ئەو بەهرەیەی هەر لە منداڵی یەوە هەبووە . . گەر بە منداڵیش سەری هەڵنەدابێت، بەڵکو لە تەمەنێکی وا تەقیوەتەوە، چونکە هەموو بەهرەکە کەڵەکە بووە لە سەر یەك و لە ئەنجام دا وەك بوورکانێك تەقیوەتەوەو ئەو ناوچەیەی هەموو گرتوتەوە . . هەربۆیەش ناوی ڕۆیشتووە بۆ دەشتی هەولێرو کۆیەو دەوروبەرەکانی و لەگەڵ هەموو ناوچەی خۆشناوەتی .

**ئەحمەد شایەرو ئەجندەکان : ـ**

شەوێك لە شەوان یەکێك دێتە لایی و خۆی وا نیشان دەدا بە پیاوێك لە پیاوەکانی ناوگوندی کاموسەك و پێی دەڵێت : ـ وەرە شایی یەو ڕەشبەڵەکەلە نزیك (توێ سوور)[4] هەستە خۆت بگۆڕەو مەترسە . . پاش ئەوەی لە گەڵی دەچی و، بەڵام ئەحمەد شایەر دەڵێ : ـ بەم شەوەو شایی ؟ هەندەك دوودڵ دەبێت لە چوونەکەی . . هەرچۆنێ بێت کابرا قایلێ دەکات و دەگەنە بن توێ سوور . . تەماشا دەکات هیچ شایی نی یە .

ئەحمەد دەڵێ : ئێ ئەوە بۆ کوێ دەچین؟ کابرا وەڵام دەداتەوە .

دەڵێ : ـ مەترسەو ئەوەی لە (بن زمانتە)[5] مەیڵێ و، منیش ئەجندەمەو ئەوە داوەتەکەمان لە نزیك (گەری بەردەکەری)یە[6] منیش ناوم کاکەڕەشە . . وەهەر بە دەم ڕێگاوە ئەجندەکە پێی دەڵێ : ـ سەرداری ئەجندەکان ناوی (ئەزناووشکە)و دوو کچی هەیە، کچە بچووکەکەیان هیچ بەنـچوو گۆرانی بە سەردا هەڵمەڵێ، چونکە یەکێك لە ئەجندەکان حەزی لێ دەکات، بەڵام کچی گەورەیان با بە هەوەستی تۆبێت .

ئەمیش دەڵێ : ـ باشەو ڕازی دەبێت . ئەحمەد شایەر بەشراری شایی یەکە دەکات و گۆرانیش دەڵێت . . شایەری ئەجندانیش بەیتەك دەڵێت . . وا دیارە ئەم شیعرەی خوارەوە ئەحمەدی شایەر بە شیعری شایەری ئەجندانی داناوە . . بۆیە وای گێراوەتەوە . . یاخود بۆ ئەوەی بووە شیعرەکە ڕێك بکەوێت، چونکە لە هۆنراوەکە دەردەکەوێت کەوا ئەحمەدی شایەر بە زمانی ئەجندە عاشقەکە دەدوێت، کە دبێژێت : ـ

**هەردووك خووشکن هەردووك خووشکن**
**هەر دووك کیژێ ئەزنا ووشکن[7]**
**لە ناو خێری[8] ئەو سەرپشکن**
**ماریان لەگەری مەندێری[9]**
**ئەوی گچکە خوا بە منی بێری**
**ئی گەورەم داتوو[10] بە بێ فێری**

پاش کۆتایی هاتنی داوەتەکە . . لەگەڵی هاتنەوە تا سەر (کانێ سولکێ)و[11] پێیان گوت : ـ ئەحمەد گۆڵمەك

(مستــەك) ئاوی بە چاوت دابکــە . . ئەویش ئاوی بە چاوی دادەکات و لە لای ئەحمەد دەبیتە شەو . .

یەکسەر بۆ ماڵەوە چوو . . تاوو لەرزی هاتیّ و نووست . . بۆ بەیـانی ئەحمـەد بە دانیشتوانی گوندی ڕاگەیاندو گوتی : ـ من چومـەتـە ناو ئەجنـدەکـان (لـەمە حێترەکان) و شایم بۆوان کرد خەڵکی گوندی دەیان گوت شێت بووە . . لە سەرەتادا بڕوایان نەدەکرد . . .

ئەحمـەد پیّ یـانی گوت : ـ بەڵگـەم زۆرە، لەو بەڵگـانەش کراس و کەوای فلاّنی ئەوا دووگرێم لیّ دایە . . کەویّ ی فلاّنە ماڵی ئاگـرم تیّ بـەرداو دووکـونی تیّ بـووە . . گابـەڵەکی گوند پیـلەکـم شاردبــووەوە، واتــە ئیـسکــەکــانی . . ئەوانیش ئێسقـانەکانیان بۆ نەدۆزراوەو یەکسەر تەختەدارەکیان چاکردو، ئێستـا بڕۆن بگـەڕێن بزانن ڕاستـە یان نا . . گەر حەز دەکـەن گرەو دەکـەین . . خەڵکی گونـدیش گایەکە دەکوژنەوەو تەماشا دەکـەن ڕاست دەردەچێت . . وەتـەماشای کراس و کەوایەکان دەکـەن ئەمـەشیـان هەر ڕاست دەردەچێت . . ئەم باسـە لای زۆربــەی پیـــاوە پیــرەکـــانــی ئەم ناوچــەیــە باوەو بەڕاستی دەزانت . . بەڵام بە ڕای خۆم دوورنی یــە ئەمــەیـان خەیــاڵـی بێت و . . واتــە مەســەلــەی گایــەکــەو کراس و کەوایـەکـان . . بەڵام گرنـگ ئەوەیە چۆنم بیستووە وەها تۆمارم کردووە . . بەڵام مەسەلەی ئەجندەو شایەران زۆر باوە . . هەتا عەلی بەردەشانیش بە سەرهاتەکی وەکو ئەمەی هەیە .

★ ★ ★

زۆرجـاران ئەحمــەدی شایـەر بە شایەری خۆشناوان ناوی ڕۆیشتــووە . . جارێــك ئەحمـــەدی شایــەر چوّتــە دەشتی هەولێــریّ و . . لەویّ دەنــگ و سەدای داوەتــەوە . . گوتیـان شایــەری خۆشنــاوان هاتــووە . . ئەوانیش بانگی «پــوورە بەسیّ»[12] دەکـەن لە گونـدی (مـام خلیج)[13] کاتیّ خەبەر بۆ ئاغای گوند چوو . . ئاغاش بانگی یەکێکی کردو پیّ ی گوت : ـ (بچۆ بەسیّ ی شایەر) بانگ بکە . . بەسیّ شایەر هات و ئەم کۆپلە شیعرەی گوت . .

## بە سیّ شایەر دبێژیت : ـ

ئەتووی[14] شایەری خۆشناوان
با بتناسم هەموو ساریّ[15] دیّم سەرت دەدەم
پێشکی[16] خۆت دەقونیّ وەردەدەم
مێوژ و دۆشاوی خۆشناوت لیّ دەردەدەم
ئەحمەد شایەر وەرام دەداتەوەو دبێژ یت : ـ
باشە بم ناسە هەموو ساریّ وەرەکنم

--- --- ---

ئەتووش ئێکی[17] وەکوو شانازیّ ژنم

★ ★ ★

جارێـك (حـاجی حسین موحـەمـەد ئەمین شێـخ خدری خۆشنــاو) لە هیــرانـەوە بۆ کامـوسـەك دەچیت و دەڵیّ : ـ مام ئەحمـــەد هەرمیـانم بدیّ؟ مەبـەستی لە بنـە هەرمیـان بووە بۆ چانـدن و موتر بەکردن . . جا لەو کاتە (حاجی حوسین) منداڵ بووەو شیعــرەکــەی لە ماڵــەوە گێــراوەتــەوەو بەم جۆرە . لـە ناونـەچـووە . ئەحمــەدی شایـەر بەم کۆپلە هۆنـراوەیە وەڵامی دەداتەوەو دەڵیّ : ـ

**هەتیمی زاروزگ گەرمی**
**ئەتوو لەهەندە بیّ شەرمی**
**ئەوە ئەتووو بنە هەرمی**

★ ★ ★

زۆر لە شایەرە میللی یەکان بەشێك لە شیعرەکانیان تەرخان کردوە، بۆ لایەنی کۆمەڵایەتی . . ئەمەش وەسفی کردنەکانیان بە ئاژەڵان دەبێت وەکوو بەیتی کلۆو (کوللە) وەبەیتی کەریّ . .

بەیـتـی کەریّ ـ ئەحمـــەد شایــەر لە (بــەیتی کەریّ) دبێژ یت : ـ

خانی‌یەکی فێنك و برند[8]
تێی دایە شایەری پەنسد
دوو برای زۆر قۆناغ و توونـد
یەك بابەکر یەك خارند
بابەکر دەرێ[9] هۆ کاکە
کەرمان کەرەکی چاکە
سێ تەغاران دەردەکا
جەم دوو ڕووبەی ئالیکا
قەد باری گران مەکا
بابەکر دەرێ ئەو کورتانەم لۆبینە
کورتان نی‌یە، نەرمە زینە
لەپشتی کەرێ شینە
ئەو کورتانەم چەند قۆزە
بە ئاوریشمی ڕەندۆزە
لە پشتی کەرێ بۆزە
بابەکر لە ڕاستی کەرێ وەکی شێخی
وەکی جاری لێ دێخی
ناکا لە سینگی بێخی
هاتە محەلی هێوارێ
کەربۆنێ گارانێی دەکرد
سەدای ماکەری بەفار
هات گەیی‌یە بان و بانوان
خوارزا دەکەن لوو لووان
خوارزا گەلەك فەقیرن
هاتینە بارو بووان
گەیی‌یەبانێ محاری[20]
خوارزا گەیینە خاری[10]
دێری شینی باریکە
خاری خۆتەو ماچیکە
بووە شرق و هۆری دەانی
مرچە مرچێ ماچانی

لاوەك قەسابی سابلاغی
شکاندی هەردوورانی
بابەکر هاتە دوو شوێنی کەرێ
کە ژووی[12] دیتەوە لەوێنرەرێ
هەتا هاتە سەر مەیتی کەرێ
چووە، گۆتی گورێ[22]
لۆم بە کەرێ هەربرێ
ژانم گەیی‌یە سەردرێ[23]
خارند گۆتی: ها بابەکر
بەزارت تاربوو شەکر
کەرت لە کن بووە حوشتر
خارند هاتە دەرێ
بە پاچ و بە پێمەرێ
بە تفنگە قورەی هەوەرێ[24]
هەتا هاتە سەر مەیتی کەرێ
دێرێ شین زۆر بە غارا
تفەنگەکی وەی‌لێ‌دا
چەرخی کردە کارا

هەروەك لە (بەیتی کەرێ) بۆمان دەردەکەوێ کە بیست و یەك کۆپلەیە، کە چی یەك دووانیان لە کۆپلەکان کەمێك لەنگن. . بەڵام دەسکاریم نەکردووەو وەکوو خۆی چۆنە وەها نووسیومەتەوە هیوام وایە لە دەرفەتێکی تردا بە نەوەی ئەحمەدی شایەر کاك (مەحمود گوڵستانی)، شادبم و شیعرەکانی ترو بابەت و بە سەرهاتی و سەرگوزشتەی ئەم شایەرە میللی‌یە نادیارە تۆمار بکەم، بۆ خزمەت کردنی کەلەپووری میللی گەلەکەمان.

## پەراوێزو فەرهەنگۆك : -

1) بڕوانــە هاوكــاری ژمـارە 710ی ڕۆژی 3 ـ 11 ـ 1983 مامۆستـا (عبـدالـرقیب یوسف) (ئـەحمـە كاموسەكی شایەرێكی كوردی سەدەی نۆزدەمە).

2) دووگـونـدن لە ناوچـەی خۆشنـاوەتی وەتخووبیان پێكەوەیە.. بەڵام لە بارەی ئیداریەوە كاموسەك سەر بە ناحیەی خۆشناوە، كە چی كۆلكەڕەش سەر بە قەزای كۆیەیە.

3) مەلای گونـد: مەبـەست لە مەلا سەعیدی هیرانی‌یە.. چونكە دۆستایەتی لەگەڵ هەبوە.

4) توێ سوور: دارتووەكی بەرزە دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی گوندی كاموسەك.

5) مەبـەست لە بن زمـان ئەوەیـە كەوا (بسم الله) نەخـوێنیت.. چونكە گەر خوێندی ئەوە ئەجندەكان (لەمە چێترەكان) لێی دووردەكەونەوە.

6) گەلی‌یـەكـە دەكـەوێتـە سەروی گونـدی (كـۆلكەڕەش) نزیك گونـدی كاموسەك وەئەم گەلی‌یەش بە ناوی بەردەكەڕ بە ناوبانگە، چونكە بەردێكی گەورەو زل لەو گەلی‌یە، هەربۆیەش بەو ناوە بە ناوبانگە.

7) ئەزنـاوشـك: مەبەستی لە شای ئەجندەكانە، دووریش نی‌یە ئەو ناوە لە هەوڵـەوە ئەجنـەووشـك بێت، كە لە ئەجنـدە ووشـك وەرگیـراوە.. ئینجـا ووشـەكە بۆرێكی‌و سووكی شیعرەكە بووەتە ئەزنا ووشك.

8) خێری: تیرە، هۆز.

9) گەلی‌یـە بە ناوی گونـدی مەنـدێر. نزیك گوندی كامووسەك. ومەندێر گوندێكە سەر بە ناحیەی خۆشناوە.

10) داتوو: دام بە تۆ.

11) ئەمـەش كانی‌یـەكـە لە ناوكاموسەك، زۆركۆنەو ئیستاش هەر ماوەو خەڵكی ناوگوند بۆ خواردنەوە بە كاری دەهێنن.

12) پوورە بە سێ: بە گوێرەی ئەم كۆپلە شیعرە دەبێت شایەرێكی میللی‌بێت لە دەشتی هەولێـر.. كە چی ئێمـەش ناوبـانگمـان نەبیستووە. وەدەشبێ شیعری تریشی هەبێت.

13) مام خلیـج: گونـدێـك بووە لە دەشتی هەولێـر.. بەڵام زۆر پرسیم ناوی ئەم گونـدەم بۆنەدۆزرایـەوە لە چ پارچـەیەكی دەشتی هەولێـرە. چونكـە ئەم گونـدە لەم ڕۆژگـارە نەمـاوە. كە چی ناوی گوندێكی تر نزیك ئەو ناوە لە دەشتی كۆیە هەیە بە ناوی (مام قلیج).

14) ئەتوو: ئەتۆ، تۆ

15) ساری: ساڵێ

16) پێشكی: پێ، قاچ، لاق.

17) ئیكی: یەكێكی

18) برند: بڵند

19) دەری: دەڵێ

20) محاری: تخووب، سنوور.

21) كەژوو: قەیاسە، یان گوریسێكی درێژە بۆبەستنی كۆمەڵەدار لە سەرپشتی گوێ درێژ.

22) گوری: گوڵێ.

23) سەردر: سەردڵ.

24) تفنگـە قورەی هەوەرێ: جۆرە تفـەنگێكی زۆركـۆنـەو پێی دەگوترێت تفەنگە حوسكە.

---

تێبینی: -

بە شێـوەیـەكی گشتی سوودم لە هەردوو گونـدی كامـوسـەك و كۆلكەڕەش وەرگرتووە بۆ ئەم باسە.. وەشێوە تایبەتی‌یەكەش بۆ ئەم دوو برایە بەرێزانەیە كە شیعرەكان و بە سەرهاتەكەیان بۆ گێرامەوە.

1) كاك (سلێمـان مەحمـود بەكـر لە ساڵی 1929 لە گونـدی كۆلكەڕەش لە دایك بووەو ئێستاش هەر لەوێ دەژیت و كاری كرێكاری‌یە.

2) كاك (دەروێش صابـر جمشیـد) لە گوندی كۆلكەڕەش لە دایك بووەو تەمەنی نزیكەی (60) ساڵ دەبێت. كاری جوتیاری‌یە.

3) دەربـارەی كۆپلە شیعـری هەرمی‌یـەكـە، لە نەوەی (حـاجی حوسێن)م وەرگـرتـووە.. ئەویش كاك (بكـر ئەحمـەدی حسین خۆشناو)ە تەمەنی 45 ساڵ دەبێت. لە هیران لە دایك بووەو كاری كرێكاری‌یە.

★★★

# جووت و جووتیاری لە دەشتی هەولێردا

## بەشی یەکەم

عەزیزی مەلای ڕەش ـ هەولێر

### جووتیار :ـ

جووتیار ئەو کەسەیە کە زەوی دەکێڵێت .

جا خاوەن زەوی و جوتەکەبێت ، یا کرێکارو ڕەنجبەر ـ کرێی جووتیار کە پێ ی دەڵێن (شەرت) ئەمانەن :ـ

1 ـ نان خواردن .

2 ـ کراسێك .

3 ـ جووتە کلاشێك .

4 ـ ڕانك (بەبێ جۆغە) .

5 ـ نیو عەڵبە شکارتە .

6 ـ دینار ونیوێك پارە .

ئەگــەر جوتیــارەکــە جوتیــارێکی باش بووایــە پارەکــە ی بۆ دەکرایە (1/750) فلس .

جوتیــارەکە بەرامبەر بەم کرێ یەی سەرەوە نزیکەی هەشت مانــگ جووتی بۆ ئاغــاکــەی دەکــرد . واتــە لە سەرەتای مانگی ئەیلوولەوە تا دوادوای مانگی نیسان .

لە هەوەڵەوە تا بارانی پەڵە تۆی دەکرد . لە دوای بارانی پەڵە شۆی دەبری . لە ئاخری زستان و سەرەتای بەهاردا دەستی بە وەرددانەوە دەکرد .

هەموو ڕۆژ دەچووە جوت تەنیا کە باران دەباری و تا دەبووەوە (کڗ) : واتە زەوی کزر دەبووەوە .

جووتیـــارە کە لە کاتی جووت وەستـــانـــدا دەستــە وەستـــان ڕانەدەوەستا بۆ ئاغاکەی دەچووە ئاش ، یان ووڵاخەکانی دەبردە لەوەڕاندن ئەگەر وەرزی بەهار بووایە .

## بەشی دووەم

زەوی و کێڵگە :ـ

1 ـ بەیار :ـ

بەم زەوی یە دەڵێن : لە ساڵێــك زیــاتــر نەکێڵدرابێت یا هەر نووکی گاسنی پێ نە کەوتبێت .

2 ـ بوور :ـ

ئەم زەوی‌یەی کە تەنیا ساڵێك نەکێڵدرابێت .

3 ـ شۆ، شێف :ـ

زەویی جارێك کێڵدراو. ئەمەش بە زۆری لە دوای بارانی پەڵەیەو لە دوادوای وەرزی پایزو سەرەتای زستان دەبێت واش دەبێت .

خاوەنـــەکـــەی بۆی نارەخـــسێت بۆوەرزی زستـــان ، یان بەهاردوای دەخات .

کێڵگەی شۆ دەبێ زۆر دابخرێت وخەتەکانی بەرین بن بۆ ئەوەی رەگی پنچك ودڕك وگیاوگۆڵ هەڵتەکێت وڕۆژ پێش لە قووڵایی خەتەکان بدات و ووشکی بکاتەوە .

4 ـ وەرد :ـ

زەوی دووجار کێڵدراو گاسنی یەکەم شۆیە گاسنی دووەم : وەردە .

کێـڵگـەی وەرد دەبـێ ووردو لە پاڵ یەك بێـت یەکــەم : تا هەرگیـــاوگۆڵێکی بە شۆبــــڕین نە فەوتـــابێ ولە سەر لێـــواری خەتەکان شین بوو بێت هەڵکەندرێت .

دووەم :ـ تا لەو سەر : لە کاتی تۆکردندا هەوجار هەڵقوز هەڵقوز نەکات .

5 ـ خرتەو پرتە :ـ

ساڵ وا دەبێ فەلاح شۆ وەردی پێ نابرێت ، جا زەوی‌یەکە پەرێـز بێ ، یا بوورو بەیـار ، دەچێتـە سەری تۆی بکات بەڵام گاسنێك خۆڵی ئەوەندە لێ‌پەیدا نابێت کە تۆیەکەی بشارێتەوە ناچـار گاسنێکی پێش تۆکـردن لێ‌دەدات وجاتـۆی دەکـات و گاسنی دووەمی لێ‌دەداتەوە .

گاسنی یەکەم پێ‌ی دەگوترێت : خرتە .

گاسنی دووەم : خـرتـەوپرتە ئەمە بە مەرجێك دەبێ لە پێش باران بێت .

6 ـ گەردو وەرد :ـ

لە شێـــوەی خرتـەوپرتـەیـە : گاسنێـك لە زەوی دەدرێت و تۆدەکرێت جا گاسنی دووەمی لێ‌دەدرێتەوە .

بەڵام دەبێ تۆکردنەکە لە پاش باران بێت .

7 ـ هیشکاوز :ـ

دەغلێکە لە پێش بارانی پەڵە تۆبکرێت یا خۆ پایز بمێنێت تۆبکرێت .

ه ـ تەراوز :ـ

دەغلێکە لە دوای بارانی پەڵە تۆبکرێت یاخۆ پایز نەمینێت .

9 ـ خێلۆك :ـ

تۆکردنەوەی دەغڵ بۆ دووەم جار ئەمەش بەم جۆرەیە :ـ ساڵ وا بووە دەغـــڵ لەبـەر خراپی نەدووراوەتـەوە . خاوەنـەکـەی بە دارێك یا شتێکی ترگوڵی دەغڵەکە دەوەرێنتە ناو زەوی‌یەکە جا گاسنێکی لێ‌دەدات .

دەغڵی خێلۆك لەبـــەرئـەوەبـە دەست تۆ ناکـرێت بە زۆری تۆیـەکـەی نارێـك وقـان قان دەبێت : هەندەجێ‌ی بۆر هەندە جێشی چی لێ‌شین نابێت .

10 ـ شکارتە :

وا بووە خاوەن زەوی لە زەوی‌ی خۆی‌و بە کەرستـــەو جوتی خۆی تەنیـا تۆیـەکە نەبێت بە ڕبەودوور بە تا عەڵبەیەك دەغڵی بۆ ئەم جۆرە کەسانە چاندووە کە پێ‌ی دەگوترێت :

شکارتە :ـ

أ ـ مەلای گوندی .

ب ـ خزمێکی خۆی .

ج ـ شێخ و سەید .

ء ـ جوتیاری خۆی .

ه ـ شوانی خۆی .

تەنیـــا بۆ جوتیـارو شوان لە بریتی کرێ بووە بۆ ئەوانی تر بە خێرو پیاوەتی بووە .

## بەشی سێیەم

ئەو ووشـانـەی کە لە وینەکەدا هەن و پەیوەندیان بە جوتەوە هەیە ئەمانەن :ـ

(أ) ـ نیر :

نیر بریتی یە لەمانەی خوارەوە :ـ

1 ـ دارخەزنە :ـ

دووپەلەداری بچووکن . وەك بزمار نزیکەی دەدوانزە (سم) لە یەکتـر دوور لە ناوەڕاستی دارنیـر کوتـراون تا هیرتەکە بەملاو بەولادا نەچێت .

2 ـ هیرتە ، ویژە :ـ

پلەچـە قاییشێکـە لە نێوان دارخەزنەکان بە دارنیر شۆڕبووەتەوە . لە دوایی دا باسی دەکەین

3 ـ دارکلاوە :ـ

چوارداری دوو لقن دەخـرێنـە ناو کونی دارنیـرەکـەوە دوو لەم سەرو دوو لەو سەر لە دوایی دا لیّ ی دەدوێین

4 ـ دارنیر :ـ

نیمچـە تەژەیـەکی تایبـەتـە نزیکەی مەترو نیوێك درێژ دەبێت چوارکـونی تێـدایـە . دوولەم سەرو دوولەو سەر دەخـرێتـە سەرملی وولاخ .

5 ـ بۆسە ، ویژانبەر :ـ

زەنگـولێکی «قـەفـز» دارە بەهیـرتـەوە شۆڕبووەتـەوە سەری مژانەکەی تێ دەخرێت

6 ـ بەربۆسە :ـ

پەلە دارێکە بە قەدەر دوو پەنجە پانەو لە ناوەڕاستی بۆسە دراوە گاینجەکەی ڕاگیر دەکات .

(ب) ـ هەوجار :ـ ئەمانەی خوارەوە دەگەیەنێت .

7 ـ سەرەمژانکە ، گاینجە :ـ

پەلە دارێکی نیمچە چەماوەیە دەخرێتە کونی مژانە . دوای ئەوە کە سەری مژانـە کە لە بۆسـەکە هەڵدەکێشرێت . تاکومژانەکە لە جێگەی خۆی دانەماڵێت .

8 ـ مژانە ، مژانکە :ـ

دارێکە نزیکەی دوومەتر درێژە . سەرێکی بە کلکی ئامووروەوە بەندە سەرەکەی تری بە بۆسەوەیە .



9 ـ قەفیز :ـ

ئاسنێکی بازنـەیی‌یـە، یا سفـەیفـە، بنکی مژانـەکە بە کلکی ئامورەکەوە ڕاگیر دەکات.

10 ـ کرمۆکە :ـ

پەلـەدارێکی زۆر بچـوکـە. لە سەری خەپـەوە دەدرێت تاکو خەپـەکـە لە کونـەکـەی خۆی نەچێتـە خوارەوە. یاخۆ خەپەکە خۆی وەك بزمار سەری خڕە.

11 ـ دەستەندوو :

دارێکـە درێـژی مەتـرێـك دەبێت وەك بزمار لە قونکی ئاموور کوتراوە. سەرەوەشی دەستە ـ مستەی پێوەیە.

12 ـ دەستەمستە :ـ

پەلـەدارێکـە لە شێوەی دەسکە خەنجەرە لە سەری دەستەندوو کوتراوەو جوتیار دەستی پێوە دەگرێت.

13 ـ قونك :ـ

بەشی دواوەی ئاموورە.

14 ـ زمانە، دوندە :ـ

پەلە بچووکەکەی ئاموورەو گاسنی پێوەدەکرێت.

15 ـ بوغازە، گرانگە :ـ

شوێـنـی بە یەك گەیـشـتنی هەردوولقی ئامـــوورە کە لە کاتی جوت دا خۆڵ بەملاو بەو لای خۆیدا پەرت دەکات.

16 ـ هێسە، بەرکۆرە، مۆرە، سەرخە :ـ

پەلـەدارێکی پانـە دەکەوێتە نێوان مژانەو کلکی ئاموورەکە. بۆ ڕشت و ماڵ کردنی زمانەی ئاموورەکە بە کاردێت.

17 ـ خەپە، هەپە :ـ

پەلـەدارێکـە، یا دووە وەك بورغی کلکی ئامـوورو مژانەی بە یەکەوە بەند دەکات.

18 ـ هەوجاری قەرۆمە :ـ

بە هەوجـارێـك دەڵێن کە زمانەی ئاموورەکە دەست کردبێت. هەروەك لەوێنەکەدا دیارە، تێ بینی :ـ

أ ـ هەوجارئەگەر ڕووت بوو. واتە مژانەو دەستەندوو، گاسنی پێوە نەبوو پێی دەگوترێت ئاموور.

ب ـ هەوجاری هێستر زۆر لە هەوجاری گوێ درێژ گەورەترە.

(ج) ـ کۆپەلان :

بە مانە دەڵێن:

19 ـ بارێنە :

بابـــۆلـە یەکی لـبادە، یا گوشـە خراوەتـە ناوکیفکێکی قاییشی چەماوە. لە دوایی‌دا باسی دەکەین سوودی چیە.

20 ـ فرفرۆك :ـ

دوو پەلـەداری بچـوکن بەخرێنە مووەوە لەم سەرو لەو سەری بارێنە خراوان

(ء) ـ گاسن :ـ

ئەمانەی خوارەوە دەگەیەنێت :ـ

21 ـ نووك :ـ

نووکـــە تیـژەکـەی گاسنـە. کە وەك مێخـە لە زەوی‌دا دەچێتـە خوارەوەو هەڵی دەتەکێنێت.

22 ـ کووپ :ـ

جێگەی زمانەی ئاموورە.

23 ـ پەر :ـ

ئەملاو ئەولای دەمی گاسنەکەیە خەتی جوت بەرین دەکات.

## بەشی چوارەم

ئەو ووشانەی کە ماون و پەیوەندیان بە جوتەوە هەیە ئەمانەن :ـ

1 ـ بن مل :ـ

چەند قەدە لبادێکە بە یەکەوە دووراوەو قاییش، یا لاستیکی لە سەرەوە دراوە لە کاتی جوت دا دەخـرێـنـە سەرملی وولاخ تاکو ملی وولاخەکە بریندار نەبێت.

2 ـ بەرووڵە :ـ

گاسنێکە کە نووکی دوای کول بوون تیژ بکرێتەوە.

3 ـ بەرینە :ـ

گاسن کە پەرەکـــانی خوار بووئـــاسنگـەر هەنـدێـك لە ئاسنی کووپەکەی لێ دەکاتەوە، دەی‌خاتە سەر پەرەکانی بەرینیان دەکاتەوە.

4 ـ بنەتۆ :ـ

دانەوێڵەیەکە کە جوتیار بە زەوی‌وە کردبێت، یاخۆ دایناببێت بۆ تۆکردن.

5 ـ بەرەجوت :ـ

بە پارچە زەوی‌یەك دەڵێن: کە بە جووتە وولاخێك بە بەرهەم بێت. بۆ وێنە فلان کەس بەرەجوتێکی زەوی هەیە، یا دوو بەرەجوت.

6 ـ بەن قادە :ـ

بەنێکە لە سێ تا ئەستوورترەو لە گوریس باریك ترە. لە سەری دارکلاوەکانی لای دەرەوەیە خراوەو نیرو کۆپەلانی لە یەك دەبەستێت.

7 ـ پەرە :ـ

بەیارێکە لە نێوان دوو خەتە جوت دا بەرگاسن ناکەوێت بە هەڵ نەقەندراوی بمینێتەوە.

8 ـ پەڵە :ـ

بە بارانێکی تێکرا دەڵێن. کە زەوی وەك ڕەباس لێ بکات.

پەسندترین کاتی پەڵە مانگێك پایزبمینێت باشترین پەڵەش پەڵەی یەعقووباغایی‌یە. ئەمەش بەم جۆرەیە:ـ وولاخ لە دوای باران بارین لە ناو کێڵگە بروات یەکسەر جێ‌ی سمەکانی پڕ ئاو بێت، یا گۆزەیەك لەبەر باران بێت تا پڕ ئاو دەبێت.

9 ـ توورەگە :ـ

جۆرێکی مووتاوە. کاوجۆی تێ‌دەکرێت کە جوتیارەکە پشوو بدات لە سەری وولاخەکانی دەکات.

10 ـ جدووم :ـ

داردەستێکی تایبەتە سەرێکی دوولقە جوتیار لە جیاتی لاپووتە بە کاری دەهێنێت.

11 ـ جەلعە :ـ

لە شێوەی جەرەیە. بەلام بچووکەو نیوەی ئەو دەبێت جوتیار ئاوی خواردنەوەی پێ‌دەباتە سەرجوت.

12 ـ خرار :ـ

وەك جەواڵە بەلام ڕیسەکەی بەن نیە مووە جەواڵیش دەبێت جوتیار تۆی پێ دەباتە سەر زەوی.

دارجوت :ـ

دار دەستێکە سەرێکی نەقیزەدارە جوتیار لە کاتی جوت کردن دا وولاخی پێ لێ‌دەخورێت

14 ـ دووشاخ :ـ

گاسن کە نووکی زۆرخوار و باریك بووەوە کەلکی بەروولەکردنی نامێنێت ئەو کات ئاسنگەر لە ناو ئاگردا جۆشی دەدات و بۆپشتەوەی خوار دەکاتەوەو دوو پارچە پۆلا لەم لاو لەو لای دەدات و سەر لە نوێ دەی‌کاتەوە نووك.

15 ـ دەست جلەو :ـ

گوریسێکە ئەم سەرو ئەو سەری بە قەوچی وولاخەکان بەستراوەو ناوەڕاستیشی بە دەستەندووەوەیە. لە دوایی‌دا باسی دەکەین

16 ـ ڕبە :ـ

جۆرە دەفرێکی دارە. دانەوێڵەی پێ دەپیورێت نیو تەنەکە دەگرێت.

17 ـ زەناخە :ـ

قوڵفەیەکی قەڕاسەیە. دەکەوێتە ژێر چەناگەی وولاخ.

18 ـ سەدە :ـ

ئەو ماوەیە کە دەکەوێتە نێوان دەست پێ کردنی دێرە جوت و بادانەوەی جوتیارەکە سەدەهێستر نزیکەی دووئەوەندەی سەدەکەرە.

19 ـ سەرسەدە :ـ

ئەو شوێنەیە کە جوتیارە کە جوتەکەی لێ‌هۆدەداتەوە.

20 ـ عەڵبە :ـ

(8) قەزناخە =(16) تەنەکە =(32) ڕبە

21 ـ قەزناخ :ـ
(2) تەنەکەیە= (4) ربە .
22 ـ کێشە ، قەتارکێش :ـ
قوڵفەیەکی موەوە بە لاتەکی کورتانەوەیە .
23 ـ لاپووتە ، مەساسە :ـ
لە وێنەی پیشەقانە ، بەڵام دەمی خرە .
جوتیار لە کاتی جوت کردن دا قوڕی هەوجاڕی پێ لێ دەکاتەوە .

•

23 ـ لات :ـ
ئەو خانەیە کە جوتیار لە زەوی دەی کێشێت و تۆی پێوە دەکات .

25 ـ مارە ، (ماڵە) :ـ
دارێکی درێژ و پانە ، کورتەکاریتەش دەبێت ، ئەم سەروئەو سەری گوریسی پێوەیە . دوای کێلان و تۆکردن بە وڵاخی جوت وەك کووچکووچە بە سەر کێڵگەکەدا دەی گێڕن تاگڕێ و گواری کێڵگەکە لووس ببێت ئەمەش بە زۆری لە بێستانی دێمی بووە .

26 ـ مامزە :ـ
ئاسنێکە بە سەری قەوچەوەیە بۆ دەست پێوەگرتنە .

27 ـ مەکینە :ـ
لە سەرەتای چلەکانەوە کەرستەی جوت جۆرە پێشکەوتنێکی بە خۆیەوە بینی :ـ شتێکیان داهێنا پێ یان دەگوت : مەکینە . هەبوو بۆ هێستران دروست کرابوو ، پێنج گاسنی پێوە بوو . هەرجارێ پێنج خەتی لێ دەدا . هەش بوو بۆ گوێدرێژان دروست کرابوو سێ گاسنی هەبوو هەر جارێ سێ خەتی لێ دەدا .

28 ـ نیوەتۆ :ـ
وا بووە خاوەن زەوی دەستی کورت بووەو توانای تۆکردنی وەردو شۆیەکەی نابێت دەچێت بە قەدەر وەردو شۆیەکەی تۆ (چ گەنم ، چ جۆ) لەیەکێکی تردەستێنێت و تۆی دەکات لەو سەر دەغڵەکە چەند بوو دەی کەنە نیوە یان خاوەن تۆیەکە دەچێت وەردوشۆی جوتیارەکە تۆ دەکات ئەم جۆرە بنەتۆشی پێ دەڵێن .
29 ـ هاونیر :ـ
بەو وڵاخ و گوێدرێژانە دەگوترێت کە لە ژێر نیردان و بەرزیان وەك یەکە .

## بەشی پێنجەم

جوت دابەستن و تۆکردن .
جوتیار هەموو بەیانی یان کە لەگەڵ مەلا بانگ دان لە خەوهەولدەستا ، شیوی بۆ ئامادە کرابوو دەی خوارد .
شیوەکەش بە زۆری ئەمانەبوو :ـ شلەساوەر ، نیسك ، بروێش ، دۆبەکەشك ، دۆینە .
نیوەڕۆیان ئەگەر نەهاتبایەوە نانی لەگەڵ یەك لەمانە بۆ دەچووە سەر جووت :ـ توور ، تەرەپیاز ، قەسپ ، مێوژ ، ماست .
دوای نان خواردن وڵاخەکانی با بلێین :
(ئێسترن) کورتان دەکرد . ئەگەر بۆ تۆکردن بووایە . ئەگینا تەنیا ئەو ئێسترەی سواری دەبوو کورتان دەکرد .
خرارە تۆیەکەی دەهاوێشتە سەر پشتی ئێسترە نێرەکی یەکەو مامزەی قەوچی ئێسترە نێرەکی یەکەی لە کێشەی تەنکێشی کورتانی هێسترە ماچەکەی هەڵدەکێشا . بە خۆی سواری ئێسترە ماچەکە دەبوو چونکە ئێستری ماچە لە ئێستری نێرەکی عەجوول ترەو باش نایەتە دوێ

هەوجارەکەی بە بەرەواژ ی لە پێشە خۆی دادەناو ڕەفیسکی لە بوغـازەکەی گیردەکردو بۆپارسەنگیش دەستێکی دەهاوێشتە سەر کلکەکەی.

جەلعە ئاوی بە هەوجارەکە شۆردەکردەوە.

یا غریـاغـر بۆسەر زەوی دەڕۆیشـت کە دەگـەیشـتـە سەرزەویـیـەکـە هەوجـار وتـۆیـەکـەی دادەنـاو کورتـانی لە ئێسترەکان دەکردەوەو بۆ جەلعەکەی دەکردنە سێبەر.

1 ـ جووت دابەستن :ـ

هەردوو ئێسـتـرەکـانی لەگـەڵ یەك جووت دەکـردن. پێکەوە بە قەوچـەکـانیان جەلەی دەکردن بن ملەکانی دەخستە سەرملیان وجـا نیـرەکـە بە جۆرێك ملی هەر ئێسترێك دەکەوتە نێوان دوو دار کلاوان تا ئێسـتـرەکـان نەتـوانن بەمبـلاو بەو لادا بچن کۆیـەلانـەکـانی لە پشت نیـرەکەوە دەخستە سەرملیان سەری دارکـلاوەکانی کە کەوتوونەتە لای پەرگە : «دەرەوە» لە لەی لێ کراوەو بە قوڵـفـە بەن قادەکـەی لێ گـیـردەکـرد جا سەری کۆیەلانەکانی لە ژێر ملی ئێسترەکان بۆیەك دەهێناوەو بە هۆی فرفـرۆکـەکـانەوە لەگەڵ دارکلاوەکانی پەرگە ڕەستا بەن قادەکە چەنـد بمـابـایـەوە لە قەدی کۆیـەلان ودارکـلاوەکـانی لای ژوورەوە دەئالاندو سەرەکەی لە دار نیرەکەگرێ دەدا لایەکەی تریش بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت: کۆیەلان دوو سوودی هەیە :ـ

أ ـ وەك بازنـە لە ملی ئێسـتـرەکـان هات وچۆدەکـات نایەڵێت توندی بکەوێتە قوڕگیان و تەنگە نەفەس ببن :ـ

ب ـ لە سەرەوە نایـەڵێت دارنیـرەکـە بچێتـە سەر شانی هێسترەکان بریندار یان بکات.

سەری مژانەکەی لە بۆسەکەی هەڵدەکێشاو گاینجەکەی لە کونی مژانـە دەنـا گوریسێکی درێـژ کە پێی دەگـوترێت: دەست جلەو لە زەنـاخـەی قەوچی ئێسـتـرەکـانی دەخست ناوەنـدی گوریـسـەکـە بە سەری دار نێـرەکـە بۆ پشتەوەی دەهێناوە لە دەستەندووەکەی دەئالاند.

بە دەستی ڕاستـە دەستـە مستـەکـەی دەگـرت و بە دەستی چەپـەش دارجـوت، هەچـەی لە ئێسترەکـان دەکـرد لەگـەڵ ڕۆیشتنی ئێسـتـرەکـان دەستی دا دەگـرت نووکی گاسنـەکـە لە زەوی ختم دەبـوو. پەڕەکـانیش تیژ ن خەتەکەیان بەرین دەکرد تا دەگـەیشتـە سەرسـەدەکـە پێش بادانەوە بۆئەوەی ئێسترەکان ئەزیـەت نە خۆن جوتیـارەکـە هەوجـارەکـەی بڵـند دەکـرد تا نەسـوورابـایـەوە نەیدەهێشت نووکی گاسنـەکـە بە زەوی بکەوێت جوتیارەکە لەگەڵ هۆدانەوە ئەمەی دەگوت :

هۆ ..ۆ.ۆ.. وەرە یا دەی گوت.. هۆ ..ۆ...ۆ ...وەرە هەرە دایکم.

ئەگـەر بە لای چەپ دا بای بدابـایـەوە دەسـت جلەوی چەپەی بۆخۆی ڕادەکێشا ئەگەر بادانەوەکە بە لای ڕاستەبووایە دەست جلەوی ڕاستـەی ڕادەکێشا ئەگەر جوتیارەکە بیویستبایە هێسترەکان ڕابگرێت پێ ی لە سەر قونکی ئاموورەکە دادەناو بە هەردوو دەسـت جلەوەکـانی بە یەکـەوە ڕادەکێشـاو ئەمـەشی دەگـوت. هۆ... ۆ... ش... ش سەرەوبنـە لە جوت کردن دا نیـە ئێسـتـرێـك دەکەوێتە لای کێڵگەکەو ئەوی تریش دەکەوێتە لایەکەی تر لە گەڕانەوە بە پێچەوانەیە بەڵام لە گێـرەو جەنجـەڕا وانیـە یەکیـان هەر لە لای چاوەیـەو پێی دەگـوترێت «بنـە» و ئەوی تر لە لای ڕۆخەیە. پێی دەگوترێت «سـەرە» جوتیـاری باش لە کێڵگەی ڕادیارە بە تایبەتی لە وەردو شۆدا قوولایی خەتـە جوتـەکـانی، لە دوورەوە لەمە سەر بۆ ئەو سەر دیارە هەمووی لە پاڵ یەك ڕاست وەك پشتی تفەنگ.

ئەم جۆرە جوتیـارە هەر وەکـو گوتمـان (250) فلس لە جوتیاری تر پتر دەدرایە.

کێڵگـەی جوتیـاری نەزان، لە هەنـدە جێیـان خەتەکانی تێکـەڵ تێکـەڵ بوون لە هەنـدە جێیـانیش شاش وپەرە لە نێوانیان دا دیاربوو.



**2 ـ تۆکردن :ـ**

پێش تۆکــردن جوتیــارەکــە زەوی‌یـەکـەی لات لات دەکـرد بەرانپیلێکی دەست دەدایە دوو سەری لە یەك گرێ دەدان و لە ملی خۆی هەڵـدەکێشـا لە تۆپڕی دەکرد دوو سەرەکەی تری بە دەسـتـەچـەپ دەگـرت و دەچووە ناولانەکە لە لایەکەوە دەستی پێ‌دەکـرد: چنگی ڕاسـتـەی لە تۆیـەکـە پڕ دەکـردو کە لە بەرانـپیلەکـەی دەردەهێنـا دەی پرژانـد تا پشتـەوەی خۆی هەنگـاوێکی گەورەشی دەنـا. ئەوەندە تۆیەی لە چنگی مابایە لەگـەڵ دەست گێـرانـەوە دەی پرژانـدو هەنگـاوێکی تری دەهـاوێـشـت بەم جۆرە تا دەگـەیـشـتـە سەری لاتـەکـە ئاوابەلایەکەی تریش دادەگەڕایەوە بەم دوو جارە تۆدانی لاتەکە تەواو دەبووە ئەگەر لاتەکە تەسك بووایە ئەگەر بەرینیش بووایە بۆ جاری سێیـەم بە ناوەنـدی لاتـەکـەدا دەچـۆوە کە پێی دەگـوتـرێت «نـاولات» بەڵام وەکو جارانی ‌‌گی خۆی تەواو پڕ نەدەکـرد کێـڵگـەی تۆ داخستنی زۆر ناوێت هەر تۆیـەکـە داپـۆشـرێت بەسـە بۆ ئەوەی ئەگـەر گەنـدە بارانێکیش ببارێت پێ‌شین ببێت دەغڵیش کە شین بوو درەنـگ دەفـەوتێت بەڵام ئەگـەر کێڵگـەکـەی قووڵ بوو بە گەنـدە باران شین نابێت و لە ژێرەوە دەپەنمێت و بە چەند ڕۆژێك دەفەوتێت لێرەدا پەندێکی کوردی هەیەو دەڵێت:

شەڕ لە شۆیێ نەك لە تۆیی واتـە کێڵگـە لە شۆدابکـەوێت نەك لە تۆکردن

# هەولێر

باسێکە لەبارەی بارو دۆخی رامیاریو ئابووریو
سەربازیو بەرێوەبەریو رۆشنبیریی هەولێر
لە سەردەمی ئەتابەکیدا
522 ـ 630ك/ 1128 ـ 1233ز

## لەسەردەمی ئەتابەکیدا

**پێشەکی: ـ**

ئەوەی کەشیاوی باسەو مایەی بەختەوەریو شانازییە، لەوەتی رۆشنبیران و هۆشمەندانی کورد هەستیان بە واقیعی گەلەکەیان کردووە، روویان کردۆتە ئەو کۆرەی کە خزمەتی سامان و کەلەپوورو بابەتی مێژووو جوگرافیاو ئەدەب وهونەری کورد دەکات، هەر بۆیەش ئەو لێکۆڵینەوەو باسانەی کە لەنامەی ماجستێرو دکتۆرادا پێشکەشی دەکەن و بروانامەی لەسەر وەردەگرن، راستەو خۆ هی نەتەوەو وولاتەکەیانە، یا هەرنەبێ پەیوەندی پێوە هەیە. لەراستیدا ئەم جۆرە هەوڵ و تەقەلایە مەیدانێکی فراوان لەبەردەمی رۆشنبیری کوردی دەکاتەوەو بەرەبەرە ئاسۆیەکەی بەرین، دەکات و، رێگە بۆ ئەو قوتابیو خوێنەرانە خۆش دەکات کەخۆیان بۆ ئەو ئەرکە پیرۆزە تەرخان کردووە، دەیانەوێ بابەتی نوێ ترو بەپێزتر بخەنە سەر خەرمانی رۆشنبیریمان.

دکتۆر محسن محمد حسین یەکێکە لەو کەسانەی لەم بوارەدا باس و نووسینەکانی بۆ بابەتی کوردی تەرخان کردووە، ئەم باسەی، کە لێی دەدوێین نامەی ماجستێرە، کە بەپلەی زۆرباش وەریگرتووە، زانکۆی بەغدا یارمەتیی بڵاوکردنەوەی داوە نامەی دکتۆراکەشی هەر لە سەر مێژووی کوردە، باسی صلاح الدین و سوپاکەیو چۆنیەتیی رێکخستنییەتی، کەهیوادارم لەدەرفەتێکی دیکەدا لێی بدوێم.

●لەسەر نووسینی:
کەمال غەمبار●

### چوارچێوەی باسەکەو
### بەرچاوخستنی سەرچاوە بنچینەییەکان

ئەو ماوەیەی کە باسەکە لێی دەدوێ لە سەدەیەك پترە، لەساڵی 522ك/ 1128ز تا 630ك/ 1233ز. ئەو ماوەیەی لە میرنشینی هەولێردا بنەماڵەی بەکتیکینی حوکمی کردو لە مووسڵ جیابۆوەو میرنشینییەکی سەر بەخۆی پێکهێناو ناوی نا میرنشینی ئەتابەکی.

ئەم ماوەیە لە مێژووی ئیسلامدا بە قۆناخێکی زۆر گرنگ دەدرێتە قەڵەم، ئەگەر سەبارەت بە مێژووی میرنشینی هەولێردا

لەهەموو قۆناخەکان گرنگتر نەبێ، کەتارادەیەکی بێهاوتاتیایا ژیان گەشەی سەندو گۆڕانێکی باشی بەخۆیەوە دی.

ناوچەکە لە گۆڕانکاری‌یەکی نائاسایی دابوو، گەلێ ڕووداوی گەورە گەورە لەڕووی باری ڕامیاری‌و ئابووری‌یەوە ڕوویدا، هەروەها لەبواری ڕێکخستنی سەربازی‌و بەڕێوە بردن و دارایی‌و هی‌دی‌دا.

ئەم ماوەیە سەرهەڵدانی سیستەمی ئەتابەکی بەخۆوەدی، کە ئیمپراتۆریەتی سەلجووقی شەق و پەق کردو لەسەر دارو پەردووەکەی حوکمرانی کۆمەڵێك بنەماڵەی تورك هاتە کایەوە کە دامەزرێنەرەکانی لە پیاوانی دەباری سەلجوقی بوون. جگە لەمەئەو ماوەیە هاوچەرخی سەرەتای قۆناخی «ڕاپەڕینی ئیسلامەتی» بوو دژی خاچ پەرستەکان و، سەرەتای شاڵاوە درندانەکەی مەغولەکان بوو بۆ سەر ئەم ناوچەیەو هەرەس هێنانی ئەو شارە ئیسلامییانەی کەوتونەتە ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی بەرامبەر دەس وەشان و زەبرە بەئێشەکانیان کە ماوەیەکی دوورو درێژی خایاند.

هەموو ئەم ڕووداوانەو چەند ڕووداوێکی تریش ئەو باك ڕاوندە، (پاشەك - خلفیة) مێژوویی‌یەیان دروست کرد کە تیادا میرنشینی ئەتابەکی سەری هەڵداو گەشەی‌سەندو، بوی‌لواکە دەوری مێژوویی تایبەتی‌ی خۆی لەو قوناخەدا ببینێ، پاش ئەوەی کە بووە خاوەن هێزێکی سەربازی‌و سیاسەتێکی بەکارو دیار.

لەم لێکۆڵینەوەدا جۆرەها جمو جوولی خەڵکی‌تیایە، ڕووناکی دەخاتە سەر خاسیەتەکانی ئەو قوناخەی کە ئەم میرنشینە پیادا تێپەڕیوە، بەر لەوەی حوکمی بنەماڵەی بەکتیکینی سەر هەڵ بدات، کە میرنشینەکە پارچەیەك بوو لە ئیمپراتۆریەتی سەلجوقی یاخود میرە هەزبانی‌یە کوردەکان حوکمیان دەکرد، پاشان هەولێر بووە پارچەیەك لە ئەتابەکی‌یەتی موسڵ پاش ئەوەی عمادالدین زەنگی داگیری‌کردو هەر یەکسەر دایە دەست سەرکردەی سوپاکەی زین الدین علی کوچکی کوری بەکتکینی دامەزرێنەری ئەتابەکی‌یەتی هەولێر.

باسەکە لە بابەت ئەو زۆرانبازی‌یەدا دەدوێ کە لە نێوان مظفرالدین کۆکبەری کورە گەورەی زین الدین علی کوچك و دوا جێگری ڕوویدا، کە بووەهۆی دوور خستنەوەی مظفرالدین کۆکبەری لە حوکم و دەرکردنی لە هەولێر، ودانانی برایەکەی خۆی، زین الدین یوسف ینالتکین کورە هەرە بچووکی زین الدین علی کوچك لە شوێنی ئەودا پاشان هێری نوێ میرنشینەکەی خۆی لەئەتابەکی‌یەتی مووسڵ جیاکردەوەو بووسەریە صلاح الدینی ئەیووبی.

لەبابەت پەیوەندیی دەرەوە، لە پەیوەندی‌یەکانی دەرەوەی میر نشینەکە دەدوێ‌و لەپەیوەندی لەگەڵ مووسڵەوە دەست پێ‌دەکات کە بەشێوەی بەردی بناغە بوو لەگەڵ هێزەکانی تردا. پاشان لەبابەت پەیوەندیی میر نشینەکە لەگەڵ ئەیوو بی‌یەکان و لەگەڵ خەلیفەی عەباسی‌و سولتانی خوارزمی جلال الدین و هێزە ناوخۆیی‌یەکانی تر. تێبینی ئەوە دەکرێ کەبەشی پەیوەندی‌یەکانی دەرەوە لەبەر پچڕانی دەنگوباسی هەندێ ساڵ، هەندێك تەمومژیان پێوەدیارە، بەڵکو وەك دەبینین ئەم پچڕانە چەند ساڵێکی دوورو درێژ دەخایەنێ، هۆی ئەمەش لەبەر نەبوونی سەر چاوەیەکی گشت لایی‌یە کەمێژووی ئەم میرنشینە بگرێتەوە، هەروەها وون بوونی کتێبی «ابن المستوفي» یە کە ڕووناکی‌یەکی تەواوی دەخستە سەر هەندێ ڕاستی‌و ڕووداو بەشێوەیەکی باشتر.

بەشی دووەمی باسەکە لە نەخشەکانی شاری هەولێر دەکۆڵێتەوە، کە دانەر بایەخێکی تایبەتی بەمنارەکەو قەڵاتەکەی داوە، وەکو دەبینین ئەم شارە لە وسەردەمەدا زۆر گەشەی سەندووەو پێشکەوتووە، کەتیایا دام و دەزگەی ئایینی‌و زانستی‌و خێرخوازی زۆر گرنگ دەرکەوتوون، هەروەها وەزیفەکاری هەمە جۆر «ڕێکخستن و دیوانەکان» کە لەم میرنشینەدا سەریان هەڵدا، جا لەوانەبێ کە بەر لە سەردەمی ئەتابەکی هەبوون و پاشان لەم سەردەمەدا گەشەیان سەند وەك وەزارەت و دادگەری‌و

هیتر، یاخود لەسەردەمی لەتابەکی دەرکەوتبن.

دانەر دان بەوەدادەنێ، کە زانیاری لە بابەت بارودۆخی ئابووری‌و کۆمەلایەتی دەس نەکەوتووە، بەتایبەت دەربارەی ئاستی گوزەران و پایە وشوێنی ئافرەت، هەروەها ئەوداب ونەریت و خووڕەوشتانەی ئەو کاتە باوبوون، بەلام ئەو بەپێی ئەو سەرچاوانەی چاوی پێ‌کەوتوون باسی ژیانی ئابووری کردووەو پەنجەی بۆ دەزگاکانی چاکەو خێرات راکێشاوە کە مظفر الدین کۆکبەری دایمەزراندبوون، ئەمەش بایەخی ئەوکار بەدەستە نیشان دەدات کەچۆن بەتەنگە چینەیێ دەرامەتەکان و بێوژن و دەستە پاچەکانەوە هاتووەو، هەموو ساڵێ بەبۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەری مەزنەوە (د) ئاهەنگی کردووەو بۆتە نەریتێکی ئەم شارەو لەویشەوە لە شوێنەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبۆتەوە.

لەو بەشەی بۆ ژیانی رۆشنبیری تەرخان کردووە باسی مەڵبەندەکانی خوێندن دەکات وەك قوتابخانەکان و یانەی حەدیث و خانە قایەکان و، دەزگای تری خوێندن، هەروەها بنەماڵەی دیاری رۆشنبیری وەك بنەماڵەی ابن خەلەکان و ابن المستوفی‌و ابن منعەو، سەر گوزشتەی شەخسیاتی رۆشنبیری تری هەولێری‌و کۆری چالاکی فیکرییان. لە ژیننامەی ئەو پیاوە ناودارە رۆشنبیرو رووناکبیرانە دەدوێ کەسەریان لە هەولێر داوەو ماوەیەك بۆ دەرس وەوتنەوە لەدەزگا زانستی‌یەکانیدا ماو نەتەوە یاخود هەولێریان کردبووە هەوارگەی خۆیان.

مامۆستا محسن ئەو سەرچاوە گرنگانەمان دەخاتە بەردەم کەپشتی پێ‌بەستوون باسەکەی لەسەر هەڵچنیون، وەك خۆی دەڵێ پێویست بەو هەموو کتێب و سەرچاوانە ناکات کەیەك یەك شیان بکاتەوە، چونکە لیستەیەکی گەورە پێك دێنن لە کتێبی عەرەبی‌و بیانەی کۆن و نوێ، چاپکراوو دەست خەت، بەڵکو ئەو تەنیا سەرچاوە بنچینەیی یەکان باس دەکات و، کتێبێکی تایبەت بە هەولێر لەبەر دەستی نەبووە کە ئەرکەکەی ئاسان بکات بۆیە ناچار بووە پەنا باتە بەر ئەو کتێبانەی کە باسەکانیان و بابەتەکانیان هەمە جۆرن، تەنانەت کتێبەکەی (ابن المستوفي)یش کە لەوانە بوو ببێتە سەرچاوەیەکی بنچینەیی بۆ مێژووی هەولێر ئەویش وون بووە.

رەنگە ابن الأثیر (630ك/ 1233ز) سەردەفتەری ئەو مێژوو نووسانە بێ کە دانەر پشتی پێ‌بەستووە، کتابە بە نرخ و بەهایەکەی «الکامل في التأریخ» نموونەی کارامەیی‌و قەڵەم رەنگینی ئەو زاتەیە، هەروەها کتێبی «التأریخ الباهر في الدولة الاتابکیة». ابن الاثیر ژمارەیەك لەو مێژوو نووسانە ناودەبات کە هاوچەرخی ئەو بوون. لەوانە (ابوشامە وابن واصل و ابن العبری..) جگە لەمانە دانەر ناوی چەند مێژوو نووسێکی تر دەبات وەك «الذهبي وابن کثیر».

بەلام ئەو مێژوو نووسانەی لەبابەت جمو جوولی دامەزرێنەری میرنشینی هەولێر دواون ناوی ابن القلانسي (555ك/ 1160ز) دێنی لەکتێبەکەی «ذیل تاریخ دمشق»و، ابن الجوزی (597ك/ 1200ز) لە کتێبی «المنتظم في اخبار الملوك والامم»، هەروەها هەندێ سەرچاوەی تر وەك (الفتح القسي)ی العماد الکاتب الاصفهاني وعلی شداد لەکتێبی (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية).

دەربارەی باس کردنی کتێبی سەر گورشتەو چینەکان کەبایەخێکی گەورەی هەیە کاتێ قسە دێتە سەر ئەو شەخسیەتانەی هەولێرین ابن خەلەکان (681ك/ 1282ز) لەپێشەوەی ئەو مێژوو نووسانە دەوەستێ، ئەویش لەبەر ئەوەی ماوەیەك لەتەمەنی لاوێتی لە هەولێر ژیاوەو، لەو رووداوانە ئاگاداربووە کە لە دەوروبەری روویدەدا و، لە کتێبە ناودارەکەیدا «وفیات الاعیان وانباء ابناء الزمان» تۆماری کردبوون، هەروەها چەندین کتێبی‌تر. لەو کتێبانەی لەبابەت رێکخستنەوە نووسیویانە ناوی کتێبەکەی قدامە بن جعفر (320ك/ 932ز) «کتاب الخراج وصنعة الکتابة» دێنی هەروەها هی‌ماوەردی‌و ابن مماتي‌و قەلقەشەندی وهیتر.

وە لەشار ناسەکان ناوی یاقوت الحموی دێنی لە (معجم

البلدان) کەباسی شاری هەولێر دەکات، خۆی دوو جار سەری لێداوە باسی بازارەکەی‌و قەیسەرییە بەناو بانگەکەی‌و بیرە ئاوساز گارو شیرینەکانی‌و ئەو کوردانە دەکات کە تیادا دەژین. لەدواییدا ناوی هەندێ سەر چاوەی تری عەرەبی‌و فارسی دێنی کەسوودی لێ وەرگرتوون، لەبابەت شوێنەواری مێژوویی‌یەوە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە جگەلە منارەکە و هەندێ گورستان هیچ شتێکی تری نەدیوە پەیوەندی بە نەخشەکانی شارەوە هەبێ، بۆیە ئێمە پێویستمان بەو بروانامانە هەیە کەپشتگیری گەلێ مەسەلەی مێژوویی دەکات.

ئەمەی کە لەپێشەوەدا باسمان کرد سەرەتایەك بوو بۆ کتێبەکە، دوایی دانەر دوو دەرگای سەرەکیمان بۆ والا دەکات، دەرگای یەکەم، یاخود دەروازەی یەکەمین بەناوی مێژووی سیاسی‌یەوەیە، ئەویش دەکاتە دوو بەش و چواربەند. دەروازەی دووەمیش لە بارەی مێژووی ژیاری‌یە کە کردوویەتی‌یە سێ‌بەند. لەکۆتایی باسەکەیدا سێ خشتەو پێنج پاشکۆی بۆ داناوە.

کەدێتە سەر مێژووی رامیاری، لەبەشی یەکەمدا تەرخانی کردووە بۆ میرنشینی هەولێر لەسەردەمی ئەتابەکی لەدامەزراندنی‌یەوە تا مردنی زین الدین یوسف (586ك/ 1190ز)، لەبەندی یەکەمدا بەدرێژی باسی چوار خاڵی گرنگە دەکات وەك: بێ‌هێز بوونی دەوڵەتی سەلچووقی‌و سەرهەڵدانی میرنشینە ئەتابەکی‌یەکان و، واتای ئەتابەك نەژادی ئەتابەك. لەخاڵی دووەمدا لەشاری هەولێری کۆن (کۆنە هەولێر)و دەرکەوتنی سەر لەنوێی لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا دەدوێ. خاڵی سێیەم لەبارەی داگیر کردنی هەولێر، لەسەردەمی ئەتابەکی‌و خستنە سەر میرنشینی مووسڵ.»

خاڵی چوارەم لەبابەت زین الدین علی کوچك، دامەزرێنەری میرنشینی هەولێری ئەتابەکی، یەوەیە.

هۆی سەرەکی کزی‌و لاوازی دەوڵەتی سەلجووقی بەوەڵێك دەواتەوە کە لەسەرەتادا، ئەوکاتەی دەسەڵاتی راستەقینە لەدەست سەلجووقی‌یەکان بوو و توانیان بەسەر دیاردەی داهێزران و لێك ترازان و پارچە پارچە بوونی هەرێمەکانی ئیسلامیدا زاڵ بین و تارادەیەکی زۆر یەکیان خەن، هەر چەندە کە یاسای خودموختاری لەوناچەو هەریمانەدا پێرەو کرد کە رەنگدانەوەی سیستەمی «زەوی دابرین» بوو کە سەلجووقی‌یەکان گونجاندیان، بەڵام هەر ئەم رێبازە خۆی، ئەگەرچی یەك لەرواڵەتەکانی هێزی حوکمی سەلجووقی بوو لە رۆژانی هەرەتی حوکمی‌دا، بەتایبەتی کە شەقڵێکی سەربازی‌و بەرێوەبردنی بەخۆیەوە دی، بووە بەڵایەکی گەورە بەسەر شانیانەوە، هەشە کزی‌و لاوازی نیزامەکە بۆ سەرهەڵدانی میرنشینی ناوخۆیی کە بەئەتابەك ناسرابوون، دەگەرێنێتەوە کە لە دەوڵەتی سلجوقی خۆی ترازان. پێرەوکردنی نیزامێکی ئاوادەکرا بێ کاتێ کە سەرەکی دەوڵەت پیاوێکی بەهێزی وەك سولتان ملکشاه (485ك/ 1092ز) کوچی دوایی کردووە - بوو کە دەسەڵات شکۆیەکی زۆری لە ناو خەڵکا هەبوو وجڵەوی کاروباری دەوڵەتی لەدەست بوو، خۆی سەرپەرشتی نەخشە کێشانی سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەی دەکردو، وەزیرێکی کارامەی وەك نظام الملك یاریدەی‌دەدا، کەئەو وەزیرە بوو نیزامی دەرەبەگایەتی لەدەوڵەتی سەلچووقی دانا. کەپێش ئەوە دەرەبەگ نەبوو، کە نظام الملك دیتی کەزەحمەتە مایەی پێویست و خەڵە دەسگیربێ، دەستی‌کرد بەدابەش کردنی سەر بازان بەشێوەی زەوی دابرین، دەیانچاندو ئاوەدانیان دەکردەوەو لەجیاتی مووچە بەرو بوومەکەیان دەس دەکەوت.

دانەر واتای ئەتابەك شی‌دەکاتەوەو دەڵێ: زاراوەیەکە لە دوو وشە پێکهاتووە «ئەتا» یاخود «ئەطا» واتە باوك، وە «بەك، بەگ» واتەمیر. واتە بەمانای بەگزادە، یا ئاغا، گەورە، لەوانەیە وشەی بەگ سووك کراوی «بیوگ»ی تورکی بێ کە تارادەیەکی زۆر مانای گەورە یاخود باپیرە دەگەیەنێ.

گوتراوە کە «ئەتابەك» بەمانای «میری باوك - باوکە میر -»دێ مەبەست لە «باوکی میران»»، بەڵام ئەوان مەبەستیان لەوشەکە

«پەروەردەکەری میر»ی سەلجوقی یە، یاخود «لەلە»یە کە منداڵی پاشاکان پەروەردە دەکات. هەیە لەسەر ئەو رایەیەکە ئەتابەك ناز ناوێك بوو لەلای فارسەکان نەك تورکەکان.

**نەژادی ئەتابەکی یەکان:**

خۆیان میرەکانی دەباری سەلجوقی بوون، کە لە باوەشی سولتانەکان پێگە یبوون و لە نەژادا لەو تورکانە بوون کە لەناوەراستی ئاسیاو وولاتی قەبجاقەوە هێنرابوون و، هەر زوو لەشوێنی پان و بەرین و بەرفراوانی زەویی ئیسلامیدا بلاو بوونەوە، بەتایبەتی لەسەدەی پێنجەم وشەمی کۆچی دا. ئەو میرانە پایەی گەورە گەورەیان لە دەرباری سەلجوقی یەکان دەسکەوت و خزمەتی باشیان بەئاغاکانیان گەیاندو، لەپێناویاندا لەخۆیان بورد، یەك لە ئەرکەکانیان پەروەردەکردنی منداڵی سوڵتانەکان بوو، لەبەر ئەوەی جێگەی رەزامەندیو مایەی باوەری ئەوان بوون، ناز ناوی «باوکە گەورە»یان پێ بەخشرا.

دەبێ پەنجە بۆئەوە درێژ بکرێ کەمیرە ئەتابەکی یەکان گشتیان پەروەدەکەری منداڵان نەبوون لەکن سەلجوقی یەکان، بەلام دەرکەوتن و بەرزبوونەوەیان لەو ماوەیەدا وای لێ کردن بچنە ژێر ئالای هەمان ناوەوە، واتە ناو لێنانیان بە ئەتابەکی..

**شاری کۆنە هەولێرو دەرکەوتنی سەر لەنوێی لەسەدەی پانزەمی زایینیدا:**

هەولێر وەك گرنگترین شار لەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە نێوان زێی گەورەو زێی بچووك نیشان دەدات، کە سەردەمی دوایی عەبباسی بووە بنکەی وولاتی شارەزوور. ئەوشارە زۆر دێرینە لەسەردەمی فەتحی ئیسلامی بۆ ماوەی چەند سەدەیەك بووە شارێکی بچووکی نەناسراو، بەجۆرێ شارە ناسەکان و مێژوو نووسە موسلمانەکان بەدرێژایی چەندین سەدە ئاوریان لێ نەدایە وەوپشت گوێ خرا. بەلام وەنەبێ شوێنە واری نەمێنێ، لەسایەی ناوە کۆنەکەیەوە توانی خۆی بگرێو بمێنێ، هەر چەندە تووشی هەندێ گۆڕین هات لە ئەنجامی ئەو نەتەوە زۆرانەی تیادانیشتن، یابوون بەدراوسێی.

گرنگی ی هەولێر لەسەدە کۆنەکانەوە دەرکەوت کە بووە بارەگای خواوەندی ئاشۆری یەکان و عەشتار، لەم ڕووەوە وەك «دلفس»ی شارە پیرۆزەکەی یۆنان بوو، بەڵکو لەسایەی شوێنی نایابی یەوە لەویشی تیپەراند، چونکە کاروان سەرابوو، لەبەرئەوە لەناو شارە ناودارەکانی تری ئاشۆردا تاك و تەنیا بوو، کەمایەوەو بەدرێژایی چەندین سەدە ناوەکەی پاریزراو بە سەر زمانی بازرگان و گەریدەو خەڵکی تر بوو کەچی شارەکانی دیکەی ئاشوور بەرەبەرە لەناوچوون و، هەولێر توانی زیاتر لە سێ هەزار ساڵ خۆی بگرێ، ئەوەش بوو وای کرد ناوی هەولێر لەسەدە کۆنەکان دەرکەوت، لەو شەڕە دابڕەی لەنێوان ئەسکەندەری گەورەو دارای پاشای فارسەکان کە ساڵی 331 پ. ز لە نزیك ئەوە ڕوویدا، ئەو شەڕەی کە لە مێژووی کۆندا بەناوی «شەڕی ئەربیللا» ناوی دەرکردو کەتیایا ئەسکەندەر دەستی بەسەر شاری بابل، پایتەختی یەکەم ئیمپراتۆریەت لەناوچەکەدا داگرت. هەولێر ئەو کاتەش لەشارە بەناوبانگەکانی ناوچەکەبوو.

لەسێ سەدەی یەکەمی مێژووی ئیسلامی ئەم شارە ناوێکی ئەو تۆی نەبوو، بەلام لەدواینی سەدەی سێیەم و سەرەتای سەدەی چوارەم چەند مێژوو نووسێك وەك شارێکی بچووك ناوی دەبەن، تابەرە بەرە دێ دەرکەوێ ودیاربێو دەبێتە مەڵبەندی میرنشینی هەزبانی کە حوکم کردنەکەی تاپاش ساڵی 520ك/ 1126ز بەردەوام بوو.

دوا بەدوای ئەوە دانەر باسی چۆنیەتی ی هەولێر دەکات لەسەردەمی ئەتابەکی یەکان و چۆن خرایە سەر میرنشینی مووسڵ، کەپێش ئەو خرانە سەرە، تیرەی هەزەبانی حوکمرانی دەکردو پێشەواکانی ئەو تیرە کوردە لەسەر دەسەلاتداری ئەو شارە ناخۆشیان کە وتەنێوانەوە وچۆن عمادالدین زەنگی داگیری کردو خستی یە سەر ئەتابەکی یەتی مووسڵ و، مێژوو نووسەکان لەساڵی ئەو خستنە سەرە رای جیاجیایان هەیەو ئەوەش لەوانەیە بگەرێتەوە سەر دیارکردنی ساڵی ڕووداوەکەو ئەو مێژوو نووسانە هاوچەرخی نەبوون. تەنانەت ئەوانەی هاوچەرخیش بوون ناوی ساڵە کەیان خستە پشت گوێ چونکە بەلای ئەوانەوە

هەواڵێك بوو شیاوی باس كردن نیە. هەروەكو ووتمان جیاوازی لەنێوان مێژوو نووسەكان هەیە لەبابەت دیاركردنی ساڵی داگیر كردن، بەڵام هەموویان لەسەر ئەو ڕایەن كە عمادالدین زەنگی داگیری كرد، پاش ئەوەی داگیر كردنەكە سەبارەت بە میرنشینەكەوە بووە مەسەلەیەكی زیندەكاری، چونكە پێویست بوو هەموو كار بەدەستێك لەسنووری وولاتەكەی دڵنیاو ئاسوودەبێ كە لەوانەیە تووشی هەرەشەیەكی دەرەوە ببێ. هەر لەبەر ئەوەش بوو بەلایەوە ڕاست نەبوو هەولێر وابمێنێتەوەو وازی لێ بهێنێ، چونكە بایەخێكی هەرەگەورەی هەبوو، دەروازەیەك بوو میرنشینی موسڵی لە ناوچە شاخاوییەكانی ڕۆژ هەڵات جیا دەكردەوەو، وولاتی جزیرەی لە عەجەم جیادەكردەوە.

لەبەر ئەوە عمادالدین خۆی نەپونگاندەوە كەبچێتە ناو شەڕێكی توندو تیژ دژی جێگری سوڵتانی سەلجوقی كە حوكمرانی شارەكەی دەكرد. عمادالدین توانی چەند سەركەوتنێك وەدەس بخات، بەڵام جێگرەكە توانی بەرگری ئەم تەقەللایە بكات و لەگەڵ هێزەكانی لەقەلاتی شارەكەدا خۆی قایم كرد، پاشان جێگر پەیوەندی بەسولتانەوە كردو ئاگاداری بارو دۆخی شارەكەی كرد، ئەویش یەكسەر ئەوی پێویست بوو كردی بۆ ئەوەی بەرگری لەبوونی سەلجوقی بكات كە كەوتۆتە بەر ترسی هەرەشەكردنی عمادالدین و، لەمەترسی كارەكە گەیشت و، ئەو ئەنجامە خراپەی بەدوایەوەی دێ خستە بەر چاوی خۆی. خۆی سەركردەی لەشكری كرد بۆ فریاكەوتنی جێگرە گەمارۆدراوەكەی و گەیشتە هەولێر. ئەوكاتە عمادالدین وازی لە گەمارۆدانەكە هێناو بریاری دا بگەڕێتەوە موسڵ، بەڵام لەڕێگادا وەستاو چاوەڕوانی كرد تابزانێ چ گۆڕانكارییەكی بە دواوەدێ، لەكن زێی گەورە دابەزیو نامەی بۆ سولتان ناردو نامەبەر لەنێوانیاندا هاتۆ چۆیان كرد، تا لەسەرپەیمانی ئاشتی ریك كەوتن و بەپێی دەقەكە عماد الدین لەژێر سایەی سوڵتان دادەبێ و وەك نێوكار (وسیط)ێك دەكەوێتە نێوان ئەوو نێوان خەلیفە مسترشد، بەڵكو خەلیفە دانی پیابنێ وەك سوڵتانێ و لەسەر دوانگەكانی بەغدا خوتبە بەناوی ئەو بخوێنێتەوە.

بەپێی ئەو ڕێكەوتننامەیە سوڵتان هەولێری دایە ئەتابەكی موسڵ عمادالدین زەنگی كە ئەویش بۆ میر زین الدین علی كوچك دایبڕیو لەم ڕووداوەوە بووە پارچەیەك لە ئەتابەكییەتی موسڵ.

چوارەم خاڵ كە دانەرلێوەی دەدوێ باسی زین الدین علی كوچكی دامەزرێنەری میرنشینی هەولێری ئەتابەكییە، كە سەركردەی سوپای موسڵ بوو، لەلەدایك بوونی زین الدین دەدوێت، جا دێتە سەر بەشداری كردنی لەدامەزراندنی ئەتابەكییەتی موسڵ و دەوری لە سەردەمی قطب الدین مودود وپەیوەندی زین الدین بەنور الدین محمودی ئەتابەكی حەلەب و، شەخسیەتی زین الدین كەپیاوێكی ئازاو چاوتێرو ڕەوشت پاك و سوار چاك و قارەمانێكی ئیسلامی بووەو، جەنگاوەرێكی چاو نەترس بووەو، نازناوی «سوارەی ئیسلامی خاوەن هەولێرەی پێ دراوە.

زین الدین علی كوچك كەكوێرو كەڕ دەبێو، پیرییەتی تینی بۆ دێنی، ناچار دەبێ لەموسڵ دەرچێو دێتە هەولێر. ماوەیەكی كەمی تیا دەمینێتەوە لەبەر پیریو كەنەفتەیی دەمرێو، لەو خاكەی كە بەناوی خۆیەوە ناسراوە لەدواییـنی ساڵی 653ك/ 1168ز دا دەنێژرێ، كە لە تەك مزگەوتی كۆنی ناو شوورەی شاری هەولێر دابوو.

زین الدین زۆر شوێنەواری لەدوای خۆیدا بە جێهێشت وەك قوتابخانەو پر دوهیتر، قوتابخانەی زینییە كە هەمیسان بە قوتابخانەی یونس النحوی الاربیلی ناوی دەركردووە ئەو دروستی كرد.

لەبەندی دووەمدا دانەر بە درێژی باسی جێگرەكانی زین الدین علی كوچك دەكات كە حوكمی هەولێریان گێڕاوە. لەوانە: سرفتكین عبدالله الزینی، مجاهد الدین قایماز عبدالله الزینی، میر زین الدین یوسف نیالتكین.

بەشی دووەمی باسەكە بۆ حوكمرانی مظفر الدین كۆكبەری تەرخان كراوە كە حوكمی هەولێری كردووەو، میرنشینی هەولێر لەسەردەمی ئەودا چۆن بووەو، مظفر الدین چ دەورێكی گێڕاوە.

که هەر چەندە ئەو توانی دوژمنەکانی لە دەسەلاتی حوکم، یا گێرانی کاروباری میرنشینەکە دوور خاتەوەو دەست بەسەر ماڵ و موڵکیان دابگرێت و، ئەو تەقەلایانە بوگۆرانکاری سەلبی دەدرێنە قەڵەم، بەلام نابێ ئەوە لەبیر بچێ، کە گۆرانکارییەکان لەم سنوورەیان تێپەر کردو، لەم رووەوە کۆمەڵێك وەزیفەو کارمەندی نوێی دانا، کە لەگەڵ بارو دۆخی قۆناخە مێژوویی نوێیەکەدا دەگونجان. لەبەر ئەوەی کە دەوروبەری بە هێزی دوژمنکار دەورەدابوو، ناچار بوو بایەخ بەرێکخستنی کاروباری میرنشینییەکەی بدات، بەتایبەتی کاروباری سەربازی، بۆ ئەوەی هێزێکی ئەوتۆی هەبێ پشتی پێببەستێ، چونکە بێ هێزێکی خۆراگری بەتین ناتوانێ بەرامبەر ئەتابەکی مووسڵ بوەستێ کە بەهێزترین هێزبوو لەناو چەکەدا.

بەندی سێیەم لە پەیوەندییەکانی دەرەوەی میرنشینی هەولێر لەسەردەمی مظفرالدین کۆکبەریدا دەدوێ، وەك پەیوەندی لەگەڵ ئەتابەکییەتی مووسڵ لەزەمانی عز الدین مسعودو، پەیوەندیی نێوان هەولێرو ئەتابەکییەتی مووسڵ لەزەمانی نورالدین ارسلان عزالدین مسعودی کوری، ئینجا پەیوەندی نێوان مظفرالدین کۆکبەریو مووسڵ لەسەر دەمی بدالدین لۆلۆو، نوێ بوونەوەی مل ملانێی نێوان هەردوو میرنشینی هەولێرو مووسڵ لە ساڵی 621ك/ 1224 زایینیدا.

لەرووی پەیوەندیی مظفرالدین بەئەیوبیی یەکانەوە، دانەر بەشێوەیەکی دوورو درێژ لە پەیوەندی لەگەڵ صلاح الدینی ئەیووبی دەدوێو، رووناکییەکی زۆری دەخاتە سەر، کە مظفرالدین چ جۆرە چالاکیو جموو جوولێکی دیاری لەشەری خاچ پەرستەکاندا دیوەو، هەموو مێژوو نووسەکانی سەردەمەکە شایەتی ئەوە دەدەن کە لەپەلاماردانی شاری نابلس بەشداری کردو، لەگەڵ دوو میریتر سەرکردایەتی شەری صفوریەی کرد کەوا وەسف دەکرێ «شەرێك بوو سەری رەشی سپی دەکرد».

بەلام بەشداری کردنی لەشەری «حطین» لەزۆرور هەموو چالاکییە سەر بازییەکانییەوە بوو، کە چ دەورێکی کاریگەری دوا پێهێنەری تیادا نواندو، بایەخ و گرنگیی ئەم شەرە کە بەگرنگترین شەرەکانی خاچ پەرستەکان دەدرێتە قەڵەم نایەتە باس کردن، کە مظفرالدین چ ئازایەتییەکی تیا نواندو سەرکردایەتیی لاچەپی موسلمانەکانی دەکرد.

دواشەر کە ئەو سەرکردەیە بەشداری تێدا کرد ئەو شەرە بوو کە لەکن (عەکا)دا قەوما، صلاح الدین میرەکانی خۆی بانگ کرد بەشداری تێدا بکەن، میری مەزن مظفر الدین یەکەم کەس بوو کە پێڕاگەیشت. پاش ئەوەی شەر لەگەڵ خاچ پەرستەکانا دوایی هات، صلاح الدین رێگەی بەمیرەکان دا بگەرێنەوە وولاتی خۆیان، مظفرالدین یەکەم کەس بوو گەرایەوە. پاش کۆچی دوایی صلاح الدین لە (3ی ئاداری 1193ز)دا سەر چاوەکان هیچ شتێ دەرناخەن کە پەیوەندی لەنێوان مظفرالدین و خەلیفەکانی صلاح الدین هەبووبێ، بەتایبەتی الملك العزیز عمادالدین عثمان، هەر چەندە جۆرە پەیوەندییەك لەنێوان مظفرالدین و الملك العادل دروست بوو، ئەویش ئەوەندە پتەونەبووو کەم خایەن بوو.

لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی مظفرالدین ناچار بووو بەپێویستی زانی کە پەیوەندی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی عەبباسی بەهێزو پتەوکات، بۆ ئەم نیازە سەردانە بەناو بانگەکەی بۆ شاری بەغدا کرد، ئەویش پاش ئەوەی پەیوەندیی نێوان میرنشینی هەولێرو خەلافەتی عەبباسی پتەوبوو، خەلیفە مستنصر بالله داوای لە مظفرالدین کرد کە سەرێك لەبەغدا بدات و ئەویش سەردانەکەی پێخۆش بووو خۆی ئامادەکردو لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی (1230ز) داسەفەری کردو کلیلی هەولێرو ئەو قەلاتانەی سەربەئەون لەگەڵ خۆی هەڵگرت، تاکو پێشکەشی خەلیفەی بکات، بۆ ئەوەی رێگا خۆش بکات بۆ پێشکەش کردنی میرنشینییەکە بۆ مەملەکەتی خەلیفەو سەر بەئەوبێ.

مظفرالدین پێشوازییەکی گەورەی لێکراو، خەلیفە بایەخێکی زۆری بەسەر دانەکە داو، رێزی تەواوی لێناو کۆمەڵێك دیاری بەنرخ و باش، باشی پێشکەش کراو، بووە

باوەڕپێکراوی خەلیفەو یەك لەسەرکردە بەوەجەکانی بۆزاڵ بوون بەسەر هەر بزوتنەوەیەکی دژ بەخەلیفەو، لەمەش زیاتر پاراستنی بەغدا، هەر جارێ بکەوتبایە بەر شاڵاوی مەترسی.

لەبەندی چوارەمی کتێبەکەدا دانەر باسی سەرگوزشتەی مظفرالدین و پایەو شوێنی دەکا لەمێژوودا، بەدرێژی لەدایك بوونی و چۆنیەتی پێگەیشتنی رەوشتەکانی دەکات، رای کۆمەڵێك مێژوو نووسی باوەڕپێکراو دێنێتەوە ئینجا دێتە سەر ئاهەنگێرانی لەدایك بوونی پێغەمبەر (د) لە هەولێر، دوا بەدوای ئەو مردنی مظفرالدین و ناشتنی و کۆتایی ئەتابەکیەتی مووسڵ.

دەروازەی دووەم «مێژووی ژیاری»یە، ئەمەش نەخشەکێشانەکانی شاری هەولێرو. قەڵات و، منارەی مظفریەو ئەو دام و دەزگایانەی کە مظفرالدین لەهەولێر داینان، سێیەم خاڵ ژیانی ئابوورییە لەمیرنشینەکەوا.

دەربارەی نەخشەکێشانەکانی شاری هەولێر دەگاتە سەر ئەو رایە کە شارەکە لە سەدەی شەشەم و حەوتەم دەستی کردووە بە گەشانەوەو فراوان بوون و پەرەسەندنی ژیان تیایا، کە شارێکی تەواو بووەو جێگەی خەڵکی تیا نەبوتەوە، ئەمەش بوتە هوی پەرەسەندنی بەشی خوارەوەی شارەکە بەتایبەتی لە سەردەمی مظفرالدین کۆکبەریدا.

لەو شوێنەوارە دیارانەی هەولێری ئێستا مامۆستا محسن ناوی دوو شوێنەوار دێنێ، کە یەکێکیان سەرەتای شوورەکەیەو دووەمیان کۆتاییەکەی، شوێنەواری یەکەم گۆڕە ناسراوەکەی - بەهەڵە لەکن خەلك - بە مەزاری سولتان مظفرالدین کە دەکەوێتە رۆژاوای شار، خۆی ئەو رایە پەسند دەکات کە گۆری زین الدین علی کوچك بێت. دووەم شوێنەوار مزگەوتی (الکف)ە - ناولەپ - کە قەزوینی دەڵێ بەردێکی لێیە شوێنەواری ناو لەپی مرۆڤی لەسەرە، خەڵکی هەولێریش قسەی زۆری لێوە دەکەن و، بێگومان شتێکی سەیرە. هێشتاش شوێنەوارەکە ماوەو قسەی سەیر سەیریش هەربەردەوامە.

هەندێ پاشماوەی کۆن ماوەتەوە - گۆرستان و خانەقا - رەنگە مێژووی هەندێکیان هی سەردەمی ئەتابەکی بێ.

قەڵاتی هەولێریش شارێکی تەواو بوو، بازارو خانووو بەرەی خەڵك و مزگەوتی نوێژکردنی تێدابوو، هەروەها ئەو قوتابخانەی، کە میر سرفتکین الزینی بینای کردو ناو نرا قوتابخانەی قەڵات، پاشان قەڵا بووە بارەگای رەسمی میرنشین و دیوانەکان و بەندیخانەی تیا بوو، بەکەمی دوو دەرگای بەرانبەر یەکی هەبوو، یەکێکیان دەروازەی باشوور کەبەسەر ئەو گۆڕە پانە دادەنوارێ کە قەڵات لە قەیسەری جیا دەکاتەوە دەروازەی دووەم، ئەو دەروازەیە، کە رووی لە عەنکاوەیە، کە گەورەترین دەروازە بووە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە قەڵاتی هەولێر دوو دەرگای زیاتر هەبووە، بێگومان قەڵاتی هەولێر شوێنێکی سەخت و قایم بووە بەجۆرێ تەنانەت مەغولەکانیش پێیان نەکرا بیگرن، رشیدالدین فضل الله‌ی همەدانی بە قەڵاتێکی بێوێنەو هاوتای دەداتە قەڵەم.

دانەر بەدرێژی باسی منارەی مظفریە دەکات کە لە چی دروست کراوەو شێوەکەی چۆنەو. ئینجا رووناکی دەخاتە سەر دەزگاکانی دروستی و کۆمەڵایەتی کە مظفرالدین دایمەزراندن بۆ خزمەتگوزاری لێقەوماوو نەخۆش و دەست کورت و هەژارو منداڵی فرێدراوو بێوەژن، لەوانە نەخۆشخانەکان کە هەریەکە چەند بەشێکی تیابووە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش و جێگەی داوو دەرمان بەرێوەبردنی، مظفرالدین بۆخۆی سەری لە خەستەخانەکان دەداو لە کاروباری ئەو نەخۆشانەی لەوی خەوتوون دەدواو لەبارو جێگەو پێویستیەکانیانی دەکۆڵییەوەو پرسیاری لێ دەکردن. هەروەها چەند خانەقایەکیشی بۆ کوێرو نەخۆشی درێژ خایەن کردبۆوە، هەر چیەکی پێویستیان پێ هەبوو بۆی مسوگەر کردبوون و مووچەی بۆ بریبوونەوە، بەمە لەسواڵکردن و دەست پانکردنەوەو لە کۆڵانە گەران دەربازی کرد بوون هەروەها داڵدەی بۆ هەتیوانی وولات و ئەو هەژارانە کردبۆوە کە کەسیان نەبوو بەخێویان بکات، کاتی تایبەتی دانابوو بۆ سەرلێدان و پرسینی بارودۆخی ژیان و رابواردنیان

لەمەش زیاتر بیری لە چارەنووسی کچەکان دەکردەوەو کە وەختی شووکردنیان دەهات شوویان دەکرد.

سەرچاوەکانی ژیانی ئابووری لە میرنشینی هەولێر دا بریتی بوون لە بەرهەمی کشتوکاڵی زۆرو زەبەند بە تایبەتی جۆرەها دانەوێڵە، ناوچەکە پشتی بە ئاوی باران دەبەست، چونکە رووباری تیا نەبوو، ئەگەر باران کەمبا ناوچەکە هەندێ ساڵ تووشی ووشکیو برینگیو بێدەرامەتی دەبوو، لەبەر ئەوە باغی نەبوو بەڵام خەڵکەکە ناچاربوو کارێز لێبدات بۆ ئەوەی سوود لە ئاوەکانی بینن. (یاقوت الحموی) ئاوی کارێزەکان بە ئاوی شیرین و سازگار دەداتە قەڵەم. گرنگترین بەروبوومی کشتوکاڵ کە هەولێر ناوی پێ دەرکردبوو لۆکە بوو، لەناوچە شاخاوی یەکانیشەوە میوەجاتی بۆ دەهات، گوندی شەقلاوە بە درێژایی ساڵ میوەکی زۆری دەنارده هەولێر. ئاووهەوای ناوچەکەش بۆ بە خێوکردنی مەڕومالآت دەگونجا. بزوتنەوەی بازرگانیش پەرەی باش سەندبوو، لەسەردەمی مظفرالدین گەیشتبووە ئەوپەڕی هەولێر لەگەڵ وولاتانی دوور پەیوەندیی بازرگانی هەبوو.

بەندی دووەم ژیانی رۆشنبیری یە لە سەردەمی ئەتابەکی، ئەویش بریتی یە لە دەزگاکانی خوێندن. کە مزگەوتەکان دەورێکی باشیان دەنواند، بەڵام مزگەوت بەتەنیا بەشی پێویستی کۆمەڵی نەدەکرد، لەبەر ئەوە قوتابخانەی سەربەخۆ سەریان هەڵدا، وەك قوتابخانەی عقیلیو قوتابخانەی قەڵات و قوتابخانەی مجاهدی یە وقوتابخانەی مظفریە هەروەها مظفرالدین دەزگای حەدیثی مظفریەی دانا.

دانەر ناوی کۆمەڵێك نێودارانی زانستی دێنی کە لە هەولێر ژیاون، یا سەریان لێداوەو ماونەتەوەو، چ دەورێکی مێژوویان هەبووە لە بواری زانین و رۆشنبیریدا، ژمارەیان زۆرەو پێویست بەناو هێنان ناکات. جا روو دەکاتە بەناوبانگ ترین بنەماڵەی زانستی لە هەولێر، کە ناویان دەرکردووە رۆڵەکانیان رۆشنبیری یەکی زۆریان هەبووە، وەك بنەماڵەی ابن خەلەکان وابن مستوفیو ابن منعەو، بنەماڵەی شێخ خضر بن نصر.

بەندی سێیەم دوابەشی کتێبەکە، ئەمەش باسی رێکخستنی بەرێوە بردن و دارایی و دادپرسین و رێکخستنی سەربازیو پارەوپوول و سیستەمی پارەدەرکردن دەکات. لە دەسەلآتەکانی میری هەولێر دەدەوێ، پاشان دێتە سەر وەزیرەکان و کاری دەرگەوان کە پیشەی پاراستنی دەرگای کاربەدەست یاخود میرەو رێگەدانی چوونە ژوورەوە بۆلای، دوای ئەوە دێتە سەر دیوانی دارشتنی «نامە نووسین نووسینکاری». پاشان باسی وەزیفەی مۆرهەڵگرتنی میر دەکات. هەندێ وەزیفەی تریش باس دەکات وەك وەزینەی وەستاداریو دیوانی عەمارو دیوانی بەرزاییو دادپەروەری، دیوانی سەیرکردنی سکالآو وەزیفەی حیساب بۆ کردن.

لە رێکخستنی سەربازی دەدوێ، کە سوپایەو بریتی بوو لەو کۆیلە تورکمانانەی لە ناوەراستی ئاسیاو وولآتی قەبجاق دەیانهێنان، بوونە کۆلەگەی ئەتابەکی یەتەکان، هەروەها خەڵکی کوردو عەرەبیشیان بەکار دەهێنا.

مەسەلەی ئالآ «بەیداغ»یش یەك لە رووالەت و نیشانەکانی سەربەخۆیی میرنشین یا دەوڵەت بوو، دەبوایە ئەم میرنشینە ئالآی جیاوازی خۆی هەبێ، ئەویش ئەوکاتە بوو کە لە میرنشینی مووسڵ جیابۆوە. ئالآکە لە ناوەراستی وێنەی بازێکی تێدابوو لەسەر شێوەی ئالآی صلاح الدینی ئەیووبیو دەوڵەتی ئەیووبی یەکان.

ئیتر دانەر بەدرێژی باسی جبەخانە دەکات، پاشان دێتە سەر پارەو پوولی میرنشین و نیزامی پارەلێدان (سکەلیدان) کە پارەکە شێوەو کێش و قەوارەیەکی چەسپاوی بەخۆوە نەدیبوو چونکە باری ئابووری هەمیشە شلەژاوو پشێو بوو، ئەویش لەبەر

پشێــوی ناوچـەکـە بەهـۆی شەڕی خاچ پەرست و کەرت بوونی وولاتی ئیسلام بۆ چەند یەکەی سیاسی و هێرش و پەلامارادانی مەغوولەکان و، کەم بوونی زێرو زیو لە بازار.

لە کۆتـایی دا چەنـد خشتـەیـەکی دانـاوە، خشتـەی یەکەم بۆ (دینـوبـەکتکینی) ئەتـابـەکـەکـانی هەولێـر دووەم بۆ خەلیفەکانی عەبیـاسی ئەوانـەی هاوچـەرخی میـرنشینی هەولێـر بوون، پاش مردنـی زیـن الـدیـن علی کوچـك، خشتــەی سێـیــەم بۆ ئەتـابـەکـەکـانی مووسـڵ. نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کە مامۆستا محسن هاتووە پشتی بە (251) سەرچاوەی عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی و تورکی و کوردی بەستــووە، کە ئەمـــەخــۆی لە خۆیدا نیشانەی خۆماندووکردن و تەقەلادانێکی زۆرە لەپێناوی پتەوکردنی باســەکــەیو، وەك ئەرکـێـکی سەرشــانی، نوانــدی گیــانی زانستییانەیە لە بواری لێکۆڵینەوەو سۆراغ کردن و هەڵسەنگاندن دا.

دوای سەرچاوەکان (5) پاشکۆی بەباسەکەی بە ستۆتەوە کە دەقی ئەو بڵاوکراوەو نامانەن کە صلاح الدین وەك بڵاوکردنەوە دەری کردووەو بەپێی بڵاوکـردنـەوەکە هەڵوێستی خۆی بەرامبەر هێـزە ئیسـلامی یـەکـان دیارکردووە، یاخود دەربارەی چارەنووسی میــرنشینی هەولێــرە پاش مردنی زین الــدین یوسف نیــالتکین یانـامـەیـەکـە بۆ مظفـرالدین کۆکبەری ناردووە داوای لێ دەکات ئامادە بێت بۆ شەڕکردن و جەنگ بەرامبەر خاچ پەرستەکان و هیتر.

**دوا ووشە: -**

ئەوەی نووسیمان پوختەکەی زۆر کورتی باسەکەی مامۆستا محسن محمـد حسین بوو، کە بەپێی‌تـوانـاو دەرفـەت کەمێـك ڕوونـاکیمـان خستـە سەر. کتێبێی ئاوا پێـویستی بە نووسینێکی لەمە زیاترەو، شیاوی ئەوەیە کە هەندێ لایەنی تری بخرێتە بەر ڕووناکی، بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر شارەزای شاری هەولێر بێ لەو سەردەمـە ناسـك و گرنگـەدا، کە میـرنشینی ئەتـابـەکی حوکمی کردووە، لەمەش زیاتر وەرگێڕانی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە ئەرکێکی مێـژوویی ڕۆشنبیـری یـە، کە لە ڕۆژگـارێکی وەك ئەمـڕۆدا وەك واقعێـك وبـەرپرسیاری‌یەك خۆی دەچەسپێنی و پێویست بەبوونی دەکات، تاکو لە کتێبخانەی کوردی‌دا شوێنی خۆی بکاتەوەو کە لێنێکی باش بۆ خۆی پڕ بکاتەوەو بکەوێتە بەردەست قوتابیان و ڕۆشنبیـرانی کورد، کە بەشـوێن مێـژووی گەلەکەیان عەوداڵن و دەیانەوێ خزمەتی نەتەوەی کورد بکەن.[1]

(1) نامەکەی ماجستێر بەناوی اربیل في العهد الاتابکی یەوە.

# تکایێك لە نووسەران

1 ـ هەوڵ بدە باسەکەت بە خەتێکی خۆش بنووسیت، هەتا بە باشی بخوێنرێتەوە.

2 ـ خەتەکە شاش بێت، واتە خەتێ بنووسەو خەتی بەجێ بهێڵە.

3 ـ لەم سەرو لەو سەری دێرەکانەوە ماوە بەجێ بهێڵە، ووشەکان مەترنجێنە ئەم سەرو ئەو سەری کاغەزەکە.

4 ـ خاڵی و نیشانە (7)ی سەریان ژێر پیتەکان لە جێی خۆیدا، دابنێ چونکە پیت ڕێخەرەکان کوردی نازانن هەتا بتوانن شوێنی خاڵ و نیشانەکان لە جێی خۆشیاندا نەبن جیایان بکەنەوە، وەك :

بینین
ڕۆشنبیری
کۆنترین
بخرێتەجێ

5 ـ ماوە لەسەری فەقەرەیێکی نوێدا بەجێ بهێڵە.

6 ـ خالبەندیش ـ چونکە دەورێکی گرنگی هەیە لە خوێندنەوا ـ لە نووسینەکەتدا. فەرامۆش مەکە.

7 ـ ڕێنوسەکەت تارادەییەك، با یەك گرتوو بێت، واتە لە شوێنێکدا ووشەیێك بە جۆرێ مەنووسەو هەرهەمان ووشە لە شوێنێکی تردا بەجۆرێکی تر بنووسیت، واتە :

ـ لە شوێنێکدا مەنووسە (ئەخوێنم)و لەشوێنێکی تردا (دەخوێنم)، لەباسەکەدا ئەگەر (دەخوێنم)ت بەکارهێنا، هەتا کۆتایی باسەکە هەر (دەخوێنم) بەکار بهێنە.

ـ مەنووسە (کابرایێك)یان (کابرایەك) هەریەکێکیان بەکاربهێنە.

ـ ووشەی ناسادە یان پێکیانەوە بنووسەریان لێکیان جیابکەرەوە لە باسەکەتدا، وەك :

گەرمکردن، گەرم کردن.
هەڵفرین، هەڵ فرین.

ـ ئامرازی (دا، ڕا) بلکێنە بە دوای ووشەکانەوە، وەك :

تێدا نەك تێ‌دا.
لەنووسیندا نەك لەنووسین دا
لەلادێوە نەك لەلادێ‌وە.

ئەمانە هەتا بڕیاری تەواوی لەلایەن دەزگا ڕۆشنبیرەکانی کوردییەوە لەسەر نووسینیان بەیەك جۆر دەدرێت.

8 ـ لە نووسینەکەتدا ماوە بخەرە نێوان ووشەکانەوە لە دێرێکدا، واتە بنووسە :

پیرەمێرد شاعیرێکی گەورەی کورد بووە.

مەنووسە :

پیرەمێردشاعیرێکی گەورەی کوردبووە.

چونکە لەسەری شێوازی دوایین لە دابڕکردندا (تقطیع)دا، ووشەکان تێکەڵ بە یەکتردەبن.

● دەستەی نووسەران

له خوارەوه دەقی ئەم نامەیە بلاودەکەینەوە، کە لە (زانکۆی بصرە)وە پێمان گەیشتوە، ناوەرۆکەکەی بریتیە لە دان نانی (زانکۆی بصرە) بە گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) بە گۆڤارێکی ئەکادیمی‌و زانستی.

بسم الله الرحمن الرحيم

الجمهورية العراقية

رئاسة جامعة البصرة
مديرية مكتب رئيس الجامعة
العدد: ٧/١٦/٧٨٢٢
التاريخ: ٨/٥/١٩٨٥

الى /

دار الثقافة والنشر الكردية
هيئة تحرير مجلة ( روشنبيرى نوى )

نهديكم اطيب تحياتنا ..

ونود اعلامكم ان لجنة الترقيات العلمية في جامعتنا قد وافقت على اعتماد مجلة ( روشنبيرى نوى ) المثقف الجديد لاغراض الترقيات العلمية .

مع التقدير ..

الدكتور كاظم عبد الامير محسن
و/ مساعد رئيس الجامعة للشؤون العلمية

نسخة منه الى /

عمادات الكليات كافة / يرجى اعتماد المجلة اعلاه / لاغراض الترقية العلمية مع التقدير

مراكز الجامعة كافة / لنفس الغرض مع التقدير

مديرية مكتب رئيس الجامعة

الاضبارة الدورية

اضبارة الكتب الصادرة

خلود / اسيا /



روشنبیری نوێ
مجلة فصلية تعني بالدراسات
تصدر عن: دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والأعلام
بغداد

Roshinbiry Nwo
Periodical Magazine for
Scientific researches
Issued: by Kurdish Culture and Publication House
Ministry of Culture and information
Baghdad - Iraq

نرخی سالأنەی (3) دینارە

نرخی 250 فلسە